


- ناوی کتێب: نوری مینبەر.
- نوسەر: ئاتح مەلا رسول شارەستێنی.
- تایپ و دیزاین: کۆمپیوتەری یاد.
- چاپخانە: سیما.
- تیراژ: ( ٥٠٠ ) دانە.
- نۆبەی چاپ: یەکەم.
- ساڵی چاپ: ٢٠٠٩ ز - ١٤٣٠ ك.

# پێشکەشە بە :

- دایك و باوکی بەڕێزم.
- بە هەموو ئەو ماموٚستایانەم کە ئەگەر بوٚ ساتێکی کەمیش لە خزمەتیاندا بووم لە زانستەکانیان بەهرەمەند بووم لە هەر کویٚ هەن.

لە ناویاندا بە تایبەتی پێشکەش بێت بە ڕوٚحی ماموٚستا (مەلا سەعیدی قامیشی) کە یەکەم وانەی فەقێتیم لە خزمەت ئەو زاتە زانا بێ وێنە گومناوە خوێند.... وە ڕوٚحی پاکی ماموٚستا (مەلا محمد أمینی بن طەبەق) کە چەند کتێبێکم لە خزمەتیدا خوێند... وە ڕوٚحی پاکی هەریەك لە ماموٚستایان (مەلا محمد نورەدینی) و ماموٚستا (سید سلێمن) و ماموٚستا (عبدالباقی) گەورە زانایانی دەڤەری ڕانیە کە ماوەیەك لە خزمەتیاندا بووم.. وە ڕوٚحی پاکی ماموٚستای گەورە و زانای دڵسوٚز و دڵ پڕ لە ئیخلاص، ماموٚستای گەورەم، ماموٚستا (شێخ خالیدی موفتی) کە لە خزمەتیدا ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت.

ڕوٚحیان شاد و جێگەیان بەهەشتی بەرین بێت و خوای گەورە لە جیاتی من و هەموو فەقێ و خزمەتکارانیان پاداشتیان بداتەوە.

- بە هاوسەری دڵسوٚز و پشتیوانم (دایکە ئاسودە) و هەرسێ جگەرگوٚشە و نوری چاوانم (محمد و ئیبراهیم و ئاسودە).

# بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ خوای پەروەردگار، سەلآت و سەلامی خوا لەسەر رۆحی سەردار و نوری چاومان حەزرەتی محمد ﷺ ، وە هەموو هاوەڵان و شوێنکەوتوانی بە گشتی.

خوێنەری ئازیز: ئەم کتێبەی بەردەستت برتیە لە وتاری رۆژانی هەینی، کە بەو شێوەیەی کە لەم کتێبەدا نوسراونەتەوە، لە ماوەی ساڵێکدا بە پێی مانگە عەرەبیەکان لەسەر مینبەر خوێندومنەتەوە و هەموو هەفتەیەك بە (CD) بلآوکراونەتەوە.

بەڵام دواتر بە باشم زانی کە بیاننوسمەوە و بەم شێوەیەی ئێستا بیانخەمە بەرچاوی موسڵمانان بە گشتی و وتاربێژان و بانگخوازان بە تایبەتی، وە بە پێویستی دەزانم ئاماژە بە چەند شتێك بکەم:

١.ئەوەی نوسراوەتەوە هەمان دەربڕین نیە کە لەسەر مینبەر پێشکەش کراوە، واتە لە (CD)یەوە نەقڵ نەکراوەتە سەر کتێب، بەڵکو بە شێوازی نوسینی ناو کتێب نوسراوەتەوە، لەبەر ئەوەی زمانی نوسین و قسەکردن لەیەکتر جیاوازن، وە وتاربێژ دەبێت خۆی جارێکی تر بە زمانی خۆی و شێوازی سەر مینبەر بیخوێنێتەوە، نەك لەسەر کتێبەکە.

٢.وتارەکان درێژن و مانای ئەوە ناگەیەنێت کە مەرجە بەیەك جار و لە یەك وتاردا هەمووی بخوێندرێتەوە، بەلاَم من مەبەستم ئەوە بوو ئەوەی کەوا لەسەر ئەو بابەتە خوێندومەتەوە، هەمووی بنوسم و ئیتر وتاربێژ بە پێی ئەو کاتەی لەبەر دەستیەتی دەتوانێت سود لە وتارەکان وەربگرێت، بۆ نمونە: لە دوو بەسەرهاتی ناو یەك وتاردا کامیانی لا گونجاوتر بوو، ئەوەیان وەربگرێت.

٣.لە کۆتایی هەر وتارێکدا ئاماژەم کردووە بۆ ئەو سەرچاوانەی کە وتارەکەم لێ وەرگرتووە و ئەگەر کەم و کوڕی وهەڵەیەك هەبێت، ئەوە لای منەوەیە و هەر خوای تاك و تەنهاش لەهەڵە بە دوورە:

هەربۆیە:

و إنْ تجدْ عَيْباً فَسدَّ الخَلَلا .... جَلَّ مَنْ لا عَيْبَ فيهِ وَ عَلا

وە ئەمە بەرگی یەکەمە و بە پیشتیوانی خوای گەورە بەرگی دووەمیش لە ئامادە کردندایە و بە وتارەکانی مانگی شەعبان دەست پێ دەکات و تا کۆتایی ساڵ لە خۆ دەگرێت... إنشاء الله.

ئامانجیشم لەم بابەتە تەنها و تەنها رەزامەندی خوای گەورەیە و گەیاندنی ئەمانەتی سەرشانمە و هاوکاریەکی بچوکی وتاربێژان و بانگخوازانی هاوپیشەمە.

وە لەبەر ئەوەش ئەوەی کە لەم کتێبەدا نوسراوەتەوە قورئانە و فەرمودەی گەوهەرباری پێغەمبەری پێشەوامانە ﷺ وە فەرمودەی

صەحابەکان و خواناسان و بەسەرهاتی پیاوباشانە، کە هەمووی نورە و روناك کەرەوەیە و (نورٌ علی نور) ، بۆیە کتێبەکەم ناونا (نوری مینەبەر)، بە ئومێدی ئەوەی پێش هەموو شتێك ببێت بە نور و روناکی دڵ و دەرونی خۆم و نوری رێگام لە ژیانی دونیادا و روناکی و نوری ناو گۆڕەکەم و مەیدانی مەحشەر و سەرپردی سیراتم، لەگەڵ هەموو ئێوەی ئەهلی قیبلە لە ئوممەتی پێغەمبەری نور ﷺ.

داواکاریشم لە تۆی خوێنەری بەڕێز لە دوعای خێر و رەخنە و پێشنیاری بنیاتنەر بێبەشمان نەکەیت.

﴿قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ﴾ البقرة: ٣٢.

﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ﴾ هود: ٨٨.

# وتاری یەکەم بۆ مانگی محرم

## کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە

## بەشی یەکەم

## چاوپێکەوتنی هۆزەکان

# وتاری یەکەم بۆ مانگی مُحرَّم

# کۆچ کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە.

## بەشی یەکەم چاوپێکەوتنی هۆزەکان

ئیمانداران بەڕێز، وا جارێکی تر پەروەردگار تەمەنی پێ بەخشین و گەیشتینەوە سەری ساڵی کۆچی، ساڵی موسڵمانان، ئومێدەوارم لە قاپی خوا کە ساڵێکی پڕ خێر و بەرەکەت بێت بۆ هەموو ئەهلی قیبلە، لەم ساڵەدا بە خۆماندا بچینەوە و لە تاوان و خراپەکانی ساڵی رابردومان تەوبە بکەین و هەوڵ بدەین بە پشت بەستن بە خوای گەورە ساڵی داهاتومان ساڵێکی پڕ تەقوا و دینداری بێت و زیاتر لە دینەکەمان شارەزا بین و لە کارو باری دونیاشماندا سەرفراز و دەست بە خێر و هەردەم بڵێین: ( رَبَّنا آتينا في الدُّنيا حَسَنَةً و في الآخرةِ حَسَنَة وقِنا عذابَ النّار ) اللّهم آمين.

**لەپاشان خۆشەویستان:**

ساڵی کۆچی کە مێژووی موسڵمانان بەو ساڵە حساب دەکرێت، لەوەوە هاتوە کە لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی کردووە لە شاری مەککەوە بۆ شاری مەدینەی منەوەرە، کە ئەم یادە پیرۆزە و ئەم رووداوە گرانبەها و پەند ئامێزە حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ بە راوێژی صەحابەکان لە زەمانی خەلافەتی خۆیدا ساڵی کۆچی دانا و مانگی موحەڕەمی کردە سەری ساڵی کۆچی، لەوانەیە موسڵمانان بپرسن بۆچی لە ناو ئەو هەموو یاد و موناسەباتانەی کە لە مێژووی ئیسلامدا هەن، هەر لە یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری پێشەوامانەوە ﷺ تاوەکو بە پێغەمبەربوونی و وەفاتی و جەنگی بەدرو ئوحود و خەندەق، و یادی ئیسراو میعراج، بۆچی ئەم بۆنانە نەکران بە سەرەتای ساڵی کۆچی و هیجرەت هەڵبژێردرا؟! لە وەڵامدا دەڵێین: هەزاران

هەزار رەحمەت لە فەقیهو موجتەهیدی دڵ روناکی ئیسلام حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب، کە بەراستی زۆر جوان دەرکی بەم راستیە کردبوو کە هیجرەت خاڵی وەچەرخان بوو لە مێژووی ئیسلامدا، هەردوو قۆناغی مەککەیی و مەدەنی بە هیجرەت دیاریکرا، هیجرەت بوو بەهۆی بەرهەمگرتنی ١٣ ساڵی بانگەوزای مەککەو صەبر و خۆڕاگری بەرامبەر هەموو ئەشکەنجە و ئازارێك...

بەڵام پێویستە هەموومان ئەو راستیە بزانین هیجرەت هەروا کت و پڕ رووی نەدا، موسڵمانان بە سەرکردایەتی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە کت و پڕ و لە بڕیارێکی سۆزداریدا بڕیاریان نەدا کە مەککە بەجێ بهێڵن و روو بکەنە مەدینە.. نەخێر، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ پاش (١٣) ساڵ لە هاتنە خوارەوەی قورئان بۆی و بەسەربردنی (١٣)ساڵ ژیان لە ناو کافرەکانی مەککەدا، ئەمجا کۆچی کرد بۆ مەدینە، بەڵام لە ساڵی (١٠)ی بوون بە پێغەمبەریەوە، واتە (٣) ساڵ پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە، بەردەوام لە هەوڵ و تێکۆشاندا بوو بۆ دۆزینەوەی شوێنێك و خەڵکێکی باش کە خۆی و ئیسلام لە باوەش بگرن و پشتیوانی لە خۆی و هاوەڵانی بکەن، چونکە پێغەمبەری دڵسۆز و کۆڵنەدەر گەیشتبوە ئەو قەناعەتەی ئیتر کە ئەم ئیسلامە لە ناو مەککەدا گەشە ناکات، و هەر وەکو بەرد و چیا ڕەقەکانی مەککە دڵەکانی ئەو موشریك و بت پەرستانەش ڕەق بوون و ئیسلام وەر ناگرن، بۆیە بڕیاری کۆچ کردنی دا و هەوڵەکانی بەم شێوەیە دەستیان پێکرد، لەسەر بنەماو لەبەر چاو گرتنی ئەو شوێنەی کە کۆچی بۆ دەکەن، کە زۆر گرنگە ئەو شوێنە و دانیشتوانەکەی بتوانن دیفاع لە ئیسلام و موسڵمانان بکەن، و باری ئابووری و داراییان باش بێت و لە هەمان کاتدا هاوپەیمانی وڵاتانی زلهێزی دونیای ئەو رۆژە نەبن وەك رۆم و فارس، بۆ ئەم مەبەستە یەکەم هەوڵی دا و چوو بۆ طائف و سەرەك هۆزەکانی ئەو شارەی بینی و

باسی ئیسلامی بۆ کردن و داوای کۆمەك و پشتیوانی بۆ خۆی و هاوەڵانی لێکردن، بەڵام ئەوە بوو بەناشرینترین شێوە وەڵامی درایەوە و بەردباران کرا و منالّی بە شوێن خراو قاچی پیرۆزی خوێناوی کرا و بە نائومێدی گەڕایەوە بەرەو مەککە، ئێستا ساڵی (١٠)ی پێغەمبەرایەتیە و مانگی حەجە، عەرەبەکان لە هەموو لایەکەوە دەهاتن بۆ مەککە و حەجیان دەکرد و حەجیان بۆ مەرامی خۆیان بەکاردەهێنا:

١.بۆ بەرزکردنەوەی ناوی بتەکانیان.

٢.بۆ خۆنواندنی عەشیرەتی، کە لە دەوری کەعبەدا هێز و توانای هۆزەکانیان دەربخەن.

٣.بۆ سودی ماددی و دارایی لەو کڕین و فرۆشتنەی کە لە کاتی حەجدا دەیانکرد.

بەڵام حەجەکەیان زۆر بێڕێزانە بوو، بە رووتی بە دەوری کەعبەدا دەسوڕانەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ سوودی لە فرسەتی کاتی حەج دەبینی بۆ بانگەواز، نەیفەرموو: ئەوە حەجی کافرانە و هەمووی بێشەرعیە و نابێت لەو شوێنە نزیك ببمەوە، بەڵکو ئەم کۆبونەوەیەی هەموو هۆز و تیرەکانی بە فرسەت دەزانی بۆ بانگەواز، سوپاس بۆ خوا ئێستا لە ئەوروپا موسڵمانانی وشیار لەسەر رێبازی پێغەمبەرەکەیان ﷺ سود لە هەموو بۆنە و موناسەباتەکان وەردەگرن بۆ بانگەواز بۆ ئیسلام.

بۆ نمونە: بانگخوازێك لە دەروازەی شاری (میونخ)ی ئەڵمانی، لەوحەیەکی گەورە دەبینێت لێی نوسراوە: (تۆ نازانیت تایەی یۆکۆهۆما چ تایەیەکە ).ئەم گەنجە بانگخوازەش لە لایەوە لەوحەیەکی گەورەی دانا کە لەسەری نوسرابوو: ( تۆ نازانیت ئیسلام چ ئاینێکە، ئەگەر دەتەوێت شارەزابیت بەم ژمارە تەلەفۆنانەوە پەیوەندیمان پێوە بکە ). بەم شێوەیە

خەڵکێکی زۆر پەیوەندیان پێوە کرد و لە ماوەی یەك ساڵدا هەزار ئەڵمانی ژن و پیاو موسڵمان بوون و پاشان مزگەوتێکیان کردەوە.

هەر لەسەر هەمان ڕێباز بانگخوازێکیش لە هۆڵەندا هەرچەندە بواری ببوایە سواری شەمەندەفەر دەبوو، ئینجا هەرکەسێکی بەدیبکردایە کە بەتەنها دانیشتوە و شێوەی لەوە دەچێت کە کەسێکی نەرم و نیان دیارە و گوێ بۆ قسە دەگرێت، دەچوە لایەوە و باسی ئیسلامی بۆ دەکرد، لەوسەریش بە هەمان شێوەی دەکرد، بەم شێوازە چەندەها کەسی موسڵمان کرد، دە خۆزگایە ئێمەش لەو هەموو فرسەتە زێڕینانەی کە دێتە ڕێمان سودمان وەرگرتایە و بانگی خەڵکیمان بکردایە بۆ دینی خوا، بۆ روناکی ئەم ئیسلامە...

نمونەیەکی تر: بانگخوازێك لە وڵاتی کەنەدا کە خەڵکی بیانی زۆری لێیە، بە چەند زمانی وەکو ئینگلیزی و بەنگلادیشی و یابانی و چینی لەسەر لەوحەیەك کە دادەنرێت لەبەردەم جامی ئۆتۆمبێلدا بۆ گەرما لە کاتی وەستاندا، نوسیبووی: ( ئەگەر دەتەوێت فێری ئیسلام ببیت، پەیوەندیم پێوە بکە، جا کاتێك دەگەڕایەوە بۆلای ئۆتۆمبێلەکەی چەند کەس بیانویستایە لێی کۆدەبونەوە، ئەمیش سندوقی ئۆتۆمبێلەکەی بۆ دەکردنەوە، کە چەندەها کتێبی تێدا بوو بەو زمانانە دەیخستە بەردەمیان، دەیگوت: چ کتێبێکت دەوێت بیبە، کە ئەمەش زۆرجار دەبووە مایەی هیدایەتیان.

کەواتە بە کوردی و بە کورتی: هەرچیت پێدەکرێت بۆ دینی خوا بیکە، ئەمڕۆ دونیایە و سبەینێش مەحشەر، تەنها خوا دەزانێت کەی و لەکوێ تەواو دەبێت، ئاشکرایە هەموشمان مردنێك قەرزارین.

کەواتە واجبە لەسەرت بەردەوام خەڵك بانگ بکەیت بۆ ئیسلام، جا ئەگەر خۆت شارەزای، لە هەموو فرسەتێکدا هەوڵبدە ئیسلام بە خەڵکی

بگەیەنە. وە ئەگەر خۆشت شارەزایی تەواوت نیە و لێی نازانیت، ئەتوانیت چەند کتێب و سەرچاوەی پێویست بکڕیت بۆ ئەو کەسانەی کە شارەزان و بەهۆی ئەو کتێبانەوە دینی خوا بەخەڵك دەگەیەنن.

بەڵێ ئیمانداران، پێغەمبەری خوا ﷺ لەماوە (١٠) رۆژدا لە کاتی حەجدا (٢٦) هەوڵی داو چاوی بە نوێنەرانی (٢٦) قەبیلە و هۆز و تاکەکەس کەوت، کە ئەمەش نیشانەی ماندوو نەبوون و لێبڕانە، داواکاری پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ هۆزەکان ئەمە بوو: (مَن رجُلٌ يحملني إلى قَومه، فَيَمنَعني حتّى أبلغ رسالة ربّي، فإنَّ قُرَيشاً قد مَنَعُوني أن أُبَلِّغ رِسالةَ ربّي). دەیفەرموو: ئایا چ پیاوێکی مەرد و بەغیرەت ئەمباتە لای هۆزەکەی و بەرگریم لێ ئەکات و پشتیوانیم لێ ئەکات هەتا ئەو کاتەی کە پەیامی پەروەردگارم دەگەیەنم، چونکە قوڕەیش رێگرمن و ناهێڵن بە ئازادی پەیامی پەروەردگارم بگەیێنم.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کرد بە گەڕان بەناو هۆزەکاندا و داوای خۆی پێگەیاندن، بەڵام هیچ سەرکەوتنێکی بەدەست نەهێنا، کەس وەڵامی نەدایەوە، بۆچی؟! چونکە بەردەوام (ئەبولەهەب)ی مامی بەشوێنیەوە بوو، بە خەڵکەکەی دەگوت: ( لا تَسْمَعُوا منهُ، فأنه كَذّاب)، واتە: ئەی خەڵکینە، گوێی بۆ مەگرن، چونکە دڵنیابن ئەم محمدە درۆزنە!!!. وە ئەبولەهەب لە هەندێ شوێندا بە خەڵکی دەگوت: (لا تُصَدِّقُوه، أنا عَمُّهُ، وَأنا أعْرِفُه، أنَّهُ مَجْنُونٌ)، واتە: نەکەن بڕوا بە قسەکانی بکەن، بە راستی مەزانن، من مامی ئەوم، چاکتر لە ئێوە دەیناسم، بەراستی ئەم محمەدە شێت بووە!!.

بێگومان درۆزنی و شێتیش، هەرکەسێك پێیان بناسرێت کەس بڕوا بە قسەی ناکات و خۆی لێ بە دوور دەگرێت، خەڵکەکەش کە ئەوەیان لە ئەبولەهەب دەبیست دەیانوت: (قَوْمَهُ أعْلَمُ بِه، و كَيفَ يُصْلِحُنا مَنْ أفسَدَ قَومَهُ؟!). واتە: گەل و هۆزەکەی خۆی و خزمەکانی خۆی باشتری دەناسن و چاکتر

شارەزای محمدن، جا چۆن کەسێك دەتوانێت ئێمە بەرەو چاکەکاری بانگ بکات لە کاتێکدا هۆزەکەی خۆی سەرگەردان کردووە؟!. بەم شێوەیە بە هۆی ئـەو راگەیاندنـە بەردەوامـە ژەهراویـەی ئەبولەهەبـەوە زۆری هـەوڵ و چاوپێکەوتنەکان بۆ ژمارەیەکی زۆر لەو (٢٦) هۆزە، لەلایەن نوێنەری ئەو هۆزانەوە هەر یەك وشەش وەڵامی نەدرایەوە، هەر بۆیە ژمارەیەکی زۆر لەو (٢٦) هۆزە هەر ناویشیان لە سیرە و ژیاننامەی پێغەمبەردا ﷺ نەهاتووە کە کێ بون و چیان وتووە، چونکە یەك وشەش وەڵامی پێغەمبەری خوایان ﷺ نەداوەتەوە، وە ئەبولەهەب هەر خۆشی بەتەنها نەبوو بەڵکو لە سیرەدا دەفەرموێ: (كان أبو جَهلٍ و أبو لهَب، يَتَناوبانِ على أذيَةِ رَسُول الله ﷺ عندَما يدعوا في الأسواقِ و المَواسِمِ، وكانَ يَجدُ منهُما عَنتاً كبيراً إضافَةً الى ما يلحقه مِنَ المدعُوين أنفُسَهُم). واتە: ئەبوجەهل و ئەبولەهەب بە نۆرە ئازاری پێغەمبەریان ﷺ دەدا، لە کاتێکدا کە بانگەوازی خەڵکی دەکرد لە بازاڕ و لە بۆنەکاندا، وە ئەم دوانە دوژمنایەتیەکی زۆر سەختی پێغەمبەری خوایان ﷺ دەکرد و ئازاریان دەگەیاندە دڵی پیرۆزی، سەرەڕای ئەو ئازارەی کە لەلایەن ئەو کەسانەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگەیەنرا کە بانگی دەکردن بۆ ئیسلام.

کەواتە ئەبوجەهل و ئەبولەهەب هیچ کات وازیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەدەهێنا، ئەگەر یەکێکیان ئیسراحەتی بکردایە ئەوی تریان بە شوێنیەوە بوو، بۆ ئەوەی نەهێڵێت قسە بۆ خەڵکی بکات، جا بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم پیلانـەی ئەبوجـەهل و ئەبولەهـەب، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بڕیـاری دا کـە لەمەودوا:

١.لە کاتی شەودا کاتێك کە ئەبوجەهل و ئەبولەهەب لەماڵەوەن چاوی بە سەرۆك هۆزەکان بکەوێت، هەروەکو دواتر پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەم هەر لە شەودا بوو..

٢.پێغەمبەری خوا ﷺ ئەچوو بۆ شوێنی مانەوە و ئیسراحەتی هۆزەکان، دەچوە خێمەکانیانەوە و لە ناو خێمە و چادرەکانیاندا چاوی پێیان دەکەوت و وەکو جاران نەدەچووە بازاڕ، بەمەش ئەبوجەهل و ئەبولەهەب نەیاندەبینی تا قسەو چاوپێکەوتنەکانی لێ تێك بدەن.

٣.إصطِحابُ الأعْوان: لەگەڵ هاوەڵاندا دەچوو بۆلای هۆزەکان، جاران بەتەنها دەگەڕا، بەڵام لە نەخشەی تازەیدا بڕیاری دا لە شوێنی پێویست و چاوپێکەوتنی تیرە و هۆزی گەورەدا حەزرەتی ئەبوبکر و عەلی رضي الله عنه لەگەڵ خۆی دەبرد، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی کە بانگیان دەکات بۆ ئیسلام وانەزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر خۆی بەتەنهایە و هیچ یارمەتیدەرێکی نیە لە پیاو ماقوڵانی هۆزەکەی و خزمەکانی، لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مرۆڤ بە تەنها ئەو دەورو حورمەتەی نابێت لەلای کەسی بەرامبەر، بەڵام وەفد باشترە، وەفدیش نابێت زۆر بێت و لە سێ کەس زیاتر بێت.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ حەزرەتی ئەبوبکری رضي الله عنه دیاری کرد بۆ یاوەری خۆی، لەبەر ئەوەی پیاوێکی ناسراوی قوڕەیش بوو، وە تەمەنێکی هەبوو، سەرەڕای ئەوەش حەزرەتی ئەبوبکر نەسەبی هەموو عەرەبی لەبەر بوو، هەموو تیرە و تایەفەکانی دەناسی، بۆیە دەیفەرموو: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ با لەگەڵ ئەم هۆزەدا دانیشین، چونکە ئەمانە خەڵکی فڵانە شوێنن و هێز و توانایان وایە و وایە، کەواتە وەکو وەزیری دەرەوەی ئێستا وابووە بۆ ناسینی پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکان.

٤.التأكُد منْ الحماية القَبيلة: دڵنیا بوون لەوەی کە ئەم هۆزە دەتوانێت خۆی و هاوەڵانی بپارێزن، واتە دەبێت خاوەنی هێز و توانایەکی زۆر بن لە ڕووی ژمارەی هۆزەکەوە، و لە ڕووی ئازایەتی و فیداکاریەوە، چونکە هەموو هۆزێك لەو کاتەدا ناتوانێت هەموو دونیا لەخۆی بکات بە دوژمن، بەتایبەت قوڕەیشی مەککە، بۆیە کاتێك دەچونە لای هەر هۆزێك سەرەتا ئیمامی

ئەبە بکر لێی دەپرسین: کێ سەرکردە و گەورەی هۆزەکەتانە؟ ئایا ژمارەتان چەندە؟ چەند جەنگاوەرتان هەیە؟، لە شەڕ و ڕووبەڕووبونەوەی دوژمندا چۆنن؟ واتە لە ڕابردوودا لە شەڕدا سەرکەوتوو بوون یان نا؟ وە ئایا هۆزەکەتان هاوپەیمانی لەگەڵ کێدا هەیە؟ . بەم شێوەیە بەهۆی ئەم پرسیار و وەڵامانەوە ئەو هۆزەیان لە هەموو ڕویەکەوە هەڵئەسەنگاند، کە ئایا بەکەڵکی ئەوە دێت کە داواکاریەکەیان بخەنە بەردەمی یان نا؟. ئێستا دوای ئەم پیلانە نوێیە با بزانین چ هۆزێك دەبینێ و چۆن وەڵامی دەدرێتەوە..

**یەکەم هەوڵی:** بینینی هۆزی ( بەنی حەنیفە ) بوو، لەم قەومە (موسەیلەمەی دۆزن) پەیدا بوو کە دەیوت منیش وەکو محمد پێغەمبەرم، پێغەمبەری خوا ﷺ داواکەی خۆی خستە بەردەمیان بەڵام ئەوان (فردّوهُ أشدَّ الرَّد) بە توندترین و ناشرینترین شێوە وەڵامیان دایەوە، کە ئەوەندە قسەی سوك و جنێوی ناشرینیان پێگوت، زانایانی ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ شەرمیان کردووە بینوسنەوە، چونکە وتەکانیان ڕووی گێڕانەوەی مەجلسی نیە!.

**هەوڵی دووەم:** بینینی هۆزی (بەنی عبدالله) بوو، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەی بەنی عبدالله ئیمان بەو خوایە بێنن کە باوکتان بەندەیەتی، بەڵام ئەوانیش داواکەیان قبووڵ نەکرد و هەوڵەکە سەرکەوتوو نەبوو.

**هەوڵی سێیەم:** قسە کردن لەگەڵ هۆزی (بَني عامر صَعْصَعَة)بوو، ئەم هۆزە زۆر گرنگ بوون، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ و حەزرەتی ابوبکریش دەیانزانی کە ئەم هۆزە جەنگاوەری زۆریان هەیە، و سام و هەیبەتێکی تایبەتیان هەیە لە ناو هەموو هۆز و تیرەکانی عەرەبدا، بەڵکو یەکێك بوون لەو

پێنج هۆزە بەناوبانگەی کە هەرگیز ئافرەتیان دەست دوژمن نەکەوتووە کە لە شەڕدا ببرێ بە تالآنی و بکرێتە کۆیلە، هاوشانی هۆزی قورەیش و خوزاعە بوون لە نیوە دوورگەدا، وە لە لایەکی ترەوە گرنگی ئەم هۆزە لەوەدا دەردەکەوێت کە ئەم هۆزی (بني عامر صعصعة) مونافیس و رکابەری هۆزی (ثەقیف) بوون لە طائف، ئەگەر ئەمان پشتیوانی لێ بکەن ئەوا ثەقیفی طائف دەکەونە مەترسیەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دوژمنەی لە بەردەم لادەچێت، کەواتە بە کورتی و پوختی: ئەگەر ئەم هۆزە موسڵمان بن ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ دڵنیا دەبێت لێیان و ئیسلام سەردەکەوێت بە پشتیوانی خوا، جا بەم ئومێدە گەورەوە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لایان و خۆی پێناساندن و داواکاری خۆی پێگەیاندن، سەرکردەی ئەم هۆزە ناوی (بَيحَرة بن فِراس) بوو، بە زیرەکی خۆی زانی ئەم ئیسلامە لە پاشەڕۆژدا سەردەکەوێت، بۆیە بە هۆزەکەی وت: (والله لَو أنِّي أخَذتُ هذا الفتى مِنْ قُرَيش لأكَلتُ به العَرَبْ) واتە: ئەگەر بێت و من ئەم لاوەی قورەیش -کە محمدە- بگرمە خۆم، سوێند بەخوا هەموو عەرەبی پێدەخۆم. واتە: بەسەر هەموو عەرەبدا زاڵ دەبم، ئینجا روی کردە پێغەمبەر ﷺ و وتی: (أرَأيتَ إنْ نَحْنُ تابَعْناكَ على أمرِكَ، ثُمَّ أظْهَرَكَ اللهُ على مَنْ خَالَفَكَ، أيكُونُ لنا الأمرُ مِنْ بَعدِكَ؟!). واتە: ئەی محمد ﷺ ئەگەر ئێستا ئێمە شوێنت کەوتین و پشتیوانی خۆت و ئاینەکەتمان کرد، پاشان لە داهاتوودا خوای گەورە سەری خستیت بەسەر هەموو نەیار و دوژمنەکانتدا،ئایا ئێمە دوای تۆ کارو بار دەگرینە دەست و دوای تۆ بەرپرسیارێتی بۆ ئێمە دەبێت؟. بە کورتی عەرزی پێغەمبەری خوا ﷺی کردکە: ئێمە بەو مەرجە موسڵمان دەبین و پشتیوانیت لێدەکەین تا ئەو کاتەی خوا سەرت دەخات، بەومەرجەی کە لە دوای خۆت ئێمە کاربەدەستی و مەسئولیەتمان هەبێت، ئایا بەمە ڕازیت؟!.

ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وا خەریکە هەوڵی سێیەمت سەردەگرێت و وا بە خۆشی و رێزەوە قسەت لەگەڵ دەکەن، وا مەککە بۆتە ئاگر و یەکپارچە ئەشکەنجە و ئازار بۆ خۆت و هاوەڵانت، وا خوای گەورە پەنایەکی بەهێزی دا، دە خۆت و موسڵمانان و بانگەوازی ئیسلام رزگار بکە، دەی مەرجەکەیا قبوڵ بکە، ئاخر ئەوان ماڵ و خوێنی خۆیا دەبەخشن، دونیا دەبێتە دوژمنیان، ئەیْ خۆ ئاخری دەبێت دەوڵەمەند ببن و ببنە لێپرسراو و مەسئولیەت وەربگرن، بەڵام ئەوە پێغەمبەری خوایە ﷺ و نایەوێت ئەم دینە لەسەر چەند هاوکێشەیەکی هەڵە بنیات بنێت، هەرگیز درۆی لەگەڵ کەس نەکردووە تا ئەمڕۆ ئەمان بخەڵەتێنێت و کاتێك سەرکەوت وەعدی جێبەجێ نەکات لەگەڵیان، ئەم ئیسلامە مەبدەئی شورای هەیە بۆ بوون بە سەرکردە، سروشتی ئەم ئیسلامە وایە بە خەڵکی بەرژەوەند خواز و دونیا پەرست و کورسی و دەسەڵات پەرست هەڵناگیرێت و سەرناکەوێت، بۆیە لە وەڵامیاندا فەرمووی: (الأَمْـرُ لِلّـهِ يَـضَعَهُ حَيـثُ يـشاء) فەرمان هەر بۆ خوایە و چۆنی حەزبکات ئاوا ئەیبەخشێت.

سەرکردەکە وتی: یەعنی ئێمە ببین بە دوژمنی هەموو عەرەب و پاشان ئەگەر خوا سەری خستیت بەروبوم و ماندوبوونی ئێمە خەڵکی تر بیخوات، (لاحاجَةَ لَنا بأمرِكَ، فَـأبوا عَلَيـه) ئێمە هیچ پێویستیمان بەو ئیشەی تۆ نیە و پشتیان تێکرد و بەجێیان هێشت، لێرەدا پێویستە هەڵوێستەیەك بکەین، ئەویش ئەوەیە: ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ رازی نەبوو بەو هۆزە بڵێت: کاتێك سەرکەوتین حوکمڕانی بۆ ئێوەیە، لەبەر ئەوەی مەسەلەی مەسئولیەت و دەسەڵات لە ئیسلامدا زۆر بە گرنگ تەماشا کراوەو دەبێت سەرکردە بە راوێژی میللەت و بە دەنگدان بچێتە سەر کورسی حوکم، نەك بە خۆ فەرزکردن یان بە ناوی ئەوەی خەباتی زۆرە.

کەواتە ئەو دیموکراتیەی ئەمڕۆ لە بواری دەسەڵاتدا باسی دەکرێت، ئیسلام پێش هەمو خەڵکی باسی کردووە و بە کردەوەش چەسپاندویەتی و قوربانیشی لە پێناودا داوە، هەروەکو لەم بەسەرهاتەدا دەردەکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ چۆن پشتیوانی هۆزی (بني عامر صَعصَعَة)ی ڕەت کردەوە چونکە تەماحی مەسئولیەتیان هەبوو لە دوا ڕۆژدا.

جا بەراستی هەر سەرکردەیەك، هەموو هیوا و ئاواتی ئەوە بێت کە تا دەمرێت هەر دەبێت لێپرسراو بێت، ئەوە هەرگیز میللەت خێری لێ نابینێت، یان کەسێك بۆیە هەوڵ و تێکۆشان بکات بەڵکو پاشەڕۆژ دەوڵەمەند ببێت و ببێت بە کاربەدەست، ئەوەش میللەت لە سێبەریدا ناحەسێتەوە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانین کە حوکمی ئیسلام لە بارەی فەرمانڕەوایەتی و لێپرسراویەتیەوە روون بکەینەوە:

١.نابێت موسڵمانان بێ سەرپەرشتیار و سەرکردە بن، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: ( لا يَحِلُّ لِثَلاثَةِ نَفرٍ يَكونونَ في فُلاةٍ مِنَ الأرضِ إلا أمَّرُوا عَلَيهِم أحَدهُم ) واتە: درووست نیە بۆ سێ کەس کە لە شوێنێکی بیابانی سەرزەویدا بن، ئەگەر یەکێکیان لێپرسراو نەبێت بەسەریانەوە.

٢.لە دیدی ئیسلامەوە کاربەدەستی بەهرە و خەڵات نیە، بەڵکو هەڵگرتنی ئەمانەتێکی گەورەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ بە (عبدالرحمن کوڕی سَمُرة)ی فەرموو: ( لا تَسألِ الأمارة، فَأنَّكَ إن أعْطَيتَها مِن غَيرِ مَسألةٍ أُعِنْتَ عَلَيها ، وإن أعطَيتها عَن مَسألَة وُكِلتَ إليها ) رواه البخاري و مسلم. واتە: ئەی عبدالرحمن هەرگیز داوای بەرپرسیارێتی مەکە، چونکە ئەگەر کرای بە مەسئول و لێپرسرا و بە بێ ئەوەی خۆت داوات کردبێت ئەوا یارمەتیت دەدرێت بۆ بەڕێوە بردنی کارەکانت، و ئەگەر

هاتوو خۆت داوای لێپرسراویەتیت کرد ئەوا بە کارەکەت دەسپێردریێ و تێیدا سەرکەوتوو نابیت.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: ( سَيَحْرُصُونَ علی الأمارَةَ، و ستَكونُ نَدامَةً يومَ القيامةِ، فَنِعمَ المُرضِعَة، و بِئسَ الفاطِمةُ) رواه البخاري.

٣.نابێت بەرپرسیاریێتی کەسەکە بۆخۆی داواکاری بێت، بەڵو دەبێت حکومەت دەسنیشانی بکات و میلەتیش بەوە رازی بێت بەوەی کە دەنگی پێ بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( إنّا وَاللّهِ لا نُوَلّي هذا العَمَلَ أَحَداً يَسألُهُ أو أحَداً يَحرُصُ عليه ) رواه البخاري و مسلم. واتە: سوێند بە خوا ئێمە کەسێك ناکەین بە لێپرسراوی ئەم کارە کە خۆی داوای بکات، یان کەسێك سور بێت لەسەر بەدەست هێنانی.

٤.نابێت ئەو کاربەدەستە نیشانەی تەماحکاری و خۆ دەوڵەمەند کردنی پێوە دیاربێت، پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەفەرموێت: ( مَن أستَعمَلناهُ علی عَمَلٍ فرَزَقناهُ رزقاً فَما أخَذَهُ بَعدَ ذلك فَهو غُلولٌ ) رواه ابو داود و إبن ماجة. واتە:ئێمە هەرکەسێکمان کرد بە لێپرسراو ئەوا موچەی تایبەتی بەقەدەر پێویستیەکانی ژیانی بۆ دیاری دەکەین، ئەگەر هەر پارە و پولێك لەوە زیاتر بۆخۆی لا بدات ئەوە بە دزی حسێبە.

هەندێك لە دوژمنانی شەریعەتی ئیسلامی دەڵێن: هیوا و ئامانجی ئیسلام لە غەزا و فتوحاتدا دەستکەوتنی ماڵ و سامان بووە.

لە وەڵامیاندا دەڵێین: سەردار و گەورەی هەموو پێغەمبەران و پێشەوای ئەهلی ئیسلام حەزرەتی محمد المصطفییە ﷺ، جا با سەیر بکەین بزانین لەو حوکمڕانیەی کە لەبەردەستیا بووە، ئایا سودی گەیاندووە بە خۆشەویسترین کەسی خۆی کە فاطمەی کچێتی، کە یادگاری خاتوو خەدیجەی خێزانیەتی و دوای وەفاتی بۆی بەجێ هێشتووە.

ئیمامی عەلی ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فاطمەﷺ دەستی تلۆقی کردبوو بەهۆی دەستاڕەوە و منالّە بەریش بووە و، زۆر ماندوو بوو، جا هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەوەی داوای خزمەتکارێك بکات، بەلاّم پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کاتەدا لەماڵ نەبوو، کە خۆشەویست ﷺ هاتەوە عائیشەﷺ بۆی گێڕایەوە و داواکاریەکەی فاطمەیﷺ پیّ وت، ئیمامی عەلی ﷺ دەفەرموێت: لەگەڵ فاطمە بە یەکەوە دانیشتبووین لە ماڵی خۆمان، پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی هێنا بۆلامان، کە چاومان پێی کەوت ویستمان لەبەری هەڵسین، بەلاّم هەرلە دوورەوە بانگی کردین و فەرمووی: تکایە لە شوێنی خۆتان مەجولّێن، ئەنجا هات لە نێوانماندا دانیشت، فەرمووی: ئایا شتێکتان پیّ نەڵێم باشتربێت بۆتان لە خزمەتکار؟. وتمان: بەڵیّ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، فەرمووی هەرکاتێك چوونە سەر جێگای خەوتن (٣٣) جار بڵێن (سبحان الله) و (٣٣) جار بڵێن (الحمد لله)، هەروەها (٣٣) جار بڵێن (الله اکبر)، ئەمە لە خزمەتکار باشترە بۆتان.... لێرەدا چەند دەرس و وانەیەك فێر دەبین:

١.فاطمەی کچی پێغەمبەر ﷺ داوا شەخصیەکەی بە نەخێر وەلاّم دەدرێتەوە لە لایەن دەوڵەتی ئیسلامیەوە، و لە لایەن بەرپرسی یەکەمی دەوڵەتەکەوە کە باوکی خۆیەتی.

٢.فاطمەﷺ وەکو هەموو ژنە هەژارەکان بە دەستی خۆی گەنم و جۆ دەهاڕێت، پارەی ئەوەی نیە ئافرەتێك بە کریّ بگرێت.

٣.بەرەکەتی ئەم ذیکر خوێندنانە لە کاتی خەوتندا بۆ یارمەتیدان و سەرکەوتن لە کاروباری رۆژی دواییدا، کە ئەمە هەر بۆ فاطمە نیە، بەڵکو بۆ هەموو ئوممەتی ئیسلامە، شیخ الاسلام (إبن تیمیة) دەفەرموێت: هەرکەسێك بەردەوام بێت لەسەر ئەو ذیکرە لە کاتی خەوتندا ئەوا توشی ماندوو بوونی جەستەیی نابێت.

وە لـە دوای وەفـاتـی پێغەمبـەری خواشـدا ﷺ هـەژاری و نـەداری وا لـە فاطمەی کچی پێغەمبەر ﷺو خێزانی ئیمامی علی دەکات کە بچێتە خزمەتی جێنشینی پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی ابوبکر ﷺو فەرموی: ئەی جێنشینی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، بەڕاسـتی هـەژار و نـەدارین و هاتومەتـە لای جـەنابت بەڵکو ئەمر بفەرموویت کەوا ئـەو پارچە زەویـە بـچکۆلەیەی کە باوکم بـەجێی هێشتووە بدرێتـە مـن، چـونکە بـاوکم کـە وەفـاتی کـردووە غـەیری مـن هـیچ ئەولادێکی لـە دوا بـەجێ نـەماوە کە ئـەوەی بـەجێی هێشتووە بۆ ئـەو بێت، ((سبحان الله... ئەمەیە دەوڵەتی قانونی و مەدەنی... کچی پێغەمبەری خوایە ﷺ، بـەڵام بـەبێ ئیزنـی حکومـەت بـۆی نیـە تەصـەڕوف بـە پارچـە زەویـەکی بچکۆلەی باوکیەوە بکات)). بەڵام ئـەمڕۆ هـەر ئەوانـەی کـە ئیـدیعای دەوڵـەتی قانون دەکەن و ڕەخنە لە نیظامی ئیسلام دەگرن و ئیسلام بە کۆنـە پەرستی دەزانـن، بـۆ خۆیـان بـە هـەزاران کێڵگـە و زەوی و خـانوو دەسـتی بـە سـەردا دەگرن و ئەوەی حیسابی بۆ ناکەن و پرسی پێناکەن دەوڵەتی قانوونە!!.

بەڵێ ئیمانـداران، حـەزرەتی ابـوبکر زۆر بـە جـوانی گـوێی بـۆ داواکـانی فاطمەﷺ گرت و پاشان زۆر بە نەرمی فەرموی: ئەی فاطمە من خۆم گـوێم لـە باوکت بـوو کە پێغەمبـەری خوایـە ﷺ کـە دەیفـەرمو:( نَحـنُ معاشِـرَ الأنبيـاء لانُـورِثُ، مـا تركنـاهُ صَدَقة ). واتـە: ئێمـە کۆمـەڵی پێغەمبـەران میراتمـان لێ ناگیرێت و ئەوەی لە دوای خۆمان بەجێی دەهێڵین صـەدەقەیە و خێروخێراتە و دەدرێـت بـە هـەژاران ونـەداران. ئیمـامی ابـوبکر ﷺ فـەرموی: دەی فـاطمـە سـوێند بـە خـوا مـن هـەرگیز کارێـك واز لـێ نـاهێنم کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ کردبێتی، و بە هەموو شێوەیەك هەوڵ دەدەم کە منیش وا بکـەم، چـونکە زۆر دەترسم ئەگەر واز لە شتێك بێنم کە ئەو فەرمویـەتی لاڕێ ببم و بخلیسکێم و ماڵ وێرانی دونیا وقیامەت ببم.

بەڵێ خۆشەویستان: ئەمە وەڵامی حەزرەتی أبوبکر بوو بۆ خۆشەویسترین و ڕێزدارترین کەس لە لای چونکە فاطمە کچی خۆشەویسترین و بەڕێزترین کەسە لای ابوبکر کە پێغەمبەری خوایە ﷺ، هەرچەندە ئیمامی ابوبکر ئەم ڕاستی و حەقیقەتانەی لەبەر چاو بوو:

١.لە پێشترین کەس بۆ ئەوەی چاودێری بکرێت و یارمەتی بدرێت، کچی پێغەمبەری خوایە ﷺ.

٢.ئیمامی ابوبکر دەزانێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ چەندە خاتوو فاطمەی خۆشویستووە، و چۆن دڵی ڕاگرتووە، چونکە تاکە یادگاری کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو ئەولاد بەجێی هێشت تەنها فاطمە بوو، لەبەر ئەوەی هەموو کوڕو کچەکانی لە پێش وەفاتی خۆیدا وەفاتیان کرد.

٣.حەزرەتی ابوبکر رضي الله عنه دەیزانی چەندە فاطمە رضي الله عنها و هاوسەرەکەی و منداڵەکانی پێویستیان بەو پارچە زەویە بچوکە هەیە بۆ داین کردنی بەشێك لە بژێوی ژیانی ڕۆژانەیان.

٤.حەزرەتی ابوبکر دڵی دەگوشرا و زمانی گۆی نەدەکرد کە لە وەڵامی داواکاریەکانی کچی پێغەمبەری خۆشەویستدا ﷺ بە (نەخێر) وەڵام بداتەوە، بەڵام بە (نەخێر)یش وەڵامی دایەوە، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی کە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستوە کە فەرمویەتی: :( نَحنُ معاشِرَ الأنبياء لانُورَثُ ).

کەواتە ئەم فەرمودەیەی خۆشەویست ﷺ بوو بە حوکمێکی شەرعی کە پێغەمبەر ﷺ میراتی لێ ناگیرێت. واتە: ئەم فەرمووده بوو بە ماددەیەکی قانوونی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا.

جا لێرەدا حەزرەتی ابوبکر رضي الله عنه خۆی بینیەوە لە نێوان دوو وەلاء و ملکەچکردندا:

١.ملکەچکردن بەرامبەر داواکانی خۆشەویسترین کەسی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فاطمەیە.

٢.ملکەچکردن بەرامبەر ئەو یاسا و قانونەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی بەرامبەر خۆی و ماڵ و منداڵی خۆی دەریکردووە... ( نەك وەك سەرکردە ماددیەکان کە کاتێك قانونێك دەردەکەن هەر بۆ خەڵکیە نەك بۆ خۆیان و بنەماڵەی خۆیان ).

بەڵام حەزرەتی ابوبکر رضي الله عنه دوودڵیەکەی لابرد و قانونەکەی هەڵبژارد، ئەمەیە سەروەری یاسا، کە بەداخەوە ئێمە هەر ناومان بیستوە و نوسینی سەر وەرەقەیە و بە خەونیش نەمانبینیوە، ئەمجا حەزرەتی ابوبکر بۆ راگرتنی دڵی فاطمە و قەناعەت پێکردنی ناردی بە دوای حەزرەتی عومەر و طەلحەو زوبێر و سەعدی کوڕی وەقاص و عبدالرحمن ی کوڕی عەوف رضي الله عنهم و بەرامبەر فاطمە رضي الله عنها داینیشاندن و فەرمووی: (نَشَدْتُكُم بالذي تقوم السَّماءُ و الأرضُ بأمرِهِ ألم تَعلَموا أنَّ رَسُولَ الله ﷺ قال: "نحنُ لا نورثُ ما تركناهُ صَدَقة"). واتە: سوێندتان ئەدەم بەو خوایەی کە ئاسمان و زەوی بە فەرمانی ئەو راوەستاون ئایا ئێوەش ئاگاتان لێ نیە و نازانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئێمە میراتمان لێ ناگیرێت و ئەوەی لە دوامانەدا بەجێدەمێنێت صەدەقەیە؟. هەمویان فەرمویان: بەڵی وایە. ئەمجا فاطمە بەڵگەیەکی تری پێشکەش کرد و فەرموی: قوربان تۆ دەزانیت کە باوکم لەو پارچە زەویە لە بەرهەمەکەی پێی بەخشیوم، کەواتە: بە حەقی میراتیش بۆ من نەبێت، ئەوا بە حەقی (هیبَة) بەخشین مافی منی پێوەیە. حەزرەتی ابوبکر رضي الله عنه فەرموی: راست دەکەیت وایە، بەڵام من بە چاوی خۆم بینیومە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرهەمەکەی دابەشکردووە بەسەر هەژار و بێنەوا و رێبواراندا، دوای ئەوە بەشی ئێوەی لێدەدا بەقەدەر پێویستی ژیانتان، جا من وای تێدەگەم کە

پێغەمبـەری خـوا ﷺ بۆیـە وای دەکـرد تـا بزانـرێ ئـەم پارچـە زەویـە بـە بەردەوامی بەشی هەژار و نەدارانی تێدایە و بۆ کەس نابێت لەدوای خۆی کە بەرهەمەکەی بخوات. فاطمە ؓ فەرموی: دەی باشە با بەدەسـت ئێمـەوە بێت و بۆخۆمان دایدەچێنین و بەرهەمی لێ هەڵدەگرین و بەشـی هـەژار و نـەدار و رێبـواری هـەژاری لێـدەدەین و بۆخۆشمـان وەکـو زەمـانی پێغەمبـەر ﷺ لێـی سودمەند دەبین...

حەزرەتی ابوبکرؓ فەرموی: بەڵام من ئەمەم پێ باش نیە، لەبەر ئەوەی مـن لێپرسـراوی ئیمانـدارانم لـە دوای پێغەمبـەری خـواﷺ کەواتـە مـن مـافی بڕیـاردانم بـەهێزترە لـە تـۆ و لـە عـەبباس، لێمگـەڕێن بـەو شـێوەیە بـەکاری دەهێنم کە پێغەمبـەری خـوا ﷺ مەبەسـتی بـووە... بـەم شـێوەیە فـاطمـە ؓ قەناعەتی کرد و وازی هێنا.

بە راستی ئەمەیە دەوڵەتی یاسا و سەروەری یاسا، بەڵێ لە ئیسلامدا پلەوپایـە لـە جیـاتی خزمـەت و خـەبات نابەخشرێت بە کـەس، لـە ئیسلامدا کاربەدەسـت ئیمـانی بەوەیـە کـە دەچێتەوە بەردەسـتی خـوای گـەورە و لێـی دەپرسرێتەوە.

ئەحنەفی کوڕی قەیس دەفەرموێت: لە خزمەت عومەری کوڕی خەطابدا بووم، کابرایەك هات بۆ لای و وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران، وەرە لەگەڵم فلان کەس زوڵمی لێ کردووم، لەو کاتـەدا حـەزرەتی عومـەر زۆر مەشغول بوو بە کارێکەوە، بۆیە بە کابرای وت: کە دەڵێم کێ ئیشی پێمـە کـەس قسە ناکات، کە ئێستا مەشغوڵی کـاری موسڵمانانم ئـەمجا ئیشەکەتان دەڵێن، حـەزرەتی عومـەر قامـچیەکەی بـەرزکردەوە و بەسـەری کابرایـدا کێشا، کـابراش بـە تورەییەوە رۆشت و دوورکەوتەوە، ئیمامی عومەر هێواش بۆیەوە و فـەرموی: بـانگی بکەنـەوە. چـون بەشوێنیدا و کـابرا هاتـەوە، ئیمـامی عومـەر فـەرموی: تۆڵەی خۆتم لێ بکـەرەوە، کـابراش وتـی: نـەخێر تۆڵـەت نێناسێنم، حـەزرەتی

عومەر هەرچەند لە بەری پاڕایەوە تۆڵەی لێبکاتەوە، کابرا رازی نەبوو، و پڕ بە دڵ گەردنی حەزرەتی عومەری ئازاد کرد و ڕۆشت، حەزرەتی عومەر هاتە ماڵەوەو دەستنوێژی گرت و ڕوەو قیبلە وەستا و بە خۆی وت: (إبن الخطّاب، كُنتَ وضيعاً فَرَفَعَكَ الله، و كُنتَ ضالاً فَهَداكَ الله، و كُنتَ ذليلاً فأعزَّكَ الله، ثُمَّ حملَكَ على رقابِ النّاسِ، فَجاءَكَ رجُلٌ يَستَعديكَ فَضَربته، فماذا تقولُ لربِّكَ غداً إذا أتيته؟).

واتە: ئەی کوڕی خەطاب، تۆ بێهێز و لاواز و گوم ناوو بێناو بویت، خوای گەورە بەرزی کردیتەوە، و سەرلێشێواو بویت خوای گەورە هیدایەتی دایت، و زەلیل بویت خوای گەورە عەزیز و سەربڵندی کردیت، پاشان بویت بە لێپرسراو بەسەر ئەو خەڵکەوە، ئەمجا کەسێك دێت بۆلات و داوای یارمەتیت لێدەکات و تۆش بە لێدان وەڵامی دەدەیتەوە، ئەی بەیانی چی وەڵامی خوای خۆت دەدەیتەوە؟ کاتێك دەچیتە بەردەمی و لێپرسینەوەت لەگەڵ دەکات؟. ئەمجا دەستی کرد بە گریان.

بەڵێ، دەبێت کاربەدەست ئەمە شیعاری بێت لەگەڵ نەفسی خۆیدا (ماذا تقولُ لربِّك غداً؟). کاربەدەست نابێت منەت بەسەر میللەتدا بکات و ئەو پلە و پایە بە بەرهەمی رەنجی خۆی بزانێت، بەڵکو دەبێت بە ئەمانەتی بزانێت، ئیمامی عومەر چی نەکرد بۆ ئیسلام کەچی دەفەرموێت: ئەوە ئیسلامە منی بەرز کردۆتەوە و گەیاندومیە ئەم پایەیە.

جابا بیر بکەینەوەئایا ئەم ئیسلامە بەکەڵی قانونی حکومەت نایەت؟ ئایا دەبێت بڵێین: جیاکردنەوەی دین لە دەوڵەت، یان دروشمی (جیاکردنەوەی دز و خائین لە دەوڵەت) بەرز بکەینەوە؟!.

ئیمانداران لە کۆتایی ئەم وتارەدا ئاماژە دەکەم بۆ خێر و عیبادەتێکی گەورە کە لەم مانگی محەڕەمەدا دەکرێت، کە بریتیە لە ڕۆژوو، چونکە ڕۆژووی ئەو مانگە زۆر خێرە و لە دەستی مەدەن، حەزرەتی ئەبوهورەیرە ﵁

**لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی:** (افضَلُ الصِّيامِ بعدَ رمضان شَهرُ المُحرَّم، و أفضلُ الصَّلاة بعد الفَريضةِ صَلاةُ اللَّيلِ) رواه مسلم.

**واتە: خێرترین رۆژوو لە پاداشتدا دوای رەمەزان، رۆژووی مانگی موحەڕەمە، و خێرترین و گەورەترین نوێژ دوای نوێژە فەرزەکان، نوێژی شەونوێژە. و بە تایبەتی رۆژی (١٠)ی مانگی موحەڕەم لە دەست خۆتان مەدەن، با گوێ بگرین لە پێغەمبەری خوا ﷺ کە چی فەرموە لە بارەی گەورەیی رۆژووی دەی مانگی موحەڕەم کە ناسراوە بە رۆژی (عاشوراء).**

عن أبي قتادة أن رسول الله ﷺ سُئِلَ عَن صيامِ يومِ عاشوراء، فقال: يُكَفِّرُ السَّنة الماضية. رواه مسلم. **واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی رۆژووی (١٠)ی مانگی موحوڕەم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: دەبێتە هۆی سڕینەوی گوناهی ساڵی رابردوو.**

**و عبدالله ی کوڕی عەبباس ﷺدەفەرموێت:** أنَّ رسول اللّه ﷺ صامَ يومَ عاشوراء و أمَرَ بصيامهِ. رواه البخاري.

**واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆخۆی رۆژی (١٠)ی مەحەڕەم بەرۆژوو دەبوو، و فەرمانی بە موسڵمانانیش کرد کە بەڕۆژوو بن.**

**لە بارەی رۆژووی (٩)ی مانگی موحەڕەمیش کە پێی دەوترێت (تاسوعا)، ئەم فەرمودەیە باس دەکەین:** عن إبن عبّاس ﷺ قال: قال رسول الله ﷺ ( لئِنْ بقيتُ الى قابلٍ لأصُومنَّ التاسِعَ) رواه مسلم.

**واتە: ئەگەر بمێنم ساڵی داهاتوو، رۆژووی (٩)ی موحەڕەمیش بەڕۆژوو دەبم.**

**بەڵام پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد و رۆژووەکەی (٩)ی مانگی موحەڕەمی نەگرت، بەڵام مادەم فەرمویەتی تێیدا بەرۆژوو دەبم، کەواتە رۆژووی (٩)ی مانگیش زۆر گەورەیە و هەرکەسێك توانای بەڕۆژوو بوونی هەیە با (٩)ی**

مانگ و (١٠)ی مانگی موحەڕەم بەڕۆژوو بێت و ئەگەر توانی ڕۆژووی تریش زۆر بگرێت لە مانگی موحەڕەمدا.

بە ئومێدی ئەوەی خوای گەورە لە هەموو تاوان و گوناهەکانمان ببورێت بە لوتف و ڕەحمەتی خۆی.

**سەرچاوەکان:**


١.قورئانی پیرۆز.

٢.فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ.

٣.بەرەو ئیسلام – ئازادی، لاپەڕە ٩٢، ئەندازیار عُثمان محمد.

٤.السيرة النبوية – د. على محمد الصَلابي – ج١ ، صفحة ٤٠٤

٥.منهاج المسلم –أبوبكر الجزائيري، صفحة ٤٢٦

٦.ئاشتینامە – ئامینە صدیق عبدالعزیز – لاپەڕە ٨٦

٧.على خُطى الحَبيب – عمرو خالد – ص٧٩

٨.خُلَفاء الرَّسول ﷺ – خالد محمد خالد – ص ٦٥

# وتاری دووەم بۆ مانگی مُحرَّم
# چاوپێکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ بە هۆزەکان پێش کۆچکردنی بۆ مەدینە.

( الحَمدُ للّٰهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

لە دوای سوپاس و ستایش بۆ خوای تاك و تەنها و بێ شەریك، وە صەلات و سەلام بۆ سەر ڕۆحی پیرۆزی سەرداری پێغەمبەران،خۆشەویستمان، شەفیعی مەحشەرمان، حەزرەتی (محمد المصطفى ﷺ) ، رەحمەت و لێخۆشبوونی خوا بۆ ڕۆحی صەحابە دڵسۆزەکان، کە لە هەموو ساتە سەخت و دژوارەکاندا، لە خزمەت پێغەمبەرﷺ بوون و بۆ چرکە ساتێك دوودڵی ڕووی تێنەکردوون، خوای گەورە ئێمەش لەسەر ڕێبازی ئەوان دامەزراو بکات إنشاءَ الله . . . أللّٰهُمَ آمين.

***ئیمانداران:***

هەر لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ داین و گەیشتینە هەوڵی چوارەمی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەك و شوێن و خەڵکێکی گونجاو کە ئیسلام و موسڵمانان لە خۆیان بگرن و پشتیوانی لە دینی خوا بکەن، ئەوە بوو لەم هەوڵ و گەڕانەدا، پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆلای طائفەیەکی تر لە بەنی عامر کە ئەو کاتە سەرۆك هۆزەکەیان لەوێ نەبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی بۆ کردن و باسی ئیسلامی بۆ کردن و ئەوانیش زۆر جوان گوێیان بۆ گرت و پێشوازی و پشتیوانیان لێکرد، دانیشتنێکی زۆر خۆش بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر دڵخۆش بوو، بەڵام لەو ساتەدا سەرۆك هۆزەکەیان کە ناوی (أُجرة بن قَيس)بوو، هاتەوە و پێغەمبەری خوای

ﷺ بینـی زۆر بـە زمـانێکی زبـر و ناخۆشـەوە وتـی: مَـن هـذا؟ ئەمـە کێیـە؟ نەیگوت: بەخێربێیت جەنابت کێیت؟قەومەکەی گوتیان: ئەوە محمدی کوڕی عبدالله ی قوڕەیـشیە. وتـی: جا چی ئێوە و ئەوی بە یەکەوە کۆکردۆتـەوە؟ وتیـان: (یَزعَمُ أنهُ رَسولُ الله، و یُریدُ بنا المَنعَةَ و الحمایَةَ حتی یَبلُـغَ رسـالةَ رَبِّـه) واتـە: دەڵێت کە من پێغەمبـەری خـوام و داوای لـە ئێمـەش کـرد کـە پشتی بگـرین و پارێزگاری لـێ بکـەین تـا ئـەو کاتـەی کە پـەیامی خوایەکـەی دەگاتـە لوتکـە و سەرکەوتن. ئوجرەی سەرکردە وتی: ئـەی ئێوە چیتان وەڵام دایـەوە؟ وتیـان: ئێمەش قسەکانی بە راست دەزانین و وتمان لەگـەڵت دەبین و پشتیوانیت لـێ دەکەین، ئوجرە وتـی: (والله ما رأیتُ أحد یرجِعُ مِن مِنی بِـشَرٍّ مِمّـا سـترجعونَ بِـهِ إذا أخَذتُم هذا الرَّجُل) واتە: سوێند بە خوا هیچ کەس نابینم کە لـەم شوێنەوە کە خاکی (مینا)یە بە شەڕ و بەڵایەکەوە بگەڕێتەوە خراپتر لەوەی کە ئێوە پێوەی دەگەڕێنەوە، ئەگەر بێتوو ئەم پیاوە بگرنە خۆتان.

ئەمجا زۆر بێ ئەدەبانە ڕوی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ و پێی وت: (قُمْ یا فَتی وَ ألحِقْ بقَومِكَ، والله لَولا أنَّكَ في رحالنـا لَـضَرَبتُ عنقـك). واتـە: هەستە ئـەی گـەنج، بـڕۆرەوە بـۆ نـاو هۆزەکـەت، سـوێند بـە خـوا ئەگـەر لـە نـاو ئێمـە و عەشیرەتی خۆماندا نەبویتایە لە گەردنم ئەدایت و دەمکوشتیت!!.

پێغەمبــەری بــەڕێز ﷺ زۆر بــە خەفــەتباری و مەحزونیــەوە هەســتا و ڕۆیــشت و سـواری پـشتی حوشـترەکەی بـوو، بـەڵام هێـشتا لەسـەر پـشتی حوشترەکەی خۆی قایم نەکردبوو کە ئوجرەی بێ ویژدان و دڵ تاریك دارێکی لە حوشترەکە ژەنی و حوشترەکە هەڵبەزیەوە و پێغەمبەری خوای ﷺ فڕێدا و بـە سـەردا کەوتـە خـوارەوە و زۆری ئـازار پێگەیـشت، ئـوجرەی بـەدکاریش دوای ئەم جەریمەیەش کە ئازاری لاشەی پێغەمبەری ﷺ دا بەوەوە نەوەستا و ئازاری دەرونیشی داو (فَضَحِكَ ضَحكاً شَدیداً) دەستی کرد بە پێکەنین بەڵام

پێکەنینێکی زۆری بە قاقا،بە شێوەیەك پێدەکەنی و قاقای دەکێشا، هەموو ئەو ناوەی هێنابووە تەماشای پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەڕێزان، ئەم دیمەنە بخەنە بەرچاوتان، بزانن لە پێناوی ئیسلامدا ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەمان ﷺ چەند ئازار درا، ئێمە ئەمڕۆ هاتوینەتە سەر سفرەی حازر، دەبا قەدری ئیسلامەکەمان بزانین.

بەڵێ، کەس لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ نەهاتە جواب، تەنها ژنێکی بەنی عامر نەبێت کە لە مەککەدا شوی کردبوو، بە نهێنی موسڵمان ببوو، هاتبوو سەردانی خزمەکانی بکات کە بۆ حەج هاتبوون، کە ئەم دیمەنە دڵتەزێنە ویژدان هەژێنەی بینی، خۆی بۆ ڕانەگیرا و هاواری کرد: (يـا بَـني عامِر، ولا عامِرَ لَكُمْ، أيَحدث ذالِكَ لِرَسولِ الله في رِحالِنا). واتە: ئەی نەوەی عامر، کە ناوی هۆزەکەتان لە ئاوەدانیەوە هاتووە، دەی یاخوا ئاوەدان نەبن، ئەوەی ئێوە کردتان بە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو چادرەکانی خۆماندا ئاوەدانیتان بۆ ناهێڵێتەوە لەسەر زەویدا. بە قسە و هاواری ئەم ژنە سێ گەنجی جوان پاڵیان بە ئوجرەوە ناو لە پێغەمبەری خوا یان ﷺ دور خستەوە، دوو کەسیش لەسەر ئوجرە هەڵیان دایە و بوو بە شەڕیان، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی تێ کردن و فەرموی: (أللهم بارِكْ في هؤلاءِ ـالـذِينَ دافَعُـوا عَنـهُ ـ وَانْـتَقِمْ مِـن هؤلاءِ ـ أُجرة و أعوانهاـ). فەرموی: یا ڕەبی خوایە بەرەکەت بخەیتە تەمەن و ژیانی ئەم سیانەوە –مەبەستی ئەو سێ گەنجە بوو کە دیفاعیان لێکرد– ، وە فەرموی: خوایە تۆڵەش لەم سیانە بکەیتەوە –مەبەستی ئوجرە و ئەو دوو کەسە بوو کە پشتیوانیان لێ کرد. دوعا و پاڕانەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەت بونەوەی نیە و سەرەنجام پاش ماوەیەك ئەو سێ گەنجەی دیفاعیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد موسڵمان بوون و بە شەهیدی چونەوە لیقای پەروەردگاریان، و ئوجرەش بە خراپترین جۆری مردن مرد و هەموو لاشەی

بوو بە برین و بۆگەنی کرد و کەس نەیدەتوانی لێی نزیك بێتەوە، ئەوە بوو لەبەر بۆگەنی لاشەی کەس نەیوێرا کفن و دفنی بکات و بیرێکی قوڵیان بۆ هەڵکەند و فرێیان دایە ناو بیرەکەوە و بە قولاپ رایان کێشا تا دەمی بیرەکە، وە ئەو دو کەسەش کە دیفایان لە ئوجرە کرد ئەوانیش بە مردنێکی خراپ مردن و لە ناو چوون.

کەواتە هەوڵی چوارەمیش سەرکەوتوو نەبوو لە بەدەست هێنانی ئامانجی دانیشتنەکەدا، بەڵام کۆمەڵێك دەرس و وانەی گەورەی لێ وەردەگیرێت:

<u>یەکەم:</u> ئەم دینە هەر وا بە ئاسانی نەگەیشتۆتە دەستی ئێمە و بە موعجیزە نەگەیشتوە، بەڵکو رەنج و خوێن و ئازاری زۆری لە پێناودا چێشتراوە، بە تایبەت پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەوەتا لەم کاتی بانگەوازەی هۆزەکاندا بە سەختترین ئازاری دەروونی و جەستەیی ئازار دەدرێت، ئازاری دەروونی دەدرا بەوەی کە زۆرێك لە هۆزەکان کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی پێ دەناساندن لە وەڵامدا دەیانگوت: (غُلامُ بَني هاشِم الّذي يَزعَمُ انَهُ رَسُول). دەیانگوت: ئەو کوڕەی نەوەی هشم کەوا گومان دەبات پێغەمبەرە... بە سەرداری هەموو پێغەمبەران وا دەگوترێت و بە بچوککراوەیی ناوی دەبرێت، بۆ زانینی ئازاری جەستەییش ئەوە نمونەی ئوجرە یەکێکیانە و ئەوانی تریش با بچینە خزمەت ئیمامی بوخاری رحمه الله کە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: مُدرك بن مُنيب لە باوکیەوە، لە باپیریەوە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (رأيتُ رَسولَ اللهِ ﷺ في الجاهِلِيَّةِ وهُوَ يَقولُ: يأيُّها النّاسُ قولوا: لا إلـهَ إلاّ اللّهُ تُفلَحوا). واتە:ئەی خەڵکینە ئەمە بڵێن: لاالـه الا الله "هیچ مەعبود و پەرستراوێك نیە جگە لە الله" ئەمە بڵێن بە دڵ و بە زمان ئەوا سەرفراز دەبن، وەڵامی لە لایەن ئەو خەڵکەوە بەو شێوەیە دەدرایەوە: (فَمنهُم مَنْ تَفَلَ في

وجهِهِ و مِنهُم من حثا عَلَيه التُراب، و منهُمْ مَنْ سبَّه، حَتَّى إنتَصَفَ النَّهار).
واتە: هەندێك لەو خەڵكانە تفیان لە رووی موبارەكی دەكرد، هەندێكیان وەڵامیان بەوە بوو كە گڵ و خۆڵیان بە رووی موبارەكیدا دەپژاند، هەندێكیان جنێویان پێ ئەدا، هەتا ناوەراستی رۆژ، واتە: نیوەڕۆ، ئەمجا كچێك دەهات بۆ لای و دۆلكەیەك ئاوی پێ بوو، دەموچاوی پێغەمبەری خوای ﷺ دەشت و ئاوی بە دەستا دەكرد و پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: (یا بُنیە، لا تَخْشی علی أبیك غلَبة ولا ذِلَّة). واتە: ئەی رۆڵەكەم مەترسیت نەبێت بەرامبەر باوكت.
گێرەرەوەی باسەكە دەڵێت: پرسیم ئەوە كێیە؟ قالوا: زینَب بنت رسول الله ﷺ.
وتیان: ئەوە زەینەبەی كچی پێغەمبەری خوایە ﷺ. (البُخاري في التاريخ الكَبير).

<u>وانەی دووەم:</u> ریش سپی و سەرۆك هۆز و لێپرسراو و سەركردەی خوا نەناس و نەفام و كورت بین و خۆبەزلزان، چەند مایەی نەگبەتی و نەدامەتی دونیا و قیامەتە بۆ گەل و میللەت و قەوم و شوێن كەوتوانی، ئەوەتا بە هۆی چارە رەشی و تەكەبورر و دڵ كوێری ئوجرەوە بوو، ئەو هۆزە موسڵمان نەبوون، ئەگینا پێشتر كە ئەو نەهاتبۆوە ناویان، بریاریان دابوو كە پشتیوانی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بكەن، ئوجرە ئەو فرسەتە گەورەیەی لە دەستی قەومەكەی دا كە هەرگیز دەستیان نەكەوتەوە... بەڵێ بە هۆی سەركردەی خۆبەزلزان و دڵرەقەوە بوو كە زۆری ئەهلی مەككە بونە دژی ئیسلام، ئەویش بە هۆی ترساندن و هەرەشە و دیعایەی بوختانـاوی، ئەبولەهەب و ئەبوجەهل و هاوشێوەكانیان لە سەركردەكانی قورەیش، ئەوەتا كاتێك ئەو سەركردە خراپانە نەمان، گەنجەكانیان موسڵمان بوون، هەروەها خەڵكی طائف بەهۆی سەركردەكانیانەوە توشی ئەو جەریمە گەورەیە بوون، كە بوو بە پەڵەیەكی رەش لە مێژووی ئەهلی طائف دا، كە ئەوش بەردباران كردنی پێغەمبەر ﷺ بوو، چونكە كە سەركردەكانیان لە ناوچوون، بۆخۆیان

و بە پێی خۆیان دەهاتن و ئیمانیان دەهێنا، ئەمڕۆش کە ڕۆڵەکانی میللەتێك لە گەنج و تازە پێگەیشتوان دەبنە دوژمنی ئیسلام، هەمووی هی خراپی بەرپرس و کاربەدەستە گەورەکانە، بە ڕاگەیاندنیان، بە پارە و سامانیان، بە دەیان شێوە و شێواز سەر لە گەنج و لاوەکان دەشێوێنن، ئەگینا ئەو خەڵکە فطرەتی پاکە و کە ئەو نالەبارانەی لە ناودا لاچوو دەگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، جا ماڵ وێران ئەو میللەت و گەلەی کە سەرکردەی وەکو ئەبوجەهل و ئەبولەهەب و ئوجرە و ئەمثالی ئەوانی هەبێت، خۆ ئەگەر ئەبوجەهل نەماوە، بەچکە و شاگردی زۆری لە دوای خۆی بەجێهێشتووە بۆ دژایەتی ئیسلام، جا با گەنج و لاوەکان بەتایبەت و میلەت بە گشتی بزانێت، کە هەر مەسئول و سەرکردەیەك دژایەتی ئیسلام و محمد المصطفی ی کرد هەر ئەبوجەهل و ئوجرەیە و بەلام لە زەمان و زەمینێکی تردایە و بە زمانێکی تر قسە دەکات.

<u>وانەی سێیەم:</u> لە ناو کافر و بێبڕوایانیشدا ئەوانەی ڕۆژێك قسەیەکی خێریان بۆ ئیسلام و موسڵمانان کردبێت، دیفاعێکیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کردبێت، بە دڵنیایەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو هەڵوێستە فریایان کەوتوە و ئیمانیان هێناوە، بە پێچەوانەشەوە ئەو بێ بڕوایانەش کە توند و تیژ بوون بەرامبەر موسڵمانان بە گشتی و بەتایبەت بێ ئەدەبیان بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ کردووە، هەر لە دونیادا توشی توندترین سزا بوون و بە پیسترین شێوە لە دونیادا دەرچوون... نمونە لەسەر بەشی یەکەم:لەم باسەدا ئەو سێ گەنجەی کە دیفاعیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و ئوجرەیان لێ دوور خستەوە، هەرچەندە کافریش بوون بەلام خوای گەورە ئەم هەڵوێستە و ئەم بەرگریەیان لە رسول الله ﷺ لێ وەرگرتن و سەرەنجام خەلاتی ئیمانیان وەرگرت و بە پلەی بەرزی شەهیدیەوە چونەوە لیقای خوای گەورە.

بەڵێ، هەرکەسێك ڕۆژی لە ڕۆژان دڵسۆزیەکی بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا نواندبێت، ئەوە خوای گەورە پاداشتی داوەتەوە با ئەو کەسە کافریش بوبێت، با نمونەیەکتان بۆ باس بکەم:

هەر لە قۆناغی مەککەداین، حەزرەتی خەدیجە وەفاتی کردبو، فاطمەی کچی منداڵێکی (٦-٧)ساڵان بوو، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە ماڵ چوە دەرەوە و دوابەدوای ئەو ئەبوجەهل هات بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و لە دەرگای دا، فاطمەش چوو دەرگای لێ کردەوە کە ئەوکات فاطمە کچێکی بچکۆلە بوو، ئەبوجەهل بە ڕووی گرژ و زمانێکی زبرەوە وتی: اینَ ابوك؟ باوکت لە کوێیە؟فاطمە فەرموی: باوکم چۆتە دەرەوە و لە ماڵ نیە، ئەو دوژمنی خوا و پێغەمبەرە ﷺ و بە هەموو هێزێکی زللەیەکی لە پەنا گوێی فاطمە دا و خستی بە زەویدا، پاشان ڕۆیشت... فاطمە زۆر بەزەیی بە خۆیی و باوکیدا هاتەوە و بە کوڵ دەکریا، ئەبوسوفیان بەویادا تێپەڕی و کە فاطمەی بینی بەزەیی پێدا هاتەوە (هەرچەندە ئەبوسوفیان کافریش بوو) پرسی: فاطمە ئەوە بۆچی دەگریت؟ فاطمە فەرموی: ئەبو جەهل هات بۆ ماڵمان و پرسی باوکت لە ماڵە؟ منیش وتم: نەخێر، ئیتر بە هەموو هێزی زللەیەکی لێدام، ئەبوسوفیان فاطمەی لە باوەش گرت و بردی بۆ ماڵی ئەبوجەهل و لە دەرگای دا، ئەبوجەهل دەرگای کردەوە، ئەبو سوفیان بە فاطمەی وت: دەی ڕۆڵە زللەیەکی لێ بدەوە، فاطمەش بە دەستە بچوکەکانی بە رومەتی ئەبوجەهلی کێشا و دڵی سوکنایی هات و ژێر بۆوە، ئەبوجەهل نەیتوانی هیچ بڵێت چونکە ئەبوسوفیان یەکێك بوو لە سەرکردە دەسەڵاتدار و بەناوبانگەکانی مەککە، بۆ ئێوارە کە پێغەمبەری خوا ﷺهاتەوە بۆ ماڵەوە، فاطمە خۆی خستە باوەشیەوە، فاطمە بەسەرهاتەکەی بۆ باوکی گێڕایەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی لە ئاسمان کردو هەردوو دەستی بەرز کردەوە و

فەرموی: (اللّهُمَّ لاتنسِها لأبي سُفيان). واتە: خوایە ئەم چاکەیەی ئەبوو سوفیان بێتەوە رێگای، خوای گەورەش دوعاکەی گیرا کرد و ئەم چاکەیە هاتەوە رێگەی و لەگەڵ ئەوەدا کە بیست ساڵی ڕەبەق دوژمنایەتی پێغەمبەری خوایﷺ کرد بەڵام لە دوایدا موسڵمان بوو، لەو هەموو جەنگەدا دژی پێغەمبەری خوا ﷺ چ وەکو سەرباز چ وەکو فەرماندە بەشداری کرد نە کوژرا و نە بریندار بوو لە کاتێکدا ئەبوجەهل و ئومەیە و عوقبەی کوڕی موعیط هەمویان کوژران و بە بێ ئیمانی سەریان نایەوە، کاتێك موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو چاکەیەی هەر لە بەرچاوو بوو، سوپاسی زۆری کردوو بە بیری هێنایەوە دوای ئەو هەموو ساڵە...

ئیماندارانی بەڕێز: نمونەش لەسەر جۆری دووەم کە دژایەتی پێغەمبەری خوایان کردووە و بێ ئەدەب بوون بەرامبەری، چۆن بوون بە پەندی زەمانە و بێ حورمەت بوون هەر لە دونیادا پێش قیامەت، لەم نمونەیەدا (ئوجرة) هەرچەندە سەرۆك هۆز بوو، بەڵام ئەم گاڵتە پێکردنەی لێ بەسەرەوە نەچوو، کاتێك کە خەریك بوو بمرێ، لاشەکەی بە زیندویی بۆگەنی کرد، کە مردیش کەس نەیدەتوانی لێی نزیك بێتەوە، لە جیاتی قەبر و مەراسیمی ناشتن، هەندێك لە خزمە هەرە نزیکەکانی بۆ ئەوەی لەو لاشە بۆگەنە ڕزگار بن، بیرێکی قوڵی وشکیان دۆزیەوە و ئوجرەیان بە گوریس راکێشا، چونکە کەس لەبەر بۆگەنی لاشەی نەیدەتوانی لێی نزیك بێتەوە و هەڵی بگرێت، فڕێیان دایە ناو بیرەکەوە و بەرد و گڵیان تێ کرد تا بیرەکەیان پڕ کردەوە..

یەکێکی تر لە دوژمنە سەرسەختەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ (ابو لَهَب)بوو، ئەویش بە هەمان شێوە بە بۆگەنی مردوو ئەویشیان راکێشا و بەرد

**و گڵیان خستە سەری تا وەکو دایانپۆشی، هەر لە دنیادا خوای گەورە کردی بە پەند و عیبرەت.**

**لە مێژودا نمونە زۆرن کە دوژمنانی ئیسلام و شەخصی پێغەمبەر ﷺ عبرەتی پێ وەر بگرن، بەڵام ئەوانە زۆر چاو قایمن، بێخود دەفەرموێ:**

پێستی چاوی هێند قایمە شمشێری میسری نایبڕێ

بێت و بیکەیتە پێڵاوێ تا قیامەت نادڕێ

**لەم چەند ساڵەشدا ئەو دانیمارکیەی کە وێنەی پێغەمبەری خوای ﷺ کردبوو بە کاریکاتێری گاڵتە پێکراو، لە ناو ژوورەکەیدا کەس نەیزانی چۆن ژوورەکەی ئاگری گرت و سوتا و بوو بە عیبرەت، هەر لە دونیادا پێش قیامەت، ئەگەر دەستی موسڵمانانیشی نەگەیشتێ ئاگر کە سەربازێکی گوێڕایەڵی خوای پەروەردگارە سوتاندی و کردی بە پەندی زەمانە.**

**ئیمانداران: تا ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو هەوڵەکانی چ ئەوانەی هەر گوێی لێ نەگیرا، چ ئەوانەی گوێی بۆ راگیرا، بەڵام بەو شێوەیەی کە باسمان کرد وەڵامی درایەوە و بێ ئەنجام بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەر بەردەوام دەبێت لەسەر بانگەوازەکەی و بێ ئومێد نابێت و هەوڵی پێنجەم دەدات.**

**<u>هەوڵی پێنجەم:</u> پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئیمامی ئەبوبکر و ئیمامی عەلی رضي الله عنهما بەلای خەیمەیەکی گەورەدا رۆشتن، خەڵکێکی زۆری تێدا بوو، بەڵام زۆر بێدەنگ و ئارام بوون، دیار بوو زۆر بە ئیحتیرام و بەرێزن، ئیمامی ئەبوبکر رضي الله عنه چوە پێشەوە لێیان و فەرموی: ئێوە کێن؟ وتیان (شَیبان بن ثَعلَبة)، حەزرەتی ئەبوبکر رضي الله عنه هاتەوە بۆلای پێغەمبەر ﷺ و بە دڵخۆشیەوە فەرموی: (بأبي و أمي، هؤلاءِ غَرَرُ النّاسِ لَو آمَنَتْ هذه القبيلَة لأعَزَّنا اللهُ بِهِم).**

**فەرموی: باوکم و دایکم بەقوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمانە لە**

بەهێزترینی خەڵکین، ئەگەر بێت و ئەم هۆزە ئیمان بێنن خوای گەورە عیززەتدارمان دەکات بەهۆی پشتیوانی ئەمانەوە.. چاوت لێیە چۆن ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ نەسەب و بنچینەیان دەناسێت، ئەمجا ئیمامی ئەبوبکر فەرموی: کێ سەرکردەتانە؟ وتیان مَفروُق. حەزرەتی ئەبوبکرﷺ فەرموی: كَيفَ العَدَدُ فيكُم؟ ژمارەتان چۆنە و هێزتان چەندە؟ مەفروق وتی: لە هەزار زیاترە، حەزرەتی ابوبکرﷺ فەرموی: لە جەنگدا چۆنن؟ مەفروق وتی: هەرکاتێك رقمان هەستا و چوینە بەرامبەر دوژمن لەو کاتەدا ئەمە یاسامانە: (إنّا لَنُؤثر الجيادَ على الأولاد، و السَّلاحَ على اللّقاح، والنَّصرُ من عند الله، يُديلنا مَرَّةً، وَيديل عَلَينا أُخرى).. واتە: ئێمە ڕێزی ئەسپەکانمان ئەدەین بەسەر منداڵەکانماندا، و شمشێر و چەکەکانمان بەلاوە گرنگترە لە کشتوکاڵ و زراعەت، واتە لە کاتی جەنگدا بیر لە ماڵ و منداڵ و پارە و سامان و کشتوکاڵ ناکەینەوە، بۆ ئەوەی پشتمان لە هێرش کردنە سەر دوژمن سارد نەبێتەوە و پاشانیش سەرکەوتن هەر بەدەست خوایە و جارێك سەردەکەوین و جارێکیش دوژمن بەسەرماندا سەردەکەوێت...

تەماشاکەن هۆزێکی چەند زیرەکن و چەند قسە جوانن، ئازا و بەجەرگ و فیداکارن، بەڵام لە خۆبایی نین، ئەمجا مەفروق سەیرێکی پێغەمبەری خوایﷺ کردو وتی: وائەزانم تۆ لاوە قورەیشیەکەی؟ ئیمامی ئەبوبکر ﷺ وەڵامی دایەوە: (إن كانَ بَلَغَكُم، أنَّهُ رَسُولُ الله ﷺ فَها هُوَذا). واتە: ئەگەر دەنگوباسی ئەم پێغەمبەرەتان پێگەیشتوە، ئەوە خۆیەتی و پێغەمبەری خوایە، مەفروق ڕوی کردە پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: (إلأمَ تَدعُونا يا أخا قُرَيش) واتە: ئەی برای قورەیشی پەیامت چیە و بۆ چ شتێك بانگمان دەکەیت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ( أدعُكُم الى شَهادة أن لاإله إلاّ اللّه وَحدَه لا شَريكَ لَه، وأنّي عَبدُ اللّهِ و رَسُولُهُ و الى أن تُؤوني وَ تَنصُرُني) واتە: بانگتان

دەکەم بەوەی کە شایەتی بدەن بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە -الله- کە خوایەکی بەتەنها و بێ شەریکە و منیش بەندەی خوا و پێغەمبەری خوام، و بانگتان دەکەم بۆ ئەوەی کە پشتیوانیم لێ بکەن و هاوکاریم بکەن بۆ سەرخستنی ئەم ئیسلامە. ئەمجا ئەوەی بۆ ڕوون کردنەوە کە بۆچی داوای هاوکاری و پشتیوانیان لێ دەکات، فەرموی: (فَإنَّ قُرَيشاً قَد تَظاهَرَتْ على اللهِ، وَ كذبَت رسولَه، واستَغنَت بالباطِلِ على الحَقِّ). واتە: چونکە بەڕاستی قوڕەیش دژایەتی خوا دەکەن و پێغەمبەرەکەی بە درۆ دەخەنەوە و خۆیان بێنیاز کردووە لە حەق و ڕاستی و پەنایان بۆ باطل و چەوتی بردووە، ئەمجا فەرموی: (و اللهُ هو الغَنيُّ الحَميد) خوای گەورە بێ ئیحتیاج و دەوڵەمەند و بە دەسەڵاتە. ((واتە پێغەمبەر ﷺ نەپاڕایەوە و بفەرموێت سەری هەموو دونیام لێ گیراوە، نەخێر، بەڵکو فەرموی: خوای گەورە پشتیوانم دەکات و ئەم ئیسلامە سەردەخات)).

مەفروق وتی: (وإلامَ تَدعوا أيضاً يا أخا قُرَيش، فَوَالله ما سَمِعْتُ كَلاماً أحسَنَ مِن هذا؟). واتە: ئایا بۆچی تر بانگمان دەکەیت و بانگەوازی خەڵکی دەکەیت، ئەی برای قوڕەیشی؟، سوێند بە خوا من هەرگیز قسەی لەمە جوانترم نەبیستووە. پێغەمبەری خوا ﷺ لە وەڵامدا دەستی کرد بە خوێندنەوەی قورئان کە دەفەرموێت:﴿ قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ الانعام:١٥١

مەفروق بە بیستنی ئەم قورئانە رەنگی کرایەوە و قورئان کاری تیٚ کرد و وتی: دەی بزانم بۆ چی تر بانگمان دەکەیت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ قورئانەکەی تەواو کردو فەرموی: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۖ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَإِذَا قُلْتُمْ فَٱعْدِلُوا۟ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۖ وَبِعَهْدِ ٱللَّهِ أَوْفُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ الانعام١٥٢

مەفروق بە سەرسوڕمانەوە وتی: دەی بۆچی تر بانگمان دەکەیت؟... ئەها قورئان چەند کاریگەرە!. وە تەماشاکەن پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن قورئان دەگەیەنێت. هەمووی بە یەکەوە بۆ نەخوێندەوە، بەڵکو یەك ئایەتی دەخوێندەوە و بێدەنگ دەبوو تا بەرامبەرەکەی بە تامەزرۆییەوە داوای هی تر کات... پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ﴿وَأَنَّ هَـٰذَا صِرَٰطِى مُسْتَقِيمًا فَٱتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾ . الانعام:١٥٣

ئیمانداران، ئەی ئەو کەسانەی کە دەتانەوێت چاکتر لە ژیاننامەی پێغەمبەرەکەتان شارەزا بن و هەنگاو بە هەنگاو شوێنی بکەون، سەرنجی ئەو مەوقیفەی بدەن لەگەڵ مەفروقی سەرکردەدا، تەماشا بکەن چۆن لەو هەموو قروئانەی کە لە مەککەدا بۆی هاتووە، کوێی قورئانی هەڵبژارد ، مەفروق ئەیەوێت لەم ئیسلامە، و هەدەفەکانی تێبگات، پێغەمبەری خواش ﷺ بە کەلامی خوا کە قورئانی پیرۆزە وەڵامی دایەوە و مەقاصیدی ئیسلامی بۆ باس کرد، واتە: ئەوەی تێگەیاند کە ئەصلی ئیسلام بۆ ئەم (پێنج) شتە هاتووە:

١.حِفظ الدِّین: پاراستنی عەقیدەو باوەڕ:( أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ).

٢.حفظ النَّفس: پاراستنی نەفس و ڕۆحی مرۆڤ لە کوشتن و لەناوبردن (وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَـٰدَكُم مِّنْ إِمْلَـٰقٍ ) و ئایەتی ( وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ).

٣.حفظ النَّسَل: پاراستنی وەچە و نەوە و خستنەوەی نەوەی حەڵاڵ زادە و دوور لە داوێن پیسی: (وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ).

٤.حفظ المال: پاراستنی ماڵ و سامان: (﴿وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ) یان ئایەتی (وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ).

٥.پاراستنی عەقڵ و ژیری: بەجێبەجێ کردنی ئەو چوار ئامانجەی تر کە باسمان کردن، چونکە بە بێ بوونی ئەمانە عەقڵ و ژیری مرۆڤ جێگیر و ئاسودە نابێت، بۆیە فەرموی: ( لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ).

سبحانَ الله لە گەورەیی قورئان، هەدەفی ئەم ئیسلامە لە چەند دێڕێکدا باس دەکات، ئایا چ دین و بەرنامەیەك غەیری ئیسلام شتی وای هەیە؟..

مەفروق وتی: (دَعَوتَ والله الی مكارمِ الأخلاق، وَ مَحاسنِ الأعمال، ولَقَد أفكَ قومِ كَذّبوكَ، و ظَاهرُوا عَلَيكَ).. وتی: سوێند بەخوا بانگەواز دەکەیت بۆ لای لوتکەی ڕەوشتە جوانەکان و کردەوە پەسەندەکان، لەناوچون بۆ ئەو هۆزەی کە بەدرۆت ئەخاتەوە و لوت بەرزی ئەکات بەرامبەرت.

سەرنج بدەن ئیمانداران، پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ئەخلاقە جوانەکانی بۆ مەفروق کرد، کە هەموو خەڵکێکی بە ویژدان و هەست زیندوو حەزی پێیەتی و دیفاعی لێ دەکات.

ئەم قەومی بەنی شەیبانە، سێ سەرکردەیان هەبوو، بەڵام زۆر تەبا و بەرێز بوون لە ناو یەکتردا، یەکەمیان ناوی مەفروق بوو، کە باسمان کرد، کاتێك مەفروق لە قسەکانی بۆیەوە، ئینجا وتی: ئەوەش (هانئ بن قبیصة)یە، (شَیخُنا و صاحب دیننا)گەورەمانە و خاوەن باوەڕمانە و مامۆستامانە، با بزانین ئەو قسەی چیە؟ هانئ وتی: ئێمە ئەی محمد بەیەك دانیشتن لەگەڵ تۆدا واز لە دینی خۆمان بێنین و بێینە سەر دینی تۆ بە چاکی نازانم، چونکە (إنَّ الزَّلَّةَ مَعَ العَجَلَة)واتە: خلیسکان و بە هەڵە چوون لە بڕیاری پەلەدایە، بۆیە داوات لێ دەکەم مۆڵەتمان بدە بیرێکی لێ بکەینەوە، پاشان وەڵامت دەدەینەوە. تا ئێستا گفتوگۆکە ڕوو لە سەرکەوتن و ئەنجامە، ئەمجا هانئ وتی: (وهذا المُثَنی شَیخُنا و صاحب حَربنا)واتە: موثەنا ڕیش سپی و مامۆستامانە و فەرماندەی سەربازیمانە و سوپاسالاری لەشکرەکەمانە، با ئەویش قسەی خۆی بکات، مثنی ی کوڕی حاریسە وتی: منیش قسەم لەگەڵ قسەی ئەو دوو سەرکردەیەمانە، بەڵام شتێك هەیە نابێت لەبیرمان بچێت، ئێمە لە نێوان فارس و عەرەبداین و ئێمە پەیمانمان بە کیسرای فارس داوە کە بەبێ ئاگاداری ئەو هیچ کارێك نەکەین، (و إنِّي أری هذا الأمر الذّي تدعُونا الیه یا أخا قُرَیش ممّا تُکره المُلُوك)واتە: من بە ڕاستی وا دەبینم کە ئەم دینەی تۆ کە بانگەوازی خەڵکی دەکەیت بۆلای، پاشاکان و دەسەڵات دارەکان ڕقیان لێیەتی و دژی دەوەستنەوە، جا ئەگەر حەز دەکەیت ئێمە بۆلای عەرەبەکان پشتیوانیت لێ دەکەین و دوژمنایەتی عەرەبەکان بۆ ئێمە گرنگ نیە، بەڵام

شەڕی فارسمان پێ ناکرێت و لێمان قبوڵ ناکەن، لەبەر ئەوە ناتوانین بڵێین وەرە بۆ ناومان.

کەواتە ئەم قسەیەی مثنی دانیشتنەکەی قفڵ کرد و شکستی پێ هێنا.

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ( ما أسَأتُمْ في الرَدِّ إذ أفْصَحْتُم بالصِّدقِ، وَ أنَّ دينَ اللّهِ عَزَوَجَل لَنْ يَنْصُرَهُ إلاّ مَنْ حاطَهُ مِنْ جَميع جَوانِبِهِ). فەرموی: وەڵامدانەوەکەتان خراپ نەبوو، دڵتان ئازار نەدام کاتێك زۆر بەراستگۆیی قسەتان کرد و رەئی خۆتان دەربڕی، وە بزانن دینی خوای گەورە کەسێك ناتوانێت پشتیوانی لێ بکات و سەری بخات کە هەموو لایەنکی ئیسلامی نەگرتبێ.

بەڵێ، دانیشتنەکە بە بێ ئەنجام کۆتایی هات و پێغەمبەر ﷺ بەجێی هێشتن، بەڵام دوای چەند هەنگاوێك گەڕایەوە و فەرموی: (أرأيتُم إنْ أظْهَرَنِيَ اللّهُ و مَلَّكني أرضَ الفُرسِ أتُسَبِّحونُ للّهِ وتُقَدِّسونَهُ؟!) واتە: ئایا ئەگەر رۆژێك لە رۆژان بینیتان خوای گەورە سەری خستم و زەوی و دەسەڵاتی فارسی خستە ژێر دەستمەوە، ئایا ئێوە لەو کاتەدا خوای گەورە بە تاك و تەنها دەناسن و تەسبیحاتی دەکەنو بە بەرز و بڵندی رادەگرن؟!.

ئیماندارانی بەڕێز: تەماشای سیاسەتی پێغەمبەری خوا بکەن ﷺ نەیفەرمو: تازە نەگەیشتینە هیچ ئەنجامێك ئیتر تەواو، بەڵکو فەرموی: ئێوە قەومێکی رێك و پێك و بەرێز و ژیر و زۆر عاقڵن، با شتێك لە نێوانماندا هەر بمێنێ ئەگەر دوای چەند ساڵی تریش بێت، بەنی شەیبان هەموو بە یەك دەنگ وتیان: بەڵێ پەیمان دەدەین ئەگەر رۆژێك تۆ سەرکەوتیت وفارست لە ناوبرد، ئێمە هەموو وەعدو بەڵێنت پێ ددەین ئیمانت پێ بێنین. ئەمجا خواحافیزیان لە یەکتر کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ بەجێی هێشتن. کەواتە ئەم هەوڵەش لە ڕووی ئامانجەوە سەرکەوتوو نەبوو، وە بەرهەمێکی بۆ ئەو

ساتەوەختە سەختە نەبوو، بەڵام ئێمە لەوەی ئەمڕۆ باسمان کرد سێ دەرس و وانەی گرنگ وەردەگرین:

**وانەی یەکەم:** مثنی وتی: ئەم ئاینەی کە تۆ بانگەشەی بۆ دەکەیت، پاشاکان ڕقیان لێیەتی و قبوڵی ناکەن. کەواتە پاشاکان دیکتاتۆر و بەزۆر خۆسەپێنەری سەر زەوین و ئەوەیان قبوڵ نیە کە ئیسلام داوای دەکات لە مافی ژیان بۆ هەموو کەس بە یەکسانی بە کۆیلە و ئازاد و گەورە و بچوکەوە. کەواتە ئەو کەسانەی باسی ئازادی دەکەن و ئیسلام بە دیکتاتۆر ناو دەبەن، ئەوە با چاك تێ بگەن هێشتا ئیسلام دەسەڵاتی پەدا نەکردبوو، کە یەکێك لە سیاسەتمەداران و فەرماندە سەربازیەکان کە چاك لە دەسەڵاتی دەسەڵاتدارانی دونیاپەرست تێگەیشتبوو، هەر موسڵمانیش نەبوبوو، شایەتی ئەوەی دا کە ئیسلام دژی دیکتاتۆریەتە و مێژووش سەلماندویەتی کە بەردەوام دیکتاتۆریەتی پاشا و دەسەڵاتدارەکان لەمپەڕ بووە لەبەردەم بڵاوبونەوەی ئیسلامدا، وە ئیسلام بە کردەوە ئازادی بۆ خەڵکی هێنا لە کاتی دەسەڵاتدا، نەك هەر لەکاتی بێدەسەڵاتی و شۆڕشدا بیکات بە دروشم و خەڵکی پێ لە خۆی کۆ بکاتەوە. بەڕاستی ئایینی ئیسلام دادوەری تەواوی تێدایە وکەسانی دەوڵەمەند و دەسەڵاتداریشی پشتگوێ نەخستوە، ئەوانیش ئەگەر حەق ویست بن بەرژەوەندیەکانیان لە ئیسلامدا پارێزراوە، بەڵام هەرگیز ئیسلام ئەوە نەبووە کە لە خزمەتی چینە باڵاکاندا بێت و ئامانجی چینە چەوساوەکانی خستبێتە تابوتەوە وەکو ناحەزانی ئیسلام دەیڵێن و دەینوسن، بەڵکو یەکەم ئامانج و هەدەفی ئیسلام ڕزگار کردنی کۆیلە و ژێردەستەکان بوو، ئایەتی (موکاتەبە)ی سورەتی (النُور) ڕێگا خۆش دەکات بۆ رزگار کردنی بەندەکان، یان کەفارەتی هەندێك گوناه و سوێند بەندە ئازاد کردنە، تەنانەت کاتێك قورئان دەخوێنیتەوە وا دەزانیت کە ئەم ئیسلامە هەر

تەنها شۆڕشی چەوساوەکانە، ئەوەتا دەفەرموێت ﴿ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴾ القصص:٥

مێژووی ئیسلامیش و غەیری ئیسلامیش ئەوانەی کە بە ویژدانەوە نوسیویانە شایەتن ئەوانەی کە ئاڵا هەڵگری ئەم ئیسلامە بوون، لە ڕۆژە هەرە سەختەکاندا، زۆربەی هەرە زۆریان کۆیلە و بێکەس و چەوساوەکان بوون، ناوە پرشنگدارەکانی ( بیلال و عەممار و صُهَیب و زەید و زەنیر)ە هەرگیز لە بیر ناچنەوە.

بەڵێ خۆشەویستان: مثنی کوڕی حاریسەی شەیبانی هەر لە یەکەم گوێگرتنی لە قورئان ئەو قەناعەتەی بۆ درووست بوو کە (پاشاکان و دەسەڵاتدارەکان دژی ئەم پەیامەن). بەڵی مثنی ئینسانێکی ژیر بوو، چاك بۆی چوو بوو، چونکە ئیسلام بوو قولەڕەشێکی بێکەسی چەوساوەی وەکو بیلالی ئازاد کرد و کردیە بانگ بێژ و وەزیری ڕاگەیاندن و بوو بە هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ و هاوشان لەگەڵ گەورە پیاواندا دەبێت و هەست بە جیاوازی ناکات، لەوەش زیاتر بە شانی کەعبەدا سەردەکەوێت و بانگی لەسەر دەدات و هەموو ڕۆژێك کە بانگ دەدرێت، یادی بیلال دەکرێتەوە و ناوی بە نەمری مایەوە.

یان ئوسامەی کوڕی زەید کە باوکی کۆیلە بوو، پێغەمبەر ﷺ ئازادی کرد، ئەم ئوسامەیە دەبێتە سەرکردەی سوپایەك کە عومەری کوڕی خەطاب و عەلی کوڕی ابوطالبی تێدایە و کاتێك کە ابوبکری صدیق پێویستی بە عومەر دەبێت مۆڵەت لە ئوسامە دەخوازێت کە مۆڵەتی عومەر بدات.

هەروەها نەرمی و بە سۆزی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خەڵکی سادەدا ئەوەندە زۆر بوو بە پێی فەرمودەی صەحیح: ئەگەر پیرەژنێك چەندێك لە

وەختی پیرۆزی پێغەمبەری خوای ﷺ بویستایە درێغی نەدەکرد و گوێی بۆ دەگرت و داواکانیشی بۆ جێبەجێ دەکرد.

هەروەها سورەتی ( عَبَس ) و پیاوە نا بیناکە شایەتە لەسەر ئەوەی کە چینی چەوساوە و کەم ئەندامانی ناو کۆمەڵگەی ئیسلام چەند مافیان پارێزراوە، کە خوا خۆی لەسەریان بە وەڵام دێت و ئامۆژگاری پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی دەکات کە نەکەی پشتی تێ بکەیت و ناوچەوانی لێ گرژ بکەیت، هەرچەندە چاویشی لێت نیە و هەستیشی پێ ناکات، ئەی ئەگەر ئەو نابینایە هەستی بە ڕووگرژی پێغەمبەر ﷺ بکردایە، ئەبوایە خوای گەورە چ ئایەتێکی بەشیددەتری دابەزاندایە؟!.

ئەوانەی دەڵێن ئیسلام هەر چینی دەوڵەمەند و پیاوە دەست ڕۆیشتوەکانە، لە وەڵامیاندا دەڵێین: قورئان بخوێننەوە تا ئەوە ببینن کە کاتێك دەسەڵاتدارانی قورەیش و چینی ئەرستۆکراتی داوای ئەوەیان کرد کە پێغەمبەر ﷺ مەجلیسیان بۆ جیا بکاتەوە، کاتێك ئەمان گوێی بۆ دەگرن با کۆیلە و هەژار و نەدارەکان لە مەجلیسەکەدا ئامادە نەبن، بەڵام خوای گەورە ئەوەی ڕەت کردەوە و بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: ئارام بگرە لەگەڵ ئەو هەژارانەدا کە تەنها خوایان دەوێت و گوێڕایەڵی لە بێ ئاگایان لە یادی خوا مەکە ﴿وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا﴾ الكهف:٢٨

**وانەی دووەم:** کاتێك مثنی وتی: ئەی برای قورەیشی، ئێمە لە نێوان فارس و عەرەبداین، بۆلای عەرەبەکان پشتیوانیت لێ دەکەین، بەڵام ناتوانین پەیوەندی خۆمان لەگەڵ فارس تێك بدەین چونکە ئەوەمان لێ قبوڵ ناکرێت،

بە کوردی و بەکورتی: ئێمە بە تەواوەتی خۆمان ناخەینە بازنەی ئیسلامەوە، بەلام هەندێکیمان قبوڵە. پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: زۆرباشە ئێوە جارێك ئەومندە ئیسلام قبوڵ بکەن کە لە شەڕی عەرەب بیپارێزن، ئیتر بۆ فارسیش قسەیەکی لێ ئەکەین، لەگەڵ فارسیش بن و لەگەڵ ئیسلامیش بن. نەخێر، بەڵکو فەرموی: دەبێت خۆتان ساغ بکەنەوە ئەگەر لەگەڵ ئیسلامدان و موسڵمان دەبن، دەبێت دوژمنایەتی هەموو دوژمنانی ئیسلام بکەن، وتە بەناوبانگەکەی فەرموو: (أنَّ دينَ اللهِ عَزَوَجَل لَنْ يَنْصُرَهُ إلاّ مَنْ حاطَهُ مِنْ جَميع جَوانِبِه ).

کەواتە: ئیسلام کەسێك بەرزی دەکاتەوە و دەتوانێت خزمەتی ئیسلام بکات و خۆشی بەهۆی ئیسلامەوە بۆنخۆش دەکات کە هەموو لایەنەکانی ئیسلامی گرتبێت، نەك ئینسانی موسڵمان هەندێك دروشم و عیبادەت جێبەجێ بکات، بەڵام لە بواری کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسیدا، پرس بە ئیسلام نەکات و بە قسەی دوژمنانی ئیسلام بکات.

بەڵێ ئیمانداران: ئەگەر ئەتانەوێت لە ئیسلام بەهرەمەند بن و ئیسلامیش بە ئێوە زیاتر پرشنگدار بێت، ئەوا باوەش بە هەموو ئیسلامدا بکەن، ئەگەر وانەکەین خوا لێمان قبوڵناکات و پێغەمبەری ئازیزیشمان ﷺ دەست ناخاتە دەستمانەوە و ئەو جۆرە ئیسلامەتیەمان لێ قبوڵ ناکات، هەروەکو لە (مثنى)ی قبوڵ نەکرد.

جا لێرەدا دەبێت بە ئاگا بێینەوە، ئەمڕۆ خەڵکانێك هەن خۆیان بە موسڵمان دەزانن و دەڵێن: ئیسلاممان قبوڵە، بەڵام نوێژ ناکەین، چونکە ئەگەر نوێژیش نەکەین، ئەوە نیە دڵمان پاکە؟ دەستمان پاکە؟، یان هەیە نوێژ دەکات بەڵام لە کڕین و فرۆشتندا ویژدانی نیە و حەز دەکات لەبەر خاتری بەرژەوەندی ماددی خۆی گرانی بێت و هەموو خەڵکی بفەوتێن، بەس ئەو

سود ببینێت، ئەمەش بە گوناه و بێ دینی نازانێت، یان خوشکمان هەیە نوێژ دەکات، رۆژو دەگرێت، بەلاّم حیجاب ناکات... ئاخر بەڕێزەکەم دەبێت هەموو ئیسلام وەرگریت، هەروەها دەبێت ئاگادار بین دوژمنانی ئیسلام هەرگیز ئەوە بە ئیمانداران و ئەهلی ئیسلام نالێن کە وەرن واز لە دینداری و مزگەوت بێنن، بەلْکو دەلێن: دین تەنها پەیوەندیەکی رۆحیە لە نێوان خوا و بەندەدا و ئیتر کاروباری بازاڕ و سیاسەت و حوکم و دادگا پەیوەندی بە دینەوە نابێت ببێت و وەکو کۆن وتویانە ( ما للّه للّه، و ما لقَیصَر لقَیصَر ). لە وەلاّمی ئەوانەشدا دەلێین: ئەو جۆرە کەس و خاوەن بیرانە کە بە (عەلمانی) دەناسرێن، وەکو ئەوە وایە بیانەوێت بچن صولْح لەگەلْ خوا بکەن –نَعُوذُ باللّە– کە خوای گەورە ڕازی بکەن قەینا با موسلْمانان بە قسەت بکەن بۆ نوێژ و ڕۆژوو و حەج، بەلاّم نابێت بە قسەت بکەن لە کاروباری دونیایی و بەڕێوەبردنی ولاّت و ژیان و ژینگەدا، کە ئەمەش کوفرێکی صەریحە و ناوێکی تری لێنراوە.

ئیمانداران: ئینسان هەرچەندە لە ئیسلام شارەزا بێت و هەموو لایەنەکانی ئیسلامی ناسی بێت، ئەمجا زیاتر گەورەیی ئیسلامی بۆ دەردەکەوێت، ئەمڕۆ خەلْکانێك کە بەرزترین ئاستی زانستی و پۆستی ئیداریان هەیە و شارەزای هەموو زمانەکانن، بە فەخرەوە ئیسلام قبولْ دەکەن، بۆ نمونە: بەرپرسێکی ئەمریکی (دکتۆر رۆبرت کرین) پاش تەمەنییێکی زۆر لە ناوەندە بالاّکاندا هەر لە بەڕێوەبەرێتی (مَجلِس الأمن القَومي) و لە (بَیت الأبیَض) و بونی بە (سەفیر) و بەڕێوەبەرایەتی پارێزەران و زانینی زمانەکانی ئینگلیزی و ئەلْمانی و روسی و فەرەنسی و پاشان عەرەبیش، لەگەلْ ئەمانەدا تایبەتمەندێتی وەرگرتووە لە (الأنظِمة القانونیة المُقارِنَةَ و الإستِعمار الدَولي)دا، لەگەلْ هەموو ئەمانەشدا موسلْمان دەبێت و

بە خەڵکی ڕادەگەیەنێت ، وە ناوی خۆی لە (ڕۆبرت کرین)ەوە دەگۆڕێت بۆ (فاروق عبدالحق).

بەڵێ، ئەم پیاوە هەڵکەوتووە دیراسەی هەموو لایەنەکانی ئیسلامی کرد تەنانەت وا گۆڕا بۆ ئیسلام نەك هەر ڕەفتارەکانی گۆڕی بەڵکو ناو کە مافێکە و خوای گەورە ئازادی تیا بەخشیوە بە مرۆڤ،لە خۆشەویستی ئەم ئیسلامە تەنانەت ناوەکەی خۆی گۆڕی بە ناوێکی ئیسلامی.

خۆشەویستان: بەڕاستی گەورەیی ئەم ئیسلامە لەوەدایە کە مرۆڤ هەر کاتێك شارەزای هەموو لایەنەکانی بوو، ئەمجا نرخی ئەم شەریعەتی ئیسلامەی بۆ دەردەکەوێت و ئیمانی بە خاوەنی ئەم دینە زیاد دەکات، ئەوەتا پڕۆفیسۆر د. مصطفی زەڵمی کە زانایەکی بەناوبانگی کوردە و سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی فەقێیایەتی و لە مزگەوت دەست پێکردووە و پاشان ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، کە بەداخەوە ئەمڕۆ هەندێك فەریکە خوێندەوار بە گاڵتەوە ناوی حوجرە دێنن و دەڵێن: زانکۆکانمان لێ مەکەنەوە بە حوجرە!. بەڵام مەلا مصطفی زەڵمی کاتێك ئیمتیحانی زانکۆ دەکات ئەو ئیجازەی مەلایەتی‌یەی بە (بکالریۆس) بە پلەی نایاب بۆ حیساب دەکرێت و دواتریش ماستەر و دکتۆرا وەردەگرێت، سێ جار ماجستێری وەرگرتووە: لە شەریعەتی ئیسلامی دا، لە فِقه المُقارن دا، لە یاسادا...

دکتۆرای لە (فقه المقارن) بە پلەی ئیمتیاز وەرگرتووە، پاشان لە زانکۆی بەغداد پلەی پرۆفیسۆری پێ بەخشراوە، ئەم زانا گەورەیە تاکو ساڵی ٢٠٠٧ ی زایینی (٢٧) کتێبی نوسیوە لە یاسا و شەریعەتدا، و کتێبەکانی لە زانکۆکانی عێراق و مالیزیا و ئەندەنوسیا و یەمەن و ئەردەن دەخوێنرێن، تا ساڵی ٢٠٠٧ (٧٠)کەس بە سەرپەرشتی ئەو دکتۆرایان وەرگرتووە لە قانون و شەریعە و لە (اُصول الفِقه)دا.

بە کورتی: ئەم زانا ناوداره دانەری کتێبەکانی قانونە، بەڵام کاتێك کە پرسیاری لێ دەکەن چۆن لە ئیسلام دەگەیت؟ دەفەرموێت: ئینسان هەرچەندە مەعریفە و زانیاری زیاد بێت ئیمانی بەهێز دەبێت، من دوای ئەوەی یاسام خوێند ئیمانم بەهێزترە وەك لەوەی کە مەلا بووم و قانونم نەخوێندبوو، چونکە ئێستا بەراورد دەکەم لە نێوان یاسا و شەریعەتدا دەبینم هەر شتێك کە راستە لە قانوندا، ئەصلەکەی لە شەریعەتی ئیسلامیدا هەیە.

کەواتە: مەعریفەت ئیمان زیاد دەکات... ئەمە قسەی ئەو پیاوە گەورەی قانون و شەریعەتە. بەڵام فەریکە خوێندەوارەکانی ئەمڕۆ کە زۆربەیان بە قۆپیە و قبوڵ خاص و شەهادەی تەزویر گەیشتونەتە زانکۆ و پەیمانگایەك و پلە و پایەیەك ڕەخنە لە شەریعەتی ئیسلامی دەگرن.

بەڵێ ئیمانداران: جیاکردنەوەی ئیسلام لە ژیان جا چ لە بواری حوکم و سیاسەتدا خۆی ببینێتەوە، چ لە هەر لایەنێکی تردا، بریتیە لە یەکپچڕانی خودی ئیسلام و لێکترازاندنی پێکهێنەرەکانی، بۆچی؟ چونکە لە ئیسلامدا دین و دەوڵەت دوو دیوی یەك شتن و سیاسەت و عیبادەت لە یەکتری جیا نین، مزگەوت و بازاڕ پێکەوە پەیوەستن، حوکم و حیکمەت پێکەوە جۆش دراون، وە ڕۆح و جەستە دوو شتی تەواوکەری یەکترین. و دونیا و قیامەت دوو شتی پێکەوە بەستراون، وە عیلم و وەحی دوو شتی لێك نەترازاون، کەواتە کەسێك دەیەوێك کە ئیسلام لە ژیان دابڕێت ئەوە ئیسلام پارچەپارچە دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍۚ إِنَّمَآ أَمۡرُهُمۡ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾ الأنعام: ١٥٩

کەواتە: پێغەمبەری خوا ﷺ پەیوەندی بە کێوە هەیە؟! بێگومان پەیوەندی بەو کەسانەوە هەیە کە دینی خوایان بە هەموو لایەنەکانەوە قبوڵە، چونکە هیچ ڕەوا نیە کە بڵێیت: خوایە من نوێژ و ڕۆژووەکەت لێ قبوڵ

نەکەم. بەڵام حوکم و سیاسەتەکەت بە کەڵك نایەت، یان مزگەوتەکەت باشە، بەڵام بازاڕەکەت نا، خوایە با دینەکەت تێکەڵی ئیشی مزگەوت بکات، بەڵام ئیشی بازاڕ خۆمان ڕێکی دەخەین، یان خوایە بواری عیبادەت بۆ تۆ بەڵام لایەنی سیاسەت تۆ نابێت قسەی لەبارەوە بکەیت، جا ئایا دەگونجێت موسڵمان شتی وا بڵێت؟نەخێر بەڵکو ئەم قسانە تەنها خەڵکی کافر دەیکەن. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( لَتُنْقَضُنَّ عُرى الإسلامِ عُرْوَةً عُرْوَةٍ، فَكلَّما انْتَقَضَتْ عُروَةً تَشبَّثَ النّاسُ بالّتي تَليها ، و أَوَّلُهُنَّ نُقضاً الحُكمُ و آخِروهُنَّ الصَّلاةُ ) رواه احمد . واتە: قوڵفە و گرێکانی ئیسلام یەك لەدوای یەك هەڵدەوەشێنرێنەوە، هەر کە قوڵفەیەکیان هەڵوەشایەوە خەڵکی دەست بەوەی دوایەوە دەگرن، یەکەم گرێ کە دەکرێتەوە حوکم و بەڕێوە بردنە، کۆتاشیان نوێژە.

**وانەی سێیەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکاتێك بانگی هەر هۆز و کەسێکی بکردایە بۆ ئیسلام، هەرگیز وەکو لێقەوماو و بێدەسەلاتێك نەدەپاڕایەوە، بەڵکو هەموو جارێك دەیفەرموو: ڕۆژێك دێت خوای گەورە ئەم ئیسلامە سەردەخات، ئەوەتا لە چاوپێکەوتنی هۆزی بەنی شەیبان دەفەرموێت: (أرأيتُم إنْ أظهَرَني اللهُ و مَلكني أرضَ الفُرسِ أتُسَبّحونُ للهِ وتُقَدّسونَهُ؟).

هەزاران صەلات و سەلامی خوات لەسەر ئەی پێغەمبەری خۆشەویست، ئەی ئەو کەسەی کە هەرگیز ڕەشبین نەبویت بە دواڕۆژی ئەم ئیسلامە، هەرگیز لە ژیانتا نائومێدی چۆکی پێ دانەدایت، وا لەم شەوەدا بە درێیەوە قسە بۆ ئەم هۆزە دەکەیت و وا ئەوانیش وەکو هەوڵەکانی ترت پشتیان نەگرتیت، کەچی دەفەرموێت: ڕۆژێك دێت موڵکی فارس کە ئەمڕۆ ئێوەی بەنی شەیبان لێی دەترسن دەکەوێتە دەستی موسڵمانان.. ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم ئیسلامە لە خواوەیە و پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها

راگەیەنەرێتی، ئەگینا هیچ بەشەرێك ناتوانێت وەعدی وا بدات کە گەورەترین ئیمپراتۆریەتی جیهانی ئەو سەردەمە ئەو دەیشکێنێت لە کاتێکدا کە هیچ پەنا و پشتیوانێکی نیە..

بەڵێ ئیمانداران: ڕۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆشت، پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و ئیمامی ئەبوبکر رضي الله عنه بوو بە خەلیفە، ڕۆژێکیان هەواڵی بۆ هات کە بەنی شەیبان موسڵمان بوون و لەشکرێکی زۆریان کۆکردۆتەوە بە سەرکردایەتی (مثنیی کوڕی حاریسەی شەیبانی) بۆ ئەوەی لە دەوڵەتی فارسی بدەن، حەزرەتی ئەبوبکر رضي الله عنه ناردی بە شوێنیدا تا ئەو سەرکردە قارەمانە بناسێت، کاتێك مُثنی هات حەزرەتی ئەبوبکر رضي الله عنه نەیناسیەوە، چونکە نزیکەی (١٢) ساڵی پێ چوبووبۆیە کاتێك قسەی لەگەڵ کرد و شەهامەت و ئازایەتی و لێزانینی ئەم سەرکردەیەی بۆ دەرکەوت فەرموی: ئەی مثنی، لَو رآكَ النَبيُ ﷺ لَفَرِحَ بِك. واتە: ئەی مثنی ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ تۆی ببینیایە بەڕاستی پێت خۆشحاڵ دەبوو. مثنی فەرموی: افَتُذكِرُ لِقاءَ النبيِّ ﷺ مَعَ بَني شَيبان يَومَ قُلتُ لَهُ: وَأمّا ما كانَ مِن جانِبِ الفُرسِ فَذَنبٌ صاحِبُهُ غَيرُ مَغفور، كُنتُ خائفاً يَومَها وَ بعدَ أن اسلَمتُ زالَ الخَوفُ. واتە: مثنی فەرموی: ئەی خەلیفەی موسڵمانان لەبیرتە ئەو کاتەی کە گەیشتین بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ هۆزی بەنی شەیبان، ئەو ڕۆژەی کە پێم وت: بەڵام بۆلای فارس ناتوانین پشتیوانیت لێ بکەین چونکە ئەوە تاوانێکە و لێخۆشبونی نیە لە لایەن فارسەوە، ئەی ئەو کاتە چەند لە دەسەڵاتی فارس دەترسام، ئێستا کە موسڵمان بووم، بە بەرەکەتی ئەم دین و ئیمانە ئەو ترسە لە دڵ و دەرونما بەرامبەر بەو هێزە گەورەیەی فارس نەماوە... بەڵێ ئاوا ئیسلام عیزەت دەدات بە خاوەنەکەی. حەزرەتی ئەبوبەکر رضي الله عنه جارێکی تر سەیری مثنیی کرد و فەرموی: لَو رآكَ الرَّسولُ ﷺ لَفَرِحَ بِك. واتە: ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ تۆی ببینیایە زۆر خۆشحاڵ دەبوو

بە پیاوێکی بەڕێز و ئازا و بلیمەتی وەکو تۆ ئەی مثنی.. (فَبَكى مُثَنّى. مثنی دەستی کرد بە گریان زۆر بە کوڵ گریا و فەرموی: فاتَتني الصُحْبَة يا أبابكر). ئای چۆن هاوەڵیەتی پێغەمبەری خوام لە دەست چوو ئەی ئەبوبکر... بەڵێ(مثنی بە صەحابە حیساب نیە و تابعی‌یە) مثنی بە حەسرەت و داخەوە فەرموی: (واللە لا أدري كَيفَ ألقاهُ يومَ القيامة). واتە: سوێند بەخوا نازانم چۆن لە ڕۆژی قیامەتدا بگەمە خزمەتی ئەو خۆشەویستەم و بە چ ڕوویەکەوە بەرەو ڕووی ببمەوە، چونکە لە یەکەم چاوپێکەوتنماندا ڕەتم کردەوە وئیمانم پێ نەهێنا و پشتیوانیم لێ نەکرد، ئەمجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ لَا يَسْتَوِي مِنكُم مَّنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الْفَتْحِ وَقَاتَلَ ۚ أُولَٰئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِّنَ الَّذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ﴾الحديد:١٠. پاشان زۆر گریا تا ئیمامی ئەبوبەکر و هەموو صەحابەکان ﷵ دەستیان کرد بە گریان.

بەڵێ ئیمانداران: مثنی‌ی کوڕی حاریسەی شەیبانی ئەو پیاوە گەورەی مێژووی ئیسلام، تابعی‌یە. سەرکردەی لەشکری ئیسلامە و سوپای فارسی تێکشکاندووە، خزمەتی زۆری بە ئیسلام و موسڵمانان کردووە، بەڵام هەتا مرد هەر دەگریا و ئاخ و حەسرەتی هەڵدەکێشا بۆ ئەو کاتەی کە وەڵامی پێغەمبەری خوای ﷺ وەکو پێویست نەدایەوە و پلەی صەحابی لەدەست چوو، دەبا ئێمەش ئاگادار بین و سەعاتێك زووتر لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نزیك بینەوە لە بەهەشتا پلەمان بەرزتر دەبێتەوە. خۆ ئەگەر دوا بکەوین و درەنگ لەسەر سوننەت و ڕێبازەکەی دامەزراوبین ئەوا پەشیمان دەبینەوە، هەم لە دونیا، هەم لە قیامەتدا دەڵێین: خۆزگە زووتر پەیمانمان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بدایە و زوتر پابەند بوینایە بە ڕێباز و بەرنامەکەیەوە، دەبا هەر ئێستا وەعد و بەڵێن بدەین کە شوێن کەوتەیەکی ڕاستەقینەی

پێغەمبەری پێشەوا و دڵسۆزمان بین و بۆ غەیری ڕێبازی ئەو لانەکەینەوەبە ئومێدی ئەوەی بە خزمەتی بگەین و شەفاعەتی مسۆگەر بکەین. إنشاء الله.

تا وتاری داهاتوو هەموو لایەك بە خوای گەورە دەسپێرم.

## سەرچاوەکان:


١.قورئانی پیرۆز.

٢.السيرة النَبَوية–د.علي‌محمدالصَّلابي– ج١/ص٤٠٤، ص٤٠٧، ص٢١٣.

٣.مَوْسُعَة اسماء الله الحُسنى – د.محمد راتب النابلسى، ج١ ص٤٢٣.

٤.على خُطى الحبيب – عمر و خالد ص٨١، ص٨٥

٥.ئاشتینامه – امینه صدیق عبدالعزیز /لا١١٢،لا٨٥.

٦.گۆڤاری لڤین – ژ ٤٨، ساڵی پێنجەم – لا١٨.

٧.ئیسلام و موسڵمانیەتی – م.علی باپیر – لا٢٢٣.

# وتاری سێیەم بۆ مانگی مُحرم

# هیجرەت ـ بەشی سێیەم

( الحَمدُ للّهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمعين )

ئیماندارانی بەرێز: وا جارێکی تر لە ژیاننامەی خۆشەویستمان، تاجی سەرمان، شەفاعەتکاری مەحشەرمان، حەزرەتی محمد المصطفى ﷺ بەیەك گەیشتینەوە بۆ بیستن و شارەزا بوون لە کۆچ و هیجرەتی پێغەمبەری خوا ﷺ.

بەڵێ خۆشەویستان: دوای ئەوەی هەوڵدان و دانیشتنەکەی خۆشەویستمان ﷺ لەگەڵ بەنی شەیبان نەگەیشتە ئەنجام، پێغەمبەری خوا ﷺ هەوڵی شەشەمی دا و چاوی کەوت بە پیاوێك لە (بني مَحارِب) کە ناوی (ڕوکانە)بوو، ئەم پیاوە پاڵەوانی زۆرانبازی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺلێی نزیك بۆیەوە و ئیسلامی بۆ باس کرد و داوای لێکرد کە خۆی و گەلەکەی لە ئیسلام تێبگەن و پشتیوانی لێ بکەن.

بەڵام روکانە لە وەڵامدا وتی: (لَو صَرَعتَني) وتی: موسڵمان نابم و گوێت بۆ ناگرم تا زۆرانبازیم لەگەڵ نەکەیت. (سبحان الله، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای چی دەکات و ئەم باسی چی دەکات؟!) روکانە تەنها زمانی هێزی دەزانی، جا بزانە پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕێگەی گەیاندنی ئەم دینە چاوی بە هەموو جۆرە کەسێ کەوتووە، (سیاسی ، کورت بین ، تووڕە، پاڵەوان ، زمان پیس ) واتە ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە لە ڕێگەی بانگەوازدا هەموو کەست دێتە ڕێگا... پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: باشە ڕوکانە چیت دەوێت وا دەکەین، ڕوکانە وتی: وەرە پێشەوە بۆ مەیدانی زۆرانبازی. سەیری ئەو

دیمەنـە بکـە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ لەبەرامبـەر پاڵـەوانێکی زۆر زەبـەلاح ڕاوەستاوە و ئەو پاڵەوانە زۆر بە هێزی بازووی خۆیدا ئەنازێ و ئەیەوێت پێغەمبەری خوا ﷺ بدات بە زەویدا. ئەوە بوو شوێنێکیان دیاری کرد و خـەڵکیان لێ کۆبـووەوە و هـەموو دەیـانگوت: محمـد نەگبەتیـەتی لەگـەڵ بەهێزترین پاڵەوانی نیوە دورگەدا زۆران دەگرێت.

بـەڵێ، باوەشیان بەیەکدا کردو پێغەمبـەری خـوا ﷺ ڕوکانـەی دا بـە زەویدا، روکانە وتی: (لَقَد أخَذتَني عَلى غَفلَة ) وتـی: ئەوە ئاگام لەخۆم نەبوو پـەلامارت دام، ئەبێت دووبارەی بکەینەوە،پێغەمبـەر ﷺ فـەرموی: زۆرباشـە فـەرموو با دوبـارەی بکەینـەوە، ئەمجارەشیان ڕوکانـەی دایـەوە بـە زەویـدا، ڕووکانـە وتـی: ئەمجارەشـیان نـازانم چـۆن بـوو کـەوتم، پێغەمبـەریش ﷺ فەرموی: زۆرباشـە ئەمجارەش ئەچینەوە مەیدان.. بەڵێ، جاری سێیەمیش پشتی ڕوکانەی دایەوە بە زەویدا و ڕوکانە دانی نا بە پاڵەوانێتی پێغەمبەری خوا ﷺ... لێرەدا دوو سەرنج هەیە:

**یەکەم:** لە گەیاندی ئەم پەیامی ئیسلامەدا، نابێت منـەت بەسـەر خەڵکدا بکەین بۆ ئەوەی کە گوێمان بۆ بگرن، بەڵکو دەبێت وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە بین گوێ بۆ داواکاری خـەڵك بگرین و بەقسەیان بکەین و بە ئومێدی ئەوەی گوێمان لێ بگرن و دەرگای دڵیان بۆ ڕووناکی ئیسلام بکەنەوە.

**دووەم:** ئـەوە پێغەمبەرەکەمانـە ﷺ و ئـەوە لاشـەی بـەهێزێتی، کەچـی بەهۆی بێ ئاگایی لە ئیسلام خەڵکانی وا هـەن کە دژی وەرزشـی زۆرانبـازین. کەواتە: تۆی وەرزشـەوان لـە ڕێگەی وەرزشەوە خزمـەت بە ئیسلام بکە و بە ڕەوشتی جوان و جوان وەرزشکردنت خـەڵکی بانگ بکە بۆ ئیسلام. ئیسلام هەموو کەسی دەوێت، لە هەموو بوارەکان شارەزامان پێویستە بۆ گەیاندنی نوری ئەم ئیسلامە.

بەڵێ ئیمانداران: سەرەنجامی ئەم هەوڵەش بەرهەمدار نەبوو، چونکە ڕوکانەی پاڵەوان ئامادە نەبوو موسڵمان ببێت و ببێتە پاڵپشتی ئیسلام و پێغەمبەری خوا ﷺ.... بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هەر لە هەوڵدان ناکەوێت و هەرگیز نا ئومێدی چۆکی پێ دانادات. بۆیە هەوڵی حەوتەم نەدات.

__هەوڵی حەوتەم:__ پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لەگەڵ بیستنی ناوی کەسێك کە هاتۆتە مەککە بۆ حەج کە ئەو کەسە ناوێکی دیاری هەبوبێت و خاوەنی عەشرەت و کۆمەڵە کەسێك بوبێت، ئیللا خۆی گەیاندۆتێ و قسەی لەگەڵ کردووە و بانگی کردووە بۆ ئیسلام.... یەکێك لەو کەسانە (سوەیدی کوڕی صامت)بوو، کە بۆ حەج هاتبووە مەککە، کە ئەم پیاوە لەناو قەومەکەیدا پێی نەوترا (الکامل) لەبەر جوانی باڵا و لاشەی و زمان پاراوی و شاعیری و ڕێز و حورمەتی خۆی و بنەماڵەکەی لەناو قەومەکەیدا، پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێکی گونجاوی قۆستەوە بۆ بینینی و ئیسلامی پێ ڕاگەیاند و پێی وت کە قورئانی لەلایەن خواوە بۆ هاتووە، سوەید کە باسی قورئانی بیست وتی: ( فَلَعَلَّ الَّذي مَعَكَ مِثلُ الَّذي مَعي؟ ) وتی: ئەی محمد لەوە دەچێت ئەوەی کە تۆ باسی دەکەیت و دەڵێی لەلای خواوە بۆم هاتووە، وەکو ئەوە وابێت کە منیش لەبەرمە. پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: ( وما الَّذي مَعَك؟ ) ئەوەی تۆ لەبەرتە چیە؟ (قال: مَجَلَّة لُقمان)، حیکمەتەکانی لوقمانە... پێغەمبەر ﷺ فەرموی:( اعْرِضها عَلَيَّ)، فەرموی: فەرموو ئەی سوەید ئەوەی تۆ لەبەرتە بۆم باس بکە و بۆم بخوێنەوە.. تەماشاکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ نەیفەرموو: نەخێر ئەوەی تۆ هەر هیچ نیە لەچاو ئەو قورئانەی خوای گەورە بۆ منی ناردووە و بەم قورئانە هەرچی وشەو نوسراوە ڕووناکی نامێنێت و بەڵکو مەجالی قسەی دایە و فەرموی: حەز دەکەم لەو شتە بە نرخەی خۆتم بۆ باس بکەیت.

کەواتـە: دەبێـت رێـز و قـەدری بـیری بەرامبـەر بگـرین و هـەر لـە یەکـەم جارەوە ڕەفزی نەکـەین. بـەڵێ، سوەید کتێبەکـەی خـۆی بـۆ خوێنـدەوە هـەتا تەواوی کرد.. پێغەمبەری خوا ﷺ لەم ماوەیەدا هیچ قسەی نەکرد و زۆر بە جوانی گوێی بۆ گرت، ئەمجا فەرموی: ( إنَّ هذا الكَلامَ حَسَنٌ، و الّذي مَعي أفضَلُ مِن هذا ، قُرآن أنزَلَهُ الله عَلَيَّ، وهو هُدىً و نُورٌ ). فەرموی: بەڕاستی ئەوەی کە تۆ خوێندتەوە قسە و کەلامێکی جوانە، (تەماشاکە چۆن ڕێـز لە شـتی بەرامبەرەکـەی دەگرێـت) ، بـەڵام ئـەوەی لای منـە چـاکترە لـەوەی تـۆ دەیڵێیت، چونکە ئەوەی لای منە قورئانێکە خوای گەورە ناردویەتیە خوارەوە بۆ سەر من، ئەو قورئانە هیدایەت و روناکی تێدایە و ڕێگا رۆشنکەرەوەیە...

ئەمجا قورئانی بـۆ خوێنـدەوە و سوەیدیش بـە دڵ گوێی بـۆ گرتبوو، چونکە خۆی زانـا بـوو، زۆر حـەزی لـە شـتی زانسـتی بـوو، حـەزی لـە بابـەتی وێـژە و ئەدەبی بوو، بۆیە وتـی: (إنَّ هـذا القَـولَ حَسَنٌ). واتـە: ئـەم قورئانـە بەراسـتی وتەیـەکی جوانـە، پاشـان ئیمـانی هێنـا و موسـڵمان بـوو، وە وەعـدی بـە پێغەمبەری خوا ﷺ دا کە بگەڕێتـەوە بۆ نـاو قەومەکەی و بانگیـان بکات بۆ موسـڵمانیەتی و پـشتیوانی ئیـسلام و پێغەمبـەری خـوا ﷺ... بـەڵام کاتێـك گەڕایەوە بۆ (یـەثریـب) فریـا نەکـەوت بـانگی قەومەکـەی بکـات بـۆ ئیسلام کە شەڕی (بُعاث) ڕویدا و بە دەستی خەزرەجیەکان کوژرا...

کەواتـە: ئـەم هەوڵـەش لـە رووی سیاسـی و ئامانجـەوە بـێ بەرهـەم بـوو، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ داوای موسڵمان بونـدا داوای پشتگیریشی هـەبوو. بـەڵام ئـەم جـارەش پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـەر بەردەوامـە لەسـەر هەوڵەکانی و هەوڵی هەشتەم دەدات.

**هەوڵی هەشتەم:** لەم هەوڵەدا پێغەمبەری خوا ﷺ لایەنی بەرامبەری نەبینی، بەڵکو ئەو کەسە خۆی هات بۆ چاوپێکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ، باشە چۆن؟

قورەیش بیانزانیایە هەرکەسێك هاتۆتە مەککە و کەسێکی زیرەك و لێهاتووە و خاوەن کەسایەتیە، خێرا دەچونە لای و ئەیانوت: نەچیت نزیکی ئەو محمدە ببیتەوە کە دەڵێت من پێغەمبەرم، ئەوە شێتە، ئەوە درۆزنە... یان دەیانوت: ئەوە ساحیرە... بۆ ئەوەی ئەو کەسە هەر لە پێغەمبەری خوا ﷺ نزیك نەبێتەوە و گوێی بۆ نەگرێت. لەبەر ئەوەی کە ئەگەر کەسێك وا تەماشا کرا کە شێتە یان ساحیرە یان درۆزنە، ئەوا یەکسەر هەوڵ دەدەیت ئەگەر لێشت نزیك بێتەوە تۆ خۆتی لێ دوور بخەیتەوە.

جا یەکێك لەو کەسانەی کە قورەیش چونە لای و بەم وەسفە ناشرینانە وەسفی پێغەمبەری خوایان ﷺ کرد لە لای (ضِماد الأَزْدِيّ) بوو، ئەم پیاوە کە ئەم قسانەی قورەیشی بیست لە دڵی خۆیدا وتی: (أَنَّهُ مُصابٌ بالجُنُون). بەڕاستی دیارە ئەو محمدە شێتەو جنۆکە دەستی لێ وەشاندووە، ئیشی ئەم پیاوە ئەوە بوو کە جنۆکەی لە لەشی شێت و فێدار دەردەهێنا و چاکی دەکردەوە، لە ویژدانی خۆیدا بەزەیی پێدا هاتەوە و وتی: (لَو أَنِّي رأيتُ هذا الرَّجُل، لَعَلَّ الله يَشفيه على يَدِيَّ) وتی: خۆزگە ئەو پیاوە کە محمدە بمبینیایە بەڵکو خوای گەورە لەسەر دەستی من شیفای بۆ بناردایە، بەم نیەتەوە ڕۆشت بە دوای پێغەمبەردا ﷺ گەڕاو لە پەنای کەعبەدا دۆزیەوە و پێی وت: (يا مُحَمَّد، إنِّي أُرقِي من هذه الرِّيح و أنَّ الله يَشفي على يَدِيَّ مَن شاءَ، فَهَل لَكَ؟) واتە: ئەی محمد من بۆ ئەم نەخۆشیانەی بەهۆی جنۆکەوە توشی مرۆڤ دەبێت نوشتە دەنوسم، و خوای گەورە مەیلی بۆ هەر کەسێك لەسەر بێت لەسەر دەستی من شیفای دەدات، ئایا تۆش حەز دەکەیت ئەوەت بۆ بکەم؟

پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە لەسەرخۆیی و نەرمی فەرمووی: گوێم بۆ بگرە ئێستە بۆت باس دەکەم کە چیمە، فەرمووی: ( إنَّ الحَمْدَ لِلّهِ نَحمَدُهُ و نَستَعينُهُ، مَنْ يَهْدِهِ اللّهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، و مَنْ يُضْلِلْ فَلا هادِيَ لَهُ، و أشْهَدُ أنْ لاإلهَ إلا اللّه وحدَهُ لا شَريكَ لَهُ، وَ أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وُ رَسُولُهُ، أما بَعدُ ) ئای دەبێت پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بە سۆزەوە ئەمەی فەرموبێت، ئای دەبێت ئەو دەنگە زولاڵەی چۆن ئەم وشە پڕ مانایانەی دەربڕیبێت؟! بۆیە ئەوەندە کاریگەری هەبوو لەسەر ضِماد کە وتی: بەسە ئەی محمد، (أعد عَلَيَّ كَلماتَك هؤلاء). وتی: جارێکی تریش ئەم وشانەم بۆ دووبارە بکەرەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ جارێکی تر بۆی دوبارە کردەوە، ضِماد وتی: (لَقَد سَمِعتُ قَولَ الكَهَنَة، و قَولَ السَّحَرة، و قَول الشُعَراء، فَما سَمِعتُ مِثلَ كَلماتَك هؤلاء و لَقَد بَلَغْنَ ناعُوسَ البَحرِ)... ضِماد وتی: بەراستی من قسەی هەموو کاهین و ساحیر و شاعیر و بوێژانم بیستووە، بەڵام بەخوا هەرگیز وشەی وەکو ئەم وشە جوان و پڕمانایانەی تۆم نەبیستووە، بەڕاستی ئەمەندە جوانن گەیشتونەتە شەپۆلەکانی دەریا.

ئەمجا ضِماد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (هات يَدَك أُبايعُك على الاسلام، فبايَعَهُ) وتی: دەستت بێنە با پەیمانت بدەمێ لەسەر ئیسلام، پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی خستە ناو دەستیەوە و پەیمانی لێ وەرگرت. ئەمجا فەرمووی: (وَعَلى قَومك). و پەیمانم بدەرێ لەسەر هۆزەکەشت کە ئیسلامیان پێ بگەیەنیت و بیانکەیت بە پشتیوانی ئیسلام، ضِماد وتی: (وَعلى قَومي). وا پەیمانم پێ دایت لەسەر هۆزەکەشم، ئیتر جیا بونەوە.

ساڵان هاتن و چون و ئیسلام هێزی پەیدا کرد و دەوڵەتی ئیسلامی لە مەدینە دامەزرا و سوپاکەی پێغەمبەر ﷺ بە هەموو لایەکدا نێردران، ئیمامی

موسلیم و ئەحمەد (رەحمەتی خویان لێبێت) دەگێڕنەوە کە سوپای ئیسلام گەیشتە لای هۆزەکەی ضماد. سەردەستەی سوپاکە بە سەربازەکانی فەرموو: ئایا چیتان لەم هۆزە وەرگرتووە؟ سەربازێك وتی: قاپێك، دەفرێکم لێ وەرگرتن. سەرکردەکە فەرموی: (رُدُّوها، فَإنَّ هؤلاءِ قَومُ ضَماد) فەرموی: بۆیان بگێڕەوە، چونکە بەراستی ئەمانە هۆزەکەی ضِمادن کە کاتی خۆی پەیمانی خۆی و هۆزەکەی بە پێغەمبەری خوا ﷺ داوە.

کەواتە: ئەم هەوڵەش لەو کاتەدا ئامانجی بەدەست نەهێنا، بەڵام چەند وانەی بەنرخی فێر کردین، لەوانە:

**وانەی یەکەم:** خوای گەورە سەربازی ونی زۆری هەن (وَما يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّك إلا هُوَ) کە لە گەیاندنی پەیامی خوادا بەشدارن، یەکێك لەو سەربازە نەناسراوانە باطل خۆیەتی، جەنگی راگەیاندن دژی ئیسلام کە خوانەناسان دژی ئیسلام بە گوێی خەڵکیدا دەدەن. لەم نمونەیەدا راگەیاندنی قورەیش وای لە (ضِماد)کرد کە بەشوێن پێغەمبەری خوادا ﷺ بگەڕێ و پاشان خۆی و هۆزەکەی موسڵمان بوون. کەواتە: ئەم ڕاگەیاندنە ژەهراویە بوختاناویە بوو بە مایەی خێر بۆ ئیسلام .

لەم سەردەمەشدا لە (ئەیلولی ٢٠٠٥)و لە (شوباتی ٢٠٠٦)دا رۆژنامەی (جێلاندس پۆست)ی دانیمارکی لە ڕێگەی کاریکاتێرەوە سوکایەتی کرد بە پێشەوای مرۆڤایەتی و پێشەنگی بەها جوانەکانی سەر ڕووی زەوی، پێغەمبەری سەرورمان حەزرەتی محمد ﷺ، لە ئەنجامی ئەم هێرشە ئیعلامیەدا چەندین کاردانەوە و ناڕەزایی و خۆپیشاندانی لێ کەوتەوە و لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی و ئیسلامیدا کە هەرێمی کوردستانیش دەوری خۆی بینی، تا کار گەیشتە برینی پەیوەندی ئابووری لەگەڵ دانیمارك و ئیفلاس پێکردنی چەندین کۆمانیای زەبەلاح کە کاڵاکانیان لە جیهانی ئیسلامیدا ساغ

دەکردەوە وەکو وەڵامێك بۆ حکومەتی دانیمارك کە ئامادە نەبوو داوای لێبوردن لە موسڵمانان بکات... ئەو سۆز و خۆشەویستی و داکۆکی کردنەی کە موسڵمانان هەیانبوو لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ وای لە خەڵکی دانیمارك کرد کە بەدواچوون و لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلام بکەن و بەدوای سەرچاوەکاندا بگەڕێن بۆ ئاشکراکردنی ئەو نهێنیەی وای لەو خەڵکە کردووە کە ئاوا لەسەر ڕێبازی ئەو پێغەمبەرە بڕۆن. بۆیە دەستیان کرد بە کڕینی قورئانی تەرجەمەکراو بە زمانی دانیمارکی و ڕۆژنامەی (کریستلیگ دا گلبلادت) کە ڕۆژنامەیەکی مەسیحیە و لە دانیمارك دەردەچێت لە ڕۆژی (چوارشەممە ٢٠/١٢/٢٠٠٦) ڕایگەیاند: ئێستا قورئان زۆرترین ژمارەی دەکرێتە دیاری و خوێنەرێکی بەرفراوانی هەیە لە نێوان گشت چین و توێژەکانی کۆمەڵگای دانیمارکدا. تا ئەو ڕاددەیەی کە قورئان پلەی یەکەمی داگیر کردووە لە فرۆشتنی زۆرترین دانە، بە گوێرەی داتایەکی ڕۆژنامەکە تەنها لە مانگی (١٢ی ٢٠٠٦)دا (٥٠٠٠) پێنج هەزار دانە لە موصحەفی شەریف کە وەرگێردراوەتە سەر زمانی دانیمارکی فرۆشراوە. ئەوەش ژمارەیەکی پێوانەییە کە کتێبێکی بیانی بە نسبەت ئەوان تۆماری بکات،کە پێشتر لەو جۆرە ڕوداوانەی بە خۆیەوە نەبینیوە.

وە هەر ئەو ڕۆژنامەیە دەڵێت: دوای بڵاوبونەوەی ئەو کاریکاتێرانە ناتوانیت گوێ لە ڕادیۆیەك یان سەیری تەلەفزیۆنێك بکەیت، یان ڕۆژنامەیەك بخوێنیتەوە بە بێ ناوهێنانی ئیسلام و موسڵمانان...

هەروەها لە هۆڵەندا چەندین ڕێکخراوی دژ بە ئیسلامی تێدایە و لە ناوخۆو دەرەوەی هۆڵەندادا هەوڵی ناشرینکردنی ئیسلام دەدەن، کەچی وا لە زانکۆی (لاهوت) بەشی (اصول الدين الاسلامي) کرایەوە، ئەم بەشە بە هەوڵی ڕۆژهەڵاتناسی ناودار (کونجنفیلد) کرایەوە و تایبەتە بەخوێندنی زانستی ئیسلامی، بە وتەی (ڤان) کە توێژەرەوەیە لە ئایینی ئیسلامی و

ئایینەکانی تر، ئەوانەی رەخنە لە ئیسلام دەگرن شارەزاییان لە ئیسلام و مێژووی ئیسلام نیە. ئەم بەشە نوێیەی زانکۆکە (دوو ملیۆن و نیو یۆرۆ)ی بۆ تەرخان کراوە، و لە هۆڵەندادا (یەك ملیۆن) موسڵمان دەژی لە رەگەزی عەرەبی و غەیری عەرەبی.

لە کوردستانیش دوای بڵاو بونەوەی چەند بەناو کتێبی پڕ لە سوکایەتی کردن بە ئیسلام و قورئان موسڵمانان بە ئاگا هاتنەوە و بەرهەمی پڕۆژەی (تیشك) کەوتە کتێبخانەکانەوە کە ئەگەر ئەو بەناو کتێبە پڕ لە درۆ و بوختانانە دژی ئیسلام لەلایەن چەند ئەڵقە لە گوێیەکەوە نەنوسرانایە، ئەو پڕۆژەیەش ئەو بەرهەمە بە پیتانەی بە پێنوسی ئەو نوسەر و رۆشنبیرانە نەدەبوو.

**وانەی دووەم:** هەردوو سیفەتی بەرزی ئارامگری و لەسەرخۆیی (الـصَّبرُ و الحِلْم) لە شەخصیەتی پێغەمبەردا ﷺ رەنگی داوەتەوە، ئەوەتا (ضِماد) پێی وت:وابزانم تۆ شێتیت و جنۆکە دەستی لێ وەشاندویت کە (هـذا مَوقـفٌ يُـثِيرُ الغَـضَب) قسەیەکە و هەڵوێستێکە بە هەرکەس بوترێت ڕەگی توڕەبوونی دەوروژێنێت، بەڵام پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: ئەوە گاڵتەیان پێ کردویت، من لە هەزاری وەکو تۆ عاقڵترم، بەڵکو زۆر بە هێمنی وەڵامی دایەوە، ئەمەش بوە مایەی سەرسوڕمانی (ضِماد) لەو کەسایەتیە گەورەیە و هەموو ڕەوشتەکانی سەرکردەی تیا بینی و موسڵمان بوو.

کەواتە:بانگەواز بۆ ئەم دینە بە توندوتیژی ناکرێت، بە تایبەتی لە کاتی گفتوگۆ لەگەڵ کەسانی دوور لە دین.

**وانەی سێیەم:** گەورەیی خوطبەی (إنَّ الحَمـدَ للّه.......) کە ئەوەندە کاریگەری لەسەر (ضِماد) درووست کرد کە وتی: بەسمە... بەڵام چۆن وا کتوپڕ ئەو تەئسیرەی کرد؟! لە وەڵامدا دەڵێین:

١.دەنگی زوڵاڵ و زمانی شیرین و قسەڕەوانی و فەصاحەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی وتنی ئەو وشە گرانبەهاو پڕمانایانە.

٢.قسەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر لە سەری زمانیەوە دەرنەدەچون بەڵکو لە دڵێکی پڕ لە ئیمان و یەقین و حیکمەتەوە دەهاتنە دەرەوە و پێش زمان بە دڵ دەوتران و قسەش کە لە دڵ هاتە دەرەوە ئەچێتەوە ناو دڵەوە، هەرچەند وشەیەکی کەمیش بێت.

بەڵام قسەو گوفتار و وتار هەرچەندە لە ڕووی بلاغیەوە بەهێز بێ، بەڵام لە دڵەوە دەرنەچێت و بۆ ڕەزامەندی خوا نەبێت و بۆ ڕیاء بێت، کار لە دڵ ناکات و بێ بەرهەم دەبێت.

وانەی چوارەم: لە زوو ئیمان هێنانی (ضِماد) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئیسلام دینی فیطرەتە و لە راستی دا هەر کاتێك دەروونی مرۆڤ دوور بوو و ڕوت کرا لە کارتێکەرە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی ئەوا لە زۆربەی کاتدا هەر کە خێر و ڕاستی بیست پێی کاریگەر دەبێت و وەڵام دەداتەوە، جا یان بە بیستنی وتەیەکی کاریگەر یاخود بە بینینی ڕەوشت و هەڵسوکەوتێکی جوان و پەسەند. ئەوەتا کاتێك (ضِماد) ئەم وشە بە نرخانەی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بیست و ئەو نەرم و نیانی و ڕەفتارە جوانانەی لێ بینی، یەکسەر دەروونی پاکی هاتەوە جۆش و ئیمانی هێنا...

بەڵێ، مرۆڤی وا هەیە زوو فیطرەتی دێتەوە جۆش و خرۆش و تۆزو گەردی کوفر و شیرکی لەسەر لا دەچێت. بە یەك دانیشتن و ئامۆژگاری بە ئاگا دێتەوە، هەیشە بە دوو جار و بە چەندان جار ئەنجا ژەنگ دەروونی بەردەدات و فیطرەتی ساغی دەردەکەوێتەوە.

وانەی پێنجەم: پێغەمبەری خوا ﷺ زانی (ضِماد) مرۆڤێکی دەروون پاکە و ڕۆح سوکە و فەرمووی: دەبێت ئەم ئیسلامە بە قەومەکەشت

بگەیەنیت. کەواتە: کەسی ئیماندار نابێت تەنها خۆی دین وەرگرێت، بەڵکو دەبێت بیشی گەیەنێ بە کەسانی نزیکی و کەسی خۆی.

بەڵێ ئیمانداران: ئەم هەوڵەی هەشتەمیش ئەنجامێکی بۆ ئەوکاتە پێویستە نەبوو. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەوڵدان ناکەوێت و بە پشتیوانی خوا دەبێت ئەوەی کە مەبەستێتی کە سەرکەوتنی ئەم ئیسلامە و ڕزگارکرد نیەتی لە چەق بەستویی مەککەدا بیهێنێتە دی، بۆیە هەوڵی نۆیەم دەدات.

<u>هەوڵی نۆیەم:</u> ئەمجارەش پێغەمبەری خوا ﷺ لایەنی بەرامبەری نەبینی، بەڵکوکەسی بەرامبەر هات بۆ خزمەتی و خۆی پێ ناساند، ئەو کەسەش (عەمری کوڕی عەبەسە)ی سولەمی بوو، بەڵام چۆن هات بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ ئەمیش بە هۆی ڕاگەیاندنی بەهێزی قورەیشیە موشریکەکانەوە باسی پێغەمبەری خوای ﷺ بیست، چونکە ئەوەندەیان باسی پێغەمبەر ﷺ کردبوو کە دینی تازەی هێناوە و دژی بتە و دەڵێت نابێت خوا شەریکی هەبێت، ئەم دەنگوباسە گەیشتە گوێی ئەو پیاوە و بۆخۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (كُنتُ و أنا في الجاهلية أظُنُّ أنَّ النّاسَ على ضَلالةٍ و أنَّهُم لَيسوا على شَيءٍ و هُم يَعبُدُونَ الأوثانَ). واتە: من لە زەمانی جاهلیەت و نەفامیدا بۆم دەرکەوتبوو کە خەڵکی لە گومڕایی و سەرلێشێواویدا دەژین و لەسەر هیچ بەرنامەیەکی ڕاست نین بۆ ژیان، چونکە بتیان دەپەرست. ئەوەبوو ئەم بیرکردنەوەیە لە مێشکمدا مایەوە تا بیستم کە کەسێك لە مەککەدا پەیدا بووە و بانگەوازەکەی دەڵێت: بت پەرستی بەتاڵە و ئەبێت خوا دوور بێت لە هەموو هاوبەشێك و بە تاك و تەنیا بپەرسترێ. منیش بە پەلە خۆم گەیاندێ و لە مەککە دۆزیمەوە و عەرزم کرد: تۆ کێی؟ فەرموی: (أنا نَبيٌّ). من خوا ناردومی. وتم: بِأي شيءٍ أرسَلَكَ؟ پەیامی چی پێدا

ناردوی بۆ مرۆڤایەتی؟ قال: (أرسَلَني بصِلَةِ الأرحامِ، و كَسْرِ الأوثانِ، و أنْ يوحَّدَ اللهُ لا يُشرِك بِهِ شيءٌ) فەرموی: خوای گەورە رەوانەی کردووم بۆ ئەوەی خزمایەتی پتەو بێت و لەیەك نەپچڕێت، و بتەکان بشکێن، و خوای گەورە بە تاك و تەنیا بپەرسترێ و هیچ هاوبەشی بۆ دانەنرێت.... سبحان الله لە رەوانبێژی و کورتی و پوختی فەرمودەی ئەم پێغەمبەرە ﷺ، بە چەند وشەیەکی کورت هەموو ئیسلامی بەم پیاوە ناساند، فەرموی: ئیسلام دوو بەشە:

١.حق الله: مافی خوا کە بریتی یە لە یەکتاپەرستی و شکاندنی بتەکان.

٢.حق الخلق: مافی بەندەکان، کە بریتیە لە سیلەی ڕەحم و خزمایەتی، جا سیلەی ڕەحم واتە: چاکە لەگەڵ دایك و باوك، منداڵ، خزم، دراوسێ، ناسیاو هەمووی دەگرێتەوە. ئەمجا (عەمری کوڕی عەبەسە) لێی پرسی: فَمَنْ مَعَكَ على هذا؟ ئەی کێت لەگەڵە بۆ ئەم پەیامە؟ فەرموی: حُرٌّ و عَبْدٌ. مرۆڤی کۆیلە و ئازاد. (ئیتر نەچوو لیستی ناوەکانی بۆ بخوێنێتەوە چونکە پێویست ناکات). لێرەدا ئەم پیاوە ئیمانی هێنا و وتی: إني مُتَّبِعُكَ. واتە: من لێرەدا دەمێنمەوە و دەبمە شوێن کەوتەی تۆ چیم ئەمر پێ بکەیت ئامادەم ئەنجامی بدەم. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إنَّكَ لا تَستَطيعَ ذالِك يَومَكَ هذا ، ألا تَرى حالي و حالَ النّاس؟ ولكِنْ إرجع الى أهلِكَ، فإذاسَمِعتَ بي أظهَرتُ فأتيني). فەرموی: تۆ ئەمڕۆ ناتوانیت یارمەتی من بدەیت، ئەی بە چاوی خۆت حاڵی من و ئەو خەڵکە نابینیت کە بە چ شێوەیەك دژایەتیم دەکەن؟ بەڵام تۆ بڕۆرەوە بۆ ناو ماڵ و منداڵی خۆت، هەرکاتێك کە بیستت کە سەرکەوتوم و ئیسلام بانگەوازەکەی بە ئازادی و ئازایی بڵاو بۆتەوە ئەو کاتە وەرەوە بۆلام.

بەڵێ، لەسەر رێنمایی پێغەمبەری خوا ﷺ چوەوە ناو هۆزەکەی و هەر گوێی هەڵدەخست، تا بیستی پێغەمبەری خوا ﷺ چۆتە مەدینەو موسڵمانان

ئەوڵەتیان هەیە، ئەمجا خۆی گەیاندە مەدینە و چوە خزمەتی رسول اللهﷺ و عەرزی کرد: اتَعرِفُني؟ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمناسیتەوە؟ فەرموی: نَعم، أنتَ الذي لَقيتَني بِمَكَّةَ. بەڵێ، تۆ ئەو کەسەی کە لە مەککە پێم گەیشتی و قسەو باسمان کرد.... واتە: پێغەمبەر ﷺ هەرگیز یاران و شوێنکەوتوانی لە بیر نەدەچۆوە... کەواتە: هەوڵی نۆیەمیش ئامانجی نەپێکا.

هەوڵی دەیەم: چاوپێکەوتنی کەسێك بوو بە ناوی (ابي ذر) لە هۆزی (غفار) ئەم پیاوەش لە ناخی خۆیدا دژی بت پەرستی بوو، سێ ساڵ بوو لەسەر دینی حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ نوێژی بۆ خوای خۆی دەکرد، کە قورەیش ئەوەندەیان باسی پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، ئەم (ابي ذر)ەش دەنگوباسەکەی بیست و هات بۆ مەککە، بەڵام گەنجێکی ژیر بوو دەیزانی ئەگەر مەبەستی هاتنەکەی بدرکێنێت قورەیش ڕێگای لێ بزر دەکەن و ئازاریشی دەدەن و ناگاتە ئامانجیش، بۆیە لە پەنای کەعبەدا بۆخۆی دانیشت، ئیمامی عەلی ﷺ چاوی پێکەوت و دەمە و ئێوارەیەکی درەنگ بوو، چووە لایەوە و فەرموی: دیارە غەریبی؟ وتی: بەڵێ، فەرموی: دەی با بڕۆینەوە بۆ ماڵی ئێمە. بردیەوە بۆ ماڵ و ئەو شەوە هیچی لێ نەپرسی و (ابو ذر)یش هیچی نەوت. بەم شێوەیە سێ شەو ئیمامی عەلی ﷺ بردیەوە و شەوی سێیەم لێی پرسی: بۆچی هاتووی بۆ مەککە؟ ئەمجا لە ناسینی ئەم سێ شەوەی ئیمامی عەلیدا و مەردایەتی و پیاوەتیدا، (ابو ذر) دڵنیا بوو لە پاکی و دڵسۆزی ئیمامی عەلی ﷺ وتی:بەمەرجێك وەعدم بدەرێ کە لای کەس باسی نەکەیت و یارمەتیشم بدەیت. ئیمامی عەلیش ﷺ بەڵێنی پێدا. ئەمجا (ابو ذر) مەبەستی هاتنەکەی بۆ ئیمامی عەلی ئاشکرا کرد و ئیمامی عەلیش ﷺ بردی بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بە نهێنی چاوی پێ کەوت و موسڵمان بوو. (ابو ذر) فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا چ فەرمانێکم پێ دەکەیت تا جێبەجێی بکەم.. فەرموی: (إرجع الى قَومِكَ فأخبرهُم حتّى يأتِيَكَ أمري) فەرموی: خۆت ئاشکرا مەکە، بەڵکو

بگەڕێوە بۆلای هۆزەکەت و ئیسلامیان پێ ڕابگەیەنە تا ئەوکاتەی دەنگوباسی سەرکەوتنی ئیسلامت پێ دەگات و ئاگادارت دەکەمەوە. بەڵام (ابو ذر) ئیمانەکەی وا پتەو بوو فەرموی: بەخوا دەبێت کارێکی وا بکەم چۆن ئەو بت پەرستانە ئازاری دڵی پێغەمبەری خۆشەویستیان داوە ﷺ، منیش داخێك بنێم بە دڵیاندا، ئەوەبوو لە گەرمەی قەرەباڵغی دەوری کەعبەدا ، بە هەموو هێزی هاواری کرد: (أشْـهَدُ أن لاإلــهَ إلا اللّه و أشْـهَدُ أنَّ مُحُمَّـداً رَسُـول اللّه) ئەم شایەتمانە ئاشکرایە لە لایەن کەسێکەوە کە خەڵکی شاری مەککەش نیە وەکو بومەلەرزە مەککەی هەژاند، چۆن لە بەنی غەففاریشەوە خەڵك موسڵمان بوو؟ چۆن خەڵك وا بێ ترس و بیم لە هەموو سزایەك و بێمنەتانە ئیمانەکەی ئاشکرا دەکات؟

ئەوە بوو موشریکەکان لێی کۆبونەوە و ئەوەندەیان لێدا تا هەموو لەشیان شلاڵی خوێن کرد، تا عەباسی مامی پێغەمبەر ﷺ هات و وتی: وازی لێ بێنن ئەگینا غەففار تۆڵەتان لێ دەکەنەوە و دێنە سەر ڕێگەی بازرگانیەکەتان کاتێك بەلایاندا دەڕوات بۆ وڵاتی شام، ئەمجا وازیان لێ هێنا. (لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە عەبباس لەو کاتەدا هەرچەندە کافر بوو، بەڵام سۆزی هەبوو بۆ موسڵمانان، وە کەسێکی زۆر زیرەکیش بوو، ئەوەتا دەیزانی قورەیش تەنیا بە بازرگانی دەترسن، نەیفەرمو: لەبەر خاتری خوا وازی لێ بێنن، یان غەریبە، یان نەزانە، چونکە ئەمانە بێ سود دەبوو، بەڵام هەر کە باسی مەترسی بازرگانی کرد یەکسەر وازیان لێ هێنا).

بەڵێ، پاشان (ابو ذر) چوەوە ناو هۆزەکەی و بانگی کردن بۆ موسڵمان بوون، ئەوەبوو نیوەی قەومەکەی لەسەر دەستی ئەو موسڵمان بون و دوای کۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە نیوەکەی تریش موسڵمان بوون و بە کۆمەڵ هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ.

کەواتە ئەم چاو پێکەوتنەش بۆ ئێستا بێ ئامانج بوو.

<u>هەوڵی یانزەیەم:</u> پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمجارەیان کەسێکی بینی بە ناوی (طوفەیلی کوڕی عەمری دەوسی) لە یەمەنەوە هاتبوو، ئەمیش پیاوێکی ناسراو و ناودار و شاعیرێکی ژیر بوو، قورەیش کە زانیان هاتووە بۆ مەککە، خۆیان گەیاندێ و وتیان: (أنتَ شاعرُ ذكيٌّ و عندَنا ساحرٌ يُفَرقُ بينَ الرَّجُلِ و زَوجَتهِ و يُفرِقُ بالكَلامِ) وتیان: تۆ شاعیرێکی زیرەکی و ئێمەش کەسێکمان لە ناودا پەیدا بووە جادوگەرە و ژن و مێرد لەیەك جیادەکاتەوە و بەقسە خەڵکی لە یەك دەکات.... (طوفەیل) وتی: جا مەبەستان لەم قسانە چیە و ئەتانەوێت چیم پێ بڵێن؟ وتیان: (إيَّاكَ أنْ تَسمَعَ لَهُ) وتیان: ئامەمان نەچی گوێ بۆ بگریت.. (طوفەیل) وتی: ئەو کەسە لە کوێیە؟ وتیان: عِندَ الكَعبَة. واتە پێغەمبەری خوا ﷺ دانەنیشتبوو لە ماڵەوە بەڵکو بەردەوام لە هەوڵی گەیاندنی ئەم دینەدا بوو.... (طوفەیل) کە گوێی لەم قسانە بوو ترسێك لە ناخیدا بەرامبەر ئەو محمدە درووست بوو، بۆیە هەستا و چوو لۆکەی پەیدا کرد و هەردوو گوێچکەی پڕ کرد لە لۆکە بۆ ئەوەی گوێی لە محمد نەبێت نەوەك سیحری لێ بکات.

ئیمانداران: تەماشاکەن ڕاگەیاندن چەند کاریگەری خراپی هەیە، (طوفەیل) بەم ئیعلامە چۆن ترسێندرا و محمد چۆن بە ترسناك دەناسێت.

(طوفەیل) دەڵێت: لە پەنای کەعبەدا نیشانیان دام کە ئەوە محمدە و ئاگات لە خۆت بێت سیحرت لێ نەکات، ئیتر ئەوان ڕۆیشتن، تەماشا دەکەم نوێژ دەکات، نەمدەوێرا سەیری بکەم دەمگوت: نەوەك سیحرم لێ بکات. نازانم چۆن بوو بەلایدا تێ پەڕیم، (فَأبى اللهُ إلاّ أنْ يسمَعَني بَعضَ ما قال) خوای گەورە ویستی لەسەر بوو کە چەند وشەیەك لەوەی دەیڵێت بیستم، هەرچەندە لۆکەشم خستبوە گوێمەوە.

(طوفەیل) دەڵێت: خۆم بە خۆم وت: (وَيحَكَ يا طُفَيل، أنتَ شاعِرٌ أتَظُنُّ أنَّ كلاماً سَيَسحرك؟) خۆم بە خۆمم وت: ئەی هاوار بۆ تۆ طوفەیل، لای خۆی تۆ شاعیری، ئایا وا دەزانیت بە بیستنی قسەیەك سحرت لێ دەكرێت؟. بەڵێ، غیرەت گرتمی و لۆكەی ناو گوێم فڕێ داو چوومە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوێم بۆ قورئان گرت، شیرینی قورئان بەو دەنگە بەسۆزەی پێغەمبەر ﷺ كاری كردە دڵم، خۆم بۆ نەگیراو شوێنی كەوتم تا چووە ماڵەوە، لە دەرگام داو ئیزنم خواست و چومە ژوورەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ باسی ئیسلامی بۆ كردم و موسڵمان بووم. (طوفەیل) دەڵێت: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (ما تأمُرُني؟) بە چی ئەمرم پێ دەكەیت؟!. فەرمووی: (إرجع الى قَومِكَ وادعُهُم للإسلامِ فأتيني بهِم يَوم أنْ يَظهَرَني الله تَعالى). فەرمووی: بگەڕێوە بۆ ناو هۆزەكەت و بانگیان بكە بۆ ئیسلام و بیانهێنە بۆلام ئەو ڕۆژەی كە خوای گەورە سەری خستم.... بەڵێ، لەسەر فەرمانی پێغەمبەر ﷺ (طوفەیل) گەڕایەوە بۆ ناو قەومەكەی و بانگی كردن بۆ ئیسلام، بەڵام لەماوەی یەك ساڵی ڕەبەقدا تەنها دایك و باوكی و یەك پیاو لە هۆزەكەی ئیمانیان هێنا، ئەویش (عَبدُالرحمن ی كوڕی صَخر)بوو كە دواتر پێی وترا: ابوهُريره. باقی هۆزەكەی زۆر ئازاریان دا، ئەمجا (طوفەیل)هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ كە لەو كاتەدا لە مەدینە بوو، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دوعایان لێ بكە بەڵكو خوا لەناویان بەرێت، ئەو هەمووە بانگیان دەكەم موسڵمان نابن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی (طوفەیل) صەبر و ئارامت هەبێت، من سیانزە ساڵ ئازارم چێشت و ئارامم گرت، تۆش ئارام بگرە و بگەڕێوە بۆ ناو قەومەكەت و بەردەوام بە لەسەر بانگەواز، ئینجا دەستی بەرزكردەوە بۆ ئاسمان و فەرمووی: ( اللّهُمَّ اهد دوساً وائتيني بهم دوساً ). فەرمووی: خوایە هیدایەتی دەوسیەكان بدە و بە موسڵمانێتی بیانهێنە بۆ ئێرە. بەڵێ: دوعاكەی پێغەمبەری خوا ﷺ گیرابوو، لە

دوای فەتحی خەیبەر و فەتحی مەککە. ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ تۆز و غوبارێکی زۆری بینی کە ڕێگاکە دیار نەبوو، فەرمووی: ئەوە چ قەوم و هۆزێکن؟ عەرزیان کرد: قوربان ئەوە هۆزی دەوسن هاتوون بۆ ئەوەی پەیمانت پێ بدەن... دوای ئەوە (طوفەیل) ئاواتەکەی هاتە دی و لە غەزادا شەهیدکرا.

ئیمانداران: تا ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەیشتۆتە ئەو ئامانجەی کە خۆی دەیەوێت، بەڵام لێرەدا کۆمەڵە وانەو دەرسێك هەیە نابێت بەسەریاندا تێپەڕ ببین:

**وانەی یەکەم:** ئایینی ئیسلام مەبەستی ئەوەیە کە خەڵك لەسەر شەرعی خوا عیبادەتی خوا بکەن و دونیا ئاوەدان بکەنەوە، بەڵام عیبادەت بە بێ بوونی شوێنێکی هێمن و بوونی هۆیەکانی ژیان و گوزەران وەکو پێویست ئەنجام نادرێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم دانیشتنەیدا داوای پشتیوانی لەم کەسانە نەکرد، چونکە هۆزەکانیان نەیاندەتوانی پێغەمبەری خوا ﷺ و موسڵمانان بپارێزن و کەشێکی هێمنیان بۆ دابین بکەن و ئەوەندەش شوێنەکانیان ئابووری نەبوو کە ژیانی خۆشیان و خەڵکی کۆچکردووی مەککەش دابین بکەن.

کەواتە: ئیسلام لەسەر فکرەی هەڵچوو تەواکوڵ ناژی، بەڵکو لەگەڵ واقیعدا دەژی، بەڵێ، کاتی خۆی کە حەزرەتی ئیبراهیم ﷺ کە ئیسماعیل و هاجەرەی علیهما السلام لەو بیابانە وشك و بێ ئاوو بێ نانە بەجێ هێشت فەرمووی: ﴿ رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ بەڵام پێویستیان بە چی هەیە تا بتوانن عیبادەت بکەن، فەرمووی: خوایە گیان ﴿فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ﴾. ابراهيم:٣٧.

داوای دوو شتی بۆ کردن، یەکەم: ئاسایش و هێمنی، دووەم: ڕزق و ڕۆزی و باشی باری ئابووری.

بەڵێ ئیمانداران: حەزرەتی ئیبراهیم‌ﷺ و حەزرەتی محمد ﷺ یەك شت بە هەڵگرانی پەیامی ئیسلام دەڵێن کە: کاتێك بانگهێشتی خەڵکی دەکەن بۆ شوێن کەوتنی ئایینی خوا لە بیرتان بێت کە دەبێت لە بیری ( بژێوی و ئاسایش )یاندا بن، لە بیرتان بێت کە دینداری مرۆۋ دەیکات و لەسەر زەویدا دەکرێت، مرۆڤی موسڵمان دەبێت نیشتیمان و وڵات و دارایی و ئەمن و ئاسایشی هەبێت و بژێوی ژیانی مسۆگەر بێت، تا لەو ژیانەدا کە بۆی بڕیار دراوە بتوانێ خواپەرستی و ئەرکی بەندایەتی جێبەجێ بکات، دینداری بە ترس و لەرزەوە و بە سکی خاڵی ناکرێت.

کەواتە: موسڵمان دەبێت زۆر بە بەرنامە و ژیرانە دین بگەیەنێت و لە هەموو کەسیش زیاتر ئاگاداری پاراستنی باری ئاسایشی وڵاتەکەی و بنەما ئابووریەکانی بێت و نەیان شێوێنێت و تێکیان نەدات.

وانەی دووەم: لە ئایینی ئیسلامدا، دڵسۆزی موسڵمان لەوەدا دەرناکەوێت کە خۆی بخاتە ژێر ئەشکەنجە و ئازاری لە ڕادە بەدەرەوە و بە بێ مەبەست خۆی بە کوشت بدات. بەڵکو ئامانج و مەبەست ئەوەیە ئەم دینە بەرهەمدار بێت و ئەو کەسە موسڵمانە لەژێر سایەیدا بحەسێتەوە، لەو چاوپێکەوتنانەی کە باسمان کرد پێغەمبەر ﷺ بە هەریەك لە (سوەیدەی کوڕی صامت) و (ضِماد الأزْديِّ) و (عەمری کوڕی عەبەسە) و (أبو ذَری غەفاری) و (طوفەیلی دەوسی) فەرموو: (إرجع الى قَومِكَ فإذا سَمِعتَ بي ظَهرتُ فأتينى). واتە: بڕۆوە بۆ ناو ماڵ و خێزانی خۆت و هەرکاتێك سەرکەوتم ئەوکاتە وەرەوە بۆلام.... چونکە ئەمانە بچنەوە بۆ ناو خزم و هۆزەکانیان و بمێنن باشترە و بانگەوازی خەڵکی بکەن بۆ ئیسلام باشترە و ئەوە خەباتە و تێکۆشانە و بەرهەمدارە. چونکە ئەمەیان پێ دەکرێت، فعلاً واشیان کرد و ئەو هەموو هۆز و خێڵەش موسڵمان بوون

پێیانەوە... بەڵام بۆچی بیلال و خەباب و زەنیرە و سومەییە لەژێر بەردی گەورە و لەو ناو لم و بیابانە گەرمەدا ئازار دەدران؟ چونکە ئەوان خزم و کەسێکیان نەبوو بچن بانگیان بکەن بۆ ئیسلام، دڵسۆزی نواندنەکەیان لەوەدا خۆی دەنواند کە بەربەرەکانی قورەیشە موشریکەکان بکەن و ئازاری دەروونیان بدەن و گەورەیی ئیمان و ئیسلامەتی و بەقوربان بوونی عەقیدەیان نیشان بدەن. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەشی واجب نەکردبوو لەسەریان، (عەماری کوڕی یاسر) کە دایکی ( سومەییە) بە دەستی ابوجهل شەهید کراو باوکی لە ژێر ئەشکەنجەدا بە ریشی سپییەوە شەهید بوو، ئەوەندەیان ئازاری (عمّار) یش دا وای لێ هات کە نەیدەزانی چی دەڵێ، ئەوە بوو موشریکەکان ئەوەندەیا ئازاری (عمّار)دا کە لە تاوی ئازاری جەستەی قسەی ناشرینی بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و بە باشی باسی بتەکانی قورەیشی کرد، ئەمجا وازیان لێ هێنا. جا کاتێك هاتەوە سەر خۆی و چووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (ما وَراءَكَ؟) ها دەنگ و باست چیە؟ قال: شَرٌّ. عمّار فەرمووی: خراپە و تاوانە. (والله ما تَركَني المُشركونَ حَتّى نلتُ منكَ، وَ ذَكَرتُ آلهَتَهُم بخَيرٍ). فەرمووی: سوێند بە خوا موشریکەکان وازیان لێ نەهێنام هەتا قسەی نابەجێم بەرامبەر جەنابت کرد و بەچاکی باسی خواکانیان (بتەکانیان)م کرد. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (كَيفَ تَجِدُ قَلبَكَ؟) ئەی دڵ و دەروونت چۆنە؟ قال: (مُطمَئِناً بالإيمان). عەممار فەرمووی: دڵم پڕ یەقین و ئیمانە بە خوا و پێغەمبەرەکەی. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (فإنْ عادوا فَعُدْ). ئەگەر ئەمجارەش تینیان بۆ هێنایتەوە و خستیانیتەوە ژێر ئەشکەنجەی لاشە پڕوکێنەوە دوبارەش تۆ قسەم پێ بڵێرەوە و باسی بتەکانیان بە چاکە بکە با لە دەستیان رزگارت بێت. ( ئەم بەسەرهاتە ئیمامی حاکم ریوایەتی کردووە). قورئانی پیرۆزیش هاتە خوارەوە و راستی ناو دڵی (عەممار)ی سەلماند کە دەفەرموێت: ﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا

مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ وَلَـٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ النحل: ١٠٦

واتە: ئەو کەسەی بێ باوەڕ بێت بە خوا لە پاش باوەڕ هێنانی، مەگەر کەسێك زۆری لێ کرابێت و دڵیشی دامەزراو بێت بە باوەڕ، بەڵام کەسێك دڵی خۆش و شادومان بێت بە بێ باوەڕی ئەوە بەر خەشم و قینی خوا کەوتون و سزای گەورەیان دەبێت.

ئەی گەنجانی بەڕێز، لەم دوو نمونەیەی عەممار و بیلالدا فیقهو تێگەیشتنێکی گەورە هەیە کە بریتیە لە ( العَزيمة و الرُّخصَة) خۆڕاگری و مەیدان چۆڵ نەکردن و چۆك دانەدان بەرامبەر دوژمن لەگەڵ درووست بوونی رۆخصەت و ماوە وەرگرتن بۆ خۆ ڕزگار کردن لە ئەشکەنجە و ئازاری دوژمنان. بیلال عەزیمەتی هەڵبژارد و عەمماریش ڕوخصەتی هەڵبژارد و هەردوکیشیان درووستن ئەگەر چی عەزیمەت گەورەترە.

کەواتە: لاوانی بەڕێز و دڵسۆز بۆ ئیسلام، بواری خۆتان بدۆزنەوە لە خزمەتی ئیسلامدا. هەیە دەتوانێ بانگەواز بکا، ئەم دینە بە شارەزایی و زمان شیرینی بە خەڵك بگەیەنێت، هەیە دەتوانێت شیعر و پەخشانی جوان بنوسێت و جوانیەکانی ئەم دینە بە ئەدەبیات دەرببڕێت، هەیە وەرزش کارەو دەتوانێت بە ڕەوشتی جوان لە یاریدا و بە ڕەفتار ئیسلام بگەیەنێت بە دەوروبەر و نزیکانی، ئەوەی کاسپکارە بە دەست پاکی و بە ویژدانی و بە کارجوانی خزمەتی ئەم دینە بکات، هەرهەمووی هەر تێکۆشانە لە پێناوی ئەم ئیسلامەدا.

وانەی سێیەم: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز تیرۆر و تۆقاندن و پەنهان کوشتنی نەکردووە، ئەوەتا هەریەکە لەو کەسانەی کە موسڵمان دەبن، لەگەڵ ئەوەدا کە خەڵکی مەککە نین و کەس بە موسڵمان بوونی نەزانیون تا گومانیان لێ بکرێت و بگیرێن و هەموو ئامادەییەکیشیان تێدایە بۆ

جێبەجێکردنی فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: برۆ ابوجهل بکوژە بە نهێنی و تیرۆری بکە، نەیفەرموو: برۆ بە شەو (دار الندوة)ی کافرەکان بسوتێنە، یان برۆ دوکان و بازاڕەکانیان بسوتێنە، لە کاتێکدا زۆر بە ئاسانیش دەیانکرد بۆی. ئەبوذەر ئامادە بوو خۆی بە کوشت بدات، ئایا ئەوەی بۆ نەدەکرا؟. بە بێگومان، بەڵام پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ئارامی شار ناشێوێنێت و کەس بە نهێنی ناکوژێت، ئەگەر یەکێك بڵێت: ئاخر پێغەمبەر ﷺ خۆی و یارانی لە مەککەدا بوون بۆیە وای نەدەکرد، لەوەڵامدا دەڵێین: کاتێك لە مەدینە بووە هەرگیز نەبووە ڕۆژێك کەسێك بنێرێت بۆ کوشتن یان سوتاندنی شوێنێك، ماڵێك، دوکانێك، لە مەککە کە کافرەکانی لێ بوون، بەڵکو کاتێ کە شەڕ و جیهادیش کراوە لە دەرەوەی ئاوەدانی کراوە دیل نەکوژراوە و بەزۆر هێنراو بۆ جەنگ پارێزراوە.

کەواتە: تێئەگەین لە ئیسلامدا تیرۆر و ڕەشەکوژی و تەقاندنەوەی ناو بازاڕ و پەنهان کوشتنی دوژمن لە ناو ماڵ و مناڵدا، ڕێگە پێ نەدراوە و ئیسلام و ئیرهاب و تیرۆرستی دوو شتی دژ بە یەکن.

**وانەی چوارەم:** ڕاگەیاندن چ کاریگەریەکی خراپی هەیە لەسەر ناشرینکردنی جوانیەکان، ئەوەتا طوفەیلی دەوسی لۆکەی خستبویە گوێیەوە لەترسی سیحری پێغەمبەر ﷺ، بەڵام کە لۆکەکەی لابرد حەقیقەتی بۆ دەرکەوت. کەواتە: لۆکە لە گوێتان لابەن و لە ئیسلامەوە ئیسلام بناسن نەك لە دوژمنانیەوە، دوژمنانی ئیسلام لە کۆنەوە چەکی ڕاگەیاندن و ترس و تۆقاندنیان بەکار هێناوە، ئەوەتا کاتی خۆی فیرعەون بە حەزرەتی موسا ﷺی دەوت: ئەی خەڵکینە ﴿ إِنَّ رَسُولَكُم الَّذِي أُرسِلَ إِلَيكُمْ لَمَجْنُون ﴾ دەیوت: موسا شێتە، ساحیرە، پاشانیش کە هیچی بۆ لەگەڵ نەکرا کۆتا چەکی خۆی بە ڕووی موسادا دەرخست کەچەکی هەڕەشە و ترساندن و تۆڵە و تەهدیدە،

بەوپەڕی خۆ بەگەورەزانیەوە وتی: ﴿ لَئِنْ اتَّخَذْتَ إلهاً غَيْرِي لأجْعَلَنَّكَ مِنَ المَسجُونِينَ ﴾.

فیرعەون دژەکانی خۆی زیندانی دەکرد لەناو بیرێکی قوڵ و تاریکدا کە هیچی نەدەبینی و نەدەبیست تا دەمرد، ئەم زیندانیەی لە کوشتن سەختتر بوو.

لە ڕاگەیاندنێکی تری فیرعەون بە شوێنکەوتوانی دەوت: ﴿ ذَرُونِي أَقْتُلُ مُوسى وَ لْيَدْعُ رَبَّهُ إنِّي أخافُ أنْ يُبَدِّلَ دِينَكُمْ أوْ أنْ يُظْهِرَ فِي الأرْضِ الفَساد ﴾.

فیرعەون بەو هەموو ستەمکاری و خراپەکاریەیەوە خۆی بە چاکساز و موصلیح نیشان دەدا و موسای چاکەخواز و چاکسازی بە تێکدەر ناو دەبرد... لە سەردەمی پێغەمبەری خواشدا ﷺ ئاوا ڕاگەیاندن بەکار دەهێنرا بۆ ناشرینکردنی ئیسلام و موسڵمانان و شەخصی پێغەمبەری خوا ﷺ.

لەم سەردەمەشدا زۆربەی ڕاگەیاندنەکان بەدەست جولەکەی جیهانەوەن، ئیستا (٦٠٪)ی ڕۆژنامە و گۆڤارەکان و (٣٠٪)ی کەناڵەکانی تەلەفزیۆن بە دەست ئەوانەوەیە و بەکاری دەهێنن بۆدژایەتی ئیسلام.

ئیستا شەبەکەی تەلەفزیۆنی (CNN -ABC - CBS - NBC) کەلە (٩٥٪)ی دەنگوباسی جیهانی لەوانەوە بڵاو دەبێتەوە، بەدەست جولەکەوەیە.

سێ دەزگای ڕۆژنامەی کاریگەریش لە ئەمەریکادا بەدەست جولەکەوەیە وەك دەزگای (نیۆرك تایمز) کە (٣٦) ڕۆژنامە و (١٢) گۆڤار دەردەکات و سێ دەزگای چاپکردنیشی هەیە، هەروەها ئەم دەزگایە هەواڵی ڕۆژانە ئەدات بە (٥٠٠) ڕۆژنامە، زۆر گۆڤاری گرنگ وەك (تایم) کە هەفتانە نزیکەی (٤ ملیۆن)ی لێ دەردەچێت و (نیوز ویك) کە ( دوو ملیۆن و سێ هەزار)ی لێ چاپ دەکرێت، بە هەمان شێوە بەدەست جولەکەوەیە.

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو ڕاگەیاندنە ژەهراویانەدا زۆرجار ئەم ڕاگەیاندنانە بۆتە هۆی ئەوەی زیاتر ئیسلام و قورئان بناسرێ و خەڵك بە

شوێنیا بگەڕێت، هەر بۆ نموونە: یەکەم نوسخەی قورئان کە چاپ کرا لە شاری (ڤێنیسیا)ی ئیتاڵیا بوو، لە ساڵی (١٥٣٧ی زایینی)دا... دووەم جار لە شاری (هامبۆرگ) لە ئەڵمانیا لە ساڵی (١٦٩٤ ی زایینی)دا چاپ کرا... سێیەم جار لە ساڵی ( ١٧٨٧ ی زایینی)دا شاژنی روسیا یارمەتی چاپکردنی دا... پاشان لە ساڵی (١٨٧٧ ی زایینی)دا لە (ئاستانە) لە دەوڵەتی عوسمانی چاپ کرا.

کەواتە: سێ جار کافرەکان قورئانیان چاپ کردووە، ئەمجار جاری چوارەم موسڵمانان چاپیان کردووە.

ئیستا لە وڵاتێکی وەکو (پاکستان) هەر سێ ماڵ و حافزێکی قورئانی تێدایە کە دەگاتە نزیکەی ( حەوت ملیۆن) حافز..

دکتۆر (محمد الراوی) کە خەڵکی میصرە و بانگخوازێکی گەورەیە و پێی دەڵێن: (الرَّجُلُ القُرآني) دەڵێت: لە نەیجیریا بووم، پیاوێکی سەوزە فرۆش لە بەردەرگا سەوزەم لێ دەکڕی، یەك پیت زمانی عەرەبی نەدەزانی، کەچی حافزی قورئان بوو، سورەتی (ئەعراف)ی بۆ خوێندم، کە بەڕاستی خۆم حافیزی قورئانم، سوڕەتی (الأعراف) لەبەرکردنی زۆری دەوێت، خوا ئاگادارە بە جۆرێك خوێندی سەرسام بووم، تاقە هەڵەیەکی تەنانەت لە تەجویدیشدا نەکرد.

رۆژهەڵات ناس (لورافاگلیری) دەڵێت: تەنها لە میصردا ئەوەندە حافزی قورئان هەیە کە ژمارەیان زیاترە لەوانەی کە لە هەموو ئەوروپادا دەتوانن ئینجیل بخوێننەوە.

تا ئێستا قورئان بە زیاتر لە (١٣٠ زمان)واتای لێك دراوەتەوە، لە کاتێکدا ئینجیل بەو هەموو دەعمە ماددیەی بۆی دەکرێت، رۆژبەرۆژ خوێنەرانی کەم دەبنەوە، ئەوەتا قەشەیەکی ئینگلیزی بە ناوی (هنستون) لە

ئوستوراليا ئينجيلى كورتكردۆتەوە و ناوى ناوە (بايبل المائة دقيقة) واتە: ئەو ئينجيلەى لە (١٠٠) خولەكدا دەخوێنرێتەوە، ئينجا زۆر كەم كەس دەيخوێنێت و ئەوانەش كە بتوانن لەبەرى بكەن هەر زۆر كەمن و يان هەر نين.

ئيمانداران: ئەوەى كەباسمان كرد بەڵگەيە لەسەر ئەوەى كە ئەو هەموو دژايەتيەى قورئان و ئيسلام واى كردووە كە خەڵكى بگەڕێن و بزانن ئەو قورئانە چيە وا دژايەتى دەكرێت، گەڕاوە بە شوێنيا و سەرەنجام لێى كۆڵيوەتەوە و عاشقى بووە.

كەواتە: سەرەنجام و پاشەڕۆژ هەر بۆ ئيسلامە ﴿ يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ و اللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَو كَرِهَ الكافِرُون ۞ هُوَ الَّذي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدى وَ دِينِ الحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَو كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ﴾.

سەرچاوەكان:

١.قورئانى پيرۆز.

٢.پوختەى تەفسيرى قورئان – ملا محمد مەلا صالح.

٣.على خُطى الحبيب – عمرو خالد – ص٨٢، ص٨٣

٤.السيرة النبويّة – د. علي محمد محمد الصَّلابي /ج١/ ص٤١٢ ،ص٢٥٠، ص٢٥٢، ص٢٥٦، ص٢٥٤،ص٢٥٧

٥.هەفتەنامەى يەككرتوو /ژ:٦٢١ لە ٢٠٠٧/١/٩ ل١٢

٦.هەفتەنامەى كۆمەڵ ژ: ٢٥٤ لە ٢٠٠٧/١/٦ لاپەڕەى كۆتايى.

٧.بانگى هەق – ژ:٢٣ – ل٣٨ – لە نوسينى: م. عمر عبدالعزيز.

٨.ژيانى موسا – ناصح محمد شريف ل٦٧.

٩. بەرەو ئيسلام – ئارامى– ئەندازيار عثمان محمد رشيد – ل١٦ ، ل ٣٧.

# وتاری چوارەم بۆ مانگی محرم

## هیجرەت

## (بەشی چوارەم)

## [ پەیمانی عەقەبەی یەکەم ]

# وتـاری چوارەم بۆ مانگی مُحرَّم

## هیجرەت ... (بەشی چوارەم)

## ﴿ پە یمانی عەقەبەی یەکەم ﴾

( الحَمدُ للّٰهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

ئیمانـدارانی بـەڕێز و خۆشەویـست: بـۆ تـەواو کردنـی وتـاری رابـردوو دەربارەی هیجرەتـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـە مەککـەی پیرۆزەوە بـۆ مەدینـەی مونەوەرە و پرشنگدار، دەڵێین ( وبالله التَوفيق ) :

موشـریکەکانی مەککـە هەرکەسـێك بهاتایەتـە مەککـەوە و بـە تایبـەت بیانزانیایە کەسێکی بە توانایە، بە تایبەتی شاعیرە، خێرا خۆیان دەگەیانـدێ بۆ ئەوەی کاری لێ بکەن کە نەهێڵن موسڵمان ببێ، چونکە دوژمنـانی ئیـسلام هـەر لـە کۆنـەوە زانیویانـە کـە راگەیانـدن گـەورەترین چـەکە بـۆ روبـەروو بوونـەوەی موسـڵمانان و لـە خـشتە بردنیـان، کـاتی خـۆی شـاعیرێك بەقـەدەر کەناڵێکی ئاسمانی دەوری هەبووە، بۆیە ئەوان زمـانی شـاعیرانیان خستوەتە کار و (حەسسان)یش بەرپەرچی ئەدانەوە و هەڵی وەشاندبوون.

جارێکیان شاعیرێك بە ناوی (أعشى) لە یەمەنەوە هات موسڵمان ببێـت، هـەر ئەوەنـدە کـافران پێیـان زانـی چونە لای و پێیـان وت: تـۆ نازانیـت ئەگـەر موسـڵمان بیـت رێـی مـەی خواردنـەوەت لێ دەگـرن. ئـەویش وتـی: مـەی خواردنـەوە شـتێکی خراپـە و مـرۆڤ عـەقڵی لـە دەسـت دەدات. وتیـان: ئـەی نازانیـت رێـی زینـاکردن و رابواردنـت لێ دەگرن؟ وتـی: مـن پـیرم و کـارم بـەو شتانە نەماوە. کە زانیان بەوانە ناگەڕێتەوە وتیان: ئەڵێی چی سەد وشترت

بدەینێ و بگەڕێیتەوە؟ کابرا ئەوەندە خەڵاتەکەی بەلاوە گەورە بوو رازی بوو. وشترەکانیان دایەو گەڕایەوە بەرەو یەمەن، کە نزیک یەمەن بۆیەوە لە وشترێکیان کەوتە خوارەوە و بە کافری مرد و خێری لە ماڵەکەی نەدی. بەڕاستی سەیرە (سەد) وشتر بە زمانی ئەمڕۆ یانی (چەند ئۆتۆمبێل) چونکە دەیانزانی شاعیر راگەیاندنە و کاریگەری زۆری دەبێت.

قورئان لەو بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيۡهِمۡ حَسۡرَةٗ ثُمَّ يُغۡلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحۡشَرُونَ﴾ الأنفال: ٣٦. واتە: (بێگومان ئەوانەی بێ باوەڕن ماڵ و سامانی خۆیان بەخت دەکەن بۆ ئەوەی بە شێنەیی بەربەست دانێن و رێگری بکەن لەبەردەم ئایین و رێبازی خوادا، جا ماڵ و سامانیان لە ئایندەدا بۆ ئەو مەبەستە خەرج دەکەن، پاشان دەبێتە پەشیمانی و داخ و حەسرەت لە سەریان، لە دوایدا شکست دەهێنن، بێگومان ئەوانەش کە بێباوەڕ بوون بۆ دۆزەخ کۆدەکرێنەوە و راپێچ دەکرێن).

بەڵێ ئیمانداران: وا دەڕۆژەکە تەواو بوو ( في آخرِ أيامِ التَشريقِ منَ الحَجِّ ) خەڵکی هەموو خەریکی کۆکردنەوەی کەل و پەلەکانیان بوون و یەك دوو رۆژیان مابوو بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، وا ئێوارەیەکی درەنگە و پێغەمبەری خوا ﷺ وا لە مینایە، خەریکە دنیا تاریك دەبێت و مینا چۆڵ دەبێت.

بەڕێزان: خەڵکی کاسبکار قسەیەکی جوانیان هەیە کە دەڵێن: لە کۆتایی رۆژدا رزق بەرەکەتی زۆری تێدایە، چونکە ئەو کاسبکارە نەبەزیوە و لە بەیانیەوە لە هەوڵدانداا بووە.

بەڵێ، تا ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ هیچ ئەنجامێکی دەست نەکەوتووە، ئەگەر کەسێکی تر بوایە جگە لە پێغەمبەری خوا ﷺ دوای ئەو هەموو هەوڵدانە دەیوت: خۆ وا مینا کەسی لێنەماوە و حەج تەواو بوو، نەمتوانی سود لە کەس وەرگرم، ئیتر با بڕۆم. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ کە شکست و بێ ئومێدی لە فەرهەنگیدا نەبوو هەر کۆڵی نەدا و هێشتا دوای ئەو هەموو هەوڵە بێ ئەنجامە، هەموو گیانی ئومێد و هیوا بەخشینە و قەت ڕەشبین نەبووە، بەردەوام گەشبین بووە، ئەم دەرسە فێری کۆڵنەدانمان دەکات لە کاروباری دونیایی و دیندا، و فێرمان دەکات شکست سەرەتای سەرکەوتنە... بەڵێ، ئیستا وا ئاخری کاتە و پێغەمبەر ﷺ لەلای سەرتاشێك چاوی بە شەش کوڕی گەنج کەوت. سەرنج بدەن پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ گەیاندنی ئەم دینە دەگەڕێت بە هەموو شوێنێکدا، تەنانەت ئەچێتە دوکانی سەرتاشێك، ئەمەش شانازی و فەخرە بۆ سەرتاشەکان کە ئاسۆی هیوا لە دوکانەکەی ئەوانەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ دەرکەوت. کەواتە: دوکانەکانتان لە گۆرانی و وێنەی ناشەرعی بپارێزن، کە بەداخەوە زۆر لە برایانی سەرتاش دوکانەکانیان گۆرانی بیانی و بێ مانا و وێنەی ئافرەتانی تێدایە.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان نزیك بۆیەوە و تەماشای کردن زۆر مناڵکارن، هەرە گەورەکەیان تەمەنی (٢١ ساڵ) بوو. ناوی (ئەسعەد کوڕی زورارە)بوو، فەرموی ﷺ: کوڕە گەنجەکان ئێوە کێن؟ وتیان: مِنَ الخَزْرَج. لە خەزرەجی یەثریبین. فەرموی: أمِنْ مَوالي يَهُود؟ لە هاوپەیمانی جولەکەکانن؟ وتیان: بەڵێ. تەماشاکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ چەند شارەزای دەوروبەر و دونیای دەرەوەیە. (ئەمڕۆ چەند پێویستمان بە زانستی جوگرافی و مێژوو و ئابوری و کۆمەڵناسی هەیە، موسڵمان ئەبێت کەسێکی بە ئاگا و چاو کراوە و

شارەزای هەموو دونیا و گەلان و ژیانیان و هەڵسوکەوتیان و پەیوەندیە نێودەوڵەتیەکانیان بێت).

پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (أفَلا تَجلِسُونَ أُكَلِّمُكُم؟) ئایا ئامادەن ماوەیەك دانیشن لەگەڵما و هەندێك قسەتان بۆ بکەم؟ (کەواتە: دەبێت سوپاسی ئەو کەسە بکەین کە گوێمان بۆ دەگرێت، نەك منەتی بەسەردا بکەین کە چاکەمان پێ وتووە، ئەبێت ئەجر و پاداشتمان تەنها لە خوا بوێت) کوڕە گەنجەکان وتیان: بەڵێ فەرموو. پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی کرد بە قسە کردن و قورئان خوێندنەوە و باسی ئیسلامی بۆ کردن و فەرموی: من پێغەمبەری خوام و کۆتا پێغەمبەرم.... گەنجەکان کە ئەمەیان بیست بە سەرسوڕمانەوە سەیری یەکتریان کرد و وتیان: چی؟ پێغەمبەری ئاخر زەمان؟!!

بەڕێزان: باشە بۆ سەریان سوڕما؟ چونکە (كانَ اليَهودُ في المَدينَةِ يَتَوعدُّونَ العَرَبَ بِنَبِيٍّ آخِرِ الزَّمانِ و أنَهُم سَيُقاتلُونَ العَرَبَ مَعَهُ) جولەکەکانی مەدینە بەردەوام هەواڵیان دەدا بە عەرەبەکان کە بەم زوانە پێغەمبەری ئاخر زەمان پەیدا دەبێت و ئێمە ئیمانی پێ دێنین و لەگەڵ ئەو پێغەمبەرەدا شەڕ لەگەڵ ئێوەی عەرەب دەکەین، چونکە جولەکە وایان دەزانی ئەم پێغەمبەرەش هەر لەوان دەبێت...

بەڵێ ئیمانداران: پێشتریش وتمان، زۆربەی جار ئەوەی ئیسلام بە خەڵکی دەناسێنێت، ڕاگەیاندی کوفرە، ئەم گەنجانە بە دەیان جار ناوی پێغەمبەری ئاخر زەمانیان لە جولەکەکانی مەدینە بیستبوو. ئەمجا گەنجەکان سەریان بەیەکەوە ناو بە یەکتریان وت: (والله أنَّهُ لَنَبِيُّ الَّذي تَوَعَّدَكُم بِهِ يَهُودُ، فَلا تَسبِقَنَّكُم إليه) وتیان: سوێند بە خوا ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جولەکەکان هەڕەشەمان لێ دەکەن بەو، با وریا بین پێشمان نەکەون بۆ ئیمان پێ هێنان و ناسینی.. هەر لەوێدا ئیمانیان هێنا، لەم سەعاتەوە مێژووی مرۆڤایەتی

گۆڕانکاری بەسەردا هات و سەرەتای سەرکەوتنەکان دوای (١٣)ساڵ ئازار و نەشکەنجە و تاریکی دەرکەوتن.

لێرەدا پرسیارێك درووست دەبێت: باشە بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ دوای هەموو هۆزەکان و کە کەسی لێ نەما ئەمجا چاوی بە خەڵکی مەدینە کەوت؟ بۆ یەکەم جار نەچوو بۆلای ئەوان؟ لە وەڵامدا دەڵێین:

١.مەدینە شەڕ و ناکۆکی عەشایەری تێدا بوو لە نێوان ئەوس و خەزرەجدا، و شوێنی شەڕ و ئاژاوەشە بۆ بڵاو کردنەوەی ئیسلام ناشێ.

٢.پیاوماقوڵ و سەرکردەکانی مەدینە هەمووی لە شەڕی (بُعاث)دا کوژرا بوون، کە پێنج ساڵ پێش کۆچکردن رویدابوو.

٣.مەدینە شارێکی کشتوکاڵیە و خەڵکی جوتیاریش زیاتر خۆ پارێزە لە شەڕ و دوژمنایەتی، لەبەر ئەوە لەوانەیە نەتوانن موسڵمانان بگرنە خۆیان.

٤.جولەکە لە مەدینەدا دەژیان و لەوانەیە لە یەکەم هەنگاویاندا دوژمنایەتی خۆیان بۆ ئیسلام دەربڕن.

کەواتە: بە پێوەرە سیاسی و عەقڵیەکان مەدینە بە کەڵك نەدەهات، هەر بۆیە یەکەم جار چوو بۆ طائیف و نەچوو بۆ مەدینە.... بەڵام لێرەدا خوای گەورە ئەو وانەیە فێری پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات کە تۆ هەوڵ دەدەی و پلان دادەڕێژیت، بەڵام خوای گەورە خۆی سەرکەوتنت پێ دەبەخشێت بۆ ئەوەی تەنها پشت بە خوا ببەستی، هەتا بزانیت بەڕێوەبەری گەردون هەر خوایە ﷻ هەتا وانەزانیت سەرکەوتن بە هۆی پیلانەکەی خۆتەوە بوو، بەڵام ئەگەر خۆت هەوڵ نەدەیت و پیلان دانەڕێژی سەرکەوتن بە دەست نایەت، پێغەمبەری خوا ﷺ بیری لای طائیفە و بیری لای (٢٦) تیرەو هۆزە، ئاخر کەس کە لە ناچاریدا و کە کەسی لێ نەمابوو خەڵکی مەدینە بوو (لاإلـه إلا اللّهُ المَلِكُ العَظيمُ المُدَبِّرُ الوَكيل...). کەواتە: پشت هەر بە خوا ببەستە، تۆ بە مێشك و

لاشەت پلان دابڕێژە، بەڵام با یەقینت ببێت کە سەرکەوتن هەر لای خواوەیە، زۆر جار توشی شکستت دەکات چونکە خێری گەورەترت لە پێشە.

خوای گەورە مەدینەی هەڵبـژارد بۆ شوێنی هیجرەت و کار ئاسانی بۆ کرد، چونکە:

١.خەڵکی مەدینە (ئەوس و خەزرەج) کەسانی بە سۆز و دڵنەرم بوون، تەکەبور و خۆبەزلزانینیان تێدا نەبوو، ملکەچی حەق دەبوون و ئینکاریان نەدەکرد، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندیەکانی خوێنی و شانەیی دروست بونیان، کە بە ویراسی بۆیان مابۆوە. وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی بەوە کرد کە زۆر میللەت هەن هەر بە نەرمی و روخۆشی و دڵناسکی هاتوون و پەروەردە بوون. بۆ نمونە کاتێك وەفدی یەمەن هاتن بۆ خزمەتی فەرموی: (أتاكُم أهلُ يَمَن، هُمْ أرَقُّ أفئِدةً، وألْيَنُ قُلُوباً) رواه البخاري و مُسلم. واتە: وا خەڵکی وڵاتی یەمەن هاتن بۆلاتان زۆر قسە جوان و دڵ ناسك و دڵ نەرمن، ئەوس و خەزرەجیش سەرەتا لە یەمەنەوە هاتبوون بۆ مەدینە و چوبونەوە سەر بنچینەی خۆیان کە یەمەنی بوون و نەرم و نیانیان لە دەست نەدابوو. و تا ئێستاش حاجیەکانمان شایەتی ئەوە دەدەن کە خەڵکی مەدینە نەرم و نیانترن لە خەڵکی مەککە.

٢.خەڵکی مەدینە سەخی تەبیعەت و بەرچاوتێربون و میوان دۆست بوون، خوای گەورە مەدحیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ الحشر:٩ .

بەڵێ، ئێستاش خەڵکی یەمەن و مەدینە بە گشتی میوان دۆست و دڵ و دەست گوشادن.

٣.لە شەڕی ناوخۆی (بُعاث)دا، هەرچی سەرکردە بەتەمەن و ناودارەکانی ئەوس و خەزرەج بوون کوژرا بوون، کە ئەمانەش وەکو سەرکردەکانی مەککە و طائف وابوون و ئەگەر بمانایە دەبوونە بەردی خڕ و لەمپەر لەبەردەم موسڵمان بوونی خەڵکی مەدینەدا، جا لەم کاتەدا تەنها کۆمەڵێك سەرکردەی لاویان مابوو کە ئەو کاریگەریە گەورەیەیان نەبوو لەسەر دانیشتوانەکەی و خەڵکی لێیان نەدەترسان و لە نەفس و دەرونی خۆیاندا چاوەڕێی کەسێکیان دەکرد کە یەکیان بخات و سەرکردایەتیان بکات.

کەواتە: شەڕی (بُعاث) یەکێك بوو لە سەربازانی خزمەتگوزاری ئیسلام.

ڕەزای خوا لە دایکی ئیمانداران و سیاسەتمەداری گەورەی ئیسلام خاتوو عائیشە بێت کە زۆر جوان لەم رستەیە تێگەیشتبوو کە دەفەرموێت: { كانَ يَوْمَ بُعاثَ اَمْراً قَدَّمَهُ اللّهُ تَعالى لِنَبِيِّهِ ﷺ فَقَدِمَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ وَقَدْ اِفتَرَقَ مَلَئوهُمْ وَ قُتِلَتْ سَرَواتُهُمْ (أشرافُهُمْ) وَ جُرِّحوا فَقَدَّمَهُ اللّه ُلِرَسولِهِ ﷺ في دُخُولِهِم الإسلامَ }رواه البُخاري.

شیخ محمد عبدالوهاب لە (مُخْتَصر سيرة الرَّسُول ص١٢٤ )دا دەفەرموێت: ( إنَّ الحَرْبَ لَبِثَتْ بَيْنَهُم مائة و عشرينَ سَنَةً، وَ كانَ آخر ما بَيْنَهُمْ منَ المَواقعِ مَوقعَةَ ـ بُعاث ـ و كانَ يَوماً عَظِيماً ماتَ فيه أكثر رُءَسائهمْ ). واتە: جەنگ و کوشتاری ناوخۆ لە نێوان ئەوس و خەزرەجدا ماوەی ١٢٠ ساڵ درێژەی کێشا، و کۆتا شەڕ و بەیەك گەیشتنیان لە شوێنی – بُعاث – بوو، وە گەورەترین شەڕ لەو ڕۆژەدا رویدا و زۆربەی هەرە زۆری سەرکردەکانیان لەو جەنگەدا کوژران...

٤.بوونی جولەکە لە مەدینەدا ڕێگەخۆشکەر بوو بۆ بڵاو بونەوەی ئیسلام زۆر بە خێرایی لە مەدینەدا، چونکە هیچ کەس نەمابوو لە ناو مەدینەدا کە باسی پێغەمبەری ئاخر زەمانی لە زمانی جولەکەکانەوە نەبیستبێ، چونکە ئەوس و خەزرەج بت پەرست بوون و جولەکەش ئەهلی کیتاب بوون و ئەیانوت: ( إنَّ نبيّاً قد أضلَّ زمانه، نقتُلُكم به قَتْلَ عاد و إرَم ). واتە: بەراستی بەم زوانە پێغەمبەری ئاخر زەمان ئاشکرا دەبێت و ئێمە دەیناسین و شوێنی دەکەوین و ئێوەی عەرەبی بت پەرستی پێ دەکوژین وەکو کوشتاری عاد و ئیرەم... قورئانی پیرۆزیش لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَهُمْ كِتَٰبٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ البقرة:٨٩. .. واتە: کاتێك لە لایەن خواوە کتێبێك (قورئان) هات بۆیان، کە: ئەو کتێبانەی ئەوانیش پەسەند دەکات و بە راستی دەزانێت، ئەوان پێشتر داوای سەرکەوتن و زاڵ بوونیان بەسەر ئەوانەی بێ باوەڕ بوون لە خوا دەکرد بەهۆی شوێنکەوتنیان بۆ پێغەمبەر ﷺ کەچی کاتێك ئەو پێغەمبەرەیان بۆ هات کە دەیانناسی بڕوایان پێنەکرد، کەواتە: با نەفرین و لەعنەتی خوا لەسەر کافران بێت... کەواتە ئەم باس کردنی جولەکانە دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ هۆکارێکی زۆر بەهێز بوو کە لەماوەیەکی کەمدا بانگەوازی ئیسلام لە مەدینەدا بڵاو بێتەوە، لەبەر ئەوەی خۆیان باسی پێغەمبەریان بیستبوو، هەرئەوەندەی دەویست یەکێك بێت و جوان بۆیان روون بکاتەوە و پێیان بناسێنێت.

٥.هەروەها وتمان مەدینە شارێکی کشتوکاڵی بوو، ئەگەر بەرهەمەکانی بە شێوەیەکی ڕێك و پێك کۆبکرایەتەوە ئەوا بەشی هەموو دانیشتوانەکەی

ىمكرد، خۆ ئەگەر مەدینە شارێکی بێ دەرامەت بوایە، ئەی کۆچ کردوان چۆن ژیانی خۆیان دابین بکردایە.

بەڵێ ئیمانداران: بەم شێوەیە خوای گەورە مەدینەی ئامادە کردبوو تا پێغەمبەری خوا ﷺ و صەحابە هیجرەتی بۆ بکەن.

بەڵێ، شەش گەنجەکە ئیمانیان هێنا و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لەناو قەومێکداین سەراپای ژیانیان دوژمنایەتی یەکترە، ئێستا هەموومان خەزرەجین، ئەگەر ئێستا بێیتە ناومان دەبیتە پێغەمبەری خەزرەج، ئەی ئەوسیەکان؟ بۆیە ئێمە ئەمساڵ دەگەڕێینەوە و پەیمانت دەدەینێ کە لە ئێستاوە بانگەوازی خوا بڵاو بکەینەوە و هەوڵ دەدەین چەند کەسێکیش لە ئەوس موسڵمان بکەین و بیهێنینە خزمەتت، بەڵکو خوا بەهۆی تۆوە دوژمنایەتی نێوانمان لابەرێت و ئاشتی بگەڕێتەوە بۆ شارەکەمان. (فَإِنْ يَجمَعُهُمُ اللهُ عَلَيْكَ فَلا رَجُلٌ أعَزُّ مِنْكَ) ئەگەر خوای گەورە بەهۆی تۆوە کۆمان بکاتەوە و ئەم دوژمنایەتیەمان کۆتای پێ بێت، ئەوا هیچ کەسێك بەقەدەر تۆ گەورە و سەروەر نابێت...

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: زۆر باشە و ساڵی داهاتوو لەم شوێنەدا و لەم کاتەدا چاوەڕێتان دەکەم، خواحافیزیان لە یەك کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و زۆر دڵخۆش بوو، لێرەدا چەند وانەیەك هەیە:

<u>یەکەم:</u> ژیری ئەم کوڕە گەنجانە، کە هەرچەندە بە تەمەن زۆر منداڵیشبوون، کە هەرە گەورەکەیان تەمەنی (٢١) ساڵ بوو، کە ئەسعەدی کوڕی زورارە بوو.. تەماشاکە، ئەم گەنجانە حەماسەت نەیگرتن بڵێن: فەرموو پێغەمبەری خوا ﷺ وەرە لەگەڵمان و خۆمانت لەسەر بە کوشت دەدەین، بەڵکو فەرمویان: ئەگەر ئێستا بییێتە ناومان، هەر دەبیتە پێغەمبەری خەزرەج و ئەوسیەکان ئەگەر بە پێغەمبەریشت بزانن، لە رقی ئێمە کە دوژمنیانین،

ئامادە نین ئیمانت پێ بهێنن. بەڵام ئەگەرئەوانیش موسڵمان بوون، کە هاتیتە ناومان دەبیت بە پێغەمبەری ئەوس و خەزرەجیش... بەڵێ، ئەمە ئەو راستیە دەسەلمێنێت کە دەبێت ئەم دینە گەنج و لاو هەڵگری بێت، نابێت گەنجی موسڵمان خۆی بە کەم بزانێت و وابزانێت هیچی بۆ ئیسلام پێ ناکرێت، نەخێر ئەم دینە گەنجان شانیان دایە بەر، بەڵام کام گەنج دەتوانێت خزمەت بە ئیسلام بکات؟ گەنجێك کە ئاوا ژیر بێت، کە ئاوا دڵ پاك بێت بەرامبەر گەل و نیشتیمانی خۆی، گەنجێك بیەوێت ئارامی و ئاشتی بە هۆی ئیسلامەوە بگەڕێتەوە بۆ ناو شار و وڵاتەکەی، نەك گەنجێکی حەماسەت گرتوو لە غەیری شوێنی خۆیدا و غەیری خۆی رقی لە هەموو کەس بێ و بەناوی ئیسلامەوە هەموو کەس سەر ببڕێ و هێشتاش پێی جیهاد بێت، و زۆربەی کات کە رابوونی ئیسلامی زەربەی لێ کەوتووە بەهۆی گەنجی ناشارەزا و کورت بین و هەڵچوو بووە.

دووەم: گەنج و لاو دەروونی پاکە، ئەگەر دوور بکەوێتەوە لە ژێر کاریگەری سەرکردەی خوا نەناس و کۆمەڵگای خراپ، تەماشاکە لێرەدا فیطرەتی ئەو گەنجانە چۆن هاتە جۆش و چەند زوو ئیمانیان هێنا.

سێیەم: هەر کە ئەم شەش گەنجە ئیمانیان هێنا یەکسەر بوونە بانگخواز، کەواتە گەیاندنی ئەم دینە واجبە لەسەرت هەر لەو رۆژەوە کە موسڵمان دەبیت.. بەڵێ، بانگەواز بۆ ئیسلام تەنها واجبی سەرشانی پێغەمبەران نەبووە بە تەنها، یان زانایانی میراتگری پێغەمبەران بەتەنها، بەڵکو هەموو کەسێك واجبە بەقەدەر توانای خۆی ئەم دینە بگەیەنێت و بڵاوی بکاتەوە، جا نێر بێت یان مێ بێت، زانا بێت یان نەزان بێت. جا لێرەوە تێدەگەین کە (لامَعْنى ولا مكان لكَلمَة (رجال الدِّين) في المُجْتَمَع الإسْلامِي) (هیچ مانا و شوێنێك نیە بۆ وشەی (پیاوانی ئاینی) لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا).

کەواتە: وشەی پیاوانی ئاینی هەڵەیە و هەمومان پیاوی ئاینین،دەبێت بوترێت (زانایانی ئاینی). چونکە هەر یەك لە ئێمە بەرپرسیارە لە گەیاندنی ئەم ئاینە جوانە (بَلِّغُوا عَنِّي وَلَو آيَة) خۆ ئەگەر سورەتی (الفاتحه) بزانی حەوت ئایەتە، کەواتە دەبێت هەوڵ بدەیت کەسێك هەر فێری نوێژ و خواناسی بکەیت. لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە خوای گەورە لە قیامەتدا گلەیی لە بەندەی خۆی دەکات و دەفەرموێت: ﴿ يا عَبْدِي اسْتَسْقَيْتُكَ فَلَم تَسْقِنِي ﴾ ئەی بەندەی من من داوای ئاوم لێ کردیت و نەتدامێ، ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگار کەی تۆ پێویستت بە ئاو بووە تا من بتدەمێ، پەروەردگاریش دەفەرموێت: ئەی فلان عەبدم داوای ئاوی لێ نەکردیت و تۆش نەتدایە؟ ئەگەر بتدایەتێ ئێستا لای من دەستت دەکەوتەوە و وەکو دابێتت بە من وابوو!!!. جا سەرنج بدەن: باشە ئەگەر کەسێك تینوی ئیمان و باوەڕ بێت کە دونیا و قیامەتی وەستاوە لەسەری و فریای نەکەوین، ئەبێ خوای پەروەردگار چەند سەرزەنشتمان بکات؟.با هەردەم لە یادمان بێت کە بونمان بە هۆی هیدایەتی کەسێك بە هێندەی دونیا و هەرچی تیایەتی خێرمان دەست دەکەوێت.. بە تایبەت لەم سەردەمەدا دوژمنان بە هەموو شێوەیەك خەریکن خەڵکی لە ڕێگەی ڕاست دوور بخەنەوە، ئەوەتا سەرۆکی ئەمەریکا (نیکسۆن) لە پەڕاوەکەیدا (نَصرٌ بِلا حَرْب)دا دەڵێت: گێژەڵوکەیەکی ئیمانی لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵی کردووە، ئەگەر نەتوانین ڕێی لێ بگرین، هەوڵ دەدەین ڕێڕەوەکەی بگۆڕین.

کەواتە: هەرچیت بۆ دەکرێت بۆ دینی خوا بیکە بە ماڵ وسامانت، بە قەڵەم و نوسینت، بە ئەخلاق و ڕەوشتی جوانت، ئەم ئیسلامە.. ئەم نور و روناکیە بگەیەنە بە هەموو شوێن و دڵە تاریکەکان. ئەمڕۆ دونیایە و

سبەینێش مەحشەر، تەنها خوا دەزانێت کەی و لەکوێ تەواو دەبێت، ئاشکرایە هەمووشمان مردنێك قەرزارین...

بەڕێزان: وەکو باسمان کرد زۆرێك لە خەڵکی دەرونیان پاکە، بەڵام دەوروبەری خراپ لاڕێیان کردون، هەر ئەوەندە تۆز و گەردەکەی لەسەر لاچوو فیطرەتی دێتەوە جۆش، گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرن کە باسی کابرایەکی ئەمەریکیە، ئەم پیاوە کاتێك چوو بۆ سعودیە هەرگیز لە خەیاڵیدا نەبوو کە بیر لە ئیسلام بکاتەوە، ئەو فەرمانبەرێکی گەورە بوو لە کۆمپانیایەکی گەورەدا و هەروەها شوێنێکی یەکجار دیاریشی هەبوو، ژیانیشی پڕبوو لە کاری ڕێك و پێك و ئەمەش وای لێ کردبوو کە چەندین بڕوانامە بە دەست بهێنێت و هەروەها چەندین پیا هەڵدان و وەصفیشی هەبێت لەلایەن لێپرسراوانی گەورەی کۆمپانیاکەی و هەروەها دەوڵەتەکەشیەوە کە ئەمریکایە، خۆی لەم بارەیەوە دەڵێت: پێش ئەوەی بێم بۆ ریاض لێپرسراوێکی گەورە بووم لە کۆمپانیایەکی ئەمەریکیدا و ئەوەی بیرم لێ نەکردبێتەوە ئایین و دەق ویاساکانی بوو، ژیانم هەمووی ماددە و کارکردنێکی وەزیفی سەرکەوتوانە بوو، کاتی پشووەکانیش و ئیجازەکانیشم بەسەر ئەبرد هەروەك ملیۆنەها مرۆڤ کە لەم جیهانەدا ژیانیان بەو جۆرە بەسەر ئەبەن، چەند مانگێکم بەسەر برد لە کارە نوێکەمدا لە ریاض و بەراستی ڕۆچووبوم لە کارەکەمدا و خەریکی ئەرکی خۆم بووم، ئارەزووی یەکەمم بریتی بوو لەوەی کە سەرکەوتن بە دەست بێنم تا زیاتر جێگەی خۆم قایم بکەم لەو کۆمپانیایەی کارم تیا دەکرد و جێگایەکی دیاریش لەناو سەرکەوتوەکانی وڵاتەکەمدا بۆخۆم بگرم، ڕۆژێکیان دانیشتبوم لە شوێنێکدا لە کاتی پشووداندا بۆ یەکەم جار بینیم کە ژمارەیەکی زۆر سعودی و غەیرە سعودیەکان روو ئەکەنە مزگەوتێکی گەورەی نزیك ئەو شوێنە، لەو کاتەدا گوێم لە بانگ بوو، هەستم بە شتێك کرد کە پێشتر هەستم پێ نەکردبوو، کە

لە رێگاوە خۆشیەك بە لەشەمدا هات کە ناتوانرێ وەصف بکرێت، لێرەدا پرسیارێکم لا درووست بوو، بۆچی ئەم خەڵکە وا دەکەن و چ شتێك پاڵ بمانەوە دەنێت بەم جۆرە روو بکەنە مزگەوت؟. هەر وەك ئەوەی کە پێشبڕکێ بکەن بۆ شوێنێك کە پارە و دیاری بە نرخیان بدەنێ، ئەم پرسیارە کاریگەریەکی قوڵی لە دەروونما دروست کرد و پاڵی پێوە نام کە گرنگی بدەم بە موتابەعەکردنی زیاتری ئەم مەسەلەیە، ئەوەی زیاتر پاڵی پێوە نام بلندگۆی دەنگی مزگەوتەکە و هەروەها پاشان قامەت کردن بوو، بە جدی کەوتمە بیرکردنەوە، کاتێك گوێم لێ بوو ئیمامەکە وتی (السَّلامُ عَلَيكُم) سەیری دەرگای مزگەوتەکەم کرد، بینیم کە نوێژکەران بە هوروژم لە دەرگاوە دێنە دەرەوە و هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریاندا قسەیان دەکرد، ئەمەش کاریگەری لە دەروونما درووست کرد، بە دەنگی بەرز وتم: ئای لەو سیستەمە جوان و گەورەیە، ئەمەش سەرەتای چونەناوەوەم بوو بۆ ناو جیهانی جوانی ئیسلام، و لە پاش ئەمەش هەموو شتێك فێر بووم و وەڵامی ئارام بەخشم دەسکەوت بۆ زۆرێك لەو پرسیارانەی کە ئەو رۆژە پرسیم.

ئەم پیاوە دەڵێت: رۆژێکیان زۆر تورە بووم، چونکە لە ناو بازاڕەکانی ریاض‌دا دەسوڕامەوە ئەمویست شتێك بکڕم بە پەلە، بەڵام بینیم کە سەرجەم کۆگاکان دەرگاکانیان داخراون، هەرچەندە هەوڵمدا کەس دوکانی بۆ نەکردمەوە، دەیانوت: دوای نوێژ وەرەوە، من لەمە تورە بووم، بەلام لە دوای موسڵمان بوونم بۆم دەرکەوت کە ئەوە چ پاڵنەرێکی دەروونە وا لەو بازرگانە دەکات کە ئاوا دوکانەکەی بەجێ بێڵێ و بچێت بۆ مزگەوت.

پاش دوو مانگ لە موسڵمان بونی، ئارەزووی سەردانی مەککەی کرد بۆ عەمرە و نوێژکردنی راستەوخۆ بەرامبەر بە کەعبە. دوو هاوڕێ سعودیەکەی دەڵێن: لە دەوری ماڵی بەیت‌دا زۆر بە عەجیبی عیبادەت و دوعا و گریانی

دەکرد. دەیوت: ئای چەندین مرۆڤ لەم جیهانەدا لەم کەش و هەوا رۆحیە گەورەیە بێ بەشن.. پێش نوێژی خەوتنان عەمرەکەی تەواو کرد و زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی لە کاتی نوێژەکانیشدا لە ریزی یەکەمدا بێت. نوێژ دەستی پێ کرد. هاوڕێکەی دەڵێت: ئەم موسڵمانە ئەمەریکیە لە حاڵەتێکی زۆر عەجیبدا بوو لە خشوع و رکوع و سجوددا، کاتێك لە تەحیاتی یەکەمدا هەستاینەوە، ئەو هەڵنەسایەوە، وامزانی وا لەگەڵ نوێژەکەیدا تێکەڵ بووە لە بیری چۆتەوە هەڵسێتەوە، بۆیە دەستێکم دا لە سەری تابە ئاگای بێنمەوە، بەڵام هیچ جوڵەیەکی نەکرد و کاتێك چوینەوە رکوع بینیم وا خەریکە بەلای راستدا دەکەوێت. ئیمام سەلامی نەدابۆوە کە بۆمان دەرکەوت کە بەتەواوی گیانی سپاردووە، باشترین رۆح دەرچوون، ئەو رۆحەی کە پەیوەندیەکی زۆر گەورەو و راستگۆیانەی بە خوای گەورەوە هەبوو، لەو شوێنە پاك و بەرزەدا بەرز بۆوە بۆلای خوای گەورە، ئەمجا رەزامەندی کەس و کارەکەی وەرگیرا لە ئەمەریکا و لە مەکەدا نێژرا.

ئیمانداران: دەچینەوە سەر باسەکەمان، ئەم شەش گەنجە چونەوە مەدینەو لە دوای ساڵێك لەسەر وەعد و بەڵێنەکەی خۆیان لە عەقەبە لە هەمان کات و شوێندا چاویان کەوتەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ بەڵام ئەمجارەیان ژمارەیان بوو بە (١٢)کەس، (١٠) کەسی خەزرەجی و (٢)کەسی ئەوسی، ئەمەش یەکەم دانیشتنی ئەو دوو هۆزە دوژمندارە بوو لەژێر رەحمەتی ئیسلامدا. وەفدەکە باسی کار و چالاکیەکانی خۆیان لە ماوەی ساڵی رابردوودا بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ خوێندەوە، و باسی ئەوەیان بۆ کرد کە هیچ ماڵێك نەماوە لە مەدینە کە باسی ئیسلامی تیا نەکرێت، ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: پێویستە پەیمانم لەگەڵببەستن. ئەوانیش دەستیان خستە ناو دەستیەوە و پەیمانیان پێدا، ئەم پەیمان پێدانە پێی دەوترێت (بَيْعَة العَقَبَة الأولى) (پەیمانی عەقەبەی یەکەم)... عەقەبە ناوی ئەو

شوێنەیە کە پەیمانەکەی تیا بەسترا.. بەندەکانی ئەم پەیماننامەیە ئەمانە بون:

١.الاّ يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئاً.. هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی خوا.

٢.دزی نەکەن.

٣.زینا نەکەن.

٤.بوختان نەکەن.

٥.منداڵەکانیان نەکوژن.

٦.لە چاکەدا سەرپێچی پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەن.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ( فَإِنْ وَفَّيْتُمْ فَلَكُمُ الجَنَّةَ، وإنْ غَشَيْتُمْ مِنْ ذالِكَ شَيْئاً ، فأمْرُكُمْ الى اللّهِ إنْ شاءَ غَفَرَ، وَ إِنْ شاءَ عَذَّبَ ) رواه البخاری و مسلم.

فەرموی: (ئەگەر وەفاتان بەم پەیمانە کرد و جێبەجێتان کرد، ئەوا بەهەشتی خوا پاداشتتانە، و ئەگەر غەشتان لەم پەیمانەدا کرد ، ئەوا کاروبارتان بۆ لای خوایە و ئەگەر ئارەزوو بکات لێتان خۆش دەبێت، وە ئەگەر ئارەزوو بکات سزاتان دەدات).

بەڕێزان: ئەو دەرسانەی لێرەدا وەریدەگرین ئەمانەن:

یەکەم: صەبرو ئارامی پێغەمبەری خوا ﷺ. وەکو وتمان کە ئەم دوو چاوپێکەوتنە یەك ساڵی پێ چوو، واتە: لە ماوەی یەك ساڵدا تەنها شەش کەس لە ئیمانداران زیادی کردووە،بەڵام پێغەمبەر ﷺ هێشتا هەر دڵی خۆش بوو، چونکە ئەم (١٢)کەسە بەردی بناغەی دەوڵەتی ئیسلامن، نابێت زۆر و بۆر بن، و سەرکەوتن بە یەکجار نایەت، بەڵکو قۆناغ بەندی یە.

دووەم: پرسیارێك: بۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر باسی ئەمانەی کرد: (دزی مەکەن، زینا مەکەن، منالْ مەکوژن، بوختان مەکەن). ئەی کوا باسی نوێژ و جومعە و زەکات و حەج؟ خۆ ئەمانە پایەکانی ئیسلامن!!!. ئەی بۆ

باس نەکراون؟!. چونکە ئەم عیبادەتانە کاتێك دەکرێن کە حکومەت هەبێت و موسڵمانان ئازاد بن، ئەگەر حکومەت نەبێت کوا زەکات کۆدەکرێتەوە؟ چۆن جومعە دەکرێت؟... کەواتە: عیبادەت دەبێت دەوڵەتی لەگەڵ بێت، ئێستاش حکومەت نیە، بەڵام کە چووە مەدینە و حکومەت دامەزرا، ئەمجا ڕۆژوو و جومعە و زەکات دانرا. هەروەها ئێمە باسمان کرد کە مەدینە لە شەڕدا دەژیان، بێگومان لە شەڕدا و لە وڵاتی جەنگدا دزی و زینا و کوشتن و بوختان بۆ یەکتر کردن (شەڕی ڕاگەیاندن) هەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیویست لە ڕێگەی ئەم خاڵانەوە کۆمەڵگای مەدینە لە شەرخوازیەوە بگۆڕێت بۆ ئاشتی خوازی، کەواتە: وڵاتی پڕ لە شەڕی ناوخۆ بەم شەش بەندە ئاشتییان بۆ دێتەوە و ئیتر دەیان دانیشتنی ناوێت.

سێیەم: گرنگی ئەخلاق و ڕەوشتی بەرز بۆ موسڵمانان، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها بەوە وازی لێ نەهێنان کە شایەتومان بێنن و تەواو، بەڵکو فەرمانی پێ کردن کە دەبێت هەڵگری ئەو ڕەوشتە بەرزانە بن، عەقیدە پاکی (دووربوون لە شیرك)، داوێن پاکی، دەست پاکی، زمان پاکی، دەروون پاکی. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیەوێت کۆمەڵگای مەدینە کاتێك سەیری ئەم دوانزە کەسە دەکەن، ئەوانە چەند ئەخلاقیان بەرزە، ئێمە زۆر پێویستمان بەم کەسە ئەخلاق جوانانەیە، ئیتر لە ڕێگەی ئەم دوانزە کەسەوە ئیسلامیان لا شیرین دەبێت و بە خۆشیەوە موسڵمان دەبن. کەواتە: بە کورتی دەتوانین بڵێین: ئەم شەش خاڵە لە هەموو زەمان و زەمینێکدا هەیە و ناسنامەی ئینسانی ئیمانداره.

ئیمانداران: تەماشای نەخشەسازی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، ئەمە ئەوەمان فێر دەکات کە خەڵکی سەیری نوێژ و ڕۆژوو و قورئان خوێندنمان ناکەن، خەڵکی سەیری ئەخلاقی جوانمان دەکەن، با هەوڵ بدەین هەر

یەکەمان لە ڕێی ئیش و کاری خۆیەوە نمونەی خەڵکی جوان بین، با وا نەکەین خەڵك بەهۆی ئێمەوە ئیسلامی لا ناشرین بێت.

گەنج و لاوانی دڵ پڕ لە ئیمان، ئەی ئەو کەسانەی کە ئێستا بە ڕۆح وا لە خزمەت پێغەمبەری خوادان ﷺ، وا چاومان لێیە چۆن دەستی خستۆتە دەستی ئەو گەنجە پاك و دڵسۆزانەوە، کێ حەزی لێیە بەشداری بکات ئەتوانێت هەر ئێستا لە دڵی خۆیدا بەیعەت بدات بە پێغەمبەری خوا ﷺ و پەیمانەکە نەشکێنێت، پێغەمبەریش ﷺ زەمانەتی بەهەشتی دەداتێ، ئەمڕۆ کۆمەڵگای ئێمە پێویستی بە گەنجانی داوێن پاك و زمان پاك هەیە، بەس تەنها بەمەش کۆمەڵگا ئیصلاح دەبێت..

کەواتە: ئەگەر حکومەت دەیەوێت وڵاتێکی هێمن و ئارام و دوور لە دزی و داوێن پیسی بەرقەرار بێت، دەبێت گرنگی بە مزگەوت و ڕۆڵی مزگەوت بدات لە بواری پەروەردەی گەنجاندا، گەنج بە سەنتەر و هۆڵی بلیارد و نادی خێر بۆ کۆمەڵگا ناداتەوە، بەڵکو ماڵ وێران و دوا ڕۆژ ڕەشی دەکات.

چوارەم: قسەی شیاو بۆ شوێنی شیاو و گونجاو هەڵبژێرین، شەرت نیە هەموو قسەیەکی حەق لە هەموو جێگەیەکدا بکرێت، خۆ قورئانی هاتووی ماوەی (١٣) ساڵی مەککی هەیە، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شەش خاڵەی پێ ڕاگەیاندن، چونکە مەدینە پێویستی بەو شەش خاڵە بوو، نەهات هەموو ئیسلامیان بۆ باس بکات، ئەی خۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هەدەف و ئامانجەکەی ئەوەیە: هەر کەسێك بیگرێتە خۆی دەبێت وەعد و پەیمانی ئەوەی پێ بدات کە خۆی و هاوەڵانی بپارێزێت و لە دوژمنیش بیپارێزێت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی لەگەڵ باس نەکردن، بۆ؟ چونکە هێشتا وەختی نیە، نابێت کار لەسەر حەمماسەتی ئەو (١٢)گەنجە بکات کە هێشتا وەختی نیە، ئیشی بەجێی ئەمان وبەرهەمدار ئەوەیە کە بانگی خەڵکی بکەن بۆ دین، هەڵگری ڕەوشتی جوان بن.

بەڕێزان: بەڕاستی لە گەیاندنی ئەم ئیسلامەدا دەبێت دوو شتمان هەبێت:

یەکەم: زانست.

دووەم: شارەزایی.

تەماشای قورئانی پیرۆز بکەن، بەردەوام صیفەتی عیلم و خەبیری بەیەکەوە بەکار هێناوە، وەکو ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾لوقمان:٣٤. یاخود ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا﴾ النساء:٣٥. ئەمڕۆ زۆر کەس هەیە شارەزای ئایەت و تەفسیری قورئانە و فەرمودەی زۆری لەبەرە، بەڵام شارەزا نیە بەو واقیعەی تێیدا دەژی، بۆیە قسە و وتار و بانگەوازەکەی زەرەری لە قازانجی زۆرترە بۆ ئیسلام و بانگەوازەکەی!.

پێنجەم: لە ماوەی ئەم ساڵەدا و بۆ ئەم دوو دانیشتنە هیچ کەس لە کافرەکانی مەککە بە هیچ شتێکی نەزانیوە، جگە لە ئیمامی ئەبوبەکر و عەلیش ﷺ هیچ کەس لە صەحابەکان ئاگایان لەم دانیشتنە نەبوو، ئەمەش گرنگی نهێنی پاراستنمان فێر دەکات.

شەشەم: لە بەندی شەشەمی پەیماننامەکەدا دەفەرموێت: (ألاّ يَعْصُوهُ فِي مَعروُف)، واتە: پەیمانیان دا بە پێغەمبەر ﷺ کە لە چاکەدا لە قسەی دەرنەچن. ئایا پێغەمبەر ﷺ غەیری چاکەو خێر بە هیچ کەس دەڵێت؟!. بێگومان نەخێر. بەڵام خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا و لە بەیعەی نِساءدا کە هەمان خاڵەکانی ئەم پەیماننامەیەن دەفەرموێت: ﴿ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ ﴾ الممتحنة:١٢. خوای گەورە ئیطاعەی پێغەمبەریشی بەستۆتەوە بە (مَعْرُوف)ەوە.

جا ئەوە بۆ ئێمە دەبێتە دەرس و عیبرەت کە هیچ سەرکردەیەك، هیچ برا گەورەیەك بۆی نیە ئەو چاوەڕوانیەی لە خەڵك و ئەندامانی ژێر دەستی خۆی هەبێت کە کوێرانە دوای بکەون و لە هەموو شتێکدا هەر بڵێن: بەڵێ و سەری بۆ بلەقێنن.. نەخێر لە ئیسلامدا شتی وا نیە و لە ئیسلامدا (بەقسەکردن) (گوێ بۆ گرتن)ی لە پێشەوەیە. (السَّمْعُ و الطَّاعَة). (السَّمْع) ئەوەیە گوێ بگری، تێی بگەی و لەو فەرمانە حاڵی ببی داخۆ شەرعیە یان نا شەرعیە، چیە و چۆنە. ئینجا نۆرەی (الطَّاعَة) دێت، واتە: بە قسە کردن و فەرمانبەری بۆ کردن.

ئیمانداران: دوژمنانی ئیسلام یەکێك لەو شتانەی دەیکەنە ڕەخنە لەسەر ئیسلام و موسڵمانان ئەوەیە کە گوایە لە ئیسلامدا ئازادی نیە و مرۆۋ دەبێت هەر بەڵێ بکات بۆ سەرکردەی موسڵمان و ئەو فەرمانە بە بەڵێ قوربان جێبەجێ بکا و تەواو. بەڵام نەخێر ئەوە تێنەگەیشتنە لە ئیسلام، بەڵکو لە ئیسلامدا دەفەرموێت: واجبە میلەت کە حکومەتێك و دەزگایەکی ئیداری هەبێت کە مشوری ژیانی بخوات و یاسا و قانون دا بنێت (بەپێی شەرع) بۆ ڕێکخستنی کاروباری ژیانی، چونکە بەدیلی ئەو حکومەت و قانونە بریتیە لە پاشاگەردانی (فَوضی) وەك شاعیرێك فەرمویەتی:

( لا يُصلِحِ النّاسُ فَوضى لاسُراةَ لَهُمْ .... ولاسُراةَ لَهُمْ إذا شِرارُهُمْ سادوا )

واتە: خەڵك چاك نابێت بەوەی کە فەوزا و پاشا گەردانی بێت و هیچ مشورخۆریان نەبن، یان ئەگەر مشورخۆرەکانیان کەسانی خراپەکار بن... بەڵام سەرکردەو حکومەت تا ئەو شوێنە گوێڕایەڵی دەکرێت کە پابەند بێت

**بە بەرژەوەندی میللەتەوە کە قورئان دەفەرموێت: ﴿ مَعْرُوف ﴾. ئیمامی عەلی ﷺ روداوێکمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:** ( خۆشەویستمان ﷺ کۆمەڵێك لە یارانی نارد بۆ شوێنێك، و کەسێك لە یاریدەدەرانی کرد بە لێپرسراویان، و بە سەربازەکانی فەرموو گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداری ئەم سەرکردەیەتان بکەن. ئەوەبوو رۆشتن و لە مەدینە دورر کەوتنەوە تا ئەوە بوو گەیشتنە شوێنێك و لە گفتوگۆیەکدا سەرکردەکە لە سەربازەکان تورە بوو، بانگی کردن و پێی وتن: (إجْمَعُوا لِي حَطَباً) هەستن کۆمەڵێك چیلکەو دارم بۆ کۆبکەنەوە، (فَجَمَعوا لَهُ) ئەوانیش بە قسەیان کرد و دار و چیلکەیەکی زۆریان کۆکردەوە، ئەمجا فەرمانی پێ کردن و پێی وتن (أوقِدُوا ناراً)ئاگری تێ بەربدەن. (فَأوقَدُوا)ئەوانیش ئاگریان دا. پاشان سەرکردەکە رووی تێ کردن و پێی وتن: (ألَمْ يَأمُرکُمْ رَسُولُ الله ﷺ أنْ تَسمَعُوا لِي و تُطعوا؟)ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێ نەکردن بەوەی کە گوێڕایەڵی و فەرمانبەرداریم بکەن؟ وتیان، بەڵێ. وتی: کەواتە: (فَادْخُلُوها). بڕۆنە ناو ئەو ئاگرەوە. صەحابەکانیش (نَظَرَبَعْضُهُمْ الی بَعْضٍ)تەماشای یەکتریان کردوو وتیان: (إنَّما فَرَرْنا الی رَسُولِ الله ﷺ مِنَ النّارِ) ئێمە لە دەست ئاگر رامان کردووە بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئیتر چۆن بچینە ئاگرەوە. ئیتر بەم شێوەیە مانەوە تا سەرکردەکە تورەبونەکەی نەما و ئاگرەکەش وردە وردە خامۆش بوو.

جا کاتێك کارەکەیان تەواو بوو گەڕانەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بەسەرهاتەکەیان بۆ گێڕایەوە، خۆشەویست ﷺ فەرموی:(لَو دَخَلُوها ما خَرَجُوا

منها، إنّما الطّاعةُ في المَعرُوف)متفقٌ عليه. واتە: ئەگەر بچونایەتە ناو ئاگرەکەوە ئەوا لێی نەدەهاتنە دەرەوە، گوێڕایەڵی تەنها بۆ چاکەیە ).

بەڕێزان: ئیشی کاربەدەست ئەوەیە پشت بە خوا ببەستێ و هەوڵ بدات جەماوەری گەلەکەی لە ناڕەحەتی و گیروگرفت بپارێزێت، نەك بیانخاتە دۆزەخەوە، و میللەتیش دەبێت وریا و وشیار بێت و فەرمانەکانی کاربەدەست بە تەرازوی شەرع هەڵبسەنگێنێت و ( إنّما الطّاعةُ في المَعرُوف )ی لە بەرچاو بێت، هەر بەمەش میللەت وشیار و بێدار و پێشکەوتوو دەبێت.

دەگێڕنەوە: کە ڕۆژێك (شەقیقی بەڵخی) ئامۆژگاری (هارونە ڕەشید)ی دەکرد و پێی وت : هارون، خودا خانویەکی هەیە ناوی دۆزەخە و تۆی کردووە بە دەرگاوانی ئەو خانوە و سێ شتی بە تۆ داوە هەتا بەو سێ شتە موسڵمانان لەو دۆزەخە دوور بخەیتەوە،ئەو سێ شتەش: ماڵ و شمشێر و قامچی یە، بە ماڵ و سامان خەڵکی تێر و تەسەل و خۆش گوزەران بکەیت تا خەڵکی بە هۆی برسێتی و نەداریەوە توشی قەرزاری و درۆ و سوێندی درۆ و وەعدە خیلافی و دزی و ناپاکی نەبن، و بە هۆی شمشێرەوە تۆڵە بکرێتەوە لەو کەسانەی کە خەڵکی بە ناحەق و بێ تاوان دەکوژن و ڕێگری دەکەن، و بە قامچی خەڵکی لە خراپە و لار و لەوێری دوور بخرێتەوە تا توشی دۆزەخ نەبن، جا هارون ئەگەر تۆ بەو جۆرە کاری دەسەلاتت بەڕێوە برد ئەوا خەڵکی لە دۆزەخ رزگار دەکەیت و خۆشت رزگار دەبیت، ئەگەر بەو جۆرەشت نەکرد، ئەوا لە پێش خەڵکیەوە دەچیتە دۆزەخ.

ئومێدەوارم خوای گەورە هۆشیار و بێدارمان بکات و لەم ئیسلامە شیرینە و سیرە و سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ تێمان بگەیەنێ و کاربەدەستانمان بە رەحم و بە ویژدان بکات و میللەتمان بە ئاگا و بێدار بێ و حەق بە حەق بناسێ و کاری پێ بکات و ناڕەوا و خراپە نەفرەت لێ بکات.

وآخِرُ دَعوانا أنَّ الحَمْدُ للّه رَبِّ العالَمين.

**سەرچاوەکان:**


١.قورئانی پیرۆز.

٢.تەفسیری ئاسان / بورهان محمد امین.

٣.بەرەو ئیسلام–ئارامی / ئەندازیار عُثمان /ل١٢.

٤.فقه السيرة النبوية / د.محمد سعيد رمضان البوطي / ص١٢٦ ، ص١٢٩.

٥.السيرة النبوية / د.علي محمد الصّلابي / ج١/ ص٤١٩، ص ٤١٦.

٦.بەرەو ئیسلام – ئازادی / ئەندازیار عُثمان / ل٩٤، ل٩٣.

٧.بەرەو ئیسلام – دڵنیای / ئەندازیار عُثمان / ل٧٣.

٨.على خُطى الحبيب / عمرو خالد / ص٨٥.

٩.چۆنیەتی بوونە پێشەنگ / م.علی باپیر / ل٢٩، ل٦٣ ، ل٣٦.

١٠.وصايا و حكيم / يوسف الحاج احمد / ص١٣١.

١١.درووود / فاتح محمد سميع / ب١/ ل١٥٧.

# وتاری یەکەم بۆ مانگی صەفەر
# پەیمانی عەقەبەی دووەم

( الحَمدُ للّٰهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

ئیمانـدارانی بـەڕێز: بـەردەوام لـە خزمـەت سـیرەت و ژیاننامـەی خۆشەویست و تاجی سەرمان حەزرەتی محمد المصطفی ﷺ داین.

خۆشەویستان: دوای پەیمانی عەقەبەی یەکەم (١٢) کەسەکە گەڕانەوە بۆ مەدینە و ئەمجارە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێنەری تایبەتی خۆی لەگەڵ ناردن کە (موصعەبی کوڕی عومەیرە). کە موصعەب بوو بە یەکەم سەفیر لە ئیسلامدا... لێرەدا پرسیارێك دەکرێت: باشە بۆچی لە ناو هەموو صەحابەکاندا موصعەب هەڵبژێردرا؟ لە وەڵامدا دەڵێین: لەبەر ئەوەی کە:

١.موصعەب گەنجێکی تەمەن (٢٤)ساڵی زۆر جوان و باڵابەرز و خاوەن هەیکەل بوو، کە ئەم خاڵە گرنگە لە نوێنەر و سەفیردا هەبێت، کە لە رووی هەیئەت و لاشەوە بە هەیبەت بێت.

٢.موصعەب کەسێك بوو هەر لە پێش موسڵمان بونیشدا حەزی لە جل و بەرگی جوان و بۆن عەتری خۆش بوو، کە ئەمەش کەسایەتی ئەوەندەی تر بەهێز دەکرد.

٣.موصعەب زۆر کەسێکی ڕوو خۆش و دەم بە خەندە و چاو گەش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەنگین بوو، چونکە ئەم کارە بە کەسی دەم و چاو داخراو ناکرێت و هەروەها بە کەسی سادە و هەرزە گۆش جێبەجێ ناکرێت.

٤. موصعەب خاوەن کەسایەتیەکی بەهێز و ئینسانێکی لەسەرخۆ و هێمن و ژیر بوو، زۆر زمان رەوان و گفت شیرین بوو، کە قسەی دەکرد هەر حەزت دەکرد گوێی لێ بگریت.

کەواتە: خەڵکی مەدینە هەست دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ چ کەسێکی گەورەی بۆلا ناردوون و ئەگەر نوێنەرێك وا نەبێت ئەوا ناتوانێت بانگەواز بۆ ئیسلام بکات.

بەڵێ، موصعەب چووە مەدینە و لە ماڵی (ئەسعەدی کوڕی زورارە) کە تەمەنی ئێستا (٢٣) ساڵە مایەوە، ئەسعەد یەکەم کەسی مەدینەیی بوو کە ئیمانی هێنا، و یەکەم کەسیش بوو کە لەگەڵ (١٢) کەسەکە گەڕایەوە بۆ مەککە. پۆل پۆل خەڵك دەهاتن بۆ ماڵی ئەسعەد و موسڵمان دەبون، ئەویش بەیعەتی لێ وەردەگرتن، لەسەر ئەوەی کە شەریك و هاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدەن و دزی نەکەن و زینا نەکەن و منالْ نەکوژن و بوختان نەکەن..

خەڵکی مەدینە کە ئەمەیان بیست وتیان: ئای لەم رەوشتە بەرز و پەسەندانە.

بەڵێ، ئیسلام بە ئەخلاق خۆی کرد بەناو مەدینەدا، خەڵکی یەك یەك موسڵمان دەبوون، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە دوو سەرکردە هەبوون ناویان (ئوسەیدی کوڕی حوضەیر) و (سَعد بن مَعاذ) بوو. دوو سەرۆك هۆز بوون، زۆر ناودار بوون، بت پەرست بوون، رۆژێکیان بە یەکەوە دانیشتبوون، سەعد وتی: ئەمە کێیە هاتۆتە شارەکەمان و گەنجەکانمان فریو دەدات؟. با بڕۆین ئاگاداری بکەین کە ئێرە بەجێ بهێڵێ، سەعد بە ئوسەیدی وت: من ئەسعەد کوڕی پورمە، با شەڕ لە نێوانماندا روو نەدات، تۆ بڕۆ دەری بکە..

بەڵێ، ئوسەید چوو بۆ ماڵی ئەسعەدی کوڕی زورارە زۆر بە رق و قینەوە، خوێن بەری چاوی گرتبوو، کە ئەسعەد چاوی پێ کەوت بە موصعەبی وت: (

هــذا سَــيِّدُ قَومــه، وَقَــدْ جــاءَكَ، فَأصــدَق اللهَ فيــه ). فــەرموی: ئــەوە گــەورەی هۆزەکەیـەتی، ئـەی موصـعەب دڵـسۆزی و ئیخلاصـت بەرامبـەر خـوا لەگـەڵی بخــەرە کــار... الله اکــبر.. فــەرموی: ئیخلاصــت بخــەرە کــار بــۆ ڕووبــەڕوو بوونەوەی... بەڵێ، ئوسەید هاتە پشت سەریانەوە و شەڕی لێ دەباری، وتـی: ( ماجاءَ بِكُما تُسَفِّهان ضُعَفاءَنا؟ ). ئەوە چی ئێوەی هێناوەتـە ئێرە و دەتانـەوێ لاواز و بەسـتەزمانەکانمان فریـو بـدەن؟ ئـەمجا وتـی: ئـەی موصـعەب ئەگـەر ئەتەوێ لەسـەر زەوی بـژی و نەچیتە قەبرەوە هـەر ئێستا شـارەکەمان بـەجێ بهێڵـە.. موصـعەب هـیچ خـۆی تێـك نـەدا و بـە دڵێکـی پـڕ لـە ئیمـان و راسـتی ڕێبازەکەی زۆر بە هێمنی فەرموی: ( أوَ تَجْلِسُ فَتَسمَع، فإن رَضيتَ أمراً قبلته، وَ إنْ كَرَهتَهُ نكُفُّ عَنْكَ ما تكره ). فەرموی: ئەی بۆ دانانیـشی و گـوێم بـۆ بگریـت؟ جا ئەگەر ئەوەی دەیلێم بە دڵت بوو ئـەوا قبـوڵی دەکـەیت و ئەگـەر حەزیـشت پێ نەکرد ئەوا دڵنیابە کارێك ناکـەین دڵـی تـۆ ئـازار بـدات... ئوسـەید وتـی: ( أنْــصَفْتَ ) بــە ویژدانــەوە قــسەت کــرد و زۆر جوانــە، ئــەمجا رمەکــەی گــرت و چەقاندی بە زەویەکەدا و وتی: دەی قسە بکـە.. موصـعەب بە دەنگە هێمن و زوڵاڵەکـەی قورئـانی بـۆ خوێنـدەوە، هێـواش هێـواش دەم و چـاوی ئوسـەید گۆڕا، ئەسعەد دەڵێت: هەر لە دەم و چاویدا ئیسلامم خوێندەوە پێش ئـەوەی قسە بکات لـە دەم و چاویدا رەنگـی دایەوە. ئوسـەید وتـی: ( مـا أحْـسَنَ هـذا الكَلام وَ أجْمَلَهُ ) ئای ئەم قسانە چەند جوان و ڕازاوەن، باشـە یـەکێك بیـەوێت موسڵمان بێت دەبێت چی بکات؟! وتیان: خـۆت بشۆ، جلـەکانت بشۆ، ئـەمجا شایەتومان بێنە، و دوو رکات نوێژ بکە.. تەماشاکە سەرەتای ئەم ئیسلامە بە پـاك و خـاوێنی دەسـت پـێ دەکـات، کـاتێ خـۆی پورتوگالیـەکان کـە چـونە ئەندەلوســەوە ماڵــە موســڵمانەکانیان بــە حەمامــە پــاك و خاوێنــەکانیان

دەناسیەوە.. بەداخەوە ئەمڕۆ لایەنی پاکوخاوێنی پشتگوێ خراوە لەلایەن موسڵمانانەوە!.

بەڵێ، ئوسەید موسڵمان بوو، ئەمجا فەرموی: ئێستا کەسێکتان بۆلا دەنێرم، ئەگەر موسڵمان ببێ، هەموو قەومەکەی موسڵمان دەبن. چوە لای سەعدی کوڕی مەعاذ، لە دوورەوە سەعد وتی: سوێند دەخۆم دەم و چاوی ئوسەید گۆڕاوە. بەڵێ، ئیمان لە دەم و چاودا دەردەکەوێت. ﴿ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ﴾سەعد وتی: ها ئوسەید چی بوو؟ چیت کرد؟. وتی: پێم وتن واز بێنن و بە موصعەبیشم وت مەدینە بەجێ بهێڵێ، ئەوانیش وتیان باشە بەقسەت دەکەین، بەڵام خێرا بڕۆ وا کۆمەڵێك خەڵك لە (بَني حارثة) دەوری ئەسعەدی پورزاتیان داوە، لەوانەیە بیکوژن، بەڵکو فریای بکەویت و لەسەری بکەیەوە..

سەرنج بدەن ئیمانداران: ئوسەید درۆیەکی مەصڵەحەتی کرد، ئەمەیە سیاسەت، چونکە ئەگەر بیوتایە موسڵمان بووم و تۆش وەرە موسڵمان ببە، لەوانەیە سەعدی کوڕی معاذ قەناعەتی نەکردایە و ئیمانی نەهێنایە، چونکە ئوسەید قورئانی لەبەر نیە و وەکو موصعەب لێی نازانێ ئاوا بە جوانی باسی ئیسلام بکات، ئەگەر بشڵێ بچۆ بۆلای موصعەب ئەوا ناچێ و خۆی بە رەفیقی ئەو نازانێ، کەواتە: چارە ئەوەیە بە فێڵێك بیگەیەنێتە خزمەت موصعەبی مامۆستا و نوێنەری پێغەمبەری خوا ﷺ...

کەواتە لێرەدا ئەو وانەیە فێر دەبین کە مەرج نیە مادەم موسڵمانی یەکسەر بۆخۆت بانگەواز بکەی، بەڵکو هاورێ خۆشەویستەکەت بەرە بۆلای مامۆستایەکی دڵسۆز با لەوەوە ئیسلام ببیستێ...

بەڵێ خۆشەویستان:سەعد کە ئەم هەواڵەی بیست رقی هەستا و سۆزی خزمایەتی بۆ ئەسعەدی پورزای جوڵا و رمەکەی دەست دایە و رای کرد بۆ

مـاڵی ئەسـعەد، بـەڵام تەماشـای کـرد وەزع هێمنـە و موصـعەب و ئەسـعەد بۆخۆیان دانیشتون. لە دورەوە ئەسعەد بینی فەرموی: موصعەب ئەو پیاوە سـەعدە و گـەورەی قەومەکەیـەتی، ئەگـەر موسـڵمان ببـێ دوو کـەس لـە قەومەکەی نابینی موسڵمان نەبن..

سـەعد گەیـشتە جـێ و زانـی ئوسـەید بـە فێـڵ ناردویـەتی تـا گـوێ لـە موصعەب بگرێت. بۆیە بە ئەسعەدی وت: پورزا، بەخوا لەتاوی تۆ نەبوایە کە خزمـی نـەدەهاتم بـۆ ئێـرە، حـەق نـەبوو تـۆش کارێـك بکـەیت کـە مـن پـێم ناخۆشە، ئەم کورە گەنجە چیە هێناوتە بۆ ماڵی خۆت؟. موصعەب فەرموی: ( أو تَقعد فَتَسمَع ، فَإنْ رَضَيتَ أمراً و رَغَبْتَ فيه قَبلْتَهُ، و إنْ كَرِهْتَهُ عَزلنا عَنكَ ما تكره ).

واتە: ئایا ناکرێ دانیشی و گوێمان بۆ بگری، ئەگەر رازی بووی بەم کارە و حەزت لێ بوو، ئەوا قبوڵی دەکەیت و ئەگەر حەزیشت پێ نەکرد ئەوا هەرچی تۆ پێت ناخۆش بێت لێت دوور دەخەینەوە.

سەعد وتی: قسەیەکی جوانە، فەرموو.. موصعەب سورەتی (الزُخرُف)ی بۆ خوێندەوە، دەم و چاوی سەعد گەشایەوە و یەکسەر هاواری کرد: توخوا پـێم بڵـێن چـی بکـەم تـا بێمـە سـەر ئـەم دینـە جوانـە؟. موصـعەب فـەرموی: پیرۆزبایی موسـڵمان بونـت لێ دەکـەم، بـڕۆ خـۆت بشـۆ و جل و بـەرگت بشۆ و جلی خاوێن لەبەر بکە، ئەمجا شایەتمان بێنە، ئەمجا دوو رکات نوێژ بکە. الحمـدُ لله.. سـەعدی کـوڕی معـاذ موسـڵمان بـوو، ئـەمجا رۆیـشتەوە بـۆلای ئوسەیدی کوڕی حوضەیر و بە یەکەوە چونە ناو خزمەکانی، سەعد فەرموی: قەومەکەم من لە ناو ئێوەدا چۆنم؟ وتیان: قوربان تۆ گەورەمانی و هەرچی تۆ بیلێیت لەسەر چاومانە. فەرموی: دەبزانن (فَـإنَّ كَـلامَ رِجـالكُمْ و نِـسائكُم عَلَـيَّ حَرامٌ، حَتى تُؤمِنُوا باللهِ وَ رَسُولِه). فەرموی: یەقینتان بێ کە قسەی پیاو و ژنتان لەسـەرم حەرامـە هـەتا ئـەو کاتـەی ئیمـان دێـنن بـە خـوا و پێغەمبەرەکـەی...

بەبەرەکەتی ئەم پیاوە هەر ئەو رۆژە ئێوارە نەهات کە یەك پیاو و ژن نەما لە (بَني عَبدُ الأشْهَل) کە موسڵمان نەبوبێ.

بەڵێ ئیمانداران: شەپۆلی ئیمان لەناو شاری مەدینەدا دەهات و دەچوو، هەموو خەڵکی ئیمانیان هێنا، هەموو یەك ئاواتیان هەبوو، ئەویش ئەوە بوو بە دیداری محمد المصطفی ﷺ شاد بن. جابری کوڕی عبدالله ﷺ دەفەرموێت: وتمان تا کەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە شاخەکانی مەککە بمێنێتەوە و توشی مەترسی ببێ (حَتّى مَتَى نَتْرُكَ رَسُول الله ﷺ يُطْرِد فِي جبالِ مَكَّةَ و يُخاف).

بەڵی، بەهۆی لێهاتویی وزمان شیرینی موصعەب و دەروون پاکی خەڵکی مەدینەوە لەماوەی کەمتر لە یەك ساڵدا هەموو خەڵکی مەدینە موسڵمان بون. ئەمجا پێش کاتی حەج (موصعەب) گەڕایەوە مەککە و راپۆرتێکی دوور و درێژی لەسەر کارو چالاکیەکانی خۆی لە ماوەی ئەو ساڵەدا خوێندەوە، موژدەی دا کە وەفدی مەدینە لەم چەند رۆژەی داهاتودا لە کاتی حەجدا بە خزمەتی دەگەن. بەڵێ کاتی حەج هات و وەفدی مەدینە هاتن کە (٣٧) پیاو و (٢) ژن بوون. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: موصعەب کێ سەرۆکیانە؟ فەرموی: (بەرائی کوڕی مەعرور). فەرموی: دەبێت چاوم پێی بکەوێت. لەسەر داوای حەزرەت ﷺ (بەرائی کوڕی مەعرور) لەگەڵ (سەعدی کوڕی مالیك)دا چونە خزمەتی و خۆیان پێ ناساند. پێغەمبەر ﷺ بە سەعدی کوڕی مالیکی فەرموو: تۆ شاعیریت؟. فەرموی: بەڵێ. پێغەمبەر ﷺ دەست خۆشی لێ کرد و زۆر رێزی لێ گرت... ئەمجا فەرموی: ئەی بەراء، دەبێت خۆت و هۆزەکەت ببینم لە ئاخر رۆژەکانی حەجدا و لە بەشی یەکەمی شەودا و لە شیوی عەقەبەدا و زۆر بە نهێنی یەك یەك و دوو دوو لە جێگاکانتان وەرنە دەرەوە و کەس کەس خەبەر نەکاتەوە لە خەو و پێڵاوەکانتان بە

ئەستەوە بگرن تا لە خێمەکانتان دێنە دەرەوە تاکو دەنگی پێڵاوەکانتان نەیەت، و نابێت کەس بەدەنگی بەرز قسە بکات، و ماوەی دانیشتنەکەمان دەبێت کەم بێت و ماوەی قسەکانمان کورت و پوخت و پڕ مانا بێت و بگەینە ئەنجام و هیچ کەسێك هیچ نهێنیەك نەدرکێنێت.

بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ چۆن نەخشەی دانابوو، ئاوا لە شوێن و کاتی دیاریکراودا بەبێ دواکەوتن و بەبێ ئەوەی کەس هەستیان پێ بکات چونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ.... پێغەمبەری خواش ﷺ عەبباسی مامی کە هەرچەندە ئەو کاتە موسڵمان نەبوبوو لەگەڵ خۆی بردی و لە هاوەڵانیش ئیمامی ئەبوبەکر و عەلی رضي الله عنهما کە حەرەس و چاودێر بن لەسەر گردەکانی ئەمبەراوبەری عەقەبە.

بەڵێ، دانیشتن و کردنەوەی دانیشتنەکە لەلایەن عەبباسی مامی پێغەمبەرەوە ﷺ کرایەوە و فەرموی: ئەی ئەوس و خەزرەج، محمد ﷺ لەناو ئێمەی بەنی (هاشم)دا پارێزراوە و کەس ناتوانێ بیکوژێت، بەڵام لە پێناوی دین و بیروباوەڕەکەیدا دەیەوێت بێتە لای ئێوە لە مەدینە، جا ئەگەر بە تەواوی دڵنیا نین لەوەی کە دەتوانن بیپارێزن، ئەوا وازی لێ بێنن با هەر لێرە لەناو خۆماندا بمێنێتەوە..

لێرەدا ئەو دەرسە وەردەگرین کە درووستە پشت ببەسترێت بە کەس و کار و خزم و سەرۆك هۆزی بێ باوەڕیش، مادەم دژایەتی ئیسلام ناکات..

مەدینەییەکان وتیان: ئەی عەبباس تێگەیشتین لە مەبەستت، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ قسە بکە، با بزانین داواکاریت چیە بۆ خودا و بۆ خۆت؟. کەواتە: ئەم دانیشتنە ئەوە دەردەخات کە هەرچەندە خەڵکی مەدینە موسڵمان بون، بەڵام هێشتا بڕیاری کۆچکردن بۆلایان نەدراوە، بەڵکو پێویستی بە دانیشتن و رێکەوتن و ئیمزاکردن هەیە. پێغەمبەر ﷺ نەیفەرموو: هەر دەبێت من فەرمان بکەم و ئێوە جێبەجێی بکەن. نەخێر، ئەمە

إتفاقیەی سیاسی یە، پێویستی بەلەیەکتر تێگەیشتن هەیە. پێغەمبەری خوا ﷺ بەوپەڕی راشکاوی یەوە دواکاری خۆی لە پێنج خاڵدا پێشکەش کردن و فەرموی:

١.(تُبايِعُني عَلى السَّمْعِ و الطّاعةِ في النَّشاطِ و الكَسَلِ). واتە: پەیمانم بدەنێ لەسەر گوێڕایەڵی و بەگوێکردن لە خۆشی و ناخۆشیدا – ئەمەلایەنی سیاسی یە–، واتە پێی وتن دەمەوێت حکومەت دا بمەزرێنم، من سەرکردە و ئێوە سەرباز.

٢.(وَ النَّفَقَةَ فِي العُسْرِ و اليُسْرِ).بەخشینی ماڵ و سامانتان لە هەرزانی و گرانیدا، –ئەمەش لایەنی ئابووری یە، واتە: پێی راگەیاندن کە رۆژانی شەڕ و ناخۆشیمان دێتە رێ، و حکومەت پێویستی بە پارە هەیە و منیش پارەم نیە، بازرگانی و سامانتان دەکەوێتە مەترسیەوە، ئایا ئەمەتان پێ قبوڵ دەکرێت؟.

٣.(وعَلى الأمرِ بالمَعْرُوفِ و النَّهي على المُنْكَرِ). وە پەیمانم پێ بدەن لەسەر فەرمان کردن بە چاکە و رێگرتن لە خراپە، –ئەمەش بواری راگەیاندن–، واتە: شەڕە قسە نەکەین و هەموومان پشتگیری لە چاکە بکەین و رێگری لە خراپە بکەین..

٤.(وأنْ تَقُلُوا في اللهِ، لا تَخافُونَ في اللهِ لَوْمَةَ لائمٍ).لە پێناوی رەزامەندی خوادا هەڵوێستی راست و دروست دەربڕن و لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسن. – ئەمەش بواری عەقیدە–، کە رەزامەندی خوا لە پێش هەموو شتێکەوە بێت... پاشان ئەگەر مونافیق و دووڕو کەوتنە ناوەوە، لە پڕوپاگەندەکەیان نەترسین.. تەماشای ئەو دووربینیەی پێغەمبەری خوا ﷺ کە پێشبینی ئەوەی کردبوو کە لە کۆمەڵگای مەدینەدا مونافیق دروست دەبێت و تانەو تەشەر لە موسڵمانی راستەقینەدەدەن.

٥.داواکاریشم بۆ خۆم و هاوەڵانم: (وعلى أنْ تَنصرُني، فَتَمنَعُوني إذا قَدَّمْتُ عَلَيكُمْ مِمّا تَمنَعُونَ منهُ أنفُسكُمْ، وَ أزواجكُمْ و أبناءكُمْ و لكُمُ الجَنَّةَ). پەیمانم بدەنیٚ لەسەر ئەوەی کە سەرم بخەن و پشتیوانیم لیٚ بکەن و لە دوژمن بمپارێزن کاتێك هاتم بۆلاتان، بمپارێزن لە هەر شتێك کە خۆتان و خێزانتان و منداڵەکانتانی لیٚ دەپارێزن، ئێوەش بەهەشتی خواتان بۆ مسۆگەر دەبێت.

بەڕێزان: سەرنج بدەن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: بمپارێزن هەر وەك خۆتان و ژن و منداڵتان دەپارێزن، نەیفەرموو: وەکو ماڵ و خانوو و پارە و باخ و سەروەتتان، چونکە لە تەنگانەدا لەوانەیە ئینسان دەستبەرداری ئەمانە ببێت، بەڵام هەرگیز ئینسان تەسلیم بە دوژمن نابێت خۆی بە کوشت دەدات لەسەر ژن و منداڵی.

ئایا یەکسەر وتیان: بەڵیٚ وا قبوڵمان کرد و وەعدت پیٚ دەدەین؟ نەخێر، بەڵکو وتیان: ئایا ئێمە بەرامبەر ئەمە چیمان دەست دەکەوێت؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (وَلَكُمُ الجنَّة) تەنها بەهەشت. ئیتر وەعدی هیچ پلە و پایە و ماڵێکی دونیای پیٚ نەدان، ئەمجا (بَراء بن مَعرُور) دەستی هێناو فەرموی: ( نَعَمْ والَّذي بَعَثَكَ بالحَقِّ، لَنَمنَعَنَّكَ مِمّا نَمْنَعُ منهُ ـ أنْفُسَنا وَ نساءَنا ـ فَبايَعْنا يارَسُولَ الله، فَنَحْنُ والله أهْلُ الحَرْبِ و أهْلُ السِّلاح).. واتە: بەڵیٚ پەیمانت دەدەینیٚ سوێند بەو کەسەی تۆی بە حەق ناردووە، ئەتپارێزین لەوەی کە خۆمان و خێزانەکانمانی لیٚ دەپارێزین، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆش پەیمانمان لیٚ وەربگرە، سوێند بە خوا ئێمە ئەهلی شەڕ و ئەهلی هەڵگرتنی چەکین...

بەڵام لەو کاتەدا کەسێکی تر هەستا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نێوان ئێمە و جولەکەدا پەیمان هەیە، ئەگەر تۆ هاتیت بۆ لامان ئێمە ئەو پەیمانە دەپچڕێنین، ئایا ئەگەر رۆژێك تۆ سەرکەوتی و چویتەوە بۆ ناو خزمەکانت، ئایا ئێمە واز لیٚ دێنیت و بەجێمان دێڵیت؟.

ئیمانداران: ئەمە ئەوەمان تێ دەگەیەنێت کە لە ئیسلامدا ئەوپەڕی ڕا دەربڕین هەیە، هەموو کەس بۆی هەیە ڕەئی خۆی دەرببڕێت و داوای مافی خۆی بکات، و تەماشای ژیری و وردبینی ئەم پیاوە بکەن کە ناوی (ابو الهَيثَمْ بن التَّيهان) بوو،چاوی لە ڕووداوی فەتحی مەککە بوو، کە (١٠) ساڵ دوای ئەوە ڕوویدا، سەیری دوور بینی ئەم پیاوە!!.

پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەی کرد و فەرمووی: (بَل الدَّمُ الدَّم، و الهَدَمُ الهَدَم، أنا مِنكُم و أنتُم مِنّي، أُحارِبُ مَنْ حارَبْتُمْ، و أُسالِمُ مَن سالَمْتُمْ). واتە: خوێنمان یەکە و شکانمان یەکە و من لە ئێوەم و ئێوە لە منن، شەڕ لەگەڵ ئەو کەسە دەکەم کە شەڕتان لەگەڵ بکات و ئاشتی دەکەم لەگەڵ هەر کەسێك کە ئێوە ئاشتی لەگەڵ بکەن... بەڵێ، ئەم پەیمانەی پێغەمبەری خوا ﷺ هەر قسە نەبوو، بەڵکو بە کردەوە جێبەجێی کرد و هەرچەندە هەردەم دڵی لای شاری مەککەی شوێنی گروگاڵی بوو، شوێنی گەنجیەتی و بوونە پێغەمبەری و ماڵی خەدیجەی بوو، بەڵام وەفای بە پەیمانەکەی کرد و لە ساڵی فەتحی مەککەدا هاتەوە بۆ ناو مەدینە و لەوێ لەناو خەڵکی مەدینە وەفاتی کرد و پەیمانەکەی هێنایە دی کە فەرمووی: گۆڕم لەگەڵ گۆڕتانە.

بەڵێ، هەموو بە یەك دەنگ وتیان: (أُمْدُ يَدَكَ حتى نُبايعُكَ). دەستت بێنە و پەیمانت ئەدەینێ. لێرەدا ئەسعەدی کوڕی زورارە کە تەمەنی (٢٣) ساڵ بوو، یەکەم کەسی مەدینە بوو ئیمانی هێنابوو لە شەش گەنجەکە، ماڵەکەی ببوە بارەگای موصعەب، هەستا و فەرمووی: بۆەستن، پەلە مەکەن ئەی خزمەکانم، حەماسەت نەتانگرێت، بیربکەنەوە و بزانن ئێوە لەسەر چی وەعد بەم پیاوە دەدەن، ئەمە وەعددانە بەوەی کە شەڕی عەرەب و عەجەم دەبێ بکەن، شەڕی سپی و ڕەش بکەن. ماڵ و سامانتان دەکەوێتە مەترسیەوە، ئەگەر لە خۆتان ڕانابینن ئێستا وەعدی پێ مەدەن... هەموو هاواریان کرد:

بەیعەتی دەدەینێ و پەشیمان نین. ئینجا بە یەك کەڕەت دەستیان درێژ کرد بۆ دەست خستنە ناو دەستی پێغەمبەری خواوە ﷺ تەنانەت لە هیچ کتێبێکی سیرەدا ناوی ئەو کەسە نەهاتووە کە یەکەم کەس دەستی خستۆتە ناو دەستی پێغەمبەری خواوە ﷺ، ئایا بەڕائی کوڕی مەعرور بووە یان ئەسعەدی کوڕی زورارە یان کەسێکی تر بووە، چونکە هەموو بە یەکجار دەستیان بردە پێشەوە، بۆچی؟ چونکە بە لەحظەیەك زوتر دەست بخەیتە دەستیەوە، زووتر بە بەهەشت دەگەیت.

بەڵێ، کۆبونەوەکە کۆتایی هات، ئایا هیچ کۆبونەوەیەك هەیە ئاوا شەفاف و راشکاوانە و کراوە و ئازادانە قسەی تێدا بکرێت؟ ئاوا سەرکەوتوانە لە ماوەیەکی دوو سەعاتی کەمتردا بگاتە ئامانجێکی ئاوا گەورە؟!. ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: لە بەیانیەوە ئێمە خۆمان ئامادە دەکەین بۆ کۆچکردن بۆ لای ئێوە، لەبەر ئەوە پێویستە کۆمەڵێك کەس وەکو نوێنەری هەموو مەدینە دیاری بکەن، تاوەکو کاروباری پێشوازی کۆچکەران و دابینکردنی جێگاو رێگا بۆیان دابین بکات. (تەماشای ئەم نەخشە سازیە، ئەبێت کۆمەڵێك لێپرسراوی دیاری کراو هەبن بۆ کاروبارەکان). ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆخۆی دیاری نەکردن، بەڵکو فەرموی: خۆتان دیاری بکەن. ئەمەش مەبدەئی شورا و دەنگدان و دیموکراسی ئەمڕۆی چەسپاند.

بەڵێ، لە ناو خۆیاندا (١٢) کەسیان هەڵبژارد کە تیایاندا (عبداللهی کوڕی حیرام و ئەسعەدی کوڕی زەوررارە و بەڕائی کوڕی مەعرور و سەعدی کوڕی موعاذ و ئوسەیدی کوڕی حوضەیری تێدا بوو). پێغەمبەری خوا ﷺ بەو نوێنەرانەی فەرموو: (أَنْتُمْ كُفَلاءٌ على قَوْمِكُمْ و أنا كَفيلٌ على قَومي). ئێوە کەفیلن لەسەر هۆزەکانتان و منیش کەفیلم لەسەر هۆزەکەم... بەم

شێوەیە دانیشتنەکە کۆتای پێ هات و خەریك بوون بڕۆن، لە ناکاو یەکێك لە دورەوە هاواری کرد:

ئەی قورەیش ئەوە محمد لەگەڵ کۆمەڵێکدا کۆبۆتەوە و دەیانەوێت لە ناوتان بەرن. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەوە شەیطانە -جا شەیطانی جنۆکە بێت یان شەیطانی مرۆڤ بێت- کارەکەی ئاشکرا کردین..

عەبباسی کوڕی عوبادە فەرموی: (واللهِ الّذي بَعَثَكَ بالحَقّ، إنْ شِئْتَ لَنَميلَنَّ على أهْلِ منى عَداً بأسْيافنا). واتە: سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە، ئەگەر حەز دەکەیت بەیانی بە شمشێرەکانمانەوە بەرەو روویان دەبینەوە لە دەشتی مینادا.

بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لَمْ نُؤمَرْ بذالكَ و لكنْ ارجعُوا الى رِحالكُمْ). واتە: فەرمان ناکەین بە شەڕ کردن بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ ناو خێمەکانتان، ئەمجا زۆر بە بێ دەنگی هەرکەسە چویەوە ناو خێمەکەی خۆی و کەس لە رەفیقەکانیان هەستیان پێ نەکردن... بۆ بەیانی قورەیش هاتنە ناو خێمەکان و لێیان پرسین: ئەمشەو محمدتان بینیوە؟. موسڵمانەکان خۆیان مەشغوڵ ددکرد بە ئیشەوە و کافرەکانی مەدینەش ئاگایان لە هیچ نەبوو، سوێندیان دەخوارد کە کەسیان نەدیوە، بەم شێوەیە کارەکە بە سەرکەوتویی کۆتایی پێ هات. ئەم پەیمان بەستنەش پێی دەوترێت (پەیمانی عەقەبەی دووەم).

لێرەدا چەند وانەو دەرسی گرنگ لەم پەیمانەدا هەیە کە باسی بکەین:

یەکەم: ئەم پەیمانی عەقەبەی دووەمە، گەورەترین سەرکەوتنە لە مێژووی ئیسلامدا، چونکە هەموو سەرکەوتنەکان بەرهەمی ئەم شەوەن. کەعبی کوڕی مالیك ﷺدەفەرموێت: (واللهِ إنَّ بَدْرَ أشْهَر بَيْنَ النّاسِ منْ بَيعَةَ العَقَبَة، ولكنْ العَقَبَة أغلى عندَنا نَحْنُ الأنصار). واتە: سوێند بەخوا جەنگی بەدر ناوو ناوبانگی لەناو خەڵکدا زۆرترە لە پەیمانی عەقەبە، بەڵام پەیمانی عەقەبە زۆر

بەمترخترە لای ئێمەی پشتیوانان... بۆیە بەم پەیمانە دەوترێت (فَتْحُ الفُتُوح)واتە: (سەرکەوتنی سەرکەوتنەکان). چونکە هەرچی شکۆ و سەروەریەکانی ئیسلام هەیە بەرهەمی ئەم شەوە و ئەم پەیمانەن.

**دووەم: نهێنی پاراستن:** پێغەمبەر ﷺ زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەوپەری ئیحتیاط بکرێت، کە بەهیچ شێوەیەك هەستیان پێ نەکرێت، چونکە ئەگەر ئاشکرا بن و ئاوا بە کۆمەڵ بیانگرن هەموویان دەکوژرێن بە بەلاش و ئامانجەکەی کە هیجرەتە لەناو دەچێت، و بۆ یەکجاری ئیسلام شکست دەخوا، کەواتە: شەوێکی زۆر پڕ مەترسی و چارەنوس سازە، چارەنوسی ئیسلام بەستراوە بەم شەوەوە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت زۆر وریا و زۆر بە حەزەر بن، بۆ نمونە:

١.فەرموی: دەبێت چاوپێکەوتنەکەمان لە شەوی کۆتایی وەختی حەجدا بێت، لە شەوی (١٣)ی مانگی (ذي الحجة)دا بێت، چونکە لە دوا نیوەڕۆی رۆژی ١٣)ی مانگەوە، حاجیەکان دەڕۆنەوە بۆ وڵات و شارەکانی خۆیان، بۆ ئەوەی دانیشتنەکە لەگەڵ کاتی گەڕانەوە و بەجێهێشتنی مەککەدا زۆر کەم بێت، نەوەکو زۆر مانەوە ببێتە هۆی درکاندنی قسەیەك، یان قورەیش پێیان بزانن و ئاشکرا بن. ئەوە بوو ئاشکراش بوون و ئەگەر بەیانی نەگەڕانایەوە دەگیران.

٢.کاتی شەو دیاری کرا بۆ چاوپێکەوتنەکە، و فەرموی: دەبێت لە سێ یەکی شەودا بێت، چونکە ئەم کاتە خەو لە هەموو کاتێك خۆشترە و دوژمن و رەفیقەکانی لە ناو خێمەدا لە گەرمەی خەودان، چونکە ئەگەر سەر لە ئێوارە بوایە، خەڵکی بە خەبەر بوون، ئەگەر کۆتایی شەویش بوایە، خەڵك تێر خەو بوون و بە چرپەیەك بە ئاگا دەهاتن.

**سێیەم: هەڵبژاردنی شوێنی گونجاو،** فەرموی: وەرنە شیوی عەقەبە، بەڵام لای راستی شیوەکە، چونکە فەرموی: ئەوەی شەو هەستێت و بیەوێت بچێت بۆ کاری سەر ئاو دەچێتە لای چەپ، لەبەر ئەوە ئێمە دەبێت لای راستەوە بین.

**چوارەم:** شێوازی ڕۆشتنیان بۆ شوێنی دیاریکراو، فەرموی: نابێت کەس کەسی تر خەبەر بکاتەوە، واتە: نابێت لە ئێوارەوە بخەون، فەرموی: ئەوەی خەوتبوو کەس هەڵی نەسێنێت، نەوەکو بەدەم خەوەوە قسەیەك بدرکێنێت، و فەرموی: یەك یەك و دوو دوو وەرن و هەموتان بە یەکەوە مەیەن، پێڵاوەکانتان دانێن و وەکو سوێسکە چرپەی پێتان نەیەت.

**پێنجەم:** نابێت کەس ئەم باسە بدرکێنێت، تەنانەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو هەموو خزمەکانیدا تەنها عەبباسی مامی ئاگادار بوو، و لەناو هەموو صەحابەکاندا لە کاتێکدا لە هەمووشیان دڵنیا بوو کە هیچ قسەیەك نادرکێنن، بەڵام تەنها ئیمامی ئەبوبەکر و عەلی ﷺ ئاگادار بوون و هیچ کەسێکی تر ئاگای لەم دانیشتنانە نەبووە، وا بۆ ماوەی دوو ساڵە کەس نازانێت پێغەمبەری خوا ﷺ خەریکی چیە، چونکە پێویست نیە کەس بزانێت، ئەمەش ئیحطیاتە، لەوانەیە ئەگەر باسەکان لەناو صەحابەکاندا بڵاو ببوایەوە، لە رووی دڵپاکیەوە صەحابەیەك لای ژن و منداڵەکەی بیگێڕێتەوە و ئەوانیش بیدرکێنن و هەموو هەوڵ و تێکۆشانەکەی هەردوو پەیمانی عەقەبەی یەکەم و دووەم هەڵدەوەشێتەوە و قورەیش ناهێڵن یەك مەدینەیی بۆ حەجیش بێتە مەککە..

**شەشەم:** دانانی پاسەوان و چاودێر، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ ئیمامی ئەبوبەکر و عەلی ﷺ لەمسەر و ئەوسەری شوێنەکە کرد بە چاودێر، نەك چەند ئایەتێك بخوێنێت، ئیتر پاسەوان دانەنێت، نەخێر بەڵکو تەوەکول و پشت بەخوا بەستنی راستەقینە ئەوەیە کە قورئان بخوێنی و پشت ئەستور بیت کە هەر خوا دەتپارێزێت و وەسیلەش بەکار بهێنی کە پاسەوان و چاودێرە.

کەواتە: تەوەکولی راستەقینە ئەوەیە کە هەموو سەبەبەکان بەکاربهێنین و پشتیش تەنها بەخوا بەستین، و بزانین پاراستن تەنها بە دەست خوایە.

**حەوتەم:** پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: نابێت کەس بە دەنگی بەرز قسە بکات، نەوەکو کەسێك لە نزیکمانەوە خۆی پەنهان دابێت، و نابێت دانیشتنەکە زۆر بخایەنێت و دەبێت قسەکان کورت و پوخت بن، ئەوەتا فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەمووی لە چەند دێڕێك تێپەڕ ناکات، کەواتە: ئەمە ئەوپەڕی سەرکەوتوی یە لە دانیشتنی سیاسی و رێککەوتننامەی سیاسیدا.

**هەشتەم:** لە ئاخری دانیشتنەکەدا ئەوە بوو ئاشکرا بوون و پێشیان زانین، ئەمەش بۆئەوەی کە هەموو کەس بزانێت کە ئەم ئیسلامە بە موعجیزەی میثالی سەرنەکەوتووە، بەڵکو کارەکانی ئینسانی بوون، ئەوەتا لەوانەیە هەڵەیەك روویدابێت بۆیە ئاشکرا بوون.

کەواتە: هەموو کەس تەنانەت بێدینەکانیش دەتوانن بۆ رێکخستنی کاروباری ژیانیان و سیاسیان دەتوانن سود لە ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ ببینن، تەماشا بکەن چۆن کارەکانی رێك و پێك و بە نەخشە بووە.. و کارێکی واجبە کە ژیاننامەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە خوێندنی ئەکادیمی بخوێنرێت، چەندان سەنتەری لێکۆڵینەوەی بۆ دابنرێت، و بکرێت بە بەرنامەی خوێندن لە قۆناغی سەرەتاییەوە تاکو دکتۆرا..

وانەیەکی تر کە لەم باسەدا فێری دەبین بریتیە لە بەشداری ژنان لەو دانیشتن و ئیتیفاقیەدا کە لەو (٧٥) کەسە دوانیان ژن بون، ئەوانیش (نوسەیبەی کچی کەعب) کە ناسراوە بە (أُمُّ عَمَّارة) و ئافرەتی دووەمیان (ئەسمائی کچی عەمر) بوون، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ سوربوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت ژنانیش نوێنەری خۆیان هەبێت لەو رێکەوتنە سیاسی و چارەنوس سازەدا.

بەڵام ئەوانەی ئەمڕۆ رەخنە لە ئیسلام دەگرن کە ئیسلام مافی ئافرەتی نەداوەتا ئێستا لە حزبەکانیاندا کەمترین رێژەی بەشداری ژن هەیە لە ئاستی

سەرکردایەتی و پۆستەکانیاندا، بەڵام لە یەکەم دانیشتنی چارەنوس سازی ئیسلام و پێغەمبەری خوادا ﷺ خۆشەویستمان ﷺ سور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت نوێنەری ئافرەتان هەبێت، و لەبەر سامناکی شوێن و کاتەکە ئەگینا ئافرەتی زیاتریش بەشداری دەکرد... و دەبێت ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە بۆ پەیمان وەرگرتن پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی خستە ناو دەستی پیاوەکانەوە، بەڵام پەیمان وەگرتن لە ژنان هەر بە قسە بووە، چونکە ( ما صافَحَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ اِمْرَاَةً اَجنَبِيَّةً قَطُّ ). واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو ژیانیدا تەوقەی لەگەڵ ئافرەتێکی نامەحرەمدا نەکردووە...

کەواتە: ئەو پیاوانەی کە تا ئێستا تەوقە لەگەڵ ئافرەتانی نامەحرەم دەکەن، با هەر ئێستا بڕیار بدەن لەو کارە ناشەرعیەیان واز بهێنن و دڵپاکی نەکەن بە پاساوی تەوقەکردنەکەیان، چونکە هیچ کەس دڵی لە دڵی پێغەمبەری خوا ﷺ پاکتر نیە و هیچ ژنێکی ئەم زەمانە و پێشتریش لەو دوو ئافرەتە صەحابەیە بە ئیمانتر و پاکتر نین...

وانەیەکی تر: لە کاتی پەیمانەکەدا کاتێك خەڵکی مەدینە وتیان، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئێمە چیمان بۆ هەیە و چیمان دەست دەکەوێت لە پاداشتی ئەو بەرگری کردنە لە خۆت و لە یارانت و لە پەیامی ئیسلام ؟. فەرموی: بەهەشت. ئیتر وەعدی هیچ شتێکی تری پێ نەدان لە ماڵی دونیا و لە پلە و پایە، ئەوانیش ڕازی بوون. فِعلاً پەیمانەکەیان بردە سەر، ئەوەتا لە دوای وەفاتی خۆشەیست ﷺ هیچ سەرکردەیەك، و هیچ خەلیفەیەك لە خەڵکی مەدینە نیە، تەنانەت لە دەسکەوتی جەنگیش بەشیان نەدرا، چونکە ئەوان تەنها بەهەشتیان دەوێت، بەڵێ، یەك درهەم سودی ماڵییان لە ئیسلام و دەسەڵاتەکەی نەکرد، چونکە ئەوان تەنها وەعدی بەهەشتیان پێ دراوە و هیچی تر، بۆ نموونە: صەحابی مەدینەیی(ئوسەیدی کوڕی حوضەیر رضي الله عنه)

کە باسمان کرد چۆن لای موصعەب موسڵمان بوو، و یەکێك لە سەرکردەکانی مەدینە بوو، ئەوەندە دڵ پڕ لەئیخلاص و دڵسۆزی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ شایەتی بۆ داوە کە فریشتەهاتوون و گوێیان بۆ قورئان خوێندنی گرتووە، لە مەیدانی جیهادیشدا بەشداری هەموو غەزاکانی کردووە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ، کاتێك ئەم پیاوە بەڕێزە وەفاتی کرد لە زەمانی حەزرەتی عومەردا رضي الله عنه ، چوار هەزار درهەم قەرزار بوو، خزمەکانی هاتنە سەر ئەوەی کە موڵك و زەویەکەی بۆ بفرۆشن و قەرزەکەی پێ بدەنەوە، خۆ ئیمامی عومەر دەیتوانی لە (بَیتُ المال) قەرزەکانی بۆ بداتەوە، بەڵام ئەوەی هەر لە بیرە کە کاتی خۆی ئوسەید رضي الله عنه تەنها وەعدی بەهەشتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرتووە، بۆیە یەك درهەمی بۆ صەرف نەکرد، بەڵام فەرموی: ( لا تْرِكُ بَني أخي أُسَيد عالَةً على النّاسِ، ثُمَّ كَلَّمَ الغُرَماء، فَرَضُوا بِأنْ يَشْتَرُوا مِنهُ ثَمَرَ الأرْضِ أربَعَ سِنِينَ كُلَّ سَنَةٍ بِألْفٍ ) فەرموی: ناهێڵم منداڵەکانی ئوسەیدی برام بە دەست کورتی و نەداری بار بن بەسەر شانی خەڵکیەوە، پاشان قسەی لەگەڵ خاوەن قەرزەکان کرد و رازی کردن بەوەی کە بەروبومی زەویەکەی ئوسەید بکڕن بۆ ماوەی چوار ساڵ،هەر ساڵەی بە هەزار درهەم. واتە: تەنها تەکلیفی ئەوەی بۆ کرد کە خاوەن قەرزەکان لەسەری بوەستن و بۆ ماوەی چوار ساڵ لە بەرهەمی زەویەکە ئەمجا قەرزەکانیان تەواو وەربگرنەوە!!.. ئای چەند خۆشە ئینسانی موسڵمان وەکو خەڵکی مەدینە ئاوا تەنها بەهەشتی بوێت و هیچ قازانجێکی ماددی و پلەو پایەی بەهۆی ئیسلامەوە دەستگیر نەبێت. بەراستی ئەهلی مەدینە زۆر بەرێزن بەهۆی ئەم رەوشتەیانەوە،کە بەهەشتیان پێ لە هەموو شتێك پێ گەورەترە، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی گەورەیی خەڵکی مەدینە دەفەرموێت: ( لَوْلا الهِجْرَةُ لَكُنْتُ امرأً مِنَ الأنْصارِ، وَلَو سَلَكَ النّاسُ وادِياً و شِعْباً لَسَلَكْتُ وادِيَ الأنْصارِ و شِعْبَهُمْ)رواه البخاري و

مُسلم.واتـە: ئەگـەر کۆچـکردن نەبوایـە کەسێك دەبـووم لـە پـشتیوانان، واتـە خەڵکی مەدینە، وە ئەگەر خەڵکی هەمووی بە دۆڵ و شیوێکدا بڕۆن، ئەوا من بـە دۆڵ و شیوی مەدینەییەکانـدا دەڕۆم، واتـە حـەز دەکـەم بـەردەوام لەگـەڵ ئـەوان بم. هەربۆیـە گـۆڕی پیرۆزی‌و مزگـەوتی پـیرۆزی لـەناو ئەواندایـە. وە ئـەهلی مەدینـە ئەوانـە بـوون کـە (١٢)کەسـیان نـەبێت ئـەگینا ئـەوانی تریـان وەختێ ئیمانیان هێنا هێشتا چاویان بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەوتبوو، زۆر موشـتاقی چـاوپێکەوتنی بـوون. جـا مـوژدە لـە ئێمـەی ئیمانـداری ئـەم سەردەمەش بێت، کە إنشاءالله پلەی ئیمانمان بەرزە، کـە پێغەمبـەری خوامان ﷺ نەبینیوە و ئیمانمان هێناوە و موشتاقی چاوپێکەوتنی ئـەوین، إنشاءالله لە بەهەشتدا بە خزمەتی دەگەین..

وە خەڵکی مەدینە لـەدوای کۆچـکردنی پێغەمبـەری خـوا ﷺ بۆ مەدینـە هەموویان ئیمانیان هێناو موسڵمان بوون، ئەوەتا ئاخر کـەس کە لـە مەدینـە موسڵمان بوو(عەمری کـوڕی ثابـتـی کـوڕی وەقش)بوو، ئـەم پیـاوە موسـڵمان بوونی دواکەوت و هەر لەسەر کافری مایەوە هەتا ڕۆژی غەزای ئوحـود، ئـەوە بوو لە ڕۆژی غەزای ئوحوددا هاتـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا ﷺ و موسـڵمان بـوو، یەکـسەر ڕۆیـشت بـۆ شـەڕ و لـە مەیـدانی شـەڕدا شـەهید بـوو، وە فریانەکـەوت لـە ژیانـدا سـوجدەیەك بـۆ خـوا ببـات، وە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموی: (إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ). واتە عەمری کوڕی ثابت ئەهلی بەهەشتە.!!

الله اکبر لە گەورەیی خەڵکی شاری مەدینە، ئەوەیان کە دوای هـەموویان موسڵمان بوو، ئاوا بە عاقیبەتخێری گەڕایەوە بۆ لای خوا..

**وانەیەکی تر: ڕێزی خوای گەورە بۆ ئەوانەی کە بەشداری ئەو پەیمانەی عەقەبەی دووەمیان کرد:**

١.نزیکەی (٧٠)کەس لەو (٧٣) پیاوە بەشداری شەڕی گەورەی بەدریان کرد.

٢.(٣٣)کەس لەو (٧٣)کەسە بەشداری هەموو غەزاکانیان کردووە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ وە دوو لەسەر سێیان (٣/٢)لە کاتێکدا شەهید کران کە هێشتا پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیاندا بوو، تاوەکو بەرەکەتی نوێژ لەسەر کردن و دوعای پێغەمبەریان ﷺ بە نسیب بێت.

٣.بۆ نمونە و بەرەکەتی باسەکەمان ئاماژە بە وەفات و شەهیدبوونی هەندێك لە بەشداربووانی بەیعەی عەقەبەی دووەم دەکەین:

*یەکەم:* بەڕائی کوڕی مەعرور. ئەم صەحابە بەڕێزە کە سەرکردەی وەفدەکە بوو، لە ڕێگادا کە بەرەو مەدینە دەهاتن و هێشتا چاوی بە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکەوتبوو، کە چاویان بە کەعبە کەوت و کاتی نوێژ هات فەرموی: بەخوا من حەز ناکەم لەکاتی نوێژ کردندا پشت لە کەعبە بکەم، بەڵکو حەز دەکەم رووی تێبکەم. هاوڕێکانی وتیان: (وَاللهِ ما بَلَغْنا أنَّ النَبيَّ ﷺ يُصَلِّي إلاَّ الى الشَام ـ بِبَيْتِ الْمَقْدِسِ ـ وَما نُرِيدُ أنْ نُخالِفَهُ). واتە: هەواڵمان پێنەگەیشتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی بەرەو غەیری شام – بيت المَقدس– کردبێت، وە ئێمەش نامانەوێت سەرپێچی لە فەرمانەکانی بکەین، بەڵام بەڕاء هەر بەرەو کەعبە نوێژی دەکرد. کاتێك چونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاء باسەکەی بۆ گێڕایەوە. حەزرەت ﷺ فەرموی: (قَدْ كُنْتَ على قِبْلَةٍ لَو صَبَرْتَ عَلَيها). واتە: ئەگەر ئارام بگریت تۆ لەسەر ئەو رووگەیە دەبیت. ئەمجا بەڕاء لەسەر فەرمانی پێغەمبەر ﷺ بەرەو قودس نوێژی دەکرد... موسڵمان دەبێت ئاوا گوێڕایەڵی فەرمانی شەرع بێت. بەڵێ، بەڕائی کوڕی مەعرور بەیەك مانگ لە پێش هیجرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ وەفاتی کرد و لە سەرەمەرگدا وەصیەتی کرد کە یەك لەسەر سێی (٣/١)ی ماڵەکەی بدرێت بە پێغەمبەری خوا ﷺ، وە وەصیەتی کرد کە رووەو کەعبە بینێژن!!!. بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ

ماڵەکەی قبوڵ کرد و پاشان بەخشیەوە بەسەر موسڵمانەکان، وە خوای گەورەش ئاواتەکەی هێنایە دی و قیبلەش گۆڕدرا بۆ کەعبە!!.

لێرەدا پرسیارێك دەکرێت: باشە بۆچی وازوو بەراء وەفاتی کرد؟! لە وەڵامدا دەڵێین: واللهُ اَعْلَم خوای گەورە ویستی ئیسراحەتی بداتێ، چونکە دەوری خۆی بینی و یەکەم کەس بوو کە فەرموی: دەستت بێنە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ با پەیمانت بدەینێ ئێمە توانای شەڕمان زۆرە، یەکەم کەسیش بوو لەو (٧٥) کەسە کە چووە لیقای خوا..!.

*دووەم:* عبداللەی کوڕی عەمری حیرام، باوکی جابر... ئەم زاتە لە شەڕی ئوحوددا شەهید کرا، لاشەکەی لەلایەن کافرەکانەوە شێوێنرابوو. جابر دەڵێت: ویستم سەری لابدەم کە بە پارچە قوماشێك داپۆشرابوو، بەڵام خزمەکانم نەیان هێشت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی دا قوماشەکەی سەرچاوی باوکم لابدەن، وە پورم زۆر گریا. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ( وَلِمَ تَبْكِي فَمازالَتْ المَلائِكَةُ تُظِلُّهُ بِأجنِحَتِها حَتَّى رُفِعَ )رواه مسلم. فەرموی: بۆچی دەگریت لەکاتێکدا فریشتەکان بە باڵیان سێبەریان بۆ کردووە هەتا بەرز کرایەوە. واتە فەرموی: کەسی ئاوا بەڕێز لای خوا گریانی ناوێت. بەڵێ، (عبداللەی کوڕی حیرەم) یەکەم شەهیدی ئوحود بوو، لەگەڵ (عەمری کوڕی جەموح) دا، بەیەکەوە خرانە یەك قەبرەوە، کاتێك لافاو لە گۆڕستانەکەی دا لاشەکانیان گواستنەوە. صەحابەکان دەفەرمون: عبدالله برینەکەی لەسەر ناوچەوانی بوو، کە لایان برد خوێنی لێ هات، کە دەستیان خستە سەر برینەکە خوێنەکە وەستایەوە!! جابر دەفەرموێت: لە زەمەنی (معاویەی کوڕی ابوسوفیان)دا بانگیان کردین کە لاشەی شەهیدەکانمان بگوازینەوە چونکە جۆگەی ئاوی پێدا دێت، دەفەرموێت: (فَرَأَيْتُ أبي في حفرته، كَأَنَهُ نائمٌ، وما تَغَيَّرَ مِنْ حاله شيءٌ وَبَيْنَ ذلكَ ستٌ وأربَعُونَ سَنَةً فَحُوِّلا إلى مكانٍ آخَر رطاباً يَتَثَنُّونَ).

جابر دەفەرموێت: کاتێك لاشەکەیمان گواستەوە باوکم لەناو قەبرەکەدا وەنی هەر ئەتوت خەوی لێ کەوتووە، وە هیچ شوێنێکی لاشەی تێك نەچووبوو، ئەمە لەکاتێکدا لە کاتی شەهیدبوونیەوە تا کاتی هەڵدانەوەی گۆڕەکەی چل و شەشساڵی بەسەردا تێپەڕی بوو!!..

دوای شەهیدبوونی عبدالله پێغەمبەری خوا ﷺ بە جابری فەرموو: (یا جابرْ الا أُخْبِرَكَ ما قالَ اللّهُ عزوجل لأبيكَ؟! قُلْتُ: بَلى. قال: ما كَلَّمَ اللّهُ أحَداً إلاّ مِن وراءِ حِجابٍ، وَكَلَّمَ أباكَ كِفاحاً، فَقالَ يا عَبْدي تَمُنَّ عَلَيَّ أعْطِكَ، قال: يا رَبِّ تَحييني فَأُقْتَلُ فِيكَ ثانيةً، قالَ: إنَّهُ سَبَقَ مِنِّي (أنَّهُمْ إلَيْها لا يُرْجَعُونَ)، قال: يا رَبِّ فَأَبْلِغْ مَنْ وَرائي، فأنْزَلَ اللّهُ عزوجل هذهِ الآيَةَ: ﴿ ولا تَحْسَبَنَّ الَّذينَ قُتِلُوا في سَبيلِ اللّهِ أمْواتاً بَلْ أحياءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾) رواه الترمذي و صححه الحاكم. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی جابر ئایا هەواڵت پێ بدەم بەوەی کە خوای گەورە چی فەرموو بە باوکت؟! وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ. فەرموی: خوای گەورە قسەی لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەکردووە لە پشتی پەردەوە نەبێت، بەڵام بە بێ پەردە قسەی لەگەڵ باوکت کرد و فەرموی: بەندەکەم، چیم لێ داوا دەکەیت و چی دەخوازیت پێت دەبەخشم، ئەی جابر باوکت فەرموی: خوای گەورە بەس داوای ئەوەت لێدەکەم کە زیندووم بکەیتەوە و بچمەوە دونیاو لە پێناوی تۆدا بجەنگم لەگەڵ کافراندا و بۆ جاری دووەم لە پێناوی تۆدا بکوژرێمەوە!!. خوای گەورە فەرموی: ئاخر من بڕیارم داوە هیچ کەس دوای مردنی بۆ دونیا ناگەڕێتەوە. عبدالله فەرموی: دەی کەواتە خوای گەورە ئەم هەواڵەی ئێمە بەوانەی دوای خۆمان کە ئێستا لە دونیادان بگەیەنە. خوای گەورە داواکەی وەرگرت و ئەم ئایەتەی نارد کە دەفەرموێت: ﴿ ولا تَحْسَبَنَّ الَّذينَ قُتِلُوا في سَبيلِ اللّهِ أمْواتاً بَلْ أحياءٌ عِنْدَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ﴾.

سبحان الله لە گەورەیی شەهیدی، عبداللە حەوت کچی لە دوای خۆی بەجیٚ هێشتووە، یەك تاقە کوڕی هەیە، بە قەرزاری شەهید بووە، کەچی خوای گەورە دەفەرموێت: حەز بەچی دەکەیت؟ نافەرموێت: خوایە حەز دەکەم بزانم کوڕو کچەکانم چۆنن، خۆزگە چاوم پێیان دەکەوێتەوە، بەڵکو ئەوەندە لەزەتی لە شەهیدی کردووە دەڵێت: خوایە گیان تەنها داواکاریم ئەوەیە کە زیندوو ببمەوە و جارێکی تر لە پێناوی تۆدا شەهید ببمەوە، کەواتە: دەبێت ئەو حەقیقەتە بزانین کە شەهید بوون لە پێناوی ئیسلامدا خەڵاتە نەك لەناو چوون، وە هەموو کەسیش ئەو پلە گەورەیەی بە نسیب نابێت..

*سێیەم:* سەعدی کوڕی معاذ، ئەم صەحابیە ئازیزە لە شەڕدا برینداربوو، پاشان بەو برینەوە لەماڵەوە وەفاتی کرد، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (إهْتَزَّ عَرْشُ الرَّحْمن لِمَوْتِ سَعْدْ بنِ مُعاذ) متفق علیه. واتە: عەرشی خوا هاتە جوڵە و لەرزە بۆ مردنی معاذ. واتە لە خۆشی بەرزبوونەوەی رۆحی پاکی سەعدی کوڕی معاذ بۆ بارەگای خوا، عەرشی خوا هاتە جولان.!! کاتێك سەعد وەفاتی کرد و هەواڵیان دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەندە بە پەلە رۆیشت، هاوەڵان کە لەگەڵیدا بوون پەتی نەعلەکەیان پچڕا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆوا خێرا دەڕۆیت؟ فەرموی: (إنّـي أخـافُ أنْ تَـسْبِقَنا إلَيـهِ المَلائِكَـةَ فَتَغسله كما غَسَلَت حَنْظَلَة).. واتە: بەراستی لەوە ترسام کە فریشتەکان پێش ئێمە بگەنە سەری و بیشۆرن هەروەکو حنظلەیان شت!!. پاشان کە چوونە مزگەوتەوە بۆ ئەوەی نوێژی مردووی لەسەر بکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی کۆ دەکردەوە و خۆی بچوك دەکردەوە. عەرزیان کرد قوربان خۆ جێگا زۆرە، فەرموی: مزگەوتەکە ئەوەندەی فریشتە تێدایە جێگا نەماوە، هەموو ئەو فریشتانە هاتون نوێژی مردووی لەسەر بکەن!! ئەمجا کە بردیان بۆ سەرقەبران و تەسلیم بە خاك کرا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ((هذا العَبْدُ الصّالِح تَحَرَّكَ لَهُ العَرش) ئەم بەندە چاکە عەرشی بۆ هاتە جولان (وَ فُتِحَتْ أبواب السَّماء) هەموو دەرگاکانی ئاسمانی

بۆ کرانەوە. (وَشَهِدَهُ سَبْعُونَ ألفاً مِنَ المَلائِكَةِ) وە حەفتا هەزار فریشتە ئامادەی ناشتنی بوون، کە: (لَمْ يَنْزِلوا إلى الأرضِ قَبْلَ ذالِكَ) ئەو فریشتانە پێش ئەم جارە هەرگیز نەهاتبونە سەر زەوی(لَقَدْ ضُمَّ ضَمَّةً، ثُمَّ أُفْرِجَ عَنْهُ) زەوی گوشی بە گوشینێکی توند، پاشان بەریدا)..رواه النَّسائي و صحَّحه الألباني في صَحيح الجامع. وە ئەبێت بزانین ئەم هاتنەوە یەکی قەبرە، عەزابی قەبر نیە بۆ ئیماندار، بەڵکو ناڕەحەتیەکە هەروەکو نەخۆشی..

وە هەر لە بارەی گەورەیی سەعدەوە ﷺ ئەبی ئیسحاق دەفەرموێت: بیستم لە بەڕاء کە فەرموی: (أُهدِيَتْ لِرَسولِ اللهِ ﷺ حُلَّةُ حَرِيرٍ فَجَعَلَ أصحابه يَلمِسُونها و يَعْجَبُونَ مِنْ لينِها) پارچەیەك ئاوریشم بە دیاری نێرابوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵانیش دەستیان لێ ئەداو سەریان سوڕمابوو لە نەرمیەکەی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (أ تَعْجَبُونَ مِنْ لينِ هذه؟! لَمَناديلُ سَعْدُ بنْ مَعاذٍ في الجَنَّةِ خَيْرٌ مِنها و ألْيَنُ) واتە: ئایا سەرتان سوڕماوە لە نەرمی ئەم پارچە ئاوریشمە؟ سوێند بەخوا دەستەسڕەکەی سعدی کوڕی معاذ لە بەهەشتدا زۆر چاکتر و بەنرختر و نەرمترە لەم پارچە ئاوریشمە بەنرخە) ئەم فەرمودەیە ئیمامی موسلیم ریوایەتی کردووە..

ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا دەفەرموێت: زانایان فەرمویانە: ئەم فەرمودەیە ئاماژەیە بە گەورەیی شوێن و پلەو پایەی سەعد لە بەهەشتدا، وە نەرمترین پۆشاکی سەعد لە بەهەشتدا چاکتر و بە نرخترە لەم پارچە ئاوریشمە، چونکە دەستەسڕ بێنرخترین پارچە قوماشە، چونکە بۆ پاککردنەوەی پیسی و پۆخڵی دەم و لووت بەکاردێت، وە غەیری ئەو دەستەسڕە زۆر چاکترو بەنرخترە. وە ئەم فەرموودەیە ئیسپاتی بەهەشت دەکات بۆ سەعد!! هەزاران سڵاوی خوا لە سەعد و لە هەموو یارانی پێغەمبەر ﷺ...

*چوارەم:* ئەم نمونەیەمان لەسەر ئافرەتانە، چونکە دوو لە ئافرەتانیش بەشداری بەیعەی عەقەبەی‌دووەمیان کردوە، بەڕاستی ئەم دوو ئافرەتەش ڕاستیان کرد لەگەڵ وەعد و بەڵێنەکەیاندا.

یەکەمیان: نوسەیبەی کچی کەعب (أمُ عَمَّارة) ﷺ، ئەم ئافرەتە لە شەڕی ئوحوددا بەشداری کرد بەوەی کە ئاوی بۆ سەربازان دەبرد و برینداری تەداوی دەکرد،جا کاتێك موسڵمانان شکان و دەوری پێغەمبەری خوا ﷺدرا، نوسەیبە شمشێری هەڵگرت و لەگەڵ مێردەکەیدا (زەیدی کوڕی عاصم) لەبەردەم پێغەمبەری خوا دا ﷺ وەستان و شەڕەشمشێرێکی بەهێزی کرد و سەرەنجام دوانزە برینی بە لاشەوە بوو، چونکە لە پەیمانی عەقەبەی دووەمدا پەیمانی دابوو بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە بەرگری لێ بکات، وە پەیمانەکەشی جێبەجێ کرد..وە ئەم ئافرەتە بەهیممەتە بەشداری (بَیْعَة الرِّضوان)ی کرد، وە موسەیلەمەی درۆزن کوڕەکەی گرت و پارچەپارچەی کرد، ئەم دایکە قارەمانە چۆکی دانەدا و ورەی بەرنەدا و شانازی بە شەهید بوونی کوڕەکەیەوە دەکرد، وە نوسەیبە بەشداری شەڕی یەمامەی کرد لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلیددا، وە زۆر پاڵەوانانە لەگەڵ مورتەدەکاندا دەجەنگا تا سەرەنجام لە دوانزە لاوە بریندار بوو، وە دەستێکی قرتا!! کەواتە تێدەگەین کە لە ئیسلامدا ئافرەت بۆی هەیە بەشداری کاری سەربازی بکات، هەروەك چۆن بۆی هەبوو بەشداری کاری سیاسی بکات...

ئافرەتی دووەمیش: ئەسمائی کچی عەمر بوو ﷺ، ئەمیش وەعد و پەیمانەکەی کە دابووی بە پێغەمبەری خوا ﷺ هێنایە دی و هەتا وەفاتی کرد بەردەوام لە خزمەتی ئیسلام و پێغەمبەری خوادا بوو ﷺ..

**دەرس و ئامۆژگاری لە باسکردنی ئەم صەحابانە:**

**یەکەم:** تەمەن گرنگ ئەوە نیە درێژ بێت، گرنگ ئەوەیە پڕ بەرهەم بێت، با کورتیش بێت، نەك دورو درێژ و بێ بەرهەم. واتە: (گرنگە عومر و تەمەن

پان بێت نەك درێژ). هی وا هەیە عومری (٧٠) ساڵە، بەڵام ئەو حەفتا ساڵە هەر یەك رۆژە دووبارە دەبێتەوە، بەڵام ئەم صەحابانە تەمەنیان لە ئیسلامەتیدا کەم بوو، بەڵام بەرهەمی زۆریان هەبوو، (بەرائی کوڕی مەعرور) یەکەمجار هیممەتی مەدینەییەکانی جوڵاند بۆ بەیعەتدان، دوای مانگێك لە ناسینی حەزرەت ﷺ وەفاتی کرد. (موصعەبی کوڕی عومەیر) بە سێ ساڵ دوای هیجرەت لە ئوحوددا شەهید کرا. (ئەسعەدی کوڕی زورارە) ئەو گەنجەی یەکەم کەسی مەدینە بوو کە ئیمانی هێنا وماڵەکەی کردە بارەگای ئیسلام، دوای یەك ساڵ لە هیجرەت وەفاتی کرد لە تەمەنی ٢٥) ساڵیدا، هەموو تەمەنی موسڵمانیەتیەکەی (٣) ساڵ بوو.

(سەعدی کوڕی معاذیش) کە عەرشی خوای بۆ هاتە لەرزین هەموو ماوەی موسڵمانیەتیەکەی نزیکەی (٤) ساڵ بوو! ئەی باشە بۆچی وا پلەیان بەرز بوو؟! بۆیە وا پلەیان بەرز بوو چونکە بوونە هۆی هیدایەتی قەومەکەیان و بەقەدەر ژمارەی هەموو ئەو کەسانەی بەهۆی ئەوانەوە ئیمانیان هێنا ئەجریان لای خوا هەیە!.

چەند خۆشە ئێمەش کە دەچینەوە قاپی خوا ئاوا بەرهەممان پێ بێت و بڵێین: خوایە، ئەوەندە کەس بەهۆی منەوە هاتنە ئامێزە بە سۆز و پڕ رەحمەتەکەی ئیسلامەوە و لە زەحمەتی دونیا و قیامەت رزگاریان بوو!.

لێرەدا پرسیارێك دەکرێت: باشە بۆچی ئەم دڵسۆزانە نەگەیشتنە ئەو رۆژەی کە ئیسلام لە لوتکەی سەرکەوتندا ببینن کە گەورەترین ئاواتیان بوو؟! لە وەڵامدا دەڵێین:لەبەر ئەوەی ئەم زاتانە ئەوەی لەسەر شانیان بوو ئەنجامیان دا و خوای گەورەش ویستی بیانحەسێنێتەوە و لە چەرمەسەری ژیان رزگاریان بکات، تاقیکردنەوەکەیان تەواو کرد و بە ئیمتیاز دەرچوون و لە کۆلێجی باڵای (اعلى علیین)وەرگیران، شەهادەی شەهیدیان وەرگرت. ئیتر وەختی حەسانەوەیە، دەبێت بۆ هەتاهەتای لە بەهەشتی بەریندا ئیسراحەت بکەن!!.

دووەم: بۆچی ئێمە ئاوا بە گرنگیەوە باسی ئەو صەحابە بەرێزانە دەکەین دوای هەزار و چوارسەد ساڵ زیاتر لە شەهید بوون و وەفاتیان؟ بۆ ئەوە باسیان

دەکەین تا بیانناسین، کە ئاوا ناسیمانن خۆشمان دەوێن، کە خۆشیشمان ویستن انشاءالله لەگەڵ ئەواندا حەشرمان دەکرێت(المَرْءُ مَعَ مَنْ أحَبَ).

سێیەم: لێرەدا تێ دەگەین ئەو دیعایە و پڕوپاگەندە ژەهراویانەی دوژمنانی ئیسلام باسی دەکەن و دەڵێن: صەحابە هاتوون بۆ داگیرکردن و بردنی سەروەت و سامانی وڵاتان، ئەوەتا بۆمان دەردەکەوێت ئەوەی کە صەحابە هەر بیریشیان لێ نەکردۆتەوە ئەم دونیایە و سەروەت و سامانی دونیا بووە..

چوارەم: بە ئیسلام و خزمەتکاری ئیسلام ئینسان ناوی بەرز و بڵند دەمێنێتەوە، ئەوەتا دوای هەزار و چوارسەد ساڵ ئاوا بە شکۆداری و فەخرەوە ناوی ئەو ئازیزانە دێنین و یادیان دەکەینەوە. بەڵام دوژمنانی ئیسلام مەگەر ناویان لە زبڵدانی مێژوودا تۆمار بکرێت و وەکو رەمزی رەشی و نەگبەتی و بەدبەختی باسیان بکرێت.

لێرەدا باسەکەمان کۆتایی پێ دێنین تا وتاری داهاتوو کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ دەبین لە کۆچی پیرۆزی\دا، تا ئەو کاتە هەموو لایەکتان بەو خوایە دەسپێرم کە سپاردە زایە ناکات..

سەرچاوەکان:

١.قورئانی پیرۆز.

٢.السيرة النبويّة – د. علی محمد الصّلابي / ج١/ص٤١٦، ص٤٢٦، ص٤٢٨، ص٤٣٢، ص٤١٩، ص٤٢٩.

٣.علی خُطى الحَبيب – عمرو خالد – ص٨٧.

٤.اصحاب الرَّسُول – محمود المصري –ابوعَمَّار– ج٢، ص١٩٧، ص٨، ص٢٤٠، ص٢٤٣، ص٤٢٣.

# وتاری دووەم بۆ مانگی صەفەر

## ﴿کۆچکردن بۆ مەدینە﴾

( الحَمدُ للهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

ئیماندارانی بەڕێز: بە پشتیوانی خوای گەورە جارێکی تر دەچینەوە خزمەت سەروەر و سالارمان پێشەوای دونیا و ڕۆژی قیامەتمان حەزرەتی (محمد المصطفى ﷺ) لە باسی کۆچی پیرۆزیدا و دەڵێم: (وبالله التوفيق):

دوای ئەوەی پەیمانی عەقەبەی دووەم تەواو بوو، بڕیاری کۆچکردن درا، بەڵام دیارە کۆچ هەروا ئاسان نیە، بەڕاستی بەجێهێشتنی وڵاتی خۆت و خزم و ماڵ و زەوی و هەڵبژاردنی غەریبی و ئاوارەیی هەروا سانا نیە، قوربانی دانی دەوێت، عەقیدە و بیروباوەڕی پتەوی دەوێت، جا هەموو هۆکارەکانی ئامادەبوون بۆ کۆچ هاتبوونە جێ ئەوە بوو: لەماوەی ئەو (١٣) ساڵەی مەککەدا عەقیدەی صەحابەکان بە تەواوی دامەزرابوو بە بڕوابوون بە گەورەیی خوا و پێغەمبەرانی خوا ﷻ و ڕۆژی دوایی و پاداشت و سزای خوا، وە لەسەرو هەدی کۆچدا ئەو ئایەتانەی قورئان دەهاتنە خوارەوە کە بۆنی هیجرەتیان لێ دەهات. ئەوەبوو لە ئاخر ڕۆژەکانی سەردەمی مەککەدا سورەتی (العَنكَبوت)دابەزی، ئەمانەی هێنایە بەرچاو:

١.ئاوارەیی و دەربەدەری و بەڵا و موصیبەت توشی ئیمانداران بووە بە درێژایی مێژوو ﴿الٓمٓ ۝ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ۝ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ﴾العنكبوت ١-٣. ئەم ئایەتە صەحابە ئاگادار دەکاتەوە کە ئەم هیجرەت و ماڵ و نیشتیمان بەجێ هێشتنە لە پێناوی عەقیدە و بیروباوەڕی ئیسلامەتیدا سەنگی مەحەکە بۆ جیاکردنەوەی ئیمانی دامەزراو و ئیمانی لەرزۆك..

٢.لە ئایەتی (١١)ی (العنکبوت)دا دەفەرموێت: ﴿وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ﴾. ئەم ئایەتە باسی دووڕوو (مُنافِق) دەکات. باشە خۆ ئەمان لە مەککەدا دەژین لە قۆناغی بێ هێزیدان، مونافیقیش لە کۆمەڵگەیەکدا دەردەکەوێت کە هێز و دەسەڵات بۆ موسڵمانانە و ئیسلام فەرمانڕەوایە. کەواتە ئایەتەکە ئاماژە بەوە دەکات کە بەم زووانە دەسەڵات پەیدا دەکەن بە بەرهەمی ئەم هیجرەتە.

٣.ئایەتی(٤٦)ی سورەتی(العنکبوت) دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ...... ﴾ باشە خۆ ئەهلی کیتاب (جولەکە و گاور) لە مەککەدا نیە، ئەی معامەلە و گفتوگۆی جوانترین شێوە لەگەڵ کێ بکەن؟!. کەواتە ئەم ئایەتە ئەیەوێت تێیان بگەیەنێت کە دەچنە شوێنێك کە جولەکە و گاوری لێیە و ئاوا ڕەفتارتان جوان بێت لەگەڵیان..

٤.لە ئایەتی (٥٦)ی سورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێت: ﴿ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ ﴾ واتە ئاماژە بەوە دەكات كە دەبێت مەككە بەجێ بهێڵن و زەویش فراوانە.

٥.بێگومان هیجرەت ڕێگایەكی پڕ مەترسیە و گریمانی كوشتن و لەناوچونی تێدایە، بەتایبەت كە موشریكەكانی مەككە ئەوە قبوڵ ناكەن موسڵمانان وا بە ئاسانی كۆچ بكەن بۆ لابردنی ئەو دوودڵی و ترسە فەرموی: ﴿ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴾العنكبوت:٥٧.كەواتە: مادەم مردن هەر بتگاتێ ئیتر ترسی ناوێت.

٦.لەوانەیە كۆچكردوان بیر بكەنەوە باشە ئەگەر كۆچیان كرد بەچی بژین لە كاتێكدا نە پارەیان پێیە و نە لە مەدینە موڵك وماڵیان هەیە تا كاسپی لەسەر بكەن، بۆ ڕەواندنەوەی ئەو ترسەش خوای گەورە فەرموی: ﴿وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ العنكبوت:٦٠.

دوای ئەم ئاگادار كردنەوانە ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو صەحابەكانی كۆكردەوە و فەرموی: (قَدْ أخبَرْت بدارِ هِجْرَتِكُمْ و هِيَ يَثْرِبْ، فَمَنْ أرادَ الخُرُوجَ فَلْيَخْرُجْ إليها). واتە: هەواڵتان دەدەمێ بە ماڵی كۆچكردوتان كە یەثریبە، جا هەركەسێك حەز دەكات بە كۆچكردن با كۆچ بكات بۆ یەثریب.. ئەمجا لەو ڕۆژەوە دەست كرا بە كۆچكردن و دوو دوو سێ سێ موسڵمانان كۆچیان دەكرد بەرەو مەدینە، بەڵام زۆر بە نهێنی. تەنها حەزرەتی (عومەری كوڕی خطّاب رضي الله عنه) نەبێت كە بە ئاشكرا كۆچی كرد و تیروكەوانەكەی بە دەستەوە گرت و چووە كەعبە و دوو ركات نوێژی كرد و

یەکبەیەك سەیری کافرەکانی کرد و پێی وتن (شاهَت الوُجُوه)، ئەمجا فەرموی: (مَنْ أرادَ أنْ تَشْكله أُمُهُ ويُتم ولَده، وَ يرمل زوجته فليلقني وراءَ هذا الوادي). واتە: هەرکەسێك حەزدەکات دایکی ڕۆڵە ڕۆی بۆ بکات و منداڵی هەتیوو ببێت و ژنەکەی بێوەژن ببێت با لە پشتی ئەو شیوە بێتە بەرامبەرم!!. ئەوەبوو کەس نەیتوانی قسە بکات و شوێنی بکەوێت. وە بیست(٢٠) کەسی بێ دەسەڵات و بێ کەسیشی لەگەڵ خۆی برد.

لێرەدا پرسیارێك دەکرێت: باشە بۆچی حەزرەتی عومەر ﵁ بە ئاشکراو بێ ترس هیجرەتی کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بە نهێنی و خۆشاردنەوە هیجرەتی کرد؟! باشە خۆ ئیمامی عومەر﵁ لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئازاتر نیە و بە غیرەتتر نیە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ڕەفتار و هەڵسوکەوتی حەزرەتی عومەر ﵁ و هەرکەسێکی تر بە هەڵسوکەوتێکی شەخصی دادەنرێت و نابێتە بەڵگەی کارپێکردن و چاولێکردن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو جوڵە و کردارێکی دەبێتە هۆی ئەوەی کە موسڵمانان چاوی لێ بکەن و بەو شێوەیە ڕەفتار بکەن، چونکە پێغەمبەری خوا (مُشَرِّع)ە، جا ئەگەر حەزرەت ﷺ بێ حەزەر و خۆپەنادان و ئیحطیات کردن کۆچی بکردایە، وایان دەزانی ئەوە دەبێت هەموو موسڵمانان وابکەن ئەوە واجبە. کەواتە: نابێت سەرکردە حەماسەت بیگرێت و کارێك بکات کە بە هەموو کەس نەکرێت، بۆ ئەوەی شوێن کەوتوانی بە هیلاك نەچن!.... سُبحان الله لە گەورەیی ئەو پێغەمبەرە ﷺ کە هەرچی ڕێگای ڕاست و بەختەوەری و سەلامەتی و دوور بوونە لە بەهیلاك چوون بۆ ئوممەتەکەی خۆی داناوە و بە کردەوە ئەنجامی داوە، هەزاران صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت و ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لە یارانی دڵسۆزی بێت.. بەڵام صەحابەکان کۆچیان کرد،

بەڵێ دیارەقوڕەیش هەر وا بە ئاسانی لێیان ناگەڕێن کۆچ بەکەن، ئەوەبوو چەند شێواز و ڕێگایان بەکار هێنا بۆ گێڕانەوەیان:

یەکەم: (أسلُوب التَّفريق بيْنَ الرَّجُلِ وَ زَوجَته وَ وَلَده): جیاکردنەوەی پیاو و ژن و منداڵەکەیان لە یەکتری بۆ ئەوەی پەشیمانیان بکەنەوە لە کۆچکردن، ئەوەبوو کاتێك (ئەبو سەلەمە ﷺ) کۆچی کرد کەسوکاری (ئوم سەلەمە ﷺ) کەناوی (هیندی کچی ئەبی ئومەیە)بوو وە خێزانی ئەبوسەلەمە ﷺ بوو، هاتن و وتیان: نابێت کچەکەمان لەگەڵ خۆت ببەیت. کەسوکای ئەبو سەلەمەش ﷺ وتیان: ئێمەش ناهێڵین منداڵەکە لای دایکی بێت، هەردوولا دەستی منداڵەکەیان ڕادەکێشا تا دەستی لە جێ چوو. پاشان ئەبوسەلەمە ﷺ بەتەنها کۆچی کرد و منداڵەکە لای ماڵی باوکی مایەوە و ئوم سەلەمەش ﷺ برایەوە لای ماڵی باوکی خۆی، ماوەی یەك ساڵ (ئوم سەلەمە ﷺ) بۆ مێرد و منداڵەکەیان گریا تا ڕێگایاندا کۆچ بکات و منداڵەکەی لەگەڵ خۆی برد و کۆچی کرد، بەتەنها و بەپێ بەو بیابانەدا ملی ڕێی بەرەو مەدینە گرتەبەر. عُثمانی کوڕی طەلحە کە موشریك بوو لە دەرەوەی مەککە توشی بوو، وتی: ئەوە ئوم سەلەمە بەتەنها کۆچ دەکەیت؟! وتی: بەڵێ. عُثمان وتی: بەخوا جوان نیە ئافرەتێکی بەڕێزی وەکو تۆ بکەوێتە ناو مەترسی بیابانەوە، ئەوەبوو حوشترەکەی بۆ یەخ دا و ئوم سەلەمەی سواری پشتی حوشترەکەی کرد و بۆخۆشی ڕەشمەکەی ڕاکێشاو بەڕێگادا ڕۆشتن، ئوم سەلەمە ﷺ دەفەرموێت: هەرگیز پیاوی بە حورمەتی وەکو عُثمانی کوڕی طەلحەم نەبینیوە، بەخوا لەو هەموو ڕێگایەدا ئاوڕی نەدایەوە بەلامدا، وە هەر کاتێك وەختی پشوو بوایە وشترەکەی یەخ ئەدا و بۆخۆی دوور ئەکەوتەوە، تا بانگم ئەکرد و ئەموت: من ئامادەم با بڕۆین، تا گەیشتینە نزیك مەدینە ئینجا عُثمان گەڕایەوە، بەڵێ، عُثمانی کوڕی طەلحە

هەرچەندە موسڵمان نەبوو، بەڵام هەستی پیاوەتی و سۆزی مرۆڤایەتی جوڵا و بەزەیی بەم ژنە تەنها و غەریبەدا هاتەوە و ئەو مەردایەتیەی ئەنجام دا. ئەم عُثمانی کوڕی طەلحەیە ئەو کەسەیە کە کاتی خۆی کلیلی کەعبەی پێ بوو، سەرپەرشتی کردنەوە و داخستنەوەی دەرگای کەعبەی بە دەست بوو، رۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەو سەردەمەدا کە لەمەککە بوو، ئیسلام لە قۆناغی بێ دەسەڵاتیدا بوو، چووە لای عُثمان و فەرمووی: تکایە کلیلەکەم بدەیە با دەرگای کەعبە بکەمەوە و دوو رکات نوێژ لە کەعبەدا بکەم، عُثمان وتی: هەرگیز کلیلی کەعبەت نادەمە دەست ئەی محمد وە رێگات نادەم نوێژ لە کەعبەدا بکەیت.. پێغەمبەر ﷺ بە نەرمیەوە فەرمووی: ئەی ئەگەر رۆژێك کلیلەکە کەوتە دەستی من تۆ ئەڵێی چی؟! عُثمان وتی: ئەگەر ئەو رۆژە هات کە تۆ ئەی محمد دەسەڵاتت وای لێ بێت بتوانیت کلیلی کەعبە لە من بسەنیت، ئەوا مردنم پێ باشترە و ژیانم ناوێت.. بەڵێ، دونیا هەرگیز لەسەر بارێك ناوەستێت و رۆژان رۆژی لە دوایە، خۆش بە حاڵی ئەو کەسەی کەوا بیر ناکاتەوە کە دەسەڵات هەرگیز بێ دەسەڵاتی بەدوادا نایەت، ئەوەبوو لەدوای فەتحی مەککە کە ئیسلام ئەوپەڕی هێز و دەسەڵاتی پەیدا کرد و مەککەی پیرۆز و کەعبەی شەریف لە بتپەرستان پاك کرایەوە و رزگار کرا، پێغەمبەری خوا ﷺ کلیلی کەعبەی کەوتە دەست، بانگی عُثمانی کوڕی طەلحەی کردو فەرمووی: ( ئەی عُثمان ئەو رۆژەت لە بیرە ئا لەم شوێنەدا و لەم پەنای کەعبەدا داوای کلیلی کەعبەم لێ کردیت نەتدامێ و واشت وت: عُثمان وتی: بەڵێ لە بیرمە و ئەمڕۆ ئاوایە کە دەیبینم. لەو کاتەدا ئیمامی عەبباس ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کلیلەکان بدە بە من و ئەو ئەرکە و ئەو شەرەفە گەورە بە من بسپێرە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر واناکەم، وەرە ئەی عُثمانی کوڕی طەلحە کلیلەکان وەربگرە و ئەم رۆژە رۆژی

تۆڵە کردنەوە نیە، بەڵکو (یَوْمُ بِرٍّ وَ وَفَاءٍ). ئەمڕۆ ڕۆژی چاکە و وەفاداریە و ئەی عُثمان هەرچەندە ئەو ڕۆژە تۆ منت ئازاردا بەوەی کە مەنعی چونە ناو کەعبەت لێ کردم، بەڵام ئەم چاکەیەشت بەسەرمانەوەیە کە ئەو مەردایەتیەت نواند و (ئوم سەلەمە)ت گەیاندە مەدینە، ئەم چاکەیەت ئەو خراپەیەت دەشواتەوە. کەواتە: لەمەوە تێدەگەین کە کافرانیش دەبێت چاکە و خراپەیان تەماشا بکرێت و نابێت هەر تەماشای خراپەکانیان بکەین و مەوقیفە چاکەکانیان لە بیر بکەین. وە فەرموی: هەموتان بزانن دەبێت تا قیامەت کلیلی کەعبە لای عُثمان و نەوەکانی بێت. ئەوەتا ئێستاش کلیلی کەعبە هەر لای عُثمانی کوڕی طەلحەیە و لەسەر فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ هیچ پاشا و سەرکردەیەك بۆی نیە بەبێ پرسی ئەوان دەرگای کەعبە بکاتەوە.. وە عُثمانی کوڕی طەلحەش کە ئەمەی بینی و بیست لە پێغەمبەری خوا ﷺ موسڵمان بوو. بوو بەیەکێك لە دڵسۆزانی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئیمانداران: بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی ئیمانە کە خێزانێك ئاوا لێك بترازێت و بۆ ماوەی یەك ساڵ یەکتری نەبینن و چۆك بە هێزی کوفر دابدەن، وە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هەرکەسێك بۆ خوا لێببڕێت، خوای گەورە ئاوا دوژمنانیشی بۆ موسەخەر دەکات، ئەوەتا عُثمانی کوڕی طەلحەی دڵ نەرم کرد بۆ یارمەتیدان و گەیاندنی (ئوم سەلەمە) و منداڵەکەی بۆ مەدینە. ئەوەش تێدەگەین کە هەر کەسێك کاری جوان و مەردایەتی بکات وە بەزەیی بە خەڵکی داماودا بێتەوە، ئاخری ئەو چاکەیە دێتەوە ڕێگای و ڕۆژێك فریای دەکەوێت کە بەرهەمی چاکە نەبێت هیچ شتێکی تر دەوری نابێت، هەر وەکو عُثمانی کوڕی طەلحە کە بەبەرەکەتی ئەو چاکە و بەزەییەی بەرامبەر (ئوم سەلەمە) نواندی نوری ئیسلامی بە نسیب بوو، هیدایەتی خوای گەورەی

وەرگرت و کلیلەکانی کەعبەشی درایە دەست و خۆی و هەموو نەوەکانی لەو شەرەفە گەورە بێبەش نەبوون.!.

بەڵێ خۆشەویستان: وتمان کە قورەیش زۆر ڕێگایان گرتە بەر بۆ ئەوەی موسڵمانان ڕێگەی کۆچکردنیان لێ بگیرێت:

دووەم:(أسلُوب الإختطاف)واتە: هەڵخەڵەتاندن و دزین و شاردنەوە. بۆ نموونە: یەکێك لەوانەی کە لەگەڵ ئیمامی (عومەری کوڕی خەطاب ﷺ)دا کۆچی کرد ناوی (عَیاش بن أبي رَبیعة)بوو، ئامۆزا و دایك برای ئەبوجەهل و حاریثی کوڕی هیشام بوو، کافرەکان لەولای مەککەوە هاتنە سەر ڕێگای عەیاش و وتیان: دایکت نەزری کردووە، نە سەری بشوات نە بچێتە بەر سێبەر هەتا چاوی پێت نەکەوێت. ئیمامی عومەر ﷺ فەرموی: ئەم قسانەیان کاریگەری نەبێت لە سەرت، چونکە ئەگەر ڕاستیش بکەن دایکت ئاخری هەر وەڕەس دەبێت. بەڵام عەیاش بە قسەی کردن و گەڕایەوە و ئەوانیش گرتیان و بەندیان کرد.

سێیەم:( اسلُوب الحَبْس) گرتن و بەندکردنی ئەوانەی کە لە ڕێگای هیجرەتدا دەگیران، ئەوەبوو هەرچی بیانگرتایە دەیانبردەوە بۆ مەککە و لە ژوورێکی سەربەتاڵدا سجنیان دەکرد بۆ ئەوەی:

١.جگە لە ئازاری بەند و سجنەکە گەرماش ئازاری بدات.

٢.تا ئەوانەی پێ چاوترساو بکەن کە نیازی هیجرەتیان هەیە.

بەڵێ، کە پێغەمبەری خواش ﷺ گەیشتە مەدینە، ئەمانە هەر بەند بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر پەرۆشیان بوو وە یەك یەك دوعای بۆ دەکردن کە خوا ڕزگاریان بکات.

چوارەم:( اسلُوب التَجْرید منَ المال)لێساندنی ماڵ و پارە و سامانیان. بۆ نمونە (صوهەیبی رۆمی ﷺ) کاتی خۆی هۆزەکەی دەستی بەسەردا گیرا لەلایەن

ڕۆمەکانەوە و کرا بە کۆیلە و دەست بە دەست فرۆشرا تا گەیشتە مەککە و (عبداللەی کوڕی جدعان) کڕی و پاشان بە پارە ئازادی کرد و موسڵمان بوو، پارە و سامانێکی زۆری پێکەوە ناو وەختێك هیجرەتی کرد گرتیان و وتیان: (أَتَيْتَنا ها هُنا صُعْلُوكاً حَقِيراً، فَكثر مالُكَ عِنْدَنا، ثُمَّ تَنْطَلِق بِنَفْسِكَ وَ مالِكَ، واللهِ لا يكُونُ ذالكَ)واتە: تۆ هاتیتە ئێرە بەبێ ماڵ و حاڵ و هەژار بوویت، سەروەت و سامانێکی زۆرت لای ئێمە پێکەوە نا، ئێستا دەتەوێت بە خۆت و سامانەکەتەوە بڕۆیت بۆلای محمد، بەخوا هەرگیز شتی وات لێ قبوڵ ناکەین!. صوهەیب ﷺ فەرموی: باشە ئەگەر هەرهەموو ماڵەکەمتان بدەمێ وازم لێ دێنن؟ وتیان: بەڵێ.. ئەویش هەموو پارە و سامانەکەی خستە دەستیانەوە، پاشان جل و بەرگەکەشیان لەبەردا داکەند و پاشان پێڵاوەکانیشیان لێ سەند و بە دەس بەتاڵی و ڕووت و پێ خاوسی گەیشتە مەدینە. هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێ کەوت فەرموی: ( رَبِحَ صُهَيْبُ، رَبِحَ صُهَيبُ) صوهەیب لە معامەلەکەیدا قازانجی کرد، قازانجی کرد. خوای گەورەش لەبارەی صوهەیبەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْرِى نَفْسَهُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾ البقرة:٢٠٧.

ئیمانداران: باشە صوهەیب چی وەرگرت لەو معامەلەیەدا؟ تەنها و تەنها بەهەشت و ڕەفاقەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەگینا خۆ صوهەیب ماڵ و سامانەکەی بۆ نەبڕێردرا.

کەواتە: بەهەشت ئاوا لێبڕانی دەوێت، دەبێت جەستەی خۆت، ماڵ و منداڵی خۆت، سەروەت و سامانی خۆت بەقوربانی ئیسلام و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ بکەیت. ئەمڕۆش هەر کەسێك تامەزرۆی بەهەشت و دیداری پێغەمبەرە ﷺ با واز لە پارەی حەرام و دونیای حەرام بێنێت، بە کەمی حەلاڵ ڕازی بێت، بۆ

ئەوەی لە قیامەتدا بە خزمەتی بگات... بەڵێ، ڕەفاقەتی پێغەمبەر ﷺ و بەهەشتی خوا ڕەنجی دەوێت.

**هەزاران ڕەحمەت لە شاعیر کە فەرمویەتی:**

سەرم سوڕماوە لەو کەسەی کە بێ هونەر و تەڕدەمە

ئەم دنیایەی لە کۆڵ ناوە وبۆ قیامەتیش دڵ بێخەمە

لە جیاتی ڕێی سەرفرازی مەیلی ڕێگای هەڵدێر دەکا

بە چڵپەی چەپەڵی حەرام نەفسی چڵێسی تێر دەکا

ڕێویەکی خەواڵوە و خەیاڵی پاروی شێر دەکا

بەبێ تەڕ بوون ماسی دەوێ، بێڕەنج گەنجی خاسی دەوێ

بێ ئەوەی هیچی کردبێ، دەست خۆشی و سوپاسی دەوێ

وا ئەزانێ چەند ڕکاتێ نوێژی بێ گیان

یان چوار ڕۆژ ڕۆژووی ڕەمەزان

بازێ دینار بۆ مامە خولە و خەجێ خان

ئیتر ئەوەی ماوە بمرێ و بفڕێ بەرەو بەهەشتی جوان

نازانێ ئەوەی دەغەڵ بێ، خانوی دینی سەر ناگرێ

درەختی ڕەنجی قیامەتی زڕ دەردەچێ و بەرناگرێ

کارنامەی بە مۆری قەبوڵ مۆر ناکرێ

نازانێ ئادەم و حەوا بە میوانی بەهەشت کران

بە سوژدەی فریشتەکانیش ڕێزدار کران

کاتێ کە دەرچوون لە فرمان، خوایان ڕەنجان، لە ناو بەهەشتدا دەرکران

بۆ ئەم مەینەتخانەی زەوی نەقڵ کران

بەهەشت هەمووی ساز و ناز و خان و مانە

تابلۆیەکی نەخشێنراوە و گوڵزار و بەهارستانە

کاڵایەکی عەنتیکەیە و زۆر بەهادار و گرانە

ڕێگای بەهەشت لە دوای ئیمان

ئیستیقامەتە و کۆڵنەدان

ژیانە لەسایەی قورئان

بێوەیی یە و لە خوا ترسان

بەهەشت بڕوای پاکی دەوێ، کردەی جوان و چاکی دەوێ

یەقینێکی پۆلایین و دڵێکی بێباکی دەوێ

بەهەشت هەروا بەلاش نیە

پارویەکی حازر نیە و پولێکی موفت و کاش نیە

بەخشینی سامانی دەوێ، لەگەڵ نوێژا حەجی کەعبە و ڕۆژووی ڕەمەزانی دەوێ

تەسبیحات و موناجاتی (ئێوارە و بەیان)ی دەوێ

سەردان و یارمەتی دانی خزمان و یارانی دەوێ

نازی منداڵی هەتیو و خەڵوەتگای شەوانی دەوێ

لە تاو ڕۆژی نەفسی نەفسی فرمێسك و گریانی دەوێ

که دەم لیك دەکا بۆ حەرام، خۆگرتن و کسپە و هەڵقرچانی دەوێ

ڕێگای دۆزەخ عەیش و نۆش و قرپ و قاڵە

ڕێگای بەهەشت ترش و تاڵ و درك و داڵە

ئەگەر بەتەمای بەهەشتی بێ (باج بەها) ناکرێ

گەر ڕێبواری ئەو ڕێ دوورەی بەبێ توێشوو نابڕێ

ئەبێ لەو خەوە شیرینەی کۆتایی شەو دەست هەڵگری

بۆ خانەی خوا ڕێگری، تا لەو سەبای ساڵحانە لە ڕیزی سوژدەبەرانە سوژدە بەری

ئەبێت ئەوەی لات بەنرخ و سەنگینە، لە دڵتا جوان و شیرینە

ئەو سامانەی کەلای خەڵکی نیشانەی بەخت و نگینە

ئەبێ لە پێناوی بەهەشت ئامادە بی فیدای بکەی

بە بڕیاری بۆ خوا ژیان، ماڵی دینت ئاوا بکەی

ئینجا دەستت بەرز کەیت و بەهەشت لە خوا داوا بکەی.

بەڵێ، هیچ کەس نەما لە مەککەدا تەنها پێغەمبەری خوا ﷺ و ابوبکر و علی رضي الله عنه و ماڵ و منداڵیان نەبێت، دەبێت سەرکردە خۆی بخاتە مەترسیەوە و شوێنکەوتوانی ڕزگار بکات. کافرەکان زانیان وا نزیکەی (٣٠٠) کەس لە مەککەوە ڕۆیشتوە بۆ مەدینە، وە چۆڵی بە بازاڕەکانی مەککەوە دیار بوو، مەترسی ئەوەیان لێ نیشت کە پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچ بکات و ئەوسا کیانێکی ئیسلامی گەورە لە مەدینە درووست دەبێت و دەبێتە مەترسیەکی هەرە گەورە بۆ مەککە و قوڕەیش، بۆیە

هەموو سەرانی کوفری مەککە بڕیاری دانیشتنێکیان دا لە (دارُ النَّدوة) کە وەکو پەرلەمانی ئەم سەردەمە وابووە بۆ ئەوان، وە پیلانی ژەهراوی و کوشەندەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ داڕشت، ئەوان لەوێ پیلانیان دارشت و خوای گەورەش حەزرەتی جوبرەئیلی نارده خزمەت پێغەمبەره خۆشەویستەکەی و فەرموی: ﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ ۖ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴾الانفال:٣٠. واتە: ئەی محمد یادی ئەو کاتە بکەرەوە کاتێك ئەوانەی بێ باوەڕ بوون پیلانیان دەگێڕا دژی تۆ بۆ ئەوەی بەندت بکەن، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن، ئەوان پیلانی خۆیان دەگێڕن و خوایش پیلانی خۆی دەخاتە کار ( بە پووچکردنەوەی کارەکانیان) دڵنیابن خوای گەورە چاکترینی هەموو پلانساز و نەخشەسازانە نایەڵێت پیلانیان سەربگرێت.

ئەمجا خوای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ کرد کە کۆچ بکات بەرەو مەدینە، پێغەمبەری خواش ﷺ حەزرەتی عەلیؓ بانگ کرد و فەرموی: (ئەی عەلی تۆ ئەمشەو لە جێگای مندا دەخەویت و هەموو ئەو ئەمانەتەی کە ئەو کافرانە لای من دایان ناوە ئەیدەیتەوە بە خاوەنە کافرەکانیان.!. الله اکبر لەو عەظەمەتە، ئەوەی سەلماند کە نابێت دوژمنایەتی، ئەخلاق بەرزی لەکەدار بکات و نابێت ئەمانەت بفەوتێت، چونکە ئەو ناسراوە بە (الصّادقُ الأمین) ڕاستگۆی دەسپاکی ئەمین. ئەبێت لەگەڵ دوژمنەکانیشی، ئەو دوژمنەی کە ئەیەوێت بیکوژێت و لە ناوی بەرێت هەر ئەمین و ڕاستگۆ بێت. بەڕاستی هەرگیز دونیا

سەرکردەی ئاوای بە خۆیەوە نەبینیوە و نایبینێت، ماڵی ئەو کەسە بپارێزیت و بیدەیتەوە دەستی لە کاتێکدا کە خەریکە ئەتکوژێت ماڵت دەخوات، دەربەدەرت دەکات، بڕوای بە خوا و پێغەمبەر و قیامەت نیە، نابێت بە فرسەت تۆڵەی لێ بکەیتەوە.

بەڵێ ئیمانداران: ئێستا کاتی هیجرەتەو هەموو هەنگاوێك پیلان دانان و حەزەر و ئیحتیاطە. کە بەداخەوە ئەمڕۆ موسڵمانان لە نەخشەسازیدا بۆ کارەکانیان زۆر لاوازن، با بزانین پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ چۆن نەخشە دادەنێت و چۆن پیلان بۆ ئاشکرا نەبوون و خۆ پارێزی دادەنێت:

١.لە گەرمەی نیوەڕۆدا چوو بۆ ماڵی حەزرەتی ئەبوبەکر رضي الله عنه تا هەواڵی هیجرەتی بداتێ، باشە بۆچی لەو کاتەدا چوو؟! لەبەر ئەوەی لەو گەرمایەی نیوەڕۆدا کەس لەبەر گەرما بە دەرەوە نیە و نایبینێ وە پێشتر هەرگیز لەو کاتەدا نەچوە بۆ ماڵی ئەبوبەکر رضي الله عنه چونکە وەختی پشوو ئیسراحەتە..

٢.پێغەمبەری خوا ﷺ دەم و چاوی پێچابوو، بەس چاوی بەدەرەوە بوو، بۆ ئەوەی ئەگەر کەسێك بینی نەیناسێتەوە.

٣.کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتە ماڵەوە فەرموی: ئەی ئەبوبەکر با کەس لە ژوورەوە نەمێنێت و کاری تایبەتم پێتە، نەوەکو کەسێك ئاگای لەم باسە بێت و بیدرکێنێت.

٤.پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی ئەبوبەکر دەمەوێت هیجرەت بکەم و تۆش هاوڕێی سەفەرمیت، بەڵام نەیفەرموو لە کوێوە دەڕۆین و چی دەکەین، چونکە هێشتا پێویست بەوە ناکات.

٥.حەزرەتی ئەبوبەکر ﵁ کە بیستی پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: تۆ هاوەڵی سەفەرەکەمیت لە خۆشیان گریا، عائیشە ﵂ دەفەرموێت: بۆ یەکەم جار بوو بینیم کەسێك لە خۆشیان بگری، ئەمجا حەزرەتی ئەبوبەکر ﵁ فەرموی: دەمێکە دوو حوشترم ئامادە کردووە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بە بێ پارە نامەوێت. بەڵێ، کێ لەم کارە نهێنی و مەترسیدارە ئاگادار دەکرێت؟! ئەسمائی کچی ئەبوبەکر ﵁، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی ئەسماء دەچینە ئەشکەوتی ثەور و خواردنمان بۆ بێنە و دواتر هەندێك ئیشت پێ دەڵێم.. باشە بۆچی تەنها ئەسماء ئەم نهێنیە دەزانێت؟ لەبەر ئەوەی:

١.ئەسماء زۆر نهێنی پارێزە، ئەوەتا دواتر ئەبوجەهل زللەی لە گوێی دا لەسەر ئەوەی لێ ی پرسی ئایا ئەسماء باوکت و محمد بۆکوێ رۆیشتون؟ ئەسمائیش فەرموی: نازانم. ئەبوجەهل لە داخا زللەیەکی لێدا و گوارەکە لە گوێی پەڕی، کەچی ئەسماء هیچی نەدرکاند. واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چاك ئەسمائی ناسیوە کە چەند نهێنی پارێزە...

٢.ئەسماء حامیلەیە و سکەکەی (٧) مانگە کەس عەقڵی ئەوە نابڕێت کە ئەو ژنە بەو حاڵەوە بگاتە ئەشکەوتەکە بەو ڕێگا دوورە و بەو شوێنە زەحمەتەوە!.

بەڵێ، ئەمەیە سیقە و متمانەی پێغەمبەری خواو ﷺ ئیسلام بە ژن، ئەو نهێنیەی کە ئەبوبەکر و عەلی ﵄ نایزانن، ژنێك دەیزانێت.

بەڵێ ئیماندارن: پێغەمبەری خوا ﷺ چوەوە بۆ ماڵەوە و قورەیشیش بە فەرمانی ئەبو جەهل (دە) گەنج لە هەر بە رەبابەی گەنجێکی دانا لە بەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ تا بیکوژن کاتێك لە

بەرەبەیاندا لە ماڵدا دێتە دەرەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ مشتێك خۆڵی هەڵگرت و ئایەتی: ﴿ وَجَعَلْنَا مِن بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَاهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴾. ئەمجا خۆڵەکەی بە دەم و چاودا کردن و فەرموی: (شَاهَتِ الوُجُوه). بە ناو ئەو گەنجە شمشێر بە دەستانەدا هاتە دەرەوە و هیچ کەس نەیبینی. ئەمجا چوو بۆ ماڵی ئەبوبەکرو ﷺ هەر ئەو شەوە لە پەنجەرەەکی پشتی ماڵەکەوە چونە دەرەوە، نەوەك کەس لە دەرگای دەرەوە بیانبینێت.

تا ئێستا ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ نازانێت بەرەو کوێ دەڕۆن، وایزانی بە ڕێگای ئاسایی مەدینەدا دەڕۆن، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە عەکسەوە ڕێگای پێچەوانەی هەڵبژارد و رووکردە باریکە ڕێگەیەك کە تەنها مەجالی یەك نەفەر هەیە پیایدا بڕوات، بەرەو ئەشکەوتی ثەور بەڕێ کەوتن.

کاتێك بەسەر شاخەکەدا سەرکەوتن و شاری پیرۆزی مەککەیان لێ دەرکەوت، پێغەمبەر ﷺ سەیری کەعبەی پیرۆزی کرد و دوو چاوی پیرۆزی فرمێسکی باراند و فەرموی: ( ئەی مەککە، ئەی شوێنی لە دایك بوونم و گەورە بوونم، شوێنی منداڵی و گڕۆگاڵم، شوێنی بازرگانی و شوانیم، بەخوا تۆ پیرۆزترین خاکیت لای خوای گەورە، بەخوا ئەگەر قەومە نەفام و نەزانەکەم دەریان نەکردمایە و ناچاریان نەکردمایە بە دەرچوون لێت، هەرگیز بە جێم نەدەهێشتیت ).. ئەمەیە خۆشەویستی نیشتیمان و شوێنی لە دایك بون، کە پێی دەوترێت: (سۆزی نەتەوایەتی و سۆزی

نیشتیمانی) کە جیاوازە لەگەڵ ڕەگەز پەرستی و نەتەوە پەرستی... ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ بە دڵی پڕو چاوی پڕ لە فرمێسکەوە هەردوو دەستی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و لە خوا پاڕایەوە و فەرموی: ( الحَمْدُ للّهِ الّذي خَلَقَني وَلَم أكُ شَيْئاً، اللّهُمَّ أعِنّي على هَولِ الدُّنيا، وَ بَوائِقِ الدَّهرِ، وَ مَصائِبِ اللّيالي و الأيّام، اللّهُمَّ اصحبني في سَفَري وَ اخْلُفْني في أهلي، وَ بارِك لي فيما رَزَقْتَني، وَ لَكَ فَذَلّلْني، وَ علىَ خَلقي فَقَوِّمْني،و إلَيْكَ رَبِّ فَحَبِّبْني، و إلى النّاسِ فَلا تَكِلْني) رواه عبد الرزاق في المصنف (٩٢٣٤). واتە: (سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە لە نەبونەوە دروستی کردوم، خوای گەورە و پەروەردگارم لێت دەپاڕێمەوە کە یارمەتیدەرم بیت بەسەر کۆسپەکانی ژیاندا، وە ناخۆشیەکانی ژیاندا، وە یارمەتیدەرم بیت کە سەرکەوم بەسەر نارەحەتیەکانی شەو و ڕۆژەکان، خوای گەورە و میهرەبانم یارمەتیم بدەیت لەم سەفەرەدا ئاگادارم بیت، وە بە ماڵ و منداڵم شادم بکەیتەوە، وە بەرەکەت بخەیتە رزق و رۆزیمەوە، وە زەلیل و ملکەچم بکەیت بەرامبەر بە گەورەیی و عەظەمەتی خۆت، چونکە عیزەت و سەربەرزی مرۆڤ لەوەدایە کە زەلیلی بەردەم پەروەردگاری بێت، خوایە لەسەر ڕەوشتی جوان دامەزراوم بکەیت. خوای گەورە و میهرەبان لای خۆت خۆشەویستم بکەیت، خوایە هەرگیز نەمسپێری بە خەڵکی و تەنها و تەنها خۆت ئاگادریم بکەیت و پشتیوانیم بکەیت).

ئای ئیمانداران: دەبێت پێغەمبەری خوا ﷺ چەند بە کوڵ لە خوا پاڕابێتەوە، چەند فرمێسکی ڕشتبێت؟! ئەمە بۆ ئەوەی کە فێرمان بکات

کە ئێمەش لە هەموو کاتێکی ژیانماندا، بە تایبەت لە کاتی نارەحەتی و دڵ تەنگیدا بەم وشە پیرۆزانە لە خوای خۆمان بپاڕێینەوە، بۆ ئەوەی کە خوای گەورە ئاواش بەدەم ئێمەوە بێت و لە تەنگانەو دڵ بە خەمی ڕزگارمان بکات.

بەڵێ خۆشەویستان: لەم کاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بە دڵ لە خوا دەپاڕایەوە حەزرەتی جوبرەئیل ؏ هاتە خوارەوە و ئەم ئایەتە قورئانیەی بۆ هێنا کە دەفەرموێت: ﴿وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ﴾ القصص:٢٠. واتە: ئەی محمد ﷺ خەم مەخۆ چونکە ئەمە هەر بەرامبەر بە تۆ نەکراوە، ئەوەتا موسای براشت لەلایەن فیرعەون و تاقمەکەیەوە هەر وەکو تۆ پیلانی کوشتنی بۆ دانرا و ناچاریان کرد وڵات و نیشتیمان و دایك و خوشك و برای بەجێ بهێڵێت، بەڵام ئەگەر ئەم هەواڵی پیلانە دڵسۆزی موسا لە کۆشکی فیرعەونەوە هات و پێی وت، ئەوا ئەی محمد ﷺ خوای گەورە خۆی جوبریل دەنێرێتە خزمەتت و ئەو هەواڵی پیلانەت پێ ڕادەگەیەنێت. واتە: دەیەوێت پێی بڵێت کە هەرگیز دڵ تەنگ مەبە و خۆم چاودێریت دەکەم و لە پیلانی دوژمنان دەتپارێزم.

ئەمجا خوای گەورە باسی ئەوەی بۆ دەکات کە حەزرەتی موساش؏ هەر وەکو تۆ بە ترسەوە بە حەزەر و ئیحتیاطەوە شارەکەی خۆی بەجێ هێشت و وەکو تۆ لە خوا پاڕایەوە، دەفەرموێت: ﴿فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ القصص:٢١. خوای

گەورەش موژدەی دایە حەزرەتی موساو فەرموی: ﴿ نَجَوْتَ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ القصص:٢٥. هەر لە هەمان سورەتشدا خوای گەورە موژدە دەدات بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە ڕۆژێك بە سەربەرزیەوە دێتەوە بۆ ئەم شاری مەککەیە کە ئێستا وا بە دڵ نارەحەتیەوە بەجێی دەهێڵێت، وەکو دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيْكَ ٱلْقُرْءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٍ ﴾ القصص:٨٥. بەم شێوەیە بەردەوام قورئان دڵنەوایی دەکرد تا گەیشتنە ناو ئەشکەوتەکە، کە لە ناو شاری مەککە بۆ ئەشکەوتی ثەور نزیکەی (٣) سەعاتە.

لەم لاشەوە (دە) کوڕە گەنجەکە هەتا هەتاو کەوتنی درەنگ هەر چاوەڕێ بوون کەچی وا محمد هەر لە جێگەدایە، تا پیاوێك هات بۆلایان و وتی: من محمدم بینی دەرچوو لەماڵەوە. هەر (دە) گەنجەکە کە ئەم هەواڵەیان بیست بە پەلە هەڵیان کوتایە سەر جێگاکەی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام سەیر دەکەن پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو جێگەکەیدا نیە و حەزرەتی عەلی ﷺ لە ناو جێگەکەیدا خەوتووە، هەرچی ئازاریان دا کە شوێنی پێغەمبەریان ﷺ پێ بڵێت، بەڵام حەزرەتی عەلی ﷺ فەرموی: نازانم پێغەمبەر ﷺ بەرەو کوێ ڕۆیشتوە، ئەمجا هەواڵ بڵاو بۆیەوە بە ناو هەموو شاری مەککەدا کە محمد دەرچوەو لە مەککە نەماوە. کەواتە: ئەو فکرەی لە جێگا خەوتنی عەلی ﷺ لە جیاتی پێغەمبەر ﷺ زۆر ناجیح بوو، وە پیلانێکی سەرکەوتوو بوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ

گەیشتبوە ئەشکەوتەکە ئەمجا زانرا کە ئەوە عەلی یە و پێغەمبەر ﷺ کۆچی کردووە..

بەڵێ، قورەیش بە یەك کەڕەت کەوتنە گەڕان و بەرەو ڕێگای مەدینە ڕۆیشتن، بەڵام هیچیان دەستگیر نەبوو، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە پێچەوانەوە ڕۆیشتبوو، سەرەنجام بە هەموو لایەکدا بڵاو بونەوە و ئەوەندە گەڕان تا سەرەنجام چونە سەر ئەشکەوتەکە، باشە بۆچی ئەو ئەشکەوتەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە باشترین شوێنی خۆشاردنەوەی دانا بوو، وە هەموو نەخشە سازیەکی بۆ کردبوو، کەچی وا کافرەکان دۆزیانەوە و چونە سەری؟! تاوەکو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو دەرس و وانەیەش فێر ببێت کە هەرچەندە پیلان و نەخشە سەرکەوتوو بێت، کەچی پاراستن هەر بە دەست خوایە... بەڵێ، چونە بەردەمی ئەشکەوتەکە و ئەبوجەهل و عوتبەی کوڕی ڕەبیعە کە دڵڕەقترین و سەرسەخترین دوژمنی پێغەمبەری خوا ﷺ بوون چونە سەر دەرگای ئەشکەوتەکە حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ( لَوْ نَظَرَ أَحَدُهُمْ أَسْفَلَ قَدَمَيه لَرَآنا ). ئەگەر بێتو بڕواننە ژێر پێی خۆیان و کەمێ سەرداخەن ئەمان بینن. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر بە دڵ دامەزراویەوە، بە تەوەکول و پشت بەستنی تەواو بە خوای گەورە فەرموی: ( يا أَبا بَكْرَ ما ظَنُّكَ بِاثْنَيْن اللّهُ ثالِثُهُما ). ئەی ئەبوبەکر ڕەئی و بۆچونت چیە بەرامبەر بە دوو کەس کە سێیەمیان (الله) یە؟! ( لا تَحْزَنْ إِنَّ اللّهَ مَعَنا ) خەفەتبار مەبە و مەحزون مەبە، بەڕاستی ئێمە خوامان

لەگەڵە. ئەیفەرمو: (لاتَخَفْ)مەترسێ، چونکە ئەبوبەکر ﷺ نەدەترسا بەڵکو خەفەتبار بوو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نەکا بە دەستی ئەو کافرە دڵڕەقانە توشی ئازارێك ببێت، لەم کاتە سامناکەدا دوو سەربازی نەناسراو کەوتنە کار، جاڵجاڵۆکە کەوتە پەردە چنین و کۆتر هێلانەی درووست کرد و هێلکەی تێدا کرد.کاتێك ئەبوجەهل کەمێك سەری دانەواند بڕوانێتە ناو ئەشکەوتەکە، چاوی چووە سەر جاڵجاڵۆکەکە و جووتە کۆترەکە، بۆیە بە هاوڕێکانی وت: (لَو دَخَلَ ها هُنا لَمْ يكُنْ نَسْج العَنْكَبُوتِ على بابه) ئەگەر لێرەوە بچونایە ئەم ئەشکەوتەوە ئەوا چنراوی جاڵجاڵۆکەکە لەسەر دەرگاکەی نەدەبوو!!. بەڵێ ﴿وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ﴾ المدثر:٣١. بەو دوو سەربازە گومناوە سەری لەو بێ دینانە شێواند، لەو وەختەوە هەتا ئێستاش کۆتر دەوری ئەشکەوتەکە بەرنادەن، هەرچەندە نە ئاو، نە گیا و خواردنی لێیە، وەکو یادگاری ئەو ساتە وەختە کە کاتی خۆی کۆترەکان دیفاعیان لە پێغەمبەری خواو ﷺ ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ کرد..

بەڵێ، کافرەکان مەئیوس بوون لە دۆزینەوەیان بۆیە ئەمجارە بڕیارێکی نوێیان دەرکردو بڵاویان کردەوە کە ئەگەر هەر کەسێك محمد بە زیندوی یان بە مردوویی تەسلیم بکات ئەوا لە پاداشتدا (١٠٠) حوشتر خەڵات وەردەگرێت، ئەوە بوو گەڕان و سوڕان لە تاوی ئەم

خەڵاتە گران بەهایە دەستی پێ کرد و هەموو کەس لە کافرەکان کەوتنە جموجۆڵ و گەڕان.

لەملاشەوە لەسەر ئامۆژگاری پێغەمبەری خوا ﷺ ئەسماء خواردنی بۆ بردن بۆ ئەشکەوتەکە، لە ئەشکەوتەکەدا کۆبونەوەیەکی سێ قۆڵی کرا، پێغەمبەری خوا ﷺ و ئەبوبەکری صِدیق رضي الله عنه و ئەسماءرضي الله عنها ، سەرنج بدەن هیچ شوێنێك نیە لە سیرەدا کە باسی ژنی تێدا نەبێت، ئیتر کوا ئیسلام مافی ئافرەتانی پێشێل کردووە؟. ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەو کۆبونەوەیەدا بە ڕاوێژی ئەبوبەکر و ئەسماء رضي الله عنهما نەخشەی ڕۆژانی داهاتویان سازدا و جێبەجێ کردنی ئەم نەخشەیە سپێردرا بە ئەسماء، واتە: ئەسماءرضي الله عنها بوو بە لێپرسراوی ڕێکخستنی ناو شار... بڕیارەکانیش ئەمانە بوون:

١.عبداللەی کوڕی ئەبوبەکر رضي الله عنهما دیاری بکرێت بە (رَجُلُ المُخابرات، و کاشِفِ الحَرَكات العَدوُ) لێپرسراوی هەواڵگیری و شوێن پێی جوڵەی دوژمنان هەڵبگرێت، هەموو ڕۆژێك تێکەڵاو بە خەڵك ببێت و گوێ هەڵبخات بۆ ئەوەی بزانێت پیلانی تازەی دوژمن چیە و بەرەو کوێ بە شوێنیاندا دەڕۆن، پاشان لە شەودا هەواڵیان بۆ بەرێت بۆ ئەشکەوتەکە و پێش بەیانیش بگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، واتە: عبداللە ئەبێت هەموو شەوێك (٧) سەعات بە پێ بڕوات بە بێ ئەوەی کەسیش هەستی پێ بکات.

٢.عامیری کوڕی فەهیرە، کە شوانی مەڕەکانی حەزرەتی ئەبوبەکر بوو رضي الله عنه مەڕەکەی بێنێتە نزیك ئەشکەوتەکە بۆ دوو مەبەست:

أ–بۆ ئەوەی شیریان بۆ بدۆشێت و خواردنیان پێ بدات.

ب-تاوەکو بە هۆی جێ پێی مەڕەکانەوە جێ پێکانی عبداللەی کوڕی ئەبوبەکر ﷺ بشارێتەوە و هەست نەکرێت کەسێك بەم ڕێگایەدا ڕۆیشتووە..

٣.دەبێت کەسێك پەیدا بکەن کە دوای سێ شەوی تر کە گەڕانی قوڕەیش کۆتایی هات، دوو وشترەکەیان بۆ بهێنێت، وە ئەو کەسە ئەبێت دوو صیفەتی تێدا بێت:

١.زۆر نهێنی پارێز بێت و ئەمین بێت.

٢.(خَبِیر الصَحْراء) واتە: شارەزای بیابان بێت و بە ڕێگایەکدا بیانگەیەنێتە مەدینە کە کەسی پێدا نەڕوات و بێ مەترسی بێت.

حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لە موسڵمانان کەس لە مەککە نەماوە کە ئەو کارەی پێ بکرێت و شارەزای هەموو کویرە ڕێگاکان بێت، بەڵام من کەسێکی کافر شك ئەبەم کە هەرچەندە کافرە، بەڵام زۆر ئەمین و زمان سەلامەتە و هەموو ڕێگاکانی بیابان شارەزایە. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: زۆر چاکە کریێ دەدەینێ با بمانگەیەنێت. وە خاتوو ئەسماء ڕاسپێردرا کە زۆر بە نهێنی پەیوەندی پێوە بکات و ئەگەر ڕازی بوو وشترەکانی تەسلیم بکات. کەواتە: درووستە یارمەتی لە کافر وەربگیرێت و پەیوەندی پێوە بکرێت و سیقە و متمانەی پێ بکرێت لە کاتێکدا دڵنیا بیت لە ئەمینی و زمان پاکی و شارەزایی، ئەو پیاوە موشریکەش ناوی (عَبدالله ی کوڕی اُرَیْقِط) بوو.

بەڵێ ئیمانداران: بەم شێوەیە هەموو کارەکان زۆر بە نهێنی و ڕێکو پێکی ئەنجام دران و پاش سێ ڕۆژ لە ئەشکەوتەکە هاتنە دەرەوە،

(عَبدالله ی کوڕی اُرَیْقِط) لەسەر ڕێنمایی ئەسماءﷺ هاتە نزیك ئەشکەوتەکە و بە لاڕێدا بەرەو مەدینە کەوتنە ڕێ، لە ڕێگا جار و بار ئەگەر کەسێکیان توش ئەبوو، هەموو کەس ئەبوبەکری ﷺ بەهۆی بازرگانیەوە ئەناسی، بەڵام خەڵکی غەیری مەککە بە شێوە پێغەمبەریان نەدەناسی، جا ئەگەر کەسێکیان توش ببوایە دەیوت: ئەی ئەبوبەکر : (مَنْ هذا الرَجُلُ الَّذي بَيْنَ يَدَيْكَ؟)ئەوە ئەو پیاوە کێیە لەگەڵتا بە ڕێگەدا دەڕوات؟ حەزرەتی ئەبوبەکریش ﷺ دەیفەرموو: (هذا هادٍ يَهديني السَّبيل). واتە: ئەمە کەسێکە کە شارەزای ڕێگام دەکات و ڕێ نیشاندەرمە. کابرای پرسیار کار وا تێ دەگەیشت کە مەبەستی ئەبوبەکر ﷺ ڕێگای ڕۆیشتنە، بەڵام حەزرەتی ئەبوبەکر مەبەستی ئیمان و ئیسلام بوو، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەبوبەکری ﷺ نیشان داوە، ئەمەش پێی دەوترێت (التَورِية) کە درۆش نەکەیت و نهێنی خۆشت بپارێزیت. ئیمامی بوخاری ﷺ ئەمەی گێڕاوەتەوە.

بەڵێ، دوای (١٤) ڕۆژ گەیشتنە شاری مەدینە، وە هەموو خەڵکی مەدینە بە سرودی

طَلَعَ البَدْرُ عَلَينا مِن ثَنيات الوَداع     وَجَبَ الشُكْرُ عَلَينا مادَاعَ لله داعِ

پێشوازیان لێ کردن.

کەواتە: پێشوازیەکەی لە پێغەمبەر ﷺ کرا بە سرود بوو!. سەیری ڕێزی ئیسلام بکە بۆ هونەر، بەڵام هونەری ڕەسەنو بەهێز و بە پێز، بەڵێ بە سرود پێشوازیان کرد، وە لە کاتی گەیشتی رسول الله ﷺ بە شاری مەدینە یەکەم

وتاری خوێندەوە گەورە و بچوك، پیاو و ژن، لاو و پیری مەدینە هەموو لەشیان ببوو بە چاو و گوێ بۆ بینین و بیستنی ئەو وشە گەوهەر بار و نورانیەی که لەو دەمە پیرۆزەوە دەهاتنە دەرەوە، جا ئایا دەبێت ئەو وتارە دینی بێت، سیاسی بێت، کومەلایەتی بێت، ئیمانی و ڕۆحی، یان ئابووری بێت؟!

نەخێر بەلکو فەرموی: ( أيُّها النّاس، أفشُوا السَّلام، و أطعِمُوا الطّعام، و صِلوُا الأرْحام، وَ صَلُّوا باللّيلِ و النّاسِ نِيام، تَدْخُلوُا الجَنَّة بسَلام).

جا ئیمانداران سەرنجی ئەم وتارە بە وشە کورتە، بەلام پڕ واتا ترین وتار کە هەموو بوارەکانی ئیمانی و ڕۆحی، سیاسی، کۆمەلایەتی، ئابووری بگرێتە خۆی، کە بەڕاستی هەر لە زاتی پیرۆزی پێغەمبەری خوا ﷺ دەوەشێتەوە کە ئاوا لە چەند وشەیەکدا هەموو پێویستیەکانی ئەو کاتەو هەموو بوارەکانی ژیان دیاری بکات، ئەوەتا فەرموی: (أيُّها النّاس) نەیفەرموو (أيُّها المُؤمِنُون) واتە: ئاماژەی بەوە دا کە هەموو خەلکی لە سایەی ئەم ئیسلامەدا ئیسراحەت دەکەن نەك هەر بەتەنها ئیمانداران، فەرموی: (أفشُوا السَّلام) واتە: سەلام بلاو بکەنەوە، بە هەر کەسێك گەیشتن ئەگەر ڕۆژی سەد جاریش بێت هەر سەلامی لێ بکەن، واتە: ئەوەی بە خەلکەکە ڕاگەیاند کە لە بواری سیاسیدا هاتنمان بۆ مەدینە بۆ ئاشتیە و ئیتر جەنگ و کوشتار کۆتایی هات، جا بۆ دەستەبەر کردنی ئەو ئاشتی و سەلامەتیە، باشترین هۆکار سەلام لە یەکتر کردنە. وە فەرموی: (أطعِموا الطّعام) ئەمەش باری ئابووری باس دەکات بەوەی کە لە شاری پیرۆزی مەدینەدا خەلکی کۆچکردووی مەککەی تێدایە کە هەمووی هەژار و نەدارن و بێ مال و حالن، جا دەبێت دەولەمەندان و دەست ڕۆیشتوان و خاوەن مال و مولك و

خانوەکانی مەدینە یارمەتیان بدەن و خۆراکیان پێ ببەخشن و بەم شێوەیە بواری ئابووری چاك دەبێت و جیاوازی چینایەتی دروست نابێت...

وە فەرموی: (وَ صِلوُا الأرحام) وە لە بواری کۆمەڵایەتیدا ئاگاتان لە سیلەی رەحم بێت و هەموتان خزمی یەکترن و پشت لە یەکتر مەکەن و پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانتان بەهێز بکەن.

(و صَلُّوا باللّيلِ و النّاسُ نيام) وە بۆ لایەنی ئیمانی و پەیوەندیتان لەگەڵ خوای پەروەردگارتان و تازەکردنەوەی ئیمانتان شەوانە هەڵسنەوە و شەو نوێژ بکەن. جا ئەگەر ئەمەتان کرد، واتە: بواری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و رۆحیتان بە پێی مەنهەجی ئیسلام جێبەجێ کرد ئەوا بە سەلامەتی و خۆشیەوە دەچنە بەهەشتی خواوە، واتە: ئەوەی راگەیاند کە ئەم ئیسلامە پێچەوانەی یەهودیەت و نەصرانیەتە و دونیا و قیامەت بەیەکەوە گرێ دەدات و عیبادەتەکەی سیاسەتە و سیاسەتەکەی عیبادەتە...

خۆشەویستان: لێرەدا جێگەی خۆیەتی پرسیارێك بکەین و بڵێین: بۆچی کاتێك خۆشەویست و نوری چاومان حەزرەتی محمد المصطفی ﷺ گەشتی بێ وێنەی ئیسرا و میعراجی پێ کرا بوراقی بۆ هات لە چاو تروکانێکدا سەدان کیلۆمەتری دەبری و هیچ مەترسی و سەرما و گەرما و ئازارێکی توش نەدەهات، بەڵام لەم سەفەری هیجرەتەدا کە مەوقیفەکە زۆر زۆر خەتەرە و گەمارۆ دراوە و پێویستی زۆری زیاتری بە بوراقە وەك لە کاتی ئیسرا و میعراجدا، بۆچی لەم مەوقیفەدا بوراقی بۆ نەهات؟! نە وەڵامدا دەڵێین: والله اعلم، گەشتی ئیسرا و میعراج تایبەتە بە پێغەمبەری خواوە ﷺ و لە یەکەم هەنگاویەوە تا کۆتایی موعجیزەیە و لە توانای مرۆڤ بە دەرە و

نەبێت هۆکاری چوون وهاتنەوەکەشی موعجیزە بێت و مرۆڤ نەیبینێت، بەڵام هیجرەت و کۆچکردن لە پێناوی خوادا بۆ پاراستنی عیزەتی ئیسلامەتی و بەجێ هێنانی دروشمەکانی ئیسلام ڕێبازی ژیانی ئیماندارانە و موسڵمانان دەرس و وانەی ژیانی لێ فێر دەبن، لەبەر ئەوە دەبێت هەموو چوون و هاتن و هەنگاو و هەڵوێستێکی مرۆیی بێت و هەموو هەوڵ و تواناکان بخاتەگەڕ، تا مەعلوم بێت کە ئیسلام دینێکی ئینسانیە نەك میثالی و هەمووی هەر بە موعجیزە هاتبێت و سەرکەوتبێت، بەڵکو موعجیزەکان هەر ئەو کاتانە ڕویانداوە کە هێزی مرۆیی دەوری نەدەما، ئەمەش هەتا کۆتایی دونیا دەمێنێت و بۆ پیاو چاکان و صالحان کەرامەتی ئەولیایە. وە دەبێت ئەوەش بڵێین هیجرەت بریتی بوو لە بەرجەستە کردنی ئیسلام لە واقعی ژیاندا. چونکە موسڵمانان لە مەککەدا ئەگەر بە دزیشەوە بوایە دەیانتوانی نوێژ و ڕۆژوو ئەنجام بدەن، بەڵام نەیاندەتوانی شەرعی خوا پیادە بکەن لە پەروەردەی منداڵ و بەڕێوە بردنی بازاڕ و حوکم رانیدا، بۆیە واجب بوو کە هیجرەت بکەن

کەواتە: با لە یادی هیجرەتدا وەعد و پەیمان بدەین بە خوای پەروەردگارمان کە هەتا مردن إنشاء الله پابەند بین بە شەرعی خواوە و ژیانی کورتی دونیامان لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریەوە بەو شێوەیە بێت کە خوا پێی ڕازیە و واز لە تاوان و بی شەرعی بهێنین.

پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت: ( المُهاجِرُ مَنْ هَجَر السَّيِّئات ) رواه البُخاري و مُسلم. واتە: کۆچکردوی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە واز لە خراپە و تاوان بهێنێت. دە با هەموومان بڕیار بدەین ڕۆژ بە ڕۆژ لە خراپە و

تاوانەکانمان واز بهێنین و بەرەو چاکە و چاکە کاری هەنگاوی زیاتر بنێین و خوای گەورەش پشتیوانی چاکە کارانە.

سەرچاوەکان:

١.قورئانی پیرۆز.
٢.فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ.
٣.السيرة النبوية – د.علي محمد الصّلابي – ج١ – ص٤٣٦، ص٤٣٩، ص٤٤٢، ص٤٤٣، ص٤٤٦، ص٤٨٣، ص٤٦٥.
٤.سيرة الرَّسول ﷺ – محمود المصري – ابو عمّار – ص١٩٣، ص٢١٠.
٥.فِقه السيرة – د.محمد سعيد رمضان البُوطي – ص١٣٧.
٦.گۆڤاری دوانگە– ژ:٢٤ – ل٤٥ – شیعری مەلا غەریب پێنجوێنی.
٧.على خُطى الحَبيب – عمرو خالد – ص٩١، ص٩٢، ٩٦.

# وتاری سێیەم بۆ مانگی صەفەر

## ﴿الشُكر﴾

( الحَمدُ للهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

لە دوای سوپاس و ستایش بۆ خوای تاك و تەنها و بێ شەریك، ئەو پەروەردگارەی کە خاوەنی گشت بونەوەرە بە دیار و نا دیاریەوە و هەموو خۆشیەکان هەر ئەو پێمان دەبەخشێت و دەبێت شوکرانە تەنها بۆ ئەو بکرێت. صەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ وە لەسەر هاوەڵە بەرێزەکانی بێت تا ڕۆژی دوایی.

ئیمانداران: خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ و اتَّقوا اللّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾. وە هەر لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿ إنَّ في ذالِكَ لَآياتٍ لِكُلِّ صَبّارٍ شَكُورٍ ﴾.

کەواتە: ئیسلام دوو بەشە:

یەکەم: ئارام گرتن و خۆڕاگری.

دووەم: شوکرانە بژێری.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: (عَجَباً لأمْرِ المُؤمِنِ، إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَ لَيْسَ ذالِكَ لأحَدٍ إلاّ لِلْمُؤمِنِ، إنْ أصابَتْهُ سَرَّاءَ شَكَرَ فَكانَ خَيْراً لَهُ، وَ إنْ أصابَتْهُ ضَرّاءَ صَبَرَ فَكانَ خَيْراً لَهُ).

واتە: سەر سوڕ دەمێنێت لە کاری ئیماندار، هەموو ژیانی ئیماندار خێر و بەرەکەتە بۆی، ئەمەش بۆ هیچ کەس نیە بۆ ئیماندار نەبێت، ئەگەر توشی

خۆشی ژیان بوو شوکری خوا دەکات و ئەم شوکرانە بژێریەی بۆ دەبێت بە خێر و بەرەکەت، وە ئەگەر توشی چەرمەسەری و ناڕەحەتی ڕۆژگار بوو ئارام دەگرێت و ورەی ناڕوخێت و ئەمەش هەر خێر و بەرەکەتە بۆی.

بەڕێزان: هەر زۆر لە کۆنەوە پرسیارێك کراوە و زانایانی ئیسلام لە وەڵام دانەوەیدا جیاوازیان هەبووە، پرسیارەکەش ئەوەیە: ئایا صەبر و ئارام گرتن کە ئینسانی پاڵەوانی دەوێت و ئارام گرتن زۆر تاڵە، ئایا صەبر کە لە ناڕەحەتیدا دەکرێت، وە شوکرانە بژێری لە خۆشیدا دەکرێت، ئایا کامیان گەورەترە؟! زۆرێك لە زانایان فەرمویانە: شوکر گەورەترە، بۆچی؟! چونکە زۆر جار مرۆڤ ئارام دەگرێت چونکە توانای نیە خراپە و تاوان بکات، لەوانەیە ئەگەر ماڵ و سامان و دەسەڵاتی ببوایە، منداڵ و کەس و کاری زۆر بوایە، پلە و پایە و دەسەڵاتی ببوایە، دونیا بە دەمیەوە پێ بکەنیایە، ئەوا ئەو کەسە ئارامگرە نەمایە و طوغیانی بکردایە. ڕۆژگار چەندان کەسی پیشان داوین کە لە هەژاری و بێ دەسەڵاتیدا خۆڕاگر بووە و کەسێکی بەڕێز و چاك بووە، بەڵام هەر کە دەسەڵات و سەروەت و سامانێك چۆتە دەستیەوە (١٨٠) پلە گۆڕاوە و بێ دین بووە، لوت بەرز بووە و خەڵکی ئازار داوە...

شاعیر فەرمویەتی:

| | |
|---|---|
| للّه قَوْمٌ إذا ما أيسَرُوا كَفَرُوا | مَحْلَى لقاهُم إذا كانُوا مَفاليساً |
| الفَقْرُ يَمْنَعُهُم مِنْ كُلِّ فاحِشَةٍ | لَولا افْتِقارُ هُمُوا كانُوا أباليساً |

واتە: زۆر کەس هەیە هەرکاتێك ژیانی خۆش بوو، گیرفانی گەرم و پڕ بوو، بێ بڕوا و بێ دین دەبێت، بەڵام کاتێك هەژار و موفلیس و بێ دەستمایە بێت، زمانی شیرین دەبێت وهەر حەز دەکەیت قسەت بۆ بکات. هەژاری و نەداری و بێ دەسەڵاتی بەرگری لێ کردوون لە هەموو جۆرەفاحیشە و

کردارێکی ناشرین و ناشەرعی، چونکە ئەگەر هەژار نەبوونایە ئەبوون بە ئیبلیس و ئەو کارانەیان ئەنجام ئەدا کە شەیطان ئەیکات و حەزی پێیەتی..

بەڵێ: بەراستی ئەگەر کەسی لەش ساغ و دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار شوکری خوای کرد ئەوە کەسێکی بەڕێز و گەورەیە لای خوا و لای عەبدانی خوا، لەبەر ئەوەی دەتوانێت دزی بکات چونکە لەشی ساغە، دەتوانێت قومار بکات و عارەق بخوات و ڕیبا بخوات چونکە پارەی لە بەردەستایە، دەتوانێت خەڵکی بچەوسێنێتەوە و زوڵم بکات چونکە پلە و پایە و کەس و کاری زۆرە، دەتوانێت بچێت بۆ نادی و نەیەت بۆ مزگەوت، دەتوانێت ئەو پارەیەی لە ڕێگەی حەجیماڵی خوادا بەکاری دەهێنێت پێی بچێت بۆ گەشتی لەندەن و پاریس!. توانا دارە کە بەو ماڵ و سامان و دەسەڵات و لەش ساغیەی دڵڕەق بێت بەرامبەر بە خەڵك و گاڵتەیان پێ بکات لە جیاتی ئەوەی ماڵیان پێ ببەخشێت و یارمەتیان بدات و بەزەیی بە نەداران و هەژاران و داماواندا بێتەوە...

جا کەسێك ئاوا خراپەکان واز لێ بهێنێت لە کاتێکدا توانای ئەنجامدانیانی هەیە و لە جیاتی ئەوە ڕوو لە خوا بکات و چاکە کار بێت لە ترسی خوا و عەزابی وە چاوەڕێی پاداشت و ڕەحمەتی خوای دەکرد، بڕوای وابوو ئەو خوایەی ئەو خۆشیەی پێ بەخشیوە دەتوانێت لێی بکات بە ناخۆشی، بۆیە چاکەی دەکرد چونکە دەیوت: خوایە تۆ ئەم هەموو چاکە و خۆشی و خۆشگوزەرانیەت پێ بەخشیوم بۆ ئەوەیە کە شوکور و سوپاست بکەم، ئا ئەم ئیمان و بڕوایە وا دەکات کە ئەم ئینسانە بەردەوام شوکری خوا بکات و بەو دەسەڵات و سامانەی چی خوا پێی خۆشە ئەوە بکات و چی خوا نەهی لێ کردووە خۆی لێ بپارێزێت، ئەو جۆرە کەسە شوکرانە بژێرە: ( فَمثل هذا الشّاكر خَيْرٌ منْ آلاف الصّابرين لأنَّهُ لَمْ تَغره دُنياهُ وَ إنْ أقبَلَت ) بۆیە

ئەم کەسانە کەمن، قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَقَلِيلٌ مِنْ عِبادِيَ الشَّكُور ﴾ چونکە حاڵی مرۆڤ بە گشتی وایە ﴿ إِنَّ الإِنسانَ لَيَطْغَى أَنْ رَآهُ استَغْنَى ﴾.

بەڵام ئیمانداران: دەبێت لێرەدا بە ئاگا بین و ئەوەش بڵێین کە مانای وا نیە هەر دەبێت دەوڵەمەند شوکری خوا بکات و فەقیر و هەژار چونکە ماڵ و سامانی کەمە، واجب نیە لە سەری کە شوکری خوا بکات، نەخێر، چونکە خەڵاتەکانی خوا لەسەر مرۆڤ هەر بریتی نین لە ماڵ و سامان و ئەولاد و دەسەڵات و پلە و پایە، بەڵکو خەڵات و بەخششەکانی خوا لەسەر هەر مرۆڤێك نازمێردرێن، وە خوای گەورە بە عەدل و حیکمەتی خۆی خەڵاتەکانی دابەش کردووە بەسەر بەندەکانیدا و هەموو کەس بەری کەوتووە: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لَذُوفَضْلٍ على النّاسِ ولكِنَّ أكْثَرَ النَّاسِ لا يَشْكُرُونَ ﴾.

ئەگەر بە وردی سەرنج بدەیت و تەماشا بکەیت بۆت دەردەکەوێت کە (أَفْقَرُ خَلْقِ الله) هەژارترین و نەدارترین و نەخۆشترین کەس لەسەر زەویدا، ئەو کەسەی کە هیچ خۆشیەکی ماددی و جەستەیی لە ژیاندا نەدیوە، بە مەرجێك ئیمانی بە حەقی بە خوا و بە پێغەمبەری خوا ﷺ هەبێت ئەوە زۆر دەوڵەمەندە و سەرمایەدارێکی گەورەیە. چۆن؟! بەڵێ، دەوڵەمەندە و خوا فەزڵی زۆری هەیە لەسەری (وَيَكْفِي أَنَّ اللهَ أكْرَمَهُ بنعْمَةِ الدِّين). تەنها ئەوەندە بەسە کە خوای گەورە ڕێزداری کردووە بەوەی کە خەڵاتی ئیمانی پێ بەخشیوە. بەڵێ، بەڕاستی ئیسلام و ئیمان و دوورکەوتنەوە لەو هەموو داو و تەڵەی بۆ لادان لە ڕێگەی ڕاستی ئیسلام نراونەتەوە و خوا ئێمەی لێ پاراستووە، ئەوە گەورەترین سەرمایەیە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ ٱللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِى كَثِيرٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ

حَبَّبَ إِلَيْكُمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِى قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ ٱلْكُفْرَ وَٱلْفُسُوقَ وَٱلْعِصْيَانَ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ۝ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾

الحجرات:٧-٨.

**واتە: ئێوە دڵنیا بن و بزانن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناوتاندایە پرس و ڕای پێ بکەن زۆر شت هەیە ئەگەر ئەو بە ڕای ئێوەی بکردایە توشی گیر و گرفت و ناخۆشی دەبوون، بەڵام خوا ئیمان و باوەڕی لەلا خۆشەویست کردون و لە دڵ و دەرونتاندا ڕازاندویەتەوە، لەولایشەوە کوفر و بێ باوەڕی و گوناه و یاخی بوون فەرمانی خوای لا تاڵ و ناشرین کردون، ئائەوانە هەر خۆیان ڕێگەی ژیری و سەرفرازیان گرتۆتە بەر، ئەمەش خۆی ڕێز و بەخششێکی تایبەتی و ناز و نیعمەتێکە لە لایەن خواوە پێیان دراوە، خواش زانا و دانا و کاربەجێیە...**

**کەواتە: دامەزراو بوون لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر و ﷺ چەشتنی تامی ئیمان و ئیسلام و ڕق بوونەوە لە کوفر و بێ ئیمانی و گوناه و یاخی بوون لە فەرمانی خوا، خەڵاتی خوایە بۆ مرۆڤ و دەبێت قەدری ئەو بەخششە گەورەیە بزانرێت. تەماشا بکەن: بەخششی خوا هەر سەروەت و سامان نیە، بەڵکو سەروەت و سامان کاتێك بە خەڵات و بەهرە و مایەی خۆش بەختی و مایەی لەزەت لێ کردن حیساب دەکرێت کە ئیمانی لەگەڵدا بێت، ئەگینا بەبێ ئیمان و بڕوا دەبێت بە نیقمەت و بەڵا و ماڵوێرانی..**

**هەروەها خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:** ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ﴾ الكهف:١. **واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم کتێبە کە قورئانە بۆ سەر بەندەی خۆی ( محمد ﷺ) دابەزاندوە، هیچ کەموکوڕی ناتەواویەکیشی بۆ ڕەوا نەداوە.**

کەواتە: شا خەڵاتی خوا بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی بریتیە لە قورئانی پیرۆز و دەبێت زۆر سوپاسی خوای لەسەر بکرێت

بەڕێزان: هەر ئەوەی کە تۆ یەکتاپەرستیت و غەیری خوا ناپەرستیت گەورەترین خەڵاتە، بە ملیۆنەها خەڵك ئەمڕۆ لە جیهاندا خۆر و مانگ و دار و بەرد دەپەرستن، لە هیندستان مانگا دەپەرستن، لەوە خراپتر (موجەلەیەکی فەڕەنسی) وێنەی خەڵکانێکی لە هیندستان بڵاو کردۆتەوە کە لە پەرستگایەکی گەورەدا زیاتر لە (٣٠٠) جرجی تێدایە و ئەو جرجانە بە خوا دەزانن و شیر و ماست و گەنم و ساوەریان لە بەردەم داناون و لەگەڵ ئەو جرجانەدا نان دەخۆن.

بەڵێ، ﴿ فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ ﴾. دەی سوێند بە خوا، ئەوە فەزڵ و کەرەمی خوایە لەسەر من و تۆی ئیماندار کە خوا ڕێزی لێ ناوین و لەم خەرافات و زەلیل بوونە پاراستوینی و خوای گەورە دەپەرستین. وە دەبێت سوپاس و ستایشی خوای گەورە بکەین لەسەر ئەوەی کە ئێمەی کردووە بە مرۆڤ و ڕێزی داوین بەسەر هەموو حەیوانات و درووستکراوەکانی تردا، وە عەقڵ و ژیری پێ بەخشیوین و چاکە و خراپەی پێ لە یەکتری جیا دەکەینەوە.

ئیمانداری بەڕێز: ئەی بۆ سەیری لاشەی خۆت ناکەیت، هەر کەسێك خۆی بە هەژار دەزانێت ئەگەر سەیرێکی لاشەی خۆی بکات، دەبینێت دەوڵەمەندترین کەسە.. بۆ نمونە: وەرە بە کەسێك بڵێ: ئایا چاوت، گوێت، هەردوو گورچیلەکانت، لوتت، لێوەکانت، بە دەفتەرێك دۆلار دەبەخشیت؟! ئایا تەنها (نوخاعی شەوکی)ت ئەو پەتە باریکەی کە بە ناو فەقەراتی پشتدا هاتووە، ئەگەر خوانەخواستە بپچڕێت هەتا هەتایە دەبێت لەسەر کورسی دانیشیت و بە قاچی خۆت ناڕۆیت، ئایا تەنها ئەو دەمارە باریکەی ناو پشت

بە هەموو سەروەت و سامانی ئەم دونیایە دەدەیت؟!. بێگومانم دەڵێیت: نەخێر.. دەی کەواتە تۆ هەرچەندە گیرفان وماڵیشت خاڵی بێت هەر بەحوڵەمەندی و شوکری خوا زۆر بکە..

زانای ناودار(د.محمد راتب النابلسي) لە کتێبەکەیدا (موسوعة أسماء الله الحُسنى)دا چەند نمونەیەك و بەسەرهاتێکی واقیعی ئەم سەردەمەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێت: پیاوێك لە فەرەنسا دکتۆرای وەرگرت لە زانستەکاندا و بووە خاوەنی کۆمپانیا و شەریکات، ژنی هێنا و چەند سەیارەی هەبوو، کۆشکێکی ڕازاوەی هەبوو، شەوانە بۆ پشوو دەچوو بۆ حەفلە و ئاهەنگ و ڕۆژانی پشوو دەچوو بۆ سەیرانگا بەناوبانگەکانی جیهان بۆ گەشت و سەیران، ئەم پیاوە لە هەرەتی لاویەتیدا بوو، زۆر سیما جوان بوو، هەتا بڵێیت زمان ڕەوان بوو، هەموو ناسیاوانی بە خۆشبەخترین کەسیان دەزانی، لە ناکاو شەوێکیان کە لە خەو هەڵسا هەردوو چاوی کوێر ببوو!!!. هەرچی دکتۆری کرد چاك نەبۆیەوە، ناچار کتاب و معامەلاتی کۆمپانیاکەیان بۆ دەهێنا بۆ ماڵەوە و ئەویش دەیوت: لەسەری بنوسن موافیقم و ئیمزای بکەن، پاش ماوەیەك لەوەش وەڕەز بوو، وازی لە هەموو کار و بارێك هێنا.. د.محمد راتب دەفەرموێت: برادەرێکی من چوو بۆ سەردانی، وتوبوی: مامۆستا حاڵت چۆنە؟! لە وەڵامدا وتبوی:(يا فُلان، والله أتَمَنّى أنْ أجْلس عَلى الرَّصيف وَ أنْ أتَسَوَّل و لا أمْلكُ منَ الدُّنيا إلا معْطَفاً على كَتفي وَ أن يُرَدَّ لي بَصَري. . . . والله هذه كَلمَتُهُ. . ! . )

لە وەڵامدا وتی: فلان کەس، سوێند بە خوا داواکارم و خۆزگە دەخوازم کە لەسەر شۆستەی ڕێگا و بانەکان دانیشم و سواڵ بکەم و لە هەموو سەروەتی دونیا تەنها ئەوەندە هەبێت کە بەسەر شانمیدا بدەم (حەسیرە

شرەیەك) بەڵام چاوەکانم وەکو جاران ڕوناکی دونیا ببینن!.. سوێند بە خوا ئەوە قسەی ئەو سەرمایەدارە بوو...

ئیمانداران: هەموو کەسێك خاوەنی دوو گورچیلەیە، ئەم گورچیلانە هەموو ڕۆژانی دوو شەممە و پێنج شەممەیەك بۆ خۆیان خۆیان پاك دەکەنەوە (بۆیە سوننەتە ڕۆژانی دوو شەمە و پێنج شەمە بە ڕۆژوو بیت تا ئاو و خواردن کەم بخۆیت و بە ئیسراحەت غەسلی گورچیلەت بۆ بکرێت) جا تەماشاکە بە تەواوی تەمەنی خۆت هەموو هەفتەیەك گورچیلەکانت دووبارە دەشۆرێت، تۆش ئاگات لێ نیە، نەسر -بەنج- وەردەگریت، نە سوپاسی کەس دەکەیت، نە هەست بە هیچ ئازارێك دەکەیت و دەرمانێك دەخۆیت... جاروبارێك کەسێك گورچیلەی پێویستی بە پاککردنەوە و شتن دەبێت لە لایەن دکتۆرەوە، تا بۆت دەربکەوێت خوای گەورە چەند فەزڵی هەیە بەسەرتەوە، خۆ ئەگەر بێتو هەموو هەفتەیەك دووجار گورچیلەت بۆ بشۆن ئەگەر ملیۆنەر بیت ئیفلاس دەکەیت!.. ئەمە جگە لەوەی کە ژیانت لێ تاڵ دەبێت و کارو کاسبی و پیشەت پێ ناکرێت!!!

جا ئایا کە تۆ تا ئێستا گورچیلەکانت ڕێك و پێك ئیش دەکەن دەوڵەمەندی یان نا؟!.

یەکێکی تر لە خەڵاتەکانی خوا کە لە لاشەی خۆماندا پێی بەخشیوین بریتیە لە (غوددەی نوخامی)(الغُدَّة النُّخاميَّة) کە کێشەکەی تەنها نیو گرامە، دوانزە هۆڕمۆن دەر دەدات، یەکێك لەو هۆڕمۆنۆنانە ئیشی ئەوەیە: ئاستی شلەکانی ناو لەشت ڕادەگرێت، بۆ نمونە: وا دابنێ تۆ ڕۆژی (٤ - ٥) پەرداخ ئاو دەخۆیتەوە و پاشان دەر دەکرێتە دەرەوەی لاشەت، ئەگەر ئەم غوددەیە خەلەلی تێ بکەوێت، ئەوا ڕۆژی نەك چوار پەرداخ ئاو بەڵکو چوار سەتڵ ئاویش بخۆیتەوە هەر تێر ئاو ناخۆیتەوە، ئیتر ئیشت تەنها دەبێت بە ئاو خواردنەوە و چونە سەر ئاو!! جا بیری لێ بکەرەوە ئایا هەر ئەم غوددەی

نوخامیە هەموو سەروەتی دونیا ناهێنێت بۆ تۆ؟! ئایا تۆ کە ئەم هۆرمۆنەی ناو لاشەت سەلامەتە خۆت بە هەژار دەزانیت؟

هەر زانای ناودار د.محمد راتب النابلسی دەفەرموێت: برادەرێکم هەبوو چاوی هیچ عەیبی نەبوو، بەڵام لە ناکاو چاوی توشی ئەوە هات کە لە (٢٠سم) ی بەردەمیەوە هەموو شتەکان لە بەرچاوی دەلەرزین، کە ئەم نەخۆشیەش پێی دەوترێت (فقدان التوازن الحركي) ئەگەر بیویستایە دەست بۆ پەرداخێك ئاو ببات دەستی بۆ لایەکی تر ڕادەکێشا، دەبوایە کەسێکی تر بیدایەتە دەستی، ئەم کەسە چاوی لە دەست نەداوە، بەڵام سودی لێ نابینێت، ئەم پیاوە چوو بۆ فەڕەنسا و شەش مانگ مایەوە، بەڵام سەرەنجام بە نائومێدی گەڕایەوە و تەواوی ژیانی بەو حاڵەوە بەسەر برد!.. جا بیر بکەرەوە ئایا تۆ هەژاری یان دەوڵەمەند لە کاتێکدا چاوەکانت شتەکان وەکو خۆی دەبینن؟!.

پیاوێك لە کارگەکەی دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە، بەڵام هەرچەند دەکات ماڵی خۆیان نادۆزێتەوە، بۆ ماوەی یەك سەعات دەگەڕێت بەڵام ماڵی خۆیانی بۆ نادۆزرێتەوە، ئەمەش بەهۆی ئەوەی کە لە کتوپڕدا توشی نەخۆشی (فَقد ذاكرة الجُزئي) (لەدەست چوونی یادەوری بەشی)بو بوو.. بەڵێ، ئەم پیاوە بازرگانە دوای سەعاتێك گەڕان و سوڕان ئەمجا ماڵی کوڕەکەی دێتەوە یاد و دەچێت بۆ ماڵی ئەوان و دەڵێت: کوڕم ماڵی خۆمانم لێ بزر بووە و نایزانمەوە وەرە لەگەڵم!! ئەم پیاوە تا مرد ماڵی خۆیانی بۆ نەدەدۆزرایەوە!.

د.محمد راتب دەفەرموێت: کەسێکی نزیکم لە ئەوپەڕی زیرەکیدا بوو، مێشکێکی زۆر سەرسوڕهێنەری هەبوو، بەڵام (فُجأةً فَقَدتْ الوَعي) لە کتوپڕ بە بێ هیچ نەخۆشیەکی پێشتر هۆش و بیری لە دەست دا و کەسی نەدەناسیەوە تەنانەت کە کوڕەکەی خۆی دەچوو بۆ لای و دەیوت: تۆ کێیت؟!.

جا ئایا تۆ کە بیر و هۆشت تەواوە و هەر کەسێکت بینی ئەیناسیتەوە، ئایا تۆ هەژاریت؟ بێگومان نەخێر، بەڵکو زۆر دەوڵەمەندیت، چونکە ئەگەر هەموو سامانی سەرمایەدارانی دونیاشت لەبەر دەستدا بێت، بەڵام هۆش و بیرت لە دەست بدەیت و کەس نەناسیتەوە، هیچ سودت پێ ناگەیەنێت.

بەڵام بە داخەوە مرۆڤ زۆر جار ناشوکرە، قورئان دەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ۞ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٞ ۞ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ ﴾ العاديات:٦-٨. واتە: بەڕاستی ئادەمیزاد لە ئاستی پەروەردگاریدا زۆر نا سوپاس و حەق نەناسە. خۆیشی شایەتە لەسەر ئەو حاڵەتەی خۆی (ڕۆژی قیامەت دان بە کەمتەرخەمی خۆیدا دەنێت)، بێگومان ئادەمیزاد لە خۆشەویستی ساماندا زۆر بە تین و هەڵپەیە...

بەڵێ بەڕێزان: یەکێك لە گەورەترین هۆکاری توش بوون بە نا شکوری ئەوەیە کە مرۆڤ وا بیر بکاتەوە کە دەبێت هەموو خۆشیەکانی ژیانی بە یەکجار لە بەردەستدا بێت، کە ئەمەش بۆ کەس دەستەبەر نابێت لە ژیاندا، وەرە تەماشا بکە:

ئەو کەسەی پارە و سامانی زۆری هەیە زۆر جار منداڵی نیە، ئەڵێت خۆزگە ئەم سەروەت و سامانەم نەبوایە، بەڵام منداڵێکم ببوایە، وە ئاخی بێ منداڵی سامانەکەی لێ کردووە بە نیقمەت، لەولاوە کەسێکی تر منداڵی زۆری هەیە، بەڵام نان نیە بیانداتێ، ئەویش دەڵێت: خۆزگە نیوەی منداڵەکانم نەبونایە و نیوەکەی ترم تێر بونایە، بوونی ئەو منداڵە چاوگەشانە بەهۆی دەست کورتی و هەژاریەوە لیی بۆتە غەم و مەراق لە جیاتی دڵخۆشی!.

لە هەمان کاتدا کەسی تری وا هەیە ماڵ و سامان و ئەولاد و منداڵی زۆری هەیە، بەڵام بێ بەشە لە لەزەتی لەش ساغی، بەهۆی ئازاری لەشیەوە تام و لەزەت لە ماڵ و منداڵ نابات. کەسانێکیش هەن ماڵ و منداڵ و لاشەی

ساغیشیان هەیە، بەڵام کە لە هیچی ماددی کەم نیە لە گەورەترین شت، کە سەرچاوەی هەموو بەختەوەریەکە بێ بەشە، کە خەڵاتی ئیمانە.

لێرەدا ئەگەر کەسێك بپرسێت: باشە بۆچی وایە؟ باشە بۆ کەس هەموو خۆشیەکانی لە بەردەستدا نیە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: لەبەر ئەوەی دونیا شوێنی مانەوەی هەتا هەتای نیە و کاروان سەرایەکە و مرۆڤ بۆ سات و پشویەك لای داوە و ئەبێت بەجێی بهێڵێت، بێگومان ڕێبواریش لەو شوێنەدا کە بۆ ساتێك پشوو دەدات، هەرگیز هەموو ئەوەی دڵی ئاواتی بۆ دەخوازێت لەو سەرە ڕێیەدا دەستی ناکەوێت، بەڵکو ئەو شوێنەی کە هەموو خۆشیەکانی لێ دەست دەکەوێت قیامەتە و بەهەشتی بەرینە. قوئان دەفەرموێت: ﴿ إِنَّا جَعَلْنا ما عَلى الأَرضِ زِينَةً لَها لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً ﴾.

کەواتە: هەموو کەس واجبە شوکری خوا بکات، جا شوکری خوا بەزمان دەکرێت، ئەبێت زمانت بەردەوام وشەی پیرۆزی (الحَمْدُ للّه)ی پێ بوترێت بۆ ئەوەی ڕام ببێت لەسەر شوکری خوای گەورە.. تەماشای قورئان بکەن، یەکەم ئایەتی ئەو قورئانە پیرۆزە ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، پێش ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾ دەڵێت ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾. چونکە هەر کەسێك حەمد و شوکری خوا نەکات ئەوا عیبادەتیشی ناکات، قورئان دەفەرموێت: ﴿ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ الزمر:٦٦. یان دەفەرموێت: ﴿وَاشْكُرُوا للّه إِنْ كُنتُم إِيّاهُ تَعْبُدُونَ ﴾.

کەواتە: هەرکەسێك بیەوێت بەندایەتی ڕاستەقینە بۆ خوا بکات، دەبێت شوکری بکات، چونکە کەسی ناشوکر خەرمانی طاعەت و عیبادەتی دەسوتێت.

وە ئەگەر تەماشا بکەین دەبینین لەناو نوێژدا چەند جار ﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ی تێدایە، لە ڕکوع و سوجدەدا، لە هەستانەوە لە رکوعدا ﴿ سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِدَهُ ربَّنا لَكَ الحَمْد ﴾ دەوترێت. دوای نوێژەکان لە زیکرەکاندا (٣٣) جار دەڵێی: (الحَمْدُ لله)، وە لە کاتی خەوتندا بە هەمان شێوە لە زیکرەکاندا (٣٣) جار (الحَمْدُ لله) دەڵێی!.

ئەمە هەمووی بۆ ئەوەی بەردەوام زمانمان (الحَمدُ لله)ی لەسەر بێت، ئەبێت وامان لێ بێت دوای خواردنەوەی هەر قومە ئاوێك، هەر پاروە نانێك، تەواوکردنی هەر ئیشێك، سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەیەکدا، کاتێك لەناو مەجلیس و دانیشتنێکدا ڕێز و حورمەتت لێ دەگیرێت، کە قسەکانت دەبیسترێت، کە ماڵ و حاڵێکت هەیە، کە گیرفانت خاڵی نیە، کە مەطبەخەکەت گەرم و گوڕە، کە ئەولاد و منداڵ و خێزانت هەیە، کە خەڵکی میوانت دەبێت و سەردانت دەکات، کە منداڵەکانت بەڕێز و بێ وەین، کە شەو بە لەشی ساغ و بێ ترس و بیم سەر ئەخەیتە سەر سەرین... هتد، لە هەموو ئەمانەدا بڵێ: (الحَمْدُ لله).. جا کە بەردەوام زمانت وتی: (الحَمدُ لله) ئەوکاتە وردە وردە لە دڵتا جێگیر دەبێت کە هەرچی خێر و خۆشی هەیە و توشت بووە، هیچی ئازایەتی خۆتی تێدا نیە و هەمووی فەزڵی خوایە، کەواتە: بە زمانی حاڵ دەڵێیت: خوایە من عەبدم و تۆ پەروەردگاری، کەواتە: عەبدایەتی خوا و شوکری خوا بەیەکەوە بەستراون. وە پێویستە بە کردەوەش شوکری خوا بکەین، وەکو بە قسە و زمان شوکری دەکەین.

شوکری بە کردەوەش بەوە دەبێت: ئەگەر لەشت ساغە یارمەتی نەخۆش و داماو بدە، ئەگەر دەوڵەمەندی یارمەتی هەژاران بدە بە پارە و سامانەکەت، قەرزی قەرزار بدەرەوە، بەرگ بۆ هەتیوو بێ ئەنوایەك بکە،

یارمەتی کوڕ وکچێکی لاو بدە کە بە حەڵاڵی بە یەك بگەن و دوور بن لە داوێن پیسی... ئەگەر ئەولادت هەیە پەروەردەیەکی جوانیان بکە و با گوڵ بن بۆ کۆمەڵ نەك دڕك، ئەگەر خوای گەورە پلە و پایە و حورمەتێکی پی بەخشیویت، ئەوا پێویستی خەڵکی جێبەجێ بکە، ئیصلاّح بکە، ئیفساد مەکە. کەواتە: هەموو خەڵات و بەخشێکی خوای گەورەکە پێی بەخشیویت بە کردەوە شوکری تایبەتی خۆی هەیە جا ئەگەر ئاوا لە دونیادا بەردەوام حەمد و شوکر و سوپاسی خوات لەسەر دەم بوو، وە بە کردەوە ئەنجامت دا، ئەوا لە بەهەشتدا جێگات دەبێت، یەکەم قسەی ئەهلی بەهەشت ئەوەیە کە کاتێك لە ناڕەحەتی مەیدانی مەحشەر و حیساب و کیتاب رزگار دەبن، یەکەم هەنگاو کە دەچنە ئەودیو دەرگای بەهەشتەوە دەڵێن: ﴿ وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَـٰمِلِينَ ﴾ الزمر:٧٤ واتە: (دوای چونە ناو بەهەشتەوە ئەوسا ئەو بەختەوەرانە دەڵێن: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بەڵێنی خۆی بۆمان بردە سەر و کردینی بە خاوەنی سەر زەمینی بەهەشت و لە هەر شوێنێك و لە هەر جێیەکدا بمانەوێت سەربەستانە ژیان دەبەینە سەر. ئای چەندە پاداشتی تێکۆشەران و خەباتکاران چاك و پاك و بەنرخە).

بەڵێ، یەکەم وشە کە لە دەمی ئەهلی بەهەشت دێتە دەرەوە (الحَمدُ لله)یە..

وە کۆتا قسەی ئەهلی بەهەشتیش ئەمەیە ﴿ دَعْوَىٰهُمْ فِيهَا سُبْحَـٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمْ فِيهَا سَلَـٰمٌ ۚ وَءَاخِرُ دَعْوَىٰهُمْ أَنِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ یونس:١٠.

واتە: (دوعاو پاڕانەوەی بەهەشتیەکان لەناو بەهەشتدا ئەمەیە: پەروەردگارا، پاکی و بێگەردی و ستایش شایستەی تۆیە ئەی خوای میهرەبان، چاکو چۆنیشیان لەوێ سەلام کردنە، دواهەمین گوفتاریشیان

دوای هەموو خۆشی و بەخششێك ئەوەیە كە: پڕ بە دڵ لەناخی دەرونیانەوە دەڵێن: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾.

بەڕێزان: زۆر كەس وا دەزانن كە تەنها ئەو كەسانە دەبێت شوكری خوا بكەن كە لە هیچیان كەم نیە و پێیان دەڵێن: (خوا پێداو) وەكو پەنا بەخوا خوا هیچی نەدابێت بەمان، بەڵام ئەگەر تەماشای قورئان بكەین تەماشا دەكەین لە ناو هەموو پێغەمبەراندا، خوای گەورە تایبەت باسی (سێ) پێغەمبەرمان لە (أُولُوا العَزْم)ەكان بۆ دەكات كێ ئەوانیش: (ئیبراهیم ، نوح ، محمد ﷺ)ن صەلات و سەلامی خوا لەسەر هەمویان بێت، بە صیفەتی شوكرانە بژێری باسی نوح دەكات، ﴿إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا﴾ الاسراء:٣.

باشە وەرە ژیاننامەی حەزرەتی نوح بخوێنەرەوە بزانە چ خۆشیەكی لە دونیادا بینیوە؟! لە بواری خێزانیدا، كێشەی خێزانی هەبوو: ژنەكەی ئیمانی پێ نەهێنا و بە كافری تێدا چوو، چ لە وە ناخۆشترە هاوسەر و هاوژینەكەت دژی عەقیدەكەت بن؟! كوڕەكەی لارە مل و لاسار بوو، لافاو خنكاندی و بە بەچاوی خۆیەوە بە كافری خنكا!.

لە بواری بانگەوازدا (٩٥٠) ساڵ بەردەوام شەو و ڕۆژ دەعوای كرد، كەچی پڕی كەشتیەكەی ئیمانیان پێ نەهێنا!! ... لە بواری كۆمەڵایەتیدا: دوژمنایەتی دەكرا و گاڵتەیان پێ دەكرد، بە چاوی خۆی تیا چوونی گەلەكەی بینی كە دەبێت چەند دڵ نارەحەتی كردبێت!! واتە: هەموو ژیانی ناخۆشی بوو، كەچی بەردەوام یادی خوای دەكرد و هەموو كات شوكور و سوپاسی خوای لەسەر دەم و ناو دڵدا بووە، بۆیە خوای گەورە وەصفی دەكات بە عەبدێكی شوكرانە بژێر.وە حەزرەتی ئیراهیم خوای گەورە لە وەصفیدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ

﴿ ٱلْمُشْرِكِينَ ۞ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾

النحل: ١٢٠-١٢١. واتە: (بەڕاستی ئیبراهیم هەر خۆی ئوممەتێك بوو (هەر خۆی پێشەوایەك بوو) ملکەچ و فەرمان بەرداری خوا بوو لە هەموو بیر و باوەڕێکی چەوت بەدوور بوو، لە موشریك و هاوەڵگەڕانیش نەبوو، هەروەها زۆر سوپاس گوزاری خوا بوو لەبەرامبەر بەخششە بێ شومارەکانی پەروەردگاریەوە، ئەویش هەڵی بژارد و ڕێنومایی کرد بۆ ڕێبازی ڕاست و درووست).

بڕۆ سەیری ژیاننامەی حەزرەتی ئیبراهیم بکە، باوکێکی بت پەرست، کە بە کافری مرد، چەند ناخۆشە باوکت دژی عەقیدەکەت بێت، چەند ناخۆشە باوکت بە کافری بمرێت، حەزرەتی ئیبراهیم نەك لەسەر دینی خوا بخرێتە زیندانەوە، بەڵکو فڕێ درایە ناو ئاگرەوە، لەسەر دینی خوا چەند جار کۆچی کرد، چووە وڵاتی شام، چووە عێراق، چوو بۆ فەڵەسطین، چوو بۆ مەککە، واتە: هەموو ژیانی دەربەدەری و ئاوارەیی بوو.

فیرعەونی میصر خەریك بوو سارا خاتونی خێزانی داگیر بکات، چ لەوە ناخۆشترە لە ژیاندا خێزانت بکەوێتە دەستی خۆبەزلزانێکی وەکو فیرعەونی میصرەوە؟!

حەزرەتی ئیبراهیم هەموو تەمەنی گەنجیەتی خۆی بە ئاواتی بوونی منداڵێکەوە بەسەر برد، نەیبوو، لە پیرێکدا خوا منداڵێکی پێ بەخشی، کە گەیشتە تافی لاوی، خوای گەورە فەرمانی پێ کرد کە جگەرگۆشە تاقانەکەت بەدەستی خۆت سەربڕە!.

کەوات: حەزرەتی ئیبراهیمیش هەموو ژیانی هەر ئازار و ناڕەحەتی و تاقیکردنەوە بوو، بۆیە بوو بە باوکی پێغەمبەران.

پێغەمبەری خۆمان، سەروەرو سەردارمان حەزرەتی محمد المصطفی ﷺ چی ناخۆشی ماوە نەهاتبێتە ڕێگای، بە هەتیوی لەدایك بوو، باوکی خۆی بەچاو نەبینی، لە شەش ساڵیدا بۆ جاری دووەم بێ ناز کەوتەوە و دایکیشی مرد، لە هەشت ساڵیدا بڕینی کولایەوە و باپیریشی مرد، هەموو ژیانی منداڵی و گەنجی بە هەژاری و نەداری بەسەر برد، لە کاتی دەربەدەرکردندا و گەمارۆدا، خێزانی دڵسۆزی خاتوو خەدیجە رضي الله عنها وەفاتی کرد، منداڵ و هەرزەکارانی طائف بەردەبارانیان کرد، بەچاوی خۆی مەرگی دەیان صەحابەی خۆشەویستی خۆی بینی، سێ کوڕی هەبوو هەموویان پێش خۆی وەفاتیان کرد، کچەکانیان مارەکرا بوون، لەسەر ئیسلامەتی لە لایەنکوڕەکانی (ئەبولەهەب)ی مامیەوە تەڵاق دران، پێش خۆی فاطمە رضي الله عنها نەبێت سێ کچەکەی تریشی وەفاتیان کرد، لە شوێنی لەدایك بوون و نیشتیمانی خۆی دەرکرا، بوختان بۆ خێزانی بەڕێزی خاتوو عائیشە رضي الله عنها کرا.!!.

بەکورتی، هەرچی ناخۆشی دونیا هەبوو هەمووی بینی، کەچی ڕۆژێك لە ڕۆژان بە خەتەرەی دڵیشیدا نەهات بڵێت: خوایە ئەمانەم بۆ بەسەر دەهێنیت؟! بەڵکو هەموو کات هەر حەمد و شوکری خوای دەکرد، ئەوەندە لە نوێژدا بەرامبەر بە خوا دەوەستا بنە پێیەکانی هەمووی دەئاوسان، کە پێیان دەوت: بۆ وا دەکەیت، خۆ خوای گەورە لە گوناهی ئەوەڵ و ئاخیرت خۆش بووە؟! دەیفەرموو: (أَفَلا أَكُونَ عَبداً شَكُوراً؟) ئایا نابێت بەندەیەکی سوپاس گوزاری خوای گەورە بم؟.

ئیمانداران: بەڕاستی مرۆڤ ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ بچوکترین زیندەوەری سەر زەوی‌دا ئەوا مرۆڤ لە هەموویان موحتاجترە بە فەزڵ و ڕەحمەتی خوا.

تەماشاکە: زیندەوەران یەك خواردنی بەسە، هەر ئاوێك بێت دەیخواتەوە، هەر شوێنێك بێت تیایدا دەژی، سەرما و گەرما و هاوین و زستانی بەلاوە گرنگ نیە، دکتۆر و دەرمان ناناسێت، شەڕ و ئاشتی نایشڵەژێنێت، گوێی نەداوەتە گرانی و هەرزانی، کەچی لەگەڵ ئەم خۆڕاگریەشدا بەردەوام شوکر و تەسبیحاتی خوای گەورە دەکات.. قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ﴾ الأسراء:٤٤.

بەڵام مرۆڤ لەگەڵ ئەو هەموو بێ هێزی و لاوازیەیدا، کە خۆی نە بۆ گەرما و نە بۆ سەرما دەگرێت، چەند دەقیقەیەك بێ هەوا ناژی، ئەو هەموو هیوا و ئاوات و تەماحەی هەیە، کەچی شوکری خوا ناکات ﴿ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ ﴾.

ئیمانداران: ئێستا با بزانین ئایا پاداشتی شوکرانەبژێری چی یە؟ چونکە خوای گەورە خۆی وەعدی داوە کە پاداشتی ئەو کەسانە دەداتەوە کە بەردەوام شوکر و سوپاسی خوا دەکەن، دەفەرموێت: ﴿وَسَنَجْزِي الشَّاكِرِينَ ﴾ یان ﴿ وَسَيَجْزِي اللَّهُ الشَّاكِرِينَ ﴾ ئەمەش هەندێك لە پاداشتی خوای گەورە بۆ شوکرانە بژێران:

**یەکەم: هەر خۆشیەك تۆ شوكری خوای لەسەر بكەیت، خوای گەورە بۆت زیاد دەكات، قورئان دەفەرموێت:** ﴿ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ ﴾ ابراهيم:٧.

**ڕاستەوخۆ خوای گەورە زیادكردنی ئەو خێر و خۆشیەی بەستۆتەوە بەوەی ئەگەر شوكرانە بژێر بویت بۆت زیاد دەكرێت، بەڵام ئەگەر بە وردی سەرنجی قورئان بدەیت بۆتدەردەكەوێت كە تەنها لە زیاد كردنی خەڵات و خۆشیەكانی كە خوا پێی بەخشیویت بە شوكرانە بژێری زیاد دەكات، خوای گەورە نەیفەرموو: ئەگەر حەز بكەم** (إنْ شاءَ)، **بەڵام لە پێنج شوێنی تردا** (استثناء)**ی داناوە، وەكو:**

١.**لە باسی دەوڵەمەند كردندا. دەفەرموێت:** ﴿ فَسَوْفَ يُغْنِيكُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ إِن شَاءَ ﴾ التوبه:٢٨. **واتە: خۆ ئەگەر دەترسن لە هەژاری و نەداری و بێ بازاڕی ئەوە بزانن كە لە ئایندەدا خوای گەورە لە فەزڵ و بەخشندەیی خۆی دەوڵەمەندتان دەكات هەر كاتێك بیەوێت.**

٢.**لە وەڵامدانەوەی دوعاكاندا** (في الإجابَة). **دەفەرموێت:** ﴿فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن شَاءَ﴾ الانعام:٤١. **واتە: كاتێك كە لە خوا پاڕانەوە بەڵا و ناخۆشیەكانتان لەسەر لا دەبات ئەگەر بیەوێت.**

٣.**لە رزق و ڕۆزیدا** (في الرِّزْق). **دەفەرموێت:** ﴿ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴾ البقرة:٢١٢. **واتە: خوای گەورە ڕزق و ڕۆزی دەبەخشێت بە هەر كەسێك كە بیەوێت بە بێ شومار.**

٤.**لە لێخۆشبووندا** (في المَغْفرة) **دەفەرموێت:** ﴿ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ ﴾ التوبة:١٥. **واتە: خوای گەورە تەوبە وەردەگرێت لە هەر كەسێك كە بیەوێت.**

**دووەم:** دووەم پاداشتی شوکرانە بژێری ئەوەیە: خوای گەورە دڵت ئاسودە دەکات، چونکە شوکرانە بژێری نیشانەی ئەوەیە قەناعەتت هەیە بەو بەشەی کە خوای گەورە پێی بەخشیویت، جا ئەگەر تەنها نان و ئاو بخۆیت و دڵت قەناعەتی هەبێت و سوپاسی خوای لەسەر بکەیت، ئەوا دڵت ئاسودە دەبێت و لاشەت لێی سود مەند دەبێت.

**سێیەم:** شوکرانە بژێری بەرگری لاشەت دژی نەخۆشی زیاد دەکات، لەبەر ئەوەی لە ناو لەشدا جیهازی مەناعە هەیە، کە لاشەت لەو میکرۆب و ڤایرۆسانە دەپارێزێت کە ڕوو دەکەنە لاشەت، ئەم جیهازی بەرگری لەشە لەخوار قەفەسەی سنگدایە، هەر وەختێك نەخۆشی هاتە لاشەتەوە، پەلاماری دەدات و بە بێ بەکارهێنانی دەرمان چاك دەبێتەوە، ئەم جیهازی بەرگریە بە دڵخۆشی زیاد دەکات، بە مەراق و ناخۆشی و دڵتەنگی لەناو دەچێت و وات لێ دێت لاشەت خۆی بۆ بچوکترین نەخۆشی ناگرێت.

هەر بۆیە خەڵکی پێشوو بەو هەموو نەداریەوە کە ژیاوە، زۆربەی ژەمە خواردنی نان و دۆ بووە، لەناو خانویەکی گڵ و بچوك و ڕایەخە شڕدا ژیاوە، بەڵام نەیزانیوە نەخۆشی چیە، چونکە جیهازی بەرگری ناو لاشەی بەهێز بووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە وەکو ئێستا پاك و خاوێنی نەبووە، بەڵام چونکە بەردەوام شوکری خوای کردووە، دڵی خۆش بووە و بەرگری لاشەی بەهێزتر بووە، بەڵام ئێستا لەم سەردەمەدا کە ئەو هەموو خواردنە خۆش و پاك و خاوێنە هەیە، کەچی سەدان نەخۆشیش هەیە، چونکە دڵ ئاسودە نیە، بۆ؟! چونکە کەس بە بەشی خۆی ڕازی نیە، کەس شوکری خوا ناکات، ئەمەش وا

دەکات بەردەوام دڵ ناڕەحەت بێت و ئەمەش دەبێتە هۆی لاوازبوونی بەرگری ناولاشەی مرۆڤ و سەرەنجام بە بچوکترین میکرۆب توشی نەخۆشی دەبێت.

بـــەڵێ ئیمانـــداران: شـــوکرانە بـــژێری خـــوا ئـــاوەدان کـــەرەوەی دڵ و دەرونمانـــە، هـــی مـــاڵ و حاڵمانـــە، مایـــەی زیـــادبوونی خۆشـــیەکانمانە و ڕەزامەندی خوای پێ بەدەست دەهێنین داواکارم خوای گەورە وامان لێ بکات دڵ و دەرونێکمـان پـێ ببەخـشێت کـە بـەردەوام شـوکری خـوا بکـەین و لـە ناشوکران نەبین...آمین.

سەرچاوەکان:

١.قورئانی پیرۆز.

٢.تەفسیری ئاسان – م. بورهان محمد أمین.

٣.پوختەی تەفسیری قورئان – م. محمد مەلا صاڵح.

٤.سلوكيات المرأة المُسلِمة – محمد عبدالعاطي بحيري – ص٣٥.

٥.الخطابة المنبريّة – خالد سيد علي – ص٤٨٧.

٦.موسوعة أسماء الله الحُسنى – د.محمد الراتب النابلسي – ج٢ – ص١٢١٦

٧.المُستَخلَص في تَزكِية الأنفُس – سعيد حوى – ص٣٠٢.

٨.آيات الله في الإنسان – د.محمد الراتب النابلسي – ص٢٤٣.

# وتاری چوارەم بۆ مانگی صەفەر

## ﴿ الشُکر - بەشی دووەم ﴾

( الحَمدُ للّهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

ئیماندارانی بەڕێز و خۆشەویست، سەلام و ڕەحمەتی خوا لە ئێمە و لە هەموو ئیماندارانی ئوممەتی محمد المصطفى بێت ﷺ ، خوای گەورە بمانگێڕێت لە عەبدە صاڵحە شوکرانە بژێرەکانی. إنشاءَ الله.

ئیمانداران: لە وتاری ڕابردودا باسی شوکرانە بژێریمان کرد و ئەمڕۆش بە پشتیوانی خوای گەورە ئەو باسە گرنگە درێژە پێ دەدەین و دەڵێین: وَباللهِ التَوْفيق.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی: ﴿وَٱشۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ﴾ النحل:١١٤. وە دەفەرموێت: ﴿ بَلِ اللّهَ فاعْبُدْ وَ كُنْ مِنَ الشاكِرِينَ ﴾. کەواتە هەر کەسێك بیەوێت

عەبدایەتی ڕاستەقینە بۆ خوا بکات، دەبێت بەڕاستی شوکری خوا بکات.

بەڕێزان: ئەگەر تەماشا بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە خەڵکی لە شوکر کردنی خوای گەورەدا چوار بەشن:

**بەشی یەکەم:** ئەو کەسانەن کە لە کاتی خۆشیدا شوکری خوا دەکەن و لە کاتی ناخۆشی و نا ئارامیدا خۆ ڕاگرن و ناشوکری ناکەن، ئەم جۆرە

کەسانە ئیمانداری تەواون، چونکە ئیمان بریتیە لە صەبر و شوکر، لە خۆشیدا شوکر بکەیت و لە ناخۆشیدا خۆڕاگر و صابر بیت.

جا مرۆڤ بە چی دەگات بەم پلە گەورە و بەرز و بەرێز و گران بەهایە، بەوەی کە بەردەوام سەیری ئەو کەسانە بکەیت کە لە گوزەران و ژیاندا لە ئاستێکدان کە لە خوار تۆوەن. (عَنْ أبي هُرَيْرَةَ ﷺ قال: قالَ رَسُول الله ﷺ: أُنْظُرُوا إلى مَنْ هُوَ أسفَلَ مِنكُمْ، وَلا تَنْظُرُوا إلى مَنْ هُوَ فَوْقَكُمْ، فَإنَّهُ أجْدَرُ أنْ لا تَزْدَرُوا نِعْمَةَ اللّهِ عَلَيْكُم ) صحيح سُنن إبن ماجة. کەواتە: ئەگەر دەتەوێت لە ژیاندا ئارام و ئاسودە بژیت و پلەی ئیمانەکەت لە بەرزترین دەرەجەدا بێت و قیامەتت ئاوەدان بێت، ڕەفتار بەم فەرمودەیەی پێغەمبەری دڵسۆز و خۆشەویست ﷺ بکە و بیکە بە کردار لە ژیاندا و بەردەوام سەیری ئەو کەسانە بکە کە لە ژیان و گوزەران و ماڵ و سامان و خانوو و منداڵ و لاشەدا لە خوار تۆودن و هەرگیز سەیری حاڵ و گوزەران و ماڵ و منداڵ و لاشە و خواردن و خۆراك و پۆشاکی ئەو کەسانە مەکە کە لە سەروی تۆوەن و ئەوەی تۆ بە مانگێك دەستت دەکەوێت و صەرفی دەکەیت، ئەو لە ڕۆژێکدا دەستی دەکەوێت و صەرفی دەکات. جا ئەگەر بە قسەی پێغەمبەری خوات ﷺ کرد ئەوە قەناعەتت بۆ درووست دەبێت و هەموو سات و کاتێك شوکری خوای خۆت دەکەیت و خۆت زۆر پێ دەوڵەمەند دەبێت.

کەواتە: خۆت ڕابێنە و دڵت وا پەروەردە بکە کە بەچاوی دڵ هەرگیز سەیری ئەو کەسە مەکە کە ئۆتۆمبێلێکی ئاخر مۆدێلی لە ژێردایە و تۆش بە پێ دەڕۆیت. چونکە تۆ نازانیت، لەوانەیە ئەو کەسەی تۆ بە دەوڵەمەندی دەزانیت و خاوەنی ئەو ئۆتۆمبێلەیە، نەخۆشی ڕۆماتیزمەی هەبێت، یان فەقەراتی پشتی تەواو نەبێت و نەتوانێت بەپێی خۆی بڕوات، لەوانەیە

ئەویش لەناو ئۆتۆمبێلەکەیەوە خۆزگە بە تۆ بخوازێت کە ئاوا قیت و قنج و گورج و بەبێ ئازار بە ڕێگادا دەڕۆیت بە قاچەکانی خۆت!!..

بەڵکو بڕۆ تەماشای ئەو کەسە بکە کەوا بە دوو دارشەق دەڕوات، یان ئەو کەسەی کە توانای نیە تەنانەت بە دار شەقیش بڕوات و لەسەر کورسی پاڵی پێوە دەنێن، ئەمجا بزانە چۆن قەناعەت دێتە ناو دڵتەوە و پڕ بە دڵ و دەم شوکری خوای گەورە دەکەیت لەسەر قاچە ساغ و سەلامەتەکانی خۆت.

وە سەیری ئەو کەسە مەکە کە لە کۆشکێکی ڕازاوەدا دەژی کە ئەوەندە قاتی بەرز کردۆتەوە بۆت نازمێردرێت، بەڵکو لەگەڵ تەماشا کردنیدا بیر لەوەش بکەرەوە کە لەوانەیە خاوەنەکەی ناساغ بێت و بە دەرمانی خەولێخەر نەبێت خەو نەچێتە چاوانی، یان لەوانەیە خاوەنەکەی کەسێکی بەرپرسە و حەرەس و حیمایە ئەملاو لای ماڵەکەی گرتووە و ئاگای لە چونە سەر ئاویشیەتی و هەموو دەقیقەیەك چاوەڕێی کوشتن و کارەساتە.

یان بە پارەی حەرام و بە خوێنی خەڵك دروستی کردبێت و هەرگیز ویژدانی تیایدا ئارام نابێت.. بەڵکو لە جیاتی ئەوە وەرە سەیری گوزەران و شوێنی نیشتەجێی ئەو کەسە بکە کە کرێ چیە، بەڵام تۆ شوکر خانوی خۆتە، یان ئەگەر کرێ نشینی سەیری ئەو کەسە مەکە کە خانوی خۆی هەیە، بەڵکو سەیری ئەو کەسە بکە کە وەکو تۆ کرێ نشینە و بەڵام تۆ ئەگەر پارەی کرێی خانوەکەت پێ دەدرێت، ئەو پارەی کرێی مانگانەشی بۆ کۆ نابێتەوە و نازانێت ڕوو لە کێ و لە کوێ بکات!!... ئەو کاتە شوکری خوا دەکەیت.

وە کاتێك کە گیرفان و ماڵ و مەطبەخت گەرم و گوڕ نیە، تەماشای ئەو کەسە مەکە کە لە سەرووی تۆوە ژیان دەگوزەرێنێت و ماڵ و پارەی زۆرە و مەطبەخی گەرم و بۆن خۆشە، چونکە لەوانەیە نەتوانێت بیخوات، چونکە زەختی هەیە، شەکرەی هەیە، پڕۆستاتی هەیە، گەدە و ڕیخۆڵەی نەخۆشە،

قەڵەویەکەی لێ بۆتە بەڵا، ئەو هەموو خواردنە چەور و ئامادەکراوە لەبەردەمیەتی ناتوانێت دەستی بۆ بەرێت و نەك هەر لەزەتی لێ نابات، بەڵكو لێشی بۆتە مەراق و ناخۆشی و خەم و خەفەت، ئیتر ئەو کاتە بزانە تۆ چۆن سوپاسی خوا دەکەیت لەسەر ئەوەی کە هیچ جۆرە خواردنێکت لێ قەدەغە نیە و ئەوەی دەیخۆیت لە لەشتدا سودمەند دەبیت لێی و لێت نابێت بە ئازار و شەو بە ئیسراحەت دەخەویت و بە لەشێکی ئاسودە و مێشکێکی ئیسراحەتەوە لەخەو هەڵدەستیت.

ئیمانداری بەڕێز: زۆر جار ئەو کەسەی تۆ دەڵێیت دەوڵەمەندە، لە واقیعدا زۆر هەژارە، بۆچی؟! چونکە قەناعەتی نیە بەو بەشەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە... کە لە ڕاستیدا دەوڵەمەندی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ڕازی بیت بەو بەشەی کە خوا پێی بەخشیوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( ارضَ بِما قَسَمَ اللّهُ لَكَ تَكُنْ أغْنى النّاسِ ) واتە: ڕازی بە بەوەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردویت ئەوا لە هەموو کەس دەوڵەمەندتر دەبیت.

ئیمانداران: پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ دەفەرموێت: ( نِعْمَتانِ مَغْبُونٌ فِيهِما كَثيرٌ مِنَ النّاس، الصِّحَةُ و الفَراغُ ). واتە: دوو خەڵاتی خوای گەورە هەن زۆربەی خەڵکی تیایاندا زەرەرمەندن، ئەوانیش لەش ساغی و تەندروست باشی، لەگەڵ دەست بەتاڵی و سەرقاڵ نەبوون. صَدَقَ رَسُول الله ﷺ، فِعْلاً، زۆربەی خەڵکی سود لە خەڵاتی لەش ساغی نابینن، بەوەی کە لەکاتی لەش ساغیدا بە فرسەتی نازانن کار و کردەوەی چاك ئەنجام بدەن، چونکە ئەوەی مرۆڤ لەکاتی لەش ساغیدا ئەتوانێت ئەنجامی بدات، ناتوانێت لەکاتی نەخۆشی و پەککەوتەییدا جێبەجێی بکات.

خەڵاتی دووەم: فەراغ و کات بەدەستەوە بوونە، ئەوەی کە خوای گەورە ڕەحمی پێ کردویت شەڕ و ئاژاوە لە وڵاتدا نیە و ئەمینیت، خەریکی ڕاکردن و خۆشاردنەوە نیت، دوژمندار نیت و ئازادیت لەوەی بچیتە هەموو شوێنێك، تۆزێك پارە و پاروت هەیە، وا دەستکورت و نەدار نیت هەموو شتێکت لەبیر چوبێتەوە، وە ئەگەر ئەم فەراغ و کات بۆ گونجانەت نەقۆستەوەبۆ ئیشی چاك کە بۆ دونیا و قیامەتت دەست مایە بێت، ئەوە خەسارەتمەندیت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( مَنْ أصبَحَ مِنْكُمْ آمِناً في سِربِهِ مُعافى في جَسَدِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ، فَكَأنَّما حيزَتْ لَهُ الدُّنيا بِحَذافيرِها ) رواه البُخاري. واتە: هەر کەسێك لە ئێوە بەیانی لێ بوەوە لەناو خاو و خێزانی خۆیدا دڵ ئارام بوو، لەش ساغ بوو، بژێوی ئەو ڕۆژەی هەبوو، ئەوە با بزانێت دونیا هەمووی هی ئەوە..

دەگێڕنەوە: پاشایەکی دەسەڵاتدار لە وەزیرەکەی پرسی: کێ پاشایە؟ وەزیر وتی: قوربان، جەنابت پادشایت. پاشاکە وتی: (لا، المَلِكُ هُوَ رَجُلٌ لا يَعْرِفُنا وَ لا نَعْرِفُهُ، لَهُ بَيْتٌ يُؤويه، وَ زَوجَةٌ تَرضيه، وَ دَخْلٌ يكْفيه). وتی: نەخێر، من پاشا نیم، چونکە من لەم پاشایەتیەمدا دڵ ئارام و ئاسودە نەبووم، بەڵکو، پاشا و مەلیکی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کە ئێمەی حکومەت و دەسەڵاتدار ناناسێت و ئێمەش ئەو ناناسین، بۆخۆی خانویەکی بچکۆلانەی هەیە کە تیایدا حەواوەتەوە و لە سەرما و گەرما دەیپارێزێت، وە ژنێکی گوێڕایەڵ و ڕێك و پێکی هەیە کە دڵی ڕازی دەکات و ماندوبوونی دەرەوەی ماڵی لە لاشە دەردەکات، وە ئەوەندەش ڕزق و ڕۆزی و واریداتی هەیە کە پێی دەژی و قەرزاری خەڵك نابێت و موحتاجی دەستی نامەرد نابێت، بەڕاستی ئەوە پاشا و مەلیکی ڕاستەقینەیە...

خۆشەویستان: بەڕاستی خەڵات و بەخششەکانی خوای گەورە زۆرن بەسەرمانەوە، وە دەبێت بزانین و یەقینمان هەبێت لە هەموو شتێك لێمان دەپرسرێتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴾ التكاثر:٨. واتە: بێگومان ئێوە لەوە دوا پرسیارتان لێ دەکرێت دەربارەی

هەموو خێر و خۆشیەك کە پێتان دراوە وەکو لەش ساغی و ئارامی و خواردن و خواردنەوەی خۆش و هەموو خەڵات و بەخششێکی تر کە خوا پێی بەخشیون، کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جا لە چ خۆشیەك پرسیارمان لێ دەکرێت، ئەوەتا ئێمە لەماڵ و حاڵی خۆمان دەرکراوین؟! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (سێبەری خانوو، سێبەری درەخت و خێمە، کە لەسەرما و گەرما دەتانپارێزن، ئاوی سارد لە ڕۆژی گەرمدا).

با بچینە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ، حەزرەتی ئەبوهورەیرە بەسەرهاتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێکدا لە ماڵ دەچووە دەرەوە کە پێشتر هەرگیز لەو کاتەدا نەچوبووە دەرەوە، توشی حەزرەتی ئەبوبکر ﷺ بوو، فەرموی: ( ما جاءَ بِكَ يا أبي بَكر؟ ) ئەوە چی تۆی هێناوەتە دەرەوە لەم کاتەدا بۆ ئەم شوێنە ئەی ئەبوبەکر؟ ئەبوبەکر ﷺ فەرموی: (خَرَجْتُ أَلْقِيَ رَسُول الله ﷺ وَ أَنْظُرُ فِي وَجْهِه، وَ التَّسْلِم عَلَيه). واتە: بەئومێدی بە خزمەت گەیشتنی تۆ هاتومەتە دەرەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ .. لەو کاتەدا حەزرەتی عومەریش ﷺ هاتە دەرەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (ما جاءَ بِكَ يا عُمَر؟ ). ئەی عومەر ئەی چی تۆی لەم کاتەدا لەماڵ هێناوەتە دەرەوە؟ حەزرەتی عومەر ﷺ فەرموی: (الجُوعُ يا رَسُول الله) ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەخوا برسێتی منی هێناوەتە

دەرەوە!. لەتاو برسیەتی ئارامم لێ براوە و لە ماڵ هاتمە دەرەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (وَأنا قَدْ وَجَدْتُ بَعْضَ ذالِكَ) منیش هەر شتێکی ئاوا کە برسیەتیە لە ماڵ هێناومیەتیە دەرەوە.. ئەمجا هەرسێکیان ڕۆشتن بۆ ماڵی (أبي الهَيثَم بِن التَّيهان الأنصاري) ئەم پیاوە خەڵکی مەدینە بوو، ئاژەڵی زۆر و باخی خورمای چاکی هەبوو، کە چونە باخەکەیەوە لەوێ نەبوو، لە خێزانەکەیان پرسی: ئەوە (ئەبی هەیثەم لە کوێیە؟) وتی: چووە ئاوی سارد لەو کانیە بهێنێت. ژنەکە زۆر بەجوانی پێشوازی لێ کردن و جێگای بۆ داخستن و بەخێرهاتنی کردن، پاش کەمێك ئەبو هەیثەمیش هاتەوە و زۆر خۆشحاڵ بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ حەزرەتی ئەبوبەکر و عومەردا ﷺ لوطفیان کردووە و سەردانیان کردووە. دوای بەخێر هێنانێکی گەرم، هەر خێرا چوو خورمای تازەی بۆ لێ کردنەوە و لەگەڵ ئاوی سارد بۆی دانان، پێغەمبەری خوا و ﷺ دوو هاوەڵەکەی ﷺ لە خورما و ئاوەکەیان خوارد، پێغەمبەری خوا ﷺفەرموی: (هذا وَالّذي نَفْسي بِيَدِهِ مِنَ النَّعيمِ تُسالُونَ عَنْهُ يَوْمَ القِيامَةِ: ظِلٌّ بارِدٌ، وَ رُطَبٌ طَيِّبٌ، وَ ماءٌ بارِدٌ) . فەرموی: (ئائەمەی خواردمان سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بە دەستە کە زاتی (الله)یە، ئەمە ئەو نەعیمەیە کە خوای گەورە لە قیامەتدا لێمان دەپرسێتەوە لەسەری، سێبەرێکی فێنك و خورمایەکی تازە و ئاوێکی سارد و سازگار) رواه الترمذي – صحيح الجامع:١٨٠٥.

بەڵێ ئیمانداران: یەکەم تاقم ئەو کەسانەن کەوا لەکاتی خۆشیدا شوکری خوا دەکەن و لەکاتی نەبوونی و ناخۆشیدا ئارام دەگرن.

ئیمامی شافیعی ﷬ گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: (يا رَبِّ هَلْ أنتَ راضٍ عَنِّي؟) ئیمامی شافیعی فەرموی: (هَلْ أنْتَ راضٍ عَنِ الله حَتّى يَرضى عَنْكَ؟!) ئایا تۆ لە خوا ڕازیت تا خواش لە تۆ ڕازی بێت؟!

کابرا بە سەرسوڕمانەوە وتی:(کَیْفَ أَرْضی عَنَهُ وَ أنا أتَمَنّی رِضاهُ؟) باشە چۆن من دەبێت لە خوا ڕازی بم لەکاتێکدا هەموو خۆزگە و ئاواتی من ئەوەیە کە ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەست بێنم؟! ئیمامی شافیعی فەرموی: (إذا کانَ سرورُكَ بالنِقْمَة کَسُرُورِكَ بالنِّعْمَة فَقَدْ رَضیت عَنِ الله) ئەگەر حاڵت وای لێ هات خۆشحاڵ بیت بە بەڵا و ناڕەحەتیەك کە توشت دەبێت و ڕەزامەندی لەسەر دەرببڕیت و ڕازی بیت بەوەی کە خوای گەورە بۆی بڕیار داویت وەکو ئەوە بێت کە کاتێك توشی خۆشی و فەرەحەتی دەبێت و چۆن لە خوای گەورە ڕازیت و بە کارەکانی دڵخۆشیت، ئەو کاتە تۆ ئەوە بزانە کە خوای گەورەش لەتۆ ڕازیە...

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز: بۆ ئەوەی کە چۆن لەکاتی خۆشیدا شوکری خوا دەکەیت، لەکاتی ناخۆشیشدا بتوانیت ئارام بگریت، ئەوا جارێکی تر فەرمودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دووبارە ئەکەینەوە کە فەرموی: ( سەیری ئەو کەسە بکە کە لەخوار خۆتەوەیە ). وە بزانە نەخۆشی و ناخۆشی هی ئەوە نیە کە خوا ڕقی لەو کەسە بێت، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( صُداعُ المُؤمِنِ، وَ شَوكَة یُشاکیها، أو شَئٌ یُؤذیهِ یرفعه اللّٰه بها یَومَ القیامَةِ دَرَجَة و یُکَفِّر بها عَنهُ ذُنوبهُ ) واتە: کاتێك ئیماندار توشی سەرئێشەیەك دەبێت، یان دڕکێك ئازاری دەدات، یان شتێك ئازاری دەدات، ئەوا خوای گەورە بەو نەخۆشی و ناخۆشیە پلەیەك بەرزەی دەکاتەوە لە قیامەتدا، وە دەبێتە هۆی هەڵوەرینی گوناهێك لەسەری.

تابیعی پایە بەرز (عوروەی کوڕی زوبەیری کوڕی عەوام). دەزانن عوروە کێیە؟باوکی کە (زوبەیری کوڕی عەوامە)ە، یەکێکە لە عەشەرەی موبەشەرە، یەکێکە لەو (دە) کەسانەی کە خوای گەور بە پێغەمبەری ﷺ فەرمووە: هەر

لـە دونیـادا مـوژدەی بەهەشـتیان پـێ بـدە، وە دایکیـشی (ئـەسمائی کـچی حـەزرەتی ئەبوبـەکری صـدیق)ە، حـەزرەتی عائـشە ﷺ پوریـەتی، بۆخۆشـی یەکێك بووە لـەو کەسانەی کـە بـەردەوام لـە خزمـەتی قورئـانی پـرۆزدا بـووە و زۆر خوا ناس و عالم بوە، ئەم زاتە پایـە بـەرزە لـە زەمـانی (عَبـدالمَلِكی کـوڕی مەروان)دا خۆی و کوڕەکەی چون بۆ دیمەشق بۆلای خەلیفە، سُبحان الله، لەو سـەفەرەدا لـە مـاڵی خەلیفە، عوروە قاچـی توشـی خـوران و ئاوسـان بـوو، کـە ئـەمڕۆ پێـی دەڵێن (شـێرپەنجە – الـسَّرطان)، دوای بـەکار هێنـانی دەرمـان و چارەسەرێکی زۆر کە حەکیم و دکتۆرەکانی ئەو سەردەمە بۆیـان بـەکار هێنـا، بەڵام هیچ برینەکەی سارێژ نەکرد و بەڵکو ڕۆژ بە ڕۆژ ئازاری زیـادی دەکـرد، تـا ئـەوەبوو هـەموو شـارەزایانی بـواری پزیـشکی بڕیاریانـدا قاچـەکەی بـۆ بڕنەوە و سەرەنجام قاچیان بڕیەوە، لە هەمان کاتـدا کوڕەکەشـی کـە کـوڕێکی گەنجی تازە پێگەیشتوو بوو، زۆر عالم و خوا ناس بوو، یەکێك لە ئەسپەکانی خەلیفە لەقەی لێ داو کوشتی، خەڵکی دەهاتن بۆ دڵدانـەوە و سـەرەخۆشـی لێ کردنـی، خەلیفـە زۆر خـەمی بـوو، چـونکە لـەماڵی ئـەودا وای لێهـاتبوو، تـا ئەوەبوو ڕۆژێکیـان خەلیفـە چـەند میـوانێکی هـات لـە (بـەنی عەبـەس)، یـەکێك لەو میوانانە هەردوو چاوی کوێر بوو، خەلیفە لێـی پرسـی: مامـەگیان بۆچـی وات لێ هـاتووە؟! لەوەدەچێت تـۆ زکمـاك کـوێر نـەبوبیت، بـەڵکو بـە پێـی ئـاوا بەترسەوە دەجوڵێیتەوە دیارە تازە کوێر بوویت.. کابرای نابینا وتـی: قوربـان ڕاست دەفەرموویت، با بەسەرهاتی خۆمت بۆ بگێڕمەوە: لە هۆزەکەمـدا کـەس بەقەد من دەوڵەمەند نەبوو، جارێکیان لەکاتی بەهاردا مـەڕ و مـاڵات و خۆمـان لەپـەنا شـیوێکدا بـووین، لـەناکاو بـاران دایکـرد و لافـاوی بـەهار دایکـرد و هـەمووی خنکانـدین، تـەنها (خـۆم ومنـداڵێکی شـیرەخۆرە و گوێدرێـژێك)م بـۆ دەرچـوو، چـوم بـەلای گوێدرێژەکـەوە، کەچـی لـەولاوە منداڵەکـە زریکانـدی و بـەدەم گورگـەوە بـوو، تـا گەیـشتمە لای سـەری لـێ کـردەوە، بـە گریـان و بـێ

ئومێدیـەوە چـوم بـۆلای وولاخەکـە، بـەڵام ئـەویش لـە ترسـناکی دیمەنەکـە جوتەیـەکی لـە ناوچاوانم دا و هـەردوو چاوم کوێر بـوو، نـە مـاڵ، نـە ژن، نـە منداڵ هیچی نەمان، خۆشـم ئاوام لێ هـات... خەلیفە کـە ئـەم باسـەی بیـست وتـی: ئـەم پیـاوە ببـەن بـۆلای عـوروە و بـا بەسـەرهاتی خـۆی بـۆ ئـەویش بگێڕێتەوە و بەهۆی ئەم پیاوەوە سوکنایی بێت. بەڵێ، کاتێك عوروەی کوڕی زوبـەیر بەسـەرهاتی پیـاوە نابیناکـەی بیـست، فـەرموی: خوایـە، هـەزاران سوپاس بۆ تۆ لەم موصیبەتەی منیش گەورەتر هەیە، ئەوەتا مـن چـوار پـەلت پێ بەخشیوم یەکێکیانت لێ وەرگرتومەتەوە و سیانم مـاوە، چـوار کـوڕت پـێ بەخشیم، یەکێکیانت بردەوە و سیانم ماوە، خوایە حەمد و ثەنای تۆ دەکەم.

بەڕێزان: زانایان دەفەرمون: خەڵکی بەسـەر سـێ چین و توێژدا دابەش دەبن لە پەیوەندیان بە شوکر و سوپاسی خوای گەورە:

یەکەم: تێکڕای خەڵکی کە شوکری خوا دەکەن لەسـەر ئـەو خۆشیانەی پێیان دەگات و جەستە و لاشەیانی پێ تێر دەبێت لە خواردن و خواردنەوە و خانوو و خێزان و ... هتد..

دووەم: کەسانێکی تایبەتمەند لەناو خەڵکیدا کە سوپاسـی خـوا دەکـەن لەسەر ئەو خۆشی و لەزەتانەی کە بە ڕۆحیان دەگات، بۆ نمونە: کاتێك کە تۆ قورئان دەخوێنیت چۆن هەست دەکەیت بەوەی کە گیـان و دڵـت ئـارام بـووە، هەموو ناخت هەست بە لەزەتێك دەکات کە ناتوانیت وەصفی بکەیت، یـاخود کاتێك نوێژێکی ڕێك و پێکت کردبێت، بە خشوع و ئاگایی دڵـەوە لـە خزمـەت خـوای خۆتـدا بووبیـت، هەسـتت کـردووە کـە چـەند لـە خـوای گـەورە نزیـك بویتەوە، یان ئەو ڕۆژانـەی هـەینی کە گوێبیستی وتـارێکی هـەینی بـە پێـز و بەهێز بوبیـت کـە لەمزگـەت هاتویتـە دەرەوە چـۆن هەسـتت بـە نـوێ بونـەوەی ئیمانەکەت کردووە، یان توشی کۆڕ و دانیشتنێك بویـت کـە پیـاوی بـاش زوو زانا و دانا بە قسە جـوان و پڕ بەرەکەتـەکانیان مەجلیسەکەیان ڕازاندۆتـەوە،

چۆن لە ناختداگەشەت کردووە و ماندوبوونی جەستەت دەرکردووە و ئەمجا شوکر و سوپاسی خوات لەسەر کردووە.

سێیەم: کەسانێکن کە دەگمەنن لەناو خەڵکیدا، ئەوانەش ئەو کەسانەن کە حەمد و ثەنا و شوکری خوا دەکەن لەسەر ئەوەی کە یارمەتی داون سوپاسی خوا بکەن، یەعنی هەر کاتێك خێر و خۆشیەك ڕوی تێکردن و سوپاسی خوایان لەسەر کرد، ئەمجا جارێکی تر سوپاسی خوا دەکەن و شوکرانە بژێری بۆ دەردەبڕن لەسەر ئەوەی کە حەمد و شوکری خوایان کردووە.

ئیمانداران: جۆری دووەم لە خەڵکی بەرامبەر شوکرانە بژێری خوا کەسانێکن کە: (ناسٌ نَسوا الله فِي الرَّخاء وَ الشِّدة). واتە: خوایان لەبیر کردوە و نایناسن و سوپاسی ناکەن نەلە خۆشیدا نە لەکاتی ناخۆشیدا، قورئان باسی ئەم جۆرە کەسانەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسٗا ﴾ الإسراء:٨٢. واتە: هەرکاتێك بەهرە و چاکەی خۆمان بڕێژین بەسەر مرۆڤی بێ باوەڕدا ڕوو وەرچەگێڕێت لە باس و یادی ئێمە و دوور دەکەوێتەوە وە کاتێك ناخۆشی و زیانی لێ بکەوێت زۆر نا ئومێد دەبێت.

جۆری سێیەم: (ناسٌ عَرَفوا الله فِي الشِّدَة وَ نَسُوُهُ فِي الرَّخاء) کەسانێکن خوای گەورە دەناسن و هاواری لێ دەکەن و لێی دەپاڕێنەوە لە کاتی تەنگانە و نەخۆشی و ناخۆشیدا، بەڵام لەکاتی خۆشی و فەرەحی و لەش ساغی و دەوڵەمەندیدا، لەو کاتەدا کە دونیا بە دەمیەوە پێ دەکەنێت، خوای لەبیر نامێنێت و جارێك لە جاران ناڵێت خوایە شوکور بۆ تۆ کە منی نا شایستەت بەسەر کردۆتەوە بەم هەموو خێر و بەهرەیە، قورئانی پیرۆزیش باسی ئەو

جۆرە کەسانەشمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَـٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوْ قَاعِدًا أَوْ قَآئِمًا فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمْ يَدْعُنَآ إِلَىٰ ضُرٍّ مَّسَّهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْمُسْرِفِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ یونس:١٢. واتە: کاتێك ئادەمی زیانێکی لێ بکەوێت، بە ڕاکشان یان بە دانیشتن یان بە پێوە لێمان دەپاڕێنەوە، ئینجا کاتێك ناخۆشیەکەمان لەسەر لابرد دەچێتەوە سەر حاڵی پێشوی وەك ئەوەی هەر هاوار و دوعای نەکردبێت لێمان بۆ ئەوەی ئەو زیان و ئازارەی توشی بووە لەسەری لابەرین، بەو جۆرە ڕازێنراوەتەوە بۆ زیادەڕەوان و ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد.

بەڵێ، ئەم جۆرە کەسانە کاتێك نەخۆش دەکەون، هەڵسان و دانیشتن و خەو و خۆراکیان هەر (یا الله)یە، دەڵێت: خوایەگیان هەر ئەم جارە شیفام بدەی هەرگیز لەیادت ناکەم، کەچی کاتێك خوای گەورە شیفای داو چاك بۆیەوە، خوای لەبیر دەچێتەوە و هەر دەڵێیت ئەویش نەبووە.

خوێندکاری وا هەیە لەکاتی تاقیکردنەوەکاندا نوێژ دەکات، داوای یارمەتی لە خوا دەکات، هەر دەڵێت: خوایە ڕەحمم پێ بکە دەربچم.. کەچی کاتێك دەرچوو لە جیاتی سوجدەی شوکر بۆ خوا بەرێت ئیتر واز لە خواپەرستی دەهێنێت، وە هەروەها چین و توێژەکانی تری کۆمەڵگاش بە هەمان شێوە... بە داخەوە زۆرمان واین، لە ناخۆشی و تەنگانەدا پەنا بۆ خوا دەبەین، بەڵام لە خۆشی و فەرەحیدا لەبیرمان دەچێتەوە.

جۆری چوارەم لە خەڵکی: (ناسٌ عَرَفُوا الله فِي الرَّخاءِ و نَسُوهُ فِي الشِّدة) خەڵکانێکن کە لەکاتی خۆشیدا خوا دەناسن و سوپاسی دەکەن، بەڵام لەکاتی بەڵا و موصیبەت و ناخۆشیدا، دەست دەکەن بە کوفر و وشەی نابەجێ بەرامبەر خوای گەورە بە دەمیاندا دێت، قورئانی پیرۆزیش باسی ئەو جۆرە

**کەسانەشمان بۆ دەکات و دەفەرموێت:** ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ﴾ الحج:١١. **واتە: لەناو خەڵکیدا کەسی وا هەیە خودا دەپەرستێت لە سەر نێواندا، لە لێواردا، جا ئەگەر توشی خێر و خۆشی بوو دڵخۆش دەبێت پێی (بەردەوام دەبێت لە خوا پەرستیدا) وە ئەگەر توشی تاقیکردنەوە و بەڵا بوو، بەرەو دوا هەڵدەگەڕێتەوە، پاشگەز دەبێتەوە لە دین، زەرەرمەندی دونیا و قیامەت بووە، تەنها ئەوەیە زیان و خەسارەتمەندی ڕون و ئاشکرا...**

**بەڵێ بەڕێزان: لەمڕۆدا خەڵکانێك خواپەرستی تاقی دەکەنەوە، دەبینی نوێژ دەکات ئەگەر قازانجی کرد لە مەعامەلەیەکدا، ئەوە دەڵێت: بەڕاستی نوێژ خێر و بەرەکەتە، بەڵام ئەگەر لەناکاو توشی ناڕەحەتی و ناخۆشیەك بوو، ئەوە تەرکی نوێژ دەکات، هەر لەم سەردەمەدا خەڵك هەبووە کە کوڕی بووە سوپاسی خوای کردووە و ڕوی خۆش بووە و شیرینی بەخشیوەتەوە، کەچی کاتێك کچی بووە، ئەو ڕۆژە نوێژی نەکردووە و وتویەتی: خوایە خۆ من نوێژ دەکەم و بەڕۆژوو دەبم، باشە بۆ هەر کچم دەبێت؟!. ئەمە لەکاتێکدا کە کچ و کوڕ هەردوکیان خەڵاتی خوایە و هەدیە و دیاری خوایە.. خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ لِّلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴾ الشورى:٤٩.

**بەڵێ، قورئان دەفەرموێت: کچ و کوڕیش هەردووکی هەدیە و خەڵاتی خوای پەروەردگارە، بەڵام خوای گەورە ناوی (کچی) پێش خستوە بەسەر ناوی کوڕدا، وەکو ئەوەی پێمان بڵێت: ڕێز و حورمەتی کچ بگرن و فەزڵی**

کوڕی مەدەن بەسەردا.. وە لێرەوە سەرنجێك هەیە، ئایەتەکە نافەرموێت ﴿ الأنـاث ﴾ بەڵکو دەفەرموێت: ﴿ إناثاً ﴾ بەڵام پێشی خستوە، بەڵام بۆ کوڕ دەفەرموێت: ﴿ الذُّكور ﴾ نافەرموێت ﴿ذُكراناً ﴾ چونکە دوای خستوە و بەو (ألف و لام)ە تۆڵەی دوا خستنەکەی بۆ کردۆتەوە ، زانایانیش دەفەرمون: (تَنْكِير وَتَقْدِيم يُفِيدُ التَكْرِيم).

وە دڵخۆش بوون بە کوڕ و توڕەبوون بە بوونی کچ لە دەستورەکانی جاهیلیەتی پێش ئیسلامە.

داواکارم لە خوای گەورە کە بمان گێڕێت لەو کەسانەی کە شوکرانە بژێری خوای گەورەن و قەناعەتمان هەبێت بەو بەشەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوین... آمین.


سەرچاوەکان:

١.قورئانی پیرۆز.

٢.پوختەی تەفسیری قورئان – محمد مەلا صاڵح بامۆکی.

٣.صَحيح وصايا الرَّسول ﷺ – سَعد يوسف ابو عزيز – ج٢ – ص٤٥٨.

٤.تەفسیری ڕەوان – مەلا محمود گەلاڵەیی – ب١٥ – جزء:٣٠ – ل٢٢٦.

٥.موسوعة اسماء الله الحُسنى – د.محمد راتب النابلسي – ج٣ – ص١٢٩٥.

٦.صحيح قصص الرَّسول ﷺ – سعد يوسف ابوعزيز – ج٢ – ص٣٨٥.

٧.درود – فاتح محمد سميع – ب١ – ل٢٣٤.

٨.جُلَساء الملائكة – عبد الحميد كُشك – ج١ – ص٢٢.

# وتاری یەکەم بۆ مانگی رَبیعُ الأوَّل

## سەرەنجامی ناشوکری

( الحَمدُ للّهِ ربِّ العالمِين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعِين )

ئیماندارانی بەڕێز: بە پشتیوانی خوای گەورە لە وتاری ئەمڕۆماندا باسی سەرەنجامی ناشوکری دەکەین،لەبەر ئەوەی کە ئەگەر سوپاس کردنی خوا و شوکری خوا لەسەر ئەو خەڵات و بەخششانەی کە پێی بەخشیوین ببێتە هۆی زیاد بوونی ئەو خێر و خۆشیە و خۆشبەختی دونیا و قیامەت، دیارە بە پێچەوانەشەوە ناشوکری کردن دەبێتە کۆمەڵێك نەهامەتی و نەدامەتی، وە پێش ئەوەش کە باسی سەرەنجامەکانی ناشوکری بکەین، پێویستە بزانین کە ئایا ناشوکری یانی چی؟ وە ناشوکری کردن هەر قسەیە؟ بێگومان ناشوکری چەند جۆرێکی هەیە، ناشوکری هەیە بە قسەو گوفتار دەردەبڕێت، کەسێك خێر و بێرێکی زۆری لەبەر دەم و لەبەر دەستایە، کەچی ئەڵێت: دەی خوا بیبڕێت، یان دەڵێت بەزیاد نەبێت. ئەمە بەقسە ناشوکری کردووە، کەسانێکیش هەن کە بە دڵ ناشوکری دەکەن، لەکاتێکدا کە بە زمان قسە ناکەن و ناشوکری دەرنابڕن، ناشوکری بەدڵ بەوە دەبێت کە ئەو کەسە ناڕازی بێت بەو بەشەی کە خوا پێی بەخشیوە، بە کەمی بزانێت، یاخود لە دڵیدا وابێت کە غەیری خوا توانا و دەسەڵاتی هەبووە لەو خێر و خۆشیەی کە توشی ئەم بووە، وە ناشوکری وا هەیە بە کردەوە دەکرێت، وەکو ئەوەی کە ئەو بەخشش و خەڵاتانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیویت لە شتێکدا، لەرێگایەکدا بەکاری بهێنیت کە خوای گەورە پێی ناخۆشە.. جا فەرموون با ئێستا هەندێك لە ئاکام و سەرەنجامی ناشوکری باس بکەین:

١.ناشوكری خۆشیت لێ دەكات بە ناخۆشی، لەسەر ئاستی تاكە كەس هەر كەسێك شوكری خوا نەكات، خوای گەورە ئەو خەلاَتەی لێ دەسەنێتەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ بە عائیشەی ﵂ فەرموو: (یا عائِشَة، أحْسِني مُجاوِرَة النِعَمِ بالشُكرِ فَقَلّما نَفَرَت نعمة عَنْ قَوْمٍ فَعادَتْ إلَيهِمْ). واتە: ئەی عائیشە، لەبەرامبەر خۆشی و خێر و بەرەكەتەكان كە خوای گەورە پێی بەخشیویت، شوكری خوا بكە،چونكە كەمجار هەیە كە خێر و خۆشی لە ماڵێك، لە بنەماڵەیەك دوور بكەوێتەوە و بە ئاسانی بگەڕێتەوە بۆلایان.. وە فەرمویەتی ﷺ: ( الشُكرُ قَيْدُ النِّعْمَةِ وَ سَبَبُ دَوامِها، و مِفْتاحُ المَزيدِ مِنها ).. واتە: شوكرانە بژێری بەستەرەوەی خۆشیەكانە و هۆكاری بەردەوام بوونیانە، وە كلیلی كردنەوەی دەرگایە بۆ زیاد بونیان..

بێگومان پێچەوانەكەشی ڕاستە،كە هەر كاتێك كەسێك توشی زەرەر و زیانێك هات و ناشوكری كرد، ئەوە خراپتری لێ بەسەر دێت... ڕوداوێكی واقعیتان عەرزدەكەم: كابرایەك خاوەنی مەڕ و ماڵاتێكی زۆر دەبێت، دوو كوڕی بەژن و ماڵیشی دەبن، ساڵێكیان لە زستاندا مەڕ و ماڵاتەكەی نەخۆشی تێ دەكەوێت و قڕان دەكات، وە لە بەهاریشدا لافاو لە كشتوكاڵ و فەلاحەتیەكەی دەدات و هیچی نامێنێت. خەڵكی بۆ دڵنەوایی دەچنە لای و پێی دەڵێن: خوا ئەجرت بداتەوە و خوا لەوە ساردتر نەكات. كابرای مەڕوماڵات و كشتوكاڵ فەوتاو لەجیاتی بڵێت شوكر بۆ خوا، وتی: بۆچی خوا لەوە ساردتریشی لایە، بۆچی چی ماوە پێم بكات؟! بەڵێ، پەنا بەخوا ئەم كوفرە و ئەم ناشوكریەی كرد و ساڵان هاتن و چوون و كابرا ئەم قسە نابەجێ و بۆگەن و ناشوكریەی خۆی لەبیر چۆیەوە، بەڵام لای خوا تۆمار كراوە و خوای گەورە تۆڵە لە ناشوكری كاران دەستێنێت، ڕۆژێكیان كوڕە گەورەكەی دەچێت بۆ دێیەكی دراوسێیان بۆ باراش هاڕین، (لەو سەردەمەدا

ئاشی ئاو هەبووە). کوڕە گەورە کە دەچێت بۆ ئاش بە ماڵەوەیان دەڵێت: لەوانەیە هەر وەکو جاران ئاشەکە قەرەباڵغ بێت و سەرەم بەر نەکەوێت، جا ئەگەر نەهاتمەوە سەردانێکی ماڵی فلانە کەس دەکەم و بەیانی بە ئیسراحەت دێمەوە، بەڵام کاتێك دەگاتە ئاشەکە تەماشا دەکات ئەو ڕۆژە کەسی لێ نیە و باراشەکەشی لێ دەکات و خۆی بە خۆی دەڵێت: باشە بۆ بمێنمەوە؟!. دەگەڕێتەوە بەرەو ماڵەوەو نزیك ماڵ نوستنان دەگاتە ماڵەوە و دەچێت لەلای خێزانەکەیەوە دەخەوێت. خانوی ئەم کوڕە بەتەنیشت ماڵی باوکیەوە دەبێت، ئەوا نیوەشەوە و مانگەشەوە، و باوکی کوڕەکە لە ماڵی خۆیان هەڵدەستێت بۆ کاری سەرئاو، تەماشا دەکات وا پیاوێك لە تەنیشت بوکەکەیەوە خەوتووە: هیچ خەیاڵی بۆ ئەوە ناچێت کە ئەوە کوڕەکەی خۆیەتی و لە ئاش گەڕاوەتەوە، یەکسەر بانگی کوڕەکەی تری دەکات و پێی دەڵێت: کوڕە وەرە، واپیاوێك لە تەنیشت براژنتەوە خەوتووە با بڕۆین بیکوژین!.. باوکەکە لەم لاوە دەوەستێت و دەست بە خەنجەر و کوڕەکەی دەچێتە سەر برا گەورەکەی و بە خەنجەر دەیکوژێت، کاتێك دەم و چاوی کابرای کوژراو لا دەبات، سەیر دەکات برا گەورەکەیەتی، ژن و منداڵ هاوار دەکەن و دەزیرێنن. لە تاوان کوڕە بچوکەکە ڕادەکات بۆلای باوکی، باوکیشی وا دەزانێت ئەوە پیاوە ناپاکەکەیە و بەخەنجەر پەلاماری دەدات و دەیکوژێت، لە یەك شەو و لە چەند دەقیقەیەکدا هەردوو کوڕەکەی لەناو چوون بە دەست و قسەی خۆی.! هەردوو بوکەکەی بێوەژن کەوتن و کۆمەڵێك منداڵی زۆری بە هەتیوی بەسەردا کەوتن، ئەمە جگە لەو بەسەرهاتە دڵتەزێنەی کە بەسەریان هات و حەزی نەدەکرد کەس بیبیستێت.!.. جا ئەمەیە سەرەنجامی ناشوکری و خوای گەورە نیشانی دا کە بەڵێ خوای گەورە دەتوانێت زۆر لەوە خراپتریشی بەسەردا بهێنێت، کە کاتی خۆی دەیوت: بۆ لەوەش خراپتر هەیە کە خوا بەسەرم بهێنێت؟!.

ئیمانداران: بەڕاستی ناشوکری لەسەر ئاستی کۆمەڵگاش هەر لەناوبەرە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ﴾ النحل:١١٢. واتە: خوای گەورە نمونەی هێناوەتەوە بە خەڵکی شارێك کە هێمن و دڵنیا بوون، ڕزق و ڕۆزی زۆری بۆ دەهات لە هەموو شوێنێکەوە کەچی بەرامبەر چاکە و بەهرەکانی خوا ناسوپاس و سپڵە بوون، جا خوای گەورە بەو هۆیەوە پۆشاکی برسێتی و ترسی کرد بەبەر خەڵکەکەیدا لەبەر ئەو کردەوانەی کە دەیانکرد.

بەڕێزان: با بەووردی سەیری ئایەتەکە بکەین کە چەند وشەیەکی زۆر سەرنج ڕاکێشی تێدایە، دەفەرموێت: (آمِنَةً) ولاتێکی هێمن، (مُطْمَئِنَّةً) دڵیشیان ئاسودە بوو، وە دەفەرموێت: (لِباسَ) ، فعْلاً زۆر ولات شەڕ و جەنگ بۆی بۆتە بەرگ و لێی نابێتەوە، وە باسی (الجُوعِ و الخَوف) ترس و برسیەتی دەکات کە بەڕاستی ئەم دوانە ژیانی ناخۆش کردووە، و دەفەرموێت: (بِما كانوا يَصنَعُون) کەواتە: ناشوکری بەکردەوەیان کرد و کردەوەی خۆیانە دێتەوە ڕێگایان.

بەڵێ، خوای گەورە دەفەرموێت: (ئەو شار و وڵات و مەملەکەتە خوای گەورە دوو خەڵاتی گەورەی پێبەخشیبوون، ئەوانیش: ئەمن و ئەمان لەگەڵ ئابووری باش، بەڵام لە جیاتی شوکر و سوپاسی خوا ناشوکرییان دەکرد، خوای گەورە ئەو ئەمن و ئەمان و تێروتەسەلی و گیرفان و مەطبەخ گەرمیەیانی بۆ گۆڕین بە ترس و تۆقاندن لەگەڵ برسیەتی و نەداری و هەژاری ).

**بەڵێ، خوای گەورە زوڵم لە کەس ناکات و خۆشی و خەڵاتەکان لە هیچ گەل و نەتەوەیەك ناسەنێتەوە تاوەکو بۆخۆیان دەست نەکەن بە ناشوکری، ئەمجا خوای گەورە وەزع و حاڵیان لێ دەشێوێنێت، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِّعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَىٰ قَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا۟ مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ الأنفال:٥٣. واتە: بەڕاستی خوای گەورە هیچ بەهرە و خەڵاتێك ناگۆڕێت کە بەخشیویەتی بە هەر هۆزێك تا ئەوەی لەخۆیاندایە نەیگۆڕن، وە بەڕاستی خوای گەورە بیسەری زانایە.**

**هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَ إذا أرَدْنا أنْ نُهْلِكَ قَرْيَةً أمَرْنا مُتْرَفيها فَفَسَقُوا فيها فَحَقَّ عَلَيها القَوْلُ فَدَمَّرْناها تَدْميراً ﴾. واتە: ئێمە شار و وڵات و ئاوەدانیەك وێران ناکەین هەتا دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار و خۆش گوزەرانەکانیان ڕوونەکەنەوە فەسادی ئیداری و ئەخلاقی و داوێن پیسی، ئەوسا شایەنی عەزابی خوا دەبن و خوای گەوردش بە هیلاکیان دەبات.**

**واتە ئێمە هیچ شار و وڵات و ئاوەدانیەك وێران ناکەین هەتا دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار و خۆشگوزەرەکانیان ڕوو نەکەنە فەسادی ئیداری و ئەخلاقی و داوێن پیسی ئەوسا شایەنی عەزابی خوا دەبن خوای گەورەش بەهیلاکیان دەبات**

**بەڕاستی ئەگەر سەیری وڵاتی خۆمان وە مێژووی گەل و میللەتان بکەین بە واقعی ئەم حەقیقەتە قورئانیەمان بۆ ئاشکرا دەبێت**

**بەڵێ بەڕێزان سەرەنجامی دووەمی ناشوکری ئەوەیە: هەرکەسێ شوکری خوا نەکات دەکەوێتە داوی شەیتانەوە. هەروەکو دوای ئەوەی کە شەیتان بەهۆی سەرپێچی و تاوان و خۆبەزلزانیەوە دوور خرایەوە لەڕەحمەتی خوا ، شەیتان ووتی﴿ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِى لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ**

ٱلْمُسْتَقِيمَ ۞ ثُمَّ لَآتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَـٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ ۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَـٰكِرِينَ ﴾ الاعراف: ١٦-١٧ .

واتە : شەیتان ووتی ئەی پەروەردگار بەهۆی ئەوەوە کە گومڕات کردم ( گومڕابوونی خۆی پاڵ دایە لای خوا) ئەوا بێگومان منیش بۆ ئادەم و نەوەکانی دادەنیشم لەڕێگا ڕاستەکەی تۆدا ئینجا سوێند بێت بێگومان بۆیان دەچم لە پێشیانەوە و لە دوایانەوە ، لەلای ڕاستیان و لەلای چەپیانەوە ئەوسا نابینیت زۆربەیان سوپاسگوزار بن .

بەڵێ شەیتان لەبەردەمتەوە بۆت دێت و پێت دەڵێت: ئاها تۆ چەند دەست کورتی ، چەند هەژاریت لەچاو خەڵکدا ، بۆ ئەوەی لەم ڕێگایەوە توشی ناشوکریت بکات .

وە شەیتان لە پشتەوە بۆت دێت بەوەی کە خەفەتی ڕابردوت بیر دێنێتەوە و پێت دەڵێت بیر بکەرەوە بزانە چیت لە دەست چوو ، ئاها ئەگەر ئەو معامەلە حەرامەت بکردایە چۆن وەکو فلان کەس دەوڵەمەند دەبوی ، تاوات لێ دەکات بەدڵ ناشوکری دەکەیت و بەبەشی خوا ڕازی نابیت.

لەلای ڕاستەوە بۆت دێت و پێت دەڵێت دونیا بەری دوور و درێژە ، ئاها خەڵك چۆن دەوڵەمەند بوو ،بەس تۆ هەژاری ئەی بەیانی بەچی ژن بۆ کوڕەکەت دەهێنیت ، ئەی ئەگەر معاشەکەت ببڕن بەچی دەژیت ، واتە دواڕۆژت لا تاریك دەکات ، وات لێ دەکات دڵ تەنگ دەبیت و قەناعەتت نامێنێت و شوکری خوات لەبیر دەباتەوە لەسەر ئەوەی کە هەتە ، وا دڵت تەنگ دەکات کە وادەزانی کەهیچت نیە.

بەڕاستی شەیتان زۆربەمانی گرتووە و وای لێکردوین کە شوکر نەکەین

ئەی باشە چارەسەر چی یە ؟! چار ئەوەیە بڵێ ی خوایە هەزار جار شوكرت دەكەم لەسەر ئەوەی كە ڕۆشتووە ، دیارە بۆ من وا باش بووە و كاری تۆ بێ حیكمەت نی یە.

وە ئەی خوای پەروەردگار داوات لێ دەكەم كە لە داهاتوودا لە فەزڵ و كەرەمی خۆت بێ بەشم نەكەیت، وە بەرەكەت بخەیتە ئەوەی ئێستا هەمە و دڵم پڕ لە قەناعەت و شوكرانە بژێری خۆت بكەیت.

ئیمانداران: سەرەنجامی سێیەمی ناشوكری ئەوەیە: ئەم گەردونە كە هەمووی لە خزمەتی تۆدایە، هەر ئەو شتانەی كە بۆ خزمەتی تۆ دروست كراون،بەهۆی سەرپێچی و تاوان و ناشوكریەوە دەبن بە نیقمەت و لەناوبەر، بۆ نمونە: (با) با: بە هەزاران سودی هەیە، ئەگەر ئەو (با)یە نەبوایە دونیا بۆگەنی دەكرد، وە زۆرێك لە گوڵەكان بەهۆی (با)وە تۆوی نێرە دەگاتە مێیە، وە بەهۆی (با)وە هەورە نێر و مێیەكان بە یەك دەگەن و باران دەبارێت، ئەم هەوایەی دەوری زەوی لەگەڵ زەویدا دەجوڵێت و لێ ی جیا نابێتەوە، بۆیە هەوایەكی نەرم و خۆشمان بۆ دێت. خۆ ئەگەر ئەم هەوایە لە جوڵەدا لە زەوی جیا ببێتەوە، ئەوا گەردەلولێك دروست دەبێت كە خێراییەكەی دەگاتە (١٦٠٠) كیلۆمەتر لە سەعاتێكدا، لەكاتێكدا ئەبێت ئەوە بزانین كە بەهێزترین گەردەلوول كە هیچ شتێك لەسەر زەوی ناهێڵێت، خێراییەكەی لە (٨٠٠) كیلۆمەتر لە سەعاتێكدا تێ ناپەڕێت، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەركاتێك (با) هەڵی بكردایە دەیفەرموو: (اللّهُمَّ اجْعَلْها رِياحاً و لا تَجْعَلْها رِيحاً). بەڵێ، هەر ئەو (با)یەی كە سەبەبی بوژاندنەوەی ژیان و ژینگەیە، ئەگەر خوای گەورە مەیلی لێ بێت، دەیگێڕێت بە سەبەبی بە هیلاكچون و لەناوبردن. وەكو قەومی عاد، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ

عَاتِيَةٍ ۞ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴾ الحاقه:٦-٧.

**واتە: وە گەلی عادیش لەناوبران بە بایەکی سەختی ساردی بەتینی بە گرمە، خوا زاڵی کرد بەسەریاندا حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بە بێ وچان لەناوی بردن، ئەو گەلەت دەبینی لەو ماوەیەدا بێ گیان کەوتبون، وەك قەدی دارخورمای گەندەڵ.**

**وە خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ الروم:٤٦. **واتە: وە لە نیشانەکانی گەورەیی ئەو خوایەیە کە چەند بایەکی مژدەدەر** (بە بارینی باران) **دەنێرێت، بۆ ئەوەی هەندێك لە (بارانی) بەزەیی خۆیتان پێ بچێژێت و بۆ ئەوەی کەشتیەکان بە فەرمانی خوا (بەو بایە) بڕۆن و بگەڕێن. وە بۆ ئەوەی بە دوای ڕۆزی ئەو (خوا)دا لە دەریادا تا شوکرانە بژێری خوا بن..**

**یان باران بارین، خوای گەورە دەفەرموێت:** ﴿ فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ الروم:٥٠.

**واتە: سەیری ئاسەواری (پەیدابوان) بە بارانی خوا بکە وەك کشتوکاڵ و درەخت گژوگیا و درەخت، چۆن زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردن و وشك بوونی، بەڕاستی هەر ئەو خوایە زیندوکەرەوەی مردوانیشە، وە هەر ئەویش بە دەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا.**

بەڵێ، هەر ئەو باران بارینە ئەگەر خوای گەورە بیگرێتەوە، ئەوا مرۆڤ و هەموو زیندەوەران بە هیلاك دەچن، خۆ ئەگەر لە حەدی خۆی زیاتر باری، دەبێت بە لافاو و وڵات وێران دەکات. هەر بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکاتێك باران بباریایە دەیفەرموو: (اللّهُمَّ اجْعَلْها سُقْيا رَحْمَةٍ و لا تَجْعَلْها سُقيا عَذابٍ). واتە: خوایە گیان ئەم بارانە بگێڕیت بە مایەی خێر و بەرەکەت و ڕەحمەت بۆمان و نەیگێڕیت بە مایەی عەزاب و وێرانکردنمان و لەناو بردنمان.

بەڵێ بەڕێزان: ساڵانە بە چەندەها لافاو بە ملیارەها زەرەر و زیان دەدات، بۆ نمونە:

١.مردنی (دە) ملیۆن کەس بەهۆی وشکە ساڵی و بێ بارانی لە هیندستان لە ساڵی (١٩٩٧)ی زاینیدا.

٢.مردنی (چوار) ملیۆن کەس بەهۆی لافاوەکانی ڕوباری (هوانج) لە چین لە ساڵی ١٩٣١ی زاینیدا.

٣.مردنی (یەك) ملیۆن کەس بەهۆی لافاوەکانی ڕۆژهەڵاتی پاکستان لە ١٩٧٠ دا.

بەڵێ، هەر بەهۆی ئەو خەڵات و بەهرانەوە کە دونیا ئاوەدان دەکەنەوە، بەهۆی ناشوکریەوە خوای گەورە دەیانکات بە هۆکاری لەناو چوون و وێران بوونی سەر زەوی و دانیشتوانی.

سەرەنجامی چوارەمی ناشوکری ئەوەیە: باری ئابووری ئەو وڵاتە دەڕوخێنێت، ئەگەر سەرنجی قورئانی پیرۆز بدەین بۆمان دەردەکەوێت کە خوای گەورە دوو کۆڵەکەی ئابوری باس دەکات:

یەکەمیان: کشتوکاڵ و زەوی و زار و باخ و باخاتە.

دووەمیان: ئاژەڵ و ئاژەڵداری و بەرهەمەکانیان.

لە بارەی ئاژەڵ و بەرهەمەکانی ئاژەڵەوە قورئان دەفەرموێت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا خَلَقْنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتْ أَيْدِينَآ أَنْعَـٰمًا فَهُمْ لَهَا مَـٰلِكُونَ ۞ وَذَلَّلْنَـٰهَا لَهُمْ فَمِنْهَا رَكُوبُهُمْ وَمِنْهَا يَأْكُلُونَ ۞ وَلَهُمْ فِيهَا مَنَـٰفِعُ وَمَشَارِبُ أَفَلَا يَشْكُرُونَ ﴾ يس: ٧١-٧٣.

واتە: ئایا نەیاندی (نەیان زانیوە) کە بێگومان بە دەستی خۆمان ئاژەڵمان بۆ درووست کردوون ئەنجا ئەوان خاوەنیانن، وە ڕامان هێناون بۆیان، ئەنجا سواری هەندێکیان دەبن و گۆشتی هەندێکیشیان دەخۆن، وە زۆر سودیان لێ دەبینن و شتی خواردنەوەشیان لێ وەردەگرن، دەی ئایا سوپاسی خوا ناکەن.

بەداخەوە ئێمە ئێستا توشی ناشوکری بووین بەوەی پێمان عەیبە بڵێین خەریکی بەخێوکردنی مەڕ و مالاتین، شوانی بۆتە عەیبە و نیشانەی دواکەوتویی،ماڵێك ئاژەڵی تێدا بەخێو بکرێت بەسوك سەیر دەکرێت، کەچی قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴾ النَّحل:٦.

واتە: وە بۆ ئێوە هەیە لەو ئاژەڵانەدا دیمەنی جوان و ڕازاوە، کاتێك دەیان هێننەوە لە لەوەڕگا و کاتێکیش دەیان بەن بۆ لەوەڕگا.

ئەوەتا بەرهەمی ناشوکری دەبینین چۆن لادێکانمان بەرە و چۆڵی دەڕۆن، لەم وڵاتەدا کە باشترین شوێنی بەخێو کردنی ئاژەڵە، پەنیر و ماست و دۆمان لە وڵاتانەوە بۆ دێت!!. خەڵکی دانیشتوی لادێ ماستی ئێرانی دەخوات!..

ئێمەی ئیماندار ئەگەر تەماشای قورئان بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە چەند گرنگی بە ئاژەڵ دراوە، گەورەترین سوڕەتی قورئان ناوی (البَقَرَة)یە،

ئایا کوا بەرهەمی مانگا و ڕەشە ولاخمان؟! سورەتێکی گەورەی قورئان ناوی (النَّحل)ە، بەلام کوا بەرهەمی مێش هەنگمان؟! بەڕاستی ناوی ئەو سورەتە پیرۆزانە وەکو ئەوەیە کە پێمان بفەرموێت: (ئەی ئینسان ئەگەر ئەتەوێت ژیانت خۆش ببێت، پشت لە ئاژەڵداری مەکە..)، سەرجی سورەتی (النَّحل) بدەن کە زۆربەی بەخشش و خەلاتەکان کە خوا بە مرۆڤی بەخشیون وا لەو سورەتەدا باس کراون، خوای گەورە لەگەڵ باسی دروست کردنی مرۆڤدا کە دەفەرموێت: ﴿خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٖ﴾ ئایەتی:٤. لە ئایەتی دوای ئەوەدا باسی ئاژەڵداری دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡأَنۡعَٰمَ خَلَقَهَاۗ لَكُمۡ فِيهَا دِفۡءٞ﴾. وە دواتر دەفەرموێت: ﴿وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴾ ئایەتی:٨. دوای ئەوە باسی باران بارین و کشتوکاڵ دەکات و دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ۝ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ﴾ ئایەتی:١٠-١١. دوای ئەوە لە ئایەتی (١٤) دا باسی بەحر و دەریا دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ فَضۡلِهِۦ تَلۡبَسُونَهَا﴾. لە کۆتایشدا دەفەرموێت: ﴿وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾..

سُبحان الله لە گەورەیی ئەم قورئانە، لە (دە) ئایەتی سورەتی (النَّحل)دا باسی مرۆڤ و کۆڵەکەکانی ژیانی ئابووری باس دەکات، باسی (ئاژەڵدای + کشتوکاڵ + دەریاو بەرهەمەکانی و کەشتیوانی) هەمووی یەك لە دوای یەك

باس دەکات و ئەوەشمان پێ ڕادەگەیەنێت: هەر کەسێك ئەمانەی پشت گوێ خست، ئەوا ژینی گران و چاو لە دەستی خەڵکی بە نسیب دەبێت و ئەوە کەسێکی ناشوکرە و خوای گەورە کەس و گەل و میللەتی ئاوای خۆش ناوێت و بەرەکەتیان بەسەردا ناڕێژێت.

وە هەروەها لە سورەتی (یس)دا لە ئایەتی (٣٣) تا ئایەتی (٣٥) باسی باخ و ڕەز و بەرهەمی کشتوکاڵمان بۆ دەکات و دەفەرموێت: ﴿لِيَأْكُلُوا مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ ۖ أَفَلَا يَشْكُرُونَ﴾. بەلام ئەمڕۆ زۆرێك لە موسڵمانان فەلاحەتیان پێ عەیبەیە

و خەڵکی خاوەن ئاو و زەوی و زار هەموو پێویستیەکانی ژیانی ڕۆژانەی کە کشتوکاڵین لە وڵاتانی دەرەوە بۆ دێت. ئێمە کشتوکاڵمان پشت گوێ خستوە، ئەو کشتوکاڵەی کە لە بارەیەوە وتراوە (إنَّ الزُّراعَ لَو سَمِعَ مَنْ يَقُولُ نَأكُلُ مِنهُ حِينَ زراعته، لَمْ يُزْرَعْ شَيئاً لكَثْرَةِ مَنْ يَقُول: نَأكُلُ مِنْهُ).

واتە: ئەگەر جوتیار گوێی لێ بوایە کە لە کاتی چاندن و ناشتنی کشتوکاڵ و فەلاحەتیەکەیدا چەند شت هاوار دەکەن و دەڵێن: ئێمە هەموومان لەم کشتوکاڵە دەخۆین، ئەوا هیچی نەدەچاند و هیچی نەدەڕواند لە ترسی ئەو هەموو زیندەوەرەی کە خۆی ئامادە کردووە بۆ خواردنی ئەو کشتوکاڵە و بەرهەمەکەی.. دەیوت: باوەڕناکەم بۆخۆم هیچم بۆ بمێنێتەوە!!.

ئیمانداران: بەداخەوە بەهۆی دابڕانمان لەم قورئانە کە هەموو خێر و بێر و ئاوەدانی وڵات و میللەتی تێدا بەیان کراوە، ئەوە حاڵی ئابووریمانە و گاڵتەمان بە خۆمان دێت ڕۆڵەی کورد لە بیارە و هەورامانە و گوێزی ئێرانی

دەخوات، لە قەندیلە و هەنگوینی سعودی دەخوات. لە قەراغ و شارەزووره و لۆکەی لە سوریاوە بۆ دێت!! لە لادێ دەژی و دۆی ئێرانی و پەنیر و کەرەی تورکی بەکار دەهێنێت!!. ئەوە مەگەر هەر ئابووری ناسەکان بزانن چ خەتەرێکی گەورەیە، ئەمەش دوو هۆی هەیە:

یەکەم: ناشوکری خۆمان بە زەوی و زار و ئاژەڵمان، کە ئەوەی هەشیەتی زۆربەی لێی بێزارە و هەر دەڵێت: خوا بیبڕێت.

دووەم: دەوڵەت و حکومەت و لایەنی پەیوەندیدار بە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە، کە ئەوەی حکومەت دەیدات بە گۆڕانی بێژ بیدات بە جوتیار وفەلاح، ئەویش دڵی بە بەرهەمەکەی خۆش دەبێت، لە جیاتی ئەوەی بیکات بە موچەخۆرێکی نزم، بۆدجەی بۆ دابین بکات و پارەی بۆ صەرف بکات بۆ ئاوەدان کردنەوە و بوژاندنەوەی زەوی و زارەکەی.

لە کۆتاییدا دەڵێم: بەزەیی خوا بە هەر گەل و نیشتیمان و نەتەوەیەك بەندە بە ڕادەی شوکرانە بژێری ئەو گەل و میللەتەوە، بە تایبەت چینی دەسەڵاتدار و سەرۆك.

لە سەردەمی (عبدالرحمن الداخل)دا کە یەکێك بوو لە دەسەڵاتدارەکانی ئەندەلوس، باران نەدەباری. خەڵکی چونە لای قازی وڵات کە ناوی (مُنْذري کوڕی سەعیدی بلوطي)بوو، وتیان: ئەی ئیمام بەڵکو لە خوا بپاڕێیتەوە کە خوا ڕەحممان پێ بکات و بارانمان بۆ ببارێنێت. قازیش ناردی بەدوای (عبدالرحمن الداخل)دا و فەرموی: وەرە لەگەڵمان بۆ نوێژە بارانە، کە چونە دەشت و دەرەکە و دەستیان کرد بە دوعا و پاڕانەوە. قازی وتی: ئەی پێشەوای موسڵمانان، ناوچەوانی خۆت لەسەر زەوی دابنێ و یەکەم جار تۆ

بە زەلیلی لە قاپی خوا بپارێرەوە، چونکە ئەگەر تۆ زەلیلی و ملکەچی خۆت بۆ خوا دەربڕیت، ئەواخوای گەورە بەزەیی پێماندا دێتەوە و دەرگای رەحمەتمان لێ دەکاتەوە.. بەڵێ، خەلیفە سەری خستە سەر زەوی و وتی: ئەی خوای گەورە، ئەگەر لەبەر تاوانەکانی من بارانت لەم موسڵمانانە گرتۆتەوە، ئەوا من زەلیلی بەردەستی تۆم، خوا بەزەییت بە منیش و بەم میللەتەشدا بێتەوە و بارانمان بۆ ببارێنە.. قازی فەرموی: دەی خەڵکینە بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆتان، دڵنیا بن ئێستا باران دەبارێت.!. خەڵکەکە وتیان: بەچی دەزانیت؟! قازی فەرموی: چونکە (إذ ذَلَّ جَبَّارُ الأرضِ، رَحِمَهُ جَبَّارُ السَّماء. . . ). واتە: ئەگەر گەورەی زەوی مل کەچ بوو ئەوا گەورەی ئاسمان بەزەیی دەنوێنێت. بێگومان خوای گەورە بەزەیی بەویش و میللەتەکەشدا دێتەوە.

کەواتە ئەی ئیمانداری بەڕێز: لە هەموو ژیانتدا هەر شوکری خوا بکە:

۞ کاتێك لە دەست خراپەکاران ڕزگارت بوو، سەربەستی و ئازادیت وەرگرت، وەکو نوح ﷺ بڵێ: ﴿فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾ المؤمنون:٢٨.

۞ کاتێك کە خوا ئەولادی صاڵحی پێ بەخشیت وەکو ئیبراهیم ﷺ بڵێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَـٰعِيلَ وَإِسْحَـٰقَ ۚ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ﴾ ابراهيم:٣٩.

۞ کاتێك عیلم و زانیاری و دەسەڵات و فەنمانڕەواییت لە دەستدا بوو. وەکو داود ﷺ و سولەیمان ﷺ بڵێ: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ النمل:١٥.

موسڵمانی بەڕێز: بەڕاستی جێگەی خۆیەتی هەر لە نێوانی چەند ڕۆژێکدا کاتێك بۆخۆت دیاری بکەیت، کە بەتەنها دابنیشیت و عیبادەتی گەورەی شوکرانە بژێری ئەنجام بدەیت، بیر بکەرەوە: چەند جار نەخۆش کەوتویت و خوای گەورە شیفای داویت.

چەند بەلا و موصیبەت ڕۆژی ڕوناکیان لێ تاریك کردویت و خوای گەورە دەرگای خێری لێ کردوویتەوە و ڕزگاری کردویت.

چەند جار هەژار و نەدار و قەرزار بوویت خوا بە لوتفی خۆی دەرگای ڕزق و ڕۆزی لێ کردویتەوە و لە هەژاری و قەرزاری ڕزگارت بووە.

چەند جار خوای گەورە بە سەری کردویتەوە بە نەخۆشی و ناخۆشی بۆ ئەوەی لە گوناهەکانت پاکت بکاتەوە.

بیر بکەرەوە لە شای هەموو خەڵاتەکان کە ئیمان و خواناسی یە، کە خوا پێی خەڵات کردوویت و ئیمانت بە نسیب بووە، لە کاتێکدا چەند ملیار خەڵك لە کوفر و بێ باوەڕیدا خنکاون.

چەند پێویستە بەووردی سەیری ئەندامەکانی لاشەی خۆت بکەیت کە ساغ و سەلامەتن، لە کاتێکدا بە ملیۆنەها خەڵك هەیە ئەندامی لاشەی لەدەست داوە.

بیر لە دەسەڵاتی ئەو خوایە بکەرەوە کە: هەرچەندە گوناە دەکەیت، کەچی ئەو لە ڕەحمەتی خۆی بێ بەشت ناکات.. بێ شەرعی دەکەیت، کەچی کە داوای لێ خۆشبوونت کرد لێت خۆش دەبێت و بە چاوتا ناداتەوە، بەو زمانە درۆ و قسەی ناڕەوا دەڵێیت، کەچی لاڵت ناکات... بەو گوێیانە گوێ لەو قسە و باسانە دەگریت کە خوا حەرامی کردون، کەچی کەڕت ناکات.. بەو چاوانەت تەماشای نا شەرعی پێ دەکەیت، کەچی نابینات ناکات.. بە شێوەنەها بەخششی بەسەرتەوەیە و هەرگیزا و هەرگیز ناتوانیت پەی بە هەموویان ببەیت و بیانژمێریت، کەچی سوپاسیشت نەکردووە لەگەڵ ئەوەشدا لێت ناسەنێتەوە، دەکەواتە ئێستا و بەردەوام پڕ بە دڵت بە هەموو هەست و هۆشت، بە ناخ و گیانتەوە بڵێ: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾

**سەرچاوەکان:**

١.قورئانی پیرۆز.

٢.پوختەی تەفسیری قورئان – محمد مەلا صالح.

٣.الخِطابة المنبريَّة – خالد سَيِّد علي – ص٤٩٢.

٤.آيات الله في الآفاق – د. محمد راتب النابلسي – ص١٣١.

٥.مُختارات مِنْ خُطَب الجُمُعة – د.محمد سعيد رمَضان البُوطي – ج١ – ص٩٠.

٦.لا تَحْزَن – محمد عبدالعاطي بحيرى – ص٣٣١.

٧.سلوكيات المرأة المُسلِمة في الاسلام – محمد عبد العاطي بحيري – ص٣٦.

# وتاری دووەم بۆ مانگی ربیع الاول

## یادی لە دایک بوونی پێشەوا و پێغەمبەرمان حەزرەتی محمد صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم

# وتاری دووەم بۆ مانگی ربیع الاول

## یادی لە دایك بوونی پێشەوا و پێغەمبەرمان حەزرەتی محمد ﷺ

( الحَمدُ للّٰهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

ئیماندارانی بەڕێز: ئەی ئەو کەسانەی کە بە تامەزرۆییەوە چاودێری یادی لە دایك بوونی پێغەمبەری خۆشەویست و بیلبیلە و نوری چاوانن، وا سوپاس بۆ خوا گەیشتینەوە مانگی مەولود و دڵ و چاوی ئیمانداران گەشایەوە و کرایەوە بەو بۆنە و موناسەبەتە گەورە وپیرۆزە.

خۆشەویستان: خوای گەورە خۆی ناوێکی تایبەتی لەم مانگە ناوە (رَبيع الأوَّل) بەهاری یەکەم سەرەتای بەهار، واتە: چۆن دونیا بە بەهار ئەڕازێتەوە و دەبوژێتەوە، ئاوا مرۆڤایەتی بە ویلادەتی فەخری عالەم ﷺ بوژایەوە و گەشایەوە و لە بەستەڵەکی زوڵم و ستەم ڕزگاری بوو.

بەڕاستی (رَبيع الأوَّل) بەهارە، بەهارە بۆ دڵەکان،بۆ ڕۆحەکان، بۆ ویژدانە زیندووەکان، مانگی بەهاری یەکەم واتە: بەهاری جوانی بەهاری چاکی و پاکی، بەهاری بەرزی و بڵندی، ئومێدەوارم لەم مانگەدا بە دڵ و بە گیان بڵێین و لەگەڵ وتنیدا هەموو ناخ و هەستمان بجولێت کاتێك دەڵێین: بەرز و بەڕێز بێت یادی لەدایك بوونت ئەی سەرداری مرۆڤایەتی، لە یادی لەدایك بونتدا پەیمان تازە دەکەینەوە بۆ سوربوون لەسەر ڕێبازەکەت، مژدە دەدەینە ڕۆحی زیندوت کە پەیامی ئیسلامەکەت ناسنامەی میلەتی کوردە، ئەی خۆشەویستمان، وا گەورە و بچوکی ئەم میللەتە شاگەشکە و خۆشحاڵە بە هاتنەوەی مانگی مەولودی تۆ، گوێ بگرە ئەی سەروەرەکەم:

من دەنگێکی زۆر بڵندی

پێنج پارچەکەی کوردستانم

لە یادی لە دایك بوونتدا

بە نوێنەرێتی (سی) ملیۆن

مەردە کوردی ستەم دیدەی هاوزمانم

زۆر تامەزرۆی دیدارم و

عەودالانە و بە خێرایی

ئەمڕۆ بۆ خزمەتت هاتم

تا لە بری تێکڕای گەلم

بڵێم : قوربانی ڕێگاتم

یادی بوونت هەر پیرۆز بێت

پڕ لە شکۆ و جیلوەدار و

پڕ لە سۆز بێت

بەو ئومێدەی

بەم دیداری یادی بوونە

زیاتر گوڕمات تێ بێتەوە

دڵمان زێدەتر لە جاران

بە ئەوینی تۆی خۆشەویست

پڕ ببێ و گەش ببێتەوە

ئیمانداران: مرۆڤ بە شایەتومان دێتە ناو ئیمان و ئیسلامەوە، شایەتومانیش دوو باڵە: (أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاّ الله) لەگەل (أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُول الله)، هەرکەسێك شایەتی بدات بە (لا اله الاّ الله) بەلاّم لەگەڵیدا نەڵێت (مُحَمَّداً رَسُول الله) نابێتە دارای ئیمان و بەرزی ناکاتەوە و خوای گەورە لێی قبوڵ ناکات، جا بۆ ئەوەی لە مانای شایەتومان بە پێغەمبەری خوا ﷺ حاڵی ببین: ئەبێت ئەو زاتە بناسین، دەبێت ئەو حەقیقەتە حاشا هەڵنەگرە بزانین کە هەرچی خێر و خۆشی سەر زەوی هەیە، بەرهەمی جوهد و ڕەنج و تێکۆشانی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەیە.. هەموو مرۆڤایەتی قەرزاری ئەو پێغەمبەرە بەرزو بەڕێزەیە، هەزاران صەلاّت و سەلامی خوای لەسەر بێت، کە خەبات و جیهادی بۆ هەموو کەس بووە، بۆ خزمەت هەموو کەون بووە، بۆیە خوا دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَـٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَـٰلَمِينَ﴾ الانبياء:١٠٧. کە بێگومان عالەمین غەیری مرۆڤیش دەگرێتەوە.

زانای بەناوبانگ (إبن القيِّم) لە کتێبەکەیدا (جَلاء الأفهام)دا دەفەرموێت: هەموو کەس و هەموو زیندەوەرێك بەر ئەو ڕەحمەتی (للعالمين)ە کەوتووە بەم شێوەیە:

١.شوێن کەوتوانی: بەهۆی شوێن کەوتنی ئەو زاتەوە ڕزگار دەبن لە سزای دونیا و دواڕۆژ، اللّهُمَ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ صَحْبِهِ وَ سلِّم.

٢.دوژمنانی کە شەڕیان لەگەڵ کردووە: بۆ ئەوانیش ڕەحمەتە، چونکە لە ناوچونیان بۆیان ڕەحمەت بووە، لەبەر ئەوەی تا زیاتر بژیانایە زیاتر تاوانبار دەبوون، وە لە دوای کوژرانیان پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لەوەی لاشەیان بشێوێندرێت، فەرموی: نابێت لاشەی کافرە کوژراوەکان فڕێ بدرێت و دڕندە بیانخوات، ئەوەبوو لاشەی کوژراوانی بەدری خستە چاڵەوە و دایپۆشین.

یاخود لەبەر جەنازەی جولەکە هەڵساوە و کە عەرزیان کردوە: قوربان، خۆ ئەوە جولەکەیە، ئیتر بۆچی ڕێزی جەنازەی دەگریت و لەبەری هەڵدەستیت؟. فەرموی: (أَلَيسَتْ نَفْساً؟!) وە فەرمویەتی: کافر و موشریکەکان نابێت لە دوای مردنیان جنێویان پێ بدرێت. وە ڕەحمەتی ئەو ڕەئوف و ڕەحیمە، تەنانەت ئەو کافرانەشی گرتەوە کە بەرد بارانیان کرد، بەرامبەر بەو لارولەوێر و تاوانکارانەش هەر فەرموی: (اللَّهُمَ اهْدي قَومي فَإنَّهُم لا يَعْلَمُون)..

بەڕاستی هەر وشەی ڕەحمەت و هیدایەتی لەسەر زوبان بوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان وشەی نەقمەت و زەحمەت بەرامبەر بە دوژمنانیشی بەسەر دەمیدا نەهاتووە. اللّهُمَ صَلِّ عَلی سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَ عَلى آلِهِ صَحْبِهِ وَ سَلِّم.

٣. ڕەحمەتی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بەو کەسانەی کە ئەهلی کیتاب (گاور و جولەکە) بوون، بەڵام شەڕیان لەگەڵ نەکردووە و لەژێر حوکمی ئیسلامدا ژیاون، بەرامبەر ئەوانەش فەرمویەتی: هەر کەسێك ئازاری ذمی‌یەك (گاور و جولەکەیەك) بدات، ئەوە ئازاری منی داوە!!

بۆیە تا ئێستاش ئەو هەموو گاور و جولەکەیە بە ئەوپەڕی ئازادی بیر و باوەڕ و پەرستگا و دروشمە ئایینیەکانی خۆیانەوە لە وڵاتی موسڵماناندا ژیاون و لەلایەن موسڵمانانەوە هەرگیز وشەیەکی ناخۆشیان بەرەو ڕوو نەکراوە... ئەمەش لەبەر فەرمودەکەی ئەو (رَحمَةٌ للعالَمينَ)یە کە فەرموی: هەرکەسێك ئازاریان بدات، ئەوە ئازاری منی داوە.

٤.ڕەحمەتە بۆ هەموو گەلانی زەوی بە کافر و موسڵمانەوە: کە خوای گەورە لەبەر خاتری حورمەتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ هەموو مرۆڤایەتی پاراستوە لە بەڵای ئاسمانی و زەمینی لەناوبەر کە هەموو دونیا بگرێتەوە

**وەك ئوممەتانی پێشوو، بەڵکو ئەگەر بەڵا لە لایەکی زەوی بدات، لاکەی تری ئاوەدانە بۆ ژیان**

**٥.ڕەحمەت بوو بۆ ئافرەتان: هەر بە لەدایك بوونی یەکەم ئافرەتی کۆیلە کە خاتوو ( ثوەیبە ) بوو، ئازاد کرا لە موژدانەی ئەوەدا کە هەواڵی برد بۆ ئبولەهەب) کە محمد لە دایك بووە، بە پەیامی ئەو (رَحمَةً للعالَمينَ)ە ئافرەت لە زیندە بەچاڵ کردن ڕزگاری بوو، ئافرەتی لە سوکایەتی پێ کردن ڕزگار کرد و فەرموی: (النِّساءُ شَقائِقُ الرِّجال)**

بەڵێ قوربان، یەکەم کەس بوویت تێت گەیاندین

ئافرت لەسەر شانۆی ژینا

خوا ڕۆڵی گەورەی پێ داوە

پایەدارە، خاوەن ڕێزە

بە هاوەڵانت دەفەرموو

چاك بن لەگەڵ ئافرەتانا

چاکترینتان ئەوەتانە، کە لەگەڵ هاوسەریدا چاك بێ

زۆر بە لەبز و نەرم و نیان و دڵپاك بێ

ئافرەتان هاوتای پیاوانن

دایکی نەوەن، قوتابخانەن

خاوەنی مافی خۆیانن . .

٦. پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەت بوو بۆ هەژاران، لە یەك ساتی ژیانی موبارەکیدا ئەو حەقیقەتە سەلما، ئەوەتا کاتێك خاتوو (حەلیمەی سەعدیە) لەبەر هەژاری درەنگ گەیشتە مەککە و یەك منداڵە، دەوڵەمەندی دەست نەکەوت تەنها محمدی هەتیوی بێ باوك و بێ ماڵ نەبێت، بەڵام هەر کە حەزرەتی محمد ﷺ چووە باوەش و ماڵیەوە، بەرەکەت بەسەر حەلیمە و شیری مەمکی و لەوەڕی لەوەڕگای و گوانی ئاژەڵی و سەرتاپای ژیانیاندا ڕژا و ئەو ژیانە کوللە مەرگییەیان گۆڕا بۆ خۆشی و شادی.

٧. پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەت بوو بۆ منداڵان، سەلامی لێ دەکردن، لە باوەشی دەکردن، گاڵتەو گەپی لەگەڵدا دەکردن، دەیفەرموو: (إنّي لأقُومُ في الصَّلاةِ أُرِيدُ أنْ أطُولَ فِيها، فَأسْمَعُ بُكاءَ الصَبِيِّ فَأتَجَوَّزُ في صَلاتي كَراهِيَةَ أنْ أشُقَّ عَلى أُمِّهِ). رواه البُخاري و مُسلم.

واتە: بەڕاستی کاتێك لە ناو نوێژدام و ئیمامەت بۆ پیاو و ژن دەکەم، حەز دەکەم درێژە بە نوێژەکە بدەم، بەڵام کاتێك لە ناو نوێژەکەدا گوێم لە دەنگی گریانی منداڵێك دەبێت لەو کاتەدا نوێژەکە بە پەلە دەکەم چونکە دەترسم ئەو گریانی منداڵە ببێت بە هۆی دڵناڕەحەتی دایکەکەی، کە لە نوێژی جەماعەتدا لەگەڵماندایە.!.

هەزار صەلات و سەلام لە ڕۆحی پیرۆزت ئەی سەرداری پێغەمبەران، کاتێك کە خاتوو حەلیمەی دایەنت مەمکی ڕاستی خستە دەمتەوە و تێرت پێ خوارد، ئەمجا مەمکی چەپیشی خستە ناو دەمت، بەڵام توخنی نەکەوتی بە دەمت بۆ برا شیریەکەت بوو خەمت.

بەڵێ، پێغەمبەری پێشەوا ڕەحمەت و دڵخۆشی دانەوە بوو بۆ هەتیوان، چونکە بۆخۆی بە هەتیوی لەدایك بوو!..

٨.ئەو (رَحمَةٌ للعالَمينَ)ە تەنانەت ڕەحمەت بوو بۆ کاتی جەنگ، کە لە جەنگدا ڕەحم و بەزەیی نیە، لەو کاتەشدا کە ڕووبەڕوی ئەو دوژمنە نەوەستایەوە کە هەموو هێزی خۆی هێنابووە مەیدان، تاوەکو نوری پێغەمبەر و ئیسلام بکوژێنێتەوە، کەچی بەرامبەر ئەو دڵڕەقە دڵ تاریکانەش هەر ڕەحمەتی نواند بەوەی کە ئامۆژگاری سوپای ئیسلامی دەکرد و دەیفەرموو: ئەی هاوەڵانم، ئەی ئەو کەسانەی کە لەپێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا بۆ ئەوە هاتونەتە مەیدان کە (كَلِمَةُ اللّهِ هِيَ العُليا)بێت و بەس، ئاگادارتان دەکەمەوە و بزانن: هەرکاتێك توشی شەڕ بوون لەگەڵ دوژمندا نەوا: (لا تَقتُلُوا وَليداً طِفلاً وَ لا إمْرَأةً، وَ لا شَيْخاً كَبيراً، وَ لا تَغُورن عَيناً، وَ لا تَعْقِرَنَ شَجَراً، إلاّ شجر يَمنَعكم قِتالاً أو يَحجزكم وَ بَينَ المُشْرِكِينَ، وَ لا تَمَثّلُوا بآدَمي وَ لا بَهيمَةٍ وَ لا تَغدرُوا وَ لا تَغلُوا).

واتە: منداڵ مەکوژن، ژن مەکوژن، پیاوی پیر مەکوژن، کانی و سەرچاوە ئاویەکان پڕ مەکەنەوە و تێك مەدەن، دار مەبڕنەوە، تەنها درەختێك نەبێت کە ڕێگای شەڕتان لەگەڵ دوژمن لێ بگرێت. وە لاشەی کوژراوە کافرەکان مەشێوێنن و لوت و گوێیان مەبڕن، وە ئاژەڵ ئازار مەدەن، وە لەناکاو هەڵ مەکوتنە سەر دوژمن، بەڵکو پێشتر ئاگاداریان بکەنەوە و داوای موسڵمان بوونیان لێ بکەن، ئەگەر ئامادە نەبوون، جزیەیان لێ وەربگرن و با بە ئازادی لەسەر دین و بیروباوەڕی خۆیان بژین، ئەگەر ئەوەشیان قبوڵ نەکرد، ئەمجا ئاگاداریان بکەن کە ئامادەی شەڕ بن، وە دزی لە دەستکەوتی شەڕ مەکەن و تاڵانی ماڵی کەس مەکەن.

ئیمانداران: بەڕاستی هەموو مافی مرۆڤی جیهان نەیتوانیوە ئاوا لە چەند وشەیەکی کورتدا مافی بێ تاوانانی جەنگ بەیان بکات و بە کردەوەش لە مەیداندا پیادە بکرێت.. وە ئەوەش وەکو بەڵگەنامەی نێو دەوڵەتی مافی

مرۆڤ بۆ کا ی جەنگ نوسراوە، تەنها هەر چەند وشەیەکی سەر کاغەزە و ڕۆحی بەبەردا نەکراوە و نەچۆتە بواری کار پێ کردنەوە، جەنگە ناوخۆیی و دەوڵەتیەکانیش باشترین سەلمێنەری ئەو ڕاستیەن!..

بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەت بوو بۆ باڵندەکان و ئاژەڵەکان، صەحابیەکان و هەموو ئوممەتەکەی دەرس دا دەدا و دەیفەرموو: ژنێکی داوێن پیس بەهۆی تێر کردنی سەگێك لە ئاو، خوا لێی خۆش بوو، ئافرەتێکیشی خستە دۆزەخەوە کە پشیلەیەکی سجن کرد و خواردن و خواردنەوەی نەدایە و ڕێگاشی نەدا کە بە شوێن خواردن و خواردنەوەی خۆیدا بگەڕێت. وە دەیفەرموو: (لَعَنَ اللّٰهُ مَنْ مَثَّلَ بالحَيْوانِ) رواه البُخاري و مُسلم. واتە: نەفرەتی خوا لەسەر ئەو کەسە بێت کە وێنە بە ئاژەڵ دەکات و کلك و لوت و گوێی ئاژەڵ دەبڕێت.

لەگەڵ صەحابە ئازیزەکاندا بوو، کە چاوی کەوت بە گوێ درێژێك کە دەم و چاوی داخ کرا بوو، هەر خێرا فەرموی: (أما بَلَغَكُمْ أنّي لَعَنْتُ مَنْ وَسَمَ البَهيمَةَ فيِ وَجْهِها أو ضَرَبها فيِ وَجْهِها) رواه ابوداود و صحَحه الألباني. واتە: ئایا من پێم ڕا نەگەیاندوون کە من نەفرەتم کردووە لەو کەسەی کە دەم و چاوی ئاژەڵێك داخ بکات، یان لە دەم و چاوی ئاژەڵێك بدات.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەحمەت بوو بۆ گوناهکاران، بۆ ئەو کەسانەی کە توشی گوناهە گەورەکان بوون، هەر ئەو فەرمودەیە بەسە کە ئافرەتێك زینای کردبوو، وە منداڵیشی لەو زینایە کەوتبۆیە ناو سکی، بەڵام کاتێك تەوبەی کرد و هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، چەند جار ڕووی لێ وەردەگێڕا بۆ ئەوەی واز بهێنێت و کارەکەی لێ ئاشکرا نەبێت، بەڵام کە ئافرەتەکە هەر وازی نەهێنا، ئەمجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: بڕۆرەوە هەتا منداڵەکەت نەبێت مەیەرەوە. پاش منداڵ بوونیشی فەرموی: بڕۆ هەتا منداڵەکە فێری

خواردن دەبێت و پێویستی بە شیر خواردن نامێنێت مەیەرەوە. ئەمجا ئافرەتەکە کە هەر هاتەوەو وازی نەهێنا، فەرمانی دا ڕەجمیان کرد. دوای ڕۆح دەرچوونی فەرمووی: بیشۆن و کفنی بکەن و بۆخۆی نوێژی مردووی لەسەر کرد. کاتێك صەحابەکان هەموویان سەریان سوڕما لەو هەموو ڕەئفەت و ڕەحمەتەی پێغەمبەر ﷺ بەرامبەر بەو ژنە زیناکارە کە منداڵی لە زینا پەیدا کردبوو، وە لە دوای مردنی نوێژی لەسەر کرد، فەرمووی: (لَقَدْ تابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ سَبْعِينَ مِن أهْلِ المَدينَةِ لَوَسِعَتْهُمْ)... بەڕاستی ئەو ئافرەتە زیناکارە تەوبەیەکی وا ڕاست و دروستی کرد و وا گەڕایەوە بۆلای خوای گەورە بە پاکی و بە جوانی، ئەگەر بێت و ئەو تەوبەیەی ئەو دابەش بکرێت بەسەر حەفتا کەس لە دانیشتوانی مەدینە ئەوا بەشیان دەکات.

بەڕاستی ﴿رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ بەهۆی ئەوەوە ڕێگەی بەهەشتمان دۆزیەوە، بەهۆی ئەو چاو ساغەوە لە فێڵ و داوی شەیطان ئاگادار بووین، هەرچی چاکەیە بانگی کردین بۆلای و لە هەموو خراپەیەك پاراستینی.

زانای بەناوبانگ (**حوسەینی کوڕی فەزڵ**) دەفەرموێت: لَمْ يَجْمَعِ اللهُ لأحَد منَ الأنْبياء إسْمَين منْ أسْمائه إلاّ للنَبيِّ ﷺ فَإنَّهُ قالَ فيه:

﴿بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ التوبة:١٢٨.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ الحج:٦٥.

واتە: خوای گەورە بۆ هیچ کام لە پێغەمبەرانی دوو ناوی لە ناوەکانی خۆی نەبەخشیوە تەنها بە حەزرەتی محمد المصطفى ﷺ نەبێت، بەڵام بۆ محمد المصطفى ﷺ ناوی (رؤوف) و (رَحيم)ی کە لە صیفاتە بەرزو بڵندەکانی خۆیەتی کردویەتی بە ناوی محمد ﷺ.

جا بە ڕاستی سەرلێشێواوی و گومڕایی لەوەدایە ئینسان نەچێتە سایەی ئەو ڕەحمەتەوە.

ئیمانداران: لە مانگی مەولوددا با بە خۆماندا بچینەوە و بزانین چەندە بە گوێرەی سوننەت و سیرەتی ئەو خۆشەویستە دێین و دەچین، ئایا چەند لەسەر ئەو بەرنامە شیرینە ماوین کە ئەو سەروەر و سالارە بە خەڵات جێی هێشت لەناوماناندا، کە خۆی دەفەرموێت: (تَرَكْتُكُمْ عَلَى المَحِجَّةِ البَيْضاء لَيْلُها كَنَهارِها لا يَزِيغُ عَنْها إلاَّ هالِك).

واتە: لەسەر بەرنامە و دەستورێك بەجێم هێشتون کە شەوەکەشی وەکو ڕۆژەکەی ڕوناکە، هیچ کەس پشتی تێ ناکات و لێی لانادات مەگەر ئەو کەسەی بە هیلاك چوبێت.

بەڵێ، یەکێك لە نازناوەکانی ئەو پێغەمبەرەمان ﷺ (نور)ە، جا ئەگەر ئینسان لەبەر ئەو (نور)ە دانەنیشێت، ئەوا ئەگەر هەموو گڵۆپ و کارەبای دونیای هەبێت هەر ژیانی تاریکە.

خۆشەویستان: هەموو گەلانی دونیا شانازی دەکەن بە سەرکردەکانیانەوە، بەتایبەتی ئەو سەرکردەیەی کە گەل و نەتەوەیەك لەسەر دەستی ئەو ڕزگاری بووبێت.

جا ئەگەر سەیری ژیانی خۆشەویستمان ﷺ بکەین بۆمان دەردەکەوێت کە بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە بۆ ڕزگار کردنی مرۆڤایەتی، لە هەموو دواکەوتویی و نەهامەتی و کوێرەوەری و کۆیلەییەك، فعلاً مرۆڤایەتی ڕزگار کرد، هەموو بتەکانی شکاند، بتی ناو کەعبە، بتی عەقڵ، بتی فکر و دەرون، مرۆڤی ڕزگار کرد لە پەرستنی دار و بەرد.

صەحابەی بەڕێز و ئازیز (ابو ذەڕی غەفاری ﷺ) لە سەردەمی نەفامی و جاهیلی پێش ئیسلامدا بتێکی لە دار داتاشراوی هەبوو، ڕۆژێکیان ابو ذەر چوو بۆ لای بتەکە بۆ ئەوەی کڕنوشی بۆ ببات و لێی بپاڕێتەوە!! بەڵام تەماشای کرد وا تەڕی بەسەر بتەکەوەیە. ابو ذەر بە چوار دەوری بتەکەدا ڕوانی، هیچی نەبینی و کەسی نەبینی کە ئاوی بەسەر بتە دارینەکەدا کردبێت، تا ڕۆژێکیان خۆی لە پەنایەکدا شاردەوە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسە بدۆزێتەوە کە ئەم بتەی تەڕ دەکات، بەڵام وەختێکی زانی ڕێویەك هات و بە چواردەوری بتەکەدا دەگەڕا و بۆ ئەو خواردنە دەگەڕا کە دەخرایە بەردەم بتەکە بۆ پیرۆز بوون. کاتێك هیچی دەست نەکەوت، چوە سەر ملی بتەکە و میزی پێدا کرد. ابو ذەر کە ئەمەی بینی وتی:

رَبٌّ يَبُولُ الثُّعْلَبانُ برَأسه لَقَد ذَلَّ مَنْ بالَت عَلَيه الثَّعالبُ

فَلَو كانَ رَبّاً كانَ يَمْنَعُ نَفْسَهُ فَلا خَيْرَ في رَبٍّ نَأَتْهُ المَطالبُ

بَرِئْتُ منَ الأَصنامِ في الأرضِ كُلِّها و آمَنْتُ بالله هُوَ غالبُ

واتە: خودایەك کە ڕێوی میزی بەسەردا بکات، بەڕاستی زەلیلە ئەوەی کە ئەوەندە بێ دەسەڵات بێت کە ڕێوی میزی پێدا بکات، خۆ ئەگەر خوا بوایە دەیتوانی بەرگری لە خۆی بکات. بەڕاستی خێر لە خوایەکدا نیە کە هەموو شتێك بتوانێت دەست درێژی بکاتە سەر، بۆیە وا ڕاستیم بۆ دەرکەوت و بڕیارمدا کە بڵێم: بەریم لە هەموو بتێك لەم سەر زەویەدا، وە وا ئیمانم هێنا بەو خودا تاك و تەنهایە کە(الله)یە و زاڵ و دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتێکدا.

بەڕێزان: خۆ ئەمانە خوێندەوار بوون، عاقڵ بوون، ئەو شیعرەی أبو ذەر ئێستا شاعیران ناتوانن بیڵێن، کەچی ئاوا توشی گومڕایی بووبوون. ئێستا جارێکی تر خەریکە مرۆڤایەتی گومڕا دەبێتەوە، هەرچەندە تەکنەلۆجیا پێش بکەوێت، بتی سەردەمیش زۆر دەبن، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت جارێکی تر بێتەوە و مرۆڤایەتی ڕزگار بکات لە بتی ناو بازاڕ و ئابووری، لە بتی ناو سیاسەت، لە بتی ناو ئاشتی و شەڕ، چونکە ئەمڕۆ ئینسانی وا هەیە وەکو بت دەپەرسترێت لە شەڕ و ئاشتیدا، حەز بکات شەڕ بە خەڵك دەکات، حەز بکات ئاشتی پێ دەکات، هەروەکو زەمانی پێش ئیسلام. کە ئەوکاتیش و ئێستاش خەڵکی ناپرسن: باشە شەڕمان لەسەر چی و ئاشتیمان لەسەر چی؟!.

بەڵێ، کە پێغەمبەری خوا ﷺ هات بە ملیۆنان خەڵکی ئاگریان دەپەرست و خزمەتیان دەکرد، ئەو چاو ساغە هات و هەموو مرۆڤایەتی ڕزگار کرد لە کیسرا و قەیصەر، لە بت پەرستی و وەثەنیەتی چین و هیندستان و ئاسیا و ئەفەریقا.

هەموو کەس قەرزاری پێغەمبەرە ﷺ هەر کەسێك حەرفێك بزانێت، پیتێك بزانێت لە ﴿ن ، وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ﴾ی قورئانەوە وەریگرتوە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئێمەی گەیاند، هەرکەسێك ڕەوشتێکی جوان فێر بووبێت لە ﴿وَ إِنَّكَ لَعَلَى خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ی قورئانەوە وەریگرتوە، کە وەصفی ئەخلاقی بەرز و پەسەندی حەزرەت ﷺ دەکات وەریگرتوە، وە فێری بووە..

هەرکەسێك بۆ خێزانی باش و بەڕێز بێت لە (خَيْرُكُم خَيْرُكُم لِأهلِهِ وَ أنا خَيرُكُمْ لأهْلي)یەوە وەریگرتوە.هەر کەسێك لەگەڵ منداڵ و ژن و کچیدا بە حورمەت بێت ئەوە لە فەرمودەی (خَيْرُكُم خَيْرُكُم لأهلِهِ وَ أنا خَيرُكُمْ لأهْلي)یەوە فێری بووە.

هەر کەسێك دەبینێت کە ئینسانێکی بە ئەدەب و ڕۆشنبیرە، ئەوە لە ئەدەبی ئەو زاتەوە وەریگرتوە کە فەرمویەتی: (أدَّبَني رَبِّي فَأحْسَنَ تأديبي).

ئەگەر کەسێك دەبینێت بەزەیی بە هەتیودا دێتەوە ئەوە دەرسی لە (أنا وَ كافِلُ اليَتيمِ فِي الجنَّةِ هكذا)ەوە فێری سۆز و بەزەیی بووە.

ئەگەر کەسێك دەبینێت دەست پاکە و لە مەعامەلەدا غەش ناکات، ئەوە پەروەرە کراوی ئەو صادقی ئەمینەیە کە فەرمویەتی: (مَنْ غَشَّنا فَلَيْسَ مِنّا).

ئەگەر کەسێك دەبینێت کە خاك و نیشتیمان و زێدی لەدایك بوونی خۆش دەوێت و فرمێسکی بۆ دەڕێژێ، ئەوە لەو زاتەوە فێری خۆشەویستی نیشتیمان بووە کە لە کاتی هیجرەتدا بە کوڵ بۆ مەککە گریا و فەرموی: ئەگەر قەومەکەم دەریان نەکردمایە هەرگیز بەجێم نەدەهێشتیت.

ئەگەر مەسئولێکی دەست پاکت بینی ئەوە پەروەردەکراوی ئەو دەست پاکەیە کە فەرمویەتی: (أيُّما راعٍ غَشَّ رَعيَتَهُ فَهُوَ في النّارِ) رواه البُخاري و مُسلِم.

ئیمانداران: بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو سەفیری خوایە بۆ سەر زەوی، سەفیری هەموو پێغەمبەرانیشە، هەڵگری پەیامی (نوح ﵇ و إبراهیم ﵇ و لوط ﵇ و عیسی ﵇ و موسی ﵇) و ئەو سالار و سەردارانەیە، پەیامەکەی ئەوانی زیندوو کردەوە، خاوێن و پاڵاوتەی کرد لە هەموو ئەو خراپانەی پێوەی لکابوو، وە محمد المصطفی خاتَمُ الأنْبياء و نوێنەر و چاوساغ و برا گەورەی هەموو پێغەمبەرەکانە، وەکو لە ئیسرا و میعراجدا بەرجەستە کرا، پێغەمبەر ﷺ ئیمامەتی بۆ هەمویان کرد و بەو نوێژە و بەو ئیقتیدایە بوون بە ئوممەتی و ئەو پێغەمبەرە بەڕێزانە بوون بە برای ئێمە. بوینە هاو خەبات و هاوسەنگەر، بە هەمووومان مەئمومی دوای یەك ئیمامین کە حەزرەتی محمدە ﷺ.

وە پێغەمبەری دڵسۆزمان ﷺ ئێمەی ناو ناوە بە برای خۆی. جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێك صەحابە بەلای گۆڕستانێکدا تێپەڕی، سەلامی لێ کردن و فەرموی: ئومێدموارم بکەم بە براکانم و دست بخەمە ناو دستیان و تەوقەیان لەگەڵدا بکەم. صەحابەکان عەرزیان کرد: ئەی ئێمە برای تۆ نین کە شەو و ڕۆژ لە خزمەتتداین و خوێن و ڕۆح و ماڵ و کەس و کارمان بەقوربانی خۆت و پەیامەکەت کردووە؟!! فەرموی: ئێوە هاوڕێ و صەحابەی منن. صەحابەکان فەرمویان: ئەی توخوا براکانت کێن کە حەز دەکەیت بیانبینیت و موشتاقیت بۆیان و درودیان بۆ دەنێریت و بەردەوام دەفەرمویت: (وردْتُ أنِّي لَقَيتُ إخواني الذينَ آمَنُوا وَلَم يَرَوني) رواه مُسلم. ئایا ئەو برایانەت چ کەسانێکن؟!. پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموی: براکانم ئەوانەن کە لەدوای من دێن و منیان نەبینیوە و بە هەموو ماڵ و خوێن و توانایان دیفاع لەو

قورئان و سوننەتە ئەکەن کە من بە خەڵات و بە ئەمانەت بۆم بەجێ هێشتون، ئەوانەن کە سوننەتەکانی من زیندو ئەکەنەوە.

الله أكبر لەو وتە بەرزو بەنرخە کە هەموو سەرکردەکانی دونیا نەیانتوانیوە قسەیەکی وا بکەن بۆ شوێن کەوتوانی دوای خۆیان، ئای چەند فەخر و گەورەییە کە ئێمە ئەمڕۆ برای پێغەمبەرینﷺ، بەڵام دەبێت ئەو برایەتیە بپارێزین، ئەویش بە ﴿وَاعْتَصِموا بحَبْلِ اللّهِ جَميعاً وَلا تفَرَّقوا﴾. ئەو برایەتیە بەوە دەپارێزرێت کە ﴿قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَيِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّـٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا﴾ البقرة:٢٥٦. بەڕاستی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ (بەخۆمان و دایك و باوك و ماڵ و منداڵەوە بەقوربانی بین) واز لە برایەتی ئێمە ناهێنێت، تا ئەو کاتەی کە دەستمان بە قورئانەوە بێت،تا شارەزای سیرە و سوننەتی زێڕین و گەوهەرباری بین، تا لەسەر ڕەوشت و ئەخلاقی ئەو زاتە بین.

جا وەرە ئازیزم چ نەهامەتی و زەرەر مەندیەکە ئەو برایەتیە لە دەست بدەین، شەفاعەتی لە دەست بدەین، سەرداری و سالاری و ئیمامەتی ئەو لەدەست بدەین، چاوساغی و ڕابەرایەتی ئەو لە دەست بدەین، ئەوە خەسارەتمەندی گەورە و عەظیمە، بەڕاستی ژیان بێ چاوساغی ئەو سەرداره زۆر تاڵە و تاڵاوێکی مەرگە ساتە، زەریایەکی پڕ نەگبەتی و پڕ نەهاتە.

بەڵێ، هەر کەسێك دەست بخاتە ناو دەستی پێغەمبەرەوە ﷺ بازرگانیەکەی دائیمەن لە برەو و قازانجدایە﴿يَرْجُونَ تِجَارَةً لَّن تَبُورَ﴾ فاطر:٢٩.

بەڵێ، هەر کەسێك بە برایەتی حەزرەتی محمد ﷺ ڕازی نەبێت، دوای ئەو نەکەوێت کە ئیمامی (نور)ە، کە (نَبيُّ الرَّحمة)یە، دیارە دوای ئەوانە دەکەوێت کە ئیمامی (نار)ن، کە ئیمامی زەحمەتن، چونکە ئیمامەکان لە مێژوودا دوو بەشن، لەمێژووی مرۆڤایەتی دا دوو جۆر ڕابەر و پێشەوا هەبوون و دەبن، یەکێکیان (يَهْدي الى النُّور)، ئەوی تریان (يَهْدي الى النّار). یەکێکیان شەو و ڕۆژ بە قسە و ڕەفتار و گوفتاری، بە ماڵ و سامان و هێزی خەڵك بانگ دەکات و ئاڕاستە دەکات بەرەو دۆزەخ، خۆشەویستمان ﷺ ئاگادرای کردوین و فەرمویەتی: (تَكُونُ دُعاةٌ عَلى أبْوابِ جَهَنَّم مَنْ أجابَهُمْ إلَيها قَذَفُوهُ فِيها) رواه البُخاری و مُسلم.

ئەمڕۆ بەچاوی خۆمان دەبینین خەڵکانێك گەنجەکانمان بانگ دەکەن بۆ ئەوەی ڕوو نەکەنە مزگەوت، بڕۆن بەرەو نادی و ئەو شوێنانەی شەرع نەهی لێ کردووە، خەڵکانێك هەن داوا لە ئافرەتان دەکەن حیجاب نەپۆشن و بە ڕووتی خۆیان بخەنە بەر چاوی گورگەکانی مرۆڤەوە، ئەوانە پێشەوای ئاگرن، یان کەسان و کۆڕ و کۆمەڵ و ڕێکخراوی درووست کراو هەن، ئیش بۆ ئەوە دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە ناشرین کراوی نیشانی خەڵك بدەن.

بەڵێ قوربان، پێش ناسینت

وێنەی ئێوەیان بۆ هانین

لە ئێوەیان دەترساندین

لە وێنەیەك :

شمشێرەکەت خوێنی لێ دەچۆڕا خواری

وێنەیێ تر :

دارشەلاقت بەسەر پشتی

ڕەنج بەرێکی چەوساوەدا

بەبێ تاوان دادەباری

لە وێنەیەکی ترتاندا

ئافرەتتان لە زیندان ناوە و

کۆیلەی پیاوە و

دەست و قاچی بە زنجیری

نەپساوی پۆلاّ تەنراوە

بە چەند وێنەش

وایان بە هەموان ڕاگەیاند، کە هەر کەسێك عەرەب نەبێت

محمد خۆشی لێی نایە

خۆی عەرەب بوو، بۆ وانی کرد

بێجگە لەوان، لەگشت گەلێك تەوەللایە

بە چەندین باس، چەندین وێنە و چەندین بوختان

پێناسەتیان وا کرد بۆمان

کە ئەوانەی شوێن کەوتەتن

گێژو وێژن، بەس خەریکی ڕۆژوو و نوێژن

شەیدای وشتری پێ پانی مل درێژن

ئیتر هەرچی

شارستانی و زانست و تەکنەلۆژیایە

دوژمنیانە و ئەگەر بیگرن

سەریدەبڕن و دەینێژن . . .

**بەڵێ ئیمانداران: سوپاس بۆ خوا لە بەرامبەریشدا خەڵکانێکیش هەن کە هەر لە زەمانی پێغەمبەرەوە ﷺ تا ئێستا و تا قیامەتیش بەردەوام دەبێت. بەردەوام خەڵکی بانگ دەکەن بەرەو بەهەشت.**

**بزانە تۆ شوێن کامیان ئەکەویت، ئەبێت پرسیار لە خۆت بکەیت، بزانیت چەند خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ لەناو دڵتایە، بزانە چەند پێغەمبەری خوا و ﷺ دینەکەیت لەلا شیرینە، چەند ئیمان و ئیسلامەکەیت. چەند هەویەی موسڵمان بوونت لەلا گەورە و بەقیمەت و گران بەهایە و چەند شانازی پێوە دەکەیت؟ ئایا گەیشتویتە ئەو ئاستە ئیمانیەی کە فەرمودەی (لا يُؤمِنُ أحَدُكُمْ حَتَّى أكُونَ أحَبَّ إلَيهِ مِنْ والِدِهِ وَ وَلَدِهِ وَ النَّاسِ أجْمَعِين) رواه البُخاري و مُسلم.**

واتە: هیچ کەس لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێت و دانامەزرێت، هەتاکو وای لێ دێت کە منی بەلاوە خۆشەویستر دەبێت لە باوك و دایکی و لە نەوە و ڕۆڵەی و لە هەموو خەڵکی بە گشتی.

جا ئیمانداری بەڕێز لە خۆت بپرسە: ئایا ڕاستە (مُسلِم)ی ڕاستەقینەیت، یان (مُسْلِم)ی سەر پێناسەت بۆتە (ملم) بەبێ سین؟!.

لەخۆت بپرسە ئایا پێغەمبەری خوات ﷺ لە خۆت خۆشتر دەوێت؟!

کە ڕۆژێکیان حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ عەرزی پێغەمبەری خوای ﷺ کرد: (یا رسُولَ الله، لَأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ إلا مِنْ نَفْسي. فقالَ النَبيُّ ﷺ: لا والَّذي نَفْسي بِيَدِهِ، حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيكَ مِنْ نَفسِكَ. فقالَ عُمَر ﷺ: واللهِ لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسي)....واتە: عومەری کوڕی خەطاب ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، سوێند بەخوا تۆم بەلاوە خۆشەویسترە لە هەموو شتێك تەنها لە نەفسی خۆم نەبێت!. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نا، سوێند بەو کەسەی کە نەفسی منی بە دەستە کە الله یە، ئیمانت تەواو نابێت ئەی عومەر هەتا ئەو کاتەی کەوات لێ نەیەت کە منت خۆشتر بوێت لە نەفسی خۆت. حەزرەتی عومەر ﷺ بە ئاگا هاتەوە و بیری کردەوە کە بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر لە نەفسی خۆی بۆی دڵسۆزترە، چونکە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ نەبوایە، ئەوا ئەم گومڕا و سەرگەردانی دونیا و بەد بەخت و چارە ڕەشی قیامەت دەبوو، ئیتر چۆن دەبێت پێغەمبەری خوای ﷺ لە نەفسی خۆی خۆشتر نەوێت؟! بۆیە فەرمووی: (واللهِ لأَنْتَ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ نَفْسي)! سوێند بەخوا ئێستا تۆم خۆشتر دەوێت لە نەفسی خۆم!. ئەنجا پێغەمبەری خوا

ﷺ فەرموی: (الآنَ يا عُمَر) دەی ئێستا ئیمانەکەت تەواوە ئەی عومەر.. ئەم فەرمودە شیرینە پێشەوای فەرمودە ناس (ئیمامی بوخاری رحمه الله) گێڕاویەتیەوە.

ئیمانداری بەڕێز: دەتۆش ئاوا بە فەرمودەیەك، لە مانگی مەولوددا بە ئاگا وەرەوە و وەکو حەزرەتی عومەر رضي الله عنه بگۆڕێ و خۆشەویستی (رَسُول الله ﷺ) لە دڵتدا زیاد بکە، وە بزانە ئەم خۆشەویستیەش هەر بەقسە نابێت، بەڵکو دەبێت تاقیبکەیتەوە بزانیت ڕاستە بە کردەوە و لە پەروەردەی ماڵ و منداڵتدا دەردەکەوێت، لە کڕین و فرۆشتن و کاروباری بازاڕتدا دەردەکەوێت؟

گوێ بگرن بۆ ئەم موژدەیە کە خۆشەویستمان محمد المصطفى ﷺ پێمان ئەدات و دەفەرموێت: (مَنْ أَحْيا سُنَّتي عِنْدَ فَسادِ أُمَّتي فَلَهُ أجْر مِئَة شَهيدٍ). واتە: هەرکەسێك ڕێباز و سوننەتی من زیندوو بکاتەوە لە کاتێکدا ئوممەتەکەم بێ وەفا ئەبێت بەرامبەرم، بست بە بست شوێن گاور و جولەکە دەکەوێت، ئا لەو کاتەدا هەرکەسێك سوننەتەکانم زیندو بکاتەوە ئەوە با بزانێت ئەجر و پاداشتی سەد کەسی هەیە کە لە پێناوی خوادا شەهید بوبن!! لە موژدەیەکی تردا دەفەرموێت: (طُوبَى لِلْغُرَبَاء) خۆش بە حاڵی ئەوانەی کە غەریبن.. عەرزیان کرد: یا رَسُول الله ﷺ غەریبەکان کێن؟! چونکە غەریب لە ناو خەڵکدا بەو کەسە دەڵێن کە بچێتە شارێکەوە و کەس نەیناسێت، ماڵی نەبێت، ئەنوای نەبێت، گیرفانی خاڵی بێت، سەروەت و سامانی نەبێت. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: نەء، ئەوە غەریب نیە، بەڵکو غەریبەکان ئەوانەن کە لە دوای منەوە دێن، لەو کاتەدا خەڵکی لادەدەن و بەلای ڕاست و چەپدا دەڕۆن و شەقامە

ڕێگەکە و گوڵستانەکەی من بەجێ دەهێڵن و دینەکەی من پشت گوێ نەخەن، ئەوانە کە (يُصلِحُونَ ما أفسَدَ النّاس).

جا برای موسڵمان، گەنجی موسڵمان، دە تۆش غەریب بە، غەریب بەو مانایە نا کە گۆشە گیر بیت، بەڵکو بەو مانایە کە چاکسازی بکەیت، ئەوەتا ئەوەی ئێستا سیاسەتمەداران داوای دەکەن، پێغەمبەری خوا ﷺ چەندان سەدە لەمەوبەر بە ئەرکی سەرشانی موسڵمانی داناوە. دە کەواتە: با مانگی مەولود بکەین بە مانگی چاکسازی ئەم فەسادە ئیداری و ئەخلاقیەی لەناو شار و شارۆچکە و گەڕەکەکانماندا هەیە.

هەر کەس لە ئاستی خۆیەوە، باوکو دایك لەناو ماڵ و منداڵتدا، مامۆستا لە خوێندنگاکەتدا، لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ خوێندکارەکانت پێ بگەیەنە، با فێری زانستی بەسود بن، فێری ڕەوشتی بەرز بین، با فێری پیاهەڵدان و چەپڵەلێدان نەبن بە کوێرانە، با لەغەیری زانست بە شتی ترەوە مەشغوڵ نەبن، هەرچەندە ئەمڕۆ مامۆستای دڵسۆز و ئیسلام خواز غەریبە!..
ئەی برای لێپرسراو لەناو دائیرەکەتدا مەهێڵە هیچی تر بەرتیل و دزی و گەندەڵی ئەم میللەتە بخوات، بەداخەوە ئەمڕۆ فەرمانبەر و لێپرسراوی باش و دڵسۆز غەریب بوە!..

ئەی لێپرسراوانی حزبی و حکومەتی کوردستان، دە ئێوەش بەشداری یادی مەولودی حەزرەتی رسُول الله ﷺ بکەن، بەڵام بەوە نا کە بروسکەی پیرۆزبایی بۆ موسڵمانان بنێرن، بەڵکو مەهێڵن گەنجانی ئەم میللەتە بکەونە داوی دوژمنانی دین و نەتەوەکەمانەوە، با گەنجەکانمان ضایع نەبن، با فێری عەرەق و قومار و مادەهۆشبەرەکان نەبن، با هیچی

تر کچەکان فێری ڕەشبەڵەك و هەڵبەز و دابەز نەبن لە جیاتی ماڵداری و خێزان پەروەری!..

وا لەو منداڵە بێتاوانانە مەکەن کە ناوی خوا و پێغەمبەر ﷺ نەبێت هەموو شتێك بزانێت، ئەزانێت چەند گۆرانی بێژ هەیە، چەند گۆرانی و کلیپ هەیە، کەلیماتی هەمووی لەبەرە، تەنانەت وای لێ هاتوە ڕۆڵەی ئەم میللەتە نەك زانیاری ئایینی، پرسیاری نەتەوایەتی لێ بکە نایزانێت، چونکە هەرکەسێك دینی بزر کرد، نیشتیمانیش دەدۆڕێنێت!..

ئیمانداران: یادی لەدایك بونی سەرداری مرۆڤایەتی ﷺ باشترین هەل و فرسەتە بۆ ئەوەی دڵمان پڕ بکەین لە خۆشەویستی ئەو زاتە، چونکە هەر دڵێك بە خۆشەویستی ئەو زاتە پڕ نەکرێتەوە ڕەق دەبێت، بێ هەست و سۆز دەبێت!..

کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ مینبەرەکەی بۆ دروستکرا و ئەو قەدە دار خورمایەی بەجێ هێشت کە پێشتر وتاری لەسەر ئەخوێندەوە (حَنَّ الجَذَعَ إلَيهِ وَ صاحَ كَما صاحَ الصَبيُّ)، پێغەمبەر ﷺ لە مینبەرەکەی دابەزی و باوەشی پێدا کرد، ئەمجا ئەو کۆلکە دارە وشکە لەناڵە و هەنسك کەوت، وەکو چۆن منداڵ لە گریان ژێر دەبێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لَو لَمْ اعْتَنْقهُ لَحَنَ إلى يَوْمِ القِيامَةِ) رواه احمد في مسنده.

شێخ حەسەنی بەصری هەموو جارێك کە ئەم فەرمودەیەی دەخوێندەوە دەگریا و دەیفەرمو: ( هذهِ خَشَبَة تَحْنُ إلى رَسُول اللّه ﷺ فَأنْتُمْ أحَقُ أنْ تَشْتاقوا إلَيهِ).. واتە: ئەوە کۆلکە دارخورمایەکی وشك بوو، هاتە ناڵە و گریان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، دەی ئێوە لە پێشترن کە زیاتر موشتاقی پێغەمبەر بن ﷺ.

سوێند بە خوا هەرکەسێك خۆشەویستی ئەو خۆشەویستەی لە دڵدا نەبێت، با بزانێت دڵی وێرانە، دڵی تاریکە، کەلاوە کۆنە، شتی خراپ جێگەی بۆتەوە تێیدا، چونکە: دڵ، ویژدان، ناخ، ئەگەر بە شتی جوان و شیرین پڕ نەبێتەوە، یەقینتان ببێت بە شتی خراپ پڕ دەبێتەوە!. دڵ و ویژدان و ناخ نابێت خاڵی بن، جا با دڵمان پڕ بکەین لە خێر تا خاڵی ببێت لە شەڕ، با پڕی بکەین لە خۆشەویستی خوا، تا پڕ نەبێت لە خۆشەویستی شەیطان، با پڕی بکەین لە خۆشەویستی بەهەشت و قیامەت، با بە دونیا پەرستی و تەماحی ناڕەوا و حیقد و حەسەد و کینە پڕ نەبێتەوە.

گەر دەتەوێ تینوێتی گیانت بشکێنی
گەر بەتەمای، تەمی ڕەشی دڵە ڕاوکی، لەسەر دڵت بتارێنی
ئەگەر شەیدایت، ئاسودەیی، کامەرانی، بۆ خۆت و
نەوە و گشت گەلت بەدەست بێنی
گەر پێت خۆشە، برایەتی، دادپەروەری بچەسپێنی
ئەوا بڕۆ دیوەخانی دڵت چۆڵکە و
تەنها قورئانی تیا دانێ. . .

ئیمانداران: بە درێژایی مێژوو خەڵکان وا ئەڕۆن و هەرکەسە و ئەیەوێت لەگەڵ کاروانێکدا ڕێگا ببڕێت، جا تۆی ئیماندار بۆ ئەوەی سەگەردان نەبیت، وەرە خۆت تێکەڵ بکە لەگەڵ کاروانێك کە سەرقافڵەی حەزرەتی محمد المصطفی‌یە ﷺ ، کە کاروانێکە ١٢٤ هەزار پێغەمبەری تێدایە، چۆن کاتی خۆی کە ئاسمان غەزەبی داباراند و زەوی توڕەیی هەڵدەڕشت، حەزرەتی نوح کەشتی نەجاتی لێ خوڕی و بانگی دەکرد: (یا

بُنَيَّ ارْكَبْ مَعَنا) ئەوەی وەڵامی نوحی نەدایەوە، هەرچەند چوە سەر شاخی بەرز هەرچەند دەسەڵاتی هەبوو، هەر غەرق بوو ﴿فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ﴾ هود:٤٣.

ئەمڕۆش وا جارێکی تر خەڵکی خەریکە غەرق دەبن، بەڵام ئەمجارەیان لە ئاودا نا، بەڵکو لەناو ماددە پەرستی و پارە پەرستی و ئیباحیەت و ئیلحاد دا. ئەگەر ئەمڕۆ فریای خۆمان نەکەوین غەرق دەبین لە فیتنەدا، فیتنەی لەناو چونی ئیمان، وەکو پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرمویەتی: (بادِرُوا بالأعمالِ فِتَناً كَقِطَعِ اللَّيلِ المُظْلِمِ، يُصْبِحُ الرَّجُلُ مُؤمِناً وَ يُمسِي كافِراً، أو يُمْسِي مُؤمِناً وَ يُصْبِحَ كافِراً، يَبِيعُ دَيْنَهُ بِعَرَضٍ مِنَ الدُّنيا) رواه مسلم. جا وەرە خۆت بخەرە ئەو کەشتیەوە کە کەشتی ئیسلامە، کە مزگەوتە، وەرە دوای ئەو قائید و ڕائیدە بکەوە (و الرّائِدُ لا يَكْذِبُ اهْلَهُ)، ئەو پێغەمبەرەی کە درۆی لەگەڵ خۆی نەکرد، درۆی لەگەڵ خەڵکی خواش نەکرد، کافرێکی بە خوێن تینوی پێغەمبەری خوا ﷺ وتی: مادەم محمد درۆ لەگەڵ هیچ کەس و مرۆڤێکدا ناکات، ئایا چۆن درۆ بەدەم خواوە دەکات؟! عبداللەی کوڕی سەلام کە لە گەورە زانایانی جولەکە بوو، کاتێك زانی پێغەمبەری ئاخر زەمان هاتوە بۆ مەدینە، چوو بۆلای تا هەندێك پرسیاری لێ بکات، بەڵام هەر بە چاوپێکەوتنی شایەتومانی بە حەقی هێنا و وتی: (هذا الوَجْهُ لَيْسَ بِوَجْهِ الكَذّاب). ئەم دەم و چاوە لە دەم و چاوی کەسی درۆزن ناچێت و هەرچیً بیڵێیت ڕاستە و پێویست بە پرسیار کردن ناکات.

وەرە ئیمانداری بەڕێز، لە مانگی مەولوددا جارێکی تر دەست بخەرە ناو ئەو دەستە ئەمینەوەکە بە شاهیدی گەورەترین دوژمنی کە (أبو جەهل)ە صادقی ئەمینە، دەست پاکی ڕاستگۆی ڕاست بێژ، یەکێك لە کافرەکان لە دەرەوەی مەککەوە هاتبوو تا هەواڵی ڕاست و درووستی

پێغەمبەری خوا ﷺ بزانێت، چوە لای (أبو جەهل) و پێی وت: (إِنَّهُ لَيْسَ هُنا إلاّ أنا وَ أنْتَ، فَأخْبِرْني هَلْ مُحَمَّد كاذبٌ أمْ صادق؟). وتی: ئەوا تەنها من و تۆ بەیەکەوەین و کەسی تر ئاگای لێمان نیە، قسەیەکت لێ دەپرسم ڕێك و ڕاست وەڵامم بدەرەوە، ئایا محمد ڕاستگۆیە یان پیاوێکی درۆزنە؟! ئەبوجەهل وتی: (لا، ما كَذَبَ مُحَمَّدٌ قَطُّ). نەخێر. هەرگیز محمد درۆی نەکردوە و درۆمان لێ نەبیستوە!... بەڵێ محمد المصطفی ﷺ تاکە پێشەوای ڕاستگۆیە. وەرە لە مانگی مەولوددا پەیمانی وەفاداری لەگەڵدا نوێ بکەرەوە، هەر کەسێك شوێنی ئەو چاوساغە بکەوێت، سوێند بە تاکو تەنهایی خوا، لەم دونیایەدا سەرفراز و لە قیامەتیشدا بەهەشتی بەرین جێگایەتی.

موژدەتان لێ بێت ئەی ئەو کەسانەی کە لەم مانگی مەولودەدا، لە یادی لەدایك بوونی پێغەمبەری پێشەوادا ﷺ. دڵتان خۆشە بەو موناسەبەتە پیرۆزە، موژدەتان لێ بێت ئەی ئیسلام خوازان، ئەی دینداران، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: ( إنَّ مِنْ وَرائِكُمْ أيّامُ الصَّبرِ، لِلمُتَمَسِّكِ فيهِنَّ بما أنْتُم عَلَيْهِ أجْرُ خَمْسينَ مِنْكُم.. قالوا : يا رَسُول الله أو مِنهُمْ؟! قالَﷺ: بَلْ مِنْكُم) (اخرجه إبن نصر في السنّة، و صَحَحَهُ الألبانيُ بِشَواهِدِهِ)... واتە:لە ڕۆژگاری داهاتووی ئوممەتەکەمدا ڕۆژانی خۆڕاگری و ئارامگری دێتە پێشەوە، هەر کەسێك لە ئوممەتەکەم دەست بگرێت بەو ڕێبازەوە کە ئێستا ئێوەی صەحابی من لەسەرنی، پاداشتی پەنجا کەسی لە ئێوەی بۆ هەیە! صەحابەکان بە سەرسوڕمانەوە فەرمویان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستت لە پەنجا کەس لە خۆیانە هی ئەو سەردەمەی خۆیان؟! فەرموی: نەخێر، بەڵکو پاداشتی پەنجا کەس لە ئێوە...

وە لە فەرمودەیەکی تردا خۆشەویست و تاجی سەرمان حەزرەتی محمد ﷺ دەفەرموێت: ( طُوبَى لِمَنْ رَآني وَ مَنْ آمَنَ بي مَرَّ، وَ طُوبى لِمَنْ لَمْ يَرَني وَ آمَنَ بي سَبْعَ مَرَّاتٍ). رواه احمد و صححه الألباني في صحيح الجامع (٣٩٢٤). واتە: خۆشبەختی و سەرفرازی بۆ ئەو کەسەی کە چاوی بە من کەوتوە و ئیمانی بە من هێناوە، یەك جار خۆشبەختی بۆ ئەو کەسە، بەڵام حەوت جار خۆشبەختی بۆ ئەو کەسەی کە منی نەبینیوە و لە سەردەمی مندا نەژیاوە، بەڵام ئیمانی بە من هێناوە..

دەموژدەتان لێ بێت ئەی ئەو کەسانەی کە لەم مانگی مەولودەدا وە لە هەموو سات و کاتێکی ژیانتاندا بە دڵ و بە ناخ، نەك ڕۆژی جارێك، بەڵکو سەد جار و هەزار جار، خۆتان بەقوربانی پێغەمبەری ئازیز و سوننەت و سیرەکەی دەکەن، هەرچەند دوای چواردە سەدە زیاتر ژیان بەسەر دەبەن. إنْشاء الله هەمومان بەر ئەم موژدە خۆشە دەکەوین.

وە یەقینیشتان ببێت، هەرکەسێك بێ فەرمانی پێغەمبەری خوا ﷺ بکات ﷺ ژیانی لێ تاڵ دەبێت و پەشیمان دەبێتەوە،چونکە ئەو چاوساغە و پێشەوا ڕاستەقینە هیچ خێرێك نەماوە کە دەستی مرۆڤی بۆلا ڕانەکێشابێت.

ئیمامی بوخاری دەفەرموێت: (کابرایەك چوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ. خۆشەویست ﷺ فەرموی: ناوت چیە؟ کابرا وتی: (حُزْن) واتە: غەمگین. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: نا، نابێت تۆ ناوت غەمگین و خەفەتبار بێت. تەماشا بکەن، ئەوەندە دڵسۆزە ڕازی نابێت کەسێك لە ئوممەتی بە ناویش خەفەتبار ببێت، نەك بە ژیان و کردار، بۆیە فەرموی: (بَلْ أَنْتَ سَهْلٌ) بەڵکو تۆ ناوت "ئاسانکارە". یان بە کوردی خۆمان "ڕوخۆش"، کابرا ئەعرابیەکی مێشك ژەنگاوی بوو وتی: (لا أغَيِّرُ إسْماً سَمَّانيه أبي)واتە: نەخێر ئامادە نیم ناوێك کە باوکم لێی ناوم بیگۆڕم بە ناوێکی تر) سُبحان الله. ئەم پیاوە ڕەتی

ئەو هەموو دڵسۆزیەی پێغەمبەری خوای کردەوە و ڕەحمەتی نەویست و زەحمەتی هەڵبژارد، بۆیە هەتا مرد هەر بە غەمباری و خەفەتباری ژیا!!. وە لەم ڕۆژەدا ئەوەی بڵێت بەقسەی فەخری عالەم بەرنامەی ژیانم ناگۆڕم، ئەوا هەتاماوە بە غەمباری دەژی.

ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (کابرایەك لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ نانی دەخوارد بە دەستی چەپی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (كُلْ بِيَمِنِكَ) بە دەستی ڕاست نان بخۆ. کابرا بە توڕەیی و خۆبەزلزانینێکەوە وەڵامی پێغەمبەری خوای دایەوە و وتی: (لا أَسْتَطِيعُ)ناتوانم بە دەستی ڕاستم نان بخۆم. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لا إسْتَطَعْتَ ما مَنَعَهُ إلاّ الكِبْرَ، فَما رَفَعَها إلى فِيه) واتە: دەی یاخوا هەر نەتوانیت، تەنها خۆبەزلزانین وای لێ کرد کە ئاوا وەڵام بداتەوە. سەرەنجام نەیتوانی بۆ هەتاهەتایە دەستی ڕاستی بۆ دەمی بەرێت!!..).

بەڵێ، هەرکەس لە گوێڕایەڵیتی ئەو خۆشەویستە بە دوورە، گەر زوو فریای خۆی نەکەوێت، لێرە دۆڕاو و بەدبەخت و ژیانی بێبەش لە نوورە، لە دادگای قیامەتیش، گرفتاری خەشمی خوایی و سزای سەختی بێ سنوورە.

لە کۆتایی ئەم وتارەشدا دەڵێم: مرۆڤ لە بەرامبەر گەورەیی پێغەمبەردا ﷺ نازانێت چۆن بدوێت و بە چی دەست پێ بکات و چۆن کۆتایی بە قسەکانی بهێنێت، بەڵام ئەتوانین تەنها ئەوە بڵێین:

گەورەم، مەولام، لەم سەرزەویە
هیچ کەس، هیچ کەس، وەك تۆ نەبوو، وەك تۆ نی یە
خەڵکی دێن و دەچن و دەمرن، بەڵام شەها
ناوی شیرینی محمد ﷺ هەتا ئەبەد
هەر زیندووە و پایەدارە و هەرگیز مردنی بۆ نی یە

ئەوە نی یە بانگی محمدﷺ پێنج فەرزە
لە (شێخی چۆڵی) هەولێر و (لە خانەقاکەی بیارە) و
لە مزگەوتی (والی) سنەو ، نەك هەر لێرە لە کوردستان
لە سەرجەم مزگەوتەکانی ، چوار قورنەی ئەم دونیایەدا
ناوی شیرینی تۆ قوربان ، هەر بڵند و شکۆدارە و
سوپاس بۆ خوا، بەردەوام بانگ بەردەوامە و
تەنها ساتێك نەوی نی یە
سا درودی خودات لەسەر
ئەی ئەو مامۆستا گەورەیەی
لە ڕاستگۆیی
لە دڵ پاکی
لە خەم خۆری
لە مێژوودا وێنەت نی یە
یارەبی خوایە ڕەحممان پێ بکەیت و بەر شەفاعەتی ئەو پێغەمبەرە نازدارە بکەوین. اللّهُمَّ آمین.


سەرچاوەکان:

١.قورئان پیرۆز.
٢.لا تَحْزَن – محمد عبدالعاطي البحيري / ص٤٤، ص٤٥.
٣.السلسلة الذَهَبِّية – محمود المصري – ابو عمّار – ج٢ – ص١٣٢ – ج٢ – ص٥٩١.
٤.خُطَب الشَيخ عَبدالحميد كُشْك – عبدالحميد كُشْك – ج٨ – ص٢٤.

٥.نظرة النعيم – ج١١ – ص٥١٩٩.

٦.على خُطى الحبيب – عمرو خالد – ص٢٢.

٧ الخطب المنبرية – احمد حسين كعكو – ص٤٨١.

٨.سلوكيات المرأة المسلمة – محمد عبدالعاطي البحيري – ص٦١

٩.السلسة الذهبية – محمود المصري – ابو عمار – ج٣ – ص٩٣، ص١٨١.

١٠.هەموو شیعرەکانی ئەم وتارە لە (شنەی سۆز)ی مامۆستا جلال الدین نجم الدین وەرگیراون.

# وتاری سێیەم بۆ مانگی ربیع الاوّل

( الحَمدُ للّهِ ربِّ العالمین، و الصَلاةُ و السَلامُ علی سَیِّدنا مُحَمَّدٍ و علی آلهِ و صَحبهِ أجمَعین )

**ئیماندارانی بەڕێز و خۆشەویست: هەر لە مانگی مەولودداین، مانگی لەدایك بوونی فەخری کائینات حەزرەتی محمد المصطفی ﷺ ، بۆیە لێرەوە ڕوو لە ڕۆحی زیندووی سەردار و سەروەرمان دەکەین و دەڵێین:**

ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ

لە سەر زەمینی (کاوان) و سوڵتانەکەی کوکە بری و

شارەزووری حەدیسەوە

لە هەرێمی گێژەڵوکەی پڕ نەگبەتی ـجینۆسایدیـ نەگریسەوە

لە دەڤەری پەت و خەردەل و مەرگەسات

لە هەرێمی بیٚ ناز کەوتووی بیٚ پەرچەم و

خاوەن چەندین خەون و ئاوات

هەمیشە تۆی خۆشەویستمان

هێزی ئەژنۆ و بیلبیلەی چاو

هەر پێشەنگ و مەولا و گەورە و ڕابەرمان بوویت

هێمای مێژووی پڕ شەرەف و

سازێنەری بزافی ڕزگارکەرمان بوویت

ها . . . . ئەوە مێژوو شاهیدە

ئەم گەلەی شەیدای پەیامت

چواردە سەدەیە دڵشادە

کە تۆی فەخری ئەم گەردونە، مامۆستا و پێغەمبەرمان بوویت

ئەی ڕابەرم:

هەر کە مانگی مەولودی تۆ، ساڵانە دەگەڕێتەوە

باوەڕ فەرموو، لەم دەڤەرە، بە شنەی شەماڵی ڕەئفەت و

ڕەحمەتە بێ وێنەکەی تۆ

هەموو دڵمان دەژێتەوە

گیانمان لە سایەی یادتدا

پشوو دەدا و دەشنێتەوە

لە حورمەتی شکۆی یادت

لە خۆشی باس و ناوی تۆ

چی ئازار و ئۆف و ژانە

هەمویمان بیر دەچێتەوە

ئەی پێغەمبەری پێشەوام

ئەم گەلە خێر لە خۆ نەدیوەی ئومەتت

بە دڵ قەناعەتی وایە، ئەگەر هەبێت

ڕێگایەکی سەرفرازی، ئەگەر هەبێت هیوا و ئومێدێك

بۆ سبەی ، ئەوە تەنها

لە پەیامە ژین بەخشەکەی تۆی مامۆستا و پێشەنگدایە

کە سەراپای هەر ڕەحمەتە و بەخششی گەورەی خودایە! . .

ئیمانداران: گەر بمانەوێت پێغەمبەری خوا ﷺ بناسین، ئەوا دەبێت لە قورئانەوە بیناسین، چونکە هەر کەسێك لە قورئانەوە پێغەمبەر نەناسێت، ئەوە یان حەقی خۆی نەداوەتێ، یان زیادەڕەوی کردووە لە خۆشەویستیدا و پێغەمبەری خوای توڕە کردووە.

یەکەم: دەیان ئایەتی قورئان باسی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە هەموو مەخلوقات گەورەترە، وە لە هەموو کەس زیاتر لە خوا نزیك بووە. ﴿ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ۞ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ﴾ النجم:٨-٩.

فەرمون سەرنجی هەندێك لەو ئایەتە قورئانیانە بدەن کە باسی گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەن و تەنها تایبەتن بەو زاتە:

١.﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾ الانبياء:١٠٧.

٢.﴿لَقَدْ جَآءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾ التوبة: ١٢٨.

٣.﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۞ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ﴾ النجم:٤.

٤.﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ﴾ القلم:٤.

٥.خوای گەورە ئەوەندە پلەو پایەی پێغەمبەر ﷺ بەرز دەکاتەوە کە دەفەرموێت: (هەرکەسێك گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ بکات، ئەوە گوێڕایەڵی و ئیطاعەی خوای کردووە):

﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا﴾ النساء:٨٠.

٦. ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ﴾ ال عمران:٣١.

٧. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ﴾ الفتح:١٠.

٨. ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ النساء:٦٥.

٩. خوای گەورە پێغەمبەری ﷺ بە نور و ڕوناکی ناو بردووە: ﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ﴾ المائدة:١٥.

١٠. تەنها پێغەمبەری خوایە ﷺ کە لە ناو هەموو پێغەمبەراندا خوای گەورە بەناوی (یا محمد) بانگی نەکردووە، بەڵکو لەبەر ڕێز و حورمەت بە (یا أَیُّها النَبيُّ ـ یا أَیُّها الرَّسُول ـ یا أَیُّها المُزَّمِل ـ یا أَیُّها المُدَّثِر . . . الخ) وە لە هەر جێگایەکدا ناوی (محمد) هاتبێت، لەگەڵیدا (رَسُول الله) بە دوایا هاتووە.

١١. لە قورئاندا ناوی زۆربەی ئەندامەکانی لاشەی پیرۆزی هاتووە، لە کاتێکدا هیچ پێغەمبەرێك (سەلامی خوا لە هەموویان بێت) وەیان فریشتەیەك ناوی ئەندامەکانی لاشەی نەهاتووە، بۆ نمونە:

❁باسی دەم و چاوی موبارەکی: ﴿قَدْ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجْهِكَ فِى ٱلسَّمَآءِ ۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبْلَةً تَرْضَىٰهَا﴾ البقرة:١٤٤. بەڵێ، پێغەمبەری خواﷺ هەر بە دڵ ئارەزووی خواست کە خوای گەورە قیبلەی بۆ بگۆڕێت بەرەو کەعبە، هیچی بە زوبان نەوت، خوای گەورە ئاواتەکەی هێنایە دی.

۞یان هەر لە بارەی دەم و چاوی پیرۆزیەوە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ حَيْثُ خَرَجْتَ فَوَلِّ وَجْهَكَ شَطْرَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ﴾ البقرة:١٤٩.

یان دەفەرموێت: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ﴾ الروم:٤٣.

۞وە خوای گەورە باسی چاوی پیرۆزی دەکات لە (٣) جێگای قورئاندا، وەکو (الكهف:٢٨ ، طه:١٣١ ، الحِجر:٨٨).

وەکو: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ﴾ طه:١٣١.

۞وە زوبانی پیرۆزی لە (٣) جێگای قورئاندا هاتووە: ( مريم: ٩٧ ، الدُخان:١٣١ ، ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾ القيامة:١٦ ).

۞وە سنگی موبارەکی (٤) جار لە قورئاندا هاتووە، بۆ نمونە دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ﴾ الحجر:٩٧.

۞وە دڵی پیرۆزی (٦) جار بە (قَلبْ) و (فُؤاد) هاتوە، لە (البقَرة:٩٧ ، الشُعَراء:١٩٤ ، الحَشر:٢١ ، النَّجْم:١١ ، هُود:١٢٠ ، الفُرقان:٣٢ ، ﴿فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ﴾ ال عمران:١٥٩).

١٢.خوای گەورە ئەوەندە رێزی ئەو خۆشەویستەی گرتوە، کە فەرمویەتی: (بۆ هیچ کەس نیە لە ئاستیدا دەنگ بەرز بکاتەوە) ﴿لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ﴾ الحُجرات:٢.

١٣.لەناو هەموو پێغەمبەراندا (سەلامی خوایان لێ بێت) ، خوای گەورە تەنها سوێندی بە تەمەنی پیرۆز و پڕ بەرەکەتی (خاتَم الأنْبياء و المُرْسَلين) حەزرەتی محمدی امین ﷺ خواردوە کە دەفەرموێت: ﴿لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِى سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ﴾ الحجر:٧٢.

١٤.خوای گەورە لەبەر ڕێزی حەزرەت ﷺ، سوێند بەو شارە دەخوات کە ئەوی تێدا نیشتەجێیە: ﴿لَآ أُقْسِمُ بِهَـٰذَا ٱلْبَلَدِ ۝ وَأَنتَ حِلٌّۢ بِهَـٰذَا ٱلْبَلَدِ﴾ البلد:١-٢.

١٥.بەهۆی قەدر و حورمەتی پێغەمبەری پێشەواوەیە ﷺ کە خێزانە بەڕێزەکانیشی پیرۆزن ﴿يَـٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۚ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ﴾ الأحزاب:٣٢.

١٦.هەر لە بارەی ڕێز و حورمەتی خێزانە بەڕێزەکانیەوە، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَـٰتُهُمْ﴾الأحزاب:٦.

١٧.خاڵی لە هەموان گەورەتر ئەوەیەکە خوای گەورە خۆی و فریشتەکانی صەڵاواتیان لە دیداری ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ﷺ لێداوە و فەرمانیشی کردووە بە ئیمانداران کە صەڵاواتی لە دیدار لێ بدەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَـٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ ۚ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ صَلُّوا۟ عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا﴾الأحزاب:٥٦. بەڕاستی ئەم خەڵاتە بەهیچ پێغەمبەرێکی خوا (سەلامی خوا لە هەموویان بێت) نەبەخشراوە.

ئیمانداران: ئەمە پێغەمبەری ئێمەیە، دەبێت ئاوا بیناسین، کە خوا چەندی خۆش ویستوە و چەند ڕێزی گرتووە، چەند لە خۆی نزیکی خستۆتەوە، چەند پلە و پایەی دونیا و قیامەتی لەسەرو هەموو بەرزان و پاکان و چاکانەوەیە، بەڕاستی ئەگەر ئیمانداری ڕاستەقینە بیت، دەبێت کەناوی پیرۆزی محمد ﷺ هات، هەموو خانەکانی ناو لەشت بکەونە جوڵە، هەر لە تەپڵی سەرت تا بنی پێت موچوڕکەی پێدا بێت. هەر لەگەڵ بیستنی ناوی سەروەر و پێشەوای هەموو پێغەمبەران حەزرەتی محمد ﷺ دڵت شاگەشکە ببێت و زمانت بێتە گۆ و بەهەموو ناخ و گیانتەوە بڵێیت: ﴿اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّد و عَلى آله وَصَحْبِه وَسَلِّمْ﴾.

جا داواکارم صەڵاوات زۆر لێ بدەن، چونکە پەیمان نوێ کردنەوەیە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، ڕەحمەتی خوا لە باوك و باپیرانمان کە ئەگەر کەسێك چاوی بە کەسێکی خۆشەویستی دەکەوت، هەر خێرا لەگەڵ دەست و دەم ماچ کردندا صەڵاواتی لە دیداری حەزرەتی محمد ﷺ لێدەدا.

وە میللەتی کورد، کاتێك میوەی تازەی ساڵی ببینیایە، مانگی تازەی ببینیایە، لە خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ پێش ذیکرە تایبەتەکە صەڵاواتی لێدەدا، وەکاتێك دوو کەس کێشە و نیزاع بکەوتایە نێوانیان، کەسی سێیەمی ناوبژیوان دەیوت: (دە صەڵاواتێ لێ بدەن) واتە: دەیانزانی صەڵاوات ئاشتی یە، بەرەکەتە، ڕەحمەتی خوایە، فیتنە و ئاشوب لادەبات، غەم لەسەر دڵ و دەرون لادەبات، بەرەکەت دەخاتە ماڵ و ڕزقەوە.

جا حەز دەکەم لە مانای صەڵاوات حاڵی ببین:

خۆشەویستان: صەڵاوات دوو بەشە: (صَلاة) لەگەڵ (السَّلام)، (صَلاة) دوو واتای گرنگی تێدایە:

واتای یەکەم: خۆشەویستیە، واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئێمە تۆمان خۆشتر دەوێت لە هەموو شتێك، لە خۆمان و دایك و باوكمان و ماڵ و منداڵمان و هەموو خەڵكی سەر زەوی بە گشتی.

واتای دووەم: دوعا بۆ كردنە، كە داوا دەكەین: خوای گەورە لە جیاتی ئێمە پاداشتی ئەو سەروەر و چاوساغەمان بداتەوە، لە بەرامبەر ئەو هەموو شەونخونی و جوهد و جیهادەی كردی، بۆ ڕزگار بوونی مرۆڤایەتی لە هەموو كۆیلایەتی و كۆسپ و كۆت و بەندێك، لە هەموو نەفامی و جاهیلیەتێك. كەواتە: كە خوای گەورە پێمان دەفەرموێت: (ئەی ئیمانداران ئێوەش صەڵاوات لە دیداری خۆشەویست لێ بدەن) واتە: خۆشتان بوێت، مەدحی بكەن، دوعای بۆ بكەن.

وە سەلامیش دوو واتای گرنگی تێدایە:

واتای یەكەم: لە مێشكتدا هەمیشە بزانە كە حەزرەتی محمد ﷺ لە هەموو عەیبێك بە دوورە، وە لە هەموو كەم و كورتیەكی بەشەری بەدوورە، وە هەموو كەماڵاتێكی بەشەری تێدایە.

واتای دووەم: محمد ﷺ بپارێزن، شوێنی سوننەت و ڕێبازە تاقانە بێ وێنەكەی بكەون و شەرعەكەی سەربخەن، ناوەكەی بپارێزن و بەرز ڕایبگرن.

كەواتە: موسڵمان كە صەڵاوات لێ دەدات، لەناخ و دڵیەوە ڕوو لە خوا دەكات و دەڵێت: (اللَّهُمَّ عَظِّمْهُ فِي الدُّنيا بأعْلاء ذِكْرِه، وَ إظْهار دينه، وَ

إبْقاء العَمَل بشَريعَته، وَ في الآخرَة بتَشْفعه في أمَّته وَ إجْزال أجْره وَ مَثُوبَته وَ إبْداء فَضْله للأوَّلينَ وَ الآخرينَ، وَ تَقْديمه عَلى كافَّة المُقَرَّبينَ).

واتە: داوات لێ دەکەم ئەی خوای گەورە کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ بەرز و بڵند بکەیت لە دونیادا بەوەی بەردەوام ناوی بەرز ڕاگیرێت، وە ئاینەکەی پایەدار و گەشاوە بێت، وە لە هەموو سات و زەمینێك کار و کردەوە بە شەریعەتەکەی بکرێت، وە لە قیامەتیشدا پایەداری بکەیت، بەوەی شەفاعەتی گەورە بۆ ئوممەتەکەی بکات، وە گەورەیی و ڕێزی بۆ هەموو خەڵکی سەرەتاو کۆتایی دەربکەوێت، وە ئەو پێغەمبەرە پێشەوایە بکەیت بە پێشەوای هەموو چاکان و پاکان و لەخوا نزیکان..

وە صەڵاواتی خوا بۆ پێغەمبەر ﷺ وەسف و سەنا و باسکردنیەتی بە چاکە لەناو کۆمەڵی هەرە بەرزی مەلائیکەتدا و بارینی ڕەحمەت بەسەریدا.

صەڵاواتی مەلائیکەت بۆ پێغەمبەر ﷺ، نزاکردنیانە بۆلای خوا کە هەردەم پایە بەرزی بکات و ڕەحمەت ببارێنێت بەسەریدا.

لەبارەی گەورەیی صەڵاواتەوە چەندین فەرمودە هەیە، لە فەرمودەیەکدا کە حەزرەتی ئەبوهورەیرە رضي الله عنه بۆمان دەگێڕێتەوە و ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: (مَنْ صَلّى عَلَيَ واحِدَةً صَلّى اللّهُ عَلَيْهِ عَشْراً). واتە: هەرکەسێك یەك صەڵاواتم لەسەر لێ بدات، خوای گەورە دە صلاواتی لەسەر لێ دەدات.

واتە: کاتێك تۆی ئیماندار صەڵاواتێك لێ دەدەیت، خوای گەورە بە بەرەکەتی ئەو صەڵاواتە دەجار خۆشەویستی بۆتۆ زیاد دەکات،

بەرەکەت دەخاتە عومرت، ناو ماڵت، ناو ڕزق و ڕۆزیت، خوای گەورە بە بەرەکەتی ئەو صەڵاواتە خۆشەویستت دەکات لای خەڵکی، پاکت دەکاتەوە لە کەم و کوڕی و عەیب، هەرکەسێك زۆر صەڵاوات لێ بدات، پێغەمبەری خوا خۆشی دەوێت... پیاوێکی زۆر دیندار صەڵاوات زۆر لەسەر پێغەمبەر ﷺ لێ دەدات، شەوێکیان لە خەودا بە خزمەتی فەخری عالەم گەیشت، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: وەرە پێشەوە دەمت بێنە با ماچی بکەم، کابرا شەرم دایگرت و دەمی خۆی بە شایەنی ئەوە نەزانی کە پێغەمبەر ﷺ بەو دەمە پیرۆزەی خۆی دەمی ئەو ماچ بکات، بۆیە ڕوومەتی تێ کرد. پێغەمبەر ﷺ ڕومەتی ماچ کرد و فەرموی: من ئەو دەمەی تۆم خۆش دەوێت چونکە زۆر صەڵاواتت پێ لێداوە. کاتێك لەخەو بەخەبەر هات، ماوەی هەشت ڕۆژ بۆنی میسك لە ڕوومەت و ژوورەکەی دەهات!!.

مەحوی شاعیر دەفەرموێت:

هەتا بولبول لەسەر گوڵ نەغمە خوان و ناڵە سەنجانە

بڵێن ئینس و مەلەك پڕ بەم زەمین و ئاسمانە

(وَصَلّى الله عَلى) ئەو بەحری عیلم و عیرفانە

کە دەرکی غەوری ناکا (غَيْر عِلْمِ الله سُبْحانَهُ)

بەڕێزان: سەرنجی ڕوداوێکی واقیعی ئەم سەردەمە بدەن کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕۆحی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ بەئاگایە بەو صەڵاواتانەی کە بۆی دەنێردرێت.

مامۆستا مەلا محمد ئیمامی مزگەوتی چوارباخ کە لە کۆڕەوەکەی (١٩٩١)دا بەعسیەکان شەهیدیان کرد، دەفەرموێت: (شەوێك بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتم، حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بڕۆ بۆلای حاجی عەلی کە پیاوێکی خواناسی حەلاڵ خۆرە و دوکانی پێڵاو فرۆشتنی هەیە لە بازاڕی حەوزە وشکەکە، سەلامی لێ بکە و پێی بڵێ: بۆچی چەند ڕۆژێکە صەڵاواتەکانی کەم بۆتەوە؟! کاتێك ڕۆژ دەبێتەوە مامۆستا مەلا محمد دەچێت بۆلای حاجی عەلی و پاش سەلام کردن خەونەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەویش چاوی پڕ دەبێت لە فرمێسك و دەڵێت: بەخوا ڕاست دەفەرمویت، بەقوربانی پێغەمبەری خۆشەویست بم، چەند ڕۆژێکە سەرم قاڵە و صەڵاواتەکانم کەم بونەتەوە).

بێخود دەفەرموێت:

هەتا تەجەلی خوا لە عالەما بکا ظُهُور

بە ئاگری گوڵی چەمەن چیا ببێتە کێوی طور

فریشتەو ئادەمی دەڵێن هەتا ئەبەد لە خوار و ژوور

صەڵاتی حەق لەسەر شەهێ کە شەق ئەکا قەمەر لە دوور

سەلامی حەق لەسەر مەهێ کە ئەسپی خۆر لە غار ئەکا. . .

ئیمانداران: لێرەدا پرسیارێك درووست دەبێت، ئەویش ئەوەیە: ئایا ئینسانی موسڵمان چۆن دەگات بەم پلەی خۆشەویستیە کە ئاوا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگای لە حاڵت بێت؟!.. بەوەی دەبێت کە بەڕاستی تۆ ئیمانت بەهێز بێت بە خوا و خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەگی

داکوتا بێت لە دڵتا و لە هەموو ناخ و گیانتدا بڵاو بوبێتەوە، پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێت: (مِنْ أشَدِ أُمَّتي لي حُبّاً ناسٌ يَكُونُونَ بَعْدي يَوَدُّ أحَدُهُم لَو رآني بِأهْلِهِ وَ مالِهِ) رواه مُسلم.

واتە: لە هەموو کەس زیاتر لە ئوممەتم کە منی خۆش دەوێت کەسانێکن کە دوای من دێن و بەچاوی سەریان منیان نەبینیوە، هەریەك لەوانە ئاواتە خوازە بەدڵ و بە گیان کە چاوی بە من بکەوێت، ئیتر نە ماڵی بمێنێت نە منداڵی نە خێزانی.!..

موسەنای کوڕی سەعید ﷺ دەفەرموێت: (سَمِعْتُ أنَساً (أنَس بنْ مالك) يَقُول: مَا مِنْ لَيْلَة إلاّ وَ أنا أرى فِها حَبِيبي، ثُمَّ يَبْكي)!!..

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکم بیست ﷺ کە فەرمووی: هیچ شەوێك نەبووە لە خەومدا بە خزمەت خۆشەویستم (پێغەمبەری خوا ﷺ) نەگەیشتبم، ئەمجا ئەنەس ﷺ دەستی دەکرد بە گریان.

ئەمە لە کاتێکدا ئەنەس ﷺ لە تەمەنی (١٠) ساڵیەوە هەتا وەفاتی پێغەمبەر ﷺ لە خزمەت پێغەمبەردا بووە، کەچی لە خۆشیدا دەگریا کاتێك لە خەودا بە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتوە.

بەڕێزان: یەکێك لە تابعین لە مامۆستاکەی پرسی: حەز دەکەم پێم بڵێیت چی بکەم تا لەخەودا بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ بگەم. مامۆستاکە فەرمووی: ئێوارە لای ماڵی ئێمە بە، ئێوارە نان و خواردنێکی زۆر سوێری دەرخوارد دا، کە بە ناڕەحەت قوت دەچوو لەبەر سوێری، پاشان ئاوی خواردنەوەی نەدایە، لە نیوە شەودا ئاوی بۆ برد و وتی: ئەمشەو خەوت بە چیەوە دەبینی؟! کابرا وتی: بەخوا ئەمشەو لە

خەونمدا جۆگە و جۆباری پڕ لە ئاوم دەبینی کە ئاوی ڕوون و ساردی پێدا دەڕۆیشت، وە لە خەومدا باران دەباری.. مامۆستاکە فەرموی: ڕاست دەکەیت، چیت لە خەیاڵ و مەبەستدا بوو، ئەوە هاتە خەوت. هەرکاتێك ئاوا ڕاستت کرد لە خۆشەویستی پێغەمبەردا و هەموو هیوا و ئاواتت بەخزمەت گەیشتنی بوو، ئەوا لە خەودا بە خزمەتی دەگەیت!..

ئیمامی عەلی ﵁ دەفەرموێت: لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە زەمانی ئیمامی عومەردا ﵁، شەوێکیان بە خزمەتی خۆشەویستم ﷺ گەیشتم، لە خەومدا دوای نوێژی بەیانی لە مزگەوت ئافرەتێك لە دەرگای دا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: عەلی بڕۆ بزانە کێیە؟. کاتێك چووم تەماشام کرد، ئافرەتێك حەلاقەیەك خورمای پێیە و بۆ بەخشین هێناویەتی، منیش خورماکەم لێ وەرگت و بردمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ، ئەویش بەدەستی پیرۆزی دابەشی کرد بەسەر صەحابەکاندا، یەك یەك بەشی دان تەنها من مامەوە، پاشان دەنکێك خورمای خستە ناو دەمی منەوە زۆر شیرین و بەتام بوو، لە دڵی خۆمدا وتم: خۆزگە دەنکێك خورمای تری بدامەیە، لەو خۆشی و شادیەدا لە خەو خەبەرم بۆیەوە، کاتی بانگی بەیانی بوو، چووم بۆ مزگەوت، ئیمامی عومەر ﵁ پێش نوێژی بۆ کردین، دوای نوێژ کەسێك لە دەرگای مزگەوتی دا، ئیمامی عومەر ﵁ فەرموی: عەلی بچۆ بزانە کێیە؟کە چووم ئافرەتێك بوو حەلاقەیەك خورمای پێ بوو، هێنابووی بۆ خێر، لێم وەرگرت و بردمە خزمەتی ئیمامی عومەر و ﵁ ئەویش دابەشی کرد بەسەر

صەحابەکاندا و بە دەستی خۆشی دەنکێک خورماشی خستە ناو دەمی منەوە، ئەوەندە خۆش بوو لە دڵی خۆما وتم: خۆزگە دەنکێك خورمای تری بدامایەتێ!! ئیمامی عومەر ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد و فەرموی: عەلی چاوەڕێی دەنکە خورمای تر مەکە، بەخوا ئەگەر پێغەمبەر ﷺ بۆی زیاد بکردیتایە، منیش بۆم زیاد دەکردیت!!..

سُبحان الله، ئیمامی عومەریش ﷺ هەر لەو شەوەدا بە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشتوە و هەمان ڕوداوی بینیوە! ئاوا بە دڵ و بە گیان و بە دڵسۆزی لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بوون ﷺ ، لە دوای وەفاتیشی ئاوا دڵیان پاك بووە بەرامبەر یەکتری!.

ئیمانداران: بەڕاستی دەبێت بزانین کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەرە و پێشەوا و سەرداری هەموو پێغەمبەرانە لە ئادەمەوە تا عیسی (سەلامی خوا لە هەمویان بێت) نابێت وەکو کەسێکی ئاسایی و سادە سەیری بکەین، دەبێت ئاوا بیناسین و وەکو صەحابە ئازیزەکان خۆشمان بوێت، چونکە گوێڕایەڵی بەرهەمی خۆشەویستیە، فەرموون گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرن کە ڕادەی گوێڕایەڵی صەحابەکان دەردەخات بۆ ئەمر و فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ:

عَنْ جابر ﷺ قال: لَمّا استَوى رَسُول الله ﷺ يومَ الجُمُعَة قال: (اجلِسُوا)، فَسَمِعَ ذلكَ إبْنُ مَسْعُود ﷺ ، فَجَلَسَ عَلى بابِ المَسْجِد، فَرآهُ رَسُول الله ﷺ فَقال: (تَعالَ يا عَبْدالله بنْ مَسْعُود). رواه ابو داود و صحَّحه الألباني في صحيح سُنَن ابي داود.

واتە: جابر ﷺ دەفەرموێت: ڕۆژی جومعە کە پێغەمبەری خوا ﷺ چووە سەر مینبەری پیرۆزی فەرموی: (ئەی خەڵکینە دانیشن لە شوێنی خۆتان)، لەوکاتەدا عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود ﷺ دەهات بەرەو مزگەوت، گەیشتە دەرگای مزگەوت و کە گوێی لێ بوو پێغەمبەر ﷺ فەرموی دانیشن، یەك هەنگاوی تری هەڵنەهێنا و لە شوێنی خۆی دانیشت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (ئەی عەبدوڵڵا وەرە پێشەوە بۆ ناو مزگەوت مەبەستم تۆ نەبوو)!..

تەماشاکەن، عبداللەی کوڕی مەسعود ﷺ یەك هەناسە فەرمانەکەی پێغەمبەری ﷺ دوا نەخست و یەکسەر دانیشت لەبەر دەرگا و یەك هەنگاو نەهاتە پێشەوە.

بەڕاستی ئیمانداران: ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستمان بەوە هەیە کە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بین ﷺ ، وەرن با لەیادی لەدایك بوونیدا تێبگەین ئەم مەولودە عەزیزە کێیە؟، ئەم لەدایك بووە کێیە؟، ئەم ڕەحمەتە کێیە؟، وەرە صەڵاواتی لە دیدار لێبدە، وەرە ویژدانت ئاسودە بکە، وەرە ناخت زیندوو بکەرەوە، وەرە بیناسە و شانازی پێوە بکە کە سەرکردە و ڕابەرێکی ئاوات هەیە، کە ڕەحمەتی خوایە و پێمان خەڵات کراوە، خۆی فەرمویەتی ﷺ : (أنا رَحْمَةٌ مُهْداة)، ئەو زاتە پێشەوایەکە دوژمنانیشی دانیان بە گەورەیی و عەزەمەتی داناوە، (و الفَضلُ ما شَهِدَ بِهِ الأعداءُ)..

(ماهاتما غاندی): ماهاتما: واتە دەروون بەرز و پیرۆز، ئەندازیار بووە و ناوی (کرمشاند غاندی)یە، لە (١٨٦٩ – ١٩٤٨) ژیاوە، یەکێکە لەو سەد کەسەی کە مێژووی جیهانیان گۆڕیوە، لە وتارێکیدا بۆ رۆژنامەی (ینج إندیا) گەنجی هیندی باسی پێغەمبەری خوا ﷺ بەم شێوەیە دەکات و دەڵێت: (ویستم خەصڵەتەکانی ئەو مرۆڤە بناسم کەبێ ناکۆکی دڵی ملیۆنەها مرۆڤی بۆخۆی کێش کردبوو، بەوپەڕی دڵنیای یەوە شمشێر ئیسلامی نەگەیاندۆتە ئەم پایە بەرزە، بەڵکو گەیشتنی بەم پایە بەرزە بەهۆی سادەیی، ووردبینی، ڕاستگۆی، هونەرمەندی، دڵسۆزی و ئازایەتی محمدﷺ بووە، ئەمانە ئیسلامیان گەیاندۆتە ئەم شوێنە نەوەك شمشێر).

یەکێکی تر: د.مایکڵ هارت: ئەمریکییەو چەند دکتۆرای بەدەست هێناوە لەبارەی گەردوون ناسی، وەیەکێکە لەزانا بەناوبانگەکانی بواری فیزیای جێ بە جێ کاری(الفیزیاء التطبیقیّة)، دەڵێت: لەکتێبی (سەد پیاوە ناودارەکە)، بەعەرەبی: ( دراسة في المائة الاوائل): یەکەم کەسێك لەنێوان گەورەترین پیاوانی مێژوو هەڵی بژێرم محمدﷺ کەهەندێك کەس توشی سەرسامی دەکات (چونکە نوسەر خۆی مەسیحییە) بەڵام تاقە پیاوبووە لەمێژودا لەلایەنی ئاینی و دونیای باشترین شێوە سەرکەوتنی بەدەست هێنابێت.

محمدﷺ گەورەترین ئاینی لەجیهاندا دامەزراندو بلأوکردەوە ،بوو بە یەکێك لە سیاسەت مەدارە گەورەکانی جیهان، لەم ڕۆژگارەدا و دوای

تێپەڕ بوونی نزیکەی (١٣) سەدە بەسەر کۆچ کردنیدا، هێشتا کاریگەریەکی بەهێزی ماوە.

ئەمڕۆش دوای (١٤٢٩) ساڵ وا لە دوای سەرهەڵدانی شێوازی نوێی زانستی بۆ زانینی ڕادەی کەسایەتیەکانی جیهان لە دوای سەدەی بیستەمەوە بە بەکارهێنانی زانستی ئامار، پێغەمبەری خوا ﷺ بە یەکێك لە ناودارترین کەسایەتی جیهانی هاتۆتە هەژمار، دوای بڵاو بوونەوەی هەبوونی زۆرترین ناو لە جیهاندا کە ناوی (محمد)ە ، سایت و ڕۆژنامەکان لەڕێی ڕاپرسیەوە، بەردەوام شێوازی تر بەکار دەهێنن تا بزانن کاریگەرترین کەسایەتی لە جیهاندا کێیە!.

لە تازەترن زانیاریدا کە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاو کراوەتەوە ناوی (٢١) کەسایەتی جیهانی خراونەتە ڕوو بۆ ئەوەی بزانرێت کاریگەرترین کەسایەتی کێیە؟، لە ناو کەسایەتیەکاندا هەریەك لە پێغەمبەر عیسا ﷺ و محمد ﷺ و لە زانایان ئەنیشتاین و فرۆید و داروین و هیتلەر و مارکس و ..هتد. خراونەتە ڕوو، بە پێی دوایین ئەنجام دەرکەوت کە حەزرەتی محمد ﷺ (٨٦٪)ی دەنگەکان و پێغەمبەر عیسا ﷺ (١٣٪)ی دەنگەکانی بە دەست هێناوە، کە ئەم دوو ڕێژەیە بەرزترین ڕێژەن تۆمار کراون، هەروەها ژمارەی دەنگدەران بە پێی ئەو زانیاریەی کە ڕۆژنامەی (Elmundo) لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوی کردۆتەوە (١٩٠,٥٥٠) کەس دەنگی داوە لەو ڕێژەیە (١٤٠,٢٤٤) کەس

ئەمنگی بۆ پێغەمبەری ئیسلام ﷺ داوە، (٢٣,٤٧٥) دەنگیش بۆ پێغەمبەر عیسا ﵇ بووە..!..

ئەوەتا ئەمڕۆ ناوی پیرۆزی محمد لە هەموو ناوێك زیاترە لە جیهاندا (٦٥) ملیۆن کەس ناوی محمدە.

وە شتێکی سەلمێنراوە کە هەموو ناوێك کۆن دەبێت، تەنها ناوی پیرۆزی محمد ﷺ نەبێت، بۆیەش لە خۆشەویستی ئەو سەردارەدا کەم کەس هەیە لە کوردستاندا لە ماڵەکەیدا ناوی (محمد) نەبێت، هەر لە کوردستانی باشوردا پیاوێکی خواناس کە چەند ساڵێك لەمەوبەر کۆچی دوایی کردووە، کوڕێکی ناوی (محمد) بووە، هەرچەندە باوکەکە خۆی ریشی سپی بووە و کوڕەکەی تەمەنی نزیکەی (١٠) ساڵان بووە، کەچی هەرگیز لە ڕێگادا کە بەیەکەوە ڕۆیشتون، پێش کوڕەکەی نەکەوتووە و فەرمویەتی: چونکە ناوی (محمد)ە لەبەر حورمەتی ناوی پیرۆزی پێغەمبەر ﷺ حەدم نیە پێشی بکەوم!!

بەڵێ ئەوا ئەمڕۆش لە کوردستان ئاوەدان و ئازاددا

کۆرپەیە تر ، چاوی بە ژیاندا هەڵهێنا

باوك و دایکی زۆر تێ ڕامان

ئەو کۆرپەیان، بە چ ناوێکەوە ناونێن

کە شاناو بێ، ناوی زاتێکی زۆر گەورە و

ناودارێکی میهرەبان بێ

زێدە دڵسۆز و خەمخۆری چەوساوەکانی جیهان بێ

ئاشنای خاك و ئاوو ڕۆڵەی

پێنج پارچەکەی کوردستان بێ

شا نمونەی ڕەوشت بەرزی و

لێبوردەیی لە ژیان بێ

ناوێکی پڕ تام و مانا و . . بۆ زار سادە و زۆر ئاسان بێ

بەڵێ، قوربان، گەلێ ناو خرا بەردەستیان

زۆر تێ ڕامان، سەریان برد و سەریان هێنا

لە دوا بڕیار

بە خۆشەویستی تۆی سەروەر

ناوی محمدیان لێ نا . . .

داواکارم خوای گەورە خۆشەویستی خۆی و پێغەمبەرە نازدارەکەی لە دڵماندا زیاد بکات و بەر شەفاعەتی ئەو خۆشەویستەمان بکەوین. اللّهُم آمین.

**سەرچاوەکان:**

١.قورئانی پیرۆز.
٢.شیعری شنەی سۆز - جلال الدین نجم الدین - ل١٢/١٣.
٣.مَنْهَلُ المُؤمنِين وَ مَورِدُ الخُطَباء - د.محمود احمد البَرشة - ص٨٧.
٤.مُجلَة - حَراء - العَدَد:٣/ص٣٣ - ٤/٢٠٠٦.
٥.مَعَ الأنبياء في القَرآن الكَريم - عَفيف عَبْدُ الفَتاح طَبارة / ص٣٣٥.
٦.بەخۆداچونەوەیەك لە خۆشەویستی پێغەمبەردا ﷺ -ئەندازیار عُثمان محمد رشید- ل٢٤.
٧.بەرەو پەروەردەی ئیسلامی - ئەندازیار عُثمان محمد رشید - ل١٤١.
٨.السلسلة الذهبية - محمود المَصري - ابوعَمّار - ج٣/ص٩٢ - ص٦٢٨.
٩.تەنها محمد ﷺ - پشتیوان کاکل - ل٦.
١٠.ڕۆژنامەی کۆمەل - ژ:٢٦٦ لە ٣١/٣/٢٠٠٧.

# وتاری چوارەم بۆ مانگی ربیع الاول
# ناسینی پێغەمبەری خوا ﷺ لە قورئانەوە

( الحَمدُ للّٰهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

ئیماندارانی بەڕێز: مرۆڤ بە شایەتومان دێتە چوارچێوەی ئیسلامەتیەوە و ناسنامەی بەڕێزی موسڵمانیەتی وەردەگرێت (أشهَدُ أن لا إلهَ إلاّ الله وَ أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُول الله)، جا چۆن باڵندە بە یەك باڵ نافڕێت، ئینسانی ئیمانداریش بە تەنها بە (لاإله إلا الله) نابێتە موسڵمان ، بەڵکو دەبێت (و أشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسول الله)شی لەگەڵ بێت. ئەمجا بە هەردوو باڵەکە بەرەو ڕەزامەندی خوا و سەرفرازی بەرزت دەکاتەوە.

جا چۆن (لا إلهَ إلا الله) شەرت و مەرجی خۆی هەیە، وەکو خۆ پاراستن لە شیرك و جێگیر بوونی محەببەتی خوا و ئومێد بە خوای گەورە ، وە ئیمان بە (لا اله الا الله) تازە دەبێتەوە.

دەبێت باڵی دووەمی ئیسلامەتیش کە (أشهَدُ أنَّ مُحَمَّداً رَسُول الله)یە تازە بکەینەوە، بەتایبەتی لەم مانگی مەولودەدا، ئەویش بەم شێوەیە:

یەکەم: (الإيمانُ به ﷺ و الرِّضا به و نَبيّاً وَ رَسُولاً) واتە: ئیمان هێنان بە پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێغەمبەر و چاوساغ و ڕابەری خۆت قبوڵ بکەیت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (والّذي نَفْسي بِيَدِهِ لا يَسمَعُ بي أحَدٌ مِنْ هذهِ الأمَّةِ يَهُوديٌ او نَصْرانيٌ ثُمَّ يَمُوتُ وَ لَمْ يُؤمِنْ بالّذي أرْسِلْتُ بِهِ الاّ كانَ مِنْ أصْحابِ النّارِ) رواه مُسلِم.

واتە: سوێند بەو زاتەی کە نەفسی منی بە دەستە کە (الله)یە، هەرکەسێك لەم ئوممەتە یەهودی بێت یان نەصرانی (گاور) ناوی منی بیستبێت و پێی گەیشتبێت کە من پێغەمبەری خوام، پاشان کە مرد ئیمانی نەهێنابێت بەو قورئانەی کە من هێناومە لەلایەن خواوە، ئەوا بە دڵنیایەوە جێگەی ناو ئاگری دۆزەخە!..

کەواتە: هەرکەسێك بڕوای دامەزراو و تەواوی نەبێت بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محمد ﷺ ئەوا گومان لە کافرێتیدا نیە، هەرچەندە خۆشی بە خاوەنی دینی ئاسمانی بزانێت.

دووەم: (الشَّهادة له بالبَلاغ) واتە: شەهادەی بۆ بدەی کە بەڕاستی ئەو پێغەمبەرە دڵسۆزە، بە ئەمانەتەوە بێ زیاد و کەم دینی ئیسلامی گەیاند بە ئوممەتەکەی. لە حەجی ماڵ ئاواییدا بەرامبەر بە هاوەڵانی خۆشەویستی وەستا و فەرمووی: (اللّهُمَّ هَلْ بَلَّغْتُ، اللّهُمَّ فَاشْهَدْ)، ئەی خوای پەروەردگار تۆ ئاگاداریت کە من پەیامی ئەم ئیسلامەم گەیاند، ئێمەش لەم کاتەدا پڕ بە دڵ شایەتی ئەدەین و بە زمان دەڵێین ڕوو لە ڕۆحی پیرۆز و هەمیشە بە ئاگای دەکەین و دەڵێین: بەڵێ ئەی خۆشەویستمان، شایەتیت بۆ دەدەین کە بەڕاستی بەبێ دریغی کردن پەیامی خوات گەیاند بە ئێمە، وە باشترین ئامۆژگاریکار بوویت بۆ ئوممەتەکەت، وە بە تەواوی مانای تێکۆشان بۆ خوا تێکۆشایت، وە شایەتی دەدەین کە کاتێك وەفاتت کرد و گەڕایتەوە بۆلای پەروەردگارت، لەسەر ڕێبازێك بەجێت هێشتین کە ئەوەندە ڕەوان و بێ گرێ و گۆڵە کە شەوەکەشی وەکو ڕۆژەکەی ڕووناکە، مەگەر کەسێك کە حەزی لە بەهیلاك چوون بێت، ئەگینا لەو ڕاستە شەقامە لا نادات.

سێیەم: ناسینی پێغەمبەری خوا ﷺ بەو شێوەیەی کە قورئان باسی کردووە، هەرکەسێك بیەوێت بە ڕاستی پێغەمبەر ﷺ بناسێت، پێویستە بچێتە خزمەت قورئانی پیرۆز، جا کاتێك دەچینە خزمەت قورئان بۆ ناسینی پێغەمبەر ، دەبینین بەم شێوەیە پێمان دەناسێنێت.

**یەکەم:** باسی ئەوە دەکات کە خوای گەورە بۆچی پێغەمبەری ناردووە بۆ سەر ئوممەتی ئیسلامی، دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ۞ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذۡنِهِۦ وَسِرَاجٗا مُّنِيرٗا ۞ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضۡلٗا كَبِيرٗا﴾ الأحزاب: ٤٥-٤٧.

شێخ محمد علي الصّابونی لە (صَفْوَةُ التَّفاسير)دا دەفەرموێت لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا: (وَصَفَهُ تَعالى بخَمْسَةِ أوْصاف كُلُّها كَمالُ وَ جَمالُ و ثَناءٌ و جَلال) ئەو پێنج وەصفەش ئەمانەن:

١.شاهداً: أي شاهِداً عَلى أُمَّتِكَ وَ عَلى جَميعِ الأمَمِ بأنَّ أنْبياءَ هُمْ قَدْ بَلَغُوهُم رِسالَةَ رَبِّهِمْ. واتە: ئەی محمد ﷺ بەڕاستی تۆ شاهیدی لەسەر ئوممەتەکەت وهەموو ئوممەتانی تر کە پێغەمبەرەکانیان پەیامی خوایان پێ گەیاندون.

٢.مُبَشِّراً: أي مُبَشِّراً لِلْمُؤمنينَ بجَنّاتِ النَّعيم. واتە: موژدە بدە بە ئیمانداران بەوەی کە بەهەشتی پڕ خێر و بەرەکەت و خۆشی چاوەڕێیانە.

٣.وَ نَذيراً: وە ئاگادار کەرەوەیە بۆ کافران لە عەزابی دۆزەخ.

٤.وَ داعِياً الى الله بإذْنه : بانگەوازی مرۆڤایەتی دەکات بۆ لای خوا، بۆ یەکتا پەرستی و بەندایەتی و گوێڕایەڵی خوای گەورە، بە پێی فەرمان و دەستوری خوا، نەك بە پێی هەوا و ئارەزووی خۆی.

٥.وَ سِراجاً مُنِيراً: واتە: ئەی محمد تۆ بوویتە چرایەکی نورانی و ڕوناك بۆ خەڵکانی جیهان.

هەندێك لە موفەسیرین زۆر جوانیان فەرمووە کە دەڵێن: (سِراج) چرا نیە، بەڵکو تیشکی ڕۆژە، کە تیشکی ڕۆژ هەڵهات، کەس پێویستی بە چرا و مۆم و گڵۆپ نیە، ئەوەی بیەوێت بەوانە بەرپێی خۆی ڕووناك بکاتەوە، ئەوە خۆی خەڵەتاندووە.

موفەسیری بەناوبانگ (إبن كَثير) دەفەرموێت لە تەفسیری (سراجاً مُنيراً): أي أنتَ يا مُحَمَّد كالشَّمْسِ فِي إشْراقِها و إضاءَتِها لا يَجْحَدُها إلا مُعاند. واتە: تۆ ئەی محمد وەکو ڕۆژ وایت لە تیشك دانەوە و ڕووناك کردنەوەی هەموو دونیادا، کە هیچ کەس ئینکاری ڕۆژ و ڕووناکیە بێ سنوورەکەی ناکات، مەگەر کەسێکی عیناد و نەسەلمێنەر کە یاسای (بشفرێت هەر بزنە) بەکار دێنێت..

**دووەم:** گەورەیی پێغەمبەرمان ﷺ لەوەدا بۆ دەردەکەوێت کە کۆمەڵێك تەکلیفی خراوەتە سەر، کە ئەو تەکلیفە نەخراوەتە سەر کەسی تر و ئەوەش نیشانەی گەورەیی پێغەمبەرە ﷺ، بۆ نموونە: لەو کاتەدا کە بوو بە پێغەمبەر ، حەزرەتی جوبرەئیلی بە شێوەی خۆی بینی، کە بە توندی گوشی بە خۆیەوە، کە هاتەوە بۆماڵەوە لەگەڵ ئەو هەموو

ئازایەتیە و بە جەرگێتیەی ، کەچی ئەوەندە دیمەنەکە سامناك بوو، کە هاتەوە فەرمووی: (خەدیجە، دامپۆشە . . . دامپۆشە).

وە صەحابەکان دەفەرمون: هەر کاتێك وەحی بۆ بهاتایە، لەبەر قورسی وەحیەکە لە کاتی شیدەتی سەرما و سۆلە، عەرەقە بە ناوچەوانی پیرۆزیەوە ئەهاتە خوارەوە.!..

وە کاتێك قورئان فەرمانی پیٚ کرد و فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ۞ قُمْ فَأَنذِرْ ۞ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ۞ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ۞ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ۞ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ۞ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ﴾ المدثر:١-٧. ئیتر ئەو هەستانەوەیەی کە هەستایەوە ئیسراحەتی نەکرد هەتا ئەو ڕۆژەی چووە بارەگای خودا، فەرمووی: (ئەی خەدیجە، ئەی هاوسەری خۆشەویست و خەمخۆرم، ئەو جێگای خەوتنە کۆ بکەرەوە ( لَقَدْ مَضى عَهْدُ النَّوْمِ) تازە کاتی خەوتن بەسەر چوو. .)، هەروەها پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ فەرمانی پیٚ کرا بە شەونوێژ، کە تەنها لەسەر ئەو واجبە و لەسەر کەسی تر لە ئوممەتەکەی واجب نەکراوە، خوای گەورە فەرمانی پیٚ دا کە هەڵسێت بۆ شەو نوێژ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ۞ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ۞ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ۞ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ۞ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا﴾ المزمل:١-٥.

پاشان خوای گەورە فەرمانی پیٚ کرد بە پشت تێکردنی کافران و فەرمووی: ﴿فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ الحجر: ٩٤.

دوای ئەوە خوای گەورە فەرمانی پێ دا بە گەیاندنی ئەم قورئانە بە هەموو خەڵکی و فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ المائدة:٦٧.

دواتر فەرمانی پێ دا بە ئیستیقامەت و دامەزراوی و فەرمووی: ﴿فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ﴾ هود:١١٢. وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئەم ئایەتە پیری کردم)...

ئەمجا فەرمانی پێ کرد بە جیهاد و خوای گەورە فەرمووی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ﴾ التوبة:٧٣.

بەڵێ، ئەم فەرمانانە کە یەکەم جار لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ واجب کران، بەڵگەن لەسەر گەورەیی پێغەمبەری خوا ﷺ.

**سێیەم:** قورئانی پیرۆز لە یەك کاتدا مەدح و تەکلیف بۆ پێغەمبەر ﷺ بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە، وەکو لە سورەتی (الإنشِراح – الضُحى)دا دەردەکەوێت.

لە سورەتی (الانشِراح)دا دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ نَشۡرَحۡ لَكَ صَدۡرَكَ ۞ وَوَضَعۡنَا عَنكَ وِزۡرَكَ ۞ ٱلَّذِيٓ أَنقَضَ ظَهۡرَكَ﴾ ئەمە ئیمتینان و خۆشەویستی بۆ دەربڕینە، ﴿وَرَفَعۡنَا لَكَ ذِكۡرَكَ﴾ ئەمەش مەدح و پایە بڵندی باس کردنیەتی، ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ۞ إِنَّ مَعَ ٱلۡعُسۡرِ يُسۡرًا ۞

فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ ۝ وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب﴾ ئەمەش تەکلیفی سەر شانیەتی.

یاخود لە سورەتی (الضُحی)دا دەفەرموێت: ﴿مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ﴾ ئەمە مەدح و ثەناو ڕێزە، ﴿أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ ۝ وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ ۝ وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ﴾ ئەمەش خۆشەویستی و ئیمتینانە، ﴿فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ ۝ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ﴾ ئەمەش تەکلیفە..

کە بە ڕاستی ئەمەش گەورەیی و خۆشەویستی خوایە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، کە ئاوا ڕێز لە هەموو ساتێکی تەمەنی پیرۆزی دەگرێت، چ تەمەنی منداڵی و ساوایی و بێ باوکی، چ تەمەنی هەژاری و شوانی و نەداری، تەنانەت سەردەمێکی تەمەنی کە بە دوای دۆزینەوەی خوای تاك و تەنها و ڕێبازی ڕاستی ژیاندا دەگەڕا و بیری دەکردەوە، خوای گەورە هەمووی بە ڕێزەوە تۆمار دەکات لە قورئاندا و دەبێتە ڕێز بۆ هەتیوان و منداڵانی بێ ناز کەوتوو، کەسانی هەژار و نەدار و شوان و کرێکار، وە ئەوەندە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە لای خوای گەورە، خوای گەورە بۆ دەربڕینی خۆشەویستی خۆی بۆ ئەو خۆشەویستەی کە محمد المصطفی یە ﷺ ، باسی ئەو فەزڵ و چاکانەی بۆ دەکات کە لەگەڵی کردووە، کە چۆن شارەزای ڕێگای ڕاستی کردووە و بە چاو ساغ و چرا بە دەستی ئەو شا ڕێگا بێ پێچ و ڕاست و درووستە، وە چۆن لە

هەژاری ڕزگاری کردووە و دەوڵەمەندی کردووە، وە لە کاتی هەتیویدا هەرگیز بێ ئەنوایی بە خۆیەوە نەبینیوە و لە باوەشی حەلیمەوە تا ئامێزی دایکی و پاشان ئامێزی ئوم ئەیمەنی بەوەفا و دڵسۆز و گەیاندی بە باوەشی باپیری (عبد المطلب) کە ئەوەندە ڕێزی پێغەمبەری خوایﷺ دەگرت لە تەنیشت خۆی دادەنیشاند لەو جێگا تایبەتیەی کە بۆ عبدالمطلب ئامادە کرابوو، لە تەنیشت کەعبەوە هیچ کەس بۆی نەبوو لەوێدا دابنیشێ. بەڵام عبدالمطلب لە تەنیشت خۆیەوە لەسەر ئەو جێگایە دایدەنیشاند و کە کوڕەکانی خەریك دەبوو دەری بکەن دەیوت: وازی لێ بێنن ئەم کوڕەزایەم دواڕۆژێکی زۆر گەورەی دەبێت. وە لە دوای وەفاتی عبد المطلبی باپیری پێغەمبەری نازدار بێ ئەنوا نەبوو، بەڵکو خوای گەورە خستیە لای پیاوێکی بەڕێز و دڵنەرم و مەردی مەیدان کە (أبو طالب)ی مامی بوو، کە لە هەموو کوڕەکانی زیاتر ڕێزی لە محمد دەگرت و هەتا دوا هەناسەی دیفاعی لێ کرد و پشتی بەرنەدا.

خوای گەورە هەموو ئەمانە بۆ خۆشەویستەکەی کە حەزرەتی محمدەﷺ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ من ئاوا چاودێری تۆم کرد و نەمهێشت بێ ناز بکەویت، کەواتە تۆش ﴿فَأَمَّا ٱلۡيَتِيمَ فَلَا تَقۡهَرۡ ۞ وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنۡهَرۡ﴾، باوکێکی بەڕەحم و بە سۆز بە بۆ بێ باوکان و منداڵانی نازدار. وە هەرگیز نەدار و هەژار و چەوساوان پشت گوێ مەخە و لە مەجلیس و کۆڕی خۆت دووریان مەخەرەوە، ئەمەش تەکلیفە.

**چوارەم:** قورئانی پیرۆز هەموو ئەو شوێنانەی باس کردووە کە پێغەمبەری خواﷺ کارێکی ئەنجام دابێ و لەگەڵ ڕەوشتە جوان و

خولقە عەظیمەکەی ئەودا نەگونجێ، یەکسەر خوای گەورە ئاگاداری کردۆتەوە.

بۆ نمونە: لە کاتێکدا سەرکردەکانی کوفری مەککە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ بۆ ئەوەی لە بارەی خوای گەورە و قورئانەوە قسەیان بۆ بکات، پێغەمبەری خواشﷺ بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە لەگەڵیان دانیشت و قسەی بۆ دەکردن، لەو کاتەدا کەسێکی نابینای موسڵمانی دڵ پڕ لە ئیمان و خۆشەویستی خوا و پێغەمبەر لەبەر ئەوەی نابینا بوو چاوی لێ نەبوو کێ لە خزمەت پێغەمبەری خوادایە، هاتە خزمەتی و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەو قورئانەی کە خوای گەورە فێری کردوی بە منیش بگەیەنە، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ بە هاتنەکەی لەو ساتە وەختەدا کە ئەو سەرکردانەی کوفری مەککەی لا دانیشتبوون. پێی خۆش نەبوون بەڵام بە قسە هیچی نەوت، تەنها پشتی تێکرد و رووی گرژ کرد، یەکسەر لەو زەمان و زەمینەدا قورئانی پیرۆز هاتە خوارەوە و ئەمەی تۆمار کرد و ئاگاداری کردەوە کە ئەوە لەگەڵ رەفتار و رەوشتی بەرزی تۆدا ناگونجێ. ﴿عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ۝ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ۝ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ﴾...

لە روداوێکی تردا کافرە موشریکەکانی مەککە خەریك بوو پێغەمبەری خواﷺ رازی بکەن بەوەی کە دانیشتنی ئەمان تایبەتی بێ و لەگەڵ بیلال و صوهەیب و عەماردا دایان نەنیشێنێ چونکە هەژارن،

بەڵام خوای گەورە فەرمووی: ﴿وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ﴾ الكهف: ٢٨

وە قورئانی پیرۆز تەنانەت ئەوەشی بۆ تۆمار کردووین کە لە هەموو تەمەنی پێغەمبەرێتیدا یەکجار بیری چوو بڵێت (إنشاءَ الله) خوای گەورە چەند ڕۆژ وەحی وەستاند و پاشان بە ئایەتی پیرۆزی ﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ۞ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾ الكهف:23 - ٢٤. ئاگاداری کردۆتەوە کە هەرگیز بە بڕیاردانی حەتمی بڕیار نەدات لەسەر کارێك کە لە بەیانیدا دەیکات، ئیللا دەبێت بڵێت: إنشاءَ الله.

**پێنجەم:** قورئانی پیرۆز باسی پێغەمبەر ﷺ دەکات بەوەی کە مرۆڤە و بە بێ ویست و ئیرادەی خوا توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکی نیە، وەکو دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ الكهف:١١٠. کەواتە گەورەیی پێغەمبەر ﷺ لەوەدایە کە مرۆڤە و عەبدێکی ڕاستەقینەی خوای گەورەیە هەڵبژێردراوی خوایە بۆ پێغەمبەرایەتی و خاتەمی پێغەمبەرانە، بۆیە لە شایەتومانماندا بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێین: (نَشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُالله و رَسُولَهُ).

**خاڵی چوارەم:** لە مافەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لەسەرمان ئەوەیە: (مَحَبَّتُهُ و تَقْديمها عَلَى مَحبَّة النَّفْسِ و الوالَد و الوالد و لنّاسِ أجْمَعين) خۆشەویستی ئەم پێغەمبەرە خۆشەویستە لە دڵدا

بچەسپێت و پێش بخرێت بەسەر خۆشەویستی نەفس و منداڵ و دایك و باوك و تێکڕای خەڵکی، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی ئەو ڕاستیەی بۆ ڕوون کردوینەتەوە و فەرمویەتی: (لا يُؤْمِنُ أحَدَكُم حَتّى أكُونَ أحَبَّ إلَيهِ مِنْ والِدِهِ وَوَلَدِهِ و النّاسِ أجْمَعِينَ) رواه البُخاري و مُسلم عن انس.

واتە: هیچ کەس لە ئێوە ئیمانی تەواو نابێت تاوەکو لە دڵ و ناخ و هەست و نەستیدا وای لێ نەیەت کە منی بەلاوە خۆشەویستر بێت لە باوك و دایك و جگەرگۆشەی و لە تەواوی خەڵکی بە گشتی.

وە کاتێك کە حەزرەتی عومەری کوڕی خەطاب رضي الله عنه ڕووی لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد و فەرموی: (يا رَسُولَ الله ، أنْتَ أحبُّ إلَيَّ مِنْ كُلِّ شَيءٍ إلاّ مِنْ نَفسي) ئەی پێغەمبەری خوا سوێند دەخۆم کە تۆ خۆشەویستری بەلای منەوە لە هەموو شتێکی سەر ئەم زەویە تەنها لە نەفسی خۆم نەبێت، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: (لا والّذي نَفسي بِيَدِهِ حَتّى أكُونَ أحَبَّ إلَيْكَ مِنْ نَفْسِكَ) نەخێر ئەی عومەر، سوێند بەو کەسەی کە نەفسی من بە دەست ئەوە ئیمانەکەت تەواو و دامەزراو نابێت هەتا ئەو کاتەی کەوات لێ دێت منت بەلاوە خۆشەویستر دەبێت لە نەفسی خۆت، حەزرەتی عومەر رضي الله عنه بەخۆیدا چوەوە و بیری کردەوە کە بەڕاستی وایە، دەبێت پێغەمبەرم لە خۆم خۆشتر بوێت، چونکە من خۆم بە کەڵکی خۆم نەدەهاتم، نەفسی خۆم بەرەو هیلاکەت و گومڕایی دەبردم، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی گرتم و لە گومڕایی و نەزانین ڕزگاری کردم.

بۆیە لە ناخی دڵەوە فەرموی: (والله أنْتَ أحَبُّ إلَيَّ مِنْ نَفْسي) ئەی پێغەمبەری دڵسۆزم ﷺ سوێند بە خوا ئێستا تۆی بەڕێز خۆشەویستری لە لام لە نەفس و ڕۆحی خۆم.. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (الآنَ يا عُمَر) ئا

ئێستا ئیمان و بیروباوەڕەکەت دامەزراوە ئەی عومەر کە وات لێ هات منت بەلاوە خۆشەویستترە لە نەفسی خۆت.

نمونەیەکی تر لە خۆشەویستی ڕاستەقینە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ، باسی یەکێك لە هاوەڵە بەڕێزەکان دەکەین کە ئەویش (خوبەیبی کوڕی عەدی)یە رضي الله عنه کاتێك بە دیلی کەوتە بەر دەستی کافرەکانی مەککە و بڕیاری کوشتنیان بۆ دەرکرد و بە دار خورمایەکدا هەڵیان واسی و خەریکی تیر باران کردنی بوون بۆ ئەوەی بە ئازارێکی زۆرەوە بیکوژن، ناوبەناو تیریان تێ دەگرت ولەو کاتەدا کە چەند تیرێك لە لاشەی پیرۆزیدا بوون و خوێن لە جەستەی دەهاتە خوارەوە، ئەبوسوفیان لێی نزیك بۆیەوە و وتی: ئەی خوبەیب (أَيَسُرُّكَ أَنَّ مُحَمَّداً عِنْدَنا نَضْرِبُ عُنُقَهُ وَ أَنَّكَ فِي أَهْلِكَ؟!) ئایا حەزت نەدەکرد و خۆزگە ناخوازیت کە ئێستا محمد لای ئێمە دیل بوایە و لە گەردنیمان بدایە و تۆش بە سەلامەتی لە ناو ماڵ و منداڵی خۆتدا ژیانت بەسەر ببردایە؟! خوبەیب رضي الله عنه بە بێ دودڵی و زۆر دلێرانە فەرموی: (لا واللە ما يَسُرُّني أنِّي في أهْلي وأنَّ مُحَمَّداً ﷺ في مكانه الَّذي هُوَ فيه يُصيبُهُ شَوْكَةٌ تُؤذيه).

فەرموی: نەخێر سوێند بە خوای گەورە حەز ناکەم و ئاوات ناخوازم کە من لە ناو ماڵ و منداڵی خۆمدا سەلامەت و بێوەی بژیم بەلاَم پێغەمبەری خوا ﷺ لە ناو جێگەی دانشتنیدا و لە ناو ماڵی خۆیدا تاکە دڕکێك ئازاری بدات.!!

ئەبوسوفیان کە ئەم وەلاَمەی لە خوبەیب رضي الله عنه بیست ئاوا بەو پەڕی ڕاستگۆییەوە وەلاَمی دایەوە بە ئەوپەڕی قەناعەتی دڵەوە، وتی: (ما رأَيْتُ أحَداً يُحِبُّ أحَداً كَحُبِّ أصْحاب مُحَمَّد مُحَمَّداً). واتە: من نەمبینیوە کەسێك ئاوا بە دڵ و بە گیان کەسێکی خۆش بوێت، بە وێنەی خۆشویستنی ڕاستەقینەی هاوەڵانی محمد بۆ محمدی سەرکردەیان. ئەمجا تیریان بۆ هاویشت و سەرەنجام شەهیدیان کرد. لە سەرە مەرگدا ئاخر وشەی خوبەیب

ﷺ ئەوەبوو کە فەرموی: خوایە گیان خۆت ئاگاداریت کە من دەم و چاوی کافر نەبێت هیچم لێ دیار نیە، خوایە بۆخۆت سەلامی من بگەیەنە بە پێغەمبەری خۆشەویستم ﷺ !.. لە هەمان کاتدا کە ئەم داوایەی لە خوای گەورە کرد، پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو مزگەوتەکەیدا بوو لە شاری مەدینە لەگەڵ هاوەڵە ئازیزەکانیدا.. لە ناکاو بەبێ ئەوەی کەس هاتبێتە مزگەوتەوە و سەلامی لێ بکات، فەرموی: (وَ عَلَيكَ السَّلام وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكَاتُهُ) ئاگاداربن ئێستا خوبەیب شەهید کرا!!.

خوای گەورە داواکەی خوبەیبی دڵسۆزی ئیسلامی جێبەجێ کرد و سەلامەکەی بە حەزرەتی جوبرەئیلی ئەمیندا گەیاندە خۆشەویستەکەی کە محمد المصطفییە ﷺ. (ئەم بەسەرهاتە ئیمامی بوخاری ریوایەتی کردووە).

ئیمانداران: نمونەیەکی ترتان عەرز دەکەم لە خۆش ویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ، لە لایەن ئافرەتێکەوە کە بە کردەوە، لە کاتی هەواڵی دڵتەزێن و پشت شکێندا سەلماندی کە پێغەمبەری خوای ﷺ لەلا خۆشەویسترە لە نەفسی خۆی و ژیانی کامەرانی و پڕ شادی لەگەڵ خۆشەویستانیدا وە خۆشەویستر لە براو باوك و هاوسەری ژیان و کۆڵەکەی ماڵی، ئەویش ئافرەتێکی گومناو کە تا ئێستاش لە مێژووی ئیسلامدا ناوی نەهاتووە و دەڵێت: ئافرەتێك لە (بَني الأشْهَلْ)بەڵام بە ئیسلام و خۆشەویستی ڕاستەقینەی بۆ خوا و پێغەمبەر ﷺ بوو بە خاوەنی دڵێکی گەورە و چیایەکی لە بن نەهاتوو لە خۆڕاگری و شایەنی ئەوەیە کە دەم بە دەم بگێردرێتەوە و نمونەی پێ بهێنرێتەوە. ئەم ئافرەتە دڵسۆزە کە کاتێك جەنگی ئوحود ڕوویدا و هەواڵی شکستی موسڵمانان و شەهید بوونی حەفتا صەحابەی ئازیز گەیشتەوە شاری مەدینە، ئەم ئافرەتەش لەگەڵ خەڵکەکەدا بەرەو ڕووی سوپای ئیسلام ڕۆیشت و لە ڕێگادا هەواڵی شەهید بوونی

باوکی خۆشەویستی و برای پشت و پەنای و هاوسەر و هاوژینی ژیانی و باوکی منداڵەکانی پێ گەیشت، کە هەرسێکیان لە ئوحوددا شەهید بوون، بەڵام ئەو شێرە ژنە دەستی نەکرد بە بەخۆدا کێشان و هاوار و ناڵە، بەڵکو فەرموی: من خەمی لەوە گەورەترم هەیە، توخوا پێم بڵێن پێغەمبەری خوا ﷺ چۆنە؟! وتیان: شوکر سەلامەتە. بەڵام هەر دڵی ئاوی نەخواردەوە و جارێ نەچووە سەر لاشەی برا و باوك و مێردەکەی، بەڵکو هەر ڕۆیشت تا توشی پێغەمبەری خوا ﷺ بوو، وە بە چاوی سەری بینی کە پێغەمبەری خوا ﷺ ماوە و سەلامەتە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای خێری بۆ کرد و سەرەخۆشی لێ کرد و داوای لێ کرد ئارام بگرێت، ئەم ئافرەتە ئیماندارە فەرموی: (كُلُّ مُصيبَةٍ بَعْدَكَ جَلَلٌ - أي صَغيرَةٌ يا رَسول الله ﷺ).ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕاستی هەموو موصیبەتێك و کۆست کەوتن و لە دەست دانی ئازیز و خۆشەویستانێك هەرچەندە جەرگبڕ و پشت شکێن بێت، بەڵام مادەم شوکر بۆ خوا تۆ ماویت و سەلامەتیت، هەر بچوکە و هەر ئاسانە، کۆستی گەورە و ماڵ وێرانی من ئەوەیە کە تۆ شتێکت لێ بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەی لە باوك و برا و هەموو کەس دڵسۆزتر و خەمخۆر تر ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.!!.

ئیمانداران: صەحابەکانی پێغەمبەر ﷺ بە کردەوە ئەوەیان سەلماند کە پێغەمبەری خوایان ﷺ بەلاوە خۆشەویسترە لە هەموو کەسێکیان، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە باوکیشیان بێت.

بۆ نمونە: (عبداللەی کوڕی ئوبەی مونافیق) کە عبدالله لاوێکی دڵ پڕ لە ئیمان و دڵسۆزی پێغەمبەری خوابوو ﷺ، بەڵام باوکی پیاوێکی دوو ڕوو – مُنافِق–بوو، وە سەرۆکی مونافیقەکان بوو. ئەم گەنجە دڵسۆزە دڵپاکە، کاتێك بیستی کە باوکی قسەی نابەجێی بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ وتووە،

چووە خزمەت پێغەمبەری خواو ﷺ عەزی کرد: ئەی خۆشەویستی خوا، ئەی دڵسۆزتر بۆمان لە خۆمان و باوکمان و هەموو کەسمان، ڕێگەم بدە باوکم بکوژم چونکە بێ ئەدەبی بەرامبەر تۆ کردووە. بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: نا نەخێر، نابێت شتی وا بکەیت، با خەڵك نەڵێن محمد هاوەڵانی دەکوژێت!.

بەڕێزان: دەچینە خزمەت هاوەڵێکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە بەڕاستی بە کردەوە سەلماندی کە پێغەمبەری خوای ﷺ لە هەموو کەس خۆشتر دەوێت و بەبێ ئەو ژیانی مەحاڵە، ئەویش بانگ بێژە دەنگ خۆشەکەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە (بیلالی حەبەشی)یە. کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد و شاری مەدینە تاریکی بەسەردا هات و لەناو هەموو دڵ وماڵێکدا گریان بەرز بۆیەوە، لە یەکەم بانگدا دوای وەفاتی پێغەمبەر ﷺ. بیلالی حەبەشی کە گەیشتە (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُول الله) بانگەکەی بڕی و بۆی تەواو نەکرا، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دیار نەماوە لە ژوورەکەیەوە بێتە ناو مزگەت، بۆیە بیلال هەرچەند دەیزانی کە یەك نوێژ لە مزگەوتی (رسول الله) خێری هەزار نوێژی لە غەیری ئەو مزگەوتەدا هەیە، وە لە شاری مەدینەدا گەورە ئەصحابی وەکو ئەبوبەکر رضي الله عنه و عمر و رضي الله عنه عثمان و رضي الله عنه عەلی رضي الله عنه و عەشەرەی موبەشەرە دەژین وە هەموو خەڵکەکەی بیلالیان زۆر خۆش دەوێت و ئولفەتی پێوە گرتبوون، بەڵام هەموو ئەمانە نەیتوانی قەناعەتی پێ بکەن کە لە دوای پێغەمبەری خواوە ﷺ بتوانێت بڕوانێتە میحراب و مینبەرەکە و پێغەمبەری ﷺ لەسەر نەبێت، بۆیە چووە خزمەت ئیمامی ئەبوبەکر و رضي الله عنه فەرموی: ئەی خەلیفەی موسڵمانان، دەبێت ڕێگام بدەیت شاری مەدینە بەجێ بهێڵم و بەرەو وڵاتی غەریبایەتی بڕۆم، چونکە تازە ناتوانم بە بێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەم شارەدا بژیم و هەرگیز چاوم بەرایی نادات مزگەوت و میحراب و مینبەرەکەی بە بێ ئەو نورو جەماله بێ وێنەیە

بەم چاوانەم ببینم، ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ کە زانی بیلال ﷺ بەتەواوەتی لە ناخەوە سوتاوە لەتاوی پێغەمبەری خوا ﷺ، تازە کەس ناتوانێت سێبوری بە دڵی بدات و جێگای خۆشەویستی پێغەمبەری خوای ﷺ بۆ بگرێتەوە، باوەشی پێدا کرد و بە گریانەوە خواحافیزی لێ کرد، بیلالیش چوو بۆ وڵاتی شام، وە نەگەڕایەوە بۆ شاری مەدینە هەتا زەمانی ئیمامی عومەر ﷺ، کە شەوێکیان لە خەویا بە خزمەتی حەزرەتی ڕسول الله ﷺ گەیشت و فەرموی: ئەی بیلال، ئەوە بۆ وا لێمان دوریت و سەردانمان ناکەیت، بیلال ئەم دوریەت بۆ؟! بۆ بەیانی بیلال ئارامی لێ هەڵگیرا و بەرەو مەدینە بەڕێ کەوت و کە گەیشتە مەدینە شەو بوو، ڕاستەوخۆ چووە سەر گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەر و ﷺ سەلامی لێ کرد و پاشان سەلامی لە ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ کرد و هەموو برینەکانی هاتنەوە سوێ و هەموو ئەو یادگاریە خۆشانەی هاتەوە یاد و زۆر بە کوڵ گریا و هەتا بەیانی مایەوە. بەیانی حەزرەتی (حسن و حسین ﷺ) کە زانیان ئەوە بیلالە ﷺ لە مزگەوت، تەکلیفیان لێ کرد کە بە یادی زەمانی پێغەمبەری خواوە ﷺ بانگێك بڵێت، بیلال بانگی فەرموو، بەڵام کە گەیشتە (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُول الله) زۆر بە کوڵ گریا و بانگەکەی بۆ تەواو نەکرا و تەواوی مەدینە وایان زانی زەمانی پێغەمبەرە ﷺ، دەنگی گریان لە هەموو ماڵێکەوە بەرز بۆیەوە و دەتوت ئەو ڕۆژەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ تێیدا وەفاتی کردووە.

بەڵێ بیلال ﷺ هەرگیز بۆ ساتێکیش پێغەمبەری خوای ﷺ لە یاد نەکرد و لە سەرەمەرگدا بوو، ژنەکەی گریا و وتی: (واكَرِبَتاه) ئای بیلال گیان ئەوە بەجێمان دەهێڵیت؟ فەرموی: هاوسەری بەوەفام مەڵی (واكَرِبَتاه)، بەڵکو بڵێ (وافَرْحَتاه، غَداً أَلْقِى الأَحِبَّةَ مُحَمَّداً و حِزْبَهُ) بڵێ: ئۆخەی، ئای لەو خۆشیە کە دەمرم و بەیانی بە

خۆشەویستانم دەگەمەوە و دوای ئەو چەن ساڵ دابڕانە، باوەش دەکەمەوە بە پێغەمبەری خوا و ﷺ هاوەڵانیدا.

بەڵێ، دەبێت مرۆڤی موسڵمان ئاوا پێغەمبەری خوای ﷺ خۆش بوێت تاوەکو ئیمانەکەی ڕاست و دامەزراو بێت و بیسەلمێنێت کە بە حەق شایەتومانی بە پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوە.

خاڵی پێنجەم: تەماشا بکەیت پێغەمبەری خوا ﷺ چیکردووە، تۆش ئاوا بکەیت.

جارێکیان (عبداللەی کوڕی عومەر)یان بینی لە شوێنێك حوشترەکەی خۆی سوڕاندەوە، لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرا کە بۆچی ئاوات کرد؟! فەرموی: نازانم: بەڵام ئەوەندە هەیە کە پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە ئەویش لە ئاستی ئەو شوێنەی ئاوا حوشترەکەی خۆی سوڕاندەوە.

نمونەیەکی تر لەسەر ئەوەی کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پێ بە پێ شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتون، تەنانەت لەناو کاروباری ئاسایی و ژیانی ڕۆژانەشدا، بیلالی حەبەشی تەماشا دەکات، وا پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو شوێنێك دەڕوات، بیلالیش ؓ لە ترسی ئەوەی کە نەوەکا پێغەمبەری خوا ﷺ توشی مەترسیەك ببێت لە لایەن جولەکە و دوژمنانەوە، بۆیە بە شوێنیدا ڕۆیشت، ڕێگاکە تۆزێك قوڕ بوو، کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەستی کرد کە کەسێك بە شوێنیەوەیەتی، ئاوڕی دایەوە ئەوە بیلالە، بەڵام هیچ جێگا پێی دیار نیە، فەرموی: ئەی بیلال ئەوە بە کوێدا ڕۆیشتویت، خۆ تەنها جێگە پێی منە دیارە؟! بیلال ؓ فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ قاچم خستۆتە سەر شوێن پێیەکانی تۆ و حەزم کرد کە لە هەنگاوی ڕێگەشدا بەشوێن پێی موبارەکی جەنابتدا بڕۆم!..

بەڵێ ئیمانداران: ئێمەش ئەمڕۆ دەتوانین وەکو بیلالی حەبەشی ؓ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بین و پێ بە پێی ئەو خۆشەویستەمان بڕۆین،

چونکە ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ بەلاشە لە ناوماندا نەماوە، ئەوا تەواوی ئاکار و ڕەفتارە بەرزەکانی ، سوننەتە گەوهەر بارەکانی، زەردەخەنەی موبارەکی دەخوێنیتەوە و دەڵێیت ئێستا لە خزمەتیدایت و جوبرەئیل ئاسا ئەژنۆت بە ئەژنۆیەوە نوساندووە و دەتوانیت پرسیاری لێ بکەیت، چی لە دڵتدایە ئاڕاستەی بکە و وەڵامی دڵ ئاسودەکار وەربگرە، چونکە ئەوەی لەلای ئەو مامۆستای مامۆستایانە و چاوساغی چاوساغانە فێر نەبێت، هەتا ماوە بە نەزانی دەمێنێتەوە و وەڵامی پرسیارەکانی ژیانی دەست ناکەوێت.

ئەی ئیمانداری بەڕێز: ئەی ئەو کەسەی لەم مانگی مەولودەدا بەوپەڕی دڵگەشی و خۆشیەوە یادی لەدایك بوونی ئەو سەردار و سالارە دەکەیتەوە، وەرە بە کردەوە یادی بکەرەوە، بەوەی وەکو صەحابەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ شوێن ورد و درشتی ژیانی بکەوە، چی کردووە ئاوا بکە و لە لۆمەی نەزانان مەترسە و دڵنیابە بەختەوەرترین ژیان بەسەر دەبەیت لە دونیا و لە قیامەتدا و شەفاعەتی مسۆگەر دەکەیت.

داواکارم لە خوای گەورە و میهرەبان کە ڕەحم بە ئێمە و هەموو ئیمانداران بکات و لە دینەکەی خۆی شارەزاترمان بکات و لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرەکەی دامەزراومان بکات و بەرشەفاعەتی ئەو شافیعە بەرێزەمان بخات. اَللَّهُمَّ آمِين.

سەرچاوەکان:

١.قورئانی پیرۆز.

٢.مُنْهَلُ المُؤمِنِين وَ مَوْرِدُ الخُطَبَاء - د.محمود احمد بَرشَة - ص٧٩.

٣.السِلسِلَة الذَّهَبِيَّة - محمود المصري -ابوعَمَّار- ج٢ - ص٢٩، ص٣٢.

٤.موسڵمانی کامڵ - م.علی باپیر - ب١ - ل١٢٠.

# وتاری پێنجەم بۆ مانگی ربیع الاول

( الحَمدُ للّهِ ربِّ العالمین، و الصَلاةُ و السَلامُ علی سَیِّدنا مُحَمَّدٍ و علی آلهِ و صَحبهِ أجمَعِین )

ئیماندارانی بەڕێز: لە کۆتایی مانگی مەولودی حەزرەتی رسول الله داین ﷺ بە پشتیوانی خوای گەورە وتارەکەمان دەکەینە تەواوکەری وتاری ڕابردوو سەبارەت بەو خاڵانەی کە باسمان کردن، کە دەبێت هەڵوێستمان بەرامبەر پێغەمبەری خۆشەویستمان چۆن بێت، پێنج خاڵمان باس کرد و ئێستا إنشاء الله خاڵەکانی تر روون دەکەینەوە و دەڵێم و بالله توفیق.

خاڵی شەشەم: (أن نُصَدِّقَهُ في كُلِّ ما أخبَرَ به منَ الشَّرائعِ و الغُيُوبِ الماضيَةِ و المُستَقْبَلَة) واتە: بە دڵ و بە گیان بڕوامان ببێت بە هەموو شتێك كە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێ داوین لە شەریعەت و حوکمە شەرعیەکان و بڕوا و یەقینمان ببێت بە هەموو هەواڵێکی نادیار کە لە ڕابردوودا ڕوویداوە و بۆی باس کردوین، وە هەموو ئەو شتانەی کە لە داهاتوودا ڕوو دەدەن و خوای گەورە ئاگاداری کردۆتەوە و پێغەمبەری خواش ﷺ بە ئێمەی ڕاگەیاندووە، بە بێ هیچ چەند و چونێك بڕوای پێ بکەین چونکە ئەو پێغەمبەرە ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۞ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ﴾ النجم: ٣-٤.

ئیمانداری ڕاستەقینە بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت وەکو حەزرەتی ئەبوبەکری صدیق بێت ﷺ لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتی ئیسرا و میعراجی پێ کراو بۆ خەڵکی مەککەی گێڕایەوە و کافرانیش کە بە هەموو شێوەیەك گاڵتەیان بەو قسانە دەهات و بە بیری مرۆڤی ئاسایی بۆیان دەڕوانی، ئەوەندە باسەکەیان بەلاوە ناڕاست بوو، کە

چوونە لای ئەبوبەکری صدیق و ﷺ وتیان: محمدی هاوەڵت شێت بووە کە وا دەزانێت لە یەك تاکە شەودا لە مەککەوە چۆتە بَیت المُقدس و لەوێشەوە چۆتە ئاسمانەکان و لە هەمان شەویشدا هاتۆتەوەبۆ ناو جێگا خەوتنەکەی خۆی. ئایا ابوبکر ئەمە کەس بڕوا بە قسەی وا دەکات؟!! حەزرەتی ئەبوبەکرﷺ فەرموی: ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای فەرموو کە ئێوە باسی دەکەن؟ وتیان بەڵێ، ئەگەر بڕوامان پێ ناکەیت بڕۆ خۆت لێی ببیستە!. حەزرەتی ئەبوبەکرﷺ فەرموی: دەی کە مادەم ئەو وای فەرمووبێت ڕاست دەکات و بەلای منەوە گرنگ نیە چی دەڵێت، ئەوە بەلامەوە گرنگە ئەو بیفەرموێت. کافرەکان دەمیان بوو بە تەڵەی تەقیوو، کە ئەم باسەیان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺ ناوی ئەبوبەکری نا صدیق، ڕاستگۆی ئەم ئوممەتە.

جا ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر دەتەوێت شایەتومانەکەت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ قبوڵ کراو و دامەزراو بێت، ئەوا وەك ئەبوبەکری پێشەوا ﷺ ڕاستگۆ بە و هەرچی بیستت و زانیت کە فەرمودەی پێغەمبەرە بیخەرە سەر چاوو دڵت و یەکسەر بە دڵ و بە گیان و بە هەموو ناخت بڵێ: (صَدَقَ رَسُول الله) گرنگ نیە چی دەفەرموێت، گرنگ ئەوەیە ئەو فەرمویێتی.

نمونەیەکی تر: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ بە هاوەڵانی فەرموو: کێ لە ئێوە چۆتە بەهەشتەوە؟! عبداللەی کوڕی عومەر ﷺ فەرموی: من. (حەزرەتی عومەر ﷺ کە لەوێ دانیشتبوو وەڵامەکەی عبداللەی کوڕی بەلاوە سەیر بوو)، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: کێ لە ئێوە ئاوی بەهەشتی خواردۆتەوە؟ عبدالله ﷺ فەرموی: قوربان من.! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: ئەی کێ لە ئێوە خواردنی بەهەشتی خواردووە؟ عبدالله ﷺ فەرموی: من!. حەزرەت ﷺ فەرموی: ئادەی بزانم چۆن؟ بزانم چۆن لە خواردن و خواردنەوەی بەهەشتت خواردووە و هێشتا لە دونیادای چویتە

نـاو بەهەشـت و بەهەشـتت بـە چـاو بینیـوە؟!!عبـدالله ﷺ فـەرموی: ئـەی پێغەمبەری خوا ﷺ تۆ هەواڵت داوینیٚ کە لـە ئیسرا و میعراجدا بەهەشتت دیوە و لە ئاوەکەیت خواردۆتـەوە و لـە خواردنەکەیت خـواردووە، جا کە تۆ چویت مانای وایە ئێمەش چوین و هەواڵی تۆش گومانی تێدا نیە، هـەروەکو من چوبم وایە، ئەمەش جێی سەرسوڕمانی هاوەڵان بوو، کـەوا عبـدالله ﷺ بـە وردی بیری کردەوە و بە جوانی دەری بڕی.

ئیماندارانی بەڕێز: زۆر جار زانست پەی بە شتێك نابات، بـەڵام دوای چـەند سـاڵێکی تـر پـەی پـێ دەبـات و ڕاسـتی فـەرموودەکانی پێغەمبـەری خواﷺ دەردەکەوێت.

بـۆ نمونـە: پێغەمبـەری خـواﷺ لـە ١٢٠ فـەرمودەدا باسـی —الطـب التشريحي—دەکات کە هەنـدێکی تـازە زانسـت ئاشـکرای کـردوون. بـۆ نمونـە: پێغەمبـەری خـواﷺ دەفـەرموێت: (لـە لاشـەی مرۆڤـدا سێـسەد و شەسـت جومگە هەیە و حەق وایە و پێویستە کە بە جوڵانی هەریەکەیان مرۆڤ خێرێك بکات).

لێـرەدا دەبـێ بیربکەینـەوە و بڵـێین: باشـە ئەگـەر حـەزرەتی محمـدﷺ پێغەمبـەری خـوا نـەبێ بـە چـی دەزانـێ ئـەو ژمـارە جومگەیـە ئـاوا بـە دیاریکراوی ژمارەکەی بێ زیاد و کەم(بێ ئەوەی بفەرموێ نزیکەی) بڵـێ کە لـە لاشـەی مرۆڤـدا هەیە،کـە زانـستی توێکـاری لەشـی مـرۆڤ تـاوەکو سـاڵی ١٩٩٧ی زاینی لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنەی زانستی پزیشکیدا تەنها ٣٤٠ جومگەی بۆ دۆزرایەوە، تـا ئەوەبوو زانایـەکی ئـەڵمانی بـواری گـوێ و لـوت و قورگ بە ناوی —شین— جومگەیـەکی ئاوێتەی لە گـوێی ناوڕاسـتدا دۆزییـەوە کە پێکهاتووە لە دە جومگەی بچوك بەمەش ژمارەکە تـەواو بـوو. ٣٤٠ لەگـەڵ ٢٠ جومگـەی هـەردوو گوێـچکە دەکاتـە ٣٦٠ جومگـە هـەر وەکـو پێغەمبـەری خواﷺ هەواڵی داوە، کە ئەمەیان بە زانا ئەڵمانییەکە وت لـە کۆتایی حـەجی

ساڵی (٢٠٠٢)دا موسڵمان بوو.(وە سەردانی هەیئەی إعجازی علمی قورئان و فەرمودەی کرد).

نمونەیەکی تر (کیث مور)یش پرۆفیسۆرێکی کەنەدییە و یەکێکە لەو (دوانزە) پرۆفیسۆرەی کە بۆ هەر باسێك لە مەسەلەی کۆرپەلە زانیدا پرسیان پێ دەکرێت. ویستی بەخەیاڵی خۆی حەزرەتی محمدﷺ بە درۆ بخاتەوە، لەو فەرموودەیەیدا کە دەفەرمووێت:(کۆرپەلە لەپاش چل و دوو شەو لە رەحمدا دیاری دەبێت کە نێرە یان مێیە)، زۆر بەوردی دراسەی کرد و بە پێشکەوتووترین ئامێر چاودێری کۆرپەلەی کرد لە رەحمدا. لە شەوی دەیەم و بیستەم و سییەم و چل و، چل شەو و یەك سەعات و دووسەعات و...هتد، بۆی سەلما کە تا چل و دوو شەوەکە تەواو نەبێت رەگەزی کۆرپەلە دیاری نابێت لە ئەنجامی ئەمەوە ئەمیش موسوڵمان بوو، لە تەلەفیزیۆنی کەنەدی وتارێکی لەسەر ئەم مەسەلەیە پێشکەش کرد و چەندەها قوتابیشی موسڵمان بوون.

خاڵی حەوتەم: لە نیشانەکانی راستگۆیی شایەتمان بە پێغەمبەری خواﷺ ئەوەیە: هەواو ئارەزووی دەرونی خۆمان شوێن ئەو شەرعە بخەین کە ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەﷺ هێناویەتی. پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعاً لما جئت بهِ). قال النووي في الأربعين حديث صحيح.

واتە: (هیچ کەس لە ئێوە ئیمانی دامەزراو نابێت تا ئەو کاتەی هەواو ئارەزوی خۆی نەکاتە شوێنکەوتەی ئەو پەیامەی کە من هێناومە).

بەڵێ هەر کاتێ هەواو ئارەزووی نەفسی خۆمان کردە ئیمام و شەرعمان کرد بە مەئموم ئەوە گومڕا و سەرگەردان دەبین. وە هەرکاتێ هەوا و ئارەزووی خۆمان کردە شوێنکەوتەی مەئمومی شەرعی خوا ئەوە سەرفرازی دونیا و قیامەت دەبین.

لە ئیمام (احمد بن حنبل) گێڕراوەتەوە فەرموویەتی: ڕۆژێکیان لەگەڵ کۆمەڵێك لە ناسیاوانم بووم، ئەوان خۆیان رووتکردەوە و چوونە ناو ئاوەکە، بەڵام من بیری ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوام ﷺ کردەوە و کارم پێ کرد کە دەفەرموێ:(من كان يؤمن بالله و اليوم الآخر فلايدخل الحمام إلا بمئزر) رواه الترمذي. من لەبەر ئەم فەرموودەیە جلوبەرگەکەم دانەنا و خۆم رووت نەکردەوە. هەر ئەو شەوە کەسێکم لە خەوما بینی پێی وتم: ئەی ئەحمەد موژدەت لێ بێت کە خوا لێت خۆشبووە بە هۆی ئیشکردن بەو فەرموودەیەی پێغەمبەرەوەﷺ وە تۆشی کرد بە پێشەوا و ئیمام بۆ موسوڵمانان. ووتم: تۆ کێیت؟! فەرمووی: جوبرەئیلم ؑ.

جا ئیماندارانی بەڕێز: هەر ئێستا تەماشای خۆت و کار و کردەوەکانت بکە بزانە ئایا هەواو ئارەزووەکانی خۆت شوێن ڕێبازی پێغەمبەرﷺ خستووە، تا ڕاستی شایەتمانەکەت بسەلمێنی.

<u>خاڵی هەشتەم:</u> بەزەیی هاتنەوە بە ئومەتەکەیدا و کۆشش کردن لەجێبەجێکردنی پێداویستییەکانیاندا و پاراستنیان لە زەرەر و زیان، بەڵێ بەڵگە نەویستە کە پێغەمبەری خواﷺ بەنەصی قورئان((بالمؤمنين رؤوف رحيم)) لە نەفسی خۆمان دڵسۆزتر بووە بۆمان، جا کەوابوو هەرکەسێ شایەتمانی بەحەقی بە پێغەمبەری خواﷺ هێنابێ، نابێ کارێك بکات کە دڵی پێغەمبەرﷺ ئازار بدات. وە دڵی پێغەمبەریش بە چەند شتێك ئازار دەخوات، یەکێ لەو شتانە ئازاردانی ئیماندارانی ئومەتەکەیەتی،وە بە پێچەوانەوە هەرکەسێ بە بەزەیی و بەسۆز بێت بەرامبەر موسڵمانان،ئەوا دڵی پێغەمبەری خوایﷺ خۆشکردووە و تەنانەت پێغەمبەری خواشﷺ لە هەندێ فەرموودەدا بە هاوشانی خۆی داناوە لە بەهەشتدا، وەك دەفەرموێ: (أنا وكافل اليتيم في الجنة هكذا)–و أشار بالسبابة والوسطى– واتە: من و

پەخێوکەر و مشورخۆری منداڵی نازداری بێباوك لە بەهەشتدا وەك ئەو دوو پەنجەیە واین، ئاماژەی بە پەنجەی ناوەڕاست و شایەتمان کرد. واتە: من تەنها وەکو پێغەمبەرایەتی لە پێش ئەوەوەم..

جا ئیمانداران: با هەریەکەمان سەیری خۆمان بکەین، ئەگەر لە ناو کۆمەڵدا، نزیکمان، خزمەکانمان، دراوسێکانمان، هاوڕێ و هاوپیشەکانمان، لێمان ڕازین و لە دەست و زمان و دەرونمان ئەمینن و چاوەڕێی خێرمان لێدەکەن و لە شەڕ و خراپەمان بە دوورن، ئەوا نیشانەیەکە لە نیشانەکانی ڕاستی شایەتمان و خۆشەویستیمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ .

خاڵی نۆیەم: بەردەوام پەیمان لەگەڵ ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەدا ﷺ تازە بکەیتەوە لەوانەیە بڵێی چۆن؟!

ئیمانداران: تۆی ئیماندار دەتوانی ڕۆژانە دەست بخەیتە ناو دەستی پێغەمبەری خواوە و تەوقەی گەرمی لەگەڵ بکەی، بچیە خزمەتی و سەلامی لێ بکەیت و گفتوگۆی لەگەڵ بکەی، وەعد و پەیمانی بدەیتێ کە وەفاداری ڕێبازەکەی و فیداکاری سیرەتی موبارەکی بیت، ئەی ئەوە نییە لە هەموو تەحیاتێکدا دەڵێیت: ( السَّلامُ عَلَيكَ أيها النَبيّ وَ رَحمةُ الله وَ بَرَكاتُهُ) لێرەدا (کاف)ی (علیك) کافی خیطابە، و(أیها النبي)وەك ئەوە قسەی لەگەڵدەکەی کە بەرامبەری دانیشتبی.بە ڕاستی دڵنیا بن کە پێغەمبەری خوا ﷺ ، هەر بە تەنها بە لاشە ئێمەی بەجێهێشتووە، بەڵام ڕۆحی زیندووی لەگەڵماندایە، ئەوە نییە قورئان دەفەرموێت: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ الحجرات:٧ ، (فیکم) هەموو کەس دەگرێتەوە تا ئاخر زەمان، بزانن پێغەمبەرتان لەناودایە، ئەگەر لاشەی نورانی و موبارەکی دیار نییە، بەڵام مینبەرەکەی دیارە، مزگەوتەکانی، مەلا صالحەکان، ئەوانەی ئیمامی ساغ و پاکن، ئەوانەی سونەتەکەی زیندوو دەکەنەوە، ئەو مزگەوتە ئەو خوطبەیە، ئەو قورئانە، ئەو

**صلاواتە، ئەو نوێژە، ئەو حیجابەی خوشکانمان، ئەو ئەخلاقە بەرزەی گەنجەکانمان، ئەوە هەمووی پێغەمبەری خواتﷺ بیر دەخەنەوە ، ئەوە هەمووی بۆنی پێغەمبەری خوایانﷺ لێدێت، رەحمەتی خوا لەو پیاوە باشەی کە فەرموویەتی: (فأن لَم تكُن مَع نَفْسه يا أخي كُنْ مَعَ نَفْسهِ) ئەگەر بە نسیبت نەبوو شەرەفی بوون بە هاوەڵی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە ﷺ و لەگەڵیا بژی بە جەستە، ئەوا براکەم هەوڵ بدە لەگەڵ نەفەس و هەناسەی پێغەمبەری خواداﷺ بژی، بەڵێ ئەگەر لەگەڵ نەفسی پێغەمبەر نیت لەگەڵ نەفەسی پێغەمبەرﷺ بەوەی سیرەت و ژیانەکەی شارەزابە و عەمەلی پێ بکە.**

سات بە ساتی تەمەنی ٦٣ ساڵە

هەموو وانە و پەندی گەورەن.

بۆ هەرکەسێك بۆ سەرفرازی عەوداڵە

گشت لایەنێکی ژیانی، خواپەرستن و شەو نوێژو

پاڕانەوە و ئیستغفاری بەربەیانی

رەوشتی بەرز و بێوێنەی

هەڵسوکەوتی لەناو کۆمەڵگە و خێزانی

وتە و فەرموودەی شیرین و پاراو و پڕمانا و جوانی

هەر گۆشەیەکی سەیر دەکەیت

پڕ لە مانا و مۆژیارییە، سەرمەشقە بۆ گرۆی مرۆڤ

لە گشت زەمان و زەمینێ، کامەرانی و سەربەرزی

هەردوو ژیانی تیا دیارییە....

ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر بە لاشە نەگەیشتووی بە خزمەتی حەزرەتی رەسول الله ﷺ لەگەڵ هەناسەکەیدابە، چونکە هەروەختێ قورئان دەخوێنرێ ئەوە بۆنی هەناسەی پێغەمبەریﷺ لێ دێ، کە حەدیس دەخوێنرێتەوە ئەوە لە دەمی ئەو هاتۆتە دەرەوە و بۆنی ئەوی لێدێ.

موصعەبی کوڕی عبدالله دەفەرموێ: ئیمامی مالك رحمه الله. کاتێ باسی پێغەمبەری خوای دەکرد و فەرموودەی پێغەمبەرﷺی دەخوێندەوە رەنگی دەموچاوی دەگۆڕا و وای لێدەهات هاو نشینانی بەزەییان پیا دەهاتەوە، ڕۆژێکیان لەم بارەوە پرسیاریان لێکرد و عەرزیان کرد: ئەی ئیمام باشە بۆچی هەرکاتێ فەرمودەی پێغەمبەرﷺ دەخوێنرێتەوە یان بۆ خۆت باسی ژیانی پێغەمبەری خواﷺ دەکەیت، رەنگت دەگۆڕێ و ملکەچ دەبیت و ترس داتدەگرێ و چاوت فرمێسك دەڕێژێت و دەنگت کز دەبێ، ئایا بۆ هەموو جارێك ئاوات لێ دێت؟! ئیمام مالك فەرمووی: (لَو رَأَيتُم مارأَيتُ لَما أَنكَرتُم عَلَى ما تَرَون!) واتە: ئاخر ئەگەر ئەوەی من ئەیبینم ئێوەش بتانبینیایە ئەوا لۆمەتان نەدەکردم لەوەی کە لە منی دەبینن لە کاتی باسکردن و خوێندنەوەی فەرمودەی پێغەمبەری خواﷺ ..!!)

وە ئیمامی مالیك هەرکاتێ باسی پێغەمبەری خواﷺی بکردایە زمانی لە ناو دەمیدا وشك دەبوو لەبەر سام و هەیبەتی پێغەمبەری خواﷺ.

زانایانی راستەقینەی ئیسلام، عاشقانی پێغەمبەری خواﷺ، هەر کاتێ فەرموودەی پێغەمبەری خواﷺ بخوێنرایەتەوە، بە بێدەنگی و ملکەچییەوە دادەنیشتن، هەروەکو لە حاڵی حەیاتی حەزرەتدا لە خزمەتیدابن.

یەکێ لە پیاوە صالحەکان کە ناوی (عبدالرحمان ی کوری مەهدی)یە، هەرکاتێ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بخوێنرایەتەوە فەرمانی

دەکرد بەو کەسانەی کە لە مەجلیسەکەدا دانیشتبون بەوەی کە زۆر بێدەنگ دابنیشن، و ئەم ئایەتەی بۆ دەخوێندنەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ﴾ الحجرات: ٢

وە دەیفەرموو بە پێی ئەم ئایەتە واجبە لە کاتی خوێندنەوەی فەرموودەی پێغەمبەردا مرۆڤی موسڵمان بێدەنگ بێت و قسە نەکات و دەنگ بەرز نەکاتەوە، هەر وەکو چۆن واجب بوو کاتێ لە ژیاندا بوو دەنگی بەسەردا بەرز نەکرایەتەوە.

بەڵێ ئیمانداران: بە ڕاستی پێغەمبەری خواﷺ ئەگەر چی بە لاشە لە ناومان دەرچووە ،بەڵام بە رۆحی هەمیشە زیندووی، بە سونەت و فەرموودە گەوهەرەکانی، بە سیرەت و ژیاننامەی پیرۆز و تێر و تەواوی، کە ورد و درشتی ژیانی باس کردووە و لە ژیاننامەی پڕ بەرەکەتی وەڵامی هەموو پرسیارەکانی ژیانی مرۆڤ، لە هەموو بوارێکی ژیاندا دەست دەکەوێت، بەڵێ پێغەمبەری خواﷺ لەناوماندایە، قورئان دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ كَٰفِرِينَ ۝ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾

بەڵێ (وفيكم رسوله) هەر بۆ چینی بەڕێزی صەحابە نەبووە، بەڵکو بۆ هەموو ئومەتیەتی تا رۆژی دوایی، بەڵێ پێغەمبەرمانﷺ لەناودایە، ئیتر

بۆچی بەدوای غەیری رێبازی ئەو بکەوین و بمانەوێ گاور و جولەکە لە خۆمان رازی بکەین، کە هەرگیز لێمان رازی نابن تا ئەو کاتەی لە دینی محمد مصطفی دەرمان نەکەن، کە خوا پەنامان بدات، ئەوە گەورەترین خەسارەت و ماڵ وێرانییە ﴿ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ﴾...

وە موژدەتان لێ بێت ئەی ئیمانداران. دڵتان خۆش بێت بەو مەولودانەی کە بە شێوەی شەرعیە و پێغەمبەری خوا ﷺ پێی رازییە و ئەنجامتاندا لە ماڵ و مزگەوتەکاندا، کە سوپاسی خواتان کرد لەسەر بوونتان بە ئومەتی ئەو سەردار و پێشەوایە و بە زوبان و بە دڵ لە سەرەتا و کۆتاوە وتتان: (الحَمْدُ لله عَلى نِعْمَةِ الأسْلام الحَمْدُ لله عَلى نِعْمَةِ مُحَمَّد عَليه الصَّلاة والسَّلام)..

ئومێدەوارم بە رەحمی بێسنوری خوا ئەوەی کردمان و گوتمان لە خۆشەویستی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەمان خوا لێمان قبوڵ دەکات و دەیکات بە مایەی ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ شەفاعەتمان بۆ بکات، وە لە دوای مانگی مەولودیشەوە هەر لەسەر صەلاوات لێدان لە دیداری حەزرەتی محمدﷺ بەردەوام بن چونکە صەلاوات لێدان یەعنی ئینتما، یانی پابەندبوون، یانی خۆکردن بە قوتابی و صەحابی و برای پێغەمبەرﷺ، صەلاوات یانی خۆجوانکردن، خۆ پاکردنەوە لە گوناه ،یانی خۆنزیك کردنەوە لە شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ رسول الله موژدەتان پێ دەدات، موژدەت لێبێت دایەپیرەی دەم بە صەلاوات،موژدەت لێبێت مامە ریش سپییەکەی عاشقی پێغەمبەر، موژدەتان لێ بێت کوران و کچانی گەنجی پابەند بە سونەتی حەزرەتی محمدەوەﷺ کە دایم لەگەڵ ناو هێنانیدا موچورکە بە لاشەتاندادێ و هەموو لەشتان بە خوێن و

هەناسەوە خۆشەویستی ئەو زاتەی تێ دەگەڕێ و لە خۆشەویستیدا دەڵێن: ( اَللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيدنا مُحَمَّد وَعَلى آله وَصَحْبه وَسَلَّم).

موژدەتان لێ بێت رسول اللهﷺ دەفەرموێ: (أولى النّاسُ بي يَومَ القيامَة أكثَرُهُمْ عَلَيَّ صَلاة) رواه الترمذي و قال حديث حسن.

زانایان دەفەرموون مانای (أولى النّاسُ بي) واتە: (أي أحَقُهُم بشَفاعَتي). واتە: موستەحەقترین کەس بە شەفاعەتی من لە قیامەتدا. ئەو کەسەیە کە زۆرترین صەلاواتی لە دیدارم داوە، یارەبی خوایە هەموو لایەکمان بەر شەفاعەتی ئەو خۆشەویستە شەفاعەت قبوڵکراوە بخەی اللّهُم آمین.

بەڕێزان خەڵکی سێ جۆرن بەرامبەر بە پێغەمبەری خواﷺ..

یەکەم:کەسانێك کە پێغەمبەری خوایان لە نەفسی خۆیان خۆشتر دەوێت، بەردەوام ناوی لەسەر دەمیانە، یادی دەکەن، مەولودی بۆ دەکەن،بە باسکردنو زیندوو بوونەوەی سونەتەکانی چاو و دڵیان گەش دەبێتەوە، ئەمانە ئیمانداری راستەقینەن، لە خزمەتی شەریعەتی ئیسلامدان.

الحمد لله، میللەتی کورد، خۆشەویستی ئەو سەروەرە وا چۆتە دڵ و دەروونیەوە، هەرگیز بە بێ یادی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە ناژی، ئەوا ئەمساڵیش لە کۆتا وتاری مانگی مەولوددا جارێکی تر ئەو پەیمانە نوێ دەکەینەوە، روو لە رۆحی هەمیشە زیندوی دەکەین و موژدەی پێ دەدەین و دەڵێن:

ئەی پێغەمبەری پێشەوا، موژدەت لیّ بیّ

ناوت ئاوێتەی گشت خاکی کوردستانە

زیاتر لە باڵای حەسارۆست ناوت بەرزە

لە دەریاچەی (وان)یش قوڵتر

ڕەگ و ریشەی پەیامەکەت

چەقیوەتە ناو ئەم ئەرزە

وەنەوشە و نێرگزی نازدار

دارگوێز و دار بەڕوی بنار

چیای قەندیل

(زرێبار)ی سەراپا شین

هەروەك ئێمە

تۆی دڵسۆز و میهرەبانیان

زۆر خۆشدەوێت

پێنج فەرزی نوێژ بە تاسەوە

گویّ ڕادەگرن

تا بە ناوی دڵ سۆزترینی مرۆڤان

محمدی زۆر خۆشەویست

تینوێتی خۆیان بشکێنن

وا چواردە سەدەی رەبەقە

ناوی پیرۆزی تۆ قوربان

چونکە دەریایەکی مەنگی

سۆز و میهرەبانی و حەقە

ئەم خاکەمان ئاو دەدرێ و

دەیخوێنێت

کام تاشە بەردەی زۆر رەقە.

دووەم: خەڵکانێکن کە وەکو عەقیدە ئیمانیان بە ئاینی ئیسلام نییە، بەڵام بە رێگایەکی زانستیانە دیراسەی ژیانی پێغەمبەری خوایانﷺ کردووە سەرەنجام بە گەورەترین سەرکردەی جهانیان داناوە و وتویانە: محمد کاریگەرترین کەسە کە مێژوی مرۆڤایەتی گۆڕیوە.

بۆ نمونە: لیف تۆلستۆی (١٨٢٨-١٩١٠) رۆمان نوس و فەیلەسوف گەورەی روسییە، هەموو سامانی خۆی بەخشی بە هەژاران،ئەم پیاوە دەڵێ: (پەیام و بەرنامەکەی محمد، هەموو جیهان دەگرێتەوە چونکە یەکانگیرە لەگەڵ عەقڵ و حیکمەت)

بەرناردشۆ (١٨٥٦-١٩٥٠) ئیرلەندییە و (٦٠) چیرۆکی شانۆیی و وتاری هەیە، هەموو بابەتەکانی باسی هەژاری دەکەن، پەرتوکێکی دانا بە ناوی (محمد) بەڵام دەسەڵاتدارانی ئەو کاتە سوتانیان، ئەم نوسەرە دەڵێ: (من لە ژیانی محمدم کۆڵییەوە، زۆر پێی سەرسام بووم، دەبێ محمد بە

رزگارکەری مرۆڤایەتی ناوزەرد بکرێت، بە بیرو باوەڕی من ئەگەر کارو باری جیهانی ئەمرۆی پێ بسپێردرێ، دەیتوانی چارەی بکات بەو شێوەیەی کە ئاشتی و ئاسودەیی بۆ مرۆڤەکان دەستەبەر بکات، ئەم جیهانە چەند پێویستی بە پیاوێکی خاوەن بیری وەك محمدﷺ هەیە).

جۆری سێیەم لە خەڵکی بەرامبەر بە پێغەمبەری خواﷺ خەڵکانێکی دڵ ڕەشن و مێشك بۆگەنن، وەکو قالۆنچە مێشکیان بە بۆنی گوڵ و عەتر تێك دەچێ و حەزیان لە بۆنی ریخ و پیسییە، ئەمانەش دوو جۆرن:

یەکەمیان: خۆی رقی لە نوری محمد المصطفی یەﷺ دڵی ڕەش و ڕەقە، بەڵام ئەم رقەی هەر لە دڵی خۆیدا هەڵگرتووە و ژەهرەکەی ناڕژێت، ئەم جۆرە کەسە خوای گەورە لە دنیادا تۆڵەی لێ ناکاتەوە و لەوانەشە رۆژێك هیدایەت وەرگرێ.

جۆری دووەمیان لەو دڵ ڕەق و دڵ پڕ لە ژەهرە پیسانە، ئەو رق و ژەهرەی ناو دڵیان هەڵ دەڕێژنە سەر کاغەز و رۆژنامە و گۆڤارەکانیان و نوکی پێنوسەکانیان ژەهری لێ ئەتکێ و بیر و هۆشی خەڵکی سادە و ئیسلام و پێغەمبەرﷺ نەناسلێ پێ بۆگەن دەکەن، بە ئاشکرا و بە بێ پەردە لەسەر شاشەی تەلەفیزۆن و راگەیاندنەکانیانەوە دەڵێن: ئەی خەڵکینە ئێمە حەزمان لە روناکی رۆژ نییە و وەرن با لەبەر فتیلە ڕەشەکە دابنیشین، وەرن با ئاوی زوڵاڵی کانی و سەرچاوە سازگارەکان نەخۆینەوە و پەنا بەرین بۆ پاشەڕۆ و ئاوەڕۆی ئاوی ڤایرۆساوی و میکرۆباوی، بەم شێوەیە ئەو ئیسلامە پاکە و ئەو محمدە بی خەوشە لە بەرچاوی خەڵکیدا بە عەقڵی خۆیان ناشرینی

**دەکەن و پیسی دەکەن بە رەشی ، بە لام پێ شینانمان جوانیان فەرمووە کە تیشکی خۆر بە بێژنگ ناگیرێ. ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ الصف:٨. وەعدی قورئانە ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ﴾ كوثر:٣**

**واتە: بێگومان هەر دوژمنان و ناحەزانی تۆ کە رقیان لێتە بێ ناونیشان و وەجاخ کوێر و دوابڕاون لە هەموو خێر و چاکەیەك لە هەردوو جیهاندا.**

**خوای گەورە خۆی وەعدی بە پێغەمبەری خۆشەویستی ﷺ داوەکە: ﴿إِنَّا كَفَيْنَـٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ﴾ خوا خۆی دیفاع لە پێغەمبەرەکەی دەکات و دوژمنانی ریسوا دەکات، هەردوو پێشەوا – بوخاری و موسلم- گۆڕیان پڕ نور بێت-ریوایەتیان کردووە کە: پیاوێکی گاور موسڵمان بوو، فێری سوڕەتی (البقرة-و -آل عِمران)بوو، ماوەیەك بوو بە کاتبی حەزرەتﷺ ، پاشان لە دین وەرگەڕا و بوو بە گاور و رایکرد بۆ لای گاور و جولەکەکان و ئەوانیش زۆر زلیان کرد و فویان کرد بە لوتیدا، جا ناوبراو دژایەتی حەزرەتی دەکرد و دەیگوت:محمد هیچی نەزانیوە ئەوە نەبێ کە من بۆمنوسیوە، ئەم مورتەدە دەم شڕە، خوای گەورە پشتی شکاند و لەناوی برد،کاتێك ناشتیان قەبر نەیگرتە خۆی و پاش ماوەیەك فڕێی دایە دەرێ، گاورەکان**

وتیان: دیارە ئەمە ئیشی موسڵمانانە و ئەوان وەکو تۆڵە دەریان هێناوەتەوە، جارێکی تر ناشتیانەوە، ئەمجارەش گۆڕ فڕێی دایەوە دەرێ و بۆیە ئیتر لەو نەشت و دەرەدا وازیان لێ هێنا تا قەل و داڵ بیخوات!!...

لەم سەردەمەشدا کاتێک ساڵی ٢٠٠٦ پاپای ڤاتیکان قسەی نابەجێی بەرامبەر بە پێغەمبەری خواﷺ کرد، (فرانسی فرانتار) کە یەکێک بوو لە هاوبیرەکانی پاپا زۆر دوژمنی ئیسلامە و سەرۆکی رۆمی کاسۆلیکە لە (سلۆفینیا)، ئەم قەشە داوای کرد رێ لە دینی محمد بگیرێت و نەهێڵێت لە جیهاندا بڵاو بێتەوە. بەڵام خوای گەورە هەر زوو رسوای کرد و لە رۆژی پێنجشەمە ١٩\١٠\٢٠٠٦ پۆلیسی سلۆفینی فرانسی)یان دەستگیر کرد و سەرەتا هەواڵەکەیان شاردەوە و پاشان لە ١٢\١١\٢٠٠٦ بڵاویان کردەوە کە بە حساب رەسولی مەحەبەت و سەلامە، پانزە ساڵە دەستدرێژی دەکاتە سەر منداڵی کوڕ و کچی سەر بە کەنیسەکەی، وا بڕیاردرا ماوەی دە ساڵێک بەند بکرێت!!..

بەڵێ ئیمانداران: دەبێ هەمومان یەقینمان هەبێت، کە چۆن خوای گەورە وەعدی داوە کە قورئانەکەی بپارێزێت کە فەرموویەتی: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ الحجر:٩.

دڵنیا بن ئاوا پێغەمبەرەکەی و سوننەت و سیرەتەکەی ئیسلامەکەی دەپارێزرێ و شەریعەتەکەی هەر پایەدار دەبێت، ﴿يُرِيدُونَ لِيُطْفِـُٔوا۟ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفْوَٰهِهِمْ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ الصف:٨

وە هەر کەسێکیش خۆی بخاتە پاڵ ئەو قورئان و ئیسلام و پێغەمبەرەﷺ، خوای گەورە ئەویش دەپارێزێت إنشاء الله

دەی با هەموو کات پەیمان لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویستمان نوێ بکەینەوە کە خزمەتکاری رێبازەکەی بین و کارێك بکەین پێغەمبەری خواﷺ پێی دڵخۆش بێت و ڕوومان بێت لە قیامەتدا بچینە خزمەتی و داوای ئاوی کەوسەری لێ بکەین.

یا رەبی خوایە بە رەحمی خۆت رەحممان پێ بکەیت، بمانخەیتە ریزی ئەو کەسانەی کە ژیانێکی ئیماندارانە مردنێکی ئیماندارانەیان بە نسیب دەبێ و لە رۆژی قیامەتیشدا لە چاوپێکەوتنی خۆت و بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەرەکەت بێبەشمان نەکەیت: یارب العالمین، الهم آمین..

## سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز

٢. ژیانەوە–ئەندازیار عثمان محمد رشید ل٢٢٣ ، ل٣٠ ، ل٣١ ، ل٣٢ ، ل٦٩

٣. موسڵمانی کامڵ– م.عەلی باپیر ب١ ل١٢٠

٤. شنەی سۆز – شعری م. جلال الدین نجم الدین ل٢١، ل١٠

٥. خطب –الشیخ محمد حسین یعقوب ج٢ ص٥٧

٦. تەنها محمد – پشتیوان کاکل ل٨

٧. بەرەو ئیسلام –ئاشتی . ئەندازیار عثمان محمد رشید ل٥١

# وتاری یەکەم بۆ مانگی ربیع الثاني
# وەفاتی پێغەمبەر ﷺ

( الحَمدُ للهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

ئیماندارانی بەڕێز: ئەی ئەو کەسانەی کە هەموو کات و ساتێك لە یادو بیری پێغەمبەری پێشەوادان ﷺ، لە مانگی ربیع الاوَّل دا کەمێکی زۆر کەم توانیمان لە خزمەت ژیاننامە و باس و خواسی ڕێباز و سوننەتە پیرۆز و گران قەدر و بێ وێنەکانی ئەو سەرداری دین و دونیایەماندا بین وە ئەبێت بە واجبی سەرشانی خۆمانی بزانین کە نەك هەر مانگی ربیع الاوَّل، بەڵکو تەواوی مانگەکان، تەواوی ڕۆژ و کاتەکان باسی گفتوگۆی ناوگۆڕ و دانیشتنی مزگەوت و ماڵمان، دائیرە و فەرمانگەکانمان، حکومەت و ئیدارەی وڵاتمان، خاڵی نەبێت لە باسی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە و هەرکەسێك لە شوێنی خۆی و بە پێی زەمان و زەمینی خۆی، بۆ دڵخۆشی و فەرەحی دڵی، بۆ ساڕێژ بوونی زامی بە کوڵی، بۆ چارەسەری گرفتی ژیانی، پەنا بباتە بەر ڕێباز و سیرەی موبارەکی..

چونکە ئەو سەروەری ئەنبیایە، بە فەرموده و شایەتی خوا بۆی (رَحْمَةً لِلْعالَمين)، وە هەر کەسێك، وە هەر ماڵێك باسی ئەو ڕەحمەتەی تێدا نەکرێت، ئەوە با بێگومان بێت کە زەحمەت جێگای دەگرێتەوە، دەبا شوێن کەوتەی ڕەحمەت بین تاوەکو دوور بین لە زەحمەت، إنشاء الله.

بەڕێزان: هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ لە مانگی ربیع الاوَّل دا لە دایك بووە، هەر لە مانگی ربیع الاوَّلیشدا کۆچی دوایی کردووە و گەڕاوەتەوە بۆ حزوری پەروەردگاری.

کەواتە: پێویستە هەروەکو باسی لەدایك بوونەکەیمان کرد، باسی وەفاتیشی بکەین، چونکە چۆن ژیانەکەی پڕە لە دەرس و ئامۆژگاری، بە هەمان شێوە کاتی نەخۆشی و دوا ساتەکانی ژیانیشی و کاتی وەفاتیشی هەمووی هەر ڕێنمایی و ئامۆژگاریە بۆ گرۆی بەشەریەت بە تێکڕا.

دەفەرمون گوێ بگرن بۆ باسی وەفاتی پێغەمبەر ﷺ:

ئیمانداران: قورئانی پیرۆز ئاماژە دەکات بۆ وەفاتی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستەمان و ﷺ ئەو حەقیقەتە باس دەکات کە ژیانی دونیا کۆتایی پێ دێت و ئینسان لاپەڕەکانی ژیانی دەپێچرێتەوە و دەچێتە قیامەتی خۆی، تەنانەت ئەگەر ئەو کەسە پێغەمبەری خواش بێت ﷺ، ئەوەتا دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ ۖ أَفَإِين مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ﴾ الانبياء:٣٤.

یاخود دەفەرموێت: ﴿إِنَّكَ مَيِّتٌ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ﴾ الزمر:٣٠.

بەڵام ئێمە لەم وتارەدا باسی وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ وەك چیرۆکێك ناگێڕینەوە، بەڵکو تەنها دەرس و ئامۆژگاریەکان کە لە وەفاتی ئەو زاتە وەردەگیرێن باس دەکەین:

**وانەی یەکەم:** هەموو ئەم دونیا فانیە بەجێ دەهێڵین، جا کەواتە مردن بەسە کەوا ئامۆژگاریکارمان بێت، (لَو كانَتْ الدُّنيا تدوم لِواحِدٍ، لَكانَ رَسُول الله فيها مُخَلَّداً) ئەگەر ئەم دونیایە بۆ هیچ کەس بمایە، ئەبوایە محمد المصطفی ﷺ هەرگیز نەمردایە.

جا گرنگ ئەوە نیە کە دەمریت، گرنگ ئەوەیە لەسەر چ حاڵەتێك دونیا بەجێ دەهێڵیت، ئایا بەرەو ڕەزامەندی خوا دەڕۆیت؟، یان بەرەو خەشم و قین و تووڕەیی خوا؟.

بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو ڕەحمەتێك بۆ صەحابە دڵسۆزەکانی، ئەو هاوەڵانەی کە پێغەمبەری خوایان ﷺ لە نەفس و ڕۆحی خۆیان زیاتر خۆش دەویست و خۆیان و ڕۆڵە و خزم وماڵ و سامان و نیشتیمانیان بەقوربانی ڕەفاقەتی حەزرەتی رسول الله ﷺ کردبوو، وەکو دڵسۆزی نواندنێك بۆیان پێش وەفاتی چەند ئاماژەیەکی دا کە وەفاتی نزیك بۆتەوە، بۆ ئەوەی لە کت و پڕدا و بێ هەواڵ لەبەر چاوی هاوەڵانی دیار نەمێنێت و بەو هەواڵی وەفاتی خۆی، کەمێکیش بێت بیستنی ئەو هەواڵە دڵتەزێنەیان لە کۆڵ بکاتەوە، لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئەگەر پێشتر هەواڵی لە شتێك هەبێت، بیستنی ڕوودانی هەواڵەکەی کەمێك لا ئەهوەنترە لە ڕوودانی ڕووداوێکی کت و پڕ کە پێشتر هیچ هەواڵێکی لە بارەیەوە نەزانیبێت.

نیشانەی یەکەم: کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ (معاذی کوڕی جەبەل ﷺ)ی بەڕێ کرد بۆ یەمەن، فەرمووی: ئەی معاذ، لەوانەیە ساڵێکی تر کە هاتیتەوە بۆ ئەم مەدینەیە من لە مزگەوت و سەر مینبەر و ناو صەحابەکاندا نەبینیت و بەلای گۆڕەکەمدا تێ بپەڕیت و سەیری قەبرەکەم بکەیت! . معاذ ﷺ دەستی کرد بە گریان. فعلاً کە هاتەوە لە یەمەن پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردبوو، معاذ ﷺ تەنها گۆڕی پڕ نوری بینی.

نیشانە و هەواڵی دووەم: لە حەجی ماڵ ئاوایدا، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرموی: ئەی خەڵکینە گوێم بۆ بگرن و بزانن (لَعَلّي لا أَلْقاكُمْ بَعْدَ عامِكُم هذا) لەوانەیە دوای ئەم ساڵە جارێکی تر پێتان نەگەمەوە و قسەتان بۆ نەکەمەوە. . بەڵێ ئەوە وتاری ماڵ ئاوایی بوو، دوای ئەوە وەفاتی کرد.

سێیەم: کە لە حەجی ماڵ ئاوایی گەڕایەوە، سەردانی شەهیدانی ئوحودی کرد و دوعای بەخێری بۆ کردن و زۆر بۆیان گریا و لایان مایەوە، کە ئەمەش وەکو خواحافیزی وابوو لەو گەورە صەحابیانەی کە لە ڕۆژی سەختی ئوحوددا لە پێناوی ئیسلامدا، بە پلەی بەرزی شەهیدی گەیشتن.

چوارەم: دواتر لە گۆڕستانی ئوحود گەڕایەوە بۆ ماڵەوە سەری زۆر دەیێشا، بەڵام گوێی لێ بوو خاتوو عائیشەی خێزانی ﷺ دەفەرموێت: ئای سەرم، ئای سەرم چەند ئازاری هەیە. پێغەمبەری خوا ﷺ بەو هەموو ئازارەی خۆشیەوە ویستی سوبعەت و قسەیەکی خۆش لەگەڵ عائیشەدا ﷺ بکات، بۆیە فەرموی: ئەی عائیشە، ئایا حەز ناکەیت تۆ پێش من بمریت و من بۆخۆم بتنێژم و بەخاکت بسپێرم؟!

عائیشە ﷺ فەرموی: نەخێر، نا، نا، شتی وام ناوێت، دوای من بچیتە لای خێزانێکی ترت.!.. پێغەمبەری خوا ﷺ زەردەخەنەیەکی پڕ سۆز و خۆشەویستی بە ڕووی خاتوو عائیشەدا کرد ﷺ، وەکو پێی بڵێت وا خەریکە من بەجێت دەهێڵم.

پێنجەم: لە ئاخر ڕۆژەکانی ژیانی موبارەکیدا، ئیمامی عەبباس ﷺ هاتە لای و فەرموی: ئەمشەو لە خەومدا مانگی یەکشەوە بە ئاسمانەوە بوو، مەلائیکەیەك هات و بردی، ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا مانای ئەم خەونە چیە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەمە من بەجێتان دەهێڵم.!!.

شەشەم: سات بە سات نەخۆشی و ئازاری سەر ئێشەکەی زیادی دەکرد، لەگەڵیشیدا تایەکی زۆر بەهێزی هەبوو، ئەوەندە ئەو پارچە قوماشەی لەسەر ناوچەوانی دانابوو، ئەوەندەی ئارەقەی موبارەکی سەر ناوچەوانی هەڵمژیبوو، ئاوی پێدا دەهاتە خوارەوە، حەزرەتی عائیشە ﵂ خۆی قورئانی بەسەردا دەخوێند و فوی بەلاشەی موبارەکی حەزرەتدا دەکرد، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ توانا و تاقەتی ئەوەی نەمابوو، خۆی بە دەمی خۆی قورئان بەسەر لاشەی خۆیدا بخوێنێت. نەخۆشیەکەی (١٣) ڕۆژی خایاند، لەو (١٣) ڕۆژە (١١) ڕۆژیان بەو نەخۆشیەشەوە خۆی تەشریفی دەبردە مزگەوت و ئیمامەتی بۆ صەحابەکان دەکرد.

چوار شەممە بوو، پێنج ڕۆژ پێش وەفاتی، تایەکەی زیادی کرد. فەرموی: بڕۆن لە (٧) بیر ئاوم بۆ بهێنن، ئاوەکەیان کردە مەنجەڵێکەوە و پێغەمبەری خوا ﷺدەستی لە ئاوەکە هەڵدەکێشا و بە دەم و چاو و قاچی خۆیدا دەکرد.

لەم شوێنەدا ئەو وانەیەی بۆ بواری پزیشکی و دکتۆرەکان بەجێهێشت کە بریتیە لەوەی (تا) بە ئاوی سارد لا دەبرێت و چارەسەر دەکرێت.

پاشان کە تۆزێك لەشی سوك بوو، لەسەر شانی عەباس و عەلی ﵄ خۆی گرتبوو، دەستی خستە سەر شانی ئەوان و بە پێی موبارەکی تەشریفی بردە مزگەوت، ویستی بچێتە سەر مزگەوتەکە، بەڵام نەخۆشیەکە وا لاوازی کردبوو لە قادرمەی یەکەم نەیتوانی سەرکەوێت!!! هەزاران جار بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەی

بەهێزترین مرۆڤ ، ئەوە تۆی وات لێ هاتووە کە نەتوانیت لە قادرمەیەك سەربکەویت؟! بۆیە لە تەنیشت مینبەرەکە وەستا و فەرمووی: (إسْمَعُوا لي لَعَلّي لا أقِفُ مَوْقِفي هذا).. فەرمووی: خەڵکینە گوێم بۆ بگرن، چونکە لەوانەیە جارێکی تر لەم شوێنە نەوەستم و قسەتان بۆ بکەم، وە فەرمووی: زوڵمم لە کێ کردووە و زللەیەك و قامچیەکم لە کێ داوە؟، ماڵی کێم لایە؟ با بێت داوای مافی خۆی بکات و حەقی خۆی وەربگرێتەوە.

ئەمە دەرسە بۆ هەموو لێپرسراوانی وڵات، ئاوا بە شەفافی بە میللەت بڵێت: کێ حەقی لامە با بیدەمەوە، بەڵام تاکە سەرکردە کە ئەوەی کردبێت تەنها حەزرەتی محمد المصطفىیە ﷺ...

لەو کاتەدا پیاوێك هەڵسا و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ سێ درهەمت لایە. فەرمووی: ئەی عەبباس پارەکەی بدەرەوە. صەحابەیەك هەستا و فەرمووی: ڕۆژێکیان بە ڕووتی قامچیەکت لێ دام. فەرمووی: ئەوە پشتی من و قامچی تۆ وەرە لێم بدەرەوە. پشتی بۆ هەڵکرد. بەڵام ئەو صەحابەیە پەلاماری پشتی دا و ماچی کرد و فەرمووی: بەخوا تەنها مەبەستم ئەوەبوو بە ڕووتی دەمم بەر لاشەت بکەوێت، بە ئومێدی ئەوەم لاشەم پارێزراو بێت لە ئاگری دۆزەخ.

پاشان فەرمووی: وەصیەتتان بۆ دەکەم دەربارەی ئەنصار، زۆر باش بن لەگەڵ خەڵکی شاری مەدینەدا، چونکە ئەوان یەکەم پەناو پشتیوانم بوون و خۆیان و ماڵ و سامانیان کردە قوربانی ئیسلام، ماندوبون و فیداکاریان بەرز بنرخێنن و هەرگیز لە یادیان مەکەن.

لێرەدا دەرسی وەفاداری فێری کاربەدەستان کرد، کە هەمیشە وەفادار بن بەرامبەر ئەو کەسانەی کە پشتیوانی شۆڕش بوون، کە سوتەمەنی بوون و ڕۆژی ئازادی گەل بە خوێن و ماڵی ئەوان هەڵهاتووە.

دوای ئەوە فەرموی: (عَبْدٌ خَيَّرَهُ اللهُ بَيْنَ الدُّنيا و الآخْرة، فأختارَ الآخِرة) واتە: بەندەیەکی خوا خوای گەورە سەرپشکی کردووە لە نێوان دونیا و دواڕۆژدا، بەڵام ئەو بەندەیە دوا ڕۆژی هەڵبژارد!!.. لێرەشدا ئەو وانەیەمان فێر دەکات کە پێویستە ئینسان پشت بە خوا ببەستێت و هەوڵبدات کە لە ژیانی کورت و کۆتایی هاتوی دونیادا ئەوەندە بە سەربەرزی بژی کە حەز بکەیت زوو بەرەو قیامەتی ئاوەدان و پڕ بەختەوەریت بڕۆیت.

بەڵێ، چوار ڕۆژی مابوو لە ژیان دا، نەخۆشیەکەی عاجزی کرد. عبداللهی کوڕی مەسعود ﵁ چووە خزمەتی و دەستی لێ داو فەرموی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تایەکەت بەرزە. فەرموی: بەڵێ ئەی عبدالله، من بەقەدەر دوو کەس لە ئێوە تام لێ دێت. عبدالله ﵁ فەرموی: واتە پاداشتەکەشت دوو بەرامبەرە؟!. فەرموی: بەڵێ. لێرەدا دەرسی دا بە نەخۆشەکان کە هەرچەندە نەخۆشیەکەتان بە ئازار بێت، نەخۆشی و ئازار و تای لاشەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ زیاتر بووە، کەواتە ئێوە خۆشەویستی خوان و ئارام بگرن و بزانن هەتا نەخۆشیتان سەخت بێت، پاداشتان لای خوای گەورە زیاترە.

وە لێرەدا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: (ما مِنْ مُسْلِمٍ يُصيبُهُ أذىً مِنْ مَرَضٍ فَما سِواها، إلاّ حَطَّ اللهُ بِها سَيِّئاتِهِ كَما تَحت الشَّجَرةُ

وَرَقُها). واتە: هەر موسڵمانێك توشی ئازارێك ببێت لە نەخۆشی، وە کەمتر لە ئازاری نەخۆشی، ئەوا بێگومان خوای گەورە گوناهی لێ دەکاتەوە، هەروەك چۆن دار گەڵای وشکی لێ دەبێتەوە!..

بەڵێ ئیمانداران: لەگەڵمان بن، هەر لە ژوورەکەی پێغەمبەردایین ﷺ تا نوێژی عیشا لەشی زیاتر تای لێ هات و عەرەق لە نەوچەوانی وەکو گەوهەر و مرواری دەردەکەوت، کە بیلالی حەبەشی ﷺ بانگی فەرموو، فەرموی: دەستنوێژم پێ بگرن.. دەستنوێژیان پێ گرت، بەڵام لە هۆش خۆی چوو، کە بە ئاگا هاتەوە فەرموی: (أصَلَّى النّاس؟!) ئایا خەڵکی نوێژەکەیان کرد؟! پاشان بێ هۆش کەوتەوە، تاوەکو سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە، لە جاری سێیەمدا فەرموی: (مُرُو أبابَكرٍ فَلْيُصَلِّ بالنّاسِ). فەرمان بە حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ بکەن با پێش نوێژی بۆ موسڵمانان بکات.. لێرەشدا دەرسی گەورەیی نوێژی بە ئوممەتەکەی ڕاگەیاند، کە نوێژ چەند پلە و پایەی گەورەیە لە ئیسلامدا و کۆڵەکەی دینە..

دوو ڕۆژ مابوو لە تەمەنی پیرۆزی، لەشی تۆزێك سوك بوو، چوو بۆ مزگەوت، لەو کاتەدا حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ ئیمامەتی بۆ موسڵمانان دەکرد، کە هەستی کرد پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مزگەوتەوە، لە میحرابەکە کشایە دوایەوە، بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بچێتە پێشەوە، صەحابەکان هەموو لە خۆشیدا نەیاندەزانی چی بکەن، وایان دەزانی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەتەواوەتی چاك بۆتەوە، بەڵام ئەوە دوا دیداری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو لەگەڵ ئەو صەحابانەدا کە لە هەموو ڕۆژگارە سەختەکاندا هاوەڵی بوون و لە مێژوودا دوبارە نابێتەوە کە کەسێك ئاوابە دڵ و بە گیان کەسێکی خۆش بوێت، وەکو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ حەزرەتی محمد المصطفیيان خۆش دەویست، وە

پێغەمبەری خواش ﷺ پێغەمبەری بەوەفاش ﷺ ، زۆر زۆر هاوەڵانی خۆش دەویست، بۆیە بۆ دواجار چووە مزگەوت بۆ چاوپێکەوتنیان و خواحافیزی لێیان، بەڵام صەحابەکان وایان زانی کە بە تەواوەتی چاك بۆتەوە، بۆیە زۆر شادومان بوون بە دیداری.

یەك ڕۆژی مابوو لە ناویاندا، شەوەکەی عائیشە ﵂ چوو لە ماڵە دراوسێ ڕۆنی چراکەی هێنا تا پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەر ڕوناکیەکەی دابنیشێت، لەم کۆتا ساتەی ژیانیشدا ئەو وانەیەی فێری هەژاران کرد کە دڵتان بە خۆتان نەمێنێت کە هەژاری ڕۆژی ڕووناکی لێ کردوون بە شەوی تاریك و ئەوە مانای بێ ڕێزیتان نیە، بەڵکو تاقیکردنەوەیە بۆتان و ئەگەر ئارام بگرن، خوای گەورە دەروی خێرتان لێ دەکاتەوە و ئەوە پێغەمبەرەکەتانە ئاوا بە هەژاری و نەداری ئاخر شەوی ژیانی بەڕێکرد.

وە زرێیەکەی کە بۆ جەنگ و جیهاد ئەیپۆشێت ڕەهن بوو لای جولەکەیەك لە جیاتی هەندێك جۆ، کە بۆ ژیانی خۆیی و خێزانەکانی لێی قەرز کردبوو... لێرەشدا ئەو دەرسی بەیەکەوە ژیان و ڕێزی بیروباوەڕی کەسانی تری فێری ئوممەتەکەی کرد، کە لە دوای خۆی لەگەڵ ئەو کەسانەی کە موسڵمان نین بە مەرجێك دژایەتی ئیسلام ناکەن، ئەگەر هاو دینیش نەبن لەگەڵیان، خۆ هاوژینیانن و دەبێت هەڵسوکەوتی ژیانیان لەگەڵ بکەن. ئەگینا خۆ دەیان هاوەڵی پێغەمبەر ﷺ بە یەك ئاماژە هەموو ماڵ و موڵکی خۆیان بەقوربانی پێغەمبەر ﷺ دەکرد، چ جای ئەوەی کە قەرزی بدەنێ، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ قەرزی لە جولەکەکە کرد بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت کە پێغەمبەری ڕەحمەتە تەنانەت بۆ جولەکەش، بۆ ئەوەی کەس لە دوای خۆی ستەمیان لێ

**نەکات.. وە ئەمەش سەلمێنەری ئەو حەقیقەتەیە کە ئەم ئیسلامە دینی ئاشتی و بە یەکەوە ژیانە.**

**ئاخر ڕۆژی ژیانی بوو، ١٢ ربیع الاول بوو، ڕۆژی دووشەممە بوو، هەمان ڕۆژ و بەرواری لەدایك بوونی، پەردەی سەر مزگەوتی لادا، صەحابەکان شاگەشکە بون لە خۆشیان و هەموو کەوتنە جموجۆڵ، وایان زانی دێتەوە بۆ ناویان بۆ ناو مزگەوت، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ بە دەستی موبارەکی ئاماژەی بۆ کردن و فەرموی: (مَكانَكُمْ، مَكانَكُمْ). فەرموی: لە شوێنی خۆتان مەجوڵێن، لە شوێنی خۆتان مەجوڵێن.**

**ئەوە تەماشاکردنی خواحافیزی یەکجارەکی بوو لە مینبەرەکەی، لە میحرابەکەی کە چەند ساڵ بوو وتاری لەسەر خوێندبۆیەوە، پێش نوێژی تێدا کردبوو، لە صەحابە دڵسۆز و فیداکارەکانی.. بەڵام نەیتوانی زۆر بە پێوە بوەستێت و کەوتە سەر زەوی، فاطمەی کچی ؓ لە پەرۆشیدا بۆ باوکی بەسۆزی هاواری کرد و فەرموی: (وا كَرْبَ أباه) ئەی هاوار بۆ باوکم، چۆن نەخۆشی بێ هێز و لاوازی کردووە!! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموی: (لیس علی أبیك كرب بعد الیوم)، لەمرۆ بە دواوە ئیتر نارەحەتی و ئازار لەسەر باوکت نەما ئەی فاطمە، لێرەشدا ئەو وانەیە فێردەبین کە مردن بۆ ئیمانداران ئیسراحەتە، لە هەموو ئازار و چەرمەسەری و ژانەکانی ژیان رزگاری دەکات، لە کۆتا ساتەکانی ژینی دا دواهەمین وەصیەت و راسپاردەی خۆی بۆ هاوەڵان و سەرجەم ئومەتی بەجێ هێشت و فەرمووی:**

**١-بَلِغو عَنّي من آمن السَّلام الی یَوم القِیامة. سەلامی من بگەیەنن بە هەر کەسێك کە ئیمانی بە من هێناوە و منی بە پێغەمبەر و چاوساغی دونیا**

و قیامەتی خۆی قبوڵ کردووە هەتا ڕۆژی قیامەت!. ئێمەش لەم کاتەدا و لەم شوێنەدا وەڵامی سەلامەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەینەوە و دەڵێین: ( ئەی پێغەمبەری بە وەفا و دڵسۆز ترینی هەموو دڵسۆزان، ئەی لە خۆمان دڵسۆزتر بۆ خۆمان کە لەو ساتی ماڵ ئاواییەدا ژیانی ئێمەت لە بیر بوو کە دوای هەزار و چوارسەد ساڵ دێنە سەر زەوی و ئیمانت پێ دەهێنین و سەلامت بۆ ناردین و هەر لە صەحابەوە تا یەکە یەکە هەڵگرانی ئەم پەیامە ئەو سەلامەی تۆیان گەیاند و وا ئێمەش وەڵامی سەلامەکەت دەدەینەوە و دەشیگەیەنین بە نەوەی دوای خۆمان و وەصیەتیان بۆ دەکەین کە هەرگیز لە ڕێباز و پەیامەکەی تۆ لانەدەن، ڕووت تێدەکەین و قبوڵمان بفەرموو کە عەرزت دەکەین، هەزاران هەزار سەلام و ڕەحمەتی خواش لەسەر تۆبێ ئەی پێغەمبەری خوا. (نَشْهَدُ أَنَّكَ بَلَّغتَ الرِّسالةَ، وَ أَدَيتَ الأمانَة، وكَشَفْتَ الغمّة. وَ نَصَحْتَ الأُمّة، وَ جاهَدتَ في الله حَق جِهادَةَ، حَتى أتاكَ اليَقينْ)، داواکارین لە خوای تاك و تەنها کە لە جیاتی ئێمەش پاداشتی ئەو هەموو ماندوبوون و هەوڵ و جیهاد و جوهد و تێکۆشانەت بداتەوە کە لە پێناوی گەیاندنی ئەم پەیامەدا پێشکەشت کردن تاوەکوو ئەم ڕووناکی و نورە بگەیەنیتە هەموو دڵە تاریکەکان و سەرجەم سەرزەویت پێ ڕووناك کردەوە.

٢- لە ڕاسپاردەی دووەمدا فەرمووی: (الصلاة، الصلاة)...ئاگاتان لە نوێژەکانتان بێت.. ئەو نوێژەی کە نور و ڕۆشنایی چاوەکانت بوو، هەموو جارێ کە ئازاریان دەدایت و گەلە کۆمەکییان لێ دەکردی دەتفەرموو: ئەی بیلالی خۆشەویست هەستە بانگ بفەرموو، بەو دەنگە زوڵاڵەت قامەتمان بۆ بکە و با نوێژ بکەین، أرحنا بها یا بلال..پێت ڕاگەیاندین ئەوەی واز لە نوێژ بێنێت دین و ئیمانی نوقسانە ئەگەر بڕوای بە نوێژ نەبێ کافرە و لە دین دەردەچێ[٢]!.

دەی ئەو کەسانەی کە پێغەمبەری خواتانﷺ خۆش دەوێ و وا لە خۆشەویستی دابۆی بە باسی وەفاتی دڵتان هاتۆتە کوڵ و چاوتان فرمێسك ئەڕێژێ، هیچ کات ئەم وەسیەتەی رسول الله لەیاد مەکەن و بۆ جارێکیش بێت نەهێڵن نوێژتان بفەوتێت و کارێك بکەن بە نوێژی سوننەتی خۆتان و منداڵەکانتان و خێزانتان لە ماڵەکانتاندا مزگەوتێکی بچکۆلانە دروست بکەن..

٣-وەصیەتی سێیەم فەرمووی: (وَمـا مَلَكَتْ أيمـانِكُم) ئاگاتان لە خزمەتکارەکانی ژێردەستتان بێت، بەڵێ ئەو وەصیەتە بۆ هەموو دەوڵەمەندان و دەسەڵاتدارانە، کە بە چاوی ڕێز و حورمەتەوە تەماشای ئەو کەسانە بکەن کە لە ژێر دەستیاندا کاردەکەن و ئیش و کاریان بۆ دەکەن، خۆیان بە ئاغا سەیر نەکەن و ئەوان بە کۆیلە، بەڵکوو ئەوانیش بە چاوی برا و ئەولادی خۆیانەوە تەماشا بکەن،ئەی چینی چەوساوە و زەحمەتکێش و رەنجدەری ناو کۆمەڵ ئەوە پێغەمبەری خوایەﷺ کە تۆی لە یادە و خەمت دەخوات، دەتۆش پەیامی رزگاری و سەرفرازیت تەنها لەوەوە بناسە و شوێن بەرنامە و رێچکەی تر نەکەویت کە ئەتخەڵەتێنن بە ناوی شۆڕشی چەوساوە و کرێکارەوە پاشان خۆیان گەورەترین مافخۆری چەوساوە و کرێکارن و سەرمایەداری گەورە هەرخۆیانن!!

٤-راسپاردەی چوارەمی بۆ من و تۆی ئەهلی جومعە و جەماعەت ئەوە بوو کە فەرمووی: (أوصيكُم بالنساءِ خَيراً) وەصیەتتان بۆ دەکەم زۆر باش بن لەگەڵ خێزانەکانتاندا، لەگەڵ هاوژینەکانتاندا، لەگەڵ خانمی ماڵ و بەخێوکەر و پەروەردەکاری منداڵ و خزمەتکاری میوان و جێگای قەدر و حورمەت و ڕێز بڵندیتان،زۆر بە ئارام بن زۆر بەڕێزبن لەگەڵ ئەو ژنەی کە نیوەی ئاینەکەت لەو کاتەدا تەواو بوو کە ئەو بوو بە هاوسەری ژینت،فەرمووی: زۆر رێك و پێك و رەفتار شیرن بن لەگەڵ خێزانەکانتان، بەڵێ

خوشکانی بەڕێز و ئیماندار یەکەمین و دواهەمین سەرکردە لە مێژوودا کە لە دوایین راسپاردەدا بۆ شوێنکەوتوانی فەرموویێتی ئاگاتان لە خێزانەکانتان بێت، یان دەتوانین بڵێین: (النساء) هەموو ئافرەتان دەگرێتەوە، جا دایک بێت، ژنی پیاو بێت، کچ بێت، هەردەبێ بە حورمەت و رێزەوە تەماشای بکرێ، ئەو زاتە تەنها محمد المصطفی بوە ﷺ، بەڵام سەرکردە دونیاییەکان ئەوانەی کە باسی ماف ئافرەت و یەکسانی ئافرەت دەکەن تەنها ئەو کاتە ئافرەتیان لە بیرە کە ئارەزووی ژنهێنانیان هەیە، یان تا ئافرەتەکە تەمەنی کەمە و روخساری جوانە، بەڵام کە چووە تەمەنەوە یان کە بوو بە ژن و دایک ماف کۆتایی پێدێ و وەکو کۆیلە سەیر دەکرێ لایان..

کەواتە با خوشکانیش بزانن کە تەنها دڵسۆزیان هەر پێغەمبەری خوایە و با هەر شوێنکەوتەی ئەو بن، هەر لە ژورەکەی خاتوو عائشەی دایکی ئیمانداران ﵂ و خێزانی پێغەمبەریخواداینﷺ. خۆشەویست سەری لەسەر رانی عائشە بوو، هەستاو دانیشت، فەرمووی: ئەوە جوبرەئیلە دەفەرمووێ: (ملك الموت) لەبەر دەرگایە و داوای ئیزن دەکات،دڵنیابە پێش تۆ پرسی بە هیچ کەس نەکردووە،بەڵام ئێستا ئەی محمد تۆ ئیختیارت لەبەردەمدایە:حەزدەکەیت هەتا قیامەت بە زیندوویی بمێنیتەوە، یان بکەیتەوە بە رەفیقی ئەعلا؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (بَلْ الرَّفيق الأعْلى).

پاشان عبدالرحمان ی کوری حەزرەتی أبوبکری صدیق﵁ هاتە ژوورەوە، سیواکێکی بە دەستەوە بوو،پێغەمبەری خواﷺ کە چاوی بە سیواکەکە کەوت پەنجەی بۆ راکێشا، عائشە ﵂ فەرمووی: حەزت لێیەتی؟ فەرمووی: بەڵێ. ئینجا عائشە سیواکەکەی لە عبدالرحمان ی برای وەرگرت و بە تفی دەمی خۆی بۆی نەرم کردەوە و خستیە دەمی پێغەمبەری خواوەﷺ و سیواکی بۆ کرد!!لێرەشدا دەرسی پیرۆزی و گەورەیی سیواک فێردەبین، کە

ج سوونەتێکی گەورەیە و چەند بەسوودە بۆ دەمودان لە بۆنی ناخۆش و نەخۆشی، وە ئەو وانەیە فێردەبین کە دوایین خۆراك، دواهەمین شتێك کە چوبێتە ناو دەمی پیرۆزی پێغەمبەری خواوەﷺ بریتی بوو لە تفی خاتوو عائشەی خێزانی ﵂،کە ئەمەش رێز و پلە و پایەی ئافرەت دەردەخات لای پێغەمبەری خواﷺ ، وە ڕادەی بەختەوەری و دڵسۆزی و خۆشەویستی و بە سۆزی ژیانی خێزانی پێغەمبەری خواﷺ کە تاقانەیە لە مێژوودا و سەرکردە دونیاییەکان هەرگیزاو هەرگیز ئاوا ژیانی خۆشەویستییان نەبووە لەگەڵ خێزانەکانیاندا.

دوای ئەوە پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی (لا إلهَ إلا اللّه، إنَّ لِلمَوتِ سَكَرات، الهُمّ أعنّي على سَكَراتِ المَوتِ).. فەرمووی: (لا إلهَ إلا اللّه) بە راستی مردن ئازاری تایبەتی خۆی هەیە،خوایەگیان یارمەتیم بدەی لەسەر ئازاری کاتی رۆحکێشان،بەڵام لێرەدا دەبێ باسی ئەوە بکەین کە پێغەمبەری خواﷺ خوای گەورە ئەوەندەی خۆشدەوێت، هەرگیز ئازاری نادات بە رۆحکێشان، چونکە هیچ گوناهی نییە خوا لە گوناهی ئەوەڵ و ئاخیری خۆش بووە.بەڵام بۆیە پێغەمبەری خواﷺ ئاوا بە کوڵ بە دڵ لە خوا دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی عیبادەتی زەلیلبوون و پاڕانەوە و لاوانەوە بەرامبەر بە خوای خۆی ئەنجام بدات، چونکە ئەوە کاتی ئەو عیبادەتەیە هەروەکو نوێژ و رۆژوو کاتی خۆیان هەیە، بەڵێ ئەم عیبادەتی زەلیلبوون و(التّضَرُع إلى اللّه)ی ئەنجامدا و دەستی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و فەرمووی: (اللّهُمَّ إغفِر لي وَ إرْحَمْني و الْحَقْني بالرَّفيق الأعلى). خوایە لێم خۆش بە، خوایە ڕەحمم پێ بکەیت، خوایە بمگەیەنیت بە دۆستانی سەروو... خاتو عائیشە ﵂ دەفەرموێت: پەنجەی شایەتومانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و فەرموی: (بَلْ

الرَّفيـق الأعْلـى، بَـلْ الرَّفيـق الأعْلـى) ئـەمجا سـەری قـورس بـوو، کەوتـە باوەشمەوە و وەفاتی کرد.

الله اکبر، چ ڕێزێکی گەورەیە بۆ ئافرەتان ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە باوەشی ئافرەتێکدا ڕۆحی دەرچوو، لە ناو وەزیر و کاربەدەستانی پایە بڵندا ڕۆحی دەرنەچوو.. کەواتە: هەر ئەمە بەسە کە وەڵام بێت بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە دەڵێن ئیسلام مافی ئافرەتی نەداوە!..

سەلامی خوات لەسەر بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ (سَلَامٌ عَلَيْـكَ يَوْمَ وُلِدْتَ وَيَوْمَ مُتَّ وَيَوْمَ تُبْعَثُ حَيّاً).

ئـای چ ڕۆژێکـی ڕەش بـوو لـە بـەر چـاوی موسـڵمانان، ئـەو صـەحابانەی کـە هـەر چـەند غـەریب و نـەدار و هـەژار بـوون، هەرچـەندە ماندوو بوون، بەڵام بە چاوپێکەوتنی پێغەمبەری خوا ﷺ دەحەسانەوە و دڵ و دەروون و لاشەیان ئیسراحەتی دەکرد.

ئافرەتی صەحابە هەبوو کە لەیەك مەیدانی وەکو (ئوحودد)دا مێرد و برا و کوڕەکەی شەهید بوو بوو، بەڵام کە بینی پێغەمبەری خوا ﷺ سەلامەتە فەرموی: هەموو موصیبەتێك لە دوای سەلامەتی تۆ ئاسانە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئەنـەس دەفـەرموێت: هـەرگیز لـە ژیانـمـدا ڕۆژی وا ڕەشـم نـەبینیوە. شاری مەدینە لە بەرچاوماندا وا تاریك ببوو، کە ڕوناکی لێ بەدی نەدەکرا.

حەزرەتی عایشە رضي الله عنها دەفەرموێت:

صُبَّت عَلَيَّ مَصائبُ لَو أنَّها
صُبَّت على الأيّامِ صِرنَ لَيالي

ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ هاتە سەر لاشەی پیرۆزی و پەردەکەی لەسەر دەم و چاوی لادا و ناوچەوانی ماچ کرد و فەرموی: (طبتَ حَيّاً و مَيّتاً يا رَسُول الله ﷺ). واتە: ئای چەند بۆنت خۆشە بە زیندوویی و بە مردوویی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ.

ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب ﷺ کە هەواڵی وەفاتی حەزرەتی فەخری عالەمی پێگەیشت لە پەرۆشی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ بڕوای نەدەکرد کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردبێت.

بۆیە شمشێرەکەی دەرکێشابوو هاواری دەکرد: هەر کەسێك بڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کردووە ئەوە مونافیقە و بەم شمشێرە لە ملی دەدەم، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ چۆتە خزمەت پەروەردگاری و پاشان بە ئاگای دەهێنێتەوە و دێتەوە بۆ ناومان، هەتا حەزرەتی ئەبوبەکر ﷺ فریای کەوت و قورئانی بۆ خوێندەوە و ئەو ئایەتانەی بۆ خوێندەوە کە باسی ئەوە دەکەن کە پێغەمبەری خواش ﷺ وەکو هەموو ئەوانەی پێش خۆی وەفات دەکات..

﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلْخَٰلِدُونَ﴾ الانبياء: ٣٤.

ئەمجا ئیمامی عومەر ﷺ قەناعەتی کرد و لە شوێنی خۆی دانیشت و دەستی کرد بە گریان.

بەڵێ ئیمانداران: ژیانی هەمووی چاوساغی بوو ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾ الاحزاب: ٢١. دەبا ئەو فرمێسکانەی کە لەبەر وەفاتی دڵسۆزترین و خۆشەویسترین کەسمان کە پێغەمبەری خوایە ﷺ ڕشتمان ببێتە هاندەرمان کە زیاتر پابەندی سوننەت و ڕێبازە

پیرۆزەکەی بین و بۆ چاوتروکاندنێك لێی لا نەدەین، هەتا إنْشاءَ الله لەسەر حەوزی (کەوسەر) بە خزمەتی دەگەین.

بەڵێ ئیمانداران: هەروەکو چۆن ژیانی هەمووی چاو ساغی بوو. وەفاتیشی هەمووی دەرس و عیبرەت بوو، کە هەندێکمان باس کرد و لە کۆتای وتارەکەشدا ئاماژە بە چەند دەرس و وانەیەکی تر دەکەین کە لە وەفاتی حەزرەتی رسول الله دا ﷺ وەری دەگرین.

١.هەمومان دەمرین، ئەگەر پێغەمبەری خوا ﷺ مرد و دونیای فانی بەجێ هێشت، بەخوا ئێمەش هەموو هەر دەمرین، بەڵام گرنگ ئەوەیە بە ئیمانەوە بمرین ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ ال عمران: ١٠٢.

٢.پێغەمبەری خوا ﷺ کە وەفاتی کرد دیرهەم و دینار و زێڕو زیوی بەجێ نەهێشت، بەڵکو میراتی پێغەمبەر ﷺ کە بۆ هەموو تاکێکی ئوممەتەکەی وەکو یەك بەجێ هێشتوە، ئەم قورئانە و ئەو فەرمودە شیرینانەیەتی، ئەم مزگەوتەیە، ئەم شەریعەتەیە.

٣.بە وەفاتی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ، ئیسلام نەمرد، هەروەکو ئیمامی ئەبوبەکری ڕاستگۆی دڵڕوناك ﷺ، چەند جوان بەو زمانە ڕاستگۆیانەی خۆی فەرموی: (مَنْ كانَ يَعْبُدُ مُحَمَّداً فَإنَ مُحَمَّداً قَدْ ماتْ، وَ مَنْ كانَ يَعْبُدُ اللهَ فإنَّ اللهَ حَيٌّ لا يَمْوت).. کەواتە: چونکە خوا نەمرە، هەرگیز دینەکەشی نامرێت، وە خوا خۆی پارێزگاری ئەم ئیسلامە دەکات ﴿إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ الحجر: ٩. کەواتە: چۆن خوای گەورە قورئانەکەی دەپارێزێت، بەهەمان شێوەش هەڵگران و خزمەتکارانی قورئان، خزمەتکارانی فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ،

زانایانی ئیسلام ، مزگەوتەکان، ئەهلی دین، هەمووی إنْشاءَ الله مەحفوظ و مەحروسن و پارێزراون و خوا خۆی پارێزەر و پشتیوانیانە.

٤.دڵنیا بن کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەر تەنها بە لاشە لە ناو ئوممەتەکەی لاچووە، بەڵام ڕۆحی پیرۆزی لەلایەن خواوە ئاگادار دەکرێتەوە بە حاڵی ئوممەتەکەی و ئەگەر چاکە بکەن و لەسەر دینداری ڕاگیراو بن دڵخۆش دەبێت، ئەگەر ئوممەتەکەشی لا ڕێ ببێت، ئەوا دڵ نارەحەت دەبێت و داوا لە خوا دەکات کە غەزەبیان لێ نەگرێت.

دەبا ئێمەش لەم ساتەوە بڕیار بدەین کە کارێك بکەین کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ خۆشحاڵ بکەین و کارێك ئەنجام نەدەین کە پێغەمبەری دڵسۆز و خەمخۆری دونیا و قیامەتمان عاجز و غەمبار ببێت.

داواکارم لە خوای گەورە و میهرەبان کە ڕەحم بە هەموو لایەکمان بکات و لە گوناهمان خۆش ببێت و بە بینینی زاتی بێ چوونی خۆی (سُبحانَهُ و تَعالى) لە قیامەتدا و بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی شادمان بکات. اَللّهمَ آمین.

# وتاری دووەم بۆ مانگی ربیع الثاني

## بەختەوەری

( الحَمدُ للّهِ ربِّ العالمين، و الصَلاةُ و السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَّدٍ و على آلهِ و صَحبهِ أجمَعين )

سوپاس و ستایش هەر لایەقی خوای تاك و تەنها و بێ شەریکە. ئەو پەروەردگارەی کە هەرچی خێر و خۆشیەك و بەختەوەریەك بە هەر زیندەوەرێك دەگات هەمووی لوتف و کەرەمی ئەوە، هەرکەسیش خوا بەختەوەری نەکات، هەرگیز بەختەوەر نابێت.

ئەوەش کە خوای گەورە خۆشحاڵ و دڵڕووناکی بکات بە هۆی شوێن کەوتنی قورئان و پێغەمبەرەکەی کەس ناتوانێت توشی لا ڕێ بوون و بێ چارەیی و بەدبەختی بکات.

هەزاران صەڵات و سەلامی خوا بڕژێت بەسەر ڕۆحی پیرۆزی حەزرەتی محمد المصطفیدا ﷺ کە بەڕاستی هەموو ژیانی بریتی بوولە خێر و بەرەکەت بۆ مرۆڤایەتی.

هەموو جوڵندەیەك لە گەورەترین تا بچوکترین لە ڕەحمەتی ئەو ڕەحمەتە پشکی بەرکەوت هەر دەبێت واش بێت چونکە خوا فەرمویەتی ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ الانبیاء: ١٠٧.

بەڕاستی هەر گوفتارێك، هەر ڕەفتار و کردارێك ببێتە هۆی بەختەوەری بۆ مرۆڤ پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژەی پێ داوە و دەستی ئێمەی گرتوە بۆ ئەو ڕێگایە، وە هەر شتێکش ببێتە هۆی کلۆڵی و

کزۆڵی و داماوی و نەدانی و نەزانی مرۆڤ ، ئەویشی باس کردووە و ئاگاداری کردوینەتەوە کە لێی نزیك نەبینەوە.

ڕەحمەت و بەرەکەتی خوا لە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بێت وە ڕەحمەت و میهرەبانی خوا بڕژێت بەسەر هەموو ئەو کەسانەی کە شوێن کەوتووی ڕێبازەکەی پێغەمبەرن و ئەهلی قیبلەن هەتا ڕۆژی دوایی.

ئیمانداران: شتێکی بێ گومانە کە ئاواتی هەموو کەسێکی ژیر، پاڕانەوە و هەوڵ و تەقەلای هەر بۆ ئەوەیە ژیانێکی بەختەوەرانە و دوور لە ئاژاوە و پشێوی بەسەر ببات و دوور بێت لە هەموو ئەو شتانەی کە ژیان دەکەن بە ژان و ڕەحمەت دەکەن بە زەحمەت و نور دەکەن بە نار، ئەمە داواکاری هەموو کەسێکە بە جیاوازی ئایین و بیروباوەڕەوە، وە زۆریشن ئەوانەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا لە ڕابردوودا، وە لە ئێستادا باس لە بەختەوەر کردنی مرۆڤ دەکەن، وە چەند ڕێکخراو دروست کراون و پەیڕەو وپڕۆگرامی خۆیان هەیە بۆ ئەو مەبەستە و هەر یەکەی بانگەشەی ئەوە دەکات کە بەختەوەری و ژیانی ئاسودە وا بەلای ئەوەوەیە و هەر کەس بەم مەنهەجە کار بکات ئاسودە دەژی.

بەڵام دەبێت ئەو ڕاستیە لە بەرچاوی خۆمان دابنێین کە هەموو شتێك پێوەری خۆی هەیە و بەختەوەریش بە هەمان شێوە پێوەری تایبەتی خۆی هەیە.

وە زۆر گرنگە کە بزانین کە پێوەر دانەر دەبێت کۆمەڵێك تایبەتمەندی و پسپۆڕی هەبێت، وەکو:

١.شارەزای ناخ و دەروونی مرۆڤ بێت، نەك تەنها هەر ڕوكەشی دەرەوەی ببینێت و بەختەوەر بوون تەنها لە تێر كردن و پڕ كردنی وورگ و گیرفان و ئارەزووەكانی دا ببینێت، بەڵام لایەنی ڕۆحی و ناخی و ناخ و ویژدان و ناو دڵ نەبینێت و نەزانێت ئەو لایەنە مەعنەویە بە چی شاد دەبێت.

٢.شارەزای قیەم و ڕەوشتە بەرز و باڵاكان بێ و بزانێ مرۆڤ پێویستی بە چییە بۆ خۆش ژیان، نەك بگەڕێ بەدوای ئەوەی مرۆڤ حەزی لە چییە بۆ ئەوەی ماوەیەك بە خۆشی بژی پاشان هەر ئەو حەزە ژیانی لێ تاڵ بكات،چونكە ئەمڕۆ زۆرن ئەو كەس و لایەن و دەزگا ڕاگەیاندنانەی بە بیسراو و بینراو و خوێندراوەوە كە تەنها باسی ئەو لایەنانە دەكەن كە گەنجێك سۆزی زاڵە بەسەر عەقڵ و ژیریدا حەزی پێیەتی و بەدوایدا عەودالێكی تینووە و هەوڵی بەدەستهێنانی ئەدات بە هەر شێوەیەك بێ، بەڵام بێئاگا لەوەی كە ئەگەر بە نارەوا ئەو حەز و ئارەزوانەی تێر بكات پاش كۆتایی هاتنی ئەو قۆناغە لە تەمەن ئیتر ژیانی لێ دەشێوێ و تەرازوی ژیانی دەگۆڕێ.

كەواتە: ئەوە بەختەوەر كردنی نەبوو بەڵكوو بەدبەختكردنی بوو. بەڵام بەختەوەری ڕاستەقینە ئەوەیە كە بزانرێ ئەو كەسە پێویستی بە چییە و چۆن پێی دەدرێت، كە ببێتە هۆی بەختەوەری بۆ سەرجەم قۆناغەكانی ژیانی لە منداڵییەوە تا ناو گۆڕەكە وە پاشان ئاوەدانی قەبر و قیامەتەكەیشی.

٣. ئەو كەسە پێوەر دانەرە دەبێ شارەزای گەلان و ئومەتانی ڕابردوو بێت بە درێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، ئاگای لەوە بێت گەلان بە

چی پێشکەوتن و بەختەوەر بوون، بە چیش ژیانیان لیَ تێکچوو،ولاَت و نیشتیمان کاول بوو،خۆیان و سەروەت و سامانیان تێدا چوو.

٤. شارەزای ژیانی ئێستای حازر بێت و ئاگاداری سەردەم و زەمانی ئێستابیَ و دۆست و دوژمن بناسیَ و فرمێسکی تیمساح لە فرمێسکی خەمخۆری جیا بکاتەوە و بزانیَ کیَ بە چ مەبەستێك بانگەشەی مرۆڤ دەکات بۆ بەختەوەر بوون..

جا ئەوەی لەمانە شارەزا نەبیَ نازانیَ بەختەوەری بە چ بەدەست دیَ وە ئەگەر بانگەوازیشی بۆ بکات خۆیشی بە هەڵەدا بردووە و ئەوەی شوێنیشی بکەویَ بە هەڵەدا دەچیَ و سەرەنجام تیَ دەگات کە ئەوەی وەکو تینوویەك بە دوایدا وێڵ بوو وایزانی ئاوی سازگارە تراویلکە (سەراب) ی بیابانێکی بێرون بوو.

بەڵیَ بەڕێزان: بەراستی مرۆڤ دوو جۆری هەیە لە گەڕان و عەودالٌ بوون بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەری..

**جۆری یەکەم:** کەسێکە کونجی قەناعەتی گرتووە و خۆشترین ساتی تەمەنی ئەو کاتەیە کە خەریکی عیبادەت و خواناسیە، بەتامترین پاروە نان ئەو نانەیە کە بەرەنجی شان و عارەقی ناوچاوان و حەلاَلی خواردبێتی، هیواو ئاواتی ئەوەیە کە سودی بۆ خەڵك هەبێت و موحتاجی داماوێك بە هۆی ئەمەوە جێبەجیَ ببیَ شادمانە کاتێك زەردەخەنە دەخاتە سەر لێوێکی خەم لێنیشتوو، چاوی گەش و روون دەبیَ کە فرمێسکی مناڵێکی هەتیو دەسڕیَ و دەستی سۆز بەسەر سەردیدا دێنیَ.. چونکە تامی ئەم خۆشییەی کردووە و بەمە بەختەوەرە.

**جۆری دووەم:** کەسێکە هەوەس باز و خۆپەرست، ئەو ساتە ئیسراحەتە کە تاوانێك

ئەنجام دەدات،ئەگەر کاسبییەکەی و پارووە نانەکەی حەرام نەکات بە قورگیا ناچێ، خۆشی دڵی لە ئازاردانی دڵی خەڵکا ئەبینێتەوە.

بەڵام لێرەدا پرسیارێکی گرنگ سەر هەڵدەدات ئەویش ئەوەیە: ئایا بەختەوەری راستەقینە کێیە؟بۆ ئەم مەبەستە دەچینە خزمەت پێغەمبەری پێشەوامان – حەزرەتی محمد المصطفیﷺ– دەچینە خزمەتی، بەڵام دەبێ ئاگادار بین بۆئەوەی توشی بێئەدەبی نەبین لە خزمەتیدا با صلاوات لە دیداری بدەین و بڵێین: (اَللّهمَّ صَلِّ عَلی سَیِّدنا محمد و عَلی آله و صَحبِه وَ سَلِّم) ، پاشان پرسیاری لێ دەکەین و دەڵێن: ئەی خۆشەویستمان، ئەی نوری چاومان پێمان بڵێ کێ بەختەوەری راستەقینەیە؟! پێغەمبەری خواشﷺ لە دەرمانخانەی قورئان کە وەڵامی هەموو پرسیارەکان و شیفای هەموو نەخۆشیەکان و چارەسەری هەموو گرفتەکانی تێدایە ئاماژە دەکات بۆ سورەتی –طه– و دەفەرموێ: ئەو ئایەتە وەڵامی پرسیارەکەتانە.. ﴿فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَایَ فَلَا یَضِلُّ وَلَا یَشۡقَىٰ﴾ طه ١٢٣.

هەرکەسێ دینداری و خوا ناسی ناسنامەی بێت و بە ناوهێنانی خەڵك چاکە و عیبادەتی بیربکەوێتەوە، هەر کەسێك شوێن (هُدای)ی خوا کەوتبێ و وازی لە هەوای خۆی هێنابێ، هەرکەس پێ بە پێی پێغەمبەری پێشەواﷺ هەنگاو هەڵبگرێ.

هەرکەسێ گەورەترین بیرکردنەوەی سەرکەوتن و پایەداری ئیسلام و موسڵمانان بێت، خۆی بە خاوەنی دین بزانی، لە ورد و درشتی ژیاندا، چ تاك، چ خێزان چ كار و كەسابەتی، چ پەیوەندی کۆمەڵایەتی، پرس بە شەرع بکات و پابەند و تەسلیمی شەرع بێت، ئەوە وەعدی خوایە، (فلا يَضِلُ ولا يَشْقَى) دوو مژدەی گەورە:

**مۆژدەی یەکەم:** گومرا نابێ، جا ئایا گومرا کێیە؟! هەر کەسێك خوای نەناسێ، نەیپرسی خالقی کێیە، کێ لە نەبوونەوە دروستی کردووە، کێ رۆزیدەریەتی، کێ کردوویەتی بەم ئینسانە خاوەن ئەندام و لاشە جوانە و وهۆش و بیرە. بیری نەکردەوە کێ ئەم ئەرز و ئاسمانەی داناوە، ئەوە بە راستی بێوەفایە بە رامبەر بە خوا و لە چڵەپۆپەی سپڵەیی و پێ نەزانیندایە، چونکە بە بچوکترین یارمەتییەك کە لە لایەن کەسێکەوە پێشکەشی دەکرێ دەڵێ مەمنونم، سوپاست دەکەم کەچی رۆژێ لە رۆژان لەسەر ئەو هەموو بەخششەی خوا پێی بەخشیوە (بسم الله)یەك و (الحمد لله)یەك بەدەمیدا نەهات، ئەی بێوەفا لەمە زیاتر دەبێ کێبێت؟!!

بەڵام کەسێك خوای ناسی و شوێن شەرعی خوا کەوت ئەوە فلا یضل- گومرا نابێ.

**مۆژدەی دووەم:** بەدبەخت و چارەرەش نابێ، کردە پەشیمان نابێ، بە زورنای خەڵك هەڵناپەرێ، هەر رۆژەی لەسەر پەتێك یاری ناکات، بەرچاوی روون دەبێ لە ژیاندا.

وە هەر لە سورەتی -طه-دا لە ئایەتی ژمارە: ١٢٤ -١٢٦ دا ئەوەشمان بۆ باس دەکات کە کە هۆکاری بەدبەختی و گومرایی و ژین تاڵی و ناخۆشی و نارەحەتی و ناسۆر چییە دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ أَعْرَضَ

عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ۞ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ۞ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ﴾ طه ١٢٤-١٢٦

واتە: هەرکەسێك روو وەربگێڕێت لە بەرنامە و یادی من و پشتی تێبکات، بێگومان ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی تاڵو ناخۆش پێش دێت بۆیان، لە رۆژی قیامەتیشدا بە کوێری حەشرم دەکەیت، جا لەوێدا ئەو جۆرە کەسە دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ بە کوێری حەشرت کردووم خۆ من کاتی خۆی چاو ساغ و بینا بووم؟!! خوای گەورە وەڵامی دەداتەوە و دەفەرموێ: تۆ ئابەو شێوەیە بویت لە ئاستی ئایەت و بەڵگەکانی ئێمەدا کاتێك پێت ڕادەگەیەنرا، ئێمەش ئاوا مامەڵەی کەسێکی لەبیرکراوت لەگەڵدا دەکەین. لە سزا و ئازاردا دەتهێڵینەوە..

ئیمانداران: فەرموون با بەیەکەوە گوێ بگرین بۆ چەند نیشانەیەك لە نیشانەکانی بەختەوەری لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ بە ئومێدی ئەوەی بە کردەوە جێبەجێیان بکەین و بەختەوەری بەدەست بهێنین:

١-دونیا بەکەم گرتن: تەماشا کردنی ژیانی دونیا وەکو ئەوەی کە قۆناغێکی ژیانە و بۆ ئەوە باشەکە چاکەی تێدا بنێژرێ و بکرێ بە کێڵگەی قیامەت. بە راستی هەر کەسێ ئەو قەناعەتەی بۆ دروست بوو کە دونیا و خۆشییەکانی لە چاو قیامەتی نەبڕاوە و خۆشیە نەبیسراو و نەبینراوەکانی، هەر هیچ نییە و شایانی باس نییە،وە بەردەوام بیری لای قیامەت وبەهەشت بوو، وە وەکو ڕێبواری ڕێگە سەیری دونیای دەکرد

کە تیایدا لایداوە و دوای پشویەك بەجێیدەهێڵێ، ئەوە تەواوی ژیانی پڕدەبێت لە کامەرانی ودڵشادی و ئاسۆ رونی و دڵ دەوڵەمەندی، چونکە ئەوەی ئەمڕۆ ژیانی لە خەڵکی کردووە بە ژان و دەوڵەمەند سەد خۆزگەی بە نەدار وهەژارە، تەنها بریتییە لە باوەشکردنی لە سنور بەدەر بە دونیادا و لە یادکردنی قیامەت و بەهەشت، ئەمڕۆ زۆربەی خەڵکی هەر چاوی مادە بینینی ئیشدەکات و بیر لە جێهێشتنی ناکاتەوە،ژیانی چەند ساڵێ لەمەوبەر کە خەڵکی بە سکی تێرو بە دوان برسی و جاریٚ پۆشتە و دەیان جار رووت و بەرگ پیناوی، بەڵام دڵگەش و بە قەناعەت و بێگرفت و نەخۆشی دەرونی دەژیا بەڵام ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو هەموو لەزەت و خواردن و خۆراك و پۆشاك و وەسائیلی خۆش ژیانیەدا ئەو هەموو خۆکوژی و رەشبینیی و بێزاری لە ژیان و نەخۆشی دەروونییە هەیە کە کەم کەس و کەم ماڵ و بنەماڵە هەیە لێی بەدوور بێت، باشترین شایەتی ئەو راستییە یە کە باسمان کرد..

٢-دووەم نیشانە لە نیشانەکانی بەختەوەری مرۆۃ ئەوەیە کە: هەرگیز لە بیستنی قسەی خێر و جوان و زانستی بەسود تێرنابیٚ و وەکو عەوداڵێکی تینوو بەشوێنیدا دەگەڕێ.

بێگومان گەورەترین سەرچاوەی هەموو خێر و چاکە و چاکییەك و زانستێك قورئانی پیرۆزە.

کەواتە: موسڵمانی بەختەوەر ئەو کەسەیە کە هەرگیز لە قورئان و گوێگرتن لێی و خوێندنەوەی و شارەزابونی مانا و ناوەرۆکی تێر نابیٚ، وە رۆشنبیرییەکی گشتی هەیە دەربارەی هەموو زانستەکان و قسەی پڕ حکمەتی زانایانی ناوداری جیهان، کە ئەمیش هەر قورئان فێرمان

دەکات و هانمان دەدات و دەفەرموێ: ﴿فَبَشِّرۡ عِبَادِ ۞ ٱلَّذِينَ يَسۡتَمِعُونَ ٱلۡقَوۡلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحۡسَنَهُۥٓ﴾. الزمر: ١٧-١٨.

بە ڕاستی خوێندنەوە و گوێ بیستی قسەی خێر کاریگەری گەورە لەسەر مرۆڤ دروست دەکات، چەند کەس هەبووە خەریکی ئەوەبوە ئەو بیرەی کە بۆ کوشتنی خۆی و لەناوبردنی رۆحی خۆی بیری پێکردۆتەوە و هەوڵی بەکردارکردنی بووە، بەڵام لەو کاتەدا گوێبیستی وتارێکی جوان و هیوابەخش بووە، یان بەسەرهاتی کەسێکی هاوشێوەی خۆی خوێندۆتەوە کە چۆن ئارامی گرتووە و پاشان رزگاری بووە و پاشان بە بەختەوەری ژیاوە، یان فیلمێکی بەسودو ئامۆژگاری کاری بواری کۆمەلایەتی بینیوە و خۆی لەوێدا بینیوەتەوە و کاری تێکردووە و پەشیمان بۆتەوە لە کوشتنی خۆی و سەرەنجامیش بۆتە مرۆڤێکی بەختەوەر بەهۆی خوێندنەوە یان بیستن یا بینینی ئەو وانە و بابەتە پڕ بەخێرە، کە لێرەدا دەڵێم: خۆزگایە راگەیاندنەکانی ئێمە بە بەشەکانی بینراو و بیسراو و خوێنراوەوە، لەجیاتی ئەوەی بگەڕێن بە دوای ئەو بەرنامە و گۆرانی و فلیمانەدا کە ڕەوشت و بەها بەرزەکان دەروخێنن،بەڵام گەنجێکی تازە پێگەیشتوو بۆ ئەو قۆناغەی ژیانی حەزی لێیەتی، ئەو دەزگا راگەیاندنە ئەوە پێشکەشدەکات و هەموو ژیانی لە بەرچاو دەکات بە خۆشەویستییەکی نێوان کوڕ وکچی بە یەکنەگەیشتووی دڵ پڕ لە ڕق،یان بەیەك گەیشتووی ژیانێکی خێزانی پڕ لە خیانەت و چاو لەکەسانی تر بوو، یان عەرەق خۆری و قومارچی بەشی شێریان پێ دەدرێ و چاکان و ئەهلی مزگەوت و ئیسلامەتیش پشکی ڕێوی و هێمای جەهالەت و دواکەوتوویی، کە بە

ڕاستی ئەمە بووە هۆی خزان و ترازانی گەنجانمان بە کوڕ و کچەوە دڕۆزاندنی ناسنامەی ڕەسەنی ئیسلامەتی و کوردایەتی پاکمان، لەجیاتی ئەوە حەقە بزانن میللەت بەتایبەت گەنج و لاو پێویستی بە چییە(نەك حەزی لە چییە) ئەوە پێشکەش بکەن و خەڵکی پێ بەختەوەر بکەن، بەڵام ئەوەش مەحاڵە مەگەر کەسێکی پەروەردەکراو بە قورئان ئەو وەسائیلە ئیعلامیەی لەبەردەستا بێت.

٣-سێیەم نیشانەی بەختەوەری بریتییە لەوەی: دڵ و دەرونێکی خاوێنت هەبێت و دوور بێت لە هەموو رق و بوغزێك، لە هەموو ئیرەیی و حەسودی بردنێك بە کەسانی تر، رەحمەت لەو شاعیرە بێ کەفەرموویەتی:

یا طالب العیش في أمنٍ و في دعة  رغداً بلا قترٍ صَفواً بلا قَلَقِ

خَلصْ فُؤادكَ من غلٍّ ومن حَسَدٍ  فَالغلُّ في القَلب مِثلُ الغُلِّ في العُنقِ

واتە:ئەی ئەو کەسەی کە دەتەوێ ژیانێکی بەختەوەرانە و بێترس و بێ دڵەراوکێ و خەم و خەفەت بەریتە سەر، وەرە دڵت پاکەرەوە لە هەموو بوغز ورقلێبونەوەیەك وەرە رەگی حەسودی لە دڵتا هەڵکەنە و فڕێدە، چونکە دڵنیابە رقو قینی ناو دڵت بەرامبەر کەسانی تر ئەبێتە تەوقێکی ئاسنین و دەئاڵێتە گەردنی خۆتەوە و سات بە سات توندتردەبێت و سەرەنجام هەناسەت لێ دەبڕێ..

بەڕاستی ئیمانداران : زۆربەی نەخۆشییە دەروونیەکانی ئەمڕۆ سەرچاوەی یەکەمی بریتیە لە دڵێکی بوغزاوی پڕ لە رق و قین و حەسودی بەرامبەر بە کەسانی تر،تەماشاکەن کاتێك خەڵکی خاوەنی دڵێکی پاك بوون، هەستی ئیمانداران وایلێکردبوون ئەوەی بۆ خۆیان پێیان خۆش بوو، بۆ هەموو خوشك و برایەکی ئیمانداریش پێیان خۆش بێت.

ئای چەند دەم و چاوەکان گەشاوە بوون، چەند دڵەکان شاد بوون، چەند خۆشەویستی هەبوو چەند تاك و خێزان و کۆمەڵ بەختەوەر بوو...

٤- چوارەم نیشانەی بەختەوەری ئەوەیە: واریع و خۆپارێزە لە حەرام، تەنانەت نەك هەر لە حەرام خۆپارێزە لەهەموو ئەو شتانەش خۆیدەپارێزێ کە گومانـاوین و و حوکمی حەڵاڵی تەواویان بەسەردا نادرێ، لەبەر ئەوەی هەرکاتێك مرۆڤ خۆی پاراست لەشتی حەرام و گومانـاوی ژیانێکی سەربەرزانە بەسەردەبات و لەناو هەموو خەڵکا سەری بەرزە و لە لێپرسینەوەی خوانەبێ لەهەموو کەس بێ منەتە و دڵێکی ئارامی هەیە، ئەمەش سەرداری پێغەمبەران و مامۆستای دەروون ناسان حەزرەتی محمد ﷺ بۆی باس کردوین و دەفەرموێ: (دَع ما يريبُك إلى ما لا يَريبُك) (رواه الترمذي و قال: حديث حسن صحيح)

وەلە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەر ﷺ ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە کە مرۆڤ بە راستگۆیی سەرفراز و بەختەوەر دەبێت و بەدرۆ و دەلەسە و قسەی ناراستیش توشی دڵەڕاوکێ و دڵە لەرزێ دەبێ.

دەفەرموێ: (إنَ الصَدقَ طَمأنينة وَ الكذب ريبَة) رواه الترمذي.

پیاو چاکان هەرشتێك ببێتە مایەی ئەوەی کە گومانیان بۆ دروست بکات خۆیان لێ پاراستووە، یەکێك لەو پیاوچاکانە ناوی: (مەسوری کوڕی مەخرەمە) بوو، دەفەرموێ: جارێکیان خواردنێکی زۆر (گەنم و جۆ و دانەوێڵەی تری کڕی) و بردیە عەمباری دوکانەکەیەوە. لەو کاتەدا پایز بوو، (فَرآى سَحاباً في الخَريف فكَرِهَهُ)، چاوی کەوت بەپارچە هەورێك کە نیشانەی بارینی پێوە بوو، دەفەرموێ لە دڵی خۆیدا خەریك بوو پێی ناخۆش بێت چونکە ئەگەر بارانی باش بباریێ دانەوێڵە باش دەڕوێ و زوو گەورە دەبێ و نرخی خواردن کەم دەبێتەوە و دێتە خوارەوە، ئەم گومانە خراپە هاتە ناو دڵیەوە، بۆیە یەکسەر

بەئاگا هاتەوە و بەنەفسی خۆی گوت: (ألا أراني كَرِهتَ ما ينفع المُسلمين؟) ئای ئەوە چییە دەبینم بە شتێك دڵتەنگی كە سوود و قازانجی موسڵمانانی تێدایە؟! (فألی أن لايربح فيه شَيئاً) . هەرلەوێدا بڕیاریدا كە هیچ قازانجێك نەخاتە سەر ئەو گەنم و دانەوێڵەیەی كڕیویەتی و بەنرخی خۆی بە موسڵمانانی بفرۆشێتەوە، ئەمجا ئەمەی بۆ خەلیفەی موسڵمانان گێڕایەوە كە حەزرەتی عومەری كوڕی خەطاب بوو، ئەویش زۆر دڵخۆش بوو بەوەی كە بازرگان و دوكانداراني ولاّتەكەی ئاوا بە ویژدان و دەروون ئاوەدانن و ئەمەش نیشانەی بەختەوەری و سەرفرازی ئەو كۆمەڵگایەیە بۆیە ئافەرینی كرد و دەست خۆشی لیٚ كرد و دوعای خێری بۆ كرد و فەرمووی: (جَزاكَ اللهُ خَيراً)، ئای خوای گەورە بۆ خۆی پاداشتی ئەو دەروونە پاكەت بداتەوە خوای گەورە بەرەكەت بخاتە رزق و رۆزیتەوە و هەزاران قاتی ئەو قازانجەی وازت لیٚ هێنا پێت ببەخشیٚ.

جا موسڵمانی بەڕێز: وەرە بیهێنە بەرچاوی خۆت بزانە ئەو بازرگانە بەو پاكیەتیەی چەند دڵی خۆش بووە، ئای چەند بەختەوەر بووە، كە ئەگەر بەقەدەر مایەی خواردنەكە و دانەوێڵەكەی كە بۆ فرۆشتن كڕی بووی قازانجی بكردایە، نیو ئەوەندەی ئەوە دڵخۆشی نەدەكرد، ئەی بزانە و بەچاوی سەر لە دونیای واقعی ئەمڕۆدا ئەو بازرگانە ویژدان مردووانە ببینە كە بەردەوام ئاواتەخوازی ئەوەن كە دەنگ وباسێك پەیدا ببێت و شت بشارنەوە و لەسەر خەڵكی گران بكەن، توخوا سەیریان بكە چەند داماون، چەند كزۆڵن، چەند دڵبەخەمن و چەند لە خەویشدا

ناحەسێنەوە، چەند ماڵ ومنداڵیان ناصاڵحە و ئەو پارەی ئەو بۆیان کۆدەکاتەوە بە شتی نابەجێ و ناڕێك و ئابڕووبەر سەرف دەکەن و گاڵتەشیان بە عەقڵی باوکیاندێ، دەی کەواتە: ئەگەر دەتەوێ بەختەوەر بیت با ویژدانت زیندوو بێت، خۆت لە حەرام و شتە گوماناوییەکان بپارێزە..

٥-پێنجەم نیشانەی بەختەوەری ئەوەیە: ئەو کەسە بەردەوام حەزی لە رەفاقەت و تێکەڵی و هاوڕێیەتی کەسانی چاکە خواز و دیندار و بەڕێزە. بە شوێنیاندا دەگەڕێ، کە دەستی کەوتن وا دەزانێ گەورەترین سەرمایە و سامانی دەست کەوتووە، لەبەر ئەوەی تێگەیشتووە لەو حەقیقەتەی کە پێغەمبەری پێشەوامانﷺ بە حەقەت فەرموویەتی: (المَرء على دِينِ خَليلِهِ فَلْيَنظُرْ أَحَدُكُمْ منْ يخالِلْ). مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی جا با هەریەك لە ئێوە تەماشا بکات و بە جوانی وورد بێتەوە کە کێ دەکات بە هاوەڵی خۆی. بەڵێ ئیمانداران: چەند کەسمان بینی هاوەڵی چاك بوە مایەی هیدایەتی. چەند کەسیشمان بینی بەهۆی برادەری خراپەوە بەدبەخت و چارە ڕەش بوو، یان کوشتیان یان خەڵکیان پێ کوشت یان توشی دزی یاخود مادە هۆشبەرە روخێنەرەکان بوو.

ئەو پەندە چەند جوانە کە دەڵێ:

کە لەگەڵ بەدا هەڵسی و دانیشی وەك شەکر لە جێی تەڕ هەو دەکێشی

جا کەواتە: چۆن خۆت برادەری باش هەڵدەبژێری ئاگات لە منداڵەکانیشت بێت، بزانە کێ دەکەن بە دۆست و هاوەڵیان، چونکە سەرەنجام رەفتاری برادەرەکانیان دوبارە دەکەنەوە...

٦-نیشانەی شەشەم بۆ بەختەوەری: سەخی تەبیعەتی و بەخشندەییە، چونکە مرۆڤی بەخشندە هەمیشە دڵخۆشە و مرۆڤی چروک و پیسکە و رەزیلیش بەردەوام دڵی تەنگە.

٧-حەوتەم: مرۆڤی بەختەوەر حەز بەوە دەکات کە بەردەوام ئیش و کاری خەڵکی بکەوێتە لای و بە ئەوپەڕی خۆشحاڵییەوە بۆی جێبەجێ بکات و دڵی خەڵکان خۆش بکات و لێو بە باری بگۆڕێ بە بەختەوەری و پێکەنین، بە کورتی حەز دەکات یەکێ بێ لەو کەسانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەصفیان دەکات و دەفەرموێ: (خَيْرُ النّاسِ أنفَعُهُمْ للناسِ).

٨- هەشتەم نیشانەی بەختەوەری هەرکەسیك ئەوەیە: خۆی خەریك ناکات بەکارێك کە پەیوەندی بەئەوەوە نەبێت، فەرموودەکەی سەروەر و چاوساغمان محمد المصطفى ﷺ جێبەجێ دەکات کە فەرموویەتی : (مِن حَسنِ الأسلامِ المَرءِ تَركهُ ما لا يعنيه)..

٩- نۆیەم نیشانەی بەختەوەری بۆ مرۆڤ ئەوەیە: کەسێك خۆ بەکەم زان بێت و دوور بێت لە تەکبوور و خۆبەزل زانین، لەبەرئەوەی هەرکەسێك فیز و خۆبەزل زانینی هەبێت، لەلای خوا و خەڵکی خوا مەبغوزە و کەس خۆشی ناوێت و بۆخۆشی بەردەوام دڵتەنگ و نائارامە.

١٠- خاڵی ژمارە دە لە نیشانەکانی مرۆڤی بەختەوەر ئەوەیە کە: بەردەوام مردنی لەبیرە، (كَفى بالمَوتِ واعِظاً)، بەڵێ بەسە مردن ئامۆژگاری کار بێت بۆ مرۆڤ، بەراستی هەرکەسێك مردنی لەبەرچاو بێت، دەزانی دونیا زۆر زوو کۆتایی پێ دێت و ئەم دونیا فانیەش شایەنی ئەوە نییە کەلە

پێناویدا دڵی خەڵکی ئازار بدەی، ماڵی حەرام بخۆی، زوڵم و ستەم بکەی، وا لە کۆڵی بدەی کەوا بزانی نامری، بەڵێ، ئەوەی کە دەبێتە هۆی بەدبەختی مرۆڤ بە پلەی یەکەم زۆر باوەش کردنە بە دونیادا وەك ئەوەی کە هەرگیز جێی نەهێڵێ چونکە لەو پێناوەدا ئازاری خەڵکی دەدات و ماڵیان دەخوات و زوڵم و ستەم دەکات، بەڵام ئەگەر مرۆڤ مردنی لەبیربوو، ئەوا زوو چارەنووسی خۆی دێتە پێش چاو و بە ئاگا دێتەوە و واز لە خراپە دێنێت و سەرەنجام بەبەختەوەری و بێ وەیی دەژی و فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ دەکات کە فەرموویەتی: (لاضَرَرَ ولا ضِرار). موسڵمان نەزەرەری بۆ کەس هەیە نە ئەوەندەش زەلیلە کە لە ترسنۆکیدا زوڵمی لێ بکرێت و زیانی لێ بدرێت، چونکە موسڵمان دەزانێ مردن حەقە و کاتی دیاری کراوە و ترسنۆکی هیچ لە ئەجەلی دوور ناخاتەوە، بۆیە کەسێکە بەرگری لەمافی خۆی دەکات، ئیمانداران: ئەوە (دە) نیشانە بوون کە لە هەرکەسێکدا هەبن إنشألله بەختەوەر دەبێت.

وە نیشانەکانی مرۆڤی بەدبەختیش ئەمانەن: هەموو ئاواتی دەوڵەمەند بوونە بە حەڵاڵی بێت یان بە حەرامی، زمان پیس و جوێن فرۆشە، حەزی لە دانیشتن و کۆڕی پیاوانی خواناس نییە، موتەکەبیرە و خۆبەزل زانە، کاری چاکە ناکات و هەوڵی تێکدانی کاری چاکە دەدات، بەخیل و چاوچنۆکە و نابەخشێ، مردنی لەبیر نییە و وا دەزانێ هەرگیز نامرێ، رقی لە بەرنامەی خوایە و داوا دەکات شەریعەتی ئیسلام جێبەجێ نەکرێت، خوای گەورە بە لوتفی خۆی بمانپارێزێت لە بەدبەختی و نیشانەکانی. امین.

بەڵێ بەڕێزان : ئایا چی وا لەمرۆڤ دەکات کە چاکە کار بێت و خراپەکار نەبێ؟!! بێگومان دین و ئیمانە، بەڵام ئایا دین و دینداری هەرتەنها بریتیە لە نوێژ و ڕۆژوو دروشمە بەندایەتیەکان بەتەنها؟! نەخێر، بەڵکو دینێك دەتوانێ گۆڕانکاری دروست بکات لە مرۆڤدا کەئەو دینە تەداخولی ورد و درشتی ژیان بکات، نەك وەك دژ بە دینەکان دەڵێن: دەبێت دین و دەوڵەت لە یەکتر جودا بن، کە مەبەستیان لە دین و شەریعەتی ئیسلامە، بەڵام بێگومان ئەو دژ بە خوا و دین و ئیمانانە بۆ حەزناکەن کە ئیسلام لە دەستوری وڵاتدا هەبێت و حوکمی پێ بکرێت، لەبەرئەمانەیە:

١- بڕوانەبوون بە خوای گەورە -نعوذ بالله- دیارە هەرکەسێك کە بڕوای بە خوا نەبێت چۆن دان دەنێت بە شەریعەت و بەرنامەکەیدا.

٢- ئیسلام ئەو دینەیە، ئەو بیروبڕوایەیە کە جیاوازی لە نێوان بەرپرس و میللەتدا ناهێڵێت، ئیسلام ئەو هەستە لەناو ناخی کاربەدەستانی موسڵماندا دروست دەکات کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (أيما راعٍ غَشَّ رَعيته مات يوم يموت حَرَّمَ اللهُ عليه الجنَة) هەر لێپرسراوێك کە غەش لە میللەتەکەی و ئەوانەی ئەو لێیان بەرپرسیارە بکات، ئەو ڕۆژەی کە دەمرێ خوای گەورە بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات.

٣- بێ دینان بۆیە حەزیان لە شەریعەتی ئیسلام نییە، چونکە ئیسلام دەفەرموێ: دز ئەگەر مەرجەکانی تێیدا هاتە دی دەبێت دەستی ببردرێت لەسەر دزی، وەلەم حوکمەدا جیاوازی نێوان دەسەڵاتدار و بێ دەسەڵات نەکرێ، هەروەکو پێشەوامان محمد ﷺ فەرموویەتی: (( وَالذي نَفس مُحَمَد بيَدِهِ لَو أن فاطمَة بنت

محمد سرقت، لقطعت محمد یَدَها)) دیارە خەڵکی دز و دەست پیس دژی ئەم بڕیارەیە.

٤- لەشەریعەتی ئیسلامدا چەسپاوە کە ئەگەر مەرجە شەرعیەکان لەسەر زیناکار چەسپا ئەگەر ئەو زیناکارانە چووبنە خانەی هاوسەریەوە پێشتر، ئەوا دەبێت ڕەجم بکرێن بەبەرد و لەژێر بەردا بکوژرێن.

بەڵام لە بێ دینی و بێ ئیمانیدا، هیچ شتێك موقەدەس و پیرۆز نییە، دین - شەرەف، ناموس، ئابڕوو، ئەمانە بۆ ئەوە نابن دیفاعیان لێ بکرێت، لە بێ دینیدا شتێك نییە خەتی سوور بێت و ناوی حەڵاڵ و حەرام بێت.

کاتێك ئیسلام مەنعی نەزەرێك، ڕوانینی دوو ڕەگەزی بەرامبەر بۆ یەکتر دەکات کە ئەگەر مەحرەم نەبن، ئەوا بێ دینەکە وای تەفسیر دەکات کە ئەوە کوشتنی ئازادی شەخصیە، بەڵام لای ئیسلام، حەزێکی هەڵقوڵاوی دەرونی گەنجێك کە سۆز و ئارەزووی زاڵە بەسەر عەقڵ و ژیریدا، ئەو حەزە سەرکوت بکرێت باشترە نەك سەربەستی و ئابڕوی خێزانێك و بنەماڵەیەك پێشێل بکرێ، ئەی مەگەر زینا سەرەتاکەی لە نەزەر و ڕوانینێکی حەرامەوە دەست پێ ناکات؟! شەرع دەفەرموێ: تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا حەرامە، با ئەو ئافرەتە ژن خوشکی خۆشت بێت، چونکە خالقی مرۆڤ دەزانێ کە گورگی وا هەیە تەماع لە ژن خوشکی خۆشی دەکات و ئامادەیە کە خیانەت لە خێزانی حەڵاڵی خۆی بکات و دەست لەگەڵ ژن خوشکەکەی تێکەڵاو بکات، هەروەکو چەند ڕووداو لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراونەوە لەو بارەوە و ئێرە جێگەی باس کردنیان نییە.

کەواتـە بەختـەوەری مرۆڤایـەتی لـە ئیـسلامدایە و لـە جێبـەجێکردنی شەرعەکەیدایە، بەڵام هەرکەسێك کە دژی شەرع قسە بکات، ئەوە بڕوای بە هیچی ئیسلام نییە بەڵام بۆ چاوبەستەکی جەماوەری موسڵمان دەڵێت: دین نوێـژ و ڕۆژووەکـەی باشـە بـەڵام قـانونی بـاری کەسـیەتیەکەی و قـانونی سزاکانی بۆ ئـەم سـەدەی بیـست و یەکـەم نابێـت ئـەو جۆرە کەسـانە خـوای گەورە لە بارەیانەوە دەفەرموێت:

﴿وَإِذَا لَقُوكُمْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾

داواکارم لە خوای گەورە کە زیاتر لە ئیسلام شارەزامان بکات و تێمان بگەیـەنێت، ئەوانـەی دڵـسۆزی ئیـسلامن سـەرفراز و دامـەزراو بـن، ئەوانەشـی لاڕێ بـوون، خـوای گـەورە هیدایـەتیان بـدات، خـوای گـەورە ئێمـە و هـەموو موسـڵمانان بەختـەوەری دونیـا و دوا ڕۆژ بکـات و لـە هـەموو نەهامەتیـەك و زەبونی و کزۆڵی و کلۆڵیەك بمانپارێزێت و (ربنا آتنا في الدُنيا حَسَنَةً وَ في الآخِرةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النار) اللهم آمين.

# وتاری سێیەم بۆ مانگی ربیع الثانی

# ئازادی بیر و باوەڕ لە ئیسلامدایە نەک لە کوفردا

# وتاری سێیەم بۆ مانگی ربیع الثاني
# ئازادی بیر و باوەڕ لە ئیسلامدایە نەك لە كوفردا

الحَمدُ للّٰهِ رَبّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعينَ.

ئیمانداران: خوای گەورە ڕێزی زۆری لە مرۆڤ گرتووە و خۆی فەرموویەتی لە قورئانەكەیدا: ولَقَدْ كَرَّمنا بَني آدَمَ.

مرۆڤیش كاتێك هەست بەو ڕێز و قەدر و حورمەتەی خۆی دەكات كە هەست دەكات بیر و باوەڕ و عەقیدەی پارێزراوە، بۆیە ئازادی بیر و باوەڕ لە ئیسلامدا زۆر گرنگە، لەگەڵ ئەوەشدا كە ئەم ئیسلامەتییە وەكو هەولو تیشكی ڕۆژ وایە بۆ مرۆڤ و ژیان و ژینگە ، بەڵام خوای گەورە بۆ پاراستنی ئازادی بیر و باوەڕ فەرمویەتی نابێ ئەم ئیسلامە موبارەكە بەزۆر نابێ بەسەر خەڵكیدا بچەسپێ و خەڵكی بە زۆر بكرێ بە موسڵمان: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ البقرة ٢٥٦، ئەم ئایەتە قورئانیەش كاتێك دابەزیە خوارەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ تەشریفی بردە شاری مەدینە،هەندێ كەس لە موسوڵمانە مەدینەییەكان كاتی خۆی پێش ئیسلام كە منالّیان نەبوو، چوبونە لای زانا ئاینییەكانی جولەكە لە شاری مەدینە و داوایان لێ كردبون كە بۆیان لە خوا بپاڕێنەوە، جا ئەگەر خوا منالّی پێ بەخشین نەزریان كردبوو كە بیكەن بە جولەكە، جا ئەوەبوو ئەو منالانەی لەو كاتەدا لەدایك ببون، دایك و باوكیان ناردبویانە لای جولەكەكان و ببون بە جولەكە،لەو كاتەدا تازە لاو بوون، جا كاتێك خوای گەورە ئەو خەڵاتە گەورە و بێوێنەیەی خەڵاتی خەڵكی مەدینە كرد كە نوری حەزرەتی محمد ﷺ و قورئان و ئیسلامەتی بوو، ئەو دایك و

باوکانە ئەمجا کە ئاینی حەقیان ناسی بۆ یان دەرکەوت کە ئاینی جولەکە دەستکاری کراوە و تەنها توێکڵەکەی ماوەتەوە و کرۆکەکەی نەماوە، بۆیە ویستیان بەزۆر کوڕ و کچە جولەکەکانیان پەشیمان بکەنەوە و لە جولەکایەتی بیانهێننە سەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام، بەڵام ئەو کوڕ و کچانە ئامادە نەبوون بێنە سەر ئاینی ئیسلام، خوای گەورە حەزرەتی جوبرەئیلی ناردە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتەی بۆ هێنا کە دەفەرموێ: :

﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ﴾ البقره ٢٥٦.

موسڵمانانی بەڕێز: قورئانی پیرۆز لە چەند ئایەتێکدا باسی ئازادی بیر و باوەڕی کردوە.

بۆ نمونە: لە سوڕەتی یونس: ٩٩ دا دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ﴾

واتە: خۆ ئەگەر پەروەردگارت بیویستایە دەیتوانی بەزۆر و بە ناچاری هەر هەموو دانیشتوانی سەر زەوی باوەڕ بهێنن، بەڵام پەروەردگاری مەزن ڕێزی بۆ ئادەمیزاد داناوە و سەرپشکی کردووە (لە نێوان ئیمانهێنان و بێباوەڕیدا)

جا ئایا تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ (یا تۆی ئیماندار لە هەر سەردەمێکدا بیت) ئەتەوێ زۆر لە خەڵکی بکەی بۆ ئەوەی ئیماندار بن؟!! .. سُبحان الله لە ڕێزی ئیسلام بۆ هەر بیر و باوەڕێك کە تەنانەت ڕێگەی نەداوە بە پێغەمبەرەکەی خۆی کە بە زۆر خەڵکی بهێنێتە سەر ڕێگای ئیسلامەتی،بەڵکو دەبێ ئەو کەسە خۆی قەناعەتی بۆ دروست ببێ و بە تەواوی گیان و هەست و ناخی شایەتمان بهێنێت..

وە هەروەها لە سورەتی ق :٤٥ دا دەفەرموێ: ﴿نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ﴾. واتە: ئەی محمد ﷺ ئێمە چاك ئاگادارین بەوەی کە ئەو کافر و خوانەناسانە دەیڵێن و چۆن دژایەتی ئەم ئیسلام و قورئانە دەکەن، بەڵام خۆ تۆ زۆردار نیت بە سەریانەوە تا بە زۆر باوەڕیان بەسەردا بسەپێنیت،کەواتە: تۆ تەنها ئەوەت لەسەرە ئەی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەم کە بەم قورئانە یا دادوەری ئەو کەسانە بکەیت کە لە هەڕەشەکانی ئێمە دەترسن.

ئیمانداران: خوای گەورە (١٢٤)هەزار پێغەمبەری ناردووە بۆ سەر مرۆڤایەتی بەس بۆ ئەوە بووە کە ئیمان بە خوای تاك و تەنها بهێنن و واز لە بت پەرستی بهێنن، بەڵام نابێ ئەو باوەڕهێنانە بە زۆر بێت.

زانای بەناوبانگ (شَيْخُ الاسلام –إبْنُ تيميَة– لە السِّياسَة الشَرعِية) دا دەفەرموێ: کوشتنی ئەو کافرانە لە کاتی غەزادا لەبەر ئەوە نییە کە کافرن. بەڵکو لەسەر ئەوەیە کە هاتوون ڕێگا لە بڵاو بوونەوەی ئیسلام دەگرن کە بگات بە مرۆڤەکان، چونکە ئەگەر لەسەر کافر بوونەکەیان بکوژرانایە ئەوا بە جزیە لێوەرگرتن وازیان لێ نەدەهێنرا کە بە ئازادی لەسەر بیر وباوەڕی خۆیان بمێننەوە...

جا بەڕێزان ئەوە ڕێزی ئازادی بیر و باوەربوونە لە ئیسلامدا، بەڵام با چاوێکیش بگێڕین بە مێژووی مرۆڤایەتی کۆن و تازەدا کە ئەوان چۆن ڕێزیان لە ئازادی بیر و باوەڕ گرتووە؟!! دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز، نمونەیەك وەردەگرینەوەنمونەکە باسی ژنێك دەکات، بۆیە نمونە بە ژنان دەهێنینەوە چونکە ناحەزانی ئیسلام و قورئان دەڵێن: ئیسلام ڕێزی ژن و بیروباوەڕی ژنی نەگرتووە، بەڵام ئەوە ژنێکە کە لە پێناو بیر وباوەڕەکەیدا شەهید دەکرێ، ئەو ئافرەتەش (خاتوو ئاسیا)یە کە خێزانی فیرعەون بوو.خوای گەورە بەسەرهاتی ئەو ژنە قارەمانەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە ئیمانی

بە خوای تاك و تەنها هێناو نەفرەتی کرد لە خۆ بە خوازانینی هاوسەرەکەی کە فیرعەون بوو،وە لەو زوڵم و ستەمەی کە لە گەلەکەی دەکرد، کاتێ فیرعەون زلنی (خاتوو ئاسیا) موسڵمان بووە داوای لێ کرد پەشیمان بێتەوە لە ئیمانەکەی، بەڵام (خاتوو ئاسیا) سوربوو لەسەر بیر و باوەڕی یەکتا پەرستی و سەرەنجام فیرعەون بڕیاری دا کە چوار مێخی بکێشن و زۆر بە ئەشکەنجە و ئازار شەهیدیان کرد، تەنها تاوانی (خاتوو ئاسیا) ئەوە بوو کە ئیماندار بوو بە خوای تاك وتەنها و هیچی تر.

خوای گەورە (خاتوو ئاسیا)دەکات بە نمونە بۆ هەموو ئەو ژنانەی کە وەکو ئەو تەنها لەسەر خواناسی و دینداری و قبوڵ نەکردنی بیروباوەڕی کوفر لە مێژوودا شەهید دەکرێن. بۆیە قورئان دەفەرموێ –إمرأة فرعون– ناوەکەی ناهێنێ بفەرموێ: ئاسیای کچی مەزاحیم، چونکە مێژوو دەیان ئافرەتی وەکو (خاتوو ئاسیا) دروست دەکاتەوە و دەبنە شەهیدی عەقیدە. بەڵام دواتر کە باسی حەزرەتی مەریەم دەکات کە ناوەکەی با ئاشکرا دێنێ، بۆچی؟! چونکە نمونەی مەریەم کە بێ مێرد منالی ببێت جارێکی تر دوبارە نابێتەوە کە ئەمەش ئیعجازێکی قورئانە کە ئەو کەسانەی دەبنە پێشەنگ بۆ کەسانی تر و مێژووەکەیان دوبارە دەبێتەوە ناویان ناهێنێ و هەر ئاماژەیان پێ دەکات، جا با بچینە خزمەت قورئان و گوێ بیستی خاتوو ئاسیا بین دەفەرموێ: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِى عِندَكَ بَيْتًا فِى ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِى مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾ التحريم: ١١.

واتە: هەروەها خوا نمونەی هێناوەتەوە بە هاوسەرەکەی فیرعەون بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە.کاتێك لە سەرەمەرگدا بوو خەریك بوو شەهید دەبوو. رووی کردە خوا و فەرمووی: پەروەردگارا لە لای خۆت لە بەهەشتدا ماڵێکم بۆ دروست بکە تا بەردەوام بە دیدارت شاد ببم. و لە

دەست فیرعەون و کار و کردەوەی رزگارم بکە و لە دەست ئەم قەومە ستەمکاردەش دەربازم بکە..

نمونەی دووەم فەرموودەیەکی پێغەمبەرە ﷺ کە هەر باسی ئافرەتێك دەکات کە لە پێناوی بیروباوەڕەکەیدا نەك خۆی بەڵکو سەرجەم جگەرگۆشە بێ تاوانە چاوگەشەکانیشی شەهید بوون، دەی فەرموون با بچینە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بزانین چۆن ئەو بەسەر هاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە. خۆشەویست ﷺ دەفەرموێ:ئەو شەوەی کە شەوڕەویم پێ کرا تیایدا بۆنێکی خۆش بەڕومدا هات و ووتم: ئەی جوبرەئیل ئەو بۆنە خۆشە چییە؟ فەرمووی: ئەوە بۆنی قژداهێنەرەکەی کچەکەی فیرعەون و منداڵەکانیەتی، وتم: بەسەرهاتیان چۆن بووە؟! فەرمووی: رۆژێکیان ئەم ژنە کە خزمەتکاری کچەکەی فیرعەون بوو، رۆژانە دەیرازاندەوە و قژی بۆدادەهێنا. لە کاتی قژداهێنانی کچەکەی فیرعەوندا شانەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە ، وتی: بسم الله. کچەکەی فیرعەون وتی: مەبەستت لە باوکمە؟! وتی: نەخێر پەروەردگاری من و باوکت -الله-یە، وتی: ئاخر بۆی دەگێڕمەوە. وتی: دەی بۆی بگێڕەوە. کچەکەش بۆ فیرعەونی گێڕایەوە. فیرعەون زۆر تورەبوو، بانگی کرد و گوتی: فلانە ئافرەت ئایا غەیری من خوایەکی ترت هەیە؟ وتی: بەڵێ پەروەردگاری من و تۆ -الله- یە، فیرعەون فەرمانی دا کە یەك مەنجەڵی گەورە پڕ بکەن لە مس و بیکوڵێنن، کە ئامادە بوو منداڵەکانی ئافرەتەکەی بانگ کرد بۆ ئەوەی دانە دانە بیانخاتە ناویەوە!!!، ئافرەتەکە فەرمووی: من تەنها یەك داواکاریم لە تۆ هەیە ئەی فیرعەون. فیرعەون وتی: چییە؟! فەرمووی: داواکاریەکەم ئەوەیە کە دوای مردنی خۆم و ئەو منداڵە جگەرگۆشانەم، ئێسك و پروسکی خۆم و منداڵەکانم بکەیتە ناو یەك بەرگ و بمانکەیتە ژێر خۆڵ بە یەکەوە!!فیرعەون وتی: باشە

داواکارییەکەت لەسەر من، پاشان دانە دانە منداڵەکانی لە پێش چاوی خۆی فڕێدایە ئەو مەنجەڵە گەورەیەی کە مسی تیابوو!!تا سەرە گەیشە خۆی و منداڵێکی بەرمەمکانی شیرەخۆرەی، لەو کاتەدا منداڵەکە دەمی بە مەمکی دایکییەوە بوو، سەیری دایکی کرد و پێکەنی، دایکی بەوپەڕی خۆشەویستییەوە بە خۆیەوە گوشی، ئەوەندە سۆز و بەزەیی جوڵا بۆ ئەو منداڵەی کە تەنها ئەوی مابوو، ئەوانی تری لەبەر چاوی خۆی خرابونە ناو ئەو مەنجەڵە مسە تواوەوە،لەو کاتەدا لە تاوی ئەو جگەرگۆشەی دودڵی رووی تێکرد ئایا خۆی فڕێ بدات یان نا، لەبەر خاتری منداڵەکەی، بەڵام لەو کاتەدا خوای گەورە منداڵەکەی هێنایە زمان و بە دایکی وت: دایەگیان خۆڕاگریە، تۆ لەسەر حەقیت، خۆت بخەرە ناوی سزای دونیا سوکترە لە سزای قیامەت،ئەمجا ئافرەتەکە خۆی و منداڵەکەی باوەشی فڕێدایە ناو مەنجەڵە مسە کوڵاوەکە و گۆشت و ئێسقانیان لە یەك جیا بۆوە و شەهید بوون لە پێناو بیر و باوەڕی پاکیاندا.. رواهُ احمد وقال محققه الأرناؤوط: إسناده حسَن.

سُبحان الله ئەوەندە بەڕێز بوون لای خوا کە لە ئیسراو میعراجدا پێغەمبەری خوا ﷺ بۆنی خۆشی ئەوانی کرد،ئەو لاشە سوتاوەیان بۆنی میسك و عەمبەری لێ دەهات .

نمونەی سێیەم: دەچینە خزمەت زەمانی پێغەمبەری خوا ﷺ سەرەتای هاتنی وەحی و بیروباوەڕو پەیامی ئازادی بەخشی ئیسلام. لێرەشدا هەر نمونە بە دوو ئافرەت دێنمەوە، تاوەکو بۆ ناحەزانی ئیسلام بسەلمێ کە ئیسلام نەك هەر زوڵمی لە ئافرەت نەکردووە، بەڵکو ئافرەتان ئەوەندە ژیانی راستەقینە و کامەرانی خۆیان لە ئیسلامدا بینیوەتەوە و تێگەیشتون تەنها و تەنها ئیسلامە ئافرەت لە ژێر دەستەیی رزگار دەکات کە ڕۆحی خۆیان بەخشیوە و ئامادەی قبوڵکردنی هەموو جۆرە ئەشکەنجە و

ئازارێك بوون لە پێناوی بیروباوەڕی پاكوخاوێنی ئیسلامدا كە ژیان دەبەخشێ بە مرۆڤ.

ئافرەتی یەكەم خاتوو (سومەیە)یە، كە خێزانی یاسر بوو، وە دایكی عەمارە، ئەم شێرە ژنە ئافرەتێكی بەساڵاچوو بوو، ئەم ئافرەتە لە پێناوی بیروباوەڕی ئیسلامەتیەكەیدا خرایە ژێر ئەشكەنجە و ئازارێكی زۆرەوە و هەردوو دەست و قاچی بە مێخ بەزەویەوە بەسرابۆوە و لەبەر گەرمای پروكێنەری عەرەبستاندا ڕاكێشرابوو، بەڵام ئەو هەموو ئەشكەنجەیە نەیتوانی لە ورەی پۆڵاین و ئیمانی بەرزی دابەزێنێ، بۆیە سەركردەی كوفر و نەفامی (ئەبو جەهل) چوو بۆ لای وتی:ها .. سومەیە، ئێستا هەر سوری لەسەر بڕواهێنانت بە محمد و قورئان؟!، بەبێ ترس و لەرز فەرمووی: بەڵێ أشهدُ أن لا إلهَ إلا الله و أشهَدُ أن محمداً رسول الله. ئەبو جەهل چاوی تاریكی تاریكتر بوو، ئەو مێشكەی بە شیرك و كوفر گوشرابوو، قبوڵی نەبوو كەسانی تریش بیر و باوەڕی خۆیان ئازاد بێت،بۆیە رمێكی كرد بە سنگی سومەیەداو لە پشتی دەرچوو شەهید بوو. بوو بە یەكەم شەهیدی ئیسلام و ئازادی بیروباوەڕی ڕاست.

ئافرەتی دووەم: ئافرەتێكی بێ كەسی جاریە بوو، ناوی (زەنیرە) بوو، ئەم ئافرەتە هەموو ژیانی پڕ بوو لە ستەم لێكران و چەوسانەوە و وەك مرۆڤ حسابی بۆ نەدەكرا، بۆیە كاتێ نوری محمد المصطفی ﷺ ئاشكرا بوو، ئەم ئافرەتە زوڵم لێكراوە تێگەیشت كە تەنها ئەم پەیامەیە كە بتوانێ هەموو ئەو كەسانەی وەكو ئەون ڕزگار بكات و نرخی مرۆڤانەیان پێ ببەخشێتەوە، بۆیە هەر زوو خۆی گەیاندە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و موسڵمان بوو، كاتێ سەرانی كوفری مەككە زانیان -زەنیرە- موسڵمان بوو، خستیانە ژێر ئەشكەنجە و ئازارەوەو

ئەوەندەیان بەسەری کێشا هەتاوەکو کوێر بوو، بەڵام ئەم ئافرەتە بەلاشە لاوازە بێکەسە، بەڵام ئیمان و عەقیدە بەهێزە، بە پشت بەستن بە کەسی بێکەسان، خوای گەورە و بە دەسەڵات بەسەر هەموو دەسەڵاتدارانەوە، مەردانە خۆی راگرت و بۆ ساتێکیش پاشگەز نەبوەوە لە ئیمانەکەی، جا کاتێك هەردوو چاوی کوێر بوو، بێباوەڕەکان چونە لای و گاڵتەیان پێکرد و پێیان وت: لات و عوزرا چاوی کوێر کردوە چونکە باوەڕی پێیان نەبووە، زەنیرەش فەرمووی:نەخێر سوێند بە خوای بێشەریك لات و عوزا ناتوانن نە سود نە زیان بە کەس بگەیەنن، هەموو شتێك بە دەستی خوای گەورەیە ئەوەبوو لە ئەنجامی ئەم تەوەکول و پشت بە خوا بەستنەیدا، خوای گەورە شیفایدا و هەردوو چاوە پیرۆزەکانی روناکیان بۆ گەڕایەوە و چاك بووەوە..

وە ئیمامی أبوبکریش چووە لای ئەو کەسەی کە زەنیرە کۆیلەی ئەو بوو، بە پارەیەکی زۆر لێی کڕی و ئازادی کرد بۆ ئەوەی بە ئازادی خوای خۆی بپەرستێت..

کەواتە ئەوەی بڕوای بە ئازادی بیر و باوەڕ نییەکوفر و کافرانن کە بە درێژایی مێژوو ئەشکەنجە و ئازاری ئەهلی ئیمان و ئیسلام دەدەن، تەنها تاوانی ئیماندارانیش بیر وباوەڕەکەیانە وەکو قورئان دەفەرموێ:

﴿وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ البروج: ٨.

واتە:ئەم هەموو رق و داخەی کافران لە ئیمانداران تەنها لەبەر ئەوە بوو کە ئەوان باوەڕی بە تینیان دەهێنا بە خوای باڵادەستی شایستەی سوپاسگوزاری.

ئیمانداران: لەوانەیە کەسانێك پێیان وابێت کە ئەمە لە کۆندا بووە و ئێستا ئەهلی کوفر ئاوا دژی بیروباوەڕنین و لە جیهانی نوێدا هەموو کەسێك ئازادە لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕ و ئاینی خۆیدا، بەڵام با تەماشاکردنمان بۆ لاپەڕەکانی مێژووی تازەی جیهان وەڵامی ئەو پرسیارەمان بداتەوە، ئایا کوفر بەردەوام بووە لە دژایەتی ئەهلی ئیمان و بیروباوەڕەکەی وەکو زەمانی فیرعەون و ئەبوجەهل و جاهیلەکان، یان گۆڕانی بەسەردا هاتوە؟! بفەرموون با چەند نمونەیەك لە چەند لاپەڕەیەکی مێژوو وەربگرین..

نمونەی یەکەم: تەماشای کتێبی –محاکم التفتیش– کە دانراوی: د. زکي علي یە لە لاپەڕە (٥٠٠)دا وە کتێبی (الشباب المسلم في مواجهة التحدیات) کە دانراوی: د. عبدالله ناصح علوان لاپەڕە (١٣٢)بکەن، کە باسی ئەوە دەکەن کە: شتێکی ئاشکرا و روونە کە موسڵمانان چەند سەدەیەك لە ئەندەلوس (ئیسپانیا) حاکم بوون کە بە دانپێدانانی مێژوونوسە رۆژئاواییەکان یەکێك لە هۆیەکانی بگرە کاریگەرترین هۆکاری سەرهەڵدانی ئەوەی کە ناوی لێنراوە (النَهْضَة العِلْمِیَّة) راپەڕینی زانستی (رێنیسانس) لە ئەوروپا گەیشتنی ئەو کلتور و رۆشنبیری و زانستەی شارستانێتی ئیسلامی بوو، کە ئەوروپاییەکانی ئەندەلوس کاتی خۆی (ئیسپانیا)ی ئێستا وەریان گرت،بەڵێ پاش بەهرەمەند بوونی ئەوروپاییەکان لە کلتور و زانست و بەها بەرزەکان و پێشکەوتنی موسڵمانان بێدار بوونەوە و هەنگاویان بەرەو چاخ و قۆناغی رێنیسانس نا، کەچی دوای ئەوەی موسڵمانان گلۆڵەیان کەوتە لێژی و دەسەڵاتیان نەما، لە لایەن نەصرانیەکانەوە لە ئەندەلوس چییان پێ کرا؟!! دادگاکانی پشکنینی بیروباوەڕ (المحاکم التفتیش عن العقائد) کە مێژوو نوسەکانی رۆژئاوا دەڵێن:ئەو دادگا بەدناوە کە بە ڕاستی هەر ناوەکەی بەد

و ناشرینە چونکە دەهات دادگایی مرۆڤی دەکرد لەسەر بیروباوەڕەکەی، بەڵام نەك هەر بیروباوەڕی دژ بە نەصرانیەت دادگایی بکات، بەڵکو هات دادگایی ئەو هەموو نەصرانیەی کە سەر بە هەردوو کۆمەڵەی (پرۆستانت) و (ئەرثدۆکس) بوون و نەیاری دەسەڵاتی کلێسا بوون، لە سەدەی سیانزە وە تا سەدەی حەڤدەی زاینی نزیکی (٩) ملیۆن کەسی کوشت!!ئەمانەش هاودینیان بوون، بەڵام چونکە لە مەزهەب و ڕێبازدا جیاواز بوون و نەیاری کلێسا بوون ئاوا لەناویان بردن! ئەمە بێجگە لەو هەموو ملیۆن موسڵمانەی کە لە ئەندەلوس هەبوون، سەرەنجام هیچیان نەمان، چونکە یان دەبوو بە زۆر ببن بە نەصرانی، کە مێژوو نوسان دەڵێن: بەزۆر گۆشتی بەرازیان دەرخوارد دەدان و بە زۆر خاچ –صلیب–یان لە مل دەکردن یان دەریان دەکردن، باشترین حاڵەتیان ئەوەبوو کە دەریان بکردنایە لەو وڵاتە، ئەوە نمونەیەکە لە مێژووی نوێدا کە رەفتاری گاورەکان هەم لەگەڵ هاودینەکانی خۆیاندا بەڵام جیاواز لە بۆچوندا، هەم لەگەڵ موسڵمانانندا...

بەڵام تەماشاکە لە مێژووی ئیسلامدا، ئازادی بیروباوەڕ لە ئازادیە بنەڕەتییەکان دەژمێردرێن کە ئیسلام بانگەشەی بۆ دەکات و داوای جێبەجێکردنی دەکات و هەموو گرنتیەکیشی بۆ پاراستنی پێشکەش کردووە،ئەوەتا رایدەگەیەنێت کە زۆرکردن لە قبوڵکردنی دیندا نییە (لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ) بەڵێ ئیسلام بە هەمو شێوەیەك ئەوەش رەت دەکاتەوە کە مرۆڤ ناچار بکات بەوەی باوەڕ بە ئاینێك یان مەزهەبێك بهێنێت کە بڕوای پێی نییە، رێگە دەدات رۆڵەکانی ئاینەکانی تر لە ناو موسوڵمانانندا بە ئازادیەکی تەواوەوە مومارەسەی دروشمە ئاینیەکانی خۆیان بکەن، ئازادی عەقیدە بریتیە لە دوانەی ئازادی فیکر و ئازادی ڕادەربڕین، مێژوو شاهیدە کە ئەو هەموو شوێن پەرستگایەی ئەهلی کیتاب و غەیری ئەهلی کیتابیش لە ژێر سایەی دەسەڵاتی ئیسلامیدا دەستی بۆ نەبراوە و هەموو کەسێك ئازادانە مومارەسەی

ئاینی خۆی کردوە و کەس مەنعی نەکردوە، تەنانەت لە چەند سەردەمی دەسەڵاتی فراوانی موسڵمانانندا کە خەڵکانێکی زۆر لە گاور و جولەکە موسڵمان دەبوون،دادگایان بۆ دانرا، بەڵام نەك وەکو (محاكم التفتيش)کەی گاورەکان، بەڵکو دادگایان بۆ دانرا تا چوار کەس شاهید بن کە ئەم گاورە یان جولەکە بە ئارەزوی خۆی موسڵمان بووە کەس زۆری لێ نەکردووە!!...

هەروەهافیقهی ئیسلامیش دەرکی بە جیاوازی فیکری نێوان ڕۆڵەکانی یەك ئاینیش کردووە و مومارەسەی کردوە و ڕێزیشی گرتووە، لەبەر ئەوەشە مەزهەبەکانیش زۆر بوون و بۆچونەکان جۆراوجۆر بوون و سەردەمانێکی دوور و درێژیش هەر کەسە و لەگەڵ ئەوی تردا بە لێبوردەیی و ئاشتیانە پێکەوە ژیاون، لەبەر ئەوە جێگەی داخ و سەرسوڕمانە کە سەردەمێك بۆ موسڵمانان بێتە پێشەوەوە تیایدا بە جیاوازی ڕای نێوان، سنگیان بەرامبەر بە یەکتر تەنگ ببێتەوە، بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ دەیبینین.

ئیمانداران: ئازادی گوزارشتکردنی سیاسی لە بۆچونی ئیسلامەوە بە یەکێك لە مافە سەرەکییەکانی مرۆڤ دەژمێردرێت کە خوای گەورە بۆ مرۆڤی دیاری کردووە، لەبەر ئەوە قورئانی پیرۆز ڕەخنەی توند ئاراستەی سیستەمی سیاسی فیرعەون دەکات، کاتێك کە تەنها یەك کەس تیایدا سور دەبێت لەسەر ڕای خۆی و بڕواشی وایە ئەوەی ئەو دەیبینێت هەر ئەوە حەقیقەتێکی ڕەهایە و هەر بە تەنهاش ئەو دەزانێت کە بەرژەوەندی خەڵکە ڕەشۆکەکە لە کوێدایە و جگە لە خۆیشی هیچ راو ئامۆژگاریەکی پێ قبوڵ نییە کە بە پێچەوانەی حەز و خۆشیەکانی خۆیەوە بێت، بۆیە ئیسلام وەك ئەلتەرناتیڤێکی فیرعەونی و سەرکوتکاری بیروڕا، سیستەمی شورای بۆ دەسەڵات پێشنیار کرد، قورئانی پیرۆزیش زیاتر لە جێگەیەکدا پێویستی شورای خستۆتە روو، سیرەتی پێغەمبەرﷺ باسی ئەوە دەکەن کە چۆن پێغەمبەری خوا کە لە هەموو کەس سیاسەتمەدارتر بووە و فەرماندەی

سەربازیبووە، چۆن راوێژی بە هاوەڵان کردوە و هەموو کەس بە ئازادی بیروڕای خۆی دەربڕیوە ورەئیەکەشی وەرگیراوە وجێبەجێ کراوە.

سوورەتی –المُجادلَة– باسی ئافرەتێك دەکات کە بۆ داکۆکیکردن لە ژیانی خۆی و پاراستنی هێلانە و بەچکەکانی موجادەلە لەگەڵ پێغەمبەر دەکات، پێغەمبەری خواش ﷺ بە لایەوە گران نەبوو،ئافرەتەکە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ رای جیاواز بوو لە مەسەلەکەدا و بەردەوام موجادەلەی لەگەڵ دەکات تا ئەوکاتە قورئان دێتە خوارە و ورای ژنەکە پەسەند دەکات!!

خەلیفەکانی پێغەمبەریش ﷺ بە هەموو سنگ فراوانییەکەوە روبەرووی گوفتوگۆ و موناقەشە کردن لەگەڵ تاکەکانی گەل و میللەتدا بوونەوە، بۆ نمونە: سەعدی کوڕی عوبادە،خەلیفایەتی کردنی حەزرەتی ئەبوبکری صدیقی رەت کردەوە و پێی رازی نەبوو، تەنانەت پاش هەڵبژاردی ئەبوبکریش بە خەلیفە لە رێگەی هەڵبژاردن و شوراوە، (سەعد) مەدینەی بەجێهێشت، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کەسێك بە کوفر و خیانەتکار تۆمەتباری نەکرد و خەلیفەش لەسەر ئەو نەیاربونەی هیچ سزایەکی نەدا، وە لە هیچ مافێکی رەوای خۆی وەکو هاوڵاتییەك بێبەشی نەکرد.

بەڵێ ئیمانداران:زیاد لەوەش ئەندامانی کۆمەڵگەی قورئانی بە هەموو ئازادییەکەوە گوزارشتیان لە رای خۆیان دەکرد، تەنانەت لە رووی خەلیفەی موسڵمانانیشدا، ئەوەتا هەندێك لە هاوەڵە گەورەکان ناکۆك بوون لەگەڵ عومەری کوڕی خطاب دا لە مەسەلەی دابەشکردنی زەوی لەو وڵاتانەدا کە ئیسلام رزگاری دەکردن، بۆیە عومەر هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێت داوای بەستنی ئەنجومەنێکی راپرسی (شورا)ی کرد لەو کەسانەی شارەزان و خاوەن ران لە ناو دەوڵەتی ئیسلامدا، ئەوە بوو بەهۆی ئازادییەکەوە لە لایەن هەردوو لاوە گفتوگۆیەکی تێروتەسەل لە بارەی مەسەلەکەوە کرا تا ئەوەی ئەنجومەنەکە گەیشتە بڕیارێك!!جگە لەوەش زۆرێك بەسەرهات و گێڕانەوە و

روداو سەبارەت بە ئەندامانی بێ پلە و پایەی ناو کۆمەڵگای موسڵمانان ناوبانگیان دەرکرد و بە ئاوی ئاڵتوون لە دو توێی کتێبەکاندا نوسرانەوە، چونکە پێشتر شتی وا مەحاڵ بووەو ڕوی نەداوە، ئەوەش ئەو بەسەرهاتانەن کە هاوڵاتی سادە بە ئاشکرا ڕەخنە ئاراستەی خەلیفە دەکەن، ئەوەتا یەکێك پرسیار لە عومەری کوڕی خطاب دەکات لە سەرچاوەی ئەو کراسە درێژەی کە لەبەری کردووە،یان دەبێت پێمان بڵێیت لە کوێت بوو،یان کەس ئامادە نییە گوێ بۆ وتارەکەت بگرێ!!

یاخود ژنێك کە تا ئێستاش نازانرێ ناوی چییە، چونکە نەناسراوە و خزمی لێپرسراوان نییە، کچی دەوڵەمەندێك نییە، بەڵکوو ئافرەتێکی سادەیە،بەڵام شارەزای قورئانە، کاتێك خەلیفە عومەری کوڕی خطاب لەسەر مینبەر بڕیاردەدات کە نابێ مارەیی ئافرەت لەوەندە زیاتر بێت ئەم ئافرەتە ئەم فتوا هەڵەیەی بۆ ڕاست دەکاتەوە لە کاتێکدا کە خەلیفە هێشتا لەسەر مینبەرە، حەزرەتی عومەریش هیچ دڵ گرانییەکی لێ ڕونادا و عاجز نابێ و نافەرموێ ئادەی بێدەنگی بکەن،نەخێر، بەڵکو سوپاسی دەکات و دوعای خێری بۆ دەکات و هیچ گرانییەك لەوە نابینێت کە دان بە هەڵەکەی خۆیدا بنێت و ڕاستی ڕەخنەی ژنەکەش بسەلمێنێت.

جا ئیمانداری بەڕێز، گەنج و لاوی خوێنگەرم، ئەوەش ئیسلامەکەی خۆمانە و ئەوەش دەسەڵاتی کوفر بوو کە باسمان کرد کە چۆن سەرکوتی هەر بیروباوەڕێکی کرد کە دژی خۆی بێ، دەفەرموو خۆت بڕیار بدە و بیکە بە وەڵامی ئەو کەسانەی کە وا نیشانی خەڵك دەدەن کە ئیسلام دیکتاتۆریە و دژی ئازادی بیروڕایە، دژی هەموو عەقیدەیەکی غەیری ئیسلامە، دەوەرە لە دینەکەت شارەزابە و شانازی بەو ئیسلامەوە بکە کە تەنها و تەنها ئازادی عەقیدە و بیروڕا لەو دایە و بەکردەوەش سەلماندویەتی..

بەڕێزان: دەچینە سەر نمونەی دووەم لە مێژوی نوێدا، هێرشی تەتەر و مەغۆلەکان بۆ سەر وڵاتی موسڵمانان،کە هەرکەسێك دەیەوێت زانیاری هەبێت دەربارەی دڕندەیی تەتەر و مەغۆلەکان بەرامبەر موسڵمانان با تەماشای کتێبەکانی: (البداية و النهاية)ی زانای ناودار (إبن كثير) ج١٣ ص٢٥٩ تا ص٢٦٤ بکات، وە تەماشای (الكامل في التأريخ) دانراوی زانای پایەبەرز (إبن الأثير) بکات ج١٢ ص٣٥٨ تا ص٣٩٩. کە لەوێدا باسی دەکات کە کاتێ هێرشیان کردە سەر وڵاتی موسڵمانان چەند دڵرەقانە رەفتاریان کردووە، یەکێك لە رەفتارەکانیان ئەوەبوو، کە قەڵای (کەللەسەر)یان دروست کرد لە کەللەسەری موسڵمانە سەربڕاوەکان، مێژونوسان دەڵێن: جاری وا هەبوە یەکێك لە فەرماندەکانی مەغۆل فەرزی دەکرد لەسەر فەرماندەیەکی ژێر دەستی و دەیوت: دەبێ بڕۆیت بۆ ئەو شارە و دەبێ لەوێ ئەوەندە کەللەسەرم بۆ بهێنیت، ئەگەر بە کەللەسەری پیاوان بۆت تەواو نەکرا ئەوا سەری ئافرەتان ببڕە، ئەگەر بە کەللەسەری ئافرەتانیش ژمارەی داواکراو تەواو نەبوو سەری منداڵم بۆ ببڕە، بۆ وێنە: جاری وا هەبوو دەیوت دەبێ بیست هەزار (٢٠٠٠٠)کەللە سەرم بۆ بێنی لەسەری موسڵمانان!!

وە مێژونوسانی وەکو (الطبري و إبن كثير و إبن الأثير) دەڵێن: ئەو قەتڵ وعامەی کە لە شاری بەغدا کرا کە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی بوو لە ساڵی (٦٥٦)ی کۆچی داو لەسەر دەستی (هۆلاکۆ) و سوپا دەڕندە کافرەکەی بە یەك ملیۆن کەس مەزەندە دەکرێت، بەڵکو بە ریوایەتێك دەڵێن: بە دوو ملیۆن کەس موسڵمان مەزەندە دەکرێن، ئاشکرایە کە ملیۆنێك یان دوو ملیۆنی (٧٠٠-٨٠٠) ساڵ لەمەوبەر کە دونیا ئەوەندە مرۆڤی لەسەر نەژیاوە زۆر زۆر بووە.

بەڵێ ئەمە هەمووی بەڵگەیە کە کوفر غەیری خۆی قبوڵ ناکات و لە پێناوی چەسپاندنی بیروباوەڕی خۆیدا و سڕینەوەی عەقیدە و بیروباوەڕی بەرامبەرەکەی، لە هیچ کوشتوبڕێك و کاولکردنێك دریغی ناکات، بەڵام ئەوانەی رەخنە لە فتوحاتی ئیسلامی دەگرن و باسی ئەوە دەکەن کە ئیسلام بە زەبری شمشێر بڵاو بۆتەوە با بێن پێمان بسەلمێنن لە تەواوی فتوحاتی ئیسلامیدا شارێك وێران کرابێت، گوندێك کاول کرابێ، کەللەسەر لەسەر یەك دانرابێت،لە هەموو مێژووی ئیسلامدا یەکجار لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ ئافرەتێك بە شمشێری موسڵمانەکان کوژرا، لە هەردوو صەحیحی بوخاری و موسلم دا تۆمارکراوە کە هەتا قیامەت موسڵمان و کافر دەیخوێنێتەوە و بوو بە یاسایەك لە یاساکان کە نەهی کرد و قەدەغەی کرد کە ژن و منالی کافران بکوژرێن، ئەفەرموێ: (وجدت إمرأة مقتولة في بَعضِ مَغازي رسول الله ﷺ فَنَهى رسول الله ﷺ عَن قَتلِ النساءِ و الصِّبيان)..

نمونەی سێیەم لە مێژوی نزیکمان باس دەکەین کە بریتیە لەو هەمو کوشتن و لەناوبردنە بە کۆمەڵەی کە لە لایەن هەردوو شۆرش و رژێمی کۆمۆنیستی روسیا بە رابەرایەتی (لینین و ستالین) و چین بە ڕابەرایەتی (ماوتسی تۆنگ)ەوە لە موسڵمانانی ئەو وڵاتانە کرا، بە بێ هیچ بنەما و پاساوێ جگە لەوەی کە ئامادە نەبوون ببنە شیوعی و لە ئاینەکەیان کە ئیسلامە هەڵبگەڕێنەوە، وە لە کتێبەکانی مێژودا هاتووە کە لە ژێر سایەی سیستەمی مارکسیزم -کۆمۆنیزم-داو لە سەرجەم ویلایەتە موسڵمان نشینەکانی یەکێتی سۆڤێتی پێشودا زیاتر لە ١٥ ملیۆن موسڵمان قەڵاچۆکراون و بە ناحەق شەهید کران.

لەو بارەیەوە مێژوو دیمەنی زۆر سەرسوڕهێنەری لە دڕندایەتی کۆمۆنیست و مارکسیەت و ماویستەکانی هەڵگری دروشمی سۆسیالیزمی زانستی –الأشتراكية العلمية– گێڕاوەتەوە، بۆ وێنە:

دەڵێ جاری وا هەبوە جەندرمەکانی ئەو ڕژێمانە خەڵکی شار و گوندەکانی ویلایەتە ئیسلامیە زەوتکراوەکانیان کۆ دەکردنەوە و داوایان لێ دەکردن کە دەست لە دینەکەیان هەڵگرن، جا ئەگەر ملیان نەدابێ مامۆستایەکەیان کوشتووە پاشان لەسەر خەڵکەکەیان فەرز کردوە کە دەبێ هەموویان پیسایی خۆیان بێنن و بەسەر مامۆستاکەیانیدا بکەن، ئەگەر بیانەوێ نەکوژرێن.

دیارە لە (چین)یش هەر بە هەمان پێودانگ ڕەفتار و مامەڵە لەگەڵ موسڵماناندا کراوە لە لایەن ئەو ڕژێمە پێشکەوتوخوازانەوە کە لاف ماف مرۆڤ و چارەنوسی گەلان و پشتگیری چینی پرۆلیتاریایان لێدەدا.

هەر لە مێژووی نزیکدا کوشتوبڕی هیندۆسەکان و سیخەکان بۆ موسڵمانان لە کاتی جیابونەوەی پاکستان لە هیندستاندا و ئێستاشی لەگەڵ دابێ هەر بەردەوامە.

ئیمانداران: ئێستا تێگەیشتین کە بەڕاستی ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی ڕادەربڕین لە غەیری ئیسلامدا بە کردەوە جێبەجێ نەکراوە و پێچەوانەکەی ڕاستە و تەنها باسکردنی قسە یان نوسینی سەر کاغەز بووە، بەڵام ئیسلام چی وەکو بنەما و فیکر چی وەکو عەمەل لە جێبەجێکردن لە کاتی دەسەڵاتدا ئەوەی سەلماندووە کە هەموو مرۆڤێك ئازادە لە هەڵبژاردنی هەر دین و عەقیدەیەك،وە ئازادە لە دەڕ بڕینی ئەوەی لە ناخیدایە بە بێ هیچ سانسۆر و چاودێرییەك لە سەری.

کۆتایی بە وتارەکەشم دێنم بەوەی کە دەڵێم: لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا لە هەر جێگایەك کە موسڵمانان لەگەڵ دینەکانی تر بەیەکەوە

ژیابن، ئەوا جیاوازی هاودین بون نەبۆتە هۆی بەرگرتن لە بەیەکەوە ژیانی ئاشتیانە و هاوژین بوون. ئەوەتا لە قورئاندا هاتووە کە موسڵمانان بۆیان هەیە لەگەڵ ئافرەتی بەڕەوشت و داوێن پاکی گاور و جولەکە ژیانی هاوسەری پێکبهێنن، وەلەکاتێکدا دراوسێ وهاوماڵن بۆیان هەیە خواردنی دەستی ئەو گاور و جولەکانە و سەربڕاوی دەستیان بخۆن و خواردنیان پێشکەش بکەن، هەروەها هەرکاتێك ئەهلی کتاب کە لە ناو موسڵماناندا دەژین توشی گرفتێك یان گرتنێك بون، دەبێ موسڵمانان وەك خۆیان لەسەریان بەوەلام بێن و داکۆکیان لێبکەن، وە ئەمەش بە کردەوە سەلماوە بۆ نمونە: زانای بەناوبانگ –شیخ الاسلام– إبن تیمیة، کاتێ دەچێ بۆ لای (قازان) یان (غازان) کە یەکێك بووە لە دەسەڵاتدارانی مەغۆلەکان بۆ ئەوەی کە دیلە موسڵمانەکان ئازاد بکات، پاش گفتوگۆیەکی بوێرانە (قازان پێی دەڵێت: من تا ئێستا هیچ مەلا و زانایەکی وەکو تۆم نەدیوە ئەوەندە سام و رێز و هەیبەتی لە دڵمدا هەبێت، بۆیە تۆ هەر تەکلیفێك بکەی من رەتی ناکەمەوە ئەوە هەموو دیلە موسڵمانەکان بە تۆ دەبەخشم، (إبنُ تیمیة)ش دەفەرموێ نەخێر دەبێ دیلەکانی ئەهلی کتابیشمان (گاور و جولەکە) پێ ببەخشی چونکە ئەوانیش وەك ئێمەن، واتە: مادام هاوڵاتی ئێمەن و مادام هاو ژینی ئێمەن با هاودینیشمان نەبن، هەتا ئەوانیش لەگەڵ خۆم نەبەمەوە ناڕۆم!! ئیتر (غازان) بە ناچاری هەموو ئەوانەی ئەهلی کتابن واتە: جولەکە و نەصرانین و گرتونی ئەوانیشی بۆ ئازاد دەکات!..

وە نمونەیەکی ترتان بۆ باسدەکەم لە هاوژین بوونی موسڵمانانی لەخواترس و دیندار و زانا لەگەڵ ئەهلی کتابدا، ئەوەتا پیاوچاك و زانا و دانا جەنابی کاك ئەحمەدی شێخ، یەکێك لە کوڕەکانی دەیەوێت ژیانی هاوسەری لەگەڵ ئافرەتێکی مەسیحی شاری سلێمانی پێك بهێنێ، جا کاتێك جەنابی کاك ئەحمەدی شێخ بەمە دەزانێت نەك هەر ڕێگری لە کوڕەکەی ناکات بەڵکو

پشتیوانیشی لیٚ دەکات و خوازبێنی بۆ دەکات و ماڵی بۆ دروست دەکات، وە کاتێ کەمناڵیان دەبیٚ و داوا لە جەنابی کاك ئەحمەدی شێخ دەکەن کە بۆیان ناوبنیٚ، کاك ئەحمەدی شێخ لەبەر خاتری دڵی دایکی مناڵەکە کە گاورە و لەسەر دینی حەزرەتی عیسایە، مناڵەکە ناودەنیٚ (عیسی).!!!

جا کەواتە: با شانازی بە دینەکەمانەوە بکەین کە ئەوەندە شارستانی و مەدەنیە و هەڵگری هەموو مافەکانی مرۆڤە، نەك هەر موسڵمان بەڵکو هەموو خاوەن بیر و باوەڕ و ڕاوبۆچوونێك دەتوانیٚ لە سایە و سێبەریدا ئازادانە و ئازایانە ژیان بەسەر بەرێت وە داواکارم لە خوای گەورە کە لەو ئیسلامە پیرۆزە زیاتر شارەزامان بکات.

وە خوای گەورە بە عیزەت و سەربڵندیەوە بمانژێنیٚ و بەسەربەرزی و روسورییەوە بچینەوە دیوانی خواو بەر شەفاعەتی خاتەمی پێغەمبەران-حەزرەتی محمدی ئەمینﷺ بکەوین، بە دەستی موبارەکی خۆی لە ئاوی حەوزی کەوثەر تێرمان بکات و خوای گەورە عاقیبەتی هەموو لایەکمان بە خێر بگێڕیٚ، اللّهمَّ آمین


سەرچاوەکان :

١. قورئانی پیرۆز.

٢. تەفسیری ئاسان -بورهان محمد امین.

٣. چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم -م. علی باپیر-چاپی یەکەم ل٤١، ٥٦، ٢٣، ٤٠.

٤. ئازادی رادەربڕین لە رۆژئاوا- نوسینی: د. شریف عبد العظیم، وەرگێڕانی: وەرزێر حەمە سەلیم. بەرهەمی پرۆژەی تیشك -ژمارە ٧ ل٥٦.

٥. ژیانی پێغەمبەری خوا لە قورئان و فەرمودەکاندا -م. محمد ملا فائق، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم ل١١٠ ، ل٢٢٩.

# وتاری چوارەم بۆ مانگی (الربیع الثانی)

## ((دزی))

الحَمدُ للّٰهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعِينَ.

ئیمانداران: ماڵ و سامان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا گرنگی تایبەتی خۆی هەیە و گەڕان بە شوێن رزق وڕۆزی حەلاڵدا و پەیداکردنی پارە و سامان لە قورئاندا لەگەڵ نوێژ و وتاری هەینیدا، کە یەکێکە لە فەرزە هەرە گەورەکانی ئیسلام و مرۆڤ بە وازهێنانی سێ جومعە و بە بێ بەهانەیەکی رەوا لە شەرعدا مۆری نیفاق و دوڕوویی لە دڵی دەدرێ، دەی نوێژی هەینی بەم گەورەییە کە یەك سورەتی قورئان بە ناویەوە ناونراوە -سورة الجُمعة- ئەم عیبادەتە لەگەڵ گەڕان بەدوای بژێوی ژیان و پارەی حەلاڵدا لە یەك ئایەتدا باس کراوە وەکو دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۞ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَٱبْتَغُواْ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ الجمعة:٩-١٠.

وە لە فەرمودەی پێیغەمبەرداﷺ هاتووە کە فەرمویەتی: (نعِمَ المالُ الصالِح لِلرّجُلِ الصالِح) رواه احمد.

وە ئەگەر ژیاننامەی پێغەمبەری خواﷺ بخوێنینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە: پێغەمبەری خواﷺ زۆر سودی بینی لە سامانەکەی خاتوو خەدیجەی هاوسەری، وە سودمەند بوو لە سامانی ئەبوبکر و عومەر و عثمان و عبدالرحمانی کوڕی عەوف بۆ خزمەتی بانگەوازی ئیسلام.

بەڵام گرنگە کە: پارە لەناو دڵماندا نەبێت و نەبێتە مەعبود و پەرستراو بەڵام پێویستە سامان لە ناو گیرفان و دەستمان بێت و دووربین لە هەژاری و نەداری و کزۆڵی.

جا ئیماندارانی بەڕێز: کاتێ ماڵ و سامانی حەڵاڵ ئاوا پیرۆز و ڕێزلێگیراو بێت، پێویستە ئەو ماڵ و سامانە پارێزگاری لێ بکرێت، کە ئیسلام چەند یاسایەکی گرنگی داناوە و فەرموویەتی کە:

١- نابێ ماڵی هەتیو بخورێ و زوڵم لەو منداڵە نازدارە بکرێ و سامانەکەی کە لە باوکیەوە بۆیماوەتەوە لە لایەن کەسێك یان کەسانێکەوە دەستی بەسەردا بگیرێ و بفەوتێنرێ.

٢- نابێ خیانەت و غەش لە کێشانە و پێوانەدا بکرێ (وَيلُ للمُطَففين).

٣- نابێ زیادەڕەوی لە بەکارهێنان لە شوێنی ناپێویستدا کە بە تەعبیری قورئانی (ئیسراف و تەبذیر) بە ماڵ بکرێ.

٤- نابێ ماڵ و پارە بدرێتە دەست کەسێك کە ناتوانێ پارێزگاری لە ماڵ و سامانەکەی بکات و بە تەعبیری قورئانی سەفیهە، چونکە ئەو ماڵ و سامانە تەنها هی خۆی نییە، بەڵکو هی هەموو کۆمەڵگایە و بە دەستی ئەوەوەیە، بۆیە نابێ بەفیڕۆ بدرێ، وەکو دەفەرموێ: ﴿وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَعْرُوفًا﴾ النساء: ٥

واتە: ماڵ و سامانتان مەدەن بە کەم عەقڵ و پیاوخراپان (کە ئێوە بەرپرسن لە ماڵیان) لە کاتێکدا خوای گەورە ئەو ماڵ و سامانەی کردووە بەهۆی ژیان و پایەداری و هەستانەوەتان، بەڵکو تەنها ئەوەندەیان بەش بدەن

کە بیکەن بە خۆراك و پۆشاکی خۆیان، بەڵام ئاگادار بن بە جوانی قسەی راست و دروستیان بۆبکەن و تەرەیان مەکەن..

الله اکبر لە گەورەیی ئەم قورئانە چۆن لە یەك ئایەتدا چەند مافێك دیاری دەکات، ماف سەروەت و سامان کە نابێ بەفیڕۆ بدرێ بەهۆی ئەوەی کە بدرێتە کەسانی نەزان، کە کەم عەقڵە و نازانێ لەچیدا سەرف دەکات، وەماف کەم عەقڵ و نەزان دیاری دەکات لە کۆمەڵگادا کە دەبێ دوو ماف رەچاو بکرێ، یەکەم: نابێ رێگەی پێ بدرێ بە ئارەزوی نەفامانەی خۆی سامانەکەی بەفیڕۆ بدات و دواتر موحتاج بێت بۆ دینارێك!

دووەم:ئەو کەم عەقڵە مرۆڤایەتی بونی لەکەدار بکرێ، نابێ پێی بڵێی ئەی بێعەقڵی نەفام، بێنە پارەکەت بدە دەستی ئێمە چونکە تۆ نەزان و نەفام و بێعەقڵیت، نەخێر، بەڵکو: وقُولوا لَهم قَولاً معروفا، بە جوانترین شێوە و نەرمترین قسەو گوفتار قسەی بۆ دەکرێ و قەناعەتی پێ دەکرێ کە ئەمە لە بەرژەوەندی ئەوە کە ئەوماڵەی لەدەست وەردەگیرێ و بۆیبەکاردەهێنێت و تەنها بەشی خۆراك و پۆشاکی رۆژانەی دەدرێتە دەستی خۆی تاوەکو بە ئارەزوی خۆی خواردن بکڕێ و پۆشاك بە حەزی دڵی خۆی بپۆشێ!!..

بەڵێ ئیمانداران: یەکێ لەو شتانەی کە خوای گەورە دایناوە بۆ پاراستنی ماڵ و سامان و پارە، بڕیاری شەرعە بۆ دز کە بڕینی دەستی ناپاکی دزە، جا لەم وتارەدا بە پشتیوانی خوای گەورە باسی تاوانی دزی و حوکمەکانی دزی و سزای دز دەکەین إنشاء الله.

بەڕێزان: دزی لە تاوانە گەورەکانە، بەڵکو لە پیسترین تاوانەکانە، چونکە پێشێلکردنی حەقی خوایە بە شکاندنی فەرمانەکەی کە ئەمری کردووە بە دەست پاکی و دزی نەکردن، وە هەروەها پێشێل کردنی ماف

خەڵکی خواشە، کە دەست درێژکرنە سەر ماڵ و سامانیانە لە ناو ماڵ و شوێنی پاراستنی سەروەت و سامانیاندا، وە دز زۆر لەم تاوانبارانەی تر پیسترە کە لە شەرعدا دەفەرموێ: (لا يَقطَعُ الخائِن ولا المُنتَهِبُ ولا المُختلس)، واتە: دەستی ئەم تاوانبارانە نابڕدرێ، الخائن: ئەو کەسەی بە ناوی دۆستایەتییەوە دەستت دەبڕێ و ماڵت دەخوات، المنتهب: ئەو کەسەیە کە بە ئاشکرا پارە لە خەڵك دەستێنێ، المختلس:ئەو کەسەیە کە ماڵ و سامانی خەڵك دەفڕێنێ و رادەکات و پارە دەبات،

ئەم تاوانبارانە کە ماڵی موسڵمان پەلامار دەدەن و دەخۆن کە گیران دەستیان نابڕدرێ، ئەی بۆ دەستی دز دەبڕدرێ؟! چونکە دز خۆی لێ ناپارێزرێ و زۆرجار ئاشکرا نابێ و نازانرێ کێیە و بە هۆی ئەو دزە نادیارەوە بوختان بۆ کەسانی بێئاگا و پاك دەکرێت! ئەو تاوانبارانەی غەیری دز زۆر بە دەگمەن نەبێ پەلاماری ماڵی هەتیو وهەژار و بێوەژن نادەن کەچی دز فەرقیان ناکات، دز هەبوە دزی لە بێوەژنێك کردوە کە سێ منداڵی ساوای بێباوکی هەیە و دەرودراوسێ و خزم و کەس و کار پارەیەکیان بۆ کۆکردونەوە، کەچی شەوێك لە ماڵەوە نەبووە دز دەرگاکەی شکاندوە ماڵ و پارەکەی تالان کردووە!!

دزی ئەو تاوانە گەورەیە کە هەرکەسێك بیستی دزیەك کراوە پێی دڵتەنگ نەبوو، ئەوە ئەو کەسە دڵسۆزی موسڵمانان نییە، دەگێرنەوە یەکێك لە پێشینان دزییەکی لێ کرا، زۆر پێی دڵتەنگ بوو، رۆژێکیان بۆ یەکێ لە عارفان و دڵرونەکانی باسکرد کە چۆن دز هاتۆتە سەری و ماڵی دزیوە، عارفەکە پێی فەرموو: (إن لمْ يَكُن حُزنُكَ عَلى أنَهُ قَد صارَ فِي هذه الأمة مَن يَعْمَل هذا العَمَل أكثر مِن حُزنك عَلى ذَهاب مالِكَ، لَم تُؤدِّ

النَصيحَة للّٰه عَزَوجلَّ فِي عِبادِهِ إليهِ)، واتە: ئەگەر حوزن و خەفەتباریەکەت بۆ لەدەست دانی ماڵ و سامانەکەتە کە دزراوە زیاتر بێ لەخەفەت خواردنت بۆ ئەوەی کە جێگای پەژارەیە لەم ئومەتەدا کەسانێك پەیدا بوون کە بەوشێوەیە دەچنە سەر ماڵ و سامانی خەڵك و دزی لێدەکەن، ئەوا بزانە کە ئەرکی سەرشانت وەکو موسڵمانێك کە دڵسۆزی نواندنە بەرامبەر خوای گەورە لەبەندەکانیدا جێبەجێ نەکردوە.

واتە: لە هەر جێگایەك بیستت کە دزیەك کراوە دەبێ چەند بۆ ماڵە دزراوەکە و خاوەن ماڵەکە خەفەت دەخۆیت، زۆر لەوە زیاتر خەفەت بۆ ئەوە بخۆی کە لەناو ئومەتی ئیسلامدا کەسانێك پەیدابوون بەدزیکرن ژیان دەبەنەسەر.

ئیمانداران: لەبەر ئەوەی کە دزی ئەوەندە تاوانێکی دزێوە، خوایگەورە لە قورئانی پیرۆزدا بۆخۆی بڕیاری سزای دزی دەرکردوە، وەکو دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ﴾ المائدة:٣٨.

واتە: دەستی پیاوی دز و ئافرەتی دز ببڕن لە پاداشتی کاری ناڕەوایاندا، ئەمەش تۆڵەیە لەلایەن خواوە، خوا باڵادەست و دانایە لەبڕیاردانی ئەو سزایە.

چۆنێتی دەست بڕینەکە: یەکەمجار دەستی راستی لەمەچەکەوە دەبڕدرێت، دووەم جار قاچی چەپی لە قولەپێیەوە، جاری سێیەم دەستی چەپی، جاری چوارەم قاچی راستی، ئەگەر هەر وازی نەهێنا دەخرێتە زیندانەوە و تا تۆبە دەکات و بڕیاردەدات کە جارێکی تر دزی ناکاتەوە، یان لە زیندان‌دا دەمرێت، وە واجبە دوای بڕینی دەستەکە،

دەبێ برینەکەی تەداوی و نەشتەرگەری بکرێ تا خوێنی لەسەر نەروات و کەسەکە نەمرێت، وە ئەمەش حکومەت بۆی دەکات چونکە رقی لەو کەسانە نییە وەکو فلان کەس، بەڵکو رقی لە کردەوەیەکەیەتی.

کەواتە: دز دو سزای هەیە: ١- دەستی دەبڕدرێ ٢- ماڵە دزراوەکەشی لێ دەسەنرێتەوە، ئەمەش سزایەکی دەرونییە لەگەڵ سزا جەستەییەکەدا، چونکە ئەویش زۆر ئازاری دەرونی ئەو کەسەی داوە کە دزیەکەی لێ کردووە:

لەوانەیە بپرسرێ: باشە چۆن دەستێك بۆ چەند دینارێك دەبڕدرێت؟!!

لە وەڵامدا دەڵێن: چۆن ئەگەر پارچەیەکی لاشەی مرۆڤ (شێرپەنجە- سرطان) ی بوو دەبڕدرێتەوە بۆ ئەوەی تەواوی لاشەکە سەلامەت بێ، ئاواش دەستی دز میکرۆب و سەرەتانە و دەبێ لەناوببرێ تا میللەت بە ئاسودەیی بژی و بخەوێ و بتوانێ ماڵ بەجێبهێڵێ و سەفەر بکات.

وە بزانن سوێند بەخوا هەتا ئەم شەرعی خوایە جێبەجێ نەکرێ کەس هەست بە ئارامی ناکات، ئیتر بۆچی شەرعی خوا بەکەڵك نایەت؟! ئەی کاربەدەستانی وڵات دڵنیا بن نە ئێوە و نە گەل و میلەت ئیسراحەت ناکەن تا یاسای ئەم قورئانە حاکم و کارپێکراو نەبێت.

ئیمانداران: لە ئیسلامدا چەند جۆرێك دەستمان هەیە:

یەکەم: ید عاملة: دەستی کرێکار و بەرهەمهێن و خەباتکەر و تێکۆشەر، کە خاك هەڵدەگێرێتەوە بۆ پەیداکردنی بژێوی ژیانی، ئەم دەستە دەستی رێزە و دەبێ لەسەر چاوان دابنرێ و ماچبکرێت، جا ئەمە هەموو دەستێکی خاوەن پیشەی حەلاڵ و سوود بەخش دەگرێتەوە.

**دووەم:** **يد عاطلة:** دەستی بەتاڵ، هەم پارە لە دەست و گیرفانیاندا نییە و هەم ئیشێکی نییە کە بیکات، ئەم جۆرە دەستەش دەبێ ئیشی بۆ پەیدا بکرێت و لە سواڵکردن بپارێزرێت.

**سێیەم:** **يد فاسدة:** دەستی تێکدەر، دەستی دز، کە دەبێ ئەم دەستە ببڕدرێ.

بەڵێ دەستی دز دەستی خراپەکارانە، هەروەکو لە سورەتی یوسفدا دەفەرموێ: براکانی یوسف فەرموویان: (قَالُواْ تَاللّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِي الأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَارِقِينَ) کەواتە: دەستی دز دەستی خراپەکار و گێرەشێوێنیە.

ئیمانداران: کێ بەرپرسیارە تا دزی نەکرێت؟!

یەکەم: خاوەن ماڵ: چونکە بۆ بڕینی دەستی دز چەند مەرجێك پێویستە:

١. موکەلەف بێ، منداڵ و شێت نەبێت.

٢. بە عەمدی و بە ئارەزوی خۆی هاتبێ بۆ دزی و بە زۆر نەنێردرابێ بۆ دزی.

٣. منداڵ و دایك و باوك دەستیان لەسەر دزینی ماڵی یەکتر نابڕدرێ.

٤. دەبێ ئەو دزە لەبرسان دزی نەکردبێ، واتە تێر و تەواو بێ، ئەمجا بچێ دزی بکات هەر بۆیە ئیمامی عومەر لەساڵی گرانیدا حوکمی بڕینی دەستی دزی راگرت.

٥. ماڵە دزراوەکە بایی روبعە دینارێکی ئاڵتون بێت.

٦. ئەو دزە ماڵەکەی لە شوێنێکدا دزیبێ کە شوێنی پاراستنی پارە و کەلوپەل و شتە بە نرخەکانبێ، کەواتە: ئەگەر پارەکەی لەناو

حەوشەی ماڵدا دزی دەستی نابڕدرێ، چونکە شوێنی پاراستنی پارە ناو سندوقی داخراوە نەك حەوشەی ماڵ، بۆیە پێشینان فەرموویانە ماڵی خۆت قایم بگرە و خەڵکی بە دز مەگرە، لەبەر ئەوە واباشە کە ماڵ چۆڵ نەکرێ و ئەگەر چونە دەرەوەش هاتە پێشەوە هەر کەلوپەلە و لە شوێنی پاراستنی تایبەتی خۆیدا هەڵبگیرێ.

دووەم: پێویستە دایك و باوك هەر لە منداڵییەوە منداڵەکانیان لەسەر دەستپاکی رابهێنن و هانیان بدەن لەسەر دەستپاکی، وە بیانترسێنن لەسەرەنجامی خراپی دزیکردن، زۆربەمان ئەو روداوەمان بیستووە کە دەڵێ: کوڕێکی گەنج لە دوای چەندین دزی و بڕینی دوکان و ماڵان و گرتنی و بەربونی، بەڵام هەر وازی نەهێنا، تا سەرەنجام دادوەر بڕیاری لەسێدارەدانی بۆ دەرکرد، (کە ئەو بڕیارە دژی شەرعە) چونکە هێشتا دەست و قاچی لەسەر دزی نەبڕاوە و زیندانی کردنیشی نابێتە هۆی وازهێنانی لە دزی کردن، بەڵێ: کاتێ کە بردیانە ژێر پەتی سێدارەوە و داوای لێکرا کە دواداواکاری خۆی پێشکەش بکات، گەنجەکە وتی: دوا داواکاریم ئەوەیە کە دایکم بانگ بکەن و چاوم پێی بکەوێت کاتێ چوون دایکیان بانگ کرد، دایکی دەستی کرد بە گریان و بەرەو رووی کوڕەکەی چوو کە بۆدواجار خواحافیزی لەیەك بکەن، کوڕەکە داوای لە دایکی کرد کە زمانی دەربێنێ و ئەم ماچی بکات!! دایکەکە بێئاگا لە مەبەستی کوڕەکەی زمانی دەرهێنا و کوڕەکەش بە هەموو هێزی خۆی بە ددانەکانی گازی لە زمانی دایکی گرت و سەرەنجام لەگەڵ هەموو هەوڵێکی دایکەکە و ئامادەبوان بۆ رزگارکردنی، وازی نەهێنا هەتا سەری زمانی دایکی قرتاند، ئەم دیمەنە زۆر بووە

مایەی سەرسوڕمانی دادوەر و ئامادەبووان، دایکەکە برا بۆ نەخۆشخانە و دادوەر لە کوڕەکەی پرسی: باشە ئەو هەموو تاوانەی کە بوون بەهۆی دەرکردنی بڕیاری لەسێدارەدانت بەس نەبوو بۆ ئەوەی پەنا بەریتە بەر ئەم تاوانە گەورەیەش کە بەرامبەر گەورەترین مرۆڤ کە دایکتە ئەنجامتدا؟!، کوڕی تاوانبار بە دادوەری وت: قوربان ڕێگەم بدە بۆت روون بکەمەوە کە بۆچی ئاوام لە زمانی دایکم کرد، من منداڵ بووم کە باوکم کۆچی دوایی کرد و دایکم سەرپەرشتی دەکردم، رۆژێکیان لە کولانەی مریشکی ماڵە دراوسێکەمان هێلکەیەکم دزی و هێنامەوە بۆ دایکم و بۆمگێڕایەوە کە لە ماڵی دراوسێکەمان ئەو هێلکەیەم دزیوە. بەڵام دایکم زۆر بە سادەیی وەری گرت و وتی: رۆڵە چاکت کرد باش بوو ئەو هێلکەیەت هێنا، ئەگینا ئەم نیوەڕۆیە هیچ نەبوو بیخۆیت و بیکەی بە پێخۆر!! بەڵێ لەو رۆژەوە دەستم کرد بە دزی و سەرەنجام لە هێلکە دزینەوە گواستمەوە بۆ مریشك دزین پاشان بۆ مەڕ و مانگا دزین و دوایی دوکان و ماڵ بڕین و بەو هەموو گرتن و ئازاردانە تەمێ نەبووم و ئەوە سەرەنجامەکە دوای چەند خولەکێکی تر لاشەیەکی بێگیان بەسەر داری سێدارەوە دەبینین، ئەمەشم هەمووی لە زمانی دایکمەوە هاتە ڕێگا، چونکە ئەگەر یەکەم جار کە یەکەم هێلکەم دزی،دایکم لێم تورە ببوایە و بیترساندمایە. ئێستا من لەو جێگایە نەدەبووم.

سێیەم: دەوری حکومەت بۆ نەهێشتن یاخود بەربەرەکانیەکی توندی دزی، ئەمەش بەوەی کە حکومەت بەردەوام هێزەکانی ئاسایش و پۆلیسی ئامادە، چاوکراوەبن بۆ پاراستنی بازاڕ و دوکان و ماڵی هاوڵاتیان، دەگێڕنەوە کە جارێك ئافرەتێکی هەژار کە تەنها مانگایەکی

هەبوو، مانگاکەی دزرا، کاتێ چوو شکاتی کرد، دادوەر لێی پرسی: مانگاکەت لە ژوورەوە بوو؟ وتی: بەڵێ، دادوەر وتی: داپیرە تۆ لەو کاتەی شەودا خەوتبووی؟ وتی: بەڵێ خەوتبوم، دادوەر وتی: دەی دەبوایە نەخەوتیتایە و ئاگات لە ماڵ و مانگاکەت بوایە، پیرێژنەکە وتی: قوربان وامزانی تۆی کاربەدەست و دەزگای ئاسایشی حکومەتەکەت بە ئاگایە و پاسەوانی ماڵ و مانگای کەسانی وەکو منی هەژارە، بۆیە من بێخەم لێی دەخەوتم!! وە ئەرکی حکومەتە کە ئەفسەری لێکۆڵینەوەی دزی و پرسیارکار لە کەسی گوماناوی لەو دزیە، کەسانێك بکاتە بەرپرس کە پسپۆڕ و شارەزا بن لەو بواردا.

لە چیرۆکی زیرەکاندا هاتووە کە: کابرایەك دزی لێکرا، گومان لێکراوان بەو دزیە گیران، دادوەر فەرمانی دا کە بخرێنە ژورێکی تاریکەوە کە چاو هیچ نابینێت، وە بە یەك بەیەکی گومانلێکراوانی وت کە کاتێ چوونە ژورەوە دەست بگێڕن تا دەستان بەر حەبلێکی هەڵواسراو دەکەوێت، دەستی پێدا بنێن و بیخەنە گیرفانتانەوە و وەرنە دەرەوە، جا هەرکەس دزیەکەی کردبێ و دەست بەو حەبلەوە بگرێ، حەبلەکە دەپچڕێ!!.. حاکم فەرمانی دابوو کە حەبلەکە ڕەش بکەن بە مادەیکی خەڵوزی، بۆ ئەوەی هەر کەس دەستی لێدا دەستی ڕەش ببێت، کاتێ کە گومان لێکراوان هاتنە دەرەوە هەموویان دەستیان رەش ببو تەنها یەکێکیان نەبێ، کە لە ترسان نەوەکو حەبلەکە بپچڕێ و قسەی دادوەر راست بێت، دەستی پێوە نەگرتبوو، دەستبەجێ دادوەر فەرمانی دەستگیر کردنی دا و ئەویش دانی نا بەوەدا کە ئەو دزییەی کردووە و ئەوانی تر بێتاوانن!..

لە روداوێکی تری دزیدا کە دوو کەس لەلایەن پۆلیسەوە گیرابوون بە تۆمەتی ئەو دزییە، لێکۆڵەر لە کاتی قسە کردن لەگەڵ ئەو دوو کەسەدا پەرداخێکی شوشەی خستە خوارەوە و پەرداخەکە شکاو ددنگی شکانەکە یەکیانی زۆر راچڵەکان و ترسا، بەڵام ئەوەی تریان هیچ نەجولا، لێکۆڵەر وتی: دڵنیام ئەوەیان کە نەجولاّیەوە دزە و جەرگی قایمە، ئەمەیان زیاتر لێکۆڵینەوەی لەسەر بکەن و ئەوی تریان کە ترسا و ڕاچڵەکی دیارە بێ ئاگایە و دزی نەکردووە و بەری بدەن، سەرەنجام قسەکەی راست دەرچوو ئەوەی نەجولاّ و رانەچڵەکی بە دز دەرچوو دانی نا بە تاوانەکەیدا.

ئیمانداران:هەر لەواجبی حکومەتەکە نابێ لە ئیجرائاتدا جیاوازی لە نێوان کەسی خاوەن کەس و کار و بنەماڵە و دەسەلاّت لەگەڵ کەسی بێ پشتیوان و بێ کەس بکات، وە نابێ فەرقی هەژار و دەوڵەمەند بکات، مادام دزی کردووە، دەبێ یەك حوکم بۆ هەردووکیان دەر بکرێت، هەروەکو لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە: کاتێك ئافرەتێك لە بنەماڵەیەکی ناسراو کە –بني مَخزوم–یان پێدەوتن دزی کرد و لێی ئاشکرابوو، کەس و کاری زانیان کە دزیەکە بایی ئەوەیە کە دەستی دزی لەسەر ببڕدرێ بۆ پاراستنی سەمعە و ڕێزی بنەماڵە ناسراوەکەیان تکا لە پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن کە وازی لێبێنێ و ئەم دەنگ و باسە بەردێکی بخرێتە سەر و پارە و ماڵە دزراوەکە بۆ خاوەنی بگێڕنەوە و تەواو بۆ ئەم مەبەستە چوونە لای ئوسامەی کوڕی زەید خۆشەویستی کوڕی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا ﷺ وە داوایان لێ کرد کە بچێتە خزمەت رسول الله و ئەو داوایەی پێ بڵێت، ئوسامە کاتێ چووە خزمەت

پێغەمبەری دادوەر و باسەکەی پێ ڕاگەیاند و داواکاریەکەی ئەو بنەماڵەیەی پێ گەیاند، پێغەمبەری خواﷺ زۆر تورە بوو، دەم و چاوی سور هەڵگەڕا و فەرمووی: ئەی ئوسامە، ئەوە تۆ چۆن دەبی بە تکاکار لە بەجبەجێنەکردنی حوکمێکی شەرعدا، سوێند بە خوا نەك ئافرەتی ئەو بنەماڵە ناسراو و بەڕێز و خاوەن خەبات و شەهید و ماندوو بوونە بۆ ئیسلام، لێی نابوردرێ و دەستی هەر دەبڕدرێ، بەڵکو ئەگەر فاتمەی کچم دزی بکات من خۆم دەستی دەبڕم!!

پاشان فەرمووی: (إنّما هَلَكَ مَن كانَ قَبْلَكُم أنَّهُم كانُوا يُقيمُونُ الحَدَّ عَلى الوَضيعِ، و يتركون عَلى الشَّريف)... واتە: ئەوانەی پێش ئێوە، ئوممەتان و گەلانی رابردوو، هەر بۆیە لەناو چوون و خوای بەدەسەڵات بە هیلاکی بردن، چونکە تاوانیان ئەوە بوو کە: ئەگەر کەسێکی بێ پشت و پەنا و هۆز و هەژار و بێدەسەڵات تاوانێکیان بکردایە، سزای دانراو بۆ ئەو تاوانە بەسەریدا جێبەجێ دەکرا و تۆڵەی لێ دەسەنرا، بەڵام ئەگەر کەسێکی خاوەن کەس و پشتئەستور بە قەوم و هۆز و بنەماڵە، دەوڵەمەند و ناسراو هەمان تاوانی ئەنجامبدایە ئەوا تۆڵە و سزای دیاری کراوی بەسەردا جێبەجێ نەدەکرا بۆی پەردەپۆش دەکرا و یاسای وڵات ئەوی نەدەگرتەوە!

جاکەواتە: ئەگەر حکومەت دەیەوێت دەسەڵاتەکەی تا سەر بێت و خوای دەسەڵاتدار بەسەر هەموو دەسەڵاتدارەکانەوە، حوکمرانیەکەی لێ تێك نەدات با جیاوازی نەکات لە نێوان هیچ تاوان بارێکدا و حوکم و یاسا بۆ هەموو کەس کە هاوڵاتیە وەکو یەك جێبەجێ بکرێت.

چوارەم: ئەو کەسەی کە دزی لێ کراوە، تۆش ئاگاداری ئەم دوو خاڵە بە:

١- بە ئارامبە و هەڵمەچۆ، بوختان بۆ کەس مەکە، ئارام بگرە چونکە ئەگەر دزیەکە ئاشکرا بوو، ئەوە تۆ ماڵەکەت دەست دەکەوێتەوە و ئەو ماوەیەش کە دڵگران و خەمبار بووی خوای گەورە لە قیامەتدا ئەجرت ئەداتەوە و بە ئەندازەی ئەو خەفەتخواردنەت گوناهت لەکۆڵ دەکاتەوە، ئەگەر دزەکەش نەدۆزرایەوە ئەوا تۆ لەم دونیادا پاداشتی دڵنارەحەتیت بۆ دەبێت بە کەفارەتی گوناه و هەڵەکانت و قورس بوونی تەرازوی چاکەت لە قیامەتدا و خوای گەورەی دادپەروەر لە رۆژی قیامەتدا بە ئەندازەی ئەو پارە و ماڵە دزراودت لە چاکەی دزەکە هەڵدەگرێ و دەیخاتە تای تەرازوی چاکەی تۆوە، ئەگەر ئەوەندەش تاوانبار بوو کە چاکەی نەمابوو ئەوا خراپەکانی تۆ دەچنە سەر خراپەکانی ئەو و لە هەردوو باردا تۆ قازانج دەکەی و زەرەرمەند نەبووی.

بەڵام بە مەرجێك ئەم ئەجر و پاداشتەت بۆ هەیە کە هەر لە خۆتەوە خەڵکی تاوانبار نەکەی بەوەی کە ئەو دزی لێ کردووی و ئاگری تورەیت تەڕ و وشك بە یەکەوە بسوتێنێ.

ئێمەی موسڵمان و دیندار دەبێ لە قورئانەکەمانەوە هەموو کاروبارێکی ژیانمان فێر بین، با بچینە خزمەت قورئان و ئایەتی (١٠٥-١١٣)ی سورەتی -النساء- تەماشا بکەین و بخوێنینەوە کە دەفەرموێ:

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ۞ وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ۞ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ۞ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ

وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ۞ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ۞ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ۞ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ۞ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ۞ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ ۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ۚ وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾ النساء: ١٠٥-١١٣.

**موسڵمانان با بزانین هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم کۆمەڵە ئایەتە کەئەمە بە کورتی ماناکەیەتی چییە و لەبارەی چییەوە هاتونەتە خوارەوە، کە خوای پەروەردگار لە عەرشی عەزیمەوە جوبرەئیلی ئەمین دەنێرێتە خزمەت محمد المصطفیﷺ و ئەم کۆمەڵە ئایەتەی بۆ دێنێ کە بە ئوسلوبە جوان و ناوازەکەی قورئان، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ، پێغەمبەری دادگەر، پێغەمبەری خەمخۆری مافخوراوان، پێغەمبەری دڵسۆزی ستەملێکراوان، پێغەمبەرێك کە بە راستی نەك هەر لە سەردەمی خۆیدا بەڵکو تا قیامەت دەبێ سارێژی برینەکان و چارەسەری نەخۆشیە خراپەکانی ناو کۆمەڵ و مرۆڤایەتی هەر لەسەر دەستی پڕ شیفا و پڕ حیکمەتی بەرەکەتداری ئەو بێ و ئەوەی لە دەرمانخانەی قورئان و سوننەتەکەی ئەوەوە دەرمان وەرنەگرێ و چارەسەری نەخۆشی پێنەکات، ئەوا هەرچەند خۆی بە دەرمانساز و چارەساز و حەکیم بزانێ، بەڵام دەردی پێیە و دەرمانی دەردی پێ دەکات، جێگای گومان نییە کە چارەسەری دەرد و نەخۆشیش بە دەرمان دەکرێ نەك بە دەردێکی تری لە خۆی پیستر، وەکو چارەی سیل بە سەرەتان..**

بەڵێ، جوان لە ئایەتەکان ورد ببنەوە، ئەبینی خوای گەورە گفتوگۆ لەگەڵ پێغەمبەرە نازدارەکەی دەکات و لەویشەوە دەبێت بە دەرس و وانە بۆ هەموو ئومەتەکەی تا قیامەت، ئای شێوازی قورئان چەند بێوێنەیە، گەورەیی ئەم پەیامی ئیسلام و قورئانە کە پێغەمبەری خوای لە(ووَجَدَكَ ضالاً فَهَدى) رزگار کرد و بوو بە کتێبێك کە چارەسەری هەموو کێشە و گرفتەکانی ناو کۆمەڵی پێ بکات، بە بیری دێنێتەوە و پاشان رێنمای دەکات بە گوێیدا دەچرپێنێ کە ئاگادار بە، زمان لوسێکی ناپاك خۆت لێنەکات بە بەفری بێ پەڵە و کەسێکی بێتاوان و بێ ئاگا ناشرین نەکات و دەستە چەورەکەی خۆی بەسەری ئەو نەسرێ، لە کۆتاییدا دڵخۆشی و دڵنیای دەکات کە ئەی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەم دڵنیابە کە بەردەوام چاودێری خوات لەسەرە هەرگیز ناهێڵێت فێڵبازان و ناپاکان زەفەرت پێ بێنن و بۆ چاوترووکانێ لە حەق و راستی لات بدەن...

دەی فەرموون با بچینە خزمەت تەفسیری (ئاسان) و بە کوردی و بە کورتی لە مانای ئایەتەکان کە خوێندمانەوە تێ بگەین، دەفەرموێ:

(ئەی پێغەمبەری خۆشەویست، ئێمە بە راستی قورئانمان بۆ لای تۆ دابەزاندۆتە خوارەوە، سەرتاپای حەق و راستی بەردەوامە، بۆ ئەوەی دادپەروەری بکەیت لە نێوان خەڵکدا بەو شێوەیەی کە خوا نیشانی داویت و رێنوویی کردویت و بە گونجاوی دەزانیت بۆ چارەسەری کێشەکان و بەرێوبردنی کۆمەڵگا و قازانجی خەڵکی، نەکەیت بەرگری لە ناپاکان بکەیت، ئەی محمدﷺ بەردەوام داوای لێخۆشبون لە خوا بکە، چونکە بەڕاستی ئەو خوایە هەمیشە و بەردەوام لێخۆشبوو و میهرەبانە... بەرگری لەو کەسانەش مەکە کە ناپاکن و خیانەت لە خۆیان دەکەن چونکە بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت کە هەمیشە

خیانەتکار و تاوانبارن... ئەوانە دەیانەوێت خیانەت و تاوانەکانیان لە خەڵکی بشارنەوە، لە کاتێکدا ناتوانن لە خوای بشارنەوە کە لەگەڵیاندایە و چاودێریانە، بە شەودا قسەی وا هەڵدەبەستن خوا پێی رازی نییە و خوا بەردەوام گەمارۆدەری ئەو کار و کردەوانەیە کە ئەنجامی دەدەن...باشە ئەوەتە ئێوە بەرگریان لێ دەکەن لە ژیانی ئەم دونیایەدا، ئەی ڕۆژی قیامەت، لای خوا کێ بەرگریان لێ دەکات؟! یاخود کێ پشتیوان و یاریدەدەریان دەبێت تا لە سزای دۆزەخ رزگاریان بکات؟! ئەوەی خراپەیەك بکات دژ بە خەڵکی یاخود ستەم لە خۆی بکات، لەوەو دوا بە خۆیدا بچێتەوە و داوای لێخۆشبون لە خوا بکات، ئەوە خوایەکی لێخۆشبوو میهرەبانی دەست دەکەوێت.. ئەوەش کە گوناه و تاوانێك ئەنجام دەدات ، ئەوە بە زیانی خۆی تەواو دەبێت، زیان بە خۆی دەگات لە قیامەتدا، بێگومان خوا هەمیشە و بەردەوام زانا و دانایە، جا ئەوەی هەڵەیەك یان تاوانێك ئەنجام بدات و لەوە بەدواوە بیسەپێنێت بەسەر بێتاوانێکدا و بێتاوانی پێ لەکەدار بکات، بێگومان ئەو کەسە بوختان و تاوانێکی ئاشکرای ئەنجامداوە و تاوانێکی گەورەی کردووە، زیاد لە گوناهەکەی خۆی، خۆ ئەگەر فەزڵ و رەحمەتی خوا نەبووایە بە سەرتەوە (ئەی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ) خەریك بوو هەندێکیان سەرت لێ بشێوێنن، بێگومان ئەوان بەو کارەیان هەر سەر لە خۆیان دەشێوێنن، دڵنیابە کە ناتوانن لە هیچ شتێکدا زیانت پێ بگەیەنن، خوای گەورەش قورئان و دانایی بۆ دابەزاندویت و فێری ئەو شتانەی کردویت کە جاران نەتدەزانی ؛ بەردەوام فەزڵ و رێزی خوا لەسەر تۆ ئەی محمدﷺ زۆر و ئاشکرا و دیارە کە نایەڵێت توشی هەڵە ببیت..

ئیمانـداران: ئێستا کـە گـوێ بیـستی مانـای ئایەتـەکان بـوین، بـا بـزانین هـۆی هاتنــە خوارەوەیــان چــی بــوو؟ دەچـینە شــاری مەدینــەی منەوەرە، سەردەمی زێڕینی ئیسلامە، قورئان دێتە خوارەوە و بە شیفای ئاسمـان میکرۆبـەکانی سـەر زەوی لـەناو دەبـات، شــەوێکی تاریکـە و کەسـێك کـە نـاوی (طـوعمـەی کـوڕی ئوبـەیریق)بـوو، قـەڵغانێکی لـە موسـڵمانێك دزی کـە نـاوی (روفاعـە)بـوو، بـردی لـە جـەواڵی ئـاردا شـاردیەوە، بـۆ بـەیانی روفاعـە ڕایگەیانـد کـە قەڵغانەکـەی لێـدزراوە و گومانیشی لە (طوعمە)یە، طوعمەی دزیش لە تـری ئـەوەی نـەوەکو بێنە سەری و ماڵەکەی بپشکنن و دزیەکەی لێ ئاشکرا ببێت، بۆیـە لـە شـەودا زرێیەکەی لە جەواڵی ئاردەکەدا بردە ماڵی کابرایـەکی جولەکە بە ناوی (زەیدی کوڕی سەمین) خستیە حەوشـەی ماڵەکەیـەوە، جولەکەکە بێئاگا و بێتاوانە لەو مەسەلەیە لە ژورەوە خەوتبوو،کاتێ ڕۆژ بووەوە روفاعـە و خزمـەکانی هاتنـە سـەر مـاڵی طوعمـە کـرد بـۆ پـشکنینی ماڵەکـەی بـەڵام هیـچیان نەدۆزیـەوە و طـوعمـە پێـی وتـن: کە مـن چاوم لێـی بـوو زەیـدی جولەکە شتێکی بە کۆڵەوە بوو، بە تاریکە شەو خۆی کرد بـە ماڵەکەیـدا، بچن بزانن لەوێ نیە؟ بەم شێوەیە سەرەڕای تاوانباری خۆی بوختانی بۆ بێتاوانێ کـرد!!بـەڵێ کـاتێ روفاعـە و خزمـەکانی چـونە بـەردەرگای مـاڵی جولەکە سەیر دەکەن ئارد رژاوە و کەچونە حەوشەوە جەواڵی ئاردەکیـان بینــی و کــە تاماشــایان کـرد قەڵغانەکــەیان لــە ناوئاردەکەدایــە ئــیتر جولەکەیان گـرت و بڕیـاری دزییەکـەیان بەسـەردا سـەپاند، جولەکەکـەش کە بێئاگا بوو زۆر پەشێو حاڵ بوو، چەند پاکانـەی دەکرد کـە نـە ئاگـای لـە جەواڵـە ئـارد و نـە ئاگـای لـە قەڵغانـە، وە طـوعمـە کـە ئـەو تاوانـەی

خستۆتە پاڵ خۆی دزە، بەم شێوەیە چونە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ خزمەکانی طوعمە بەرگریان لە طوعمە و عەرزی پێغەمبەریان کرد کە بچێتە شوێنی دزیەکە و ئاردە رژاوەکە لەبەردەم ماڵی جولەکەکەدا ببینێت، پێغەمبەری خوا خەریك بوو بفەرموێ، طوعمە پاکە و جولەکەکە دزە چونکە بەڵگەکان وا نیشان دەدا، لەم کاتەدا پێغەمبەر ﷺ قسەکە لە دەمی نەهاتە دەر کە حەزرەتی جوبرەئیل لە لایەن خواوە هات و ئەم ( ٩ ) ئایەتەی سورەتی –انساء– ی بۆ هێنایە خوارەوە تا رۆژی قیامەت هەموو سات و کات وزەمان و زەمینێ دەخوێنرێتەوە و راستی روداوەکەی دەرخست و پەردەی لەسەر پیلان و بوختانەکە هەڵماڵی و جولەکەی سەرسەختی ئیسلامی بەری کرد و موسڵمانە دزەکەی مەحکوم کرد.. بەڵام طوعمە ئامادە نەبوو بچێتە ژێر حوکمی شەرع و و هەڵهات بۆ مەککە و چووە لای موشریکەکانی مەککە لە ئیسلام هەڵگەڕایەوە، لە شاری مەککەش هەروازی لە دزی نەهێنا و دیواری بەسەردا روخا لە کاتی دزیدا و لە ژێریا مرد!.

سُبحان الله، ئائەمەیە دادگەری و بەرزی و ماف مرۆڤ، ئایەتەکە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:(و أستَغفِر الله) داوای لێخۆشبون لە خوا بکە چونکە پێغەمبەر ﷺ تەنها ئەوە هاتبوو بە دڵی خاوێنیدا کە جولەکە بێئاگاکە تاوانبار بێ و طوعمەی بە ناو موسڵمانی دز بێتاوان بێ، خۆ بە قسەش ئەمەی نەوتبوو!!

جا ئەی ئەو کەسانەی کە دوژمن بە ئیسلامن، ئاوا ئیسلام دیفاع لە ئێوەش دەکات و ناهێڵێ تۆمەتتان بدرێتە پاڵ و کەسایەتیتان لەکەدار بکرێ و هەموو مافێکی هاولاتی بوونتان پێ دەبەخشێ!، باشە ئەمە لە چ یاسایەکی جیهانی ماف مرۆڤدا پێش ئیسلام بە کردەوە ئەنجام دراوە؟!

بەڵێ دەگەڕێینەوە بۆ لای خاوەن ماڵ و پێی دەڵێین: لە کاتێکدا دزیت لێ دەکرێت ئارامبگرە و پەلە مەکە لە تۆمەتدانە پاڵ کەسانێك کە لەوانەیە هیچ ئاگادرای ئەو دزیە نەبن و خۆت تاوانباری لای خوا و ناشرینی بەرچاوی خەڵکی مەکە.

٢-ئەی ئەو کەسەی کە دزیت لێ کراوە، ئاگادار بە، با وەکو ماڵ و پارەت رۆشتوە دین و ئیمانیشت نەڕوات! ئەویش بەوەی بچیت بۆ لای فاڵچی و و کتێب گرەوە و منداڵ خەوێن و ساحیر و دەستبڕەکان، بە مەبەستی ئەوەی بەڵکو دزیەکەت بۆ ئاشکرا بکەن و دزەکەت پێ بناسێنن، دڵنیابە کە ئەمانەش هەر دز و شەریکە دزن و بەڵام بە جۆرێکی تر دزیت لێ دەکەن و هەندێ پارەت لێ وەردەگرن و چەند ناوێکت پێ دەڵێن کە تەناه دەتخەنە نێو گومانەوە سەرەنجام پارەکەشت دەروات و دەبیت بە ناحەز و دوژمنی چەندین کەس و لە هەموو بەلایەك گەورەتر ئەوەیە، دین و ئیمانەکەت دەکەوێتە مەترسیەوە، پێغەمبەری دڵسۆزمانﷺ بەفەرموێ: (مَن أتـى عَرَّافـاً أو كاهِنـاً فَصَدَّقَه بمـا يَقـولُ فَقَـد كَفَـرَ بمـا أُنـزِلَ عَلـى مُحُمَّـد) رواه ابو داود(٣٩٠٤) و الترمذي (١٣٥) و صححه الألباني في السلسة الصحيحة(٣٣٨٧).

وە ئیماندارانی بەڕێز: ئێوە بیر بکەنەوە ئایا کێ لەو کەسە نەفام و نەزانترە کە وابزانێ و بڕوای وابێ کەسێکی داماو دەتوانێ دزی ئاشکرا بکات، باشە ئەگەر ئەو کەسە ئەوەندە پەنهان بینە، ئەی باشە بۆچی ئەو هەموو گەنجینە و کوپەڵە پڕ لە ئاڵتون و مادە گران بەهایانە نابینێ کە لە ژێر ئەم زەوییە پڕ لەو جۆرە مادە گرانبەهایانە کە بە دەرهێنان و دەستکەوتنیان تا هەتا هەتایە لەم قاچ و قوچە و دەست بڕینە رزگاری دەبێ، ئەی کە ئەمەیان نابینێ، چۆن دەزانێ کێ دزیکردوە؟!

باشــە ئێمــە لێــرەدا پرســیارێك دەكــەین و بــا جــوان بــیری لــێ بكەینــەوە، ئــەویش ئەوەیــە: باشــە ئەگــەر راســتە ئەمانــە دزی ئاشــكرا دەكەن، ئەی باشە حكومەت بۆچی لەجیاتی پۆلیس و ئاسایش ناچێ ئەمانە بە كرێبگرێ و دزیەكانیان پێ ئاشكرا بكات و دزەكان دەستگیر بكات و ئیتر نە پۆلیس و نە ئەفسەری لێكۆڵینەوە و نە دادگا خۆی ماندوو بكات و ئەم فاڵچیانە ئەو هەموو دەورە ببینن باشتر نیە؟!

ئەگەر ئەمانە هیچیان بزانیانە دەبوایە ئاوا پلە و پایەی گەورەیان لە حكومەتدا هەبوایە! بەڵام چونكە هەموو درۆو دەلەسە و دەست بڕینە، هەریەكـەیان لـە لاكۆلانێكـا خۆیـان لـە بۆسـە نـاوە بـۆ راوكردنـی ئـەو كەسانەی كە تا ئێستاش بڕوایان بە خەرافات هەیە و دەبنە نێچیرێكی چەوری ئەو رۆژەیان.

كە بە داخەوەم حكومەتیش كەمتەرخەمە كە ناچێتە سەر ماڵی ئەم فاڵچی و درۆزنانە و نایانگرێت و لە كونجی زینداندا قایمیان ناكات و دادگـایی نـاكرێن و سـزای ئـەو هـەموو دەسـت بـڕین و خەڵەتانـدن و چەواشەكاریەیان لێ ناسەنێت كە دەبنە مایەی دوژمنایەتی و رق و كین لە نێوان خەڵكیدا و بوختان پاڵدانە لای دەیان كەسی بێ تاوان!!

باشــە حــەیف نییــە میللــەتی موســڵمان، كــە قورئــانی هەیــە، كــە سوننەتی گەوهەرباری سەرداری پێغەمبەرانی لایە، میلەتێك كە هەزاران زانای دڵسۆز و شارەزا لـە هـەموو وتارێكدا وشیاری دەكاتـەوە كە چیتر بڕوا بـە خـەرافیات نـەكات، كەچـی بەداخـەوە هێشتا زۆرن و لـەزۆریش زۆرترن ئەوانەی كە كاتێ دزیان لـێ دەكرێ، پێش پۆلیس را دەكەن بۆ

لای ئـەو فاڵـچیانە و هـەموو ئومێـد و قەناعـەتێکیان بەوەیـە کـە ئـەو دزەکەیان بۆ ئاشکرا دەکات!!

باشـە ئـەم میلەتـە دەبـێ چ سـەردەمێك بێـت واز لـەم خەرافیاتانـە بێنێت تا ئێستاش کەسانێکی زۆر نامەکەی شێخ ئەحمەدی مەدینە بڵاو دەکەنـەوە هەریەکـەیان دەبـێ چـەند دانەیـەکی لـێ کـۆپی بکـات و بـڵاوی بکاتەوە، چونکە ئەگـەر وانـەکات، ئـەوا توشـی بەڵایـەك دەبێـت ، وە ئەمـە هــەموو ســاڵێك لــەم کوردەواریــەی ئێمــەدا بەتایبــەت لــە گونــد و شارۆچکەکان زیاتر بڵاو دەبێتەوە و بە سەدان وێنـەی لەبـەر دەگیرێتـەوە و بـڵاو دەکرێتــەوە و بیروهۆشــی خــەڵکی خۆشــباوەڕی بــێ ئاگــا لــە عەقیدەی ئیسلامی پـێ مەشـغول دەکـەن، کـە ئـەم خەرافیاتـە بـێ بنەمایـە دروستکراوە لە ساڵانی ١٩٦٠ بەدواوە پەیدا بـوە وزانـای نـاودار (دکتـۆر یوسف القرضاوی)لە (فتاوى المعاصرة) ج١ ص٢٠١ دا باسی کـردووە و وتاربێـژی حەقبێـژی میـصری خوالێخـۆش بـوو(عبـد الحمیـد کشك) لـە سـاڵانی حەفتاکانـدا لـە قـاهرە لـە یـەکێ لـە وتارەکانـدا موسـڵمانانی لـە ناراستی ئەو خەونە ئاگادار کردۆتـەوە و لـە زنجیرە کتێبەکانی (الخطـب المنبریــة) دا نوســراوەتەوە، کەچــی ئــەم درۆیــە هــەموو ســاڵێ سەرهەڵدەداتەوە و لە میصرەوە بۆ قەتەر و بۆ عێراق و بۆ کوردستان و هـەموو وڵاتـان دەگوێزرێتـەوە و بـڵاو دەکرێتـەوە، کـە بـە ڕاسـتی ئەمـە مانـای تێنگەیـشتنە لـە ئیـسلام و ناڕۆشـنبیری ئـەو جـۆرە کەسـانەیە کـە ساویلکانە بڕوا بەم شتانە دەکەن.

وە لە خاڵی کۆتاییدا ڕوو دەکەمە ئەو کەسانەی کە توشی ئەم تاوانە بوون و ماڵ و سامانی خەڵکیان دزیوە، بە ئەوانیش دەڵێم: وەرن

تەوبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆ قاپی پڕ ڕەحمەتی خوایەك کە لێخۆشبوو و میهرەبانە، لەبەر ئەوەی خوای گەورە ڕێگای تەوبەی نیشانداون و لە دوای باسی سزای دز راستەوخۆ دەفەرموێ: ﴿فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ﴾المائدة:٣٩

واتە:ئەو کەسەی کە دوای ستەم و تاوانەکەی تەوبە بکات و چاکسازی لە خۆیدا بکات بە شێوەیەك: دڵ و دەرونی خاوێن بکاتەوە، ماڵی خەڵکی کە لێی دزیون بیداتەوە، دەستی و گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات، (ئەگەر نەشیتوانی ماڵە دزراوەکە بداتەوە دەستی خاوەنی لەبەر ئەوەی دەترسا لێی خۆشنەبن و ئابروی ببەن،یان دزی تریش کە ئەم نەیکردوە بەسەریدا بدەن، ئەوا بە نهێنی بیخاتە ماڵی خاوەنەکەیەوە ، وە ئەگەر خاوەنەکەیشی لە ژیاندا نەمابوو، وە واریس و کەس و کاری لەو شوێنەدا نەمابوون و بۆی نەدەدۆزرایەوە ئەوا با ئەو پارە دزیە بخاتە پرۆژەیەکی گشتیەوە وەکو مزگەوت و قوتابخانە و پرد و بیری ئاو کە هەموو موسڵمانان لێی سودمەند دەبن بە خێری خاوەنپارەکە). وە یەقین بدات بە دڵی کە هەرگیز جارێکی تر چاوی لە دزی نەمێنێت، ئەوە بێگومان خوا تەوبەکەی لێ وەردەگرێت، چونکە بە ڕاستی خوای گەورە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

وە پێغەمبەری خۆشەویستمان لە فەرمودەیەکدا ریگەی تەوبە و پەشیمانبونەوەی بۆ ئەو کەسانەی توشی تاوانی دزی بوون داناوە و دەفەرموێ: (لا يسرقُ السارِقُ حينَ يَسرِقُ وهوَ مُؤمِن، ولكِن التَوبَةَ مَعرُوضَة) متفق عليه.

ئەی دز تۆ واز لە دزی بێنە و دەست بە کار و کەسابەتی حەڵاڵ بکە ، دڵنیابە خوای گەورە ئەوەی تۆ دەتەوێت بە دزی دەستت بکەوێ، بە خەجاڵەتی دونیا و دواڕۆژەوە، بە حەڵاڵی و سەربەرزی و دونیا و دواڕۆژەوە بۆت دەنێرێ!..

کۆتایی وتارەکەشم بەوە دێنم کە دەڵێم: دیاردەی دزی کە ئەمڕۆ زۆرە و بنکەکانی پۆلیس شایەتی ئەوە ئەدەن کە هەفتانە چەند حاڵەتی دزی کردن لە ماڵان و بازاڕ و کۆمپانیاکان رودەدات و داوا تۆمار دەکرێت، ئەگەر حکومەت بیەوێت ئەم دیاردەیە بنبڕبکات، یاخود لانی کەم زۆر کەمی بکاتەوە ئەوا بە دوو ڕێگا دەکرێ:

١-گرنگی دان بە مزگەوتەکان و هۆشیار کردنەوەی خەڵك لەو تاوانە گەورە و سەرەنجامە مەترسیدارەکەی ، چونکە تەنها هەستی ئیمان و ترسی خوا و بڕوا بوون بەوەی کە کامێرای خوای گەورە بەردەوام لە هەموو سات و کات و شوێنێکدا دەیبینی و لێی بێئاگا نییە، ئەمە مرۆڤ دەپارێزێت لە دزی کردن، وە هەروەها ئەرکی سەرشانی حکومەتە بە تایبەتی چاودێری بخرێتە سەر کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، بە تایبەتتر تەلەفیزۆن و کەناڵە ئاسمانیەکانی لای خۆمان، کە لەجیاتی ئەو فلیم و تەمسیلانە نیشانی جەماوەر بدرێ کە باسی بڕینی بانق و شکاندنی دەرگا و کانتۆری ماڵان دەکات و چۆن بەسەر دیوارد هەڵدێ و چۆن خۆی رزگار دەکات و ئەوەی ناشزانێ چۆن دزی دەکرێ بە جوانی فێردەبێ کە بە ئاسانی دزی بکات، لەجیاتی ئەوە حەق وایە فلیم و تەمسیلی وا نیشانبدرێ و ئامادە بکرێ کە باس لە ریسوابونی دز و حەیاچونی و تیاچونی و سزای توندی بکرێ بە شێوەیەك ئەوەی نیازی

دزیکردنیشی لەدڵدا بێت بە بینینی ئەو تەمسیلە، ترسێك ناخی دابگرێ و پەشیمان بێتەوە.

٢-پێویستە شەرعی خوا حوکمی پێ بکرێت و دوای دابینکردنی ژیان و گوزەرانی خەڵك و نەهێشتنی ئەو هۆکارانەی کە مرۆڤ ناچار دەکەن پەنا بباتە بەر ئەو کارە دزێوە، وە وشیار کردنەوەی جەماوەر بە پاراستنی ماڵ و سامانیان لە شوێنی پێویستی هەڵگرتنی خۆیدا و بەگەڕ خستنی تواناکانی پۆلیس و روبەرووبونەوەی دزەکان، دوای ئەوە هەرکەسێ دزی کرد و مەرجە شەرعیەکانی بڕینی دەستی دزی لێ هاتە جێگا، دادوەر بڕیاری دەست بڕینی بدات و ئەو دەستە پیسە لە ناو کۆمەڵدا لاببرێ، وە هەموو ئەو خۆ بە رۆشنبیر و مەدەنی خوازانەی کە پێیان وایە ئەمە پێشێلکردنی مافی مرۆڤە و دز تەنها دەبێ سجن بکرێ و لە زینداندا تەمێ بکرێ و ببێتەوە بە مرۆڤێکی دەست پاك، ئەوە بەوانیش دەڵێین:

١-ئێوە لە خوای پەروەردگار میهرەبانتر نین بۆ بەندەکانی خوا و حوکمی خوا هەمووی لەجێی خۆیەتی و هەرکەسێ غەیری حوکمی خوای پێ باش بێت ئەوە خوای گەورە پێی دەفەرموێ: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾ المائدە:٥٠

٢-واقعی ئەمڕۆی جیهان و وڵاتی خۆشمان شاهیدی ئەو راستیەن کە مەگەر کەسێك لەسەر دزیەکی بچوك گیرابێ لە حوکمی شەرعیشدا ئەو کەسە بڕیاری بڕینی دەستی دزی بەسەردا نادرێ و تەنها بە لێسەندنەوەی ماڵەکە و

بەندکردنی و ئامۆژگاری کردنی لە بەندینخانەدا حوکم دەدرێ، وە دوای بەربونی ئومێدی چاکبونی لێ دەکرێ و جارێکی تر دزی ناکاتەوە بەڵام دزی گەورە، ئەوانەی کە حوکمی بڕینی دەستی دز دەیانگرێتەوە، دوای چەندینجار گیرانیان و حکومدانیان بە چەند ساڵ زیندانی مەگەر زۆر زۆر دەگمەن ئەگینا هەموویان داوای بەربونیان نەك هەر واز لە دزی ناهێنن، بەڵکو لە ناو بەندینخانەدا دزی تریش دەناسن و زیاتر فێری پیلاندانان بۆ دزیکردن دەبن و دوای بەربونیان دزی گەورەتر لەوەی کە پێشو لەسەری گیراون ئەنجام دەدەن، وە ئەمانە دەبن بە باند و عەصابە و ئەوانەی لە جیهاندا بانقە گەورەکان دەبڕن. هەموویان چەندینجار لەسەر دزی گیراون، بەلام زیندانی کردن نەك دەرسی دانەدان بەڵکو چاوسورتری کردن و دزێکی کارامەتری لێ دروست کردن، بەڵام بە دڵنیای تەواوەوە بڕینی دەستێك وازهێنانی ئەو دزە و تەمێبونی سەدان کەسی تریش کە بە تەمای دزیبن، ئەنجامی دەبێ.

دە با بگەڕێینەوە بۆ شەرعی خوا، ئەو خوایەی کە کاربەجێ و دادگەر و میهرەبانە و هەر خۆی دەزانێ ئەو مرۆڤەی خۆی دروستی کردووە بەچی روو لە چاکی و پاکی دەکات و بەچی واز لە خراپە و تاوان دێنێت.

خوای گەورە هەموو لایەکمان لە دینەکەی خۆی شارەزا بکات و سەرفرازی دونیا و دوارۆژمان بکات، اللّهم اغنینا بِحَلالِكَ عَن حَرامِكَ، و اغْنینا بِفَضلِكَ عَمَّنْ سِواك و بطاعَتِكَ عَن مَعصیتك. اللّهم آمین

سەرچاوەکان:

١ قورئانی پیرۆز
٢. صفوة التفاسير –محمد علي الصابوني
٣. تەفسیری ئاسان – بورهان محمد أمین
٤. تەفسیری رەوان –مەلا محمود گەلاڵەیی –بەرگی سێیەم– جوزئی پێنجەم. ل١٨٠
٥. تەفرسیری ڕامان –مامۆستا أحمد کاکە محمود ل٢٠٥
٦. لە خزمەت قورئاندا –ئەندازیار عثمان محمد رشید ل٢١
٧. صحيح وصايا الرسولﷺ –سعد يوسف أبو عزيز ج٣ ص١٠٩
٨. المجموعة الثانية من صحيح وصايا الرسولﷺ –سعد يوسف أبو عزيز ج٣ ص٤٢٦
٩. العقيدة أولاً لو كانوا يعلمون –صالح بن طه عبدالواحد ج٤ ص٣٢٠
١٠. چیرۆکی زیرەکان – حبیب محمد سعید ل٣٧– ٣٩
١١. فتاوى المعاصرة. د. يوسف القرضاوي ج١ ص٢٠١
١٢. سبيلُ المهتدين –الشيخ محمد المختار السلامي ج١ ص٢٤٦

# وتاری یەکەم بۆ مانگی جمادي الأولی

## (( مردن ))

الحَمدُ للّٰهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعينَ.

ئیمانداران و خواناسانی خۆشەویست و بەڕێز، پشتیوان بە خوای گەورە لە وتاری ئەمڕۆماندا باسی قۆناغێکی چارەنوس ساز لە قۆناغەکانی ژیانمان دەکەین، کە بەڕاستی چارەنوسسازە و ئەگەر لەو کاتە سەرفرازبی، ئەوا هەموو قۆناغەکانی دوای ئەو بە سەربەرزی بەسەر دەبەیت، خۆ ئەگەر خوانەخواسە ئەو قۆناغە بە شکست خواردوویی بەسەر بەریت، ئەوا قۆناغەکانی دوای ئەو هەمووی ژان و ئازار و نەهامەتی دەبێت، ئەویش مردنە، ساتی کۆتایی هاتن و پێچەوانەی هیوا و ئاواتەکان، ساتی پێچەوانەی لاپەڕەکانی ژیان، ساتی ساتان، کاتی کاتان، کە لەو کاتەدا مرۆڤ لە نێوان دوو شتدایە، کە پێغەمبەری دڵسۆزﷺ و ئازیزمان بۆی دیاری کردوین، ئەویش ئەوەیە: ئەوەی ئیمانداره زۆر بەو مردنە خۆشحاڵە، چونکە دەگات بە لیقای خوا، دەگاتەوە بە رەحم و بەزەیی خوا، کە لە دونیادا لە ژێر سایەی رەحمەتیدا ئاوا بە کامەرانی ژیاوە، ئەمجا لە قەبر و قیامەتەکەوە دەچێتەوە بۆ لای نەوەد و نۆ رەحمەتی خوا کە خوای گەورە هەڵی گرتووە بۆ قیامەت، ئیتر زۆر خۆشحاڵ دەبێ و خوای گەورەش بە جوانی پێشوازی لێ دەکات و بە خۆشحاڵیەوە بەوەی بەندەکەی دەگاتەوە خزمەتی، (مَن أحَبَّ لِقاءَ اللّٰه أحبَ اللّٰه لِقاءَه) جا بە ڕاستی ئەم کەسە لەم سەرەمەرگەدا شەهادەی رزگاربونی لە هەموو مەینەتیەکان

وەرگرت مژدەی گەیشتن بە هەموو خۆشیەکانی پێدرا، بەڵام ئەم جۆرە مردنە کارکردنی دەوێ بۆی، خۆ ئامادە کردنی دەوێ، ئەوەی دەوێ هەموو کات خوات لە یاد بێت، قەبرت لە بیر بێت کردەوەت بۆ رەوانکردبێ، دڵت پابەند بێت بە مزگەوت و نوێژەوە، هەروەکو کە (عامری کوری عبدالله ی کوری زوبەیر) رەحمەتی خوای لێبێ کە لەو کاتەدا لەسەرمەرگدا بوو خەریکی ئەوەبوو دوا هەناسەی ژیانی دونیای دەدا و ماڵ و منداڵ و کەس و کاریشی لە دەوری کۆببونەوە بۆی دەگریان، لەو کاتەدا کە لە نێوانی ژیان و مردندا بوو، گوێی لە دەنگی بانگبێژی مزگەوت بوو –الله أكبر الله أكبر– بانگی دەکرد –حَيَّ على الصلاة، حَيَّ على الفلاح– بانگی نوێژی شێوان (مەغریب) بوو، بەڵێ کە گوێی لە بانگەکە بوو، فەرموی بەو کەسانەی کە لە چواردەوری بوون وەرنە ژێر باڵم و هەڵمسێنن و بمبەن بۆ مزگەوت با نوێژەکەم بە جەماعەت بکەم!! بە سەرسورمانەوە وتیان: بتبەین بۆ کوێ؟!! فەرمووی: بۆ مزگەوت! عەرزیان کرد: ئاخر بەم حاڵەوە چۆن دەتوانی بچیتە مزگەوت!! فەرمووی: سُبحان الله!!گوێم لە بانگبێژ بێ بانگم بکات بۆ نوێژ و وەڵامی نەدەمەوە؟! خێراکەن هەڵمسێنن و بمگەیەننە مزگەوت، بەڵێ چوونە ژێر باڵیەوە و بردیانە مزگەوت و یەك رکات نوێژی مەغریبی لەگەڵ ئیمام کردو، لە سوژدەدا بوو کە رۆحی دەرچوو مرد و گەیشتەوە بە لیقای خوا، بەڵێ مرد بەڵام لە چ حاڵەتێکدا لە سوژدەدا!! ئەو سوژدەیەی کە مرۆۆ تێیدا لە هەموو کاتێ زیاتر لە خوا نزیکە: (أقرَب مايَكونُ العَبدُ مِن رَبهِ وَهُو ساجِد).

دەی خوایە لێت دەپاڕێمەوە مردنێکی ئاوا جوانمان بەنسیب بکە، وە ئاوا دڵمان بە مزگەوتەوە پابەند بکە، آمین.

جۆری دووەم لە مردن پێغەمبەری خواﷺ بۆمان باس دەکات و بە ئاگامان دێنێتەوە و ئاگادارمان دەکاتەوە کە خۆمانی لێ بپارێزین ئەوەیە کە دەفەرموێ: (و مَن كَرِهَ لِقَاءَ اللّهِ، كَرِهَ اللّه لِقَاءَهُ)، هەرکەسێك حەز بە خزمەتی خوا نەکات و پێی ناخۆش بێ بمرێ چونکە دەگاتەوە بە لیقای خوا و دەشزانێ کە ئەوەندە سەرپێچی خواو دینی خوای کردوە کە، خوا لێی نارازیە، ئەوەش خوای گەورە حەز ناکات بەوەی کە ئەو عەبدەی خۆی پێی بگاتەوە!! خوای گەورە بمانپارێزێ.

پێشەوا –إبنُ القَیم– رەحمەتی خوای لێ بێت، بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: یەکێ لەوانەی لە سەرەمەگدا بوو، کەسێك بوو زۆر لە تاوان و خراپە و خوانەناسی دا ڕۆچوبو، دەگەڕا بە شوێن ئەو کارانەدا کە شەرع نەهی لێ کردون و خوای گەورە پێ تورە دەبێ لە بەندەی خۆی، بەڵام کاتێ مردنی هات و لەسەر جێگای مردن کەوت، کەس و کار و دۆستانی لە دەوری کۆبونەوە و ئەوانەی دیندار و خواناس بوون بەزەییان بە حاڵیدا دەهاتەوە کە ئاوا دەچێتەوە بۆ دیوانی خوا، بۆیە هەوڵیان لەگەڵ دەدا کە ناوی خوا بێنێ و شایەتمان (لآ إلـه إلا اللّه، محمد رَسول اللّه)یان لە لا دەگوت بە ئومێدی ئەوەی ئەویش بیڵێتەوە، بەڵام سُبحان اللە ئەوەی چاوەڕێی نەبوون ئەوە ڕویدا، ئەویش ئەوە بوو، ئەو کەسە کە لە کاتی ڕۆح دەرچونیدا بوو، بە هەموو هێزی خۆیەوە هاواری کرد: باشە وا وتیشم لا الە إلا اللە ، بەڵام دەزانم: (ما تنفعني لا إله إلا اللّه، و ما أعلَمُ أني صلَّيتُ للّه صلاة!!) وتی: خۆم دەزانم کە ئەگەر

بشڵێم لا إلە إلا اللّٰە هیچ سودم پێ ناگەیەنێت، چونکە من لە ژیانمدا سوژدەیەکم بۆ خوا نەبردوە و ڕۆژێك لە رۆژان نوێژێکم بۆ ئەو خوایە نەکردووە!.. ئەمجا زۆر بە ئازارەوە رۆحی دەرچو!..

دەی ئیمانداری بەڕێز، هەردوو حاڵەتەکە بێنە پێش چاوی خۆت، ئەمڕۆ لە دونیادای و دەتوانی دوای داواکردنی هیدایەت و دامەزراوی لە خوای گەورە، یەکێ لەو دوو مردنە هەڵبژێری کە باسمان کرد.

ئای چەند بەختەوەریە مرۆڤ بە زەردەخەنەوە بەدەم فریشتەکانەوە کە لەگەڵ ملك الموتدا، هاتون بۆ گیانکێشانی رۆحی دەرچێ، هەروەکو (محمد إقبال) رەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێ: یەکێ لە نیشانەکانی عاقیبەت خێری ئیماندار ئەوەیە کە لە کاتی رۆح دەرچوندا زەردەخەنە لەسەر لێوی بێ بەدەم فریشتەکانەوە.

مامۆستایەکی بەڕێز گێڕایەوە و فەرمووی: ساڵانی شەستەکان بوو، فەقێ بووم لە یەکێ لە گوندەکانی ئەم کوردستانە پڕ لە دین و عیلم و خواناسەدا، مامۆستای مُدرس ی مزگەوت و حوجرەکەمان لە ماڵ نەبوو، بۆیە یەك دوو کەسی ئاوایی هاتن بۆ حوجرەی فەقێکان و داوایان کرد کە یەکێ لە فەقێکان لەگەڵیان بچێ بۆ ماڵی فلان کەس کە خێزانەکەی ئافرەتێکی بەتەمەن بوو، وا لە سەرەمەرگدایە، ئەو مامۆستایە فەرمووی: من لەگەڵیان چووم و لە لای سەری پیرە ژنەکەوە دانیشتم و دەستم کرد بە خوێندنی سورەتی -یس- لەگەڵ تەواوبوونی سورەتەکەدا، ئەو ئافرەتە کە چەند رۆژ بوو لەسەر جێگا کەوتبوو، هیچ قسەیەکی نەکردبوو، سەری بەرز کردەوە و تەماشای لای دەرگای ژوورەکەی کرد و زەردەخەنەیەکی جوان هاتە سەر لێوەکانی و

فەرمووی: توخوا دەرگاکە بەربدەن و رێگەیان کەن بابێنە ژورەوە، یاخوا بەخێر بێن. فەرمووی: پەنجەی شایەتمانی بەرز کردەوە و بە زوبانێکی پاراو فەرمووی: (أشهد أن لآ إله إلا الله،و أشهد أنَ محمد رَسول الله) سەری کەوتە سەر سەرینەکەی و وەفاتی کرد!

موسڵمانی بە ئاگا و هۆشیار دونیا ناکات بە هەموو هیوا و ئامانجی و دونیا ناپەرستیٚ بەڵکو دەیکات بە کێڵگەیەك و چاکەی تێدا دەچێنیٚ بۆ ئەوەی لە قیامەتدا بەرهەمەکەی هەڵبگریٚ، لەبەر ئەوەی لە قورئانەوە تێگەیشتبوو کە ئەو کەسانەی دونیا هەموو ئاوات و خولیا و مەبەستێکیانە، ژیانێکی پڕ لە ژان و مردن و قیامەتێکی پڕ لە نەهامەت و ماڵوێرانی چاوەڕێیانە، وەکو دەفەرمویٚ:﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَـٰتِنَا غَـٰفِلُونَ ۝ أُوْلَـٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾ يونس:٧-٨

واتە: بە راستی ئەوانەی کە بە تەمای ئامادە بوونی بەر بارەگای ئێمە نین و باوەڕیان پێی نییە و رازی بوون بە ژیانی ئەم دونیایە و دڵنیا بوون پێی و دڵیان پێی خۆش بوو و ئەوانەش کە خۆیان غافڵ و بیٚ ئاگان لە ئایەت و نهێنی دروستکراوانی ئێمە سەرنجی نادەن و بیری لیٚ ناکەنەوە، ، ئا ئەوانە شوێن و جێگەیان ئاگرە بەهۆی ئەو کار و کردەوەی کە دەیانکرد.

بەڵیٚ ئیمانداران: هەر لەدوای ئەم ئایەتەوە راستەوخۆ قورئان سەرەنجامی خواناسان و دیندارانیشمان بۆ روون دەکاتەوە و دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُم بِإِيمَـٰنِهِمْ ۖ

تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ۞ دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ يونس: ٩-١٠.

**واتە: بە ڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کار و کردەوە چاکە کانیان ئەنجامداوە، پەروەردگاریان بە هۆی ئیمان و باوەڕی ڕێك و پێك و دامەزراویانەوە هیدایەت و ڕێنموییان دەکات بۆ ئەنجامدانی هەموو کار و کردەوەیەکی چاك، لەو جیهانیشدا لەناو بەهەشتە جۆراوجۆرە پڕ لە ناز و خەڵاتەکانی خوادا چەندەها ڕووبار بە بەردەمیاندا دەڕوات، جا لە بەهەشتدا دوعا و پاڕانەوەیان ئەمەیە: پەروەردگارا، پاکی و بێگەردی و ستایش شایستەی تۆیە ئەی خوای میهرەبان، چاکی و چۆنیشیان لەوێ سەلامکردنە، دواهەمین قسە و گوفتاریشیان دوای هەموو بەخششێك ئەوەیە کە: پڕ بە دڵ لە ناخی دەرونیانەوە بەڕاستی دەڵێن: الحَمدُ لله رَبَّ العالَمین.. سوپاس و ستایش هەر شایستەی خوایە و خوایە کە خاوەن و پەروەردگاری هەموو جیهانیان و هەموو بونەوەرە..**

**بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: هەر کەسێ لەم ژیانە کورتەی دونیادا هەر لە ئاو و نان خواردنێکەوە تا هەر خۆشییەکی مادی و مەعنەوی بە هی خوای زانی و سوپاس و ستایشی خوای لەسەر کرد، ئەوە دڵنیابێ إنشاء الله لە بەهەشتا خۆی دەبینێتەوە و لەوێشدا هەرچی خێر و خۆشیە ئەیچێژێ کە نە زوبان دەتوانێ باسی بکات و نە چاو بینویەتی و نە گوێ بیستویەتی و نە بە بیرکردنەوە و خەیاڵی هیچ کەسێکیشدا هاتووە، ئا لەو بەهەشتەدا ئەو زوبانەی هەر دەڵێ: الحَمدُ لله رَبَّ العالَمین.**

**ئیمانداران: مردن کۆتایی هاتن نییە بە ژیان، بەڵکو گواستنەوەیە لە قۆناغێکی ژیانەوە بۆ قۆناغێکی تر،لە ژیانی کۆتایی پێ هاتووەوە بۆ**

ژیانی هەتا هەتای، بۆ ژیانی راستەقینە کە مردنی بە شوێندا هاتووە، لەبەر ئەوەی مردن بە چەند قۆناغێکدا دەڕوات، پشتی باوك بۆ رەحمی دایك، پاشان دوای تەواو بوونی قۆناغی دروست بوون و ناوسکی دایك بۆ سەر دونیا و ئەم چەند رۆژ و ساڵەی سەر دونیا،دواتر بە مردن دەگوێزرێتەوە لەسەر زەوییەوە بۆ ژێر زەوی، بۆ باوەشی ئەو خاکەی کە یەکەمجار لێی دروست بوین،دوای قۆناغی ناو قەبریش کە پێی دەوترێ قۆناغی بەرزەخ، ئەمجا قیامەت دەست پێدەکات و دوا جێگای مرۆڤ دیاری دەکرێت،یان بەهەشت خوا بە نسیبمان بکات یان دۆزەخ خوا بمانپارێزێ.

بەڵێ مرۆڤ بە مردن بێئاگا نابێ، بەڵکو ئاگادارە بەوەی کە کێ دەیشوات، وە لە فەرمودەی پێغەمبەرداﷺ هاتووە کە مردوو گوێی لە خشپەی پێی ئەو کەسانەیە کە لە دەوروبەری گۆڕەکەی دێن و دەڕۆنو دەیشارنەوە، وە مرۆڤ لە گۆڕدا جگە لە پێغەمبەران و شەهیدان لاشەی شی دەبێتەوە و دەبێتەوە بە خۆڵ بەڵام سُبحان الله ئەصڵی ئەو مرۆڤە هەر دەمێنێتەوە کە ئێسکی کلێنچکەیە، هەروەکو چۆن دارتویەکی گەورە هەموو صیفاتەکانی و شێوە و پێکهاتنەکەی لە دەنکە تویەکی زۆر بچکۆلەدا کۆبۆتەوە و هەر ئەو دەنکە زۆر بچکۆلە دەڕوێتەوە و هەمان تووی یەکەم جاری لێ دروست دەبێتەوە و بەبێ فەوتان و لەناوچونی هیچ شتێك لەو دارتووە گەورەیە، مرۆڤیش بە هەمان شێوە هەموو صیفاتەکانی لە ئێسکی کلێنچکەدا دەمێنێتەوە و پاشان لەو ئێسکە بچکۆلەوە کە دەکەوێتە کۆتایی بڕبڕەی پشتەوە زیندو دەبێتەوە، هاوەڵی خۆشەویستی پێغەمبەری خواﷺ کە ئەبو هُوریرەیە، دەفەرموێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (ما بَینَ النَّفختَینِ أربعونَ،

قالَ: أربَعونَ يوماً؟! قال أبوهُرَيرة: أبيتُ، قال: شهراً؟! قال: أبيتُ، قالَ: سَنَةً؟! قال أبوهُرَيرة: أبيتُ..). واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە نێوان لێدانی نەفخی صوری یەکەم و دووەم چلە، کەسێك وتی: چل رۆژ؟ ابو هريره فەرمووی: نازانم، وتی: چل مانگ، فەرمووی: نازانم، وتی: چل سالْ؟! ابو هريره فەرمووی: نازانم و ناتوانم بڵێم کە پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەستی لە چل ساڵ بووە، یان چل مانگبوە، یان چل رۆژ بووە، ئەوەیان نازانم، بەڵام فەرمووی: نێوانیان چلە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ثُمَّ يُنَزِّلُ اللّه مِنَ السَّماءِ ماءً، فَيَنبتُون كما يُنبِتُ البَقلُ، ، لَيسَ مِنَ الأنسانِ شَيءُ إلا يبلي إلا عَظماً واحِداً و هو عَجبُ الذنَبِ،وَ مِنهُ يركب الخلق يومَ القيامَةِ). رواه البخاري.

واتە: پاشان خوای گەورە لە ئاسمانەوە ئاوێك دەنێرێتە خوارەوە (لە شەرحی عەقیدەی طەحاویدا دەفەرموێ: ئەو بارانە وەکو مەنی پیاو وایە) جا بەهۆی ئەو ئاوەوە هەموو زیندەوەران و مرۆڤ دەژێنەوە و دەڕوێنەوە چۆن کە پاقلە دەڕوێ و شین دەبێ، وە لە لاشەی مرۆڤدا هیچ شتێك نامێنێتەوە کە نەڕزێ و لەناو نەچێ، تەنها یەك ئێسك دەمێنێتەوە ئەویش ئێسکی کلێنچکەیە، کە لەو ئێسکەوە زیندەوەر دروست دەبێتەوە لە رۆژی دوایدا.

وە لە صەحیحی پێشەوا (موسلیم)دا. رەحمەتی خوای لێبێت، فەرموودەکە ئاوا هاتووە کە دەفەرموێ: (إنَ فيِ الأنسان عَظماً لا تأكلُه الأرضُ أبَداً فيهِ يركَبُ يَومَ القيامَةِ، قالوا: أي عظم هُوَ يارَسُوْلَ اللّه؟! قال: عَجبُ الذنَبِ).

واتە: بە ڕاستی لەناو لاشەی مرۆڤدا ئێسکێك هەیە کە زەوی نایخوات و نایڕزێنیٚ و ناپوکێتەوە و هەتا قیامەت دەمێنێتەوە، کە لە ڕۆژی قیامەتدا لەو ئێسکەوە دروست دەبێتەوە بە مرۆڤەکەی پێش مردنی، صەحابەکان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئایا ئەوە چ ئێسکێکە؟! فەرمووی: ئەوە ئێسکی کلێنچکەیە کە لە کۆتایی بڕبڕکانی پشتی مرۆڤدایە.

وە هەروەها لە (سُنن أبی داود) داهاتووە: (مِنهُ خُلِقَ وَفيهِ يُرَكَّبُ). واتە: مرۆڤ لەو ئێسکەوە دروست بووە و لەویشەوە جارێکی تر دوای لەناوچونی تەواوی لاشە زیندو دەبێتەوە و دروست دەبێتەوە..

لەم فەرمودە شیرین و پڕ لە زانستی زیندەوەر ناسیدا، کە پێغەمبەری خواﷺ کە لە کاتێکدا ئەمەی فەرمووە کە نەك هەر لەو زەمانەوە بەڵکو دوای هەزار و چوارسەد ساڵێك لەدوای ئەو فەرموودەیە ئەمجا زانایان ئەو ڕاستیەیان بۆ ئاشکرا بوو، کە ئەمەش وەکو سەدان فەرموودەی زانستی تر بەڵگەن لەسەر پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محمدﷺ کە: (ما يَنطِقُ عَنِ الهَوى إن هوَ إلا وحيٌ يُوحَى)، کە لێرەدا ئاماژە بۆ لایەنی زانستی ئەم فەرمودەیە دەکەم:

١- کۆرپەلە لە کلێنچکەوە دروست دەبیٚ.

٢- بەرگە گرتنی ئەم ئێسکە بچکۆلە کە بە ئەندازەی دەنکە نۆکێك دەبێت، بۆ گۆڕانکاریەکانی ناو گۆڕ و پوکانەوەی گۆشت و ئێسکی مرۆڤ، ئەم کلێنچکەیە وەکو دەنکە تۆوێك چەکەرە دەکات و زیندوو دەبێتەوە.

لە وڵاتی چین ئێسکی کلێنچکەی مرۆڤێکی مردوویان هێنا کە دەیان ساڵ بوو مردبوو وە تەواوی ئێسکی لاشەی پوکانبوونەوە تەنها ئەم

پارچە ئێسکە بچکۆلەیە مابۆوە هێنایان ویستیان لەناوی بەرن و ئەویش بپوکێننەوە، بۆیە:

١- لە رووی کیمیاییەوە لە بەهێزترین ترشی (Acids)یان هەڵکێشا، کە هیچ شتێك نییە خۆی بۆ بگرێ و نەیکوژێ و نەیسوتێنێ، بەڵام پاش چەند خولەکێك کە تەماشایان کرد بە ئامێری زۆر وردبینی تایبەت بەو لێکۆڵینەوەیە، بینییان هێشتا خانەکانی هەر زیندووە!!.

٢- ئەمجارەیان لە رووی فیزیاییەوە ویستیان ئەو ئێسکی کلێنچکەیە لەناو بەرن، بۆیە لە بەهێزترین فڕندا سوتاندیان، دواتر هاتن پانیان کردنەوە بە بەهێزترین ئامێر، بەڵام ئەمجارەش کە سەیریان کردەوە هێشتا خانەکانی هەر زیندوون!!

٣- پاشان خستیانە بەردەم مادەیەکی ناوکی تیشکدەر (ذرّة) کە لە رووی زانستییەوە دەڵێ ئەو تیشکی ناوکیە هەموو مادەیەکی زیندوو دەفەوتێنێ، بەڵام ئەمجارەش کە تەماشایان کرد، بینییان هێشتا زیندووە!!

بەڵێ وەکو وتمان ئەوەش بەڵگەی زانستی و راستی حاشا هەڵنەگر لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار، کە جیهان لەو سەردەمەدا ئەو جۆرە قسانە و ئامازە زانستیانە، وەکو ئەفسانە و خەوبینین وابوون بەلایانەوە، وە دوای سەدان ساڵ ئەمجا زانستی کۆرپەلە ناسی و زیندەوەر ناسی ئەم حەقیقەتە زانستیانەی دۆزیەوە و بە فەخرەوە بە جیهاندا بڵاو کرایەوە، بەڵام داخی گرانم لەو کاتەدا مەگەر دەگمەن ئەگینا پسپۆڕێکی موسڵمان ئەوەی نەدا بە گوێی زانایانی ئەوروپیدا کە ئەوەی ئێوە زۆر بە هەوڵ و تێکۆشان و لەناو تاقیگەدا دوای چەند ساڵ دۆزیتانەوە، پێغەمبەری ئێمە لە یەك

فەرمموودەی کورت و پوختدا رونی کردۆتەوە بە شێوەیەکی وا کە هەم زانا و هەم نەزان، هەم گەنج و لاو هەم پیر و ئیختیار تێی بگەن.کەواتە: مرۆڤ بە مردن کۆتایی پێ نایەت و لاشەی بە تەواوی نافەوتێ و ئەصلْ و بنەرەتییەکەی  کە سەرەتا لێی پێك هاتووە هەر دەمێنێ، بۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ دەفەرموێ: لەبەر حورمەتی مرۆڤ کە بە مردن ژیانی کۆتایی پێ نایەت دەبێ مردوو لە لایەن زیندوانەوە ئەمانەی بۆ جێبەجێ بکرێت، وەکو دەفەرموێ: إذا ماتَ أحَدُكُم: ئەگەر کەسێك لە ئێوە مرد با ئەم شتانەی بۆ بکرێ:

١- فأحسنوا كَفَنَهُ، پۆشاکێکی جوان و پاك و خاوێن کە چاکتر وایە رەنگی سپی بێ بۆی بکەن بە کفن

٢- وَ عَجِّلوا إنجازَ وَصيته: وە بە زوترین کات وەصیەت و راسپاردەکانی جێ بە جێ بکەن.

٣- و اعمَقوا لهُ فِي قَبرِه: وە قەبرەکەی بۆ قولْ بکەن تاوەکو بۆنی نەیەتە دەرەوە و دڕندە نەیخوات و دەری نەهێنێتەوە، ئەم شاردنەوەی مردوەش هەر لەو کاتەوە پەیدا بوو کە یەکەم مرۆڤ لەسەر زەویدا مرد، کە کوڕە چاك و پاك و گوێڕایەڵەکەی ئادەم بوو کە بە دەستی برا لاسار و بێ رەحمەکەیەوە کوژرا، ئەمجا نەیدەزانی چی لە تەرمی برا مەزڵومە کوژراوەکەی بکات، تا ئەو کاتەی کە قەلەڕەشێك هات و چاڵێکی بۆ قەلە ڕەشێکی تری مردارەوە بوو هەڵکەند و گڵی بەسەردا کرد و شاردیەوە، ئەمجا برا پیاو کوژەکە فێر بوو چۆن قەبر بۆ براکەی هەڵکەنێ و بیشارێتەوە، هەروەکو قورئانی پیرۆز ئەو باسەمان بۆ

دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ﴾ المائده:٣١

واتە: کاتێ کوڕە بەدکارەکەی ئادەم بە ناحەق و ناڕەوا برا بەڕێز و هێمنەکەی خۆی کوشت، پاشان گیری خوارد بە دەست تەرمەکەیەوە، چونکە وادیارە یەکەم کەسە کوژرابێت و شەهید بوبێت ئەوسا خوای میهرەبان قەلە ڕەشێکی نارد و چاڵێکی لە زەویدا هەڵکەند بۆ قەلە ڕەشێکی تری مردارەوەوە بوو، تا نیشانی بدات چۆن لاشەی براکەی بشارێتەوە، جا ئەو خوێن ڕێژە کە ئەوەی بینی وتی: هاوار لە من، ئایا ئەوە من نەمتوانی وەکو ئەو قەلەڕەشە بکەم و بەقەدەر ئەوم لێ نەهات تا لاشە و عەیب و عاری براکەم بشارمەوە ئیتر بۆ هەمیشە چووە ریزی پەشیمانانەوە.... ئیتر هەر لەو کاتەوە خوای گەورە مرۆڤی فێرکرد کە نابێ لاشەی مردوو بسوتێندرێ وەکو بوزی و هیندۆسەکان وادەکەن، وە مرۆڤ دەکرێتە ناو قەبرەوە، تا ئەو قەبرە نیشانە بێت کە ئەم خاکە مرۆڤی تیا نێژراوە، بۆیە نابێ بێڕێزی بەرامبەر بکرێ، تەنانەت دروست نییە لەسەر گۆڕی هیچ کەسێك دابنیشی، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (لأن يَجلِسَ أحَدُكم على جَمرة، فتُحرِقَ ثِيابهُ، فتُخلَصَ إلى جِلدِهِ خَيرٌ لهُ مِن أن يَجلِسَ على قَبرٍ) رواه مسلم، واتە: ئەگەر بێت و یەکێك لە ئێوە لەسەر پشکۆیەك ئاگر دابنیشێ و جل و بەرگەکەی بسوتێنێ و پاشان بگاتە سەر پێستەکەی و لاشەی داخ بکات، هێشتا ئەوە باشترە بۆی لەوەی لەسەر گۆڕی مردوویەك دابنیشێ!!

وە لە ئیسلامدا مرۆڤ بە مردوویش بەڕێزە و نابێ ئەگەر دوای چەندین ساڵیش ئێسقانێکی لە گۆڕێکەوە دەرکەوت بە هۆی داروخانی گۆڕەکەوە، ئەوا دەبێ ئەو ئێسکانە بخرێتە تورەکەیەکەوە و لە شوێنێکی تر بە خاك بسپێرێن، وە نابێ ئێسکی مردوو بشکێنرێ هەروەکو پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: (كَسرُ عَظم المَيّتِ كَكَسرِهِ حَياً) رواه ابو داود، واتە: شکاندنی ئێسکی مردوو، وەکو ئەوە تاوانی هەیە کە ئەو ئێسقانەی ئەوکەسە بە زیندویی لە کاتی ژیانیدا بە ناڕەوا بشکێنرێ!!

بەڕاستی ئەمە تەنها و تەنها لە ئیسلامدا هەیە و ئیسلامێك ئاوا ڕێز لە گۆڕی مردوویەك لە ئێسقانێك کە کەس نازانێت ناوی مرۆڤەکە کامەیە کە ئەم ئێسکە لە گۆڕەکەیدایە، ئەگەر ڕێز لەو مردووە و ئەندامی لاشەی ئەو مردووە ئاوا بگرێ، ئیتر ئەبێ چۆن ڕێزێك و مافێك بە زیندوو ببەخشێ؟!

٤- پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (و جنِّبوهُ جارَ السُوء) قيل يا رسول الله وَ هَل يَنفَعُ الجارُ الصالِحُ فِي الآخرِةِ؟! قالَ: هَل ينفَعُ فِي الدنيا؟ قالَ: نَعَم، قالَ: كذالِكَ ينفَعُ فِي الآخرةِ)

واتە: مردووەکەتان بپارێزن لە دراوسێی خراپەکار، واتە: لە تەنیشت مردویەکەوە مەینێژن کە لە ژیانیدا بە خوانەناس و بەدکار ناسراوە و لەلایەن موسڵمانانەوە نەفرەتی لێ کراوە هاوەڵان عەرزی پێغەمبەری خوایانﷺ کرد کە ئایا دراوسێی چاك لە دواڕۆژدا – لەگۆڕدا–سود بە هاوەڵەکەی تەنیشتی دەگەیەنێت کە لە لایەوە نێژراوە؟! پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئایا ئەگەر لە دونیادا کەسێك دراوسێیەکی خواناس و ڕەوشتبەرزی هەبێ پێی خۆشحاڵ نابێ و پێی

دڵئارام و ئاسودە نابیٚ؟! وتیان: بەڵیٚ سودی لیٚ دەبینیٚ و هیچ شتیٚ لە دراوسێی ڕێکوپێك باشتر نیە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دەی ئاواش لە گۆڕدا دراوسێی چاك سودی بۆ دراوسیٚ گۆڕەکەی هەیە، وە چەند بەسەر هاتمان هەیە کە مردوو هەبووە هاتۆتە خەونی پیاوچاکێکەوە و وتویەتی: بە عەزابی ئەو دراوسیٚ قەبرەم نارەحەتم و منیش توشی ئازار هاتووم!

وە لە خەودا منالّی ساوای بیٚ گوناه بینراوە کە هەموو سەری سپی بووە، دایکەکەی یان باوکەکەی لێی پرسیوە رۆڵە بە هۆی چییەوە ئاوا سەرت سپی بووە؟ منالّەکە وتویەتی: بەهۆی ئەو دراوسیٚ گۆڕەم کە سزای لەسەرە ئاوا منیش لە ترسانا هەموو سەرم سپی بووە، کەواتە نابیٚ خەڵکی دژ بە دین و هەڵگەڕاوە لە ئیسلام، لە گۆڕستانی موسڵمانان بنێژرێن، بۆ ئەوەی نەبنە مایەی ئازار بۆ ئەهلی ئەو گۆڕستانە.

بەڵیٚ کاتیٚ کە مردوو خرایە قەبرەوە، وا چاکە هەموو خەڵکەکە بەجێی نەهێڵن، بەڵکو هەندیٚ لە خۆشەویستانی، لەوانەی کە زۆر خواناس و پابەندن بە ئیسلامەوە و دەم بەزیکر و یادی خوا و صەڵاواتن، لە لای گۆڕەکەی بمێننەوە و بەردەوام دوعای بۆ بکەن، بڵێن: خوایەگیان ئەمە میوانی تۆیە، خوایە رێزی بگرە، خوایە بێکەسە، خوایە رەحمی پیٚ بکە، خوایە ئەگەر ئەو مردوەش رەحمی بە خۆی نەکردووە تۆ رەحمی پیٚ بکە، چونکە تۆ خوایەکی رەحمان و رەحیمی.

جارێکیان پێغەمبەری خواﷺ لەسەر ناشتنی جەنازەیەك ئامادە بوو، کاتێ خەڵکەکە بڵاوەیان لێکرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (سَلوا اللّهَ لأخيكُمُ التُّبات فأنَّه الانَ يسألُ)، واتە: داوای راگیر بوون بۆ براکەتان بکەن، چونکە ئێستا پرسیاری لێ دەکرێ.

وە هەروەها نابێ قەبر خانووی لەسەر بکرێ یان قەفەزی ئاسنی بخرێتە سەر لەبەر ئەم فەرمودەیە: (نَهى رَسول اللهﷺ أن يُجَصِّصَ القَبرُ و أن يقعَدَ عَلَيه، و أن يُبنى عليه). رواه مسلم، واتە: پێغەمبەری خواﷺ نەهی کردووە لەوەی کە قەبر گەچ و چیمەنتۆی بۆ بەکاربێ، وە نەهی کردوە لەوەی کە لەسەر گۆڕەکان دابنیشرێ، وە نەهی لەوە کردووە کە وا خانوو چەتری لەسەر بکرێ وە لە ریواتەکەی ئیمام (ترمذي) دا دەفەرموێ: وأن يكتب عليها. وە نەهی لەوە کردووە کە لەسەر گۆڕ شت بنوسرێ،... کە بە داخەوە ئەمڕۆ هەموو ئەوانەی کە پێغەمبەری خواﷺ نەهی لێ کردوون لەسەر گۆڕی گۆڕستانەکان دەبینرێ و تەنانەت هەندێ قەبر هەیە کارەبا و تەلەفۆن و هەموو پێداویستیەکانی ژیانی تێدادانراوە کە لە زۆربەی ماڵاندا نییە...

وە شیعر و شانامە لەسەر گۆڕەکان دەنوسرێ و خەڵکی کە دەچنە سەردانی گۆڕی کەسەکەی خۆی، دەبێت سەرەتا دەست بکات بە خوێندنەوەی ژیاننامە و شیعر، لەجیاتی بیرکردنەوە لە مردن و ئەوەی کە ئەوەش رۆژێك چارەنوس و ماڵی ئەو دەبێت، ئەگەر بە نسیبی ببێت!...

بەڵام دانانی کێلی قەبر شتێکی باشە و ڕێگە پێدراوە، ئەوە بوو کە کاتیٚ (عثمان بن مَظعون) کە برای شیری پێغەمبەر بوو وەفاتی کرد، پێغەمبەری خواﷺ، دوای ناشتنی و بەخاك سپاردنی بەردێکی درێژی گەورەی هێنا و لە لای سەریەوە چەقاندی، عەرزیان کرد ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئایا ئەم کێلی قەبرە هیچ سوود بە مردوو دەگەیەنێت؟ فەرمووی: نەخێر، بەڵام بۆیە ئەو بەردە تایبەتەم دیاری کرد، هەتاوەکو: (اتعلَّمُ بِها قَبرَ أخي عُثمان). بۆ ئەوەی کە گۆڕی براکەم کە عوسمانە بە هۆی ئەم بەردە درێژەوە بناسمەوە. جا کەواتە لەمڕۆدا دروستە ئەگر قەبر بەردێکی بەرز و تایبەتی لەسەر دابنریٚ، لەلای سەری مردووەکەوە و ناوی مردووەکەی لەسەر بنوسریٚ، بۆ ئەوەی لە کاتی سەردانیدا کەسو کاری بیناسنەوە، بەڵام لەوەشدا زیادە ڕەوی نەکریٚ، چونکە گۆڕستان جێگای خۆنواندن و کەشوفشی دنیا نییە ، بەڵکو جێگای بە ئاگا هاتنەوەیە، لەبەر ئەودی ئەوانەی لە گۆڕەکاندان بە ئاگا هاتونەتەوە و حەقیقەتیان بە چاوی سەریان بینیوە، (الناسُ نِيامُ فَإذا ماتوا إنتبَهوا) خەڵکی خەوتون ئەگەر مردن ئەوجا بە ئاگادێن، بە داخەوە دڵەکان وا ڕەق بوون تەنانەت وامان لیٚ هاتووە شانازی بەوەشەوە دەکەین کە گۆڕی مردووەکانمان لە گۆڕی مردووی خەڵکی تر ڕازاوەترە و بەرچاوتر و سەرنج ڕاکێشتر بیٚ، وەکو ئەوەی کە لە خانوو ماڵ و دوکانەکانماندا حەزمان پێیەتی، لە کاتێکدا گەورەیی و بەرزی مردوو لەوەدایە کە ناو قەبرەکەی ڕازاوە و جوانبیٚ، ئای چەند گۆڕ

هەیە، ناوەوەی تاریکە و شیوی جەهەنەمە بۆ خاوەنەکەی کە لە ناویایەتی و هاواری جنۆکە و مرۆڤ نەبێ هەموو زیندەوەرێك دەیبیستێ، ئاژەڵەکان، مەڕ ومالات و ئەسپ و وڵاخی سواری دەسڵەمێتەوە کاتێ دەگاتە نزیك ئەو گۆڕە پڕ لە عەزاب و ئەشکەنجە و ئازارانە و پێغەمبەری خوا ﷺ هەمووی لە فەرموودەکانیدا بۆ روون کردوینەتەوە، کەچی سەیر دەکەی سەرەوەی خانوی لەسەرە و کورسی بەدەورەوە دانراوە و دەیان چەپکە گوڵی رازاوەی دەخرێتە سەر و رووناك دەکرێتەوە، بەڵام مردووەکەی ناوی ئەگەر دەنگی بگەیشتایە ئەو کەسانەی کە ئاوای بۆدەکەن، تەنها ئەوەندەی پێ دەوتن: ئەوە هێشتا ئێوەش بە ئاگا نەهاتونەتەوە و چاوتان پەردەی رەشی لەسەرە و نازانن حاڵی من چۆنە، منماڵوێرانبووم، چی سودم پێ دەگەیەنێ تازە چ روناکیەکی سەر گۆڕەکەم سودی هەیە کە خۆم لە ژیانی دونیادا روناکیم بۆ ناو قەبرە تاریکەکەی خۆم ئامادە نەکرد؟! گوڵ و چەپکە گوڵ چی لێبکەم کە دەیخەنە سەر گۆڕەکەم لە کاتێکدا من کارێکی وام نەکرد ناو قەبرەکەم وەکو ئەو خەڵکە خواناس و کردار جوانە بکەم بە گوڵستان! بڕۆن واز لە من بێنن خەریکی خۆتان بن و فریای خۆتان بکەون.

ئیماندارانی بەڕێز: دڵنیابن کە مرۆڤ بە مردن لە ژیانی دونیا دانابڕێ و ئاگادارە بە حاڵی دەوروبەری، بە بەڵگەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ فێرمان دەکات کە کاتێ بە لای گۆڕستاندا رۆشتین سەلامی لێ بکەین، سەلام لە مردوانی ئەو گۆڕستانە بکەین، دیارە سەلامیش لە دار و

بەرد ناکرێت، بەڵکو لە شتێك دەکرێ کە وەڵامی سەلام بداتەوە و پێی دڵخۆش بێت، کە ئەویش مردووی ناو گۆڕەکانن، کە زۆربەی موسڵمانان ئەم سونەتە گەورەیەی پێغەمبەری خواﷺ کە سەلامکردنە لە کاتی چونە سەرقەبران یان تێپەڕبوون بەلای گۆڕستاندا، وەکو خۆی جێبەجێ ناکەن و زۆرجار هەر سەلامەکەش ناکەن لە کاتێکدا چەند وشەیەکی زۆر ناسك و جوانە و ئاسان لەبەر دەکرێ، کە پێغەمبەری خواﷺ فێرمان دەکات و دەفەرموێ:کە چوویتە سەردانی گۆڕی مردوەکەت، یان بە لای گۆڕستاندا تێپەڕی بڵێ: (السَلامُ عَلَيكُم، أهلَ الدِّيارِ مِنَ الْمُؤمِنِين و الْمُسلِمِينَ و إنا إنشاءَ الله بكُم لاحِقُونَ، أسألُ الله لنا و لكُمُ العافِية) رواه مسلم. وە بزانن ڕەحمەتی خواتان لێ بێت، کە سەرە خۆشی کردن لەو کەسەی کەسێکی نزیك و خۆشەویستی مردووە، سونەتە و لابردنی هەندێك لە غەم و پەژارەی سەر دڵی بەوشەیەکی جوان و دوعا و پاڕانەوەیەکی شەرعیانە، پاداشتی خوایت بە نسیب دەکات إنشاء الله.

وە پرسە و سەرەخۆشی ئەگەر نەکرێ بە مایەی نارەحەت کردنی کەس و کاری مردوو، لە جیاتی لابردنی غەم لەسەر دڵی، غەمی نەخەیتە سەر دڵ بە مانەوە لەلای و نانخواردن لە ماڵی لەجیاتی نان بۆ ئامادەکردنی، ئەوە تاوەکو ماوەی سێشەو و ڕۆژ بۆ کەس و کاری نزیکی دروستە، وە بۆ ئافرەتی مێرد مردوو تا چوارمانگ و دەشەو دەبێ تەعزیە باری پێوە دیار بێ، وە درێژکردنەوەی تازیە باری لەوە زیاتر ناشەرعی و حەرامە.

وە ئەو کەسانەی کە سەرەخۆشی لە کەس و کاری مردوو دەکەن، ئەگەر مردوەکە موسڵمان بوو ئەوا دوعا و پاڕانەوە بۆ مردووەکە و بۆ کەس و کارەکەی دەکات، چونکە سەرەخۆشی دوو بەشە: بەشێکی بۆ زیندوەکەیە، بەشێکی دوعا بۆ مردوەکەیە، جا ئەگەر مردوەکە موسڵمان بوو، ئەوا دەڵێی: (أعظَمَ اللّه أجرَك و أحسَنَ عَزاءكَ، بەڵام ناڵێی و غَفَرَ لِمَيّتكَ)..

لە کۆتایدا دەڵێم: ئەی ئەو کەسانەی کە دژ بە ئیسلامن و بەم ئیسلامە جوانە رازی نین. باشە غەیری ئیسلام چیتان پێیە بۆ مرۆڤایەتی؟! باشە خۆ ئەگەر چاکەیەکیش بکەن لە ژیاندا هەر ئەوەیە کە ئیسلام فەرمانی پێ کردووە و پاداشتی دونیا و قیامەتی بۆ داناوە، وە تەنانەت ئەگەر ئیسلام نەبێ نازانن مردوەکانیشتان چۆن بشارنەوە. لە کوڕە لاسارەکەی ئادەم خراپترتان بەسەر دێت!! باشە بۆ رووناکەنە مزگەوت و بە قاچەکانی خۆتان رێگای مزگەوت و ماڵی خوا ناگرنە بەر، پێش ئەوەی لەناو دارەمەیتدا بەسەر شانی خەڵکەوە بتانهێنن بۆ مزگەوت.

دەبا هەموومان تەوبەیەکی راستەقینە بکەین و بگەڕێینەوە بۆ لای خوای خالیقمان، خوایەك کە ژیان و مردن هەر بە دەستی ئەوە، هەموشمان دەچینەوە بەر قاپی ئەو: (إنا للّه و إنا إلهِ راجعون) سوێند بە خوا دوای مردن یەکسەر زیندوو دەبینەوە و پاداشت و سزای هەموو کردەوەیەکی جوان و ناشرین بە چاوی خۆمان دەبینین، هەروەکو چۆن خواو پێغەمبەرەکەی پێیان راگەیاندووین، خوی گەورە بە رەحمی خۆی رەحم بە ئێمە و مردووەکانمان بکات. اللّهم آمین

**سەرچاوەکان:**

١. قورئانی پیرۆز
٢. تەفسیری ئاسان – بورهان محمد أمين
٣. الموسوعة الذهبية – د.محمد عبدالرحمان العريفي ج١ ص٤٩٠
٤. بەڵگە ئاشکراکان – د. کاوە فرج سعدون ل١٢٠، ل١٣٠

# وتـاری دووم بۆ مانگی جمادي الاولی

## جاسوسی کردن

الحمدُ للّهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمعِينَ.

ئیمانداران: ئیسلام ئەو ئاینە تێر و تەواوەتەی خوای پەروەردگارە کە هەموو بوارێکی ژیانی مرۆڤی گرتۆتەوە و هیچ بوارێك نییە لە ژیاندا کە ئیسلام باسی نەکردبی، بۆیە ئیسلام ئاینێکە، پەیڕەوێکە کە مرۆڤ تەنها و تەنها لەژێر سایەی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی ئەودا بەختەوەر دەبی. (اليَوم أكمَلتُ لَكُم دينكم و أتممتُ عَلَيكُم نِعمَتي و رضيتُ لكُمُ الأسلام ديناً)..

بەڕێزان: ئیسلام فێرمان دەکات کە خۆمان لە ئیشی خەڵکی هەڵنەقورتێنین، وە زیاتر بە خۆمانەوە خەریك بین، نەچینە ناو ژیانی تایبەتی خێزانی خەڵکیەوە، هاوەڵی بەڕێز ئەبی سەعیدی خودری، دەفەرموێ: پیاوێك لە پێغەمبەری خوای پرسی: أيُ الناسِ أفضَلُ يا رسولَ الله؟ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چ کەسێك لە هەموو کەس باشترە؟ قال: مؤمِن يُجاهدُ بِنَفسه و ماله في سبيلِ الله. فەرمووی: ئیماندارێك کە تێبکۆشێ لە پێناوی خوادا بە گیان و بە ماڵی خۆی، ڕۆح و ماڵی خۆی بەقوربانی خوا و دینی ئیسلام بکات، قالَ ثُمَ مَن، کابرا وتی: ئەی لەدوای ئەو کێ زۆر باش و بەڕێزە؟ قال: ثُمَّ رجلُ مُعتَزِلُ في شعبِ من الشَّعاب يعبُدُ رَبّه فەرمووی: پاشان کەسێك کە کەنارگیرە لە شیوێك لە

شیوەکاندا بە دڵسۆزی و پاکی بەندایەتی خوای خۆی دەکات، لە ڕیوایەتێکدا فەرمووی: (یتقي اللّه و یَدَعُ الناسَ مِن شَرِّهِ).

واتە: تەقوای خوا دەکات و خەڵکی لە خراپەی پارێزراون، ئەم فەرموودەیە هەردوو پێشەوای فەرموودە ناس -بوخاری و موسلیم- ڕەحمەتی خوایان لێبێ- گێڕاویانەتەوە، لە فەرموودەیەکی تردا کە بوخاری لە ئەبی سەعیدی خودری یەوە گێڕاویەتیەوە، فەرمووی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: یُوشِكُ أن یَكونَ خَیرَ مالِ المُسلِم غَنَمُ یَتَّبِعُ بها شَعَفَ الجِبالِ وَمَواقِع القَطرِ یَفِرُ بدِینهِ مِنَ الفِتَنِ.

واتە: نزیکە ئەو کات و زەمانە بێتە پێشەوە کە باشترین ماڵ و سامانی موسڵمان بریتیبێ لە پارچە مەڕێك کە لادۆڵ و قەدپاڵی چیاکان و سەرچاوەی ئاوەکان و کوێستانەکان بیانلەوەڕێنێ و دین و ئیمانەکەی لە فیتنەی لەناوچونی ئیمان ڕزگار بکات.

بەڵێ، ئیماندار کاتێ کەنارگیریشە هەر خێری بۆ کۆمەڵگاکەی هەیە، ئەوەتا لە فەرموودەکەدا نافەرموێ دادەنیشێ بەدەستەوسانی، بەڵکو دەفەرموێ:مەڕ بەخێودەکات و بەرهەم پێشکەش بە کۆمەڵگا دەکات،بەڵام ئیمانەکەی سەلامەتە، ئایا مرۆڤ بە چی سەلامەت دەبێت لە بەڵای دونیا و خەسارەتمەندی قیامەت، وەڵامی ئەم پرسیارە لە پێغەمبەری خواﷺ وەردەگرین، کە کاتێ عوقبەی کوڕی عامر لە پێغەمبەری خواﷺی پرسی: یا رَسولَ الله ما النجاة؟ ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ڕزگاری لەچیدایە؟ پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (أمسِك عَلَیكَ لِسانَكَ وَ لِیَسَعَكَ بَیتُكَ، وأبْكِ علیٰ خَطیئَتِكَ). رواهُ الترمذي و قال: حَديث حَسَن.

واتە: ئەگەر دەتەوێ لە بەڵاو موصیبەتی دونیا پارێزراو بیت، ئیمانت سەلامەت بێ و لە قیامەتدا ڕزگار و سەلامەت بیت ئەوا: زمانت بگرە و ئاگاداری بەو لە چاکەدا نەبێ بەکاری مەهێنە، وە لەناو ماڵ و شوێنی حەوانەوەی خۆت دابنیشە و بەبێ بونی ئیشێك یان بۆ کار و کەسابەت نەبی لە ماڵ مەچۆ دەرەوە، وە بەسەر گوناهەکانی خۆشتدا بگری و تەماشای گوناه و عەیب و کەموکوڕی خەڵکی مەکە..

بەڵام دەبێ کە ئەم فەرموودانە ئەخوێنینەوە ئاگاداری ئەوەش بین کە ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ کە ئینسانی موسڵمان هیچ پەیوەندییەکی بەسەر کۆمەڵگاوە نەبی، نەخێر، بەڵکو دەفەرموێ: (المؤمِنُ الذي يُخالِطُ الناس و يصبر عَلى آذاهُم خَيرَ مِن المؤمِنُ الذي لَم يُخالِطِ الناس و لَم يصبر عَلى آذاهُم) واتە:ئەو ئیماندارەی کە تکەڵاوی خەڵکی دەبێ و لەسەر ئەو نارەحەتیانەی کە لە لایەن خەڵکیەوە لەو تێکەڵاویە توشی دەبێ ئارام دەگرێ، لەو کەسە باشترە، لەو ئیماندارەی کە تێکەڵاوی خەڵکی نابێ و گۆشەگیرە و ناتوانێ ئارام بگرێ لەسەر ئەو وشە ڕوشێنەرانە و کردەوە دڵ ئازاردەرانەی کە لە خەڵکیەوە ئاراستەی دەکرێن لە کاتی تێکەڵاوبوونیاندا.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکی تردا ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرموێ: (مَن لَم يَهتَم بأمرِ المسلمينَ فليسَ مِنهُم) ئەو کەسەی کە گوێ نەدات بە کار و باری موسڵمانان، ئەوە لە موسڵمانان ناژمێردرێ.

وە فەرموویەتی ﷺ: (لا يؤمِنُ أحدكُم حَتى يُحِبَّ لأخيهِ ما يُحِبُ لِنَفسِهِ) واتە: هیچ یەکێك لە ئێوە ئیمان و بڕواکەی تەواو نابێ هەتاوەکو ئەو کاتەی کە دڵ و دەرونی وای لێ دێ ئەوەی بۆ برای موسڵمانی پێ

خۆش بێ و بە بینینی دڵشاد ببێ کە بۆخۆی ئاواتی بۆ دەخوازێ و بە بونی دڵ و دەرونی ئاسودە دەبێ، کەواتە: ئیسلام پێمان دەڵێ کە تۆی ئیماندار نابێ تەداخولی ئیشی خەڵك بکەی، وە نابێ بێدەنگیش بی بەرامبەر بەو شتانەی کە زەرەر لە کۆمەڵگای موسڵمانان دەدات، کە هەر ئەمەشە مەدەنیەت و پێشکەوتنە مادی و دونیاییەکەی ئەوروپا و ڕۆژئاوا کە لە ئیسلامەکەی خۆمان وەرگیراوە و کاریان پێ کردووە، بەڵام بەداخەوە زۆربەی موسڵمانان لە وڵاتی موسڵماندا بە پێچەوانەکەی ڕەفتار دەکەن، کە هەر ئەمەش خاڵی بنچینەییە لە دواکەوتنمان.

ئیمانداران: یەکێ لەو شتانەی کە ئاینی ئیسلام داوای لە موسڵمانان کردوە خۆی لێ بپارێزن لە ڕیزی ئەو زنجیرە تاوانانە ناوی هێناون کە گوناهی گەورەن و چاکەکانی مرۆڤی موسڵمان لەناو دەبەن و مایە پوچی ڕۆژی دوایی دەکەن، جاسوسی کردنە، هەروەکو خوای گەورە لە سورەتی –الحُجرات– ئایەتی ١٢ دا دەفەرموێ:﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ﴾

لە تەفسیری (ڕامان)دا ئاوا مانای کردووە و دەفەرموێ: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە خۆتان لە زۆرێك لە گومانبردن بە یەکتر دوربگرن، چونکە هەندێ لەو گومانانە مایەی گوناه و دوچار بوونتانە لای خوا...عبداللە ی کوڕی عەمر دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ تەوافی کەعبەی کرد و ئەیفەرموو: (ما أطيَبَكِ و أطيَبَ ريحكِ، ما أعظمَكِ و

أعظَمَ حرمتكِ!، والذي نَفسُ محمد بيدِهِ لَحُرمَةُ المؤمِن أعظَم عند اللّه حُرمَةً مِنك، مالهُ و دَمُهُ، وأن تظنَّ بِهِ إلّاخيراً) رواه إبن ماجة.

واتە: ئەی کەعبەی پیرۆز چەندە پاکیت و چەند بۆنت خۆشە چەند گەورە و خاوەن حورمەتی، بەو زاتەی کە گیانی محمدی بە دەستە، حورمەت و ڕێزی مرۆڤی بروادار لای خوا لە تۆ گەورەترە و ماڵ و دارایی و خوێنی خاوەن حورمەتە، وە هەردەم دەبێ چاوەڕوانی خێری لێ بکەین.. (و لاتجسسوا) وە بە دوای عەیب و عار و کەم و کوڕتی یەکتردا مەگەڕێن و چاوە چاو مەکەن، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (إياكُم و الظَنَّ فأنَ الظَنَّ أكذبُ الحديثِ، و لا تجسَّسوا، ولا تَحسَّسوا و لا تنافَسوا و لاّ تحاسدوا، و لاّتَبا غضوا، و لاّتَدابَروا، و كونوا عِبادَ اللّهِ إخواناً) رواه البخاري.

واتە: وشیار بن و بە ئاگا بن لە گومان بردنی خراپ و ناڕەوا بە یەکتر، چونکە گومانی خراپ لە هەموو قسەیەك درۆترە، وە سیخوڕی و جاسوسی بەسەر یەکترەوە مەکەن، وە لە کەمیندا مەبن بۆ دۆزینەوەی کەمو کورتی یەکتر، وە ململانەی نابەجێ لەسەر دونیا و ماڵ و سامانی دونیا مەکەن کە واتان لێ بکات بکەونە حەرامەوە، وە حەسودی بە یەکتر مەبەن و ڕق و قین لە دڵ و دەرونتاندا بەرامبەر بە یەکتر کۆمەکەنەوە، پشت لە یەکتر مەکەن، بەڵکو بەندەی خوا بن و خوا بە حەق بناسن و برای دڵسۆز و ڕاستەقینەی یەکتر بن، (ولا يَغتَب بعضُكُم بَعضاً) وە لە پاشملە ناوی یەکتر بە خراپە مەبەن و غەیبەتی یەکتر مەکەن، (أيُحِبُّ أحدُكم أن يأكلَ لَحمَ أخيهِ مَيتاً فكَرِهتُموهُ) ئایا کەستان پێی خۆشە گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوات؟! –دیارە ئەمە ئەوپەڕی ناشرین کردنی ئەو کارەیە تا مرۆڤەکان سڵی لێ بکەنەوە و نەیکەن – ئاشکرایە کە ئەوەتان زۆر

پێ ناخۆشەو حەزی لێ ناکەن و نایخۆن، (وأتقوا الله) لە خوا بترسن و سنورەکانی مەشکێنن، (إِنَّ اللهَ تَوابٌ رَحيم)، بێ گومان خوا زۆر لێبوردەیە بۆ هەر کەسێك پەشیمان بێتەوە لەو کارە ناشرینانەی کە کردوویەتی، زۆریش میهرەبانە لەگەڵ بەندەکانی خۆیدا...

جا پشتیوان بە خوا لەم وتارەدا زیاتر تیشك دەخەینە سەر جاسوسی کردن، وە لەو فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ کە خوێندمانەوە فەرمووی: (ولا تَجَسَسوا ولا تَحَسسوا) ئایا جیاوازی لە نێوانیاندا چییە؟! زانایان دەفەرموون:التَجَسّس: أن يَطلُبَ الخَبَر لِغيرهِ. واتە: جاسوسی ئەوەیە بەشوێن هەواڵ و کاری تایبەتی کەسێك بکەوی بۆ ئەوەی بە کەسێکی تری بگەیەنی و توشی سزا و ئازارێك ببێ، وەکو راپۆرت نوسەکانی ناو خەڵك، کە بە داخەوە لە هەموو سەردەم و کاتێکدا و حکومەتێکدا دەیان خەڵك لەسەر راپۆرتنوسین و جاسوسی کردن بەسەر خەڵکیەوە دەژین و نان بەدەست دێنن بۆ ماڵ و منالیان!! بەڵام: التَحَسُس، أن يَطلُبَهُ لنفسه، ئەو کەسەیە کە حەزی بە زانین و دەنگوباسی ژیانی تایبەتی خەڵکانی ترە، بەڵام نەك بۆ ئەوەی بە دام و دەزگایەکی رابگەیێنێت بەڵکو هەر خۆی حەزی پێیەتی و بە کەسی تری نالێ، ئەمەیان تاوانەکەی لە جاسوسیکردن کەمترە.

جا ئیماندارانی بەرێز: زۆر زۆر خۆتان لەوە بپارێزن کە رۆژێ لە رۆژان جاسوسی لەسەر هیچ کەسێك بکەن با خۆشیشت نەوێت و زەرەری بۆت بووبێ، لە کۆڕ و دانیشتنێکدا کەسێك کە دڵی پڕە بە بینینی ئەو هەموو ناعەدالەتییە قسەیەك دەکات دەمەیگەیەنە بە دەزگاکانی حکومەت و بەگرتنی مەدە، چونکە ئەو تۆی بە ئەمین و

دۆستی خۆی زانیوە، بۆیە دەردی دڵی خۆی لای تۆ کردووە و تەنها هەر قسەش دەکات و ناچێتە سەر هیچ دام و دەزگایەك و کەس ناکوژێ.
ئەگەر هەر کەسێ ئەم قسەیەی گەیاندە شوێنێکی وا کە لێپرسنەوە لەو کەسە بکرێت کە ئەو قسەیەی و سزای بدات کە ئەمە ڕەفتاری دام و دەزاگا داپڵۆسێنەرە دیکتاتۆریەکانە و بەهۆی توند وتیژی و قبوڵ نەکردنی ڕەخنە، بەردەوام هاولاتی لەو شوێنانەی چاوی کاربەدەستانی لێ نییە، دەردی دڵی خۆی دەکات، ئەو کەسەی ئەم قسەیەی گەیاند، ئەوە جاسوسە و خیانەتی لە ئەمانەت کردووە. هەروەکو پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: (المَجلِس بالأمانَة ، إلا ثَلاثَ مَجالِس: سَفْكُ دَمٍ حَرامٍ، أو فَرجٍ حَرام، أو اقتَطِاعِ مالٍ بغَيرِ حَقّ) رواه أبو داود.

واتە: دانیشتنی کۆڕ و کۆمەڵ ئەمانەتە و نابێ نهێنی و قسە و باس و گفتوگۆکانی ببرێنەدەرەوە، تەنها سێ مەجلیس و کۆڕ نەبێ، ئەویش پیلاندانان بۆ ڕشتنی خوێنی کەسێك بە ناحەق یاخود کەسانێك بیانەوێ ئابڕوی کەسێك (پیاو یان ژن) ببەن، یاخود لە دانیشتنێکدا کەسانێك ڕێك بکەون بۆ ئەوەی دەست بگرن بەسەر ماڵ و سامانی کەسێکدا و دزی لێ بکەن یا ڕێگای پێ بگرن، تۆش لەو دانیشتن و مەجلیسانەدا ئامادە دەبی ئەو پیلانە ژەهراویە نەشاریتەوە بە ناوی ئەوەی ئەمانەتی مەجلیسە، بەڵکو واجبە لەم سێ حاڵەتەدا ئەو کەس و کەسانە ئاگادار بکەی کە ئەم پیلانەیان بۆ دڕێژراوە، بۆ ئەوەی بە ئاگا بن و فریای خۆیان بکەون و لێی ڕزگار بن.

هەروەها پێغەمبەری خواﷺ لە فەرموودەیەکی تردا، وانەیەکی گەورە فێری ئومەتەکەی دەکات و دەفەرموێ: (إذا حَدَّثَ رَجُلُ رَجُلاً بِحَديثٍ، ثُمّ إلتَفَتَ فَهوَ أمانة) رواه الترمذي و قال حديث حَسَن.

واتە: هەر کاتێ کەسێك قسەی بۆ کەسێك کرد و لەو کاتەدا کە ویستی قسەی بۆ بکات بەملاولای خۆیدا ڕوانی بۆ ئەوەی بزانێ کەس گوێی لێیان نییە، ئەوا ئەو قسەیە ئەمانەتە و دەبێ لای کەس نەگێڕدرێتەوە، چونکە بۆیە بەملا و لای دا ڕوانیوە نایەوێت کەسی تر بەم قسەیە بزانێت.

ئیمانداران: جاسوسی تاوانێکی زۆر گەورەیە و هەر کەسێ جاسوسی لەسەر کەسێك کرد و سەرەنجام بە هۆی ئەو هەواڵ لێدانەوە کەسەکە کوژرا، لە سێدارە درا، ئەوا ئەو جاسوسە بە پیاوکوژ –قاتل– ئەژمێردرێ و لە تۆڵەدا دەکوژرێتەوە!..

وە حکومەت و کاربەدەستانی وڵات نابێ جاسوسی بەسەر ناوماڵ و ژیانی شەخصی تاکەکانی میلەت دا بکەن لەبەر ئەوەی هەر دەسەڵاتێك زۆر چاودێری توند لەسەر هاوڵاتیانی دابنێت، بە شێوەیەك کە پێویست نەکات ئابەو شێوەیە چاودێریان بخرێتە سەر، ئەوا ئەو گەل و میللەتە، ئەو دەسەڵاتە بە دژی ئازادییە شەخصییەکانی خۆی دەزانێت و سەرەنجام لێی هەڵدەگەڕێنەوە، هەروەکو لە وڵاتانی دەسەڵاتی دیکتاتۆریدا بەرچاو دەکەوێت کە دەسەڵات ئەوەندە بە توندی چاودێری هاوڵاتیانی دەکات، سەرەنجام بێزاریان دەکات و لە کۆتاییدا پەتی ئارامیان دەپچڕێ و لێی هەڵدەگەڕێنەوە و خۆپیشاندان و ناڕەزایی و ڕاپەڕین دەست پێ دەکات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ لأميرَ إذا ابتَغَى الرِّيبةَ في الناسِ أفسَدَهُم) رواهُ أبو داود و قال الألباني صحيح.

وە هەروەها پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: نابێ بۆ قسە و باسی خەڵکی گوێ هەڵ بخەی لە کاتێکدا قسە بۆ کەسێکی تر دەکات، یان کەسێك گوێ بە دیواری ماڵی کەسێکەوە دەنێت یان لەودیو دەرگا و

پەنجەرەوە گوێ هەڵدەخات بۆ ئەوەی گوێی لە قسەکانیان بێ، وە فەرموویەتی: سزایەکی زۆر بە ئێش و ئازاریان هەیە لە قیامەتدا، وەکو فەرموویەتی: (مَنْ إستَمَعَ إلى حَديثِ قَومٍ، وَهُم لهُ كارِهونَ صُبَّ في أُذنَيهِ الآنُكُ يَومَ القيامَةِ) رواه البخاري.

واتە: هەرکەسێك گوێ بگرێت بۆ قسەی کەسانێك و ئەوانیش پێیان ناخۆش بێت کە ئەو کەسە گوێ بیستی قسە و باسەکانیان بێت. ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا مسسی تواوە ئەکرێتە گوێچکەیانەوە!!

بەڕێزان: لە ئیسلامدا ئەگەر کەسێك لە ماڵی خۆیدا گوناهی کرد و لەبەر چاوی خەڵکیدا لە شوێنە گشتی و سەرشەقامەکاندا ئەنجامی نەدا، ئەوە نابێ کەسێك لە موسڵمانان، بچێ جاسوسی بەسەرەوە بکات و هەواڵی لێ بدات بە دەزگا بەرپرسەکان، لەبەر ئەوەی ئەم گوناهە بە پەنهانی ئەنجام دراوە نابێ بڵاو بکرێتەوە و باس بکرێ.

یەکێك لە عوقبەی کوڕی عامری پرسی: ئێمە هەندێ دراوسێمان هەن کە لە ناو ماڵی خۆیاندا عەرەق دەخۆنەوە، بە حیسابی خۆیان کەس ئاگای لێ نییە، بەڵام من ئاگاداری ئەو تاوانە گەورەیان بووم و چووم پۆلیسم هێنایە سەریان و بەگرتمدان، عوقبە فەرمووی: کارێکی چاکت نەکردووە، لەمەودوا وامەکە بەڵکو لەجیاتی ئەوە بڕۆ بە نەرمی و بە جوانی و زمانێکی شیرین ئامۆژگاریان بکە و لەسەرەنجامی خراپی عەرەق خواردنەوە لە دونیا و قیامەتدا ئاگاداریان بکەرەوە و بییان ترسێنە.. کەسەکە وتی: ئاخر قوربان من پێشتر وەکو چۆن دەفەرمووی ئاوا ئامۆژگاریم کردن و سزای عەرەق خواردنەوەم بۆ باس کردن، بەڵام ئەوان هەر وازیان نەهێنا و منیش ناچار چووم. پۆلیسم هێنایە سەریان

**و دەستگیریان کردن، عوقبە فەرمووی: هاوار بۆ تۆ من دەڵێم دەبوایە جاسوسیت بەسەرەوە نەکردنایە و بە گرتنت نەدانایە، چونکە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە کە فەرمووی:** (مَن سَتَرَ عَورَةً فَكَأَنَّما استَحيا مَوءُودةً فِي قَبرِها) رواهُ أبو داود و إبنُ حبّان في صحيحه.

**واتە: هەر کەسێك کەموکوڕی کەسێك دابپۆشێت و ئابروی نەبات و دەنگ و باسی بە ناو خەڵکدا بڵاو نەکاتەوە، ئەوە وەکو ئەوە وایە کە زیندە بە چاڵ کراوێکی لە گۆڕەکەیدا ڕزگار کردبێ لە مردن، ئەوەندە پاداشتی لای خوا بۆ دەنوسرێ!..**

**مێژووی پرشنگداری ئیسلام تۆماری کردووە کە شەوێکیان حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب لەگەڵ عبد الرحمانی کوڕی عەوفدا، بۆ چاودێری شاری مەدینە دەگەڕان، کات درەنگانی شەوێك بوو، هەموو خەڵکی خەوتبوون، بەڵام ڕووناکی و چرا و ئاگرێك هێشتا هەر مابوو کە بەڵگە بوون لەسەر ئەوەی ئەو ماڵە هێشتا بە خەبەرن و دانیشتون، بۆیە حەزرەتی عومەر و عبدالرحمانی هاوڕێی بەرەو ماڵەکە بەڕێ کەوتن، تەماشایان کرد ماڵی (ڕەبیعەی کوڕی ئومەیەی کوڕی خەلەف)بوو، کە لە دەرگا نزیك بوونەوە گوێیان لە دەنگە دەنگی چەند کەسێك بوو، عبدالرحمانی کوڕی عەوف فەرمووی: قوربان لەوانەیە خەریکی عەرەق خواردنەوە بووبن و ئێستا سەرخۆش بوون بۆیە ئاوا دەنگە دەنگ دەکەن و دەنگیان بەرز دەکەنەوە، با بچینە پێشتر و باشتر گوێبگرین بزانین ئەڵێن چی و قسەکەیان قسەی کەسێکی سەرخۆشە یان نا؟!! حەزرەتی عومەر فەرمووی:** (أرى أن قَد أتَينا ما نَهَى اللّٰهُ عَنهُ، قالَ اللّٰه تعالى: - لا تَجَسَّسُوا- فَقَد تَجَسَّسنا، فَنْصرَفَ عَنهُم و تَرَكَهُم)، **فەرمووی: وا**

ئەزانم خەریکە کارێك دەکەین کە خوا نەهی لیّ کردووە، کە فەرموویەتی: جاسوسی بەسەر یەکترەوە مەکەن، کەچی ئێمە خەریکی ئەوەین کە لەم درەنگانەی شەودا جاسوسی بەسەر ژیانی ئەم ماڵەدا بکەین و ئەوەی خوا نەهی لیّ کردووە ئەنجامی بدەین، با بڕۆین وازیان لیّ بێنین، ڕۆشتن و دوور کەوتنەوە لێیان و وازیان لیّ هێنان..

ئەی ئەو کەسەی کە تا ئێستا جاسوسیت بەسەر خەڵکەوە کردووە. تەوبە بکە و واز لەو کردارەخراپە بهێنە، کە دەبێتە مایەی ئەوەی لە دنیادا لەبەر چاوی خەڵکی بێزراو بیت و جاسوس هەموو کەس ڕقی لێیەتی و کەس حەز بە هاوڕێیەتی ناکات و هەموو خەڵکی بە چاوی سوك سەیری دەکەن تەنانەت ئەوانەشی کە ئەم جاسوسیان بۆ دەکات. وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا مسی تواوە دەکرێتە گوێچکەکانیەوە چونکە گوێی بۆ قسەی نهێنی خەڵك گرتووە و خوای گەورە تۆڵەی هەموو ئەو کەسانەی لیّ دەستێنیّ کە بە هۆی جاسوسی کردنی ئەوەوە توشی ئازار و ئەشکەنجە و گرتن و دەرکردن بوون، یان لە سێدارە دراون، ئەم جاسوسە وەکو بە دەستی خۆی کوشتبنی ئاوا تاوانبارە.. دەی وەرە تەوبە بکە و واز لەو کارە چەپەڵە بهێنە بە ئومێدی ئەوەی کە خوا لێت خۆش ببێت، پێش ئەوەی بگەیتە قیامەت و پەشیمان بوونەوە دادت نەدات وە هەر لە دنیاشدا ڕۆژێك دێتە پێشەوە، ئەو کەسانەی کە تۆ جاسوسیان بۆ دەکەیت دەور و ڕۆڵیان نامێنیّ و دەسەڵاتەکەیان دەپێچرێتەوە ئەمجا تۆش هەر لە دنیادا پەشیمان دەبیتەوە، بەڵام پەشیمانییەکی بیّ سوود!..

ئیماندارانی بەڕێز: ئێمە کە باسی جاسوسیمان کرد و بە تاوان و نارەوایی لە قەڵەممان دا، دەبێ ئەوەش ڕوون بکەینەوە کە ئەگەر هاولاتییەك شتێکی بینی ، ڕوداو و دیاردەیەکی بینی کە زەرەر و زیانی بۆ سەر ژینگەی موسڵمانان دەبوو، دەبێ لێی بێدەنگ نەبێ و دەزگا بەرپرسەکانی دەوڵەت کە دەتوانن ئەو کارە نارەوایە لەناو ببەن ئاگادار بکات و ئەمە جاسوسی نیە.

بۆ نمونە: کەسێك لە دوکانێکدا خواردەمەنییەکی بەسەرچووی کڕی، نەشزانێ کە دوکاندارەکە بە ئامۆژگاری و قسەی ئەم واز لەم کارە حەرامە زیانبەخشە لەناوبەرە ناهێنێ و دەیان کەسی وەکو ئەم لە ڕێی ئەو دوکاندارە بێ ویژدانەوە ئەم خواردنە کۆنە بەسەرچووە دەچێتە مەعیدەیەوە و چەندین نەخۆشی خراپی توش دەبێ. لەم حاڵەتەدا واجبە کە دەزگا تەندروستییەکان ئاگادار بکاتەوە و خواردنەکەیان نیشان بدات و دوکان و دوکاندارەکەیان پێ بناسێنێ و واز نەهێنێ هەتا ئەو ناپاکە بە سزای یاسایی خۆی دەگات،چونکە ئەو مادەیەی کە دەکرێتە ئەم خواردن و خواردنەوەی کە هەڵدەگیرێن و بۆ مادەیەکی دیاری کراو بە هۆی ئەو مادەیەوە لە تێکچوون دەپارێزرێن، ئەگەر هاتوو لە کاتی خۆی دەرچوو کە بەرواری ئێکسپایەر بوونیەتی، ئەوا ئەو مادە دەگۆڕێت بۆ ژەهرێکی لەناوبەر و پزیشکەکان دەڵێن زۆربەی نەخۆشی شێرپەنجە –سرطان– بەهۆی ئەوەوەیە..

کەواتە:دەبێ هاولاتی چاوکراوە بێ و لەم دیاردە لەناوبەرانە بێدەنگ نەبێ و ئەمە خێر و پاداشتی هەیە و جاسوسی نییە.

بەڕێزان: ئەم دیاردەی شتی بەسەرچووە، بە ڕاستی خەتەر و مەترسییەکی گەورەیە بۆ سەر ژیانی ڕۆڵەکانی میللەتەکەمان و کەس کەس لە بەڵاو مەترسی ئەم دیاردە سامناکە ڕزگاری دەبێ، بۆیە بە پێویستی دەزانم کە زیاتر لەسەری بدوێم و بڵێم:

لە ئیسلامدا بازاڕ و کڕین و فرۆشتن دەبێ لە لایەن حکومەت و دەسەڵاتەوە چاودێری بکرێ و دەستی ئەو بێ‌ویژدان و دڵمردووانە بگیرێ کە هەموو ئاواتیان دەستکەوتنی پارەیە و ﴿جَمَعَ مالاً وَعَدَدَهُ يَحسَبُ أنَّ مالَهُ أخلَدَهُ﴾ بونە بەندە و عەبدی دینار و دیرهەم و ئەگەر چی لەسەر خوێن و ژیان و تەندروستی خەڵکیش بێ هەر سوورن لەسەر بەدەست هێنانی. پێغەمبەری خواﷺ لەگەڵ ئەو هەموو ئەرك و ماندوبونەی کە لەسەر شانی بوو، کەچی خۆی چاودێری بازاڕی کردووە، لە صەحیحی (موسلیم)دا هاتووە کە: جارێکیان پێغەمبەری خواﷺ ڕۆیشت بە لای پیاوێکدا کە خواردەمەنی دەفرۆشت –گەنمی دەفرۆشت– ڕوکاری دەرەوەی زۆر جوان بوو، بە شێوەیەك کە سەرنجی پێغەمبەری خوای ڕاکێشا، پێغەمبەر دەستی خستە ناویەوە، تەماشای کرد ناوەوەی تەڕە و بۆنی کردووە، فەرمووی: ماهذا؟ ئەوە بۆچی وا تەڕە؟! کابرای فرۆشیار وتی: أَصابَتهُ السَّماءُ يا رَسُول اللّه، ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوە باران لێیداوە ئاوا تەڕی کردووە! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (فَهَلا جَعَلتَهُ فَوقَ الطعام حَتى يَراهُ الناسُ، مَن غَشَّنا فَلَيسَ مِنا) رواه مسلم.

فەرمووی: ئەی بۆچی ئەم تەڕبووەت نەخستۆتە سەرەوە تاوەکو خەڵکی ببینن، وە بزانن ئەو جوانەی لە سەرەوە سەرنجیان ڕادەکێشێ،

**ژێرەوەی وانییە و بەکەڵك نەماوە، ئەمجا فەرمووی: هەرکەسێ غەشمان لێ بکات لە ئێمە نییە!!.**

**بەڕێزان: بە ڕاستی خۆراك و خوادنەوەی بەسەرچوو، تەنانەت داو دەرمانی ناو دەرمانخانەکانیش هەندێ جار بەسەر چووی تێدایە و لەجیاتی بۆ نەخۆش ببێ بە هۆکاری شیفا و چاکبوونەوە. لێی ئەبێ بە دەرد و نەخۆشییەکی کوشندەی تر و ژەهراوی بونی تەواوی لاشەی، هەر چەند ڕۆژ جارێك کۆمەڵێك خۆراك و دەرمانی بەسەر چوو دەستی بەسەردا دەگیرێ و لە لایەن لایەنە بەرپرسەکانەوە دەسوتێنرێ، ئەمە سەرەڕای دەیان ئەوەندەی تر کە هاولاتی کڕیویەتی و خواردویەتی و پێی توشی نەخۆشی بووە، هەم پارەکەی فەوتاوە و هەم پارەی تریشی لە خۆیدا سەرف کردووە، لێرەوە جێگای خۆیەتی بپرسین باشە بۆچی ئەم شتە بەسەرچووانە دێنە ناومان؟! لە وەلامدا دەڵێن:**

**١- بە داخەوە خۆمان لەم وڵاتە پڕ بەرەکەتەدا بە هۆی پشتکردنمان لە بواری کشتوکاڵی و ئاژەڵداری و چۆڵبوونەوەی گوندەکان و ئاوڕ نەدانەوەی پێویست لە جوتیاران، ناچارین هەموو خۆراکێکمان لە دەرەوە بۆ بێ، پەنیری ئێرانی، ماست و دۆی ئێرانی، کەرەی تورکی هەنگوینی سعودی، تەنانەت ئاوی خواردنەوەشمان لەو وڵاتانەوە بۆ دەکرێتە دەبە و پێمان دەفرۆشنەوە، خەڵکی گوندەکان ماست و بەرهەمی شیرەمەنی ئێرانی بەکاردێنن.**

**٢- دەزگای پشکنینی تایبەت لەسەر سنورەکان و مەرزەکاندا نییە و بازرگانی بێویژدان بە ئارەزووی خۆیان و بە بێ بوونی چاودێری تەندروستی کەلوپەل و خۆراك دێننە وڵاتەکەمانەوە.**

**ئایا چارەسەری ئەم دیاردەیە بەچی دەبێت؟!**

١-دەزگا تەندروستییەکان لەسەر سنورەکان دەزگای پشکنین دابنێن و ڕێگانەدرێ بەو خۆراك و دەرمانانەی کە بەسەر چوون یان کاتی بەکارهێنانیان نزیکی تەواو بوونە، وە لە ناوخۆشدا ڕۆژانە لیژنەی تەندروستی تایبەت بەو بابەتە بگەڕێن بەسەر دوکان و بازاڕەکان و چێشتخانەکاندا تەماشای بەروار و چۆنیەتی خۆراکەکان و جێگای هەڵگرتنیان و پاکوخاوێنی دوکان و کۆگاکانیان بکرێ و ئەگەر باش بوو پاك و خاوێن بوو دەست خۆشییان لێ بکرێت و ئەگەر خۆراك و دەرمانی بەسەرچوویان دەفرۆشت  بە پێی یاسا سزا بدرێن و جیاوازی هیچ کەسێك نەکرێت.

٢- هاوڵاتی وشیار بێ و لە هەر فرۆشیارێکەوە ئەوەی بینی کە شتی بەسەر چوو دەفرۆشێ ئەوا نابێ بێ هەڵوێست بێ و بڵێ ئەمە جاسوسی کردنە، نەخێر بە پێچەوانەوە دەبێ هەڵوێست بنوێنێ بەوەی کە: شتەکەی لێ نەکڕێ، وە بە زمانێکی نەرم ویژدانی مردووی بە ئاگا بێنێتەوە و ئامۆژگاری بکات کە دەست بەجێ لەبەر چاوی ئەم ئەم شتە بەسەر چووە لەناو ببات و بڕیاریش بدات جارێکی تر ئەوە دوبارە نەکاتەوە، ئەگەر زانیت بەقسەت ناکات و هەر سورە لەسەر کارە ناڕەواکەی، ئەوا با بەگێل و بێدەسەڵاتت نەزانێ بڕۆ دەزگا تەندروستی و بەرپرسەکانی لێ ئاگادار بکە بۆ ئەوەی بە پێی یاسا مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، وە لە هەموو چارەسەرەکان کاریگەرتر: هەست کردنە بە چاودێری خوا، کە ئەو فرۆشیارە ئەو هەستە ئیمانیەی لا دروست ببێ کە ئەگەر چی کەسیش پێی نەزانێ و دەزگای بەرپرس و دەسەڵاتدار لێی ئاگادار نەبێ، بەڵام خۆ خوای گەورە ئاگای لە هەموو کار و کردەوەکانیەتی و لە دونیا و دواڕۆژدا سزای ئەو غەش و خیانەتەی لێ دەستێنێ، وە هەر کاتێ ئەم هەستە ئیمانییە دروست بوو، ئەوا بە بێ ئەوەی کەس ماندووبێ، بازاڕ لەغەش و خیانەتی فرۆشتنی شتی بەسەر چوو پاك دەبێتەوە،هەروەکو ئەو کچە تازە پێگەیشتووە لە تەمەندا بچوك، بەڵام لە ئیماندا گەورە و سەنگین، دایکی لە بەرە بەیانیەکی نیمچە تاریکدا پێی دەڵێ ڕۆڵە هەستە ئاو بکەرە شیرەکەوە، و با زیاتربێ و زیاتر پارەمان دەست

بکەوێ، بەڵام کچەکە دەڵێ: ئاخر دایەگیان خەلیفە عومەری کوڕی خطاب بڕیاری داوە هەر کەسێ ئاو بکاتە شیرەوە و غەش بکات بە توندی سزای دەدات، دایکەکە دەڵێ: ڕۆڵە لەم بەرە بەیانییەدا خوا ئەزانێ خەلیفە عومەر لە کوێ یە و کەی ئەو چاوی لە ئێمەیە و بەم کارەی ئێمە دەزانێ؟!! کچەکەش بە دڵێکی پڕ لە ئیمان بە چاودێری خوای گەورەدەڵێ: دایەگیان باشە خۆ ئەگەر خەلیفە عومەر ئاگاشی لێمان نەبێ و چاویشی لێمان نەبێ، خۆ خوای گەورە چاوی لێمانە و ئاگاداری ئەم غەش و خیانەتەمانە!.. الله اکبر لەم ئیمانە ڕاستەقینەیە، بە ڕاستی ئەوەیە تاك و کۆمەڵگا چاك دەکات و چاکسازی دروست دەکات..

لە کۆتایی وتارەکەشمدا ڕوودەکەمە بازرگان و دوکاندارەکان و بەبیریان دێنمەوە کە:

١- ڕاستگۆبن لە کڕین و فرۆشتندا، پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (التاجِرُ الصَّدُوقُ الأمينُ، معَ النَبِيِّنَ و الصِّدِيقِينَ و الشُهَداء) رواه الترمذي و قال: حديث حسن. واتە: بازرگانی ڕاستگۆی ئەمین لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەکان حەشری دەکرێت لە قیامەتدا..

ئەی بازرگانی بەڕێز توخوا حەیف نییە بە هۆی غەش و خیانەت لە کڕین و فرۆشتنەکەتەوە بۆ بەدەست هێنانی پارەیەکی کەم، کە بەجێیدێڵی و لەسەریشی سزا دەدرێی و ئەو هەموو فەزڵ و گەورەییە لەدەست خۆت بدەی؟!

٢- ئەی بازرگانەکان ئەی ئەو کەسانەی کە کڕین و فرۆشتن ئەنجام دەدەن، ئاگادار بن هەرگیز سوێندی بە درۆ و خواوەکیلی بەکار مەهێنن، پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: (الحَلِفُ مَنفَقَة للسِّلعةِ مَمحَقَة لِلكَسْبِ)رو البخاري و مُسلم.

واتە: سوێند خواردن ڕەواج بۆ کەلوپەلی فرۆشراو پەیدا دەکات، بەڵام بەرەکەت لە کاروکەسابەتدا ناهێڵێ و ئەو سامانە گەشە ناکات و لەپڕێکا، لە ڕوداوێکدا تیادەچێ.

هەوڵ بدەن کە بەرنامە و کار و کاسپیتان بریتیبێ لە حەڵاڵ خۆریێ و دوور کەوتنەوە لە حەرامێك، چونکە هەرچەندە پارەی کەمیشت دەست بکەوێ، بەڵام حەڵاڵ بێ، بەرەکەتی تێ دەکەوێ و ژیانێکی خۆشی پێ بەسەر دەبەی،بەڵام پارەی حەرام هەرچەندە زۆر بێ هەر بێ بەرەکەت دەبێ و بە ئاسودەیی نایخۆی و ئەمەش حەقیقەتێکە هەموو ئەوانەی حەڵاڵ یان حەرامیان خواردبێ بە کردەوە بۆیان سەلماوە.

دەگێڕنەوە پیاوێکی شەربەت فرۆش لە شاری سلێمانیدا دەچێتە خزمەتی کاك ئەحمەدی شێخ و عەرزی دەکات، قوربان:شەربەتی مێوژ دروست دەکەم و ئەیفرۆشم، زۆر پاکە زۆر چاکە زۆر خەست و بێ غەشە، ئاوی بە ئەندازەی پێویست تێ دەکەم، بەڵام بازاڕم کەمە لە چاو دراوسێ دوکانێکما کە ئەو بە پێچەوانەی منەوەیە: ئاوی زۆر تێدەکات، پاك و خاوێنی ناپارێزێ، دەست بە دەستنوێژ نییە، بەڵام بازاڕی لە من گەرمترە، سەرفیاتی زۆرترە، قازانجی زۆریش دەکات.

کاك ئەحەمدی شێخ دەفەرموێ: جا نیازت چییە؟ کابرای کاسب دەڵێ: قوربان هاتووم منیش وەك ئەوی لێ بکەم، تا بازاڕم گەرم ببێ!! جەنابی شێخ ئەفەرموێ: نەکەی وای لێ بکەی کەم و نەخت بژی چاکترە لەوە، کابرا ڕازی نابێ چەند جارێك ئەچێتە لای، دواجار کاك ئەحمەد دەفەرموێ: ئاکامی باشی نابێ، هەر بەقسەشم ناکەیت چیت لێ بکەم کەیفی خۆتە!. بەڵام دڵنیابە پەشیمان ئەبیتەوە، بەڵام هەر سەردانم بکە، بەڵێ کابرا دەڕوات و لەو خراپتر دەست دەکاتە کارکردن، ئاوی زۆر، پۆخڵی لە دروست کردندا، بازاڕی زۆر سەرفیاتی چاك!!پاش مانگێك دەچێتە خزمەت کاك ئەحمەدی شێخ و بە دڵێکی خۆشەوە دادەنیشێ و پرسیاری لێ دەکات، ئەرێ برا: بازاڕت، کارت، سەرفیاتت، لە وەڵامدا کابرا دەڵێت: زۆر باشە، بازاڕم گەرمە، پارەی باشم دەست دەکەوێ، لە کابرا باشترە بازاڕ و دوکانم، کاك ئەحمەدی شێخ دەفەرموێ:ئەی پارەکەی چۆنە؟! لە چیدا خەرجی دەکەی؟! کابرا دەڵێ: بەخوا پارەی باشم دەست دەکەوێ بەڵام نازانم لە چیدا خەرجی دەکەم،

بەرەکەتی نییە، زۆرە بەڵام جێگە ناگرێ بە پێچەوانەی جارانەوە، جاران پارەی کەم بەڵام بەرەکەتی زۆر، پارەی کەم بەڵام لەش ساغ و سەلامەت لە ماڵ و منداڵ و لاشەی خۆمدا.. پارەی کەم بەڵام قەناعەت و مورتاحی، کاك ئەحمەدی شێخ دەفەرموێت: ئەوە ئاکامی پارەی حەرامە، کاری حەڵاڵ و چاك و پاك بەرەکەتی تێ دەکەوێت،کاسبی حەڵاڵ و خاوێن و بێغەش ئەگەر چی پارە و دەستکەوتی کەم بوو. بەڵام خوای گەورە لەولاوە لە زۆر نارەحەتی و دەرد و بەڵا بە دورت دەکات، ئەگەر توشیشت بوو ئەوە دەبێتە کەفارەتی گوناهەکانت... کابرای شەربەت فرۆش بڕیاریدا بگەڕێتەوە سەر کار و ڕەوشی جارانی، چونکە کاسبی حەڵاڵو پاك و بێغەش پڕ بەرەکەتە...
خوای گەورە بە لوتفی خۆت: اغْنِنا بِحَلالِكَ عَنْ حَرامِكَ و بطاعَتِكَ عَنْ مَعصيتكَ. اللّهم آمين

سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز
٢. تەفسیری ڕامان، م. احمد کاکە محمود
٣. الترغيب و الترهيب – للحافظ المُنذري.
٤. اخلاق المُسلم علاقته بالمُجتمع – د.وهبة الزُحيلي ص١٤١
٥. الأخلاق الأسلامية – عبدالرحمان حنبكة الميداني ج٢ ص١٧٤
٦. موسوعة نظرةُ النعيم ج٩ ص٤١٢٩ ، ص٤١٣١
٧. منهاجُ الصالحين في الآداب الأسلاميَّة –محمد عبدالعاطي البحيري ص٥٨٧
٨. ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم –ئاوات ابوبکر احمد ل٣٧٣

## وتاری سێیەم بۆ مانگی جمادی الأول

## خۆ پارێزی لە شتە گوماناویەکان – الورَع-

## ((بەشی یەکەم))

الحَمدُ للّٰهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعِينَ.

ئیمانداران: بناغەی ئەم ئیسلامەتییە بریتییە لە ئیمان، لە هەر جێگایەکی قورئانیش دا باسی ئیمان هاتبیٚ ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا باسی کردەوەی چاکیش کراوە، (الذينَ آمَنُوا وَعَملوا الصّالحات...)، کردەوەی چاکیش بریتییە لەوەی کە فەرمانەکانی خوا جێبەجیٚ بکەین و ئەوەی فەرموویەتی وازی لیٚ بێنین حەرامە، خۆمانی لیٚ بپارێزین، کەواتە: ڕاست و دروستی ئیمانی تەواو لەگەڵ ئیمانی بە قسە و دیعایە بەوەدا لە یەك جیا دەکرێنەوە کە مرۆڤی موسڵمان هەوڵی بەدەست هێنانی حەڵاڵ بدات و بە هەموو جۆرێك خۆی لە حەرام و حەرامخۆری بپارێزیٚ، وە هەر کەسێك ئەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی بە حەڵاڵیان داناوە، ئەو بە لایەوە حەرام بێت، یان بە پێچەوانەوە ئەوەی خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی بە حەرامیان داناوە ئەو بە حەڵاڵی بزانیٚ ئەوە بێگومان پێی کافر دەبیٚ و لە دین و ئیمان دەچێتە دەرەوە.

بەڕێزان: حەڵاڵ و حەرام ئەوەندە ئاشکران، کە تەنانەت ئەگەر مرۆڤ لە زانایانی ئیسلامیش دوور بیٚ، هەر پرس بە دڵی خۆی بکات، بەمەرجیٚ دڵی نەمردبیٚ و نەڕزیبیٚ و نەگەنیبیٚ ئەوا بە دڵنیاییەوە دڵی خۆی پێی دەڵیٚ، ئەوە حەڵاڵە یان حەرامە هەر وەکو پێغەمبەری پێشەوامانﷺ لە فەرموودەیەکی (جامع و مانع)دا فەرموویەتی: (البِرُّ

ماانشَرَحَ لهُ صَدرُكَ، و الأثمُ ماحاكَ في صَدرِكَ، و إن أفتاكَ عَنهُ الناس) رواهُ احمد و صحح إسنادهُ الألباني.

واتـە: چاکی و پاکی و حەڵاڵ ئەوەیە کە سنگت پێی گوشادە و دەرونت بە ئەنجامدانی ئاسودەیە و تاوان و خراپە و حەرام خۆریش ئەوەیە کە لە سینەتدا هەست بە نامۆیی بکەی و ویژدانت پێی نائارام بێت و دڵت ئازار بکێشێ و لە ناختدا هەست بەوە بکەی کە تاوانێکت ئەنجام داوە، هەر چەندە خەڵکی دەستخۆشیشت لێ بکەن و فتوات بۆ بدەن کە ئەوە حەڵاڵ و ڕەوایە، هەروەکو ئەو حەرامخۆری و بێ شەرعیەی کە بێ دینێك دەیکات، خۆ بە هەزاران کەس پشتیوانی لێ دەکەن و هاوڕان لەگەڵی و دەست خۆشی لێ دەکەن، کەچی مەگەر هەر دڵی بە تەواوی مردبێ و ویژدانی زیندوو نەمابێ، ئەینا لە ناخەوە دەزانێ کارێکی ناڕەوای کردووە و ئەوەی بە دەستی هێناوە حەرامە..

ئەمە تا ئێرە زۆر ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدا هەندێ شتی گوماناوی هەن، کە ساغ نەبونەتەوە نە بەلای حەڵاڵی تەواودا یان حەرامی تەواودا، هەروەکو پێغەمبەری دڵسۆزمان کە هیچ شتێ نەماوە بۆمان باس نەکات و بەرچاومان ڕووناك نەکاتەوە هەزاران صەلات و سەلامی خوای لەسەر بێ لە فەرموودەیەکی پیرۆزی دا دەفەرموێ: (الحَلالُ بَيِّنُ وَ الحَرامُ بَيِّنُ، وَ بَينَهُما مُشَبَّهات، لا يَعلَمُهُما كَثير مِنَ الناسِ فَمَن أتقَى المُشَبهاتِ إستَبرَأَ لِدينهِ و عِرضِهِ، ومَن وَقَعَ في الشُبُهاتِ كَراعٍ يَرعَى حَولَ الحِمَى، يُوشِك أن يُواقِعهُ، ألا وَ إنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمَى، ألا إنَ حِمَى اللهِ في أرضِهِ مَحارِمُهُ) رواهُ البخاري و مُسلِم.

واتە: حەڵاڵ ئاشکرا و دیارە، حەرام ڕوون و ئاشکرایە، لە نێوان حەڵاڵ و حەرامیشدا کۆمەڵێ شتی گوماناوی هەن، زۆربەی خەڵکی نایانزانن و دەرکیان پێ ناکەن، هەر کەسێ خۆی لە شتە گوماناوییەکان بپارێزێ ئەوا دین و ئیمان و کەسایەتی و حورمەتی پارێزراو دەبێ، بەڵام هەر کەسێك بکەوێتە ناو شتە گوماناوییەکانەوە وەکوئەو شوانەی لێدێ کە لە دەوری قەدەغە کراوێکدا ئاژەڵەکەی بلەوەڕێنێ، زۆر نزیکە کە بکەوێتە ناوی، وە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئاگادار بن و بزانن کە بۆ هەموو پاشا و دەسەڵاتدارێك قەدەغە کراوێك هەیە، ئاگادار بن قەدەغە کراوی خوای گەورە لەسەر زەوی حەرامکراوەکانیەتی..

پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ:

١- إتَّقِ المَحارِمَ تَكُن أعبَدَ الناسِ: خۆت لە حەرامەکان بپارێزە، ئەوا خواناسترین کەس دەبێ.

٢- و ارضَ بما قَسَمَ الله لَكَ تَكُن أغنَى الناسِ: رازی بە بەو بەشەی کە خوای گەورە بۆی دیاری کردوویت و قەناعەتت هەبێ، ئەوا دەبی بە دەوڵەمەند ترین کەسی ناو خەڵکی.

٣- وَأحسِن إلى جارِكَ تَكُن مؤمناً، لەگەڵ دراوسێکەتدا چاکەکار بە ئەوا ئیماندار دەبی.

٤- وَأحِب للناسِ ما تُحِبُّ لِنَفسِكَ تَكُن مُسلماً: ئەوەی بۆ خۆتت پێ خۆشە بۆ خەڵکیش پێت خۆش بێت ئەوا موسڵمانێکی ڕاستەقینەی.

٥- ولا تُكثِرِ الضَّحكَ، فَأنَّ كَثرَةَ الضَّحكِ تُميتُ القَلبَ: زۆر پێمەکەنە چونکە پێکەنینی زۆر (کە نیشانەی ئەوەیە هیچ غەمی غەمباران و هەژاران و لێقەوماوانی نییە کە ساتێکیش بۆ ئەوان غەمبار بێ) دڵ دەمرێنێ.

کەواتە: ئیمان و ئیسلامەتی و خواناسی هەر بە قسەی بێ کردەوە نییە، بەڵکو کۆمەڵێك نیشانە و کردەوە هەن کە ئەمانەی باسمان کرد و لە فەرموودەکەدا هاتوون بەشێکی گەورەیانن و ڕەوشتی مرۆڤی ڕۆشنبیر و پێشکەوتون.

بەڕێزان: ئێمە کە باسی وەرع دەکەین ئەبێ بە هەڵە لێی حاڵی نەبین، هەر وەکو شیخ الاسلام –إبن تیميّة(رحمه الله)فەرموویەتی: (تَمامُ الوَرعِ أن يَعلَم الأنسانُ خَير الخَيرَين، و شَرَّ الشَّرَين، و يَعلَمَ أنَّ الشَّريعَةَ مَبناها عَلى تَحصيلِ المَصالِحِ و تكميلها وَ تَعطيلِ المَفاسدِ و َتَقليلها). .

واتە: تەواوی وەرع ئەوەیە کە مرۆڤ جیاوازی بکات لە نێوان چاکترینی دوو چاکە وە خراپترینی دوو خراپە و لە یەکیان جیا بکاتەوە، وە مرۆڤ بزانێ کە شەریعەت بناغەکەی و بنچینەکەی لەسەر دەستەبەر کردنی خۆشبەختی بۆ مرۆڤ و تەواو کردنیەتی و وە پەکخستنی هۆیەکانی خراپە کاری و کەم کردنەوەیەتی.

کەواتە: خراپەکاری هەر دەمێنێ لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا و ئاینی ئیسلام ئاینێکی میثالی نییە، بەڵکو واقیع بینانە دەڕوانێتە کۆمەڵگا و هەوڵی ئەوە دەدا کە خراپە کەم بکاتەوە و ڕێگاکانی دابخات..

بەڵام ئەگەر کەسێك سنورە قەدەغە کراوەکانی شکاندبوو،حەرامە ئاشکراکانی ئەنجام دابوو. ئەمجا دەیویست کە خۆبپارێزێ و وارعی بکات لە شتە گوماناویەکاندا، ئەوە بەڕاستی بۆی ناکرێ، بەڵکو دەبێ ئامۆژگاری بکرێ کە جارێ واز لە حەرامە ئاشکراکان بێنە، ئەوجا باسی واریعی و خۆپارێزی لە شتە گوماناوییەکان بکە ، هەروەکو کە عبدالله ی کوڕی عومەر لە وەڵامی ئەو کەسەدا کە خەڵکی عێراق بوو پرسیاری

کرد: ئایا حوکمی شەرع چۆنە دەربارەی خوێنی مێشولە!! فەرمووی: (یَسألونَني عَن دَمِ البَعُوضِ وَقَد قتلوا الحُسَين)، واتە: بەڕاستی سەیرە، پرسیارم لێ دەکەن دەربارەی خوێنی مێشولە کەچی هەر ئێوە بوون ئەی خەڵکی عێراق کە حوسەینی کوڕی ئیمام عەلیتان بە ناحەق و بە زوڵم شەهید کرد! یاخود کابرایەك هاتە خزمەت (بشری کوڕي حارث) و پرسیاری لێ کرد دەربارەی پیاوێك کە: ژنی هەیە و دایکی داوای لێ دەکات کە دەبێ ژنەکەی تەڵاق بدات، وە ئەو خێزانەشی هیچ عەیب و کەم و کوڕیەکی وای تێدا نییە کە شایەنی تەڵاقدان بێت، بەڵکو هەر دایکەکە خۆی حەز بە چارەی ناکات... کابرا پرسی: ئایا دەبێ بەقسەی دایکی بکات و ژنەکەی بە بێ هۆ تەڵاق بدات، بۆ ئەوەی بێ قسەیی دایکی نەکات، یان بەقسەی نەکات و ژنەکەی بهێڵێتەوە؟! ئەم پیاو چاکە لە دین تێگەیشتووە و حاڵی بوو لە وەرع و خۆپارێزی- فەرمووی: (إنْ كانَ برَّ أُمهِ فِي كُلِّ شَيءٍ وَ لَم يَبقَ مِنْ برها إلاّ طَلاقَ زَوجَتهِ فَليَفْعَلْ، و إن كانَ يَبُرُّها بِطَلاقِ زَوجَتهِ ثُمَّ يَقُومُ بَعدَ ذالِكَ إلى أُمِّهِ فَيَضرِبها فَلا يَفعَل) جامعُ العلوم و الحكَم -إبنُ رجب الحنبلي- حديث رقَم:١١.

واتە: ئەگەر ئەو کەسە لە ورد و درشتی ژیانیدا گوێڕایەڵی دایکی کردووە هەرگیز لە قسەی دەرنەچووە تەنها ئەوە ماوە بەقسەی بکات کە تەڵاق دانی خێزانەکەیەتی، ئەوە با لەمەشدا بەقسەی دایکی بکات، بەڵام ئەگەر تەنها لەمەدا بەقسەی دایکی دەکات کە ژنەکەی تەڵاق بدات، پاشان هەر کە ژنەکەی جیابۆوە دەچێتەوە بۆ لای دایکی و دەست دەکات بە لێدانی، ئەوە با بەقسەی نەکات و ژنەکەی تەڵاق نەدات!.)

بەڵێ ئیمانداران: ئەمڕۆ ئێمە بە چاوی خۆمان ئەم ڕاستییە دەبینین کە کەسانێك هەن بە حیسابی خۆیان زۆر خۆ دەپارێزن لە شتە گوماناوییەکان و وەرع دەکەن و پرسیاری زۆر ورد دەکەن و لە زانایانی ئیسلام و شەرعزان دەربارەی هەندێ شت کە زۆر نادیارن و لە نێوان حەلاڵ و حەرامدا ئاشکرا نین، بەلام ئەگەر سەیری ژیانی ڕۆژانەیان دەکەی زۆر حەرامی زۆر ئاشکرا و دیار کە قورئان و فەرموودە باسی کردوون، ئەم بە ناو واریعە دەیانخوات و لە ناو ماڵ و شوێنی کار و کەسابەتیدا هەن و گوێشیان پێ نادات و هەروەکو خوێنی مێشولەکەی لێ هاتووە!!.

خۆشەویستان: خۆپاراستن لە شتە نادیارەکان و وارعی لە وەرگرتنی حوکمی شەرعیدا ئەوەیە ئاسانکاری وەرگری، نەك خۆت بخەیتە نارەحەتی و گرانکاری و وابزانی بەوە زیاتر لە خوا نزیك دەبیتەوە!. بۆ نمونە: کەسێك کە یەقینی هەیە و دڵنیایە کە دەست نوێژی هەیە بەلام بە بێ بەڵگە گومانێك دەکەوێتە دڵیەوە کە دەستوێژی شکابێ، بۆیە دەکەوێتە دودڵی و گومانەوە ئایا لە مزگەوت بچێتە دەرەوە و دەست نوێژ تازە بکاتەوە یان لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە و گوێ بە گومانەکە نەدات و نوێژەکەی بکات،ئەگەر کەسێك ئاگای لە شەرع نەبێ وا ئەزانێ واریعی ئەوەیە کە بە قسەی گومانەکەی بکات و وادابنێ کە دەستنوێژەکەی شکاوە، بەلام وارعی ڕاستەقینە لێرەدا ئەوەیە کە گوێ بە گومانەکەی نەدات و بە فەرموودە پیرۆزەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەفتار بکات کە فەرموویەتی ئەو کەسەی کە حاڵەتێکی ئاوای بەسەر هات ئەوا: (لا يَنْصَرِفُ حَتى يَسمَعَ صَوتاً أوْ يَجِدَ ريحاً) متفق عليه. واتەبا لە مزگەوت نەچێتە دەرەوە بۆ تازەکردنەوەی

دەستنوێژ هەتا گوێی لە دەنگێك دەبێ یان بۆنێك دەچێ بە لوتیا، کە بەڵگەن بۆ نەمانی دەستنوێژەکەی) کەواتە: ئیمانداری بەرێز وامەزانە قورس وەرگرتنی شەرع وەرعە بەڵکو ئەوە وەسوەسەیە..

ئیمانداران: خۆپاراستن لەو شتانەی لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدان و وەرع کردن لە هەموو کەسێك جوانە و کەسایەتییەکی تۆکمە بۆ خاوەنەکەی دروست دەکات، بەڵام وەرع لە چوار کەسدا جوانترە و وڵات جوانتر دەکات و بە هۆی ئەوانەوە زۆربەی هاوڵاتیانی ئەو وڵات و شوێنەش ئەو ڕەفتار و ڕەوشتە بەرزە هەڵدەگرن و دەبن بە واریع و خۆپارێز.

یەکەم: سەرکردە: ئەو کەسەی کە لێپرسراوی یەکەمە لە وڵاتدا تاوەکو ئەو سەرکردەیەی کە چەند کەسێك لەژێر فەرمانی ئەو دان، چونکە هەموو میللەت چاو لەسەرکردەی یەکەمی وڵات دەکەن و هەوڵی لاسایی کردنەوەی دەدەن، وە لانیکەم ئەوکۆمەڵە کەسەی کە لە ژێر فەرمانی کەسێکدان هەوڵی ئەوە دەدەن کە وەکو سەرکردەکەیان ڕەفتار و هەڵوێست بنوێنن، هەروەکو ئەم ڕاستیەمان بە کردەوە لە ژیانی پێغەمبەری پێشەوامانداﷺ بۆ دەردەکەوێ کە پێشەوا ٫بوخاری و موسلیم بۆمان دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (إني لأنقَلِبُ إلى أهلي فأجِدُ التَمَرةَ ساقِطةً عَلى فِراشي ثُمَّ أرفَعُها لآكُلَها، ثُمَّ أخشَى أن تَكونَ صَدَقَة مألقيها).

واتە:لە کاتێکدا چوومەوە بۆ ماڵی خۆمان و لای ماڵ و خێزانم، بینیم کە دەنکە خورمایەك لەسەر جێگاکەم کەوتووە، منیش هەڵم گرتەوە و پاشان بەرزم کردەوە بۆ لای دەمم بۆ ئەوەی بیخۆم، بەڵام ترسام کە ئەمە هی زەکات بێ، بۆیە نەمخوارد و فڕێمدایەوە..

بەڵێ ئەمەیە پابەندبوون بە یاساوە، چونکە خوای گەورە کردوویەتی بە بەندێکی یاسای ئیسلام کە نابێ پێغەمبەری خوا و بنەماڵەکەی زەکات بخۆن، خۆ ئەم دەنکە خورمایە تەنها گومانی لەسەر بوو کە لەوانەیە زەکات بێ یان نا، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی پاراست لە خواردنی شتی گوماناوی و بە کردەوە سەلماندی کە یەکەمین سەرکردەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئاوا واریع بێ و تەنانەت خۆی نەك لە هەموو حەرامێك بەڵکو لە دەنکە خورمایەکی گوماناوی پاراستبێ لە کاتێکدا لەوانەیە زۆریشی برسی بوبێ بۆیە بە چاوپێکەوتنی هەڵی گرتۆتەوە!...

بەڵێ باسمان کرد کە ئەگەر سەرکردە ئاوا واریع و خۆپارێز بوو، بێگومان شوێنکەوتوانی شوێنپێی هەڵدەگرن و وەکو ئەو ڕەفتار دەکەن. هەر بۆیە هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو سەرکردە و پێغەمبەرەکەیان ئاوا خۆیان لە هەموو شتێکی گوماناوی نێوان حەڵاڵ و حەرام دەپاراست لە ناو هەموو هاوەڵاندا باسی کەسێك دەکەم کە درێژترین ماوە سەرکردایەتی هەموو ئومەتی ئیسلامی کردووە کە ئەویش عومەری کوڕی خطابە ﷺ، مێژوو دەڵێ کاتێ خەلیفە عومەر موچەی بۆ موهاجرین ئەوانەی کاتی خۆی لە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە کۆچیان کردبوو بۆ مەدینە و لە پێناو ئیسلامدا ماڵ و سامان و خانوو و زەوی و ئاژەڵیان لەدەست دابوو، وە دواتریش لە فەتحی مەککە بەدواوە لەخزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ نەگەڕانەوە بۆ مەکە و نەچوونەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان حەزرەتی عومەر وەکو ڕێزلێنانێك و پاداشتێك بۆیان بڕیاری دا موچەیان لە دەوڵەتی

ئیسلامیەوە بۆ دابین بکات، هەر یەکێ لە موهاجرین (٤٠٠٠) دیرهەمی بۆ بڕیار درا، بەڵام لە ناو هەموویاندا حەزرەتی عومەر بڕیاری دا کە مووچەی (عبداللە)ی کوڕی (٣٥٠٠) دیرهەم بێ، واتە ٥٠٠ دیرهەمی لەوانی تر کەمتر بێت، صەحابەکان بە سەرسوڕمانەوە لە حەزرەتی عومەریان پرسی: هُوَ مِنَ المُهاجرین، فَلِمَ نَقَصتهُ مِن اربَعة آلاف؟! خۆ عبداللە ش کوڕی خۆتە لە موهاجرینە، ئەی بۆچی موچەکەی ئەوت لە چوار هەزار کەمتر کردووە؟!! (سەرکردە دونیا پەرستەکان چاوەڕێی ئەوەیان لێ دەکرێ کە هەرگیز نابێ موچەی نەوەکانیان وەکو موچەی خەڵکی تر بێت، بەڵکو دەبێ چەند قاتی ئەوان بێ) صەحابەکان ئەمەیان بە غەدر دەزانی کە خەلیفەی دادپەروەر لە کوڕەکەی خۆی بیکات، کە دادپەروەری تەواوی حەزرەتی عومەر ﷺ تەنها لەوەدا دەرکەوتایە بەس بوو کە موچەی کوڕەکەی خۆشی هەروەکو خەڵکی تر بێ و زیاتر نەبێ.. بەڵام ئەگەر کەمتر بێت عبداللە مەغدور دەبێ، بۆیە ئەو پرسیارەیان لە حەزرەتی عومەر کرد، بەڵام حەزرەتی عومەر وەڵامێکی ئەوەندە نایابی دانەوە کە مێژوو بۆ هەتا هەتایە تۆماری کردو هەرگیز لە بیر ناچێتەوە، فەرمووی: (إنما هاجَرَ بِهِ أبَواهُ، لَیسَ هُوَ کَمَن هاجَرَ بنَفْسِهِ). واتە: ئاخر لە ڕاستیدا عبداللە ی کوڕم لە لایەن من و دایکییەوە هیجرەتی پێ کراوە و لە کاتی هیجرەتدا بە باوەشی من و دایکی هەڵگیراوە، ئیتر چۆن دەبێ وەکو کەسێك موچەی بۆ دابنرێ کە بە قاچی خۆی هیجرەتی کردووە و کەسێکی باڵغ و تەواو بووە؟!!) ئەم بەسەرهاتە ئیمامی بوخاری ڕەحمەتی خوای لێ بێ گێڕاویەتیەوە.

هەر ئەم حەزرەتی عومەرە هەر کاتیٚ کەسێك بۆ ئیشی تایبەتی خۆی کە پەیوەندی بە کارو باری موسڵمانانەوە نەبوایە بچوایە بۆ لای، چرای بیت المال ی دەکوژاندەوە و دەیفەرموو: ئەم چرایەی ناو بیت المال زەیتەکەی بە پارەی میللەت کڕدراوە نابیٚ بۆ بەرژەوەندی میللەت نەبیٚ کەس قسە و باسی لەبەر بکات و سودی شەخصی لە رووناکییەکەی ببینیٚ!!!

بەڵام ئەمڕۆ دەبینین کە سەرکردە خۆی کارەبای فول لەسەر حسابی میلەت بەکار دەهێنیٚ و هەرگیز گڵۆپ لەماڵیا ناکوژێتەوە و لە زستان وهاویندا سپلیت ناهێڵیٚ پانکە و سۆپا ماڵەکەی ببینیٚ، کەچی بە ڕادیۆ و تەلە فیزۆن داوا لە هاولاتی دەکات کە کارەبا کەم بکاتەوە و گڵۆپی زیاد دانەگیرسێنیٚ!! دەیان بەرپرس باسی گەندەڵی لە بەڕێوە بردنی ولاتدا دەکات کەچی خۆی یەکێکە لە گەندەڵەکان، کەچی ڕەخنە لە ئیسلام و ئیمامی عومەر دەگریٚ و بە کۆنە پەرستی دەزانیٚ!! بەڵیٚ ئیمانداران: هەر کاتیٚ سەرکردە خۆپارێز بوو، واریع بوو ئەوا میللەتیش بە شێوەیەکی گشتی واریع دەبیٚ و نەك هەر حەرام ناخوات بەڵکو شتی گوماناویش ناخوات. هەر بۆیە کاتیٚ ئەو هەموو زێڕ و گەوهەر و مادە گرانبەهایانەی دەوڵەتی فارسی کەوتە دەستی موسڵمانان و سوپای ئازادی بەخشی‌یە ئیسلام، هەمووی هاتە خزمەتی خەلیفە و کە سەیری کرد شتی زۆر بچوکی تێدایە کە دەیان لێی لە گیرفاندا جێیدەبێتەوە و بە ئاسانی هەڵدەگیریٚ و دەدزریٚ و لە نرخیشدا لە ئاڵتوون بە نرخترە، کەچی بە ئەمانەتەوە لە ناو هەموو چیا و چۆڵ و بیابانەوە گەیشتۆتە بیت المال بۆ ئەوەی لە خزمەتی تەواوی موسڵماناندا بەکار بێت.

حەزرەتی عومەر سەرکردەی یەکەمی وڵات کە ئەوەی بینی گریا و فەرمووی: ئای سەربازانێکی چەند دەست پاك و ئەمینن کە خیانەتیان نەکردووە لە بچوکترین دەستکەوتیش. یەکێ لەوانەی لەوێ ئامادە بوو فەرمووی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەمە بۆ تۆ و واریعی و پاکی تۆ دەگەڕێتەوە، سوێند بە خوا ئەگەر تۆ ناپاك و حەرام خۆر بوویتایە و تۆ بە مثقاڵ لەو ماڵ و سامانەی میللەتە کە لە ژێر دەستایە خیانەتت بکردایە، ئەوا سەربازەکانت بە تەن دزییان دەکرد و ئەم شتە گران بەهایانە ئاوا بە سەلامەتی نەدەگەیشتنە خەزێنەی دەوڵەت!!بێگومان ئەوە پەروەردەی ئیسلامە کە سەرکردەی ئاوا واریع و دەست پاك پەروەردە دەکات.

دووەم: دووەم چین لەو چین و کەسانەی کە واریعی لەواندا زۆر جوانە و گەل و میللەت بە چاولێکەری ئەوان دەبێ بە واریع و خۆپارێز لە شتی گوماناوی، عالم و زاناکانن. جا کە دەڵێن زانا هەموو جۆرە زانایەك دەگرێتەوە لە هەر بوارێکی زانستدا بێت، بە تایبەتی ئەوەی ئێمە مەبەستمانە لەم باسەدا زانایانی ئاینییە، ئەو کەسانەی کە پۆشاکی زانایانیان لەبەردایە و لە مینبەر و میحرابەکانەوە ڕێنمایی موسڵمانان دەکەن بۆ چاکە کاری و حەڵاڵ خۆری ، ئەوانە میللەت چاوی لە گەورە و بچوکی وتە و هەنگاو و هەڵوێستیانە، وە ئەوەندەی خەڵکی سەیری کردەوەیان دەکات، سەیری قسە و وتەیان ناکات، بۆیە ئەگەر زانایەکی ئاینی بۆ خۆی وەرع نەکات وە لەو شتانەی کە لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدا لە گوماندان خۆی نە پاراست، ئەوا میللەت بە چاولێکەری ئەو خراپتر دەکات و دەست دەکات بە حەرام خواردنی ئاشکرا، بۆیە کاتێك قسەی زانای ئاینی کاریگەری کردەیی –عەمەلی– لەسەر ژیانی ڕۆژانەی هاوڵاتیان دەبێ و وایان لێ دەکات کە واز لە حەرام خۆری

بهێنن، کاتێ ئەو زانا وتاربێژە بۆ خۆی نەك هەر حەرام نەخوات بەڵکو واز لە هەموو شتێك بهێنێت کە گومانیشی لەسەر بێت ئایا حەرامە یان نا.

زۆربەمان ئەو باسەمان بیستووە کە دایکێك ڕۆڵەکەی دێنێتە خزمەت ئیمامی عومەر بۆ ئەوەی ئامۆژگاری بکات کە واز لە خورما خواردنی زۆر بێنێ چونکە لاشەی حەساسیەتی پێی هەیە و بەقسەی دایکی ناکات، ئیمامی عومەر فەرمووی: خوشکەکەم منداڵەکەت ببەرەوە بۆ ماڵەوە و بەیانی بیهێنەرەوە ئامۆژگاری دەکەم، ڕۆژی دواتر کە دایکەکە منداڵەکەی بردەوە خزمەتی، ئیمامی عومەر فەرمووی:ڕۆڵەگیان لەمەودوا ئەبێ بەقسەی دایکت بکەی و زیادە ڕۆیی نەکەی لە خواردنی خورمادا..

دایکەکە بە سەرسوڕمانەوە وتی: ئەی ئەمیری ئیمانداران: ئەگەر ئامۆژگارییەکەت هەر ئەو دوو قسەیە بوو، ئیتر بۆچی هەر دوێنێ پێت نەدەوت و دوو جار هاتوچۆت پێ کردم؟! حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئاخر دوێنێ من خۆم خورمایەکی زۆرم خواردبوو، ئەگەر بە کوڕەکەی تۆم بوتایە خورما مەخۆ، هیچ کاریگەرییەکی نەدەبوو، بۆیە وتم بەیانی وەرەوە، چونکە لە دوێنێوە هەتا ئەمڕۆ بۆ خۆم هیچ خورمام نەخواردووە، بۆ ئەوەی ئامۆژگارییەکەم لەسەر کوڕەکەت کاریگەری هەبێت! بەڵێ ئەمە واقیعە و وەکو ئەو دکتۆرە وایە کە خۆی جگەرە بەدەستیەوەیەتی کەچی لەو کاتەدا ئامۆژگاری نەخۆش دەکات کە خۆی بپارێزێ لە جگەرە کێشان!

وە ئەو بەسەر هاتەش زۆر گێردراوەتەوە کە کاتێ پێشەوا –ئەبو حەنیفە– ڕەحمەتی خوای لێ بێ منداڵێك ئەبینێ یاری دەکات و لە نزیك چاڵێکی قوڕاودایە، ئەفەرموێ: ڕۆڵەگیان ئاگات لە خۆت بێت نەخلیسکێی و نەکەویتە ناو قوڕاوەکە! منداڵەکە بە فیطرەت و دەرونی

پاکی دێتە گۆ و دەڵێ: مامۆستاگیان تۆ خەمی منت نەبێ، بەڵکو ئاگات لە خۆت بێ کە نەخلیسکێی چونکە من دایکم پاکم دەکاتەوە و بەرگەکانم بۆ دەشوات، بەڵام ئەگەر تۆ بخلیسکێی ئەوا ئومەتێك چاوت لێ دەکات و لە ڕێگای ڕاست لادەدات و ئیتر کێ خاوێنیان بکاتەوە!!

هەزار ڕەحمەت لە ئیمامی شافعی کە فەرموویەتی: (زِينَةُ العِلمِ الوَرْعُ وَ الحِلْمُ).

واتە:زینەت و جوانی زانست کە پێی دەڕازێتەوە و سەرنجی خەڵکی بەلایدا ڕادەکێشێ دوو شتە: یەکەم واریعی و خۆپارێزی، دووەم: نەرم و نیانی و لەسەر خۆیی و پشو درێژی، بەڵێ هەر مەلا و زانایەك ئەم دوو ڕەوشتە بەرزەی تێدابێ، ئەوا دەبێتە ڕێگا نیشاندەری ڕاستەقینەی خەڵکی و موسڵمانان لە دەوری کۆدەبنەوە و هەموو قسەکانی بە کردەوە جێبەجێ دەکەن.

لێرەدا بە داخەوەوە دەڵێم: کە زۆربەی مامۆستا ئاینییەکان کە دیعایەی ئەوە دەکەن کە لەسەر مەزهەبی پێشەوا شافعین، بەڵام ئەم دوو ڕەوشتە بەرزەی کە پێشەوا شافعی ئاماژەی پێ کردن کە لە عالم و زانادا هەبن، کەمتر لە خۆیاندا بەدی دەکرێ، زۆر نین ئەو زانایانەی کە بەراستی واریعن و لە هەموو گومانێك خۆیان بە دوور گرتوە. دووەم:زۆرێك لە زاناکان و وتاربێژەکان زوو هەڵدەچن و زمانی زبر و توڕەبوون لەجیاتی لەگەڵ ناحەزانی ئیسلامدا بەکار بهێنن لەگەڵ ئەو خەڵکە بەکاری دەهێنن کە هاتوون گوێیان بۆ بگرێ و ماندوبون و شەکەتی و نائارامی دەرونی کە لە ناو ماڵ و منداڵ و بازار بگرە و بەردەی دونیادا توشی بووە لە مزگەوتدا پشویەك بدات و دڵ و دەرونی

لە ڕێگەی ئەو وشانەی کە لە مینبەرەوە ئەیانبیستێ،بەڵام بە داخەوە زۆرجار بە کۆمەڵێك زەجر و هەڕەشە و ترساندنەوە دەگەڕێتەوە ، لەگەڵ ئەوپەڕی دوعای خێر و قەدر و حورمەت بۆ هەموو وتاربێژان و ماموستایانی مێزەر سپی کە دەبێ کردەوەکانیان وەکو مێزەرەکەی سەریان سپی بێت و بە کردەوە لەسەر ڕێبازی ئیمام شافعی بن.

خۆشەویستان: لەم ساڵانەدا مامۆستای مزگەوتێك لە بریطانیا لەناو پاصدا دەبێت، لە کاتی پارە کۆکردنەوەدا، شۆفێری پاصەکە (٢٠) بەنس زیادە لەگەڵ باقی پارەکە ئەداتەوە بە مامۆستا ئاینیەکە، مامۆستا کە بیری کردەوە پارە زیادەکە بگێڕێتەوە بۆ شۆفێرەکە چونکە هەقی ئەو نییە و زیادەیە، پاشان هات بە خەیاڵیدا خۆ پارەکە ئەوەندە نییە شایەنی باس بێت، ئیتر بۆ بیگێڕمەوە، کێ گوێ دەداتە ئەوە! دوای ئەوەش خۆ کۆمپانیای ئەو پاصانە پارەی باشیان دەست دەکەوێت، خۆ پەکیان بەو ٢٠ بەنسە نەکەوتووە،بۆ بیاندەمەوە وا ئەزانم ڕزقێکە و خوا ناردوویەتی، لە کاتی ئەم بیرکردنەوەیا بوو کە پاصەکە وەستا و ئەو شوێنە بوو کە مامۆستا دەیویست دابەزێت، بەڵام لە دەم دەرگاکەدا مامۆستا ئاینیەکە نەفرەتی لە شەیتان کرد و پارەکەی دایەوە بە شۆفێرەکە وتی: ئەوە لە حەقی خۆم زیاترت داومەتەوە، شۆفێرەکە بە زەردەخەنەوە وەریگرت و وتی: تۆ مامۆستای ئاینی تازەی ئەم ناوچەیە نیت؟! وتی: بەڵێ، وتی: من ماوەیەکە دەمەوێت بێم بۆ مزگەوتەکەتان تا لە ئیسلام شارەزا ببم و بە ئەنقەست زیادم دایتەوە تاوەکو تاقیت بکەمەوە، مامۆستا کە دابەزی قاچی هەڵی نەدەگرت، بۆیە دەستی گرت

بە عەمودێکەوە و سەری هەڵبڕی بۆ ئاسمان و بە گریانەوە وتی: خوایەگیان خەریك بوو ئیسلام بە (٢٠) بەنس بفرۆشم!!

سێیەم: سێیەمین کەس و چین لە ناو کۆمەڵدا کە زۆر پێویستە واریع و پاك بن و کاریگەری ڕاستەوخۆیان دەبێت لەسەر جەماوەر، بازرگانەکانن یاخود هەموو کەسێك کە لە بواری بەرهەمهێناندا کار دەکات.. ئەگەر کڕیار بینی وا بازرگان یان خاوەن پیشە خۆپارێزە لە هەر شتێك کە گومانی لێ دەکات کە حەرامی تێکەڵ بوبێت، ئەوا ئەویش هەستی حەڵاڵخۆری بۆ دروست دەبێت، بەڵام ئەگەر بینی فرۆشیار نەك هەر واریع نییە، بەڵکو شتی خراپیشی بە چاك پێ فرۆشتووە، ئەوا هاوڵاتی کڕیاریش بیری دەچێت بە لای حەرام خۆری و حەرام پەیداکردن و غەش و فێڵ کردن لە کەسێکی تر، کە بە داخەوە بە هۆی نەمان یاخود کاڵ بوونەوەی بڕوابوون بە چاودێری خوایی و لێپرسینەوەی قیامەت زۆربەی زۆری بازاڕی ئەمڕۆ بۆتە جێگای دەست بڕین و هەر چییەك دەیکڕی لێی دڵنیا نیت، وە ئەوەی چارەسەری ئەمەش دەکات پێش هەموو شتێك و دەست تێوەردانێکی حکومەت لە بازاڕ و کاری بازرگانی بریتییەیە لە دروست کردنەوە و ژیاندنەوەی بیری خواناسی و ئیمان بە قیامەت و بەوەی کە لەسەر (مثقال ذرة) لێپرسینەوە هەیە و خوایەك هەیە ئاگادارە نەك لە کردەوە ئاشکراکانت، بەڵکو ئاگاداری ئەوەشە کە لە ناو ناختدایە و بیری لێ دەکەیتەوە و هێشتا لە ناو سینەتدا نەهاتۆتە سەر زمانت!! وە لەوانەیە بپرسی ئایا: کەسانێکی وا هەن؟ لە وەڵامدا دەڵێم: بەلێ، ئەوە ئیسلامە کە بە هەزاران کەسانی بەویژدان و نەك هەر دەست پاك بەڵکو پێش دەست دەروون

پاك دروست دەكات، كە نەك هەر نزیكی حەرام نابێتەوە، بەڵكو موحاسەبەی دڵی خۆیشی دەكات لەسەر ئەوەی كە بە زەرەری موسڵمانێك خۆشحاڵ بێت و بە كردەوە سزای دەدات، یەكێ لەو كەسایەتییە خواناسانە، كە بازرگانێكی دەوڵەمەند بووە،واتە: هەم پیاوی ناو مزگەوت بووە ئەهلی شەونوێژ و ڕۆژوی سوننەت و زیكر و فكر بووە، هەم ئەهلی بازاڕ و كڕین و فرۆشتن بووە،ئەم پیاوە بەڕێزەش ناوی (المسوّر بن مخرمه) بووە، ئەم بازرگانە خواناسە گەنم و دانەوێڵەیەكی زۆری كڕی بوو لە كاتی هەڵگرتنی خەرماندا و كردبویە ناو عەمبارەكانیەوە، بەرە بەرە لێی دەفرۆشت و بیریشی كردەوە كە ئەوەی نەفرۆشراوە تاوەكو پایز و زستان ئەوا قازانجێكی زۆرتر دەكات، كات پایز بوو و وەختی بارانی پەڵە بوو، لە ناو دوكانەكەیدا دانیشتبوو، چاوی كەوت بە هەورێكی ڕەش كە هێمای ئەوەی پێوە بوو كە بارانی هەڵگرتبێ، لەم كاتەدا لە ناخیەوە پێی ناخۆش بوو بباریێ، چونكە ئەگەر ماوەیەكی تر بارانی پەڵە دوا بكەوتایە گەنم و دانەوێڵەكەی ئەم زیاتر نرخی بەرز دەبووەوە، (هەرچەندە ئەو بەو مەبەست و نیازەش نەیكڕیبوو كە بۆ گرانی هەڵی بگرێ، واتە: إحتكار- بكات كە لە شەرعدا حەرامە)، بەڵام هەر دەست بە جێ و لە هەمان جێگادا لۆمەی نەفسی بەدخوی خۆی كرد و بە خۆی گوت: ئەوە چییە لە كەیەوە وام لێ هاتووە، كە بە قازانجی موسڵمانان دڵگران بم، لە پێناوی ئەوەدا كە بۆ خۆم هەندێ پارەم دەست بكەوێ! تەوبە و ئیستغفاری كرد و بڕیاری دا كە بە كردەوەش سزایەكی توندی نەفسی بدات، بۆیە هەر لەوێدا بڕیاری دا كە ئەو دانەوێڵەیەی بە چ نرخێك

کڕیوە لە کاتی مانگی خەرماندا کە دانەوێڵە لە هەموو وەختێکی ساڵ تێیدا هەرزانترە، هەر بە هەمان نرخ بیفرۆشێتەوە و هیچ قازانجێکی نەخاتە سەر، خەڵکی کە ئەمەیان زانی زۆر بە لایانەوە سەیر بوو، چۆن ئاوا لە پایزدا بە نرخی هاوین دانەوێڵە دەفرۆشێ، ئەوانەی کە باش نەیاندەناسی خەریك بوو گومان لەوە بکەن کە دانەوێڵەکەی تێك چووبێت، بۆیە ئەم باسەیان بۆ حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب کە خەلیفەی موسڵمانان بوو گێڕایەوە، ئەویش بانگی کرد و لێی پرسی: ئەوە چۆنە هیچ قازانج ناخەیتە سەر دانەوێڵەکەت؟! (مەسوەر)یش بە ناچاری تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە،حەزرەتی عومەر زۆر دڵخۆش بوو بەم بڕیارە بوێر و دلێرانەیە کە بە ڕاستی هەڵوێستی موسڵمان دەبێ ئاوا بێت، وە زۆر دڵخۆش بوو کە بازرگانی ئاوا لە ناو وڵات و میللەتدا هەبێت و نیشانەی ئەوەیە کە خوای گەورە بەرەکەتیان بەسەردا دەڕێژێ، بۆیە زۆر دەست خۆشی لەو بازرگانە بەویژدانە دڵ پڕ لە ئیمانە کرد وفەرمووی: پاداشتی تۆی بەڕێز هەر بە خوای گەورە دەدرێتەوە و هەر ئەوەندەت پێ دەڵێم: جَزَاكَ اللهُ خَيْراً.. یا ڕەبی خوا پاداشتی بە خێرت بداتەوە و نمونەت زیاد بکات..

ئای چەند جوانە، چەند جێگەی دڵخۆشییە کە بازرگانەکانی ئێمەش ئاوا بیر بکەنەوە، ئای برای ئیماندار تۆش خۆت بپارێزە لە شتە گوماناویەکان، هەر شتێ کە زیان بە منداڵێکی بێ گوناه دەگەیەنێت، وەکو هەڵمات و میزەڵان و دەمانچەی میروو تراقە و تەقەمەنی، هەرچەندە بە پارەی خۆت دەیکڕی و دەیفرۆشی، بەڵام چونکە سود ناگەیەنێ و بگرە لە ڕووی تەندروستی و لاشەوە زەرەر لە منداڵ دەدات،

فرۆشتنی گەر تەواو حەرامیش نەبێ، مەکروهو ناپەسەندە و دەبێ خۆتی لێ بپارێزی... تۆش ئەی برای شۆفێر، ئەگەر زانیت ئەو نەفەرانەی بەکرێت دەگرن کە بیانبەی بۆ شوێنێك، بۆ خواردنەوەی عەرەق، یان بۆ قوماركردن، یان بۆ تێکەڵی ناو ڕەشبەڵەکی شایت دەبەن، ئەوا پارەت نەوێ و بڵێ من ناتوانم بتانبەم و خۆت مەکە بە شەریکی ئەو تاوانە.

روداوێکی واقعی کە چەند ساڵێك لەمەوبەر ڕویدا بۆتان دەگێڕمەوە: کوڕێکی گەنج عەرەبانەیەکی پێ دەبێت لە ناو بازاڕدا کەلوپەل بگوازێتەوە بۆ خەڵکی، گەنجێك کە لە سیما و جل و بەرگ و پێڵاویدا سیمای هەژاری و موحتاجی دەبینرا، بەڵام نەفس بەرز کە ئامادە بوو بە دوای عەرەبانەیەکی ئاسندا بڕوات و پەلاماری حەرام نەدات، لە ناو بازاڕ کابرایەکی ورگ زل، کە سیمای دەوڵەمەندی و پارەداری لە جل و بەرگ و بۆنی عەتر و سەر و سیمایدا دەردەکەوێت، داوا لەم کوڕە گەنجە عەرەبانچییە دەکات کە ئەو کارتۆنانەی بۆ بار بکات بۆ فلان گەراج بۆ لای سەیارەکەی، کوڕە گەنجەکەش بە دڵخۆشییەوە لەگەڵی دەڕوات تاوەکو بەردەم دوکانی عەرەق فرۆشێك لە بەردەم دوکانەکەدا یەکدوو کارتۆن دانراوە، کابرای دەوڵەمەند بە کوڕە گەنجەکە دەڵێت: ئەوە کارتۆنەکانە و باری بکە. بەڵام گەنجەکە بە بینینی دوکانی عەرەق فرۆشی و دانانی ئەو کارتۆنانە لەبەردەمی ئەو دوکانەدا ئەکەوێتە گومانەوە و بە کابرای دەوڵەمەند دەڵێ: بەڕێز ناچارم پرسیارێك بکەم: ئەم کارتۆنانە چییان تیایە؟! ئەویش زۆر بە سادەیی دەڵێ: تەنها عەرەق و بیرەیە! بۆچی؟! گەنجەکە دەڵێ: دەی من ناتوانم ئەو شتانە بخەمە سەر عەرەبانەکەم! کابرا دەڵێ: خۆ شتێکی وا قورس نییە، هەر چەند کیلۆیەك دەبێ! گەنجەکە دەڵێ: مەبەستم قورسی و سوکی نییە ، مەبەستم

ئەوەیە حەرامە و خوای گەورە قەدەغەی کردووە و پێغەمبەری خواﷺ نەفرەتی کردووە لەو کەسەی کە عەرەق دەگوازێتەوە و باری دەکات و دایدەگرێ، ئیتر من چۆن دەتوانم شتی وا بکەم!! کابرای دەوڵەمەند دەڵێ: کوڕی باش تاقەتم نییە بڕۆم بە شوێن عەرەبانەیەکی تردا و سەیارەکەشم بۆ نایەتە ئەم شوێنە قەڵەباڵەغە، ئیتر چەند پارە داوا دەکەی ئەتدەمێ و خێرا باری بکە بۆم! کوڕە گەنجەکە بە دڵێکی پڕ لە ئیمانەوە دەڵێ: باوەڕ بکە من بۆ دینارێك موحتاجم، وە زۆر دڵم خۆش بوو کە تۆ پێت وتم وەرە ئەو شتانەم بۆ هەڵبگرە بۆ ئەو گەڕاجە، بەڵام کە زانیم حەرامە، دڵنیابە ئەگەر هەموو سەروەت و سامانەکەی خۆتم بدەیتێ تەنها دەستیشی لێ نادەم!! ئەم قسانە ئەوەندە بە ڕاستگۆیی و دڵێکی پاکەوە دەکات کە کابرای دەوڵەمەند سەری سوڕدەمێنێ لە پاکی و خواناسی ئەم گەنجە بەو هەژاری و موحتاجیە. بۆیە فیطرەتی بە ئاگا دێتەوە هەر لەوێدا خوای گەورە بە بەرەکەتی ئەم گەنجە وارعە و خواناسە دەرونپاکە، هیدایەتی دەدات و دەڵێ: توخوا تۆ بەو هەژاریە ئامادە نیت کە بێ فەرمانی ئەو خوایە بکەی، کەچی من بەم هەموو سەروەت و سامانەوە گوێ بە فەرمانی خوا نادەم، تۆ بەو هەموو موحتاجیە کە بە ئاشکرا پێتەوە دیارە تەنەزول بۆ حەرام ناکەیت و سەری بەرزت دانانەوێنی بۆ حەرام، کەچی من بەو هەموو سامانەوە کە هەمە دەیان جار تەنزولم بۆ چەند دینار و دۆلارێك کردووە! وە هەرگیز نەمپرسیوە ئەمە حەڵاڵە یان حەرامە! تۆ زۆر لە من گەورەتر و بەڕێزتری و وا بڕیارم دا کە منیش وەکو تۆ پیاوانە و مەردانە و موسڵمانانە بژیم و تاماوم عەرەق نەخۆمەوە، هەر لەوێدا کارتۆنە عەرەقەکانی بەجێ دێڵێ و بە زۆر و بە سوێند هەندێ پارە دەبەخشێ بە گەنجە عەرەبانچییەکە و گەنجەکەش دوعای خێری بۆ دەکات و پیرۆزبایی ئەم هەنگاوە نوێیەی لێ دەکات و ناونیشانی یەکتری

وەردەگرن و هەموو حەفتەیەك لە مزگەوتێکی دیاری کراودا لای مەلایەکی شارەزا و وتارجوان بە یەکەوە نوێژی هەینی ئەنجام دەدەن!.

بەڵێ بەڕێزان: ئەگەر ئەهلی کەسابەت و بازاڕمان ئاوا واریع بن، ئاوا دەبنە مایەی ڕەحمەت بۆ خۆشیان و هەموو ئەو کەسانەش کە ئەمان هەڵس و کەوتیان لە گەڵدا دەکەن.

چوارەم: چوارەم کەس و چین کە پێویستە بە ڕەفتاری جوان و باڵای – واریعی– خۆیان بڕازێننەوە و کاریگەری گەورەیان دەبێت بۆ سەر کەسانی تر، دایك و باوکە، چونکە ئەگەر دایك و باوك گاڵتەیان بە حەڵاڵ و حەرام هات، ئەوا ڕۆڵە و ئەولادەکانیان گوێ بە هیچ نادەن و نازانن حەرام و حەڵاڵ جیاوازییان هەیە یان نا، بەڵام ئەگەر دایك و باوك نەك هەر حەرامیان نەخوارد بەڵکو خۆیان لە شتە گوماناوییەکان پاراست و وەرعیان کرد، ئەو کاتە ئەو مناڵەی لەو ژن و پیاوە واریعە پەیدا دەبێ إنشاء الله مناڵێکی زۆر خواناس دەردەچێ، وە ئەو مناڵەش کەلە وماڵەدا و لە باوەشی ئەو دایك و باوکەدا پەروەردە دەبێ، هەمان ڕەفتاری دایك و باوکی دووبارە دەکاتەوە و خۆی لە گوماناوییەکانیش دەپارێزێ، چ جای حەرام خۆری، لە مێژووی ژیانی پڕ بەرەکەت و پرشنگداری پیاوچاکاندا بەسەرهاتێکی زۆر نایاب و ناوازە هەیە و حەز دەکەم بە یەکەوە گوێی بۆ بگرین:

کوڕێکی گەنجی بەڕێز و ڕەوشت بەرز ناوی (ثابتی کوڕی ئیبراهیم)بوو، ڕۆژێکیان لە دەرەوەی شاری (کوفە)دا بە قەراغی جۆگە ئاوێکدا دەڕۆیشت، لە ناو ئاوەکە چاوی کەوت بە سێوێك کە لە دارێك لە دار سێوەکانی ناو ئەو باخە سێوانەی کە جۆگە ئاوەکەی لێ دەهاتە دەرەوە کەوتبوە خوارەوە، ئەم گەنجە دەستی برد بۆ سێوەکە و نیوەی خوارد، دوای ئەوە کە هێشتا نیوەی سێوەکەی هەر بە دەستەوە بوو،

بیری کردەوە کە ئەم باخە خاوەنی هەیە ، لەبەر ئەوە وازی لە نیوە سێوەکەی تر هێنا کە بە دەستییەوە بوو، بردی بۆ لای خاوەن باخەکە و پێی وت: لێم ببورە و گەردنم ئازاد بکە لەوەی کە خواردومە و ئەمەش نیوەکەی تری سێوەکە، پیاوەکەش وتی: من ناتوانم لێت ببورم چونکە من باخەوانم، خاوەنی ئەم باخە شەو ڕۆژێك لێرەوە دورە، ثابتی کوڕی ئیبراهیم وتی: هەرچەندە دوور بێت پێویستە بچم، چونکە دروست نییە و گومانی حەرامی تێدایە کە لەتە سێوێك بخۆم لە کاتێکدا خاوەنەکەی بێ ئاگا بێت لێی!.. بەڵێ ڕێگای دور و درێژی گرتە بەر تا گەیشتە بەردەرگای خاوەن باخەکە و سەلامی لێ کرد وتی: قوربان گەردنم ئازاد بکە و لێم ببورە من نیوەی ئەم سێوەم لە باخەکەی تۆ خواردوە، ئەمەش نیوەکەی تریەتی، خاوەنی باخەکە سەیرێکی کرد و وتی: لێت خۆش نابم و گەردنت ئازاد ناکەم هەتا ئەم مەرجەم بەجێ نەهێنی، ثابت فەرمووی: مەرجەکەت چییە؟!! وتی: دەبێت کچەکەم مارە بکەیت!! ثابتی گەنج بە سەرسوڕمانەوە فەرموی: باشە ئایا سزای خواردنی لەتێك سێو بریتیە لە مارەکردنی کچی خاوەن باخ؟! باوکی کچەکە وتی: بەڵام با پێناسەی کچەکەمت بۆ بکەم، کچەکەی من کوێر و کەڕولاڵە، لە ماڵدا دانیشتووە! ثابت تۆزێك بیری کردەوە لە دڵی خۆیدا وتی: ئەگەر ئافرەتێك بەو جۆرە بێت کەی بۆ شوکردن دەگونجێت؟! بەڵام چار نییە خاوەن باخەکە گەردنم ئازاد ناکات، هەتا ئەو ئافرەتە مارە نەکەم، لەبەر ئەوە بڕیاری دا کە ڕازییە بەو کچە و لەبەر خاتری خوای گەورە خزمەتی دەکات، دوو شایەتیان ئامادە کرد و مارە بڕین تەواو بوو، خاوەن باخەکە دەستی کچەکەی گرت و بردی بۆ ئەو خانوەی کە ثابت بە کرێی گرتبوو، کاتێ ثابت چووە ژورەوە بۆ لای کچەکە وتی: السلام علیکم. لە دڵی خۆیدا وتی: خۆ دەزانم لاڵە و

ناتوانێ وەڵامم بداتەوە، بەڵام خۆ فریشتەکان وەڵامم دەدەنەوە، بەڵام کاتێکی زانی کچەکە وەڵامی دایەوە، ثابت سەری سوڕما!! کەواتە: کەڕ نییە و لاڵ نییە و ئیفلیج و گۆجیش نیە، خۆ چاوی دەمبینێ و بەرەو ڕووم دێت ئافرەتێکی زۆر جوان و ڕێکوپێکە، بە سەرسوڕمانەوە بە ئافرەتەکەی وت: باشە بۆچی باوکت ئاوا وەصفی تۆی بۆ کردم؟!کچەکە وتی: باوکم ڕاست دەکات: من بۆ نەزەر و ڕوانین بۆ پیاوی نامەحرەم کوێرم، بۆ گوێگرتن لە غەیبەت و بوختان کەڕم، زمانم بەس چاکەی پێ دەوترێ، قاچم نییە بۆ خراپە و شوێنی ناشەرعی پێی بڕۆم.. بەڵێ ئەم دوو پاك و خاوێنە ئەم دوو واریع و خواناسە هەر بۆ یەك باشن و خێزانێکی تا بڵێی بەختەوەریان دروست کرد لەم ژن و پیاوە بەڕێزە (پێشەوا أبو حنیفە کە ناوی نعمانی کوڕی ثابتە) لە دایك بوو، کە إجتهادی لە هەزاران مەسەلەی شەرعیدا کردووە و ماوەی چل ساڵ بە دەست نوێژی عیشا نوێژی بەیانی کردووە!..

بەڕێزان:کۆتایی ئەم وتارە بەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ دێنم کە فەرموویەتی: (إنَكَ لَن تَدَعَ شَيَئاً إتِّقاءً للّهِ –عَزَّ و جَل- إلا أعْطاكَ اللّهُ خَيراً مِنهُ) مجمع الزائد ج١٠ ص٢٩٥ و قال: رواهُ أحمد و الطَبراني و إسنادُ هُما حسن.

واتە: تۆی ئیماندار لەبەر خاتری خوا واز لە هەر شتێك بێنی کە خوا حەرامی کردووە –تواناشت هەبێت بیخۆی و بەدەستی بهێنیت بەڵام لەبەر فەرمانی خوا کە لە شەرعدا فەرموویەتی حەرامە وازی لێ بێنی و نەیخۆی، دڵنیابە خوای گەورە زۆر لەو شتە حەرامە باشتر و بەنرخترت بە حەڵاڵی پێ دەبەخشێ)

بەڕێزان ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ هەموومان بە چاوی خۆمان بینیومانە، کە ئەگەر مرۆڤ ئارامی هەبێ و پەلە نەکات و کورت بین نەبێ و وانەزانێ نان هەر ئەو نانەیە کە ئەمڕۆ لە خوانە، ئەوا ئەوەی وازی لێ

دێنێ بە فەرموودەی شەرع، خوای گەورە بە حەڵاڵی بە نسیبی دەکات و پێی دەبەخشێ.. نمونەیەکی واقعی لە گوڵزاری پیاوچاکان وەردەگرین، کە تێیدا هاتووە: کوڕێکی گەنجی بەڕێزی دڵ پڕ لە ئیمان و خواناسی ناوی –موبارەك– دەبێ بە شوێن کار و کەسابەتدا دەگەڕێ، کە نانێکی حەڵاڵ بەدەست بهێنێ و بە دەستی خۆی بژی و چاوی لە دەستی خەڵك نەبێ، لەم کاسبی بۆ ئەو کاسبی تا سەرەنجام ڕێی دەکەوێتە لای خاوەن باخێك و ڕێك دەکەوێ لەگەڵی کە ساڵانە بەرامبەر بڕێکی دیاری کراو لە پارە خزمەتی باخەکەی بۆ بکات و ئاوی بدات و بەرهەمەکەی بۆ بڕنێ، یەکێ لە بەرهەمەکانی باخەکە، کە بەشی هەرە زۆری باخەکەی داگیر کردبوو، هەنار بوو، دوای زیاتر لە چەند ساڵێك ڕۆژێکیان خاوەن باخەکە کۆمەڵێ میوانی زۆر خۆشەویستی دەبێت دەیانهێنێ بۆ ناو باخەکەی و بە موبارەك دەڵێ:بڕۆ هەندێ هەناری شیرینمان بۆ بێنە، ئەویش دەڕوات سەبەتەیەك هەنار لێدەکاتەوە و بۆیان دێنێت،کە ئەیشکێنن تەماشا دەکەن هەنارەکە ترشە،خاوەن باخەکە بە تووڕەییەوە دەڵێ: باشە تۆ تامی شیرین و ترش لێك جیا ناکەیتەوە؟ موبارەك دەڵێ: قوربان چۆن جیای ناکەمەوە، سوپاس بۆ خوا هەستی تام کردنم زۆر تەواوە.

خاوەن باخ دەڵێ: ئەی کەواتە بۆچی چویت هەناری ترشت لێ کردۆتەوە لەجیاتی شیرین. ئەویش دەفەرموێ: ئاخر قوربان من هەتا ئێستا تامی هیچ هەنارێکی ئەم باخەم نەکردووە و لێم نەخواردووە، چونکە تۆ کە منت هێنایە ئێرە وتت: تۆ باخەوانیت، نەتوت: بڕۆ هەنار بخۆ، خاوەن باخەکە بە سەرسورمانەوە وتی:چۆن شتی وا دەبێ تۆ چەند ساڵە لەم باخەدا کار دەکەی کەچی هەنارێکت لێ نەخواردبێ!!

**بۆیە کەوتە گومانەوە لە ڕاستی ئەم بەسەرهاتە سەیرە، هەر بۆیە ڕۆیشت بۆ لای باخەوانێکی تر کە هاوکاربوون لەگەڵ موبارەکدا و ئەم باسەی بۆ گێڕایەوە، ئەوانیش وتیان: بەخوا ڕاست دەکات هەرگیز لەگەڵ ئێمە، نە بە تەنها دەمی نەك بۆ هەنار بەڵکو بۆ هیچ میوەیەکی تری ئەم باخە نەبردووە!!!**

**خاوەن باخ هاتەوە بۆ لای موبارەکی دەرون و دەست و چاو موبارەك و پیرۆز و پێی وت: پرسیارێکت لێ دەکەم و ڕاوێژێکت پێ دەکەم: خۆت دەزانی من تەنها یەك کچم هەیە و ئەولادی ترم نییە، باشە بیدەم بە کێ تا بەختەوەری دونیا و قیامەت بێت؟! موبارەك فەرمووی: قوربان، جولەکە کە کچ بە شوو دەدەن هەوڵ دەدەن بیدەن بە کەسێك کە خاوەن ماڵ و سامان بێت،گرنگ ئەوەیە دەوڵەمەند بێت، گاورەکان حەز دەکەن کچ بدەن بە کەسێك کە جوان بێ و بەرچاو بێ لە جوانیدا، عەرەبەکان حەز دەکەن کچیان بدەن بە کەسێك کە خاوەن پلە و پایە و ناو و ناوبانگ و قەوم و هۆز بێت، موسڵمانی لە ئیسلام تێگەیشتوش، حەز دەکات کچەکەی بدات بە کەسێکی لە خوا ترس، موتەقی،کە ئەگەر خێزانەکەی خۆشویست و لەگەڵی ژیا ئەوپەڕی ڕێز و حورمەتی لێ دەگرێ، ئەگەر بە یەکیشەوە نەژیان ئەوا بە جوانترین شێوە لێی جیا دەبێتەوە و زوڵمی لێ ناکات..**

**خاوەن باخ وتی: جا باشە تۆ بڵێی لەم سەردەمەدا لە تۆ بەتەقواتر و پاکتر و واریعتر هەبێ وا بڕیارم دا لەگەڵ کچەکەم چاوتان بە یەك بکەوێ و ئەگەر یەکترتان بە دڵ بوو، پێشکەشتی بکەم، بەڵێ چونەوە بۆ ماڵ و لەگەڵ کچی خاوەن باخ یەکتریان زۆر بەدڵ بوو، هەر لەوێدا لێی مارە کرد و پێی وت: ئەی موبارەك لەمڕۆوە تۆ باخەوان نی و خاوەن باخیت و لە دوای من ئەم باخ و خانوو موڵکە هەمووی هی کچەکەمە و**

ئەویش هاوسەری تۆیە و هی تۆیە، تۆ شایەنی هەموو شتێکیت، بەڵێ ئینسانی ئەمین و واریع دەبێ خەڵات بکرێ و دەست خۆشی لێ بکرێ و ناوی بلاو بکرێتەوە لاپەڕەی کتێبی بۆ مێژوو پێ برازێتەوە. نەك بە داخەوە وەك ئەمڕۆ، ئەمین و دەست پاك و واریع و حەڵاڵ خۆر لای خەڵکی خوا نەناس بە گێل و فەقیر حاڵ دەزاندرێ و زۆرجار لە پیشەکەی دەردەکرێ، بەڵام دز و ناپاك و خائین و حەرام خۆر خەڵات دەکرێ و پلەی بەرز دەکرێ و دەست خۆشی لێ دەکرێ!!

بەڵێ ئیمانداران: لە موبارەکی گەنج و واریع و خواناسی بە حەق، لەگەڵ ئەو کچەدا کە کچی پیاوێکی خواناس و تێگەیشتوو بەویژدان بوو، منالێك لەدایك بوو ناویان نا (عبدالله) کە لە دواییدا بوو بە یەکێ لە زاناترین و پیاوچاکترین کەسی سەردەمی خۆی و کەم کتێب هەیە لە تەفسیر و مێژووی ئیسلام و پیاوچاکان کە ناوی (عبدالله ی کوڕی موبارەکی) تێدا نەبێ، سبحان الله، چۆن موبارەك واریع و خۆپارێز بوو لە هەموو شتێکی گوماناوی لە حەرام عبدالله ی کوڕیشی بە هەمان شێوە واریع بوو، دەیفەرموو: (لأن أرُدُّ درهَماً من شُبهَة خَيرُ لي من أنْ أتَصَدَقُ بمائة ألف درهَمٍ، وَما ئَتي ألف درهَمٍ . . حَتَّى عَدَّ سَمائة ألف درهَم) . .

واتە: (ئەگەر من لەبەر خاتری خوا واز لە خواردنی یەك درهەم بێنم کە گومانی تێدا بێ لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدا، ئەوا بۆ من چاکترە لەوەی کە سەد هەزار دیرهەم بکەم بە خێر و بیبەخشم، وە بەخوا چاکترە لە بەخشینی دووسەد دیرهەم، بەم جۆرە ڕۆیشت ـ هەتا فەرمووی: بەخوا ئەم واریعەیە و نەخواردنی ئەو دیرهەمە کە ئەو

گومانی حەرامەی تێدایە خێرترە و چاکترە لە بەخشینی شەش سەد هەزار دیرهەم لە پێناوی خوادا!!)

بەڵێ باوکی ئاوا هەردەبێ کوڕی ئاوای لێ پەروەردە ببێ: ﴿وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا﴾ الأعراف.٥٨

داواکارم لە خوای گەورە کە کاربەدەستانمان دادپەروەر و بەویژدان و بەسۆز کا، زانایانمان دلێر و بوێر و حەقبێژ بکا، بازرگان و ئەهلی بازارمان دەست پاك و ئەمین بکات.

دایك و باوکان بە ئاگا و هوشیار و بێدار بکا و شارەزایان بکات لە ئیسلام و لەسەر ئەم ئیسلامە جوانە نەوەکانیان پەروەردە بکەن، هەر لە سەرکردەوە تا زانا و بازرگان و هەر هاوڵاتیەکی ئەم وڵاتە بڕازێنێتەوە بە دڵسۆزی و و حەڵاڵ خۆری و واریعی و پاکی و چاکی. اللّهُمَّ آمین.

**سەرچاوەکان:**

١. قورئانی پیرۆز
٢. نَظْرةُ النَّعيم- ج٨ ص٣٦١٩ ، ص٣٦٢١ ، ص٣٦١٧
٣. صحيح وصايا الرَّسولﷺ -سعد يوسف ابو عَزيز ج١ ص٢٩١ ، ص٢٨٩
٤. بەرەو ئیسلام -ئاسودەیی- ئەندازیار عثمان محمد ڕشید ل٨٣
٥. درود -فاتح محمد سميع ب١ ل٧٦
٦. السلسلة الذهبية -محمود المصري ج١ ص٨٣

# وتاری چوارەم بۆ مانگی جمادی الأول

## خۆ پارێزی لە شتە گوماناویەکان – الوَرع–

## ((بەشی دووەم))

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمِين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعِينَ.

ئیمانداران: لە وتاری ڕابردودا باسی یەکێ لە ڕەوشتە جوانەکانی مرۆڤی موسڵمانمان کرد، کە ئەو ڕەوشتە بەڵگەی ئیمانی ساغ و ویژدان و ناخی زیندووی مرۆڤی موسڵمانە، کە ئەویش خۆپاراستن بوو لەو شتانەی کە گوماناوین و لە نێوان حەڵاڵ و حەرامدان.

بەڕێزان: زانایانی زمانەوانی و شەرع زان بە گەلێك شێوە پێناسەی وەرعیان کردووە، لەناویاندا ئەو پێناسەیەی پێشەوای ناودار –إبن القَیم– هەڵدەبژێرم کە لە کتێبی (الفوائد ص١١٨)دا فەرمویەتی: (الورع: تَرْكُ ما يُخشَى ضَرَرُهُ في الآخرة) واتە: وەرع ئەوەیە کە خۆت بپارێزی و وازبهێنی لە هەر شتێك کە بترسی زەرەری بۆ قیامەتت هەبێ.. کەواتە: لەم پێناسە فراوانەی –إبن القیم–ەوە تێدەگەین کە وەرع تەنها هەر لە خواردن و خواردنەوەدا ناکرێ وەکو هەندێ کەس وای لێ حاڵی بووە، بەڵکو ئەگەر سەیری پیاوچاکانی پێشین بکەی دەبینی وەرعیان کردووە لە تەماشاکردنی هەر شتێك کە پەیوەندی بەوانەوە نەبێت و تەماشا کردنی سودی نەبوبێ، بۆ نمونە: لە کاتی سەردانی ماڵی خزم و دۆستدا چاویان نەگێڕاوە بە هەموو شوێنێکی ناو ماڵەکەدا بە شێوەیەك کە گومانی ئەوەی لێ بکرێ کە خاوەن ماڵ پێی دڵگران بێ و بە کەسێکی چاوپیس و حەسود کە یەکێ لە نیشانەکانیان زۆر وردبوونەوەیە و بە قوڵی سەرنج دانە لە هەر شتێك کە لە دەوروبەریاندا هەیە – بێتە بەرچاوی، بۆیە لە چەندین شوێنی ژیانی پیاو

چاکاندا هەیە  کە کاتێ چونە ماڵێکەوە، یان بەڕێگا و ناو کۆڵانێکدا ڕۆشتون. یان چوونەتە ناو بازاڕ. دواتر لێیان پرسیون ئەو ماڵە یان ئەو دوکانە. یان ئەو کۆڵانە و ماڵی فلان کەس چۆن بووە. نەیتوانیوە باسی بکات چونکە ئەوەندە بە وردی لێی نەڕوانیوە، کە بە داخەوە هەندێ موسڵمان هەیە نە ژن و پیاو کە بە حسابی خۆی وەرع دەکات کەچی کە چووە ماڵێکەوە بە ڕادەیەك بە هەرچوار لای خۆیدا دەڕوانێ وسەرنج دەدات زۆر جار ئازاری دەروونی خاوەن ماڵ دەدات، کە بە ڕاستی ئەگەر ئێمەی موسڵمان وەرع لە تەماشاکردندا فێر ببین، جوانترین کەسایەتیمان دەبێت نیشانەی مرۆڤی ڕۆشنبیر و پێشکەوتومان تێدا دێتە دی. وە وەرع کردن لە (گوێگرتن) دا بەشێکی تری وەرع کردنی مرۆڤی موسڵمانە. کە گوێت بپارێزی لە گوێ گرتن لە هەر قسەیەك، گۆرانیەك گفتوگۆیەك کە هەست دەکەی هەندێ وشەی ناشەرعی تێدایە . یان بە شێوەیەك باسی ئیسلام و موسڵمانان دەکرێ کە زە میان دەکرێ و ناشرین دەکرێن. بەڵام ئەم قسە نابەجێ و ناشەرعیانە کراوتە ناواخنی بابەتێکی بەناو ڕۆشنبیری و کلتوری و ئەدەبی. ئەوا تۆ لەو کاتەدا گوێی خۆت لەبیستنی  ئەو قسەو گفتوگۆیانە بپارێزی، وەرعی بیستنت کردووە و نیشانەی ئیمان و دڵسۆزیتە بۆ ئیسلام، مەگەر لە کاتێکدا گوێ لەو قسانە بگری کە بتەوێ لە نیاز و مەبەستی ژەهراوی ئەو بابەتە حاڵی ببی و ڕددی بدەیتەوە و لەسەری بنوسی و موسڵمانانی لێ وشیار بکەیتەوە، ئەوە دروستە و کارێکی گەورە و خزمەتە بە ئیسلام، بەڵام ئەگەر ئەوەت لە تواناندا نەبوو. وە بۆت نەکرا ئەوا مێشك و گوێی خۆت بەو دەنگە ناسازە ناخۆشە، نەخۆش مەخە و وازی لێبێنە و فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ جێبەجێ بکە کە فەرموویەتی: (مِنْ حُسْنِ إسْلام المرء تركه مالا يعنيه) حديث حسن رواه الترمذي (٢٧١٣) و إبن ماجة (٣٩٧٦)... واتە لە جوانی موسڵمان بوونی کەسێکە

کە واز لەو شتانە دێنێ کە پەیوەندی بەوەوە نییە و لێی سودمەند نابێ و لە شەڕ و خراپەشی دڵنیا نییە!...

ئیمانداران: جۆرێکی تر لە وەرع و خۆپارێزی بریتییە لە وەرع کردن لە بۆن کردنی هەر شتێك کە بزانی لەسەرت حیساب دەکرێ بۆ قیامەتت و لێپرسینەوەت لەسەری لەگەڵ دەکرێ، هەروەکو (عومەری کوڕی عبد العزیز) ڕەحمەتی خوای لێبێت کە خەلیفەی دادگەری موسڵمانان بوو، لە زەمانی خەلافەتیدا هەندێ میسك هاتبوو بۆ موسڵمانان و لە بیتُ المال دا دانرابوو، لە کاتێکدا بە لای بیت المال دا تێپەڕی توند لوتی خۆی گرت تا لەو ناوە دوور کەوتەوە ئەوانەی لەگەڵی بوون بە سەرسوڕمانەوە وتیان: قوربان ئەوە بۆچی لوتی خۆتت گرت؟! فەرمووی: (إنَّما يُنْتَفَحُ من هذا بريحه، فأكرهُ أن أجِدَ ريحه دُونَ المسلمِينَ)، واتە: بە ڕاستی سود بینین لەم میسکە خۆ هەر بۆنە خۆشەکەیەتی، جا کە لوتی خۆمم گرت بۆ ئەوە بوو کە ئەو بۆنە نەچێ بەلوتما پێم ناخۆش بوو کە من بۆنی بکەم بە بێ موسڵمانان!!!) سُبحان الله لە گەورەیی ئەم ئیسلامە کە مرۆڤی چۆن پێدەگەیەنێت، سەرکردەی ئاوا دروست دەکات کە تەنانەت خۆی دەپارێزێ لەو بۆنەی کە بەبێ دەسەلاتی ئەو بە هەوادا بلاو دەبێتەوە، بەلام چونکە بەشی موسڵمانانی تێدایە خۆ لەو بۆنە خۆشەش دەپارێزێ و بە بێ تەواوی موسڵمانان ئەویشی ناوێت! ئەمە ئیسلامە کە سەرکردەی ئاوا پێدەگەیەنێ و ئەوەش کوفرە کە سەرکردەی وا پێدەگەیەنێت بە بۆنی خوێنی مرۆڤی بێتاوان نەبێ مێشکی ئاسودە نابێ و چاوی تێر نابێ و ئەگەر هەموو سامانی وڵات بخاتە بانق و خەزێنەکانیەوە کە وەکو جەهەنەم وان

هەرگیز تێر نابن و هەر دەڵێ: هل من مزید. هێشتا هەر پێی کەمە و ڕەخنەش لە ئیسلام دەگرێ و بە کۆنە پەرستی دەزانێ!!

جۆرێکی تر لە وەرع بریتیە لە وەرع کردن لە قسە و ئاگادار بوون لەوەی کە زمان دەیڵێ.

واتە: چاودێرییەکی توندی لەسەر زمانی داناوە و قسە هەتا لە بێژنگی نەداو زەرەر و قازانجی دیاری نەکات نایڵێ و نایبێژێ، ئەمەش بەرهەمی ئیمانبوونە بە ئایەتی: ﴿مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾ ق:١٨

بەڵێ ئیمانداران: بواری وەرع زۆر فراوانە و هەموو هەڵسوکەوتێکی ژیان دەگرێتەوە، لە هەڵسان و دانیشتن، لە ڕۆشتن، لە خواردن و خواردنەوە، ئیمامی ذەهەبی لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا (سير أعلام النبلاء ج١٠ ص٤٧١)دا باسی یەکێ لە واریعان و خۆ پارێزان دەکات کە ئەویش (بشیری کوڕی حاریسە) ڕەحمەتی خوای لێ بێت: دەفەرموێ: ئەم پیاو چاکە لە شاری (عَبّادان) نیشتەجێ دەبێ، هەموو کاتێ بۆ ئاو خواردنەوە دەچێت بۆ سەر دەریا و ئاو ددخواتەوە و ئاوی خواردنەوە لەگەڵ خۆی دێنێتەوە بۆ ماڵەوە، کە ئاوی دەریا گەرم و سوێر و ناخۆشە، وە ئامادە نابێ لە ئاوی حەوزەکانی ئاوخوادنەوە کە ئاوی سارد و سازگاری تێدایە بخواتەوە دەفەرموێ چونکە لە لایەن کاربەدەستی وڵاتەوە دروست کراوە، ئەویش کەسێکی زاڵم و زۆردارە و بە پارەی میللەت کردویەتی و بە پیاوەتی خۆی بەسەر میللەت حیسابی دەکات، جا بە ڕاستی خواناسی بە حەق واتە واریعی، هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرموویەتی: (كُن وَرِعاً تَكُنْ أعْبَدَ النَّاسِ).حديث حسن، أخرجه إبنُ ماجة و إبنُ أبي الدُنيا، وقال البوصيري في الزوائد: إسْناده حسن.

خواناس و زانای ناوداری ئیسلام سوفیانی سەوری دەفەرمویٚ: (عَلَيكَ بالْوَرْعِ يُخَفِّف الله حَسابكَ، و دع ما يَريبُكَ إلى مالا يَريبُك، وَادفَع الشَّكَ باليَقِينِ يَسلَمْ لَكَ دينُكَ). واتە: واریع بە و خۆت بپارێزە لە شتە گوماناوییەکان، خوای گەورە حیساب و لێپرسینەوەت ئاسان دەکات، وە هەر شتیٚ گومانت لێی هەبوو وازی لیٚ بێنەو و ئەوە بگرە کە گومانت لێی نییە، وە هەر شتیٚ گومانت لێی هەبوو بیگۆڕە بە یەقین، ئەوا دینەکەت سەلامەت دەبیٚ...

خۆشەویستان: ڕەوشتی بەرزی وەرع تەنها قسە نییە و پێویستی بە کردەوەهەیە. پێویستی بە ڕاهێنانی نەفس هەیە ماوەیەکی باشی دەویٚ کە ئەم وەرعە لە مرۆڤدا دروست ببیٚ، وە لێبوردەیی و لێبڕانی ئەویٚ، پیاوچاکان لە مەیدانی کردەوەدا ئەمەیان جێبەجیٚ کردووە و ئەوەی بیستویانە لە قورئان و فەرموودە لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیاندا کردوویانە بە کردەوە ئیمامی ذەهەبی هەر لە کتێبی (سیر أعلام النُبَلاء ج١٠ ص٣١٧)دا لە باسی ژیانی یەکیٚ لە پیاوچاکان کە ناوی -کهمس- وە یەکیٚ بووە لە بڕوا پێکراوەکانی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، دەفەرمویٚ: (إنَّ كَهمَساً سَقَطَ منهُ دينار ، فَفَتَّشَ، فَلَقيهُ فَلَم يَأخُذهُ، وقال: لَعلَّهُ غَيْرهُ)!! واتە ڕۆژێکیان -کَهمَس- دینارێکی لیٚ بزر دەبیٚ زۆر بۆی دەگەڕیٚ لە هەمان ڕێگای کە پێیدا هاتووە و پارەکەی لیٚ بزر کردووە، سەرەنجام دەیدۆزێتەوە،بەلاَم وازی لیٚ دەهێنیٚ و هەڵی ناگرێتەوە و دەفەرمویٚ، نەوەکو هی من نەبیٚ و هی کەسێکی تر بێت ئەویش هەر لەسەر ئەم ڕێگایە لێی کەوتبیٚ!! ئەمەش لە پێغەمبەری خواوەﷺ فێربووە کە لە

پێغەمبەری خواوەﷺ گێڕدراوەتەوە کە فەرموویەتی: (إني لأنقَلِبُ إلى أهلي فأجِدُ التَمَرةَ ساقِطةً عَلى فِراشي ثُمَّ أرفَعُها لآكُلَها، ثُمَّ أخشَى أن تَكُونَ صَدَقَة فَألقيها) رواهُ البُخاري (٢٤٣٢) مُسلم (١٠٧٠).

ئیمانداران: هەر وەکو لە وتاری ڕابردوودا بۆم باس کردن، کە واریعی و خۆپارێزی لە هەر شتێك کە گومانی حەرامی لەسەر بێت و یەکلا نەبوبێتەوە کە حەڵاڵە، ڕەوشتێکی هەرە بەرزە و کاکڵەی ئیمان و بڕوایە بۆ هەموو کەسێك جوانە، هەموو مرۆڤێکی ئیماندار بەم وەرع کردنە دەبێت بە مرۆڤێکی پاك و بەڕێز و خاوەن کەسایەتیەکی بەرز. بەڵام بۆ چوار کەس و چوار چین لە خەڵکی لە هەموو کەس جوانترە چونکە ئەم چوار چینە دەبن بە پێشەنگ و چاوساغ بۆ خەڵکانی تر.

یەکەم: سەرکردەی واریع، هەر کاتیێ سەرکردە خۆپارێز بوو لە شتی گوماناوی ئەوا سەرباز و شوێنکەوتوەکانی بە شوێن ئەودا دەڕۆن و لانی کەم ئەوەی حەرامە نایخۆن و ئەنجامی نادەن، فەرموون با بەیەکەوە بچینە خزمەتی سەروەر سالارمان، تاجی سەر و نوری چاومان، حەزرەتی محمدﷺ، هاوەڵانی بەڕێزی دەفەموون: (كانَ رسولَ الله ﷺ لا يَسألُ عَن كُل ما يحمل اليه) واتە: ئەگەر پێغەمبەری خواﷺ لە ناو ماڵی خۆیدا هەر شتێکی بۆ ئامادە بکرایە و بۆی بهێنرایە کە بیخوات، پرسیاری لە بارەیەوە نەدەکرد، چونکە دڵنیا بوو کە ماڵی حەرام نەهاتۆتە ماڵی پێغەمبەرەوەﷺ بەڵام: (كانَ إذا أتيَ بطعامٍ من غَيرِ أهله سألَ عَنهُ) رواهُ احمد، واتە: ئەگەر خواردنێکی لە دەرەوەی ماڵی خۆیان بۆ بهاتایە، بە وردی پرسیاری دەکرد کە ئەمە هی کێیە و لە کوێوە هاتووە و ئەگەر هیچ گومانێکی بۆ دروست نەبوایە لە سەرچاوەی خواردنەکە ئەوجا دەیخوارد.

وە لە فەرموودەدا هاتووە کە: (أنَ رسولَ اللّه ﷺ و أصحابه مَرّوا بإمْرأةٍ فذبحت لهُم شاة، فَأخَذَ رسولَ اللّهﷺ لقمَة فلَم يستَطِع أن يَسيغها، فقالَ: هذهِ شاة ذبحت بغَيرِ إذنِ أهلِها).. جارێکیان پێغەمبەری خواﷺ لەگەڵ هەندێ لە هاوەڵانی دا ڕۆشتن بە لای ماڵی ئافرەتێکدا و، ئافرەتەکەش زۆر ڕێزی لێگرتن و فەرمووی لێ کردن و پێغەمبەری خواشﷺ لەگەڵ هاوەڵان لایدا و دڵی نەشکاند، ئافرەتەکە هاوسەرەکەی لەماڵ نەبوو لەو کاتەدا هیچی وایان نەبوو، لە خۆشی ئەوەی پێغەمبەری خواﷺ بۆتە میوانیان هەستا بەرخێکی سەربڕی کە هی خۆیان نەبوو، هی کەسێکی تر بوو بە ئەمانەت لایان دانرابوو، لە دڵی خۆیدا وتی: دواتر بۆیان دەکڕمەوە و بەرخێکی تری لە هی خۆیان باشتر دەدەمەوە، بەڵێ کاتێ خواردن ئامادە کرا و دانرا بۆ خواردن پێغەمبەری خواﷺ پارویەکی هەڵگرت و خستیە دەمیەوە، بەڵام هەرچی کرد بۆی قوت نەچوو، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەم بەرخە بە بێ پرسی خاوەنەکەی سەربڕدراوە!!)

بەڕێزان ژیانی پێغەمبەری خواﷺ لە نێوان دەوڵەمەندییەکی لە سنور دەرچوو وە هەژارییەکی پروکێنەردا بوو، کە پێی دەوترێ –الكفاف– هەروەکو فەرموویەتیﷺ :(قَدْ أَفلَحَ من هُدِي إلى الأسلامِ، وَ رُزقَ الكَفافَ، و قَنَّعَهُ اللّه بما أتاهُ) رواهُ مُسلِم.

واتە:بەڕاستی سەرفراز و سەرکەوتووە ئەو کەسەی کە ڕێنمایی کرابێ بۆ ئاینی ئیسلام و ڕزق و ڕۆزی و باری ئابورییەکەی بە جۆرێ بێ کە دەوڵەمەندێکی بوغرای لێ دەرچێ، نە هەژارێکی وا بێ لە ژێر تیری هەژاریدا چەمیبێ، وە خوای گەورە قەناعەتی دابێتێ بەوەی پێی بەخشیوە).

ئەگەر سەیری خێزانە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خواﷺ بکەین دەبینین کە لە چاو ژیانی هاوەڵانی و تێکڕای خەڵکی زۆر سادەتر بووە، (وەکو ئەوەی بە کردەوە بە لێپرسراوان بفەرموێ: دەبێ سەرکردە ژیانی لە خەڵکانی شوێنکەوتووی لەخوارتر بێت!) بۆیە خێزانە بەڕێزەکانی وەکو هەر ئافرەتێکی تر کە بە فیطرەتی خۆی حەزی لە ماڵی جوان و کەلوپەلی باش و ڕازاوە هەیە، ناڕەزاییان دەربڕی لەو ژیانە سادەیەیان و داوای خانووی باشتر و کەلوپەلی جوانتر و خواردنی بەتامتریان دەکرد، بە تایبەتی ئەو کاتەی کە ئەو گروپانەی دژی پێغەمبەر و موسڵمانانی مەدینە کۆ ببونەوە وەتێکشکان و دەسکەوتی جەنگی (بەنی قورەیزە) کەوتە دەست موسڵمانان خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ پێیان وابوو کە هەقە ژیان و ژیواری ئەوانیش خۆش ببێ، بۆیە داوایان لە پێغەمبەری خواﷺ کرد کە بەڵکو کەمە کەمە ژیانیان خۆشترکا، بۆیە وتیان: ئەوەتە ژنان و کچانی (کیسرا) و (قەیسەر) بەو شێوەیە ڕائەبوێرن کە ڕادەبوێرن، ئێمەش ئالەم ژیانە تفت و تاڵەدا!! هەقە تۆش وەکو ئەوانەمان لەگەڵ بکەیت..

جا ئیمانداران لەگەڵما بن با بەیەکەوە بچینە شاری مەدینەی مونەوەرە و بچینە ماڵی پێغەمبەری خواوەﷺ بزانین ئەم داواکارییە چی لێ پەیدا دەبێ، پێشەوای فەرموده (موسلیم) ڕەحمەتی خوای لێ بێت، بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: (ڕۆژێکیان حەزرەتی أبو بکر ڕۆیشت بۆ ماڵی پێغەمبەرﷺ داوای مۆڵەتی کرد بچێتە ژورەوە، بینی خەڵك لەبەر دەرگاکەیدا دانیشتوون و مۆڵەتی بە هیچ کەسێکیان نەداوە بۆ چوونە ژورەوە، جابیری کوڕی عبدالله کە فەرمودەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: مۆڵەت درا بە أبوبکر و ڕۆشتە ژورەوە، پاشان حەزرەتی

عومەر هات و مۆڵەتی چونەژورەوەی خواست ئەویش مۆڵەتی پێ درا، بینی پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشتووە و خێزانەکانیشی بە خەفەتباری و بە بێدەنگی بە دەوریدا دانیشتوون، پاشان حەزرەتی عومەر فەرمووی: سوێند بە خوا ئێستا قسەیەك دەکەم کە پێغەمبەر ﷺ پێبکەنێ، بۆیە چووە خزمەتی و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە چاوت لێ بوایە کە خێزانەکەم داوای نەفەقەی لێ دەکردم، منیش هەڵسامەوە بۆی ودام بە گەردنیدا، پێغەمبەری خواش ﷺ پێکەنی و فەرمووی: ئەم هاوسەرانەی منیش کە دەیانبینی بە دەوری منداں، داوای نەفەقەم لێ دەکەن، جا حەزرەتی أبو بکر هەڵسا بۆ عائشەی کچی بە ملی کێشا، هەروەها حەزرەتی عومەریش بە ملی حەفصەی کچی کێشا، أبوبکر و عومەر بە خێزانەکانی پێغەمبەریان فەرموو: باشە چۆن دەبێ دڵی پێغەمبەر ئازار بدەن بەوەی داوای شتێکی لێ بکەن کە لە توانایدا نییە؟! ئەوانیش وتیان: سوێند بە خوا هەرگیز داوای شتێك ناکەین لە پێغەمبەر ﷺ کە نەیبێت، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ مانگێك یان بیستونۆ ڕۆژ دوورکەوتەوە لێیان و جێی لێ جیا کردنەوە، جا خوای گەورە ئەم ئایەتانەی بۆ ناردنە خوارەوە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ۞ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَـٰتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ الأحزاب: ٢٨-٢٩

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بە خێزانەکانت بڵێ: ئەگەر ئێوە ژیانی دونیا و ڕازاوەی ئەوتان دەوێ، دەی هەمووتان وەرنە پێشەوە با مارەیی و هەندێ شتومەکتان بدەمێ، بە خواپەسەندانە و جوانی دەستتان لێ بەردەدەم و تەڵاقتان بدەم بە تەڵاقدانێکی جوان و بێ زیان بێ هیچ گلەیی و گازندە دڵ ڕەنجاندنێك، ئەگەر خوا و پێغەمبەرەکەی و

پاداشتی دوارۆژیشتان دەوێ و ڕازی دەبن بەو ژیانەی ئێستاتان. ئەوە بە ڕاستی خوا ئامادەی کردووە بۆ چاکە کاران لە ئێوە پاداشتێکی گەورە...، جابیری کوڕی عبداللە دەفەرموێ: کە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە عائشەوە دەستی پێ کرد و فەرمووی: ئەی عائشە دەمەوێت کارێك بخەمە بەردەستت پێم خۆشە پەلەی تێدا نەکەیت. هەتا پرس و ڕا بە دایك و باوکت دەکەیت! عائشەش فەرمووی: ئەو کارە چییە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ، ئەویش ئایەتەکەی بەسەردا خوێندەوە، عائشەش فەرمووی: ئایا دەربارەی تۆ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پرس و ڕا بە دایك و باوکم بکەم؟! نەخێر واناکەم بەڵکو خوا و پێغەمبەرەکەی و پاداشتی دوا ڕۆژ هەڵدەبژێرم، وە داوات لێ دەکەم ئەم قسەیەی من کردم بە هیچ کام لە خێزانەکانت نەڵێیت، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەر ئافرەتێك لەوان پرسیارم لێ بکات پێی دەڵێم: کە خوا منی بە نارەحەت کار و نارەحەت هێنەر نە ناردووە بەڵکو بە فێرکەر و بە ئاسانکار ناردوومی..) وە هەموو خێزانەکانی تری پێغەمبەریش وەکو عائشە وەڵامیان دایەوە خوا و پێغەمبەریان هەڵبژارد و ئارامی و خۆشی گەڕایەوە بۆماڵی پێغەمبەر ﷺ

ئیمانداران: ئایا لە مێژووی مرۆڤایەتیدا هیچ سەرکردەیەك هەبووە کە ئاوا ژیابێ و ژیانی ماڵ و خێزانی ئاوا بووبێ؟! نەخێر، دەی حەیف نییە بە شوێن ئەو سەرکردە ڕاستەقینە و ڕاستگۆیە نەکەوی؟!

کە ئەمە ئەوپەڕی وەرع کردنە لە ماڵ و سامانی میللەت، کە ئامادە نەبوە بە هیچ شێوەیەك بۆ خۆشی ژیانی خۆی و ماڵ و منالی بە کاری بێنی! لە کاتێکا ڕێگاشی پێدراوە و هەموو هاوەڵان بە گشتی و بە

ئەوپەڕی خۆشحاڵییەوە گەردنیان ئازاد دەکرد و هەموو ژیان و سامانی خۆیان بەقوربانی پێغەمبەری خوا دەکرد.

خۆشەویستان: ئێمە کاتێ کە باسی سەرکردەی وارع دەکەین هەر ئەوەندە دێ بە خەیاڵمانا کە خۆی دەپارێزێ لە شتی گوماناوی، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ، واریعیەکەی گەیشتۆتەرادەیەك کە مەگەر ئەوە لە محمد المصطفی بوەشێتەوە، مەگەر لەو (رَحمةً للعالمین) بینرابێ،کە خۆی پاراستووە لە خواردنێك کە خۆی زۆر برسی بووە، بەڵام سەیری کردووە خەڵکی تری وەکو ئەویش برسی هەن، خۆی نەیخواردووە هەتا ئەوان لێیان تێر نەخواردووە، فەرموون با بەیەوەکەوە بچینە خزمەت یەکێ لەو صەحابە بەڕێزانەی کە زۆربەی کاتەکانی ژیانی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بەسەر بردووە، کە ئەویش –أبو هریرە–یە، بزانین چیمان بۆ دەگێڕێتەوە: حەزرەتی –أبو هریرە– دەفەرموێ: (و الّذي لا إلهَ إلا هُو... إنّي كُنتُ لأشُدُّ الحَجَرَ على بَطني مِن الجُوعِ). سوێند بەو خوایەی کە غەیری ئەو هیچ پەرستراوی تر نییە، من لە تاوی برسیەتی بەردم لەسەر سکم بەستبوو بەڵکو تۆزێ لە نارەحەتی برسیەتیەکەم کەم بێتەوە، لە برسان کە لە ماڵی خۆمان هیچم دەست نەکەوت بیخۆم، لە ماڵەوە هاتمە دەرەوە، چاوم بە پێغەمبەری خوا ﷺ کەوت و چووم بۆ خزمەتی، (فَتَبَسَّمَ حينَ رَآني) ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: هەر کە پێغەمبەری خوا ﷺ چاوی پێم کەوت زەردەخەنەی بە ڕوومدا کرد و بەررومەوە پێکەنی، (هەزاران جار بەقوربانت بم ئەی پێغەمبەری پێشەوا کە هەموو کاتێ ڕوت هەر گەش بوو) فەرمووی: ئەبو هورەیرە برسیتە؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: منیش برسیەتی هێناومیە دەرەوە!! وەرە با

بەیەکەوە بڕۆینەوە بۆ ماڵی ئێمە بزانین هیچمان دەست ناکەوێ بیخۆین!
کاتێ کە گەیشتنە ماڵەوە، پێش ئەوان قاپێ شیریان بۆ هاتبوو لە ماڵە دراوسێکانەوە، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: أبو هُريره بڕۆ بۆ مزگەوت و هەموو ئەهلی –صوفە– بانگ بکە، (ئەهلی صوفە هەموو ئەو کەسانە بوون کە ماڵ و حاڵیان نەبوو، هەژار و نەخۆش و بێ ئەنوا بوون) ئەبو هورەیرە دەفەرموێ: هەرچەندە بە دڵ پێشم خۆش نەبوو، چونکە دەمگوت من هەر بە تەنها ئەو قاپە شیرە دەخۆمەوە، ئیتر ئەو هەموو خەڵکەش چۆن لێی بخۆنەوە! بەڵام لەبەر فەرموودەکەی پێغەمبەرﷺ ڕۆشتم و بانگم کردن، ئەوانیش زۆر برسی بوون، زۆر بە خۆشحاڵیەوە هاتن بەرەو ماڵی پێغەمبەری خواﷺ، پێغەمبەری دڵسۆزی هەژاران فەرمووی: أبو هريره یەك بە یەك ئەو قاپە شیرەیان پێوە بگێڕە و با هەموویان لێی تێر بخۆنەوە، هەر کەسێ قاپە شیرەکەی وەرگرت نەیدات بە کەسێکی تر تا تێر نەخواتەوە لە شیر، بەم شێوەیە هەموو ئەهلی صوفە تێریان خواردەوە! پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:أبو هريره کێ ماوە شیر بخواتەوە؟! عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا تەنها من و تۆ ماوینەوتەوە. فەرمووی: تۆش بخۆرەوە، دەستم کرد بە شیر خواردنەوە، وتم ئەی پێغەمبەری خوا تێرم خواردەوە، فەرمووی: ئەمجارەش بخۆرەوە، دوبارە خواردمەوە، فەرمووی: ئەمجارەش بخۆرەوە، وتم: (لا وَالذي بَعَثَكَ بالحَقِّ لا أجدُ لَها مَسْلكا). عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خواﷺ سوێند بەو کەسەی کە تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە، هیچی ترم بۆ ناخورێتەوە و هیچ شوێنێ نەماوە شیری تێ بکەم، ئەمجا پێغەمبەری خواﷺ قاپە شیرەکەی لێ

وەرگرتم و بۆ خۆی بەرماوەکەی خواردەوە). ئەم فەرموودەیە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

ئیمانداران: لەوانەیە ئێمە هەر ئەوە بە موعجیزە بزانین کە چۆن پەرداخێ شیر بەشی ئەو هەموو خەڵکە برسییەی کردووە، کۆمەڵێ گەورەیی تر لەم بەسەرهاتەدا هەن وەکو: گەورەیی پێغەمبەری خوا کە خۆی پاراست لە خواردنەوەی قاپێ شیر لە کاتێکدا هاوەڵانی وەکو ئەو برسیانە، بەڕاستی ئەوە سەرکردەی ڕاستەقینەیە کە:

١. چەند خۆی برسییە، بەڵام هەژاران پێش خۆی تێر دەکات.
٢. ئەوەندە مُتواضعە، بەرماوەی ئەو هەموو هەژار و نەخۆشە دەخواتەوە.

ئایا غەیری ئەم زاتە کەسی تر بۆی هەیە بڵێ پێشەوا و دڵسۆزی چینی هەژارم؟! ئایا حەیف نییە لەگەڵ ئەو زاتەدا نەژی و لەسەر ڕێبازی ئەو نەمری؟!

ئیمانداران دەچینە خزمەت سەرکردەی واریع: عومەری کوڕی خطاب.

شەوێك لە شەوان طەڵحەی کوڕی عبدالله تەماشا دەکات حەزرەتی عومەر دەچێتە ماڵی پیرە ژنەیەکی کوێری بێکەسەوە، دوای هاتنە دەرەوەی طەڵحە دەچێتە ژوورەوە و دەڵێ پورێ گیان ئەمە کێ بوو؟! وتی: ڕۆڵەگیان بەخوا نازانم کێیە، بەڵام بۆ ماوەی (١٠ ساڵ) دەبێت ئەم پیاوە باشە خواناسە هەموو هەفتەیەك جارێك دێت بۆ سەردانم و ماڵەکەم بۆ خاوێن دەکاتەوە و خۆراکی ئەم هەفتەیەم بۆ دەهێنێ، بەڵام هەرچەندە لێی دەپرسم تۆ کێی، هەر دەڵێ: یەکێکم لە عەبدانی خوا و خوازیاری دوعای خێرم لە تۆ!! یا الله لەم ئیسلامە چ جۆرە سەرکردەیەك پێدەگەیەنێ، وەرعی کردووە و خۆی پاراستووە لەوەی کە ناوی ئاشکرا ببێ و بزانێ ئەمە ئەمیری

ئیماندارانە خزمەتی دەكات، خۆ حەزرەتی عومەر هەر بەوەندەی كە كەسێكی بۆ دیاری بكات كە سەرپەرشتی ئەم پیرەژنە كوێرە بێكەسە بكات بەس بوو بۆ خۆ ڕزگاركردن لە باری لێپرسراویەتی سەركردەیەك بەرامبەر هاوڵاتیەكی، بەڵام نەخێر بە دەستی خۆی خزمەت دەكات و ئەو پارەیەی كە بۆ ئەو خزمەت كارەی دابین دەكات دەگەڕێتەوە بۆ بیت المال و بە دەستی خۆی خزمەتەكە دەكات.

ئەمە ئیسلامە قوتابخانەكەی پێغەمبەری خوایەﷺ سەركردەیەك پەروەردە دەكات كە ماوەی ١٠ ساڵ خزمەت كردن ناوی لای هیچ كەسێك ئاشكرا نابێت، بەڵام لە دنیای هەرە پێشكەوتوو پڕدادگەری بە حسابی ئەمڕۆدا، ئەگەر جارێك لە جاران سەركردەی وڵاتێك سەر بە ماڵی پیرە ژنێكدا بكات ئەبێ حەفتەیەك هەرچی تەلەفیزۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامە و گۆڤار هەیە باسی بكات و پشكی شێری لە دەنگ و باسدا بداتێ و ببێ بە مانشێتی ڕۆژنامە و گۆڤارەكان.

هەر ئەم حەزرەتی عومەری كوڕی خطابە، لە سەردەمی فەرمانڕەواییدا، هەموو ئێوارەیەك دوای چۆڵبوونی بازاڕ شتە بزربووەكانی هەڵ دەگرتەوەو ڕۆژانی جومعە دەیدایەوە بە خەڵكی، لە كاتێكدا دەیتوانی كەسانێك بۆ ئەم كارە دیاری بكات، بەڵام مادام بۆخۆی كاتی دەبێ و بۆی دەكرێ، وەرع دەكات كە پارەی بیت المال صەرف بكات و خۆی كارەكە نەكات!..

هەر حەزرەتی عومەری كوڕی خطابە كە شوێنێكی لە دەرەوەی شاری مەدینە تەرخان كرد بۆ بەخێوكردنی ئاژەڵی موسڵمانان و كارمەندی بۆ بەخێوكردنیان دانا!! (ئەمەیە مەدەنیەت و پێشكەوتن و

شارستانیەت. یەکەم کەس بوو بڕیاری دا نابێ لە ناو ماڵاندا ئاژەڵ بەخێو بکرێ، وە نابێ هەموو کەس خزمەتی ئاژەڵ بکات ئەگەر پسپۆر نەبێ!! هەتا ئێستاش لە گەلێك وڵاتانی پێشکەوتوی دونیای ئەمڕۆدا ئەم سیستەمە بۆ ئاژەڵداری نیە، جارێکیان چوو بۆ بەسەرکردنەوەی ئەو شوێنە. کۆمەڵە حوشترێکی قەڵەوی بینی، کە زۆر بەرچاو بوون و دیار بوو باش خزمەت کراون، فەرمووی: ئەمانە هی کێن؟! وتیان:هی عبدالله ی کوڕتە، فەرمووی:دیارە لەبەر خاتری من کە عبدالله کوڕی منە زیاتر خزمەتی حوشترەکانی ئەوتان کردووە و لە شوێنی باشتری لەوڕگادا لەوەڕاندوتانن بۆیەلە هی خەڵکی جوانترن و قەڵەوترن! بانگی عبدالله ی کوڕی کرد و فەرمووی: دەبێ ئەم حوشترانە بفرۆشی و مایەکەی چەندە و کاتی خۆی چەندت پێ داون پارەکەی خۆت هەڵبگرە و زیادەکەی بخەرە بیت المالەوە، چونکە بەهۆی منەوە ئەو پارە زیادەیەت دەست دەکەوێت و منیش نابێ ڕێز و حورمەتی ئەمیری ئیمانداران بۆ مەصلەحەتی شەخصی خۆم و کوڕو کەس و کارم بەکار بهێنم، پاشان لەجیاتی دەستخۆشی سزای ئەو کەسانەی دا کە کاری ئاژەڵ بەخێوکردنەکەیان ئەنجام دەدا و جیاوازی ئاژەڵی کوڕی خەلیفە و خەڵکی تریان کردووە!!!

ئیمانداران: لەگەڵما بن هەر لە خزمەت حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب داین، باسی وەرعی سەرکردە دەکەین... چەند ملوانکەیەك ئامادە کرابوو کە وەکو مەدالیای ڕیزلێنان ببەخشرێ بەو ئافرەتانەی کە خزمەتی ئیسلامیان کردووە لە ڕۆژە سەختەکاندا، یەك بە یەك ملیوانکەکان بەخشران بە ئافرەتەکان و دانەیەك مایەوە، ئەوانەی لە

خزمەتیدا بوون لە گەورە پیاوانی صەحابە فەرموویان: ئەی ئەمیری نیمانداران، ئەم ملوانکەیەش ببەخشە بە خێزانی بەڕێزی خۆت کە (أُم کلثومی کچی ئیمامی عەلی یە)، کچەزای پێغەمبەری خوایە و کچی عەلی کوڕی أبوطالبە وە خێزانی گەورەی هەموو موسڵمانانیشە و خۆشی لە پیناوی ئەم ئیسلامەدا گەلێك زەحمەت و ماندووبونی بینیوە! بۆیە شایانی ئەو ڕێزلێنانەیە، بەڵام حەزرەتی عومەر فەرمووی: نەخێر خەڵکی موستەحەقتر و شایستەتر هەیە، عەرزیان کرد کێیە؟!! فەرمووی: (أُمُّ سُلَیْط أحَقُ بهِ – وأُمُّ سُلَیط مِن نیساءِ الأنصارِ –قالَ عمر: فَأنها كانَت تُزْفِرُ لَنا القِرَبَ یَومَ أُحُدٍ) رواه البخاري.

واتە: ئوم سولەیت کە ژنێکی بەتەمەن و پیری مەدینەییە، شایەنتر بەم مەدالیای ڕێزلێنانەیە، چونکە ئەو ئافرەتە لە ڕۆژی سەختی ئوحوددا زۆر خزمەتی کردین و بە گۆزە ئاوی بۆ دەهێناین.. پاشان بانگی کرد و ملیوانکەکەی پێبەخشی!!

اللّٰه أكبر لەم وەرعە، خۆ خێزانەکەی خۆشی شایەن و شایستەبوو کە ئەو میلوانکەیەی پێشکەش بکرێ، بەڵام چونکە موستەحەقتر هەیە دەبێ بدرێ بە ئەو، ئەمەش جۆرێکە لە وەرعی سەرکردە! دەی وەرن با شانازی بەو ئیسلامەی خۆمانەوە بکەین کە ئاوا ڕێز لە تێکۆشەران دەگرێ و سەرکردە خۆی لەیادیان ناکات با لەیادی خەڵکیش چوبنەوە ئەوە ئیسلامە ئاوا ڕێز لە ئافرەت و خەباتی ئافرەت دەگرێ.

بەڕێزان: لە خزمەت سەرکردەیەکی تری واریعداین، ئەویش هەر عومەرە، بەڵام عومەری کوڕی عبدالعزیزە ئەوەندە دادپەروەر بووە، لە مێژووی ئیسلامدا ناونراوە خەلیفەی پێنجەمی ڕاشدین، بەراستی کە

باسی واریعی ئەم سەرکردەیەش دەکەین، مرۆڤ سەری سوڕدەمێنێ، چونکە لە شتی وادا وەرعی کردووە کە خەڵکانی تر هەر بیریشیان لێ نەکردۆتەوە با چەند نمونەیەك وەربگرین:

یەکەم: جارێکیان یەکێ لە کاربەدەستان بە سێ نامە پێویستی موسڵمانانی خستە بەردەم خەلیفە عومەری کوڕی عبدالعزیز، خەلیفە عومەریش بە یەك نامە وەڵامی دایەوە و فەرمووی: با نوکی قەڵەمەکەت باریك بێت و دێڕەکان لەیەکەوە نزیك بن و پێویستیەکانیش کۆبکەرەوە ئەمجا بە یەك نامە بیاننێرە، چونکە من پێم ناخۆشە سامانی موسڵمانان لە شتێکدا خەرج بکەم کە کەڵکی لێ وەرنەگرن.!! بەڵام ئەمڕۆ بە هەزاران لاپەڕە چاپ دەکرێت و بڵاو دەکرێتەوە بە پارەی میللەتی هەژار و برسی، بەڵام نەك بۆ ئەوەی پێداویستیەکانی میللەتی تێدا بنوسرێ و بگەیەنرێ بە سەرکردەکانی وڵات، بەڵکو بۆ مەدحی سەرکردە و چەواشە کردنی میللەت بە شێوەیەك سپی لێ دەکات بە ڕەش و ڕەشی لێ دەکات بە سپی و دونیا و دواڕۆژی لە دەست دەدات!!..

دووەم: کلیلە وانەکانی کەعبە نامەیان نوسی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز و داوایان لێ کرد کە فەرمان بدات بەوەی کە (کەعبەی پیرۆز) بە بەرگی نوێ، بە وێنەی خەلیفەکانی پێش خۆی پۆشتە بکرێتەوە، خەلیفە عومەری دادگەر و واریع فەرمووی: بەڵام من وای بە چاك دەزانم ئەو مەسرەفە بکەمە چەند پاروویەك نان و خۆراك و برسیەکی پێ تێر بکەم، چونکە ئەو برسیانەی ئەم گەلە لە پێشترن لە کەعبە!!.

سێیەم: جارێکیان داوای کرد تەختەیەکی بۆ بکڕن کە قورئانی لەسەر دابنێ لە کاتی خوێندنی قورئاندا، کە بۆیان هێنا فەرمووی: زۆر

**جوانە لەکوێتان کڕی؟! ووتیان تەختەکەی هی بیتُ المال بوو، خۆمان دروستمان کرد لێی،، فەرمووی: ئەو تەختانە بایی چەندە؟ وتیان: نیو دینار، فەرمووی: دەبێ دوو دینار لە ماڵی خۆم بخەمە (بیتُ المال)ەوە ئەمجا ئەو مێزە قورئانەکەمی بخەمە سەر!!..**

**بەڵی بەم دەست پاکی و واریعیە لە ماوەی دوو ساڵی خەلافەتی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا، ئەوەندە پارە زۆر بوو، ئەوەندە خەزێنەکانی دەوڵەت پڕ بوون لە پارە و سامان کە دەوڵەت بڕیاریدا:**

**١. هەموو کەس مەعاشی بۆ بڕدرایەوە.**

**٢. قەرز بۆ هەموو قەرزاران درایەوە.**

**٣. ژن بۆ هەموو گەنجان هێنرا و کچان شویان کرد.**

**٤. کێ زەوی هەیە سلفەی بدەنێ تا زەویەکەی ئاوەدان بکاتەوە و بەرهەمی باش بدات.**

**ئەم هەموو پێشکەوتنەش بریتیبوو لە بەرهەمی واریعی و خۆپارێزی خەلیفە و سەرکردەی موسڵمانان لە هەموو شتێك کە بچوکترین گومانی حەرامبوونی تێدابێ.**

**بەڕێزان: دووەم دەستە کە بە وەرعی ئەوان دونیا ئاوەدان دەبێتەوە زانایانن، ئیمامی شافیعی -رەحمەتی خوای لێ بێت- دەفەرموێ لەبارەی خۆیەوە:**

عَلَيَّ ثيابٌ لَو يُباعُ جَميعُها بفلسٍ لَكانَ الفلْسُ منهُنَّ أكثَرا .

و فيهِنَّ نَفسٌ لَو تُقاسُ بمثْلِها نُفُوسُ الوَرى كانَت أجَلُّ وَ أخطَرا .

کە جێگای داخە زۆربەی ئەوانەی کە ئیدعای مەزهەبی شافعی دەکەن بە پێچەوانەی خودی ئیمامی شافعین بە جل و بەرگ زۆر ئاوەدانن بەڵام لە تەقوا و وەرع و زانستدا وێرانن!.

بەڵێ ئیمانداران: چینی سێیەم کە بە وەرعی ئەوان دونیا جوان دەبێ خاوەن پیشەکانن، بۆ نمونە نمونەیەك لەسەر وەرعی یەکێ لە دوکاندارەکان باس دەکەین کە ئەویش (یونسی کوڕی عەبیدە)، ئەم دوکاندارە خواناسە واریعە ڕۆژێکیان دوکانەکەی بەجێ هێشت و چوو بۆ کارێك، برازاکەی خۆی لەسەر دووکانەکەی بەجێ هێشت، لە کاتی گەڕانەوەیدا چاوی کەوت بە یەکێ لەو کەلوپەلانەی لە دوکانەکەی ئەودا نەبێ نییە، بە دەستی کەسێکەوە بوو، کە ئەملاولای پێدەکرد و سەیری دەکرد، ئەم دوکاندارە پیاوچاکە لە کابرای پرسی: ئەوەت بە چەند کڕی؟ وتی: بە ٤٠٠ دیرهەم، وتی: چۆن دەبێ ئەوەندەت پێدابێ لە کاتێکدا نرخی خۆی ٢٠٠ دیرهەمە! کابرا وتی: من بە ٤٠٠ دیرهەم هەر قبوڵمە لە وڵاتی خۆمان زۆر قازانج دەکات. بەڵام (یونسی کوڕی عەبید) لێی نەگەڕا هەتا ٢٠٠ دیرهەمی تری دایەوە، ئەمجا کە گەڕایەوە سەرزەنشتی برازاکەی کرد و ئەویش وای نیشاندا کە نرخەکەی لێ تێکچووە و کابرای موشتەریش خۆی بەوە ڕازی بوو، بەڵام (یونس) فەرمووی: با کڕیاریش بەو نرخە ڕازی بێ و بەلایەوە هەرزان بێت، ئێمە هەر دەبێ قبوڵی نەکەین زیاتر لە نرخی خۆی وەرنەگرین.

بەڕێزان: پیاوچاکان و خواناسان زۆر بە وردبینیەوە ئامۆژگاری کاسبکارانیان کردووە کە خۆیان نەك هەر لە حەرام بەڵکو لە هەر شتێکیش کە لە حەرام و ناشەرعی نزیکیان بکاتەوە بپارێزن.

رۆژێکیان کەسێك کە پیشەی –بەنایی– بوو وەستای دیوار بو، چوو بۆ خزمەت زانای بەناوبانگ (سوفیانی سەوری) و عەرزی کرد: مامۆستا من وەستای دیوارم و پاشای وڵات دەیەوێ شورا و دیوارێکی گەورە بۆ شارەکە دروست بکات، ئایا ئەگەر من بچم ئەو ئیشە وەربگرم و دیوارەکە دروست بکەم، پارەکەی حەڵاڵە یان حەرامە؟! جەنابیشت ئاگاداری کە ئەو دیوارە سودی بۆ موسڵمانان دەبێت و لە دوژمن دەیانپارێزێت، سوفیانی سەوری فەرمووی: نەخێر ئیشی بۆ مەکە و پارەکەت نەوێت، چونکە خۆت وەکو من دەزانیت کە پاشای وڵات کەسێکی زاڵمە و بە ئارەزوی خۆی پارەی ئەم وڵات و میللەتە صەرف دەکات.تۆش کە وەختێ دەستت کرد بە ئیشکردن بۆی: (أقَل مايد خُلُ عُلُيكَ أن تحب بَقاءهم ليوفوكَ أجرك). لانی هەرە کەمی لە کاتی ئەو ئیش کردنەتدا ئەوە دێتە دڵتەوە کە حەز دەکەی پاشا و داروودەستە و دەسەڵاتەکەی لەسەر کار بمێننەوە و دەسەڵاتی ئەو زاڵمە بەردەوام بێ تاوەکو تۆ ئیشەکەت تەواو دەکەیت و پارەکەت وەردەگری! لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: (مَنْ دَعا لِظالِمٍ بالْبَقاءِ فَقَد أَحَبَّ أنْ يُعصى اللّه في أرضِهِ) هەر کەسێ دوعا بۆ زاڵم بکات و لە دڵیدا حەز بکات دەسەڵاتەکەی بەردەوام بێت ، ئەوە ئەو کەسە حەزی کردووە کە سەرپێچی خوا بکرێ لەسەر زەوی خوادا!!.. وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتوە: (إنَّ اللّه

لیغضب إذا مُدِحَ الفاسِقُ) خوای گەورە توڕە دەبێ کاتێ کە مەدحی فاسق و خراپەکارێك دەکرێ...

شێخ سوفیانی سەوری فەرمووی: لەبەر ئەوە کە ئەو حەزکردن بە مانەوەی زاڵمە لە ناو دڵتا دروست دەبێ ئەو پارەیە حەرامە و ئیشەکە مەکە!..

هەزاران ڕەحمەت لە زانای تێگەیشتوو لە ئیسلام و واریع و حەق بێژ سوفیانی سەوری هەموو زانایانی ئیسلام کە چونکە خۆیان واریع بوون، زۆر ئازادانە و ئازایانە باسی حەلاڵ و حەرام و واریعیان بۆ موسڵمانان کردووە و بە چاوێکی زۆر وردبینانەوە دەرکیان بە هەموو لایەنەکانی شتە گوماناویەکانیش کردووە، ڕەحمەتی خوای گەورەش لەو بازرگان و دوکاندار و ئەهلی کەسابەتە بێ کە پێش ئەوەی هەر کارێك بکەن دەچنە خزمەت زانایانی شەرع زان و واریع و حەق بێژوتا دڵنیا نەبن لە حەلاڵی ئەو کارە ئەنجامی نادەن!...

پیاوچاکان و دڵڕوناکان فەرموویانە: سەردەمێك بەسەر خەڵکیدا دێت. کەسێك کە نەشارەزا و غەریبە و کەس ناناسێ و دەیەوێ شت بکڕێ و بفرۆشێ، دەچێتە بازاڕەوە و لە کەسێکی خواناس و واریع دەپرسێ: من کەس لە ئەهلی ئەم بازاڕە ناناسم، ئایا معامەلە لەگەڵ کێ بکەم سەر ڕاستە و فێڵم لێ ناکات؟! پێی دەوترێ: (عامِلْ مَنْ شِئتَ). لەگەڵ کێ پێتخۆشە معامەلە بکەی بیکە چونکە هەموو ئەهلی بازاڕ ئەمین و حەلاڵ خۆرن! پاشان دوای چەند ساڵێك زەمانێکی تر دێتە

پێشەوە ئەگەر کەسێکی نەشارەزای تر بێ و هەمان پرسیار بکات، پێی دەوترێ: (عامِل مَنْ شئتَ إلا فُلاناً و فُلاناً)، معامەلە لەگەڵ هەر کەسێکدا بکە کە پێت خۆشە تەنها فلان کەس و فلان کەس نەبێ، ئەو دوانە نەبێ باقی ئەهلی بازاڕ هەمووی ئەمین و ڕاستگۆیە، دوای ئەوە زەمانێکی تر دێتە پێشەوە وەڵامی پرسیاری ئەو کەسە نەشارەزایە وای لێدێ کە پێی دەوترێ: (لاتعامل أحَداً إلا فلاناً وَ فُلاناً).. معامەلە و کڕین و فرۆشتن لەگەڵ کەسدا مەکە لە ناو بازاڕدا ، چونکە هەمووی دەست بڕ و ناپاکە ، تەنها دوو کەس نەبێ کە باسی حەڵاڵ و حەرامیان لاماوە، ئەوانیش فلان و فلانن!!

پیاوچاکان دەفەرموون: لەوە دەترسین زەمانێك بێتە پێشەوە ئەو دوو کەسەش نەمێنێ و ئەگەر چویتە هەر بازاڕێکە وە و هەر شتێکت کڕی و فرۆشت، بەردەوام لە دڵەراوکێ و ترسدا بیت کە ئایا دەستیان بڕیوی یان نا، ئایا ئەوەی کڕیوتە بەکەڵك دێت یان نا! (إنا لله و إنا إليه راجعون) بەڕاستی ئەوە گەورەترین موصیبتە کە ڕوو دەکاتە موسڵمانان!

ئیمانداران و خواناسان: لە کۆتایی ئەم باسی وەرع و خۆپاراستن لە شتە گوماناویەکان و نادیارەکاندا، ئەوە دەڵێم کە کۆمەڵێك شت هەیە پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین، لەبەر ئەوەی زۆربەیان ئەگەر بە ڕووکەشیش حەرام نەبێ بەڵام لە ناوەڕۆك و واقیعدا حەرامە و موسڵمان دەبێ واریع بێ و خۆیانی لێ بپارێزێ:

١. وێری ناو مەطعەم و ئۆتۆمبێل، زۆرجار بوە کەسێك لەڕووداماوە و پارەی چەند کەسێکی تری داوە و زۆری لەسەر کەوتووە و بە دڵ

پێی ناخۆشە و بەڵام چارەی نییە، ئەمە حەرامە و نابێ قبوڵی بکەی و سوپاسی بکە و با هەرکەس خۆی پارەی خۆی بدات.

٢. زۆر کەس هەیە کە دەچێتە دوکانێکەوە تا کیلۆیەك شت دەکڕێ. دەست دەبا و چەند شت دەخوات جا میوە بێ جەرەسات بێ، کە دوکاندارەکە پێی عەیبە بڵێ مەیخۆ، بەڵام لە دڵەوە زۆری پێ ناخۆشە و ئەو کەسە حەرامی خواردووە و ئومێدەوارم ئەو ڕەوشتە ناشرینە نەمێنێ.

٣. هەر شتێك بە لەڕوودامان –غصبُ الحیاء– دەستت بکەوێ، حەرامە، بۆ نمونە: کەسێك شتێکی بەدەستەوەیە،تۆ بڵی بەڕاستی جوانە، ئەویش وەکو ڕێز لێگرتنێك بڵێ: پێشکەشت بێت ئەوە نابێ لێی وەرگری، چونکە ئەو وشەی پێشکەش کردنە تەنها ڕێز نواندنێکە و مانای ئەوە نیە هەدیەت دەکات، ئەگەر بیویستایە پێشکەشت بکات خۆی بۆی دەهێنای بۆماڵەوە، بەڵام تۆ کە لێی وەردەگری پێی دەڵێی بەراستی جوانە، ناچاری ئەوەی دەکەی کە بڵێ پێشکەشت بێ و حەرامە وەری بگری!..

٤. سوپاسی خوای گەورە دەکەم کە بە پەروەردەی ئەم ئیسلامە لە بەرەکەتی مزگەوتەوە، لە ئەمڕۆدا خەڵکانی حەرام خۆر لە چاوی خۆیانەوە دەڕواننە دەوروبەر و دەڵێن: کەسی حەڵاڵ خۆر نەماوە، بەڵام دەیان و سەدان کوڕ و کچی گەنجمان هەیە کە لەگەڵ ئەوەشدا زۆر موحتاجن و باری ئابوریان باش نیە، بەڵام زۆر خۆپارێزن و هەرشتێ گومانی لێ بکەن نزیکی ناکەونەوە و لە هەموو هەڵس و کەوتێکیاندا

پرس بە زانایانی شەرع زان دەکەن و جێگەی دڵخۆشی مامۆستایان و میللەتی موسڵمانان و دونیا بە ئەوانەوە جوانە و ئاوەدانە، بەڵام چونکە حەرامخۆرەکە زۆرتر بووە، ئەوانە کەمتر دیار و ئاشکران، خوای گەورە لێت دەپاڕێمەوە و دەڵێم: اللّهُمَّ اغنِنا بحَلالِكَ عَن حَرامِكَ و بطاعَتِكَ عَن مَعصيَتِكَ و بفَضْلِكَ عَمَّنْ سِواكَ. اللّهمَّ آمين.

**سەرچاوەکان:**


١. قورئانی پیرۆز.
٢. پوختەی تەفسیری قورئان –مەلا محمد مەلا صالح.
٣. تەفسیری ڕامان –مامۆستا أحمد کاکە محمود.
٤. نَظْرَةُ النَّعِيم ج٨ ص٣٦٢٠ ، ص٣٦٢٤.
٥. دورُ القيَم و الأخلاق في الأقتصاد الأسلامي –د. يوسف القرضاوي: ص٣٣١ ، ص٢٩٦، ص٣٣٢.
٦. مواقف من حياة الرسولﷺ – محمد حسين عبد العال ص٣١٩ ، ص٣١٦.
٧. جێنشینانی پێغەمبەرﷺ –عمرو خالد –وەرگێڕانی میراز: ل٩٨،ل١٠٠،ل٩٥،ل٩٤.
٨. عومەری کوڕی عبدالعزیز – حبيب محمد سعيد ل١٩٣، ل٢٠٨، ل١٩٤، ل.٢٠١
٩. خُطَب الشسخ محمد الغَزالي. ج١ ص١٨٣.

# وتاری پێنجەم بۆ مانگی جمادي الأولی

## (( چاوپیسی ))

الحَمدُ للّٰهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعينَ.

**ئیمانداران: یەكێ لە جیاكەرەوەكانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە هەموو بۆچونێكی مرۆڤی و فەلسەفەیەك ئەوەیە كە ئاینی ئیسلام كە بەرنامەی ژیانی مرۆڤە تەنها ڕێگای بەختەوەری و گەیشتنیەتی بە ڕەزامەندی خوا، ئەوەیە كە هیچ خێرێك و شەر و خراپەیەك نەماوە كە ڕولە مرۆڤ بكات و باسی نەكات، دەستمان دەگرێ بۆ هەموو خێرێك ئاگادارمان دەكاتەوە لە هەموو خراپە و شەڕێك و ڕێبازی خۆپاراستنیش لێی دیاری دەكات.**

**وە ئاینی ئیسلام هەرچی شتێ كە حەقیقەتی هەبێ و ڕاست بێ دانی پێدا دەنێ و هەرچی ئەفسانە و خەرافات و خەیالاتە ڕەتی دەكاتەوە و دژایەتی دەكات.**

**جا یەكێ لەو شتانەی لە دێرزەمانەوە خەڵكی مەشغوڵ كردوە و هەندێ لە خەڵكی بڕوای پێیەتی و هەموو ژیانی ترسە لێی، هەندێكی تریش دەڵێ نیە و بڕوام پێی نییە، ئەویش (چاوپیسی)یە، بەڵام ئێمەی موسڵمان پێش ئەوەی كە حوكم لەسەر بون یان نەبونی هەر شتێك بدەین پێویستە بگەڕێینەوە بۆ قورئان و سوننەت، (سُبحان الله لە عەظەمەت و گەورەیی ئەم ئیسلامە تەنانەت باسی ئەمەشی تێدایە).**

**بەڕێزان: با بچینە خزمەت قورئانی پیرۆز بزانین لەبارەی چاوپیسیەوە چی باس كردووە؟! قورئانی پیرۆز لە سورەتی (یوسف)دا**

**باسی بەسەرهاتی حەزرەتی (یەعقوب) پێغەمبەرمان بۆ دەگێڕێتەوە لەو کاتەدا کوڕەکانی بانگ کرد و بنیامینیشی لەگەڵ ناردن بۆ وڵاتی میصر بۆ ئەوەی دانەوێڵە و خۆراك لەگەڵ خۆیان بێننەوە، لە کاتی بەڕێکردنیاندا ئامۆژگاری کردن و فەرمووی:** ﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖ﴾ یوسف:٦٧

**زانای تەفسیر -إبن کثیر- دەفەرموێ: بۆیە وای پێوتن:** (لأنَّهُ خَشی عَلَيهُم العَيْنَ و خَشَى عليهم أنْ يُصيبَهُم الناسُ بعُيونهِمْ) **چونکە لێیان دەترسا بە چاوەوە بن لەوە دەترسا کە ئاوا بە کۆمەڵ ببینرێن و خەڵکی چاوپیس بە چاویانەوە بکات کە ئەو هەموو برایە چۆن بەیەکەوەن.**

**هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا جارێکی تر باسی چاوپیسی هاتووە لە سورەتی -القلم-دا باسی کردووە وەکو ئاماژەیەك کە ئەم باسە حەقیقەتێکی عیلمیە، دەفەرموێ:** ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكۡرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجۡنُونٞ ۝ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ القلم: ٥١-٥٢

**واتە: بەڕاستی نزیك بوو بێبڕواکان هەڵت خلیسکێنن بە چاوی (پیسیان)، لە کاتێکدا دەبیستن وە دەیان وت: بەڕاستی ئەم پێغەمبەرە شێتە، لە کاتێکدا کە ئەم قورئانە هەر ئامۆژگاریە بۆ هەموو جیهانیان... لێرەشدا زانای موفەسیر -إبن کثیر- دەفەرموێ:** (في هذه الآية دَليلُ عَلى أنَّ العَينَ إصابَتُها و تَأثيرُها حَقٌ بأمرِ الله عَزَّ و جَل).

**واتە: ئەم ئایەتە بەڵگەیە کە چاوی پیس بە ویستی خوا ڕۆڵ و دۆزی خۆی دەبینێ و دەتوانێ زیان بگەیەنێت بەو شتەی بۆی دەڕوانێت..**

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەوە بوو کە چاوپیسانی بەنی ئەسەد کەسی وای تێدا بوو کە حوشتری ساغی بەچاوەوە دەکرد و بەبێ هیچ نەخۆشیەك بە زەویدا دەکەوت و مردار دەبۆوە موشریکەکانی مەککە هاتن لەگەڵ ئەم چاوپیسانە ڕێککەوتن بەرامبەر بە بڕێك پارەی زۆر کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە چاوەوە بکەن و لەناوی ببەن، بەڵام خوای گەورە پاراستی و بەم ئایەتە ئاگاداری کردەوە لە پیلانەکەیان..

بەڕێزان ئێستا با بچینە خزمەت فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بزانین لە بارەی چاوپیسیەوە چی فەرمووە؟!

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

١. العينُ حَق- رواهُ مسلم، چاوپیسی حەق و ڕاستە و کاریگەری خۆی هەیە.

٢. إستَعِذوا باللّهِ مِنَ العينِ ، فإنَ العينَ حَقٌ- رواهُ إبن ماجة، پەنا بگرن بە خوای گەورە لە شەڕی چاوی پیس، چونکە چاوپیسی حەقە.

٣. العَينُ تَدخُلُ الرَّجُلُ القَبرَ، و تَدْخُلُ الجَمَلُ القِدْرَ - رواهُ ابو نعيم في حلية الأولياء، چاوی پیس مرۆڤی ساغ دەخاتە گۆڕەوە و حوشتری ساغ دەخاتە مەنجەڵەوە!.

٤. العينُ حَق وَلَو كانَ شيء سابِقُ القَدَر لَسَبَقَتْهُ العينُ- رواهُ مسلم، واتە: چاوپیسی حەقە و ئەگەر شتێك پێش قەدەر بکەوتایە، ئەوا چاوپیسی پێشی دەکەوت.

٥. عبدالله ی کوڕی عباس دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم دوعایەی بەسەر حەسەن و حوسەین دا دەخوێند و دەیفەرموو: (أُعيذُكُما بِكَلِماتِ اللّهِ التّامَة، مِنْ كُلِّ شَيطانٍ وهامَّةٍ، وَ مِنْ كُلِّ

عَيْنٍ لامَّة) رواه البخاري– وە پێغەمبەری خواﷺ دەیفەرموو: کاتی خۆی حەزرەتی إبراهیم ئەم دوعایەی بەسەر –إسماعیل و إسحاق–دا خوێندووە بۆ پاراستنیان لە چاوی پیس.

ئیمانداران: لە کوردەواری خۆماندا وا ئەزانین کە حەسودی و چاوپیسی هەر یەکن، بەڵام لە ڕاستیدا جیاوازن لە چەند ڕوویەکەوە وەکو:

١. كُلُّ عائِنٍ حاسِد، و لَيسَ كُلُ حاسِدٍ عائِن: هەموو چاوپیسێك حەسودە بەڵام مەرج نیە هەموو حەسودێك چاوپیس بێت.

٢. حەسودی لە ڕق و کینەوە دروست دە بێت بەڵام چاوپیسی لە سەرسوڕمانەوە دروست دەبیٚ کە ئەو شتەی زۆر بە جوان و سەرنج ڕاکێش دێتە بەرچاو.

٣. حەسود زۆر جار پێش بوونی شتەکە لای ئەو کەسە، حەسودی پیٚ دەبات. بەڵام چاوپیس دەبیٚ شتەکە بونی هەبیٚ و چاوپیسەکە چاوی پیٚ کەوتبیٚ.

٤. مرۆڤ حەسودی بە خۆی نابات، بەڵام خۆی و ماڵ و منالی بە چاوەوە دەکات، زۆر جار بووە ئەو چاوپسیانە داوایان لە مامۆستایانی ئاینی کردووە کە دوعا و نوشتەیان بۆ بکەن بۆ چاوی خۆیان کە مالی خۆیان و منالی خۆیان بە چاوەوە نەکەن. حەسودی لە مرۆڤی پیس و دەرون نەخۆش و بیٚ دینەوەیە، بەڵام چاوپیسی جاری وا هەیە لە کەسی خواناس و زانا و پیاو چاکیشەوە ڕوودەدات.

٥. جنۆکە حەسودی بە مرۆڤ نابات، بەڵام جنۆکە مرۆڤ بە چاوەوە دەکات. پێغەمبەری خواﷺ منالێکی بینی دەموچاوی پەڵەی ڕەشی

لێدابوو، فەرمووی: (إستَرقوا لَها فَإنَّ بِها النَّظرة) رواهُ البخاري و مُسلِم.
واتە: دوعای بەسەردا بخوێنن چونکە جنۆکە بە چاویەوە کردووە.

بەڕێزان: چاوپیسی دیاردەیەکی جیهانییە و لە هەموو وڵاتانی دونیادا باس دەکرێت، تەنانەت بە بۆنەی کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی جیهانیەوە کە لە یاریگای (جارکارتای) پایتەختی ئەندەنوسیا ئامادە کرا، زۆر پاڵەوانێتی و یاری کرا، لە ناویاندا پێشبڕکێی چاوپیسی، ئەو کەسەی بە یەکەم دەرچوو خەڵات کرا، کەسێك بوو کە کاتیٚ گایەکی شێتیان لەو قەفەزەی تێیدا بەند کرابوو بەڕەڵا کردە ناو مەیدانی گۆڕەپانەکەوە، ئەم چاو پیسە  بە یەك تەماشا کردن بەلایدا خست و کوشتی!!.

ئیمانداران: لێرەدا لەوانەیە پرسیارێك بکریٚ و بگوتریٚ: باشە خۆ هیچ شتێکی بینراو یان بیسراو یان هەست پیٚ کراو لەم چاوەوە دەرناچیٚ، ئیتر ئەم شتە چۆن ڕوودەدات؟! لە وەڵامدا دەڵێین: هەر خوای گەورە خۆی دەزانیٚ چۆنە، بەڵام لەوانەیە تیشکێکی ژەهراوی بێت و لە چاو بێتە دەرەوە، لە دونیای ئەمڕۆدا تیشکی لەیزەر بەردی گورچیلە دەتوێنێتەوە و چەندین نەشتەرگەری زۆر گرنگی پیٚ ئەنجام دەدریٚ، خۆ ئەم تیشکە نە چاو دەیبینیٚ و نە گویٚ هەستی پیٚ دەکات، نە هیچ هەستێکی پیٚ دەکریٚ و کاریگەری تەواوی خۆشی دەکات، دەی تیشکی چاوی پیسیش بە هەمان شێوەیە.

تەنانەت هەندیٚ چاوپیس هەبوە کە وتویەتی:کە سەیری شتێکم کردبیٚ و سەرنجی ڕاکێشابم، گەرمایی بە چاومدا هاتووە و یەکسەر

کارم تێکردووە، یان شتەکە لەبەر چاوم گەورە بووە تا تەقیوە، ئیتر زانیومە کە کاریگەری خۆی کردوە.

نوسەر و لێکۆڵەری بەریتانی (لین ماکتا جارات) لە پەڕاوەکەیدا (گەڕان بە دوای نهێنی گەردوندا) ئەو لێکۆڵینەوانەی کۆکردۆتەوە کە لەسەر وزە کراوە، نوسەر دەڵێت: لە ساڵی ۱۹۷۳دا کە (مەلیك فەیصەڵی کوڕی عبد العزیز) ویستی نەوت نەدات بە ڕۆژئاوا، وڵاتانی ڕۆژئاواو ئەمریکا زاناکانیان کۆکردەوە و داوایان لێکردن کە دیراساتی زۆر بکەن لە بواری وزەدا، کە مەلیك فەیصەڵ تیرۆر کرا و نەوتیش کەوتە بەردەستیان دیراساتەکان سست بوون، زاناکان دیراسەی پێکهاتەکانی ناو ناوکی گەردیلەیان کرد کە ئەجوڵێن و بۆیان دەرکەوت کە ئەو جوڵەیە کاری تێ دەکرێت بە سەیر کردنی ئەو کەسەی کە سەیری دەکات، دیارە ئەمەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت، گەنجێك ناوی (ماثیو مانینغ) کە خەڵکی گوندی (لینتۆن)ی نزیك شاری (کامبردج)ە، هەر بە سەیر کردن دەتوانێت کەوچك و چەقۆ بنوشتێنێتەوە هەروەها سەیری کاتژمێر دەکات و لە جوڵەی دەخات، هەروەها بە سەیرکردن دەتوانێ کار بکاتە سەر ڕۆشتنی خوێن لە بۆریەکانی خوێندا!!..

زانای بایۆلۆجی (ئیدوارد دفامۆف) مامۆستای زانکۆی مۆسکۆ لێکۆڵینەوەی کرد لەسەر ئافرەتی ڕوسی (نیلیا میخایلۆفا) کە لە دوری شەش پێوە بە تەنها بە سەیر کردن سپێنە و زەردێنەی هێلکە لە یەك جیادەکاتەوە!!..

ئەمە و سەدان لێکۆڵینەوەی تر ئەوە دەسەلمێنن کە چاو کاریگەری خۆی هەیە ئەمەش هەمووی شایەتییە بۆ قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ کە باسی کاریگەری چاو پیسی دەکەن.

بەڕێزان: لەبارەی سزای چاوپیسیشەوە، زانایانی ئیسلام فەرموویانە: (أنَّ مَن عَرَفَ بذالكَ حَبَسَهُ الإمامُ و يُنْفقُ عَلَيه إلى الموت ، و هذا هوَ الصوابُ قَطعاً)

واتە: هەر کەسێك بە چاوپیس ناسرا لە ناو خەڵکی دا و کەسانێك بەڵگەیان هەبوو لەسەری کە بە چاوی ئەو زەرەرمەند بوون، ئەوا پێشەوای موسڵمانان بەندی دەکات و پێویستیەکانی ژیانی بۆ دابین دەکات و لە زیندانەدا دەمێنێتەوە تا دەمریّ!!..

بەڕاستی ئەوە یاسای ئیسلامە و ئەوە دەوڵەتی پێشکەوتوو کە هەر کەسیّ زەرەر و زیان بە خەڵکی بگەیەنیّ نابیّ لە ناو کۆمەڵدا بژی و دەبیّ حکومەت هەم خەڵکی لە دەست و چاوی ڕزگار بکات، هەم چاوپیسەکەش مافی پارێزراو دەبێت.

وە لەم سەردەمەشدا کە ئەو یاسایەی شەرع جیّ بەجیّ ناکریّ، هەر کەسێك کە خۆی بە موسڵمان و دیندار دەزانیّ و خۆی هەست بە خۆی دەکات کە چاوی پیسە و خەڵکی لە چاوی ئەوەوە توشی زیان دەبن ، پێویستە خۆی سزای خۆی بدات و بۆ کار و ئیشی زۆر زەرور نەبیّ نەیەتە ناو خەڵکییەوە و لە ناو ماڵی خۆیدا دابنیشیّ، ئەو کاتە هەم خۆی دین و ئیمانەکەی سەلامەت دەبیّ و بە چاوی سوك سەیر ناکریّ و هەم موسڵمانانیش لە چاوی پیسی بە دور دەبن، وە خەڵکی بەو جۆرەش هەبووە،

پیاوێکی ڕاستگۆ بۆی گێڕاینەوە کە کاتی خۆی گەنج و تازەلاو بوە، باوکی ناردویەتی بۆ لای برادەرێکی دێرینی خۆی و دیاریەکی بۆ ناردوە، فەرمووی کە چووم بۆ لای و سەلامم لیٚ کرد پشتی تیٚ کردم و تەماشای نەکردم، هەروا پشتی تێم بوو کە هەواڵی باوکمی لیٚ پرسیم و سوپاسی دیاریەکەی کرد، دەفەرمویٚ: زۆر لە دڵم گران بوو، کە باوکم بۆ لای کەسێکی نادووم. هیچ ڕووی تیٚ نەکردم و خولقی مانەوەی نەکردم! کە گەڕامەوە و بۆ باوکمم گێڕایەوە، باوکم وتی: ڕۆڵەگیان: ئەو پیاوە زۆر بەڕێزە، بەڵام بە دەست خۆی نییە و چاوی زۆر پیسە، جا لەبەر خاتری دین و ئیمانەکەی خۆی: ئەوە چەند ساڵی زۆرە خۆی لە ماڵی خۆیدا سجن کردووە و تەماشای دەم و چاوی کەس ناکات و کوڕەکانی کاسپی بۆ دەکەن و بۆ خۆی لە ماڵ و لەو ژورە ناچێتە دەرەوە!!!

ئیمانداران: ئیسلام باسی هەر شتێکی کردبیٚ چارەسەریشی بۆ داناوە، بۆیە لێرەدا پرسیارێك دروست دەبیٚ: ئایا کەسێك بە تەواوی بەڵگە زانرا هیچ نەخۆشیەکی ناو خوێن و هەناوی نییە، بەڵکو نەخۆشی و لاوازی و بیٚ هێزیەکەی بە هۆی چاوی کەسێکی ناسراو بە چاوپیسەوە توش بووە، ئەوە ئەگەر شەرعی خوا فەرمان ڕەوا بێت بانگی ئەو چاوپیسە دەکریٚ و ئاوی بۆ دادەنریٚ و فەرمانی پیٚ دەکریٚ کە هەردوو دەستی و هەردوو باڵی تا ئانیشکی وە لە ناوکی بەرەو خوار تا قاچەکانی بەو ئاوە بشوات لە ناو تەشتێکی گەورەدا ئاوەکە کۆ بکرێتەوە و بەسەر پشتی ئەو کەسەدا بکریٚ کە بە چاوەوە بوە، بە ئیزنی خوا ڕزگاری دەبیٚ و چاك دەبێتەوە، ئەمەش فەرموودەی

پێغەمبەری پێشەوامانەﷺ کە کاتیٚ کۆمەڵێك خەڵکی هاتنە خزمەتی و بۆیان باس کرد کە: سەهلی کوڕی حەنیف لەسەر ئاو و کانیەك خۆی شتوە، لەو کاتەدا (عامری کوڕی ڕەبیعە) بەلایدا تێپەڕیوە و سەیری کردوە و وتویەتی: (تا ئێستا پێستی وا سپیم نەبینیوە!!)، دەست بەجیٚ لەوسەر ئاوە (سەهلی کوڕی حەنیف) بوراوەتەوە ، دڵنیاشین کە لەو کاتەدا ( عامری کوڕی ڕەبیعە) بەوێدا ڕۆشتووە و لە ناو هەموو خەڵکیشدا بە چاوپیس ناسراوە، پێغەمبەری خواﷺ زۆر عاجز و توڕە بوو فەرمووی: (علام یَقتُلُ أحدکم أخاهُ؟!) باشە ئەوە لەسەر چی هی وایە لە ئێوە بە چاوی پیسی براکەی دەکوژرێت؟!.. کەواتە: چاو پیس ئەگەر کەسێك بە چاوی ئەو بمرێت بە قاتیل و پیاوکوژ حسابە و لە قیامەتدا لەگەڵ ئەوانەدا حەشر دەکریٚ کە بە ناحەق خەڵکی دەکوژن!! پاشان پێغەمبەری خواﷺ داوای ئاوی کرد و فەرمووی: بڕۆن عامر بانگ بکەن و با هەردوو دەستی تا ئانیشکی و لە ناوکی بەرە و خوار بشوات و ئاوەکە لە تەشتێکدا کۆبکەنەوە و بیکەن بەسەر پشتی (سەهل)دا چاك دەبێتەوە بە فەرمانی خوا! وە فەرمووی: قاپەکەش دەمەو نخون بکەنەوە بە زەویدا، وە جێگای خۆیەتی و زۆر پێویستە کە هەر کاتیٚ ترسای لە چاوی کەسێکی چاوپیس کە کار لە منداڵەکەت بکات، بەتایبەت منالی ساوای سپی و جوان، ئەو دوعایەیان بەسەردا بخوێنن کە پێغەمبەری خواﷺ بەسەر هەردوو کوڕەکەی فاطمەی کچیدا واتە: (حەسەن و حوسەین) دا خوێندویەتی کە عبدالله کوڕی عباس بۆمان دەگێڕێتەوە و

دەفەرموێ: پێغەمبەری خواﷺ دوعای بێچاوێنی و نزای ئاگاداری و چاوەزاری بۆ حەسەن و حوسەین دەکرد و دەیفەرموو: (أُعيذكُما بكَلمات الله التَامَة، منْ كُلِّ شَيطان وهامَّةٍ، وَ منْ كُلِّ عَيْنٍ لامَّة). واتە:لە پەنای وشە تەواوەکانی خوای گەورەدا بن، دووربن لە زیانی هەموو شەیتانێ، وە خوا بتانپارێزێ لە وەزەنی هەموو ماروو مێروو گەزەندەیەك وە پارێزراو بێچاوێنی بن لە هەموو چاوێکی پیسی تاوانبار)) وە پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: (كانَ أبوكُم إبراهيم يُعَوِّذ بهما إسماعيل و إسحاق عَلَيهم السَّلام) واتە: بابەگەورەشتان ئیبراهیم لە کاتی خۆیدا بەم وشانە دوعای حیفظ و چاوەزاری دەکرد بۆ ئیسماعیل و ئیسحاقی کوڕی!! (رواهُ أبو داود و الترمذي بسند صحيح)..

وە پێویستە هەموو ئیمانداریێك لە ژن و پیاو، لە گەورە و بچوك چاو لە پێغەمبەری خواﷺ بکات و هەموو دوای نوێژی بەیانیەك و هەموو کاتی شەوانێك پێش خەوتن سێ جار ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾، ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾، ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ بخوێنێ بەسەر تەواوی لاشەی خۆیدا و فوو بکات بەسەر ماڵ و منالی و خانوی و سەیارەی و کەلوپەلەکانی دا دڵنیا بێ خوای گەورە لە شەڕی هەموو چاوپیسێك دەیپارێزێ.

هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خواﷺدوعای پاراستن لە چاوی پیس و شەڕی شەیاتینی و دەرونی پیسی بۆ خۆی دەکرد، بەڵام کاتێ

سوڕەتی ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ﴾و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ هاتنە خوارەوە ئیتر کاری بەم دوو سورەتە دەکرد کاری بەوانی تر نەما. وە ئەگەر کەسێك بە چاوەوە بوو، بۆ خۆی یان کەسێکی تر سوڕەتی: (الأخلاص)و (فلق)و (الناس)ی بەسەردا بخوێنێ إنشاء الله رزگاری دەبێت.

وە کە ئەم سورەتە پیرۆزانەت خوێند ئیتر نابێ هەموو کاتێ هەر دڵت بترسێ و هەموو کەست هەر پێ چاوپیس بێ و هەموو نەخۆشی و ئازارێك بە چاوەزار بزانی، چونکە ئەوەی چاوی پیس بەتاڵ دەکاتەوە تۆ بەکارت هێناوە.

وە ئەوەش بزانن، هەر کاتێ چاوت بە ماڵ و سامانێکی خۆت کەوت، یان منداڵێکی جوان و ساوای خۆت کەوت، یاخود باخ و باخاتی خۆتت بینی و بەجوانی هاتە بەرچاوت و سەرنجی ڕاکێشای یاخود کەسێك بەرەو ڕووت بۆوە و سەرنجی دایت یاخود سەرنجی باخ و کێڵگە و سەیارە و ماڵ و خانوو منداڵی دای دڵت لێی دەترسا، لە هەردوو بارەکەدا یەکسەر بڵێ: ( ماشاء الله، لاحَولَ ولا قُوَةَ إلا بالله).

لە کۆتایشدا ئەوە دەڵێم کە: چاوی پیس هەمووی لە یەك پلەدا نییە و هەیە تەنها بێتاقەتت دەکات و هەیە نەخۆشت دەخات و هەشە خوا بمانپارێزێ مرۆڤ لەناو دەبات.

خوای گەورە بە گەورەیی خۆی لە خراپە و شەڕی چاوپیسان و دەرون نەخۆشان بمانپارێزێ. اللهم آمین.

## سەرچاوەکان:

١. قورئانی پیرۆز

٢. التاجُ الجامع للأُصول فِي أحاديث الرسولﷺ . لە نوسینی: منصور علی ناصف–وەرگێڕانی: مامۆستا نوری فارس حمه خان ب٤ ل٢٢٠، ل٢٠٧، ل٢٢٣

٣. گۆڤاری جەماوەر : ژ٧٦

٤. تەفسیری ڕامان –مامۆستا احمد کاکە محمود

٥. الوافي فِي شَرح الأربعين النوويَّة – د. مصطفى البُغا– ط٩ ص٢٨٣

٦. زادُ المُتَّقين –إبراهيم عبدالله الحازمي ص٣٨٩

٧. نامیلکەی چاوپیسی –صابر گرد عازەبانی.

# وتاری یەکەم بۆ مانگی جماد الثانی

لەبەر خاتری خوا واز لە هەر حەرام و ناشەرعییەک بێنی
خوای گەورە پاداشتی زۆر گەورەت دەداتەوە

## وتاری یەکەم بۆ مانگی جماد الثاني

## (( لەبەر خاتری خوا واز لە هەر حەرام و بێشەرعییەك بێنی، خوای گەورە پاداشتی زۆر گەورەت دەداتەوە ))

الحَمدُ للّهِ رَبّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعينَ.

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە فەرمویەتی: ئەی بەندەکانم، ((لا تَقْنَطوا مِنْ رحمَتي)) ئەی بەندەکەم لە ڕەحمەتی من نائومێد مەبە، چونکە ئەگەر:

تۆ بە غەدر وەصف کراوی،خوای گەورە بە جود و بەخشەر وەصفی خۆی کردووە، ئەگەر گوناهباری خوا بەخشندەیە ، ئەگەر تۆی بەندە بێوەفای ، خوای گەورە چاکەی هیچ کەسێك بە زایە نادات، ئەگەر تۆی بەندە بیٚ ئاگایت، خوای گەورە لێخۆشبووە، ئەگەر گەڕایتەوە بۆ لای و لێی پاڕایتەوە، ئەوا دوعات قبولْ دەکات.

هەزاران صەلاوات و سەلامی خوا لەسەر ڕۆحی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزەی کەهیچ خێرێك نەماوە ئێمەی لیٚ ئاگادار نەکردبیٚ، وە هیچ شەڕ و تاوان و خراپەیەك نییە کە ئێمەی لیٚ وشیار نەکردبێتەوە، ڕەحمەت و ڕەزای خوا لەسەر یار و یاوەران و خێزانە بەڕێزەکانی و هەموو ئەو کەسانەش بیٚ کە شوێن ڕێباز و سونەتی ئەو فەخری عالەمە کەوتون بە گشتی تا ڕۆژی دوایی.

ئیمانداران: لەم وتارەدا دەچینە خزمەت یەکیٚ لە صەحابە ئازیز و بەڕێزەکانی پێغەمبەری خواﷺ کە ئەویش (ئوبەی کوڕی کەعبە) کام

ئوبەی؟! با جارێ باشتر بیناسین، پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: (أرْحَمُ أُمَتي بأُمتي أَبوبَكر و أشَدُّهُم في أمرِ اللهِ عُمَر، وَ أصدَقُهم حَياءً عُثمان، و أقْرؤهُم لكتابِ اللّه أُبي بن كعب) صحيح رواه احمد و صحّحهُ الألباني.

واتە: بەبەزەیی ترین کەسی ئومەتەکەم بۆ ئومەتەکەم ئەبوبکرە.. بەهێزترین و توندترینیان لە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی خوادا عومەرە، بەشەرم و حەیاترین کەسیان عُثمانە، شارەزاترین کەس لە جوانخوێندنەوەی قورئاندا ئوبەی کوڕی کەعبە!

هەر لەبارەی گەورەیی ئوبەی کوڕی کەعبەوە ئەنەسی کوڕی مالك دەفەرموێ: پێغەمبەری خواﷺ بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرموو: (إنَّ اللّه أَمَرَني أن أقرأ عَلَيكَ القُرآن) خوای گەورە فەرمانی پێ کردم کە قورئانت بۆ بخوێنم! ئوبەی لە خۆشیاندا فەرمووی: (اللّهُ سَماني لَك؟!) خوای گەورە ناوی منی هێناو بە تۆی فەرموو؟!! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئوبەی خەریك بوو باڵی دەگرت لە خۆشیاندا، بۆیە ئەم جارەش لە پێغەمبەری خوایﷺ پرسیەوە: (أوَقَد ذكرت عِندَ رَبِّ العالمين؟!) ئایا ناوی من (ئوبەی) لە لای پەروەردگاری جیهانیان هاتوە؟!! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ. رواهُ البخاري.

اللّهُ أكبر لە پلە و پایە و ڕێزەی ئوبەی کوڕی کەعب لای خوا و پێغەمبەرەکەی!! جا ئێمە دەچینە خزمەت ئوبەی گەورە هاوەڵی پێغەمبەری خواوﷺ کە ئەویش دەفەرموێ: گوێ بگرن فەرموودەیەکی پێغەمبەری خۆشەویستتان بۆ دەگێڕمەوە، بەڵام توخوا بەدڵ گوێی بۆ بگرن و لەبەری بکەن و لە ژیانی ڕۆژانەتاندا کاری پێ بکەن، بۆ ئەوەی بەختەوەری دونیا و دوا ڕۆژبن، ئێمەش بە دڵ گوێ دەگرین و إنشاء الله

بەڵێن دەدەین کە کاری پێ بکەن. ئوبەی دەفەرموێ: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (إنَّك لَن تَدَعْ شَيئاً للّهِ عَزَّ وجَلَّ إلا أبْدَلَكَ اللّهُ بِهِ ما هُوَ خَيرٌ لَكَ مِنهُ) صحيح رواه احمد.

واتە: بێگومان بە و( عِلمُ اليَقين و عَيْنَ اليَقين و حَقَّ اليقين)ت ببێ کە تۆ هەر شتێك (کە حەرامە و ناشەرعیە) لەبەر خاتری خوای گەورە وازی لێ بێنی، ئەوا خوای گەورە بۆت دەگۆڕێ بە باشتر بۆت لەوەی کە وازت لێ هێناوە.

بەڵێ ئیمانداارانی بەڕێز: مرۆڤ خاوەنی شەهوەت و ئارەزووە، کە بە ڕاست و ناڕاست داوا دەکات جا ئەگەر داواکراوەکە حەڵاڵ و ماقڕ ڕەوات بوو، حەقی خۆتە و هەوڵی بۆ بدە، ئەگەر نا ڕەوا بوو، ئەوا تۆ بەرامبەر تاقیکردنەوەیەکی گەورەیت ئایا خۆت ڕادەگری یان تەسلیم بە نەفسی خراپ و شەهوەت دەبیت، ئەگەر ئارامت گرت بەرامبەر شەهەوات، ئەوە سەرەتا نارەحەتە بەڵام پاشان دەگۆڕێ بۆ لەزەت و خۆشی.

بەڵێ نیشانەی تەقوا و ئیمانداری ئەوە نییە کە ئینسان قەت خەیاڵی خراپی بە مێشکدا نەیەت بەڵکو ئەوەیە: بەرپەرچی بداتەوە ئەمەش جیهادی گەورەیە کە جیهادی نەفسە.

جا هەرکەسێ وازی لە شەهەوات هێنا، (للّه)تەنها لەبەر خوا، نەك لەبەر شتی تر وەکو بێدەسەڵاتی یان بێتوانایی، ئەوە خوای گەورە قەرەبوی دەکاتەوە بەوەی کە خۆشەویستی خۆی دەخاتە دڵی ئەو بەندەیەوە، دڵی ئارام دەکات و لە قەلەق و دودڵی و دڵەراوکێ دەیپارێزێ، وە لە ڕووی مادیشەوە خوای گەورە هەر لە دنیادا پاداشتی دەداتەوە ئەمە سەرەڕای پاداشتی گەورە لە قیامەتدا.

ئیمانداران: باسی هەندێك لەو شتانە دەكەین كە پێویستە مرۆڤی موسڵمان لەبەر خوا وازیان لێ بێنێت و خوای گەورە بە چاكتر و خێرتر بۆی قەرەبوو دەكاتەوە.

یەكەم: كەسێك واز لە پارەیەكی حەرام بێنێت لەبەر خوا:

پارەیەك هاتۆتە ناو دەستەوە و زۆر موحتاجی پێی و كەسیش پێی نازانێ و هیچ ڕێگرێك نییە لەبەردەم ئەوەدا كە بە ئاسانی بیخۆی و بیخەیتە گیرفانتەوە، بەڵام یادی خوای گەورە دەكەی و دڵنیای كە خوای گەورە چاوی لێتە و ئەو پارەیە موڵكی تۆ نییە و خاوەنی خۆی هەیە و دەبێ بیگەڕێنیتەوە بۆ خاوەنەكەی كە شەرعی خوا ئاوا فەرمانی پێ كردووی، تۆش بەقسەی نەفسی هاندەر بە خراپەت ناكەی كە داوات لێ دەكات بیخۆ، زۆر موحتاجی، كێ دەڵێ خاوەنەكەی دەدۆزرێتەوە، لەبەر چاوت گەورە و شیرینی دەكات، ئیمانەكەشت پێت دەڵێ نەخێر مادام حەرامە مەیخۆ و لەبەر خوا وازی لێ بێنە، خوای گەورە لەو بڕە پارەیە زیاترت بە حەڵاڵی پێ دەبەخشێ،تۆش بەقسەی خوای گەورەت كرد و پشتت لە داواكاری نەفست كرد، ئەوە دڵنیا بە خوای گەورە بە حەڵاڵی پێت دەبەخشێت ئەگەر چی دوای ماوەیەكی تریش بێ و زەمەنێكی پێ بچێ و لە زەمەنێكی تردا بێ.

بێگومانین لەوەی كە هەرچی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی حەق و ڕاستە و پێویست بە تاقیكردنەوە ناكات، چونكە فەرمودەی كەسێكە كە ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ﴾ . بەڵام مرۆڤ بەردەوام بە چیرۆك بەسەرهاتی واقعی و ڕاستەقینە دڵی تەواوتر ئاو دەخواتەوە و دڵنابیایەكەی چەسپاوتر دەبێ، وە مێژووی پیاوباشان و

زانایانمان دەیان چیرۆك و بەسەرهاتی لەو بارەیەوە تێدایە كە هەمووی بە كردەوە فەرمودەكەی پێغەمبەری خواﷺ ڕوون دەكاتەوە كە فەرمووی: (إنَّكَ لَنْ تَدَعَ شَيئاً لله عَزَّ وجَلَّ، إلا أبْدَلَكَ الله به ما هُوَ خَيْرٌ لَكَ منهُ)..

فەرموون با گوێ بۆ ئەم بەسەرهاتە بگرین كە زانای بەناوبانگ (إبْن رَجَب الحَنْبَلي لە كتێبی ـذيل طبقات الحَنابلَة ج٣ ص١٩٦)دا بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: زانای گەورە (قاضي ئەبوبكر محمد بن عبدالباقي بن محمد البزاز الأنصاري) فەرمویەتی: لە شاری مەككەی پیرۆزدا دەمخوێند و زۆر هەژار و دەست كورت بووم، ڕۆژێكیان برسێتی تینی بۆ هێنام و هیچم دەست نەكەوت بیخۆم و هیچ پارەشم نەبوو خواردنی پێ بكڕم، بۆیە لەبەر زۆری برسیەتیەكەم لە ژورەكەم هاتمە دەرەوە بە ئومێدی ئەوەی خواردنێكی پاك و حەڵاڵم دەست بكەوێت، لە ڕێگا كیسەیەكم دۆزیەوە كە لە قوماشی ـإبرسيمـ كە جۆرە قوماشێكی نایابە دروست كرابوو، دەمەكەی بە هەمان قوماش بەسترابوو كە چاوم پێ كەوت و هەڵم گرتەوە و بە پەلە گەڕامەوە بۆ ژورەكەی خۆم و كردمەوە، بینیم گەردانەیەكی لوئلوئی تێدایە كە لە ژیانمدا شتی وا جوان و گرانبەهام نەبینیبوو، كە ئەگەر بمفرۆشتایە بە تەواوی لە هەژاری ڕزگارم دەبوو و دەچومە ڕیزی دەوڵەمەندانەوە،بەڵام هەر زوو ئارەزوی خراپەكارم سەركوت كرد و حوكمی شەرع كە باسی شتی بزربوو دەكات كردم بە ڕێنمایی خۆم و هاتمە دەرەوە لە ژورەكەم بۆ ئەوەی خاوەنەكەی بدۆزمەوە، هاتمە نزیك ئەو شوێنەی تورەكەكەم لێ دۆزیبۆوە، گوێم لە پیاوێكی بازرگانی زۆر دەوڵەمەند بو كە زۆر بە پەرۆشەوە بانگەوازی دەكرد و دەیگوت ڕەحمەتی خوا لەو كەسە بێ كە

کیسەیەکی گرانبەهای دۆزیوەتەوە و ئەمداتەوە و ئەوە پاداشتی گەورەم بۆ دیاری کردووە کە (٥٠٠) دیناری ئاڵتونە!!. قاضي أبوبكر دەفەرموێ: خوای گەورە هەر خۆی دەزانێ چەندم برسی بوو، چەند ڕوت و ڕەجاڵ بووم، چەند موحتاج بووم بە دیرهەمێك، بەڵام لەبەر خاتری خوا چومە لای کابرای بازرگان و وتم: وەرە لەگەڵم بۆ ژورەکەم، ناونیشانی تەواوی ئەو تورەکەیە و جۆری قوماشەکەی و ئەوەی تێیدایە بۆم باس بکە، ئەگەر هی تۆ بوو ئەتدەمەوە، کابرای بازرگان لە خۆشیان ڕووی گەشایەوە و تەواوی وەصفەکانی تورەکەکە و لوئلوئەکەی ناوی باس کرد و دامەوە دەستی و ئەویش دوای دوعای خێری زۆر و زۆر سوپاس کردنم، (٥٠٠)دینارە ئاڵتونەکەشی بۆ دانام و وتی: ئەمەش بەڵێنەکەی من! بەڵام من لەگەڵ ئەو هەموو موحتاجیەمدا لێموەرنەگرت و وتم: من وەکو ئەرکی سەرشانی خۆم وەکو موسڵمانێك ئەم کیسە دۆزراوەم بۆ گەڕاندویتەوە وە من خۆم بە موستەحەقی ئەو دیاریە گەورە کە بڕی (٥٠٠)دیناری ئاڵتونە نازانم، هەرچەندە بازرگانەکە زۆر هەوڵی دا کە ئەو دەستخۆشیانەی لێ وەرگرم، بەڵام لێم وەرنەگرت و لە دڵی خۆمدا وتم: با کارەکەم تەنها بۆ خاتری خوا بێت!... ئیتر بازرگانەکە خواحافیزی لێ کردم و ڕۆشت، دەفەرموێ: ئەمجا با بێینەوە سەر باسی خۆم، دوای ماوەیەکی تر مانەوە لە شاری مەککەی پیرۆزدا و درێژەدانم بە خوێندن، لەبەر هەژاری و هەم گەڕان بە دوای مامۆستای زاناتردا کە خوێندکاری زانستی شەرعی بەردەوام دەگەڕێ بە وڵاتاندا و وەکو هەنگ لە شیلەی عیلم و مەعریفەتی زانایان دەمژێ، منیش بڕیاری سەفەرم دا و سواری کەشتی بووم لەگەڵ کۆمەڵێك خەڵکی تردا و چوینە دەریاوە،

بەڵام لەبەر هەڵکردنی با و کۆنی کەشتییەکەمان کەشتیەکە شکا و پڕ بوو لە ئاو و تەختەکانی لە یەك ترازان، هەموو سەرنشینەکانی بە خۆیان و کەلوپەلەکانیانەوە تێداچوون و خنکان!! منیش لە تەواوی ڕۆحی خۆم پەلاماری پارچە تەختەیەکم داو چونکە لاواز بووم بە پارچە تەختەکە خۆم گرتەوە و ماوەیەك لە ناو دەریاکەدا مامەوە و شەپۆلی ئاوەکە بردمی و نەمدەزانی بەرەو کوێم دەبات، تاوەکو گەیشتمە قەراغی دەریاکە و دورگەیەك بوو، کۆمەڵە ماڵێکی لیّ بوو، چوومە مزگەوتی ئەو شوێنە و موسڵمانان زۆر ڕێزیان لیّ گرتم و بە تایبەتی کە زانیان قورئان خوێنم وبەدوای زانستی شەرعیدا دەگەڕێم زیاتر بوومە جێگای متمانە و بڕوایان، وە داوایان لیّ کردم کە فێری قورئانی پیرۆز و خوێندنەوە و نوسینیان بکەم و ببمە پێشەوای ئاینییان، بە تەواوی لەگەڵیاندا ئاشنا بووم و ئەوانیش هەموو منیان وەکو کوڕی خۆیان تەماشا دەکرد، پاش ماوەیەك، هەندیّ لە ڕیش سپی و پیاوماقوڵانیان هاتنە لام و پێیان وتم: لەم دێیەدا کچێکی زۆر ڕێك و پێك هەیە کە باوکی بازرگانێکی دەوڵەمەند بوو، پێش ماوەیەك لە هاتنی تۆ وەفاتی کرد و مرد، خێزانەکەشی دوای ئەو مرد، تەنها هەر ئەم کچەیان هەیە و هیچ منالێکی تریان نییە و برا و برازاشی نییە، ئەگەر حەز دەکەی لەگەڵ ئەو کچەدا یەکتری ببینن و ئەگەر یەکترتان بەدڵ بوو، خێزان دروست بکەن و شایەنی یەکترن.

بەڵیّ، دوای ڕۆشتن بۆ ماڵی کچی بازرگان، وتیان: ئەوە کچەکەیە، بەڵام ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا کچەکە نەبوو، کە ئافرەتێکی زۆر بە ئەدەب و خاوەن ڕێز و سیما جوان بوو، بەڵکو ئەو ملوانکەیە بوو کە لە

ملیدا بوو، چونکە ئەو ملوانکە لوئلوئە هەر ئەوە بوو کە کاتی خۆی لە مەککەدا دۆزیبومەوە و دابومەوە بازرگانەکە، بۆیە خەیاڵم چوەوە بۆ مەککە و ئەو دیمەنەم دەهاتە بەرچاوکە ملیوانکەکەم لە تورەکە نایابەکە دەرهێناوو سەرنجی ڕاکێشام، ئێستا هەمان ملیوانکە دەبینمەوە، لە ملی کەسێکدایە کە بە تەمام ببێ بە هاوسەری ژیانم، بۆیە کە لە دەریای فیکر و خەیاڵدا بووم هیچ قسەم نەکرد، ئەو پیاوە بەڕێزانەی لەگەڵم بوون وتیان: ئەوە بۆچی ئاوا بێدەنگ بووی و سەرنجی ئەو ملوانکە لوئلوئە دەدەی و تەماشای کچەکە ناکەی و ڕەئی خۆت ناڵێی؟! منیش دەستم کرد بە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە بۆیان و باسی دۆزینەوەی ئەو ملیوانکەم بۆ کردن لە شاری مەککەدا و دانەوەی بە خاوەنەکەی و وەرنەگرتنی تەنانەت هیچ بەخششێك لەجیاتی! هەر کە ئەوەم بۆ گێڕانەوە، هەموو دانیشتوانی مەجلیسەکە بەیەك جار دەستیان کرد بە (لا إلهَ إلا الله و الله أکبر) و صلاوات لێدان و هەستان باوەشیان پێداکردم و ماچیان کردم!! بە سەرسوڕمانەوە وتم: ئەوە بۆچی وادەکەن؟! وتیان: ئەو بازرگانەی تۆ باسی دەکەی باوکی ئەم کچە بوو، هەر کە لە شاری پیرۆزی مەککە گەڕایەوە بەردەوام باسی جوامێری و دەستپاکی و ئەمینی و نەفس بەرزی تۆی دەکرد و دەیگوت: هەرگیز ئینسانی وا چاك و گەنجی وا ئەمین و دەست پاکم نەبینیوە، وە بەردەوام لە خوا دەپاڕایەوە و دەیوت: خوایەگیان کارێ: بکەی جارێکی تر ئەو کوڕە گەنجە خواناسە ئەمینەم چاو پێ بکەوێتەوە و ئەم کچەی خۆمی لێ مارە بکەم و ببێ بە یەکێ لەم خێزانە! ئەوا ئەگەر چی خۆی مرد بەڵام ئاواتەکەی هاتە دی و تۆ بووی بە هاوژینی کچەکەی، دوای ڕەزامەندی

نواندنی کچەکەش گرێبەستی هاوسەریمان ئەنجامدا و بەوپەڕی خۆشحاڵی و دڵشادیەوە چوینە لانەی هاوسەریەوە و خوای گەورە دوو منالّی پێ بەخشین، بەڵام سُبحان الله پاش ماوەیەکی تر خێزانەکەشم وەفاتی کرد و من و دوو منالّەکەمماینەوە، دوای ماوەیەکی تر هەردوو منالّەکەشم مردن و ئەو ملوانکە لوئلوئەی کاتی خۆی لەبەر خاتری خوا هەڵم نەگرت بۆ خۆم و بە پێی فەرمانی شەرع دامەوە بە خاوەنەکەی و ئەوەندە کارەکەم بۆ خوا کرد تەنانەت بەخشش و دیاریشم وەرنەگرت! ئەو ملوانکەیە و هەموو سامانی بازرگانەکە بە حەڵاڵی و بەشەرعی خوا بوو بە ماڵی من و بەچاوی سەر و بە کردار واتای فەرمودەکەی پێغەمبەری خوامﷺ بینی کە فەرموویەتی: (إنَّكَ لَنْ تَدَع شَيْئاً لله عَزَّ وجَلَّ، إلا أبْدَلَكَ الله به ما هُوَ خَيْرٌ لَكَ منهُ)..

ئیمانداران: ئەمەی گێڕامانەوە یەکێکە لەو دەیان بەسەرهات و ڕوداوەی کە لەسەر ئەم بابەتە لە کتێبەکاندا تۆمارکراون و لە کۆندا ڕویانداوە، بەڵام حەز دەکەم بەسەرهاتێکی ئەم سەردەمەشتان بۆ بگێڕمەوە کە زانای نوسەر و بەتوانا (محمد عبدالعاطي بحيري) لە کتێبەکەیدا (رَوْضَة المُتَقين ج٢ ص٨) بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: یەکێ لە زانایانی برادەرم بۆی گێڕامەوە فەرمووی: ڕۆژێکیان لەگەڵ کۆمەڵێك لە مامۆستا و دۆست و برادەر بڕیارماندا سەردانی یەکێ لە هاوڕێ خۆشەویستەکانمان بکەین، کە پیاوێکی بەڕێز و زانایە و لە شاری مەدینەی منەوەرە، شارەکەی پێغەمبەری خواﷺ دادەنیشێ، لەو کاتەدا کە ئێمە گەیشتینە بەردەرگا و برادەرەکەمان هاتبووە دەرەوە بۆ پێشوازیمان، خەریکی چونە ژورەوە بووین کە پیاوێکی ڕیش سپی بە

تەمەنیش بەرەو ماڵی ئەو مامۆستایە هات و ئێمەش وەستاین تاوەکو گەشت و چاکوچۆنیەکی گەرمی لەگەڵ مامۆستاکەدا کرد و مامۆستاش داوای یارمەتی لە ئێمە کرد و لەگەڵ کابرای بەساڵاچودا چونە ئەولاتر و شتێکی خستە دەستی پیاوە پیرەکەوە و هەندێ قسەی بۆ کرد، کابرای بەساڵاچوو دڵی پڕ بوو زۆر بەکوڵ گریا و پاشان فرمێسکەکانی سڕی و خواحافیزی کرد و ڕۆشت، ئێمەش چوینە ژورەوە و لەگەڵ مامۆستادا دەستمان کرد بە قسە و باس و لە میانەی قسەکردندا مامۆستای خانەخوێمان فەرمووی: ئەو پیاوە بەساڵاچوەی ئێستا لەبەر دەرگا لەگەڵی وەستام و گریا بەسەرهاتێکی سەیری هەیە! وتمان چۆن؟! فەرمووی: ئەم بەیانیە پیاوێکی دەوڵەمەند هات بۆ لام و (٥٠٠) ڕیاڵی بۆ هێنام و وتی: مامۆستا خۆم مەجالم نیە و سەرقاڵم بەڵکو ئەو پارەم بۆ بدەی بە فلان کەسی ناسیاومان کە لە گەڕەکەکەماندایە و هەژارە (ناوی ئەو کابرا بەساڵاچوەی هێنا)!!و منیش تەلەفونم بۆ کرد و بانگم کرد بۆ ئێرە و پارەکەم دایە! ئێمەش وتمان: جا مامۆستا گیان ئەمە چ شتێکی تێدایە کە مایەی سەرسوڕمان بێ؟! فەرمووی: ئێستا بۆتان باس دەکەم، خۆتان بینیتان کە زەرفەکەم دا بە پیاوە بە ساڵاچوەکە، چۆن بە کوڵ گریا!! وتمان بەلێ، فەرمووی: ئەوە کە پارەکەم دایە، بۆی گێڕامەوە کە دوێنێ، (٢٠) ڕیاڵی لە خێزانەکەی وەرگرتووە کە کارێکی پێ بکات، بەڵام لە ڕێگادا توشی ناسیاوێکی خۆی بووە و هەواڵی پرسیوە، ئەویش باسی حاڵی خراپی خۆی لە ڕووی نەخۆشی و نەداری و بێدەرامەتیەوە بۆ کردووە و ئەمیش سەرەڕای وەزع و حاڵی خۆی زۆر بەزەیی پێدا هاتۆتەوە و (٢٠) ڕیاڵەکەی لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوا بەو هەژار و

نەخۆشە بەخشیوە!! جا کە پێم وت ئەو (٥٠٠) ڕیاڵە دەوڵەمەندێك هێناویەتی بۆ لام و داوای لێ کردووم بیدەم بە تۆ، دەستی کرد بە گریان وتی: بۆیە دەگریم کە بە چاوی خۆم لوطف و کەرەمی خوای گەورەم بینی کە لەگەڵی کردم، من لەبەر خاتری خوا وازم لە (٢٠) ڕیاڵی خۆم و خێزانەکەم هێنا، کەچی دوای یەك شەو خوای گەورە (٥٠٠) ڕیاڵی پێ بەخشیمەوە!!!..

بەڕێزان: هەر یەك لە ئێمە لە ژیانی خۆیدا دەتوانێ چەند نمونە و ڕوداو باس بکات کە ئەگەر هەر شتێ لەبەر خاتری خوا وازی لێ بێنی خوای گەورە زۆر لەوە باشترت پێ دەبەخشێەوە، جا هەندێ جار ئەوەی لەبەر خوا وازی لێ دێنێ حەرامێکە و نایخۆی هەندێ جاریش حەڵاڵی خۆتە و لەبەر خوا وازی لێ دێنی ودەیبەخشی بە کەسانی موحتاج، ئەوە هیچ گومانت نەبێ کە خوای گەورە بە چاکتر پاداشتت دەداتەوە...

دووەم: هەر کەسێك لەبەر خاتری خوا و فەرمانی خوا ڕقی خۆی بخواتەوە و هەڵنەچێ و توڕە نەبێ و لە کاتی توڕەبووندا دۆ و دۆشاو تێکەڵاو نەکات و ماڵی خۆی و خەڵکی وێران نەکات، بیری وەعد و بەڵێنی خوای گەورەی بێتەوە کە پاداشتی بەهەشتی بۆ ئەو کەسانە داناوە کە توڕەبونی خۆیان دەخۆنەوە و فەرموویەتی: ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ﴾آل عمران: ١٣٤

ئەوە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە بە باشتر لەوەی کە دەیوست بە توڕەیی بە دەستی بێنێ و خوای گەورە بە بێ شەڕ و هەرا و دەنگە دەنگ پێی دەبەخشێ و لە پەشیمان بوونەوە و عوزر هێنانەوە و داوای لێبوردن کردن لە خەڵکی دەیپارێزێ و لە هەموو پاداشتێك گەورەتر ئەوەیە کە دەیخاتە ڕیزی موتەقی و پارێزکارانەوە و دەبێت بە خۆشەویستی خوا و دەچێتە ڕیزی موحسنین و چاکەکارانەوە!!

**سێیەم:** هەر کەسێ لەبەر خاتری ئەمر و فەرمانی خوا و پێغەمبەرﷺ وازی لە غەش و خیانەت هێنا لە معامەلە و کڕین و فرۆشتندا ئەو پارە زۆرەی نەویست کە بە غەش و تەزویر و خیانەت دەستی دەکەوت و بە کەمی حەلاڵ قەناعەتی دەکرد، خوای گەورە قەرەبووی بۆ دەکاتەوە بە خۆشەویستی خەڵکی و زیاتر کڕیار ڕووی تێ دەکات و بەرەکەت دەخاتە ئەو کەمە قازانجەی بە حەلاڵی بەدەستی هێناوە و لەبەلا و زیانی تیاچووی سەرمایە و کەسابەتەکەی دەیپارێزێ..

**سێیەم:** هەر کەسێك حەقێکی لەسەر کەسێك بێ و ڕۆژێك لە ڕۆژان هەلی بۆ هەڵکەوتبێ کە تۆڵەی خۆی لەو کەسە بکاتەوە و بەو تۆڵە کردنەوە دڵی خۆی ئاسودە بکات، بەلاَم لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوا و پێغەمبەری دڵسۆز و پێشەوا کە فەرموویەتی: (وَما زادَ اللهُ عَبْداً بِعَفْوٍ إلا عِزًّا)رواهُ مُسلم. واتە: هەر کەسێ لەبەر خوا واز لە تۆڵەسەندنەوە بێنێ و لێبوردن و چاوپۆشی بنوێنێ، ئەوا خوای گەورە هەر سەربەرز و پایە بڵندی دەکات....

جا لەبەر ئەم فەرموودەیە واز لە تۆڵە کردنەوە بێنێ، ئەوا خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە بەوەی کە ئەگەر بە تۆڵە کردنەوە دڵی ئاسودە دەبو، بەم لێ بوردن و عەفوکردنە دڵی زۆر ئاسودەتر دەبێ و دڵی گوشاد دەبێ و مێشك و بیری دەکرێتەوە و لەبەر چاوی نەیارەکەی و تێکڕای خەڵکی خوای گەورە ڕێز و و حورمەتی زیاتر دەکات!..

**چوارەم:** هەر کەسێك واز لە گەڕان بەدوای عەیب و کەم و کوڕی خەڵکیدا بێنێ، چونکە خوای گەورە فەرمانی کردووە بەوەی کە ئیماندار نابێ بە شوێن عەیب و عاری خەڵکیدا بگەڕێ، وە چەند فەرمودەی

پێغەمبەری خواﷺ لەو بارەوە هەیە، ئەوە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە بەوەی کە خەڵکیش زمانیان لە ئاستی عەیب و کەم و کوڕی ئەودا دەبەستریٚ و کەم و کوڕیەکانی ئاشکرا ناکەن، ئیمامی شافیعی فەرموویەتی:

المَرءُ إن كانَ مُؤمناً وَرعاً . . . . . . . أشْغَلَهُ عَن عُيوبِ الوَرى ورعهُ

كَما السَّقيمُ العليل أشْغله . . . . . . . عَنْ وَجْعِ الناسِ كلهم وَجْعَهُ.

واتە: ئەگەر ئینسانی ئیماندار بەڕاستی ئیماندار و واریع بیٚ، ئەوا بەهۆی وەرع و خۆپارێزیەکەیەوە ناپەرژێتە سەر گەڕان بەدوای عەیب و کەم و کوڕی خەڵکیدا، هەر وەکو ئەو نەخۆشە بیمار و لەش بە ئازارەی کە لە تاوی ئازاری لەشی خۆی ئاگای لە ئازاری هیچ کەسێکی تر نییە! بەڵام بە پێچەوانەوە هەرکەسیٚ بە شوێن عەیب و کەم و کوڕی خەڵکیدا بگەڕیٚ و بڵاوی بکاتەوە و بەوە دڵی خۆی خۆش بکات و کات بەسەرببات، ئەوا دەبێت دڵنیا بێت کە خوای گەورە سەرەنجام ڕۆژێك ئابڕوی خۆی دەبات و خەڵکیش ڕوبەرووی دەبنەوە.

بەڕێزان فەرموون گویٚ بۆ بەسەرهاتێکی ڕاستەقینە بگرین کە لەم چەند ساڵەی ڕابردودا ڕویداوە و ئەو کەسەی چیرۆکەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە، ئێستا تۆبەی کردووەو ئەم ڕوداوە هۆکاری گەڕانەوەی بوە بۆ لای خوا، دەفەرموون با گوێی بۆ بگرین، ئەم پیاوە دەڵێت:

لەگەڵ ئافرەتێکی ساڵۆنی بەناوبانگ ڕێککەوتم کە بە کامێرای شاراوە وێنەی ئەو ئافرەتانەی دێنە ساڵۆنەکەی بۆم بگرێت بەرامبەر بە بڕێك پارە، خاوەن ساڵۆنەکە کامێرەی لە ژوری ڕازاندنەوەی بوك دانا، جا کە ئافرەتەکان دەهاتن لەویٚ پۆشاکی خۆیان دادەکەند، خاوەن ساڵۆنەکە بە فێڵ

ئافرەتەکانی دەهێنایە پێش کامێراکە تاوەکو جوان دەربچن، ئێمەش شەوان کۆمەڵە گەنجێك کۆدەبوینەوە و ئەم کاسێتانەمان لێدەدا و پاشان کۆپیمان دەکرد و لە نێوان خۆشماندا بڵاومان دەکردەوە، هەر بۆیەش من هەموو جارێك زۆر بە توندی خێزانم و خوشکەکانم قەدەغە دەکرد کە هەرگیز نەچنە سالۆن چونکە دەمگوت نەوەکا نەزانن و وێنەی ئەوانیش بگرن!!.. تا جارێکیان خاوەن سالۆنەکە بەو برە پارەیەی کە لەگەڵی ڕێککەوتبوم کاسێتێکی بۆ هێنام، منیش هێندێکم لە سەرەتای کاسێتەکە سەیر کرد، بەڵام چونکە کاری ترم هەبوو، بۆیە بە پەلە هەڵمگرت، لەبەر ئەوەی زۆر پێی سەرسام بووم کۆمەڵێکم لێ کۆپی کرد و دابەشی سەر هاوڕێکانم کرد، ئێوارەیەکیان هاوڕێکانم هەموو کۆبونەوە بۆ بینینی کاسێتەکە، کاسێتەکەمان خستە ناو ڤیدۆکەوە بە بێدەنگ دانیشتبوین، ئافرەتەکان دانە بە دانە دەهاتنە پێش کامێراکەوە تاوەکو چاومان کەوتە سەر ئافرەتێکی شۆخ و شەنگی بالابەرز، سەرەتا ڕوخساری دیار نەبوو ئەم ئافرەتە وردەوردە پۆشاکەکانی دادەکەند، هاوڕێکانم هەموو بە بەژن و باڵا جوانەکەی سەرسام ببون بە جۆرێك لە هەموو لایەکەوە دەنگیان بەرز دەکردەوە! پاشان خاوەن سالۆنەکە نزیکی کردەوە لە کامێراکە، بەڵام ئای چیم بینی!!! بینیم ئەو ئافرەتەی کە هەموو پێی سەرسام بوون خێزانی منە!... بەڵێ بینیم ئەوە خێزانمە لاشە جوانەکەی پیشانی هاوڕێکانم دەدەم، منیش چاوی شەرمەزاریم داگرت و هەر بەپەلە کاسێتەکەم لە ڤیدیۆکە دەرهێنا و شکاندم، کاسێتەکانی تریشم لە هاوڕێکانم وەرگرتەوە و شکاندمن، هاوڕێکانم پێیان وتم: باشە ئەی تۆ نەتوت خێزانەکەی خۆمم قەدەغە کردووە نەچێتە سالۆن، نەوەکو بەداوەکەوە بێت؟!! وتم: بەڵێ قەدەغەم کردبوو نەچێتە سالۆن، بەڵام نازانم چۆن ڕویداوە! بە بێزاری و پەستیەوە چومە ماڵەوە داوام لە خێزانەکەم کرد کە نکوڵی لێ نەکات و ئەوە وێنەکەیەتی بەڵام بۆم باسبکات سەرەڕای

ئەو هەموو ئاگادار کردنەوەم بۆی چۆن ڕێی کەوتۆتە ئەو سالۆنە، چۆن تەنها چووە ئەو سالۆنەی کە من تەها ئەوم لێ قەدەغە کردبوو؟!!! خێزانەکەم وتی: باوەڕ بکە نازانم چۆن بوو کە خوشکەکەم هات بۆ ماڵمان و داوای لێ کردم لەگەڵی بچمە ئەو سالۆنە و منیش نەمتوانی بڵێم نایەم و لەوێش هەر نەمزانی چۆن و بە چ مەبەستێك چومە ژوری ڕازاندنەوەی بوك (لە کاتێکدا هیچ پێویستم بەو خۆ ئارایشت دانە نەبوو) ئیتر دەتگوت عەقڵم لای خۆم نەماوە هەتا هاتینە ماڵەوە!!.

بەڵێ تازە کار لە کار ترازابوو، هاوڕێکانیشم کە دەیانزانی خێزانی منی تیایە ئەو کاسێتەیان زیاتر بڵاو دەکردەوە! ئەمەش بە سزایەکی خوایی دەزانم بۆ خۆم، چونکە پێشتر من ئابڕوی زۆر لە خەڵکیم لەکەدار کردبوو، هەر بۆیەش خوای گەورە ئابروی بردم، هەروەکو پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: (مَن تَتَبَّعَ عَورةَ أخيهِ المُسلِمِ يَتَتَبَّعَ الله عورتَهُ، وَمَن تَتَبَّعَ اللهُ عَورَته يُفضَحْهُ وَ لَو في جَوفِ بيتهِ) حديث صحيح رواهُ الترمذي.

واتە: هەر کەسێك خەریکی عەیب و و عاری برای موسڵمانی خۆی بێت، ئەوا خوای گەورە عیب و عاری ئەو هەڵدەداتەوە و ڕیسوای دەکات ئەگەر لە ناو ژوری خۆشیدا بێت!!

بەڵێ دەرسم وەرگرت و تەوبەم کرد و وازم لەو کارە و ڕەفیقە خراپەکانم هێنا و ئەم بەسەرهاتەم بڵاو کردەوە بۆ ئەوەی خەڵکی لە منەوە پەند وەربگرن!...

**پێنجەم:** هەر کەسێك لەبەر خاتری خوا و فەرموودەی پێغەمبەرﷺ واز لە دەمە قاڵێ و شەرەقسە بێنێ و لەگەڵ کەسانی نەسەلمێندا

ڕوبەڕوو نەبێتەوە و شەڕەقسە نەکات و کە زانی کەسەکەی بەرامبەری ملکەچی حەق نابێت وازبێنێ و قسە نەکات، ئەوە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە بەوەی کە لە ناوەڕاستی بەهەشتدا کۆشکێکی بۆ دروست دەکات، هەروەکو پێغەمبەری ئازیز و دڵسۆزمانﷺ فەرموویەتی:(أنا زَعيم بَيتٍ فِيْ رَبضِ الجَنَّةِ لِمَن تَرَكَ المراءَ وَ إن كانَ مُحِقّاً) حديث صحيح رواهُ إبنُ حبان.

**شەشەم:** کەسێك لەبەر خوا واز لە داوێن پیسی بێنێت و غەیری خوای گەورە هیچ شتێکی تر نەبێ کە ڕێگری بکات لە ئەنجامدانی ئەو زینایە، بەڵام شەرم لە خوای گەورە بکات و خۆی لێ دوور بخاتەوە، ئەوە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە بەوەی کە لە دنیادا خێزانی بەڕێز و داوێن پاکی بە دڵی خۆی بە حەڵاڵی پێ دەبەخشێ و پلە و پایەی بەرز دەکاتەوە و لە ڕۆژی قیامەتیشدا دەیخاتە ژێر سێبەری عەرشی خۆیەوە، وکو حەزرەتی یوسف -علیه السلام- لە کاتێکدا خێزانی پاشای میصر کە جوانترین ئافرەتی ئەو سەردەمە بوو، داوای لێ کرد کە دەستی خراپە کاری لەگەڵ تێکەڵ بکات، بەڵام حەزرەتی یوسف لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم هەموو داواکاریانەی لەگەڵدا بوو بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە خراپە بەڵام تەنها و تەنها لە ترسی خوا پشتی تێکرد و ئەو کارە بەدرەوشتیەی نەکرد، تەماشاکەن حەزرەتی یوسف:

١. لە تەمەنێکدایە کە هەرەتی لاوێتیەتی و لەو تەمەنەدا ئارەزوی گەنج بۆ ئافرەت لە چڵەپۆپەدایە.

٢. حەزرەتی یوسف لەو کاتەدا خێزانی حەڵاڵی خۆی نەبوو، تا ئارەزوی خۆی پێ بشکێنێ، بەڵکو کەسێکی بێ ژن بوو.

٣. حەزرەتی یوسف غەریب بوو، خەڵکی ئەو وڵاتە نەبوو،ئەوەش سەلماوە کە مرۆڤی غەریب کەمتر خۆی لە خراپە دەپارێزێ چونکە کەمتر شەرم دەکات وەکو ئەوەی کە لە وڵاتی خۆیدا بێ.

٤. حەزرەتی یوسف لەو کاتەدا کۆیلە بوو دیارە کۆیلەش وەکو ئازاد شتی لێ ناگیرێ.

٥. ژنی عەزیزی میصر لە جوانترین ئافرەتی سەردەمی خۆی بوو.

٦. ژنەکە خاوەنی پلە و پایەی بەرز و ناو کۆشك بوو، وە جوانترین سیمای هەبوو.

٧. ژنەکە خۆی داوای لە حەزرەتی یوسف کردبوو کە ئەو کارەی لەگەڵ بکات، وە هەموو شتێکی پێویستی بۆ ئەو کارە ئامادە کردبوو.

٨. هیچ کەس لەماڵەکەدا نەبوو تا لێی بترسن.

٩. هەموو دەرگاکان یەك بەدوای یەکدا داخرابوون و دڵنیا بوون لەوەی کەس نایانبینێ.

١٠. ئافرەتەکە هەڕەشەشی لێ کردبوو، کە ئەگەر ئەوەی داوای لێ دەکات ئەنجامی نەدات، ئەوا توشی سزای توندی دەکات و ئابڕوی دەبات و دەیخاتە بەندیخانەوە و لەو ژیانە خۆش و بێکەم و کوڕیە بێبەشی دەکات.

بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو داواکاریەدا حەزرەتی یوسف تەنها لە ترسی خوا و شەرم کردن لە خوا بە نەخێر وەڵامی دایەوە و فەرمووی: بەندیخانە و ژیانی کولە مەرگیم پێ خۆشترە لەوەی کە لە کۆشکدا بژیم و خۆشترین خۆراك و پۆشاکم هەبێ بەڵام خوای گەورەم لێ بڕەنجێ، سەرەنجامەکەشی ئاشکرایە کە خوای گەورە پاداشتی دایەوە بەوەی کە زۆر باشتری پێ بەخشی کە ئەو لەبەر خوا وازی لێ هێنابوو، بە حەڵاڵی بوو بە خاوەنی هاوسەر و بوو بە پاشا و نەك خزمەتکاری لە کۆشکا بێ، بەڵکو بە وەزیری و پاشایەتی لە کۆشکا دەژیا! وە خێزانەکەی عەزیزی میصر لە کۆتایدا دانی نا بە تاوانی خۆی و پاکی یوسفدا و وەکو خزمەتکارێك لە خزمەت یوسفدا دەژیا هەموو جارێ دەیگوت: (سُبحان مَن صَیَّرَ المُلُوكَ بِذُلِّ المعصیَّة عَبیدا ، وَجَعَلَ المَمالیكَ بعِزِّ الطاعَةِ مُلوكاً)

ئیمانداران: وە ئەگەر تەماشای ژیانی پێغەمبەری سەروەرمانﷺ بکەین بۆمان دەردەکەوێ کەچۆن کاتێك کافرەکان پێشنیاریان خستە بەردەمی و پێیان وت: بەمەرجێ واز لە ئیسلام و بانگەواز بۆ لای خوای تاك و تەنها بێنی، جوانترین کچی پێشکەش دەکەین، هەرچی داوا بکات

لە سەروەت و سامان بۆی دابین دەکەین، لەپلەو پایەدا دەیکەین بە گەورەی خۆمان و بەبێ قسەی ئەو هیچ کارێك ناکەین، بەلام پێغەمبەری خوا ﷺ هەموو پێشنیارەکانی ڕەت کردەوە و فەرمووی: بۆ یەك چاوتروکانێکیش واز لەم بانگەوازە ناهێنم خوای گەورە پاداشتی دایەوە بەزۆر زۆر باشتر کە لەبەر خوا ڕەتی کردنەوە، هەر لە دنیادا ئەمە بێجگە لە پلەی هەرە بەرزی خاتَم الأنبیاء و المرسلین و پلەی بەرزی وەسیلە لە بەهەشتدا، هەر لە دنیادا خوای گەورە پاداشتی دایەوە بەوەی کە پاکترین و چاکترین ئافرەتان بونە هاوسەری کە دایکی ئیماندارانن، وە هەموو خەزێنەی دونیا کەوتە بەر دەستی، وە هەتا قیامەت و کۆتایی حەشر و حیساب و لە بەهەشتی نەبڕاوەشدا ناوی پلە و پایەی گەورەی هەموو ناو خاوەن پلەکانە!!.. هەزاران هەزار صەلات و سەلام لەسەر ڕۆحی پیرۆزی بێ.

ئیماندارانی بەڕێز: با بڕیار بدەین کە هەر شتێك خوا و پێغەمبەرەکەی نەهێیان لێ کردووە خۆمانی لێ بپارێزین و لەبەر خاتری خوا نەیکەین، دڵنیا بین لەوەی کە خوای گەورە بە حەلاڵی زۆرباشتر و چاکترمان پێ دەبەخشێ، لە قیامەتیشدا بەشی چاك و خۆشبەختی بۆ ئەو کەسانەیە کە ئەم چەند ڕۆژ و ساڵە کورتەی ژیانی دونیا نەیخەڵەتاندون و قیامەتی نەبڕاوەیان بە قوربانی دونیای فانی نەکردووە، چونکە ڕۆژێك دادێ کە خەڵکی لە یەکتری جیا دەکرێنەوە، وەکو خوایگەورە دەفەرموێ: ﴿وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَتَفَرَّقُونَ ۝ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمۡ فِي رَوۡضَةٖ يُحۡبَرُونَ ۝ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ﴾ الروم:(١٤-١٦)...

واتە: ئەو ڕۆژەی قیامەت بەرپا دەبێت، لەو ڕۆژەدا ئەو خەڵکە لە یەك دادەبڕێن و دەبنە دوو دەستەوە: جا ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە، ئەوانە لە باخچە و باخاتی بەهەشتدا بە ژیانی پڕ لە کامەرانی و بەختەوەری و ئاسودەی شاد دەکرێن، ئەوانەش بێ بڕوا بوون، کاتی خۆی بەڵگە و نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ دەزانی و بڕوایان بە گەیشتنی قیامەت و زیندوو بونەوە نەبوو، ئەوانە ئامادەن لە ناو سزایەکی سەخت و دۆزەخێکی پڕ لە ئەشکەنجە و ئازاردا...

داواکارم لە خوای گەورە و بە ناوە جوانەکانی لێی دەپاڕێمەوە کە ئیمانمان دامەزراو بکات و هەموو هەنگاو و هەڵوێست و گوفتارێکمان بەو شێوەیە بێ کە خوای گەورە پێی ڕازیە.

اَللّهمَّ امح عَنْ قُلوبنا كل ذكر إلا ذكركَ، وَ كل حُبٍّ إلا حُبُكَ، وَ كل ودٍّ إلا ودَّكَ، و كُل رَجاء إلا لَك، وكل خَوف إلا منكَ، وكل رغْبَة إلا إلَيكَ وكل رَهبة إلا لَكَ، وكل سؤالٍ إلا منكَ،... أَللّهمَّ ارحَمنا برَحمَتكَ وَ أمنامن عذابكَ يا رَبَّ العالَمينَ...

سەرچاوەکان:

١. قورئانی پیرۆز

٢. تەفسیری ئاسان –بورهان محمد امین

٣. رَوْضَةُ المُتَّقِين في مَجالِسِ الصالِحينَ– محمد عبدالعاطي بحيري ج٢ ص٣

٤. سێ کورتە چیرۆك –نامیلکە– فەرمان نەجار ل٩.

# وتـاری دووەم بۆ مانگی جماد الثانی

## (( رێبازی بەهەشت و دۆزەخ ))

الحَمدُ للّهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعين.

**ئیمانداران و خواناسان: لەم وتارەدا بە پشتیوانی خوای گەورە دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز و چارەنوسی ڕاستەقینەی هەموو مرۆڤێك لە ڕوانگەی چەند ئایەتێکەوە وەردەگرین، کە بریتیە لە ڕێگای بەختەوەری و بەدبەختی، ڕێگای خۆشی و حەسانەوەی هەتا هەتایی یان بەدبەختی و تیاچونی هەتا هەتایی، یان ڕونتر بڵێین: ئایا ڕێبازی بەهەشت و دۆزەخ کامەیە؟! خوای گەورە دەفەرموێ:** ﴿فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ۝ يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ۝ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ۝ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ۝ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ۝ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ۝ وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ۝ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ﴾ النازعات:٣٤-٤١

**واتە: جا کاتێك بەڵا گەورەکە پێش هات، کە تەنگانە سامناکەکە ڕویدا-کە مەبەست ڕۆژی قیامەتە، ئەو ڕۆژە ئادەمیزاد دێتەوە یادی کە چی کردووە و چی ئەنجام داوە، دۆزەخ نیشان دەدرێت و دەردەخرێت بۆ هەر کەسێ کە بیبینێت، جا ئەوەی خوانەناس و یاخی و لەسنور دەرچوبێت و ژیانی دونیای زیاتر لە قیامەت مەبەست بوبێت، ئەوە بێگومان ئەو دۆزەخە جێگەی مانەوە و حەوانەوەیەتی، بەڵام ئەوەی لە پایە و شکۆی پەروەردگار ترسابێت و حیسابی بۆ کردبێت و جڵەوی**

نەفسی گرتبێتەوە لە هەموو هەوا و هەوەس و ئارەزوویەکی نادروست، بێگومان هەر بەهەشت جێگەی مانەوە و حەوانەوە و گوزەرانیەتی.

بەڕێزان:با هەر یەك لە ئێمە خۆی بخاتە ژێر تیشکی ئەم ئایەتە قورئانیە و سەیری خۆمان بکەین بزانین لە کام دەستەیەین، ئایا لە تاقمی دۆزەخی، یا لە تاقم و دەستەی بەهەشتین، زۆر ئاسانە دەتوانی ئێستا دیاری بکەی، ئەویش بەوەی سەیری ژیانی ڕابردووی خۆت بکە تا ئێستا دڵ و دەرونت سەرکەش و لەخۆباییە،ئایا قیامەتت بەقوربانی دونیا کردووە؟! ئەگەر وابووی فریای خۆت بکەوە و خێرا تەوبە بکە ئەگینا لە دۆزەخیان دەبی ﴿فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ وە ئەگەر لە ژیانیشتا بەردەوام ترسی خوا لە دڵ و دەرونتا بوو، ئەوەی نەفسی خراپە ویست داوای لێ دەکردی و دەهاتە بەردەستت و بۆت ئەنجام دەدرا بەڵام لەبەر ئەمری خوا نەتکرد، ئەوا شوکری خوا بکە و بەردەوام بەو موژدەت لێ بێ بەهەشتی خوا جێگاتە ﴿فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾..

بەڕێزان: بەسەرهاتێکی خۆش هەیە لە گەلێك لە کتێبی بەسەرهاتی پیاوچاکان و زانایان باس کراوە و دەڵێ: هارونە ڕەشید لەگەڵ خێزانەکەی کە ناوی (زوبەیدە)بوو، دانیشتبوو لە کاتی گفتوگۆ و قسە و باسی نێوانیاندا و باسی پیاوچاکی و دادگەری، هارونە ڕەشید خۆی بە کەسێکی باش دەزانی و دەیگوت بە پێی توانا خزمەتی میللەت و وڵاتم کردووە، خێزانەکەشی پێی وت: کە بەو شێوەیە من نابینم و ئەگەر ئاوا کاربکەی و لەسەر ئەو حاڵەتە بمری ئەوە خوا دەتخاتە دۆزەخەوە! هارونە ڕەشید تورە بوو سەرەنجام تەڵاقی خوارد کە دەچێتە بەهەشت و بەم شێوەیە ئەم هەڵەیە بەدەمیا هات و ئەمجا پەشیمان بۆوە و لەبارەی

تەڵاقەکەوە پرسی بە زانایان و شەرع زانان کرد، کەسیان نەیانتوانی وەڵامێکی دڵ ئارامکەری بدەنەوە، تا سەرەنجام چووە خزمەتی ئیمامی شافعی و باسەکەی بۆ گێڕایەوە،ئیمامی شافعی فەرمووی: من پرسیارێکت لێ دەکەم: ئایا لە ژیانی خۆتدا، لە ژیانی فەرمان ڕەواییتدا قەت بووە کارێکی ناشەرعی و حەرام هاتبێتە بەردەستت و هیچ ڕێگرێك نەبوبێ لەبەردەمتدا تەنها و تەنها لەبەر شەرم کردن لە خوا ئەنجامت نەدابێ؟! هارونە ڕەشید وتی: بەڵێ چەند جار ئەمە ڕوی داوە، ئیمامی شافعی فەرمووی: دەی من لەسەر ئەو وەڵامەی تۆ دەڵێم: تەڵاقەکەت نەکەوتووە، زانایان چوونە خزمەت ئیمامی شافعی و عەرزیان کرد ئایا بە چ بەڵگەیەك ئەو بڕیارەت دەرکرد؟! فەرمووی: لەسەر ئەو ئایەتە قورئانیەی کە دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ۝ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ النازعات:٤٠-٤١

هەزاران ڕەحمەت لە پێشەوامان شافعی کە بە ڕاستی زۆر بە جوانی لە قورئان تێگەیشتبوو وە حوکمە شەرعیەکانی لێ وەرگرت.

ئیمانداران: دەچینە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ کە دەفەرموێ: (لَمّا خَلَقَ اللهُ الجَنَّةَ و النّارَ أرسَلَ جبريل إلى الجَنَّة، فَقال: أنْظُرْ إلَيها وَ إلى ما أعْدَدْتُ لأهلها فيها) واتە: کاتێ خوای گەورە بەهەشت و دۆزەخی دروست کرد، جوبرەئیلی نارد بۆ بەهەشت و پێی فەرموو: تەماشای بەهەشت و هەموو ئەو خۆشیەی کە تیایەتی و ئامادەم کردووە بۆ ئەهلی بەهەشت بکە، (فَجاءَ فَنَظَرَ إلَيها وَ إلى ما أعَدَ اللهُ لأهلها فيها) جوبرەئیل چوو تەماشای بەهەشت و ئەوەی تیایەتی لەوەی کە خوای گەورە بۆ ئەهلی بەهەشتی ئامادە کردووە، تەماشای کرد. (فَرَجَعَ إلَيه

ق ــ وعزَّتك لايَسمع بها أحدُ إلا دخَلَها) جوبرەئیل گەڕایەوە بۆ خزمەت خوای گەورە و فەرمووی: سوێند بە گەورەیی تۆ ئەی خوای گەورە هیچ کەسێك نیە کە باسی ئەم بەهەشت و خۆشیەکەی ببیستێ ئەوا ئەوەندە کاری بۆ دەکات کە هەر دەبی بچێتە ناویەوە. (فَأمر فَحُفَّت بالمكاره) پاشان خوای گەورە فەرمانی کرد کە دەوری بەهەشت بدرێ بە نارەحەتی و هەموو ئەو ئازارانەی کە دێنە سەر ڕێگای ئەهلی بەهەشت. ئەمجا خوای گەورە فەرمووی: ئەی جوبریل ئێستا بڕۆرەوە سەیری بەهەشت بکە. کاتی جوبرەئیل چوو سەیری بەهەشتی کرد و بینی وا دەوری دراوە بەو هەموو نارەحەتی و سەختی و ئازارانە کە دێنە سەر ڕێگای ئەهلی بەهەشت، گەڕایەوە بۆ خزمەت پەروەردگار و فەرمووی: وعزَّتكَ لَقد خفتُ أن لا يَدخُلَها أحَدُ) سوێند بە گەورەیی تۆ ئەی پەروەردگار بەراستی دەترسم کە کەس نەچێتە بەهەشتەوە چونکە ئەوەندە دڕك و داڵ و ئازار و نارەحەتی لەسەر ڕێگای بەهەشتدا هەیە پاڵەوانی خۆراگر و مەردی مەیدانی دەوێ کە زاڵ بێت بەسەریاندا و کۆڵ نەدات و بەردەوام بی تا دەگاتە بەهەشت. .پاشان خوای گەورە فەرمووی: ئەی جوبریل (إذهب إلى النار، فَانْظُرْ إليها وما أعدَدْتُ لأهلها فيها) ئەی جوبریل بڕۆ بۆ لای دۆزەخ و تەماشای ئاگری دۆزەخ و تەماشای ئەو هەموو سوتاندن و ئەشکەنجە و ئازارە و خواردن و خواردنەوە بۆگەن و ناخۆشە بکە کە بۆ ئەهلی ئاگرم ئامادە کردووە لەناو دۆزەخدا، حەزرەتی جوبریل ڕۆشت و سەیری دۆزەخ و نارەحەتیەکانی و ئەشکەنجە و ئازارەکانی کرد. (فَإذا هي يَرْكَبُ بَعضُها بعضاً) تەماشای کرد دۆزەخ وا هەندێکی هەندێکی تری تێك دەشکێنی و

شەپۆلەکانی ئاگر یەکتری دەخۆنەوە!! جوبریل ئەمەی بینی گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگار وفەرمووی: (وَعِزَّتِكَ لايَسمَعُ بِها أحَدُ فَيَدخُلَها) ئەی خوای گەورە سوێند بە عیزەت و گەورەییت، هەر کەسێ هەر ناوی ئەم جەهەنمە ببیستێ، کارێك ناکات کە بچێتە ناوی. ئەمجا خوای گەورە فەرمانی کرد (فَحُفَّتْ بالشَّهَوات) بە ئارەزوەکان و شەهەوات دەورە درا، لە هەموو لایەکەوە ڕازێنرابۆوە بە لەزەت و خۆشی حەرام و هەمووشی وەکو قولاپ وابوو، هەرچی بیگرتایە دەیخستە دۆزەخەوە!! جوبریل کە ئەمەی بینی عەرزی خوای گەورەی کرد و فەرمووی: (وَعِزَّتِكَ لَقَد خَشيتُ أنْ لايَنجو مِنها أحَدُ إلا دَخَلَها) سوێند بە عیزەت و گەورەیی و دەسەڵاتت، بەراستی ئێستا کە بینیم وا دۆزەخ بەو هەموو ئارەزوو و شەهەوات و تەماع و خۆشیە حەرامانە دەورە دراوە و مرۆڤیش مەگەر خوا ڕەحمی پێ بکات و خۆگربێ ئەگینا دەکەوێتە داوی ئەو حەرامە ڕازێنراوانە ئێستا ترسی ئەوەم هەیە کە هیچ کەس ڕزگاری نەبێ لە ئاگری دۆزەخ و بۆ جارێکیش بێ هەر بچێتە ناوی!)..ئەم فەرمودەیە رواهُ أبو داود و النَّسائي و الترمذي وقال: حَديث حَسَن صحيح.

ئیمانداران: ئەم ئیسلامە پاك و بێگەردەی ئێمە هەر شتێك باس بکات و مرۆڤی لێ ئاگادار بکات ئەو باس و بابەتە نەك هەر بۆ قیامەتە، بەڵکو بۆ دونیاشە، چونکە ئیسلام دینی دونیا و قیامەتە، لەم باسەدا سەرنج بدەن و بیر بکەنەوە: ترسان و شەرم کردن لە خوا و هەڵبژاردنی ژیانی نەبڕاوە و خۆشیە لە کۆتایی نەهاتوەکانی بەسەر دونیایەکی کاتی و خۆشیە چرکە ساتەکانی،یەکسانە بە بەدەست هێنانی بەهەشتی خوا، وە دەرچوون لە سنوری شەرع و بەگوێ کردنی هەوا و نەفس و

ئارەزووی حەرام و شەرم نەکردن لە خوای پەروەردگار و هەڵبژاردنی ژیانی کورت و لەزەتی چەند چرکەیی ئەم دونیایە بەسەر ژیانی هەمیشەیی قیامەتدا و هەڵگرتنی دروشمی (نان ئەو نانە ئەمڕۆ لە خوانە) (حازر بەقەرز مەدە)،یەکسانە بە چوونە ناو دۆزەخ جا ئەم یاسا و رێسا و هاوکێشەیە بۆ ژیانی دونیاش هەر وایە ، هەر کاتێ هاوکێشەی یەکەم لە ژیانی مرۆڤەکاندا جێبەجێ کرا، ئەوە بەبێ گومان دونیا دەبێت بە بەهەشتێکی بچکۆلانەو موسڵمان هەر لە دونیادا لە بەهەشتایە و بە مردن دەچێ بۆ بەهەشتە نەبڕاوەکەی قیامەت، وە جێبەجێ کردنی هاوکێشەی دووەم لە ژیانی دونیا و ناو مرۆڤەکاندا، بە بێ گومان ژیانی دونیا دەبێتە دۆزەخێکی بچکۆلانە و خەڵکی ئەگەر چی لاشەشیان لە ئاگردا نەبێ، بەڵام ڕۆح و ویژدانیان و ناخ و دڵ و دەرونیان لە ئاگردایە و وەکو شەپۆلە ئاگرەکانی ناو دۆزەخ دێن بە ناو یەکتریدا و ماڵی یەکتری کاول دەکەن و خوێنی یەکتری دەڕێژن و ژیان لە یەکتری دەکەن بە دۆزەخ و بە مردنیش دەگوازرێنەوە بۆ دۆزەخی هەمیشەیی.

با زیاتر باسەکەمان ڕوون بکەینەوە: بۆ نمونە لەسەر ئاستی سیاسەت و ئابوری و خێزاندا ئەگەر کاربەدەست لە ترسی خوا و لێپرسینەوەی قیامەت و سزای دۆزەخ غەش و خیانەتی لە سیاسەتی میللەت و ئەخلاقی ڕەسەنی میللەت و ماڵ و سامان و دارایی میللەت نەکرد و لەجیاتی خۆ بەگەورە زانین و تەکەبور لێدان بەسەر هاوڵاتیاندا، ملکەچ و متەوازیع بوو وەکو هەر هاوڵاتیەك لەبەردەم شەرع و یاسادا،... گەنج داوێنپیسی نەکرد و فرۆشیار فڕوفێڵی لە کڕیار نەکرد، ئەوەی نیەتی خراپەی بەدڵدا هات و لە ترسی خوا و شەرمی مەیدانی مەحشەر

و لێپرسینەوەی بەردەم خوا، دەستی گێڕایەوە و خراپەی نەکرد هەرچەند کەسیش چاوی لێی نەبوو، هەرچەندە کامێرای سەر زەوی نەیبینی بەڵام دڵنیا بوو که کامێرای ئاسمان لێی غافڵ نیە، بۆیە لە ناخەوە هاواری کرد (إني أخاف الله) وە وازی لە خراپەکە هێنا، پیاو لەبەر فەرمانی شەرعی خوا بێحورمەتی لەگەڵ خێزانەکەی نەکرد.. ژن لەبەر فەرمانی خوا گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی بوو، ڕۆڵە گوێڕایەڵ و خزمەتکاری دایك و باوکی بوو، خاوەن پیشە دەیتوانی لەپڕێکدا خۆی بکات بە کوڕێك بە حەرام خۆری و غەش و تەزویر، بەڵام نەیکرد و قەناعەتی بە حەڵاڵەکەی خۆی کرد، ئایا دونیای ئاوا و وڵاتی ئاوا و خێزانی بەو شێوەیە ژیانیان نابێتە بەهەشت؟! بێگومان بەڵێ.

بەڵام ئەگەر بە پێچەوانەوە بوو: کاربەدەست وایزانی ژیان تەنها ئەم چەند ساڵەی دونیایە و پەلەی دەکرد کە خێراتر خۆی دەوڵەمەند بکات و فریا بکەوێ ئەم چەند ساڵەی ژیانی دونیای بە خۆشترین شێوە بەسەر بەرێت، ئیتر خۆی تێر بێ میللەت کەیفی خۆیەتی و واجیبیانە خزمەتی بکەن و ئەو هەموو خەبات و ماندووبوونەی بۆ ئەوەیە کە پاداشتی خۆی وەربگرێ و بە خۆشی بژی، چونکە خۆ دوای مردن ژیانێك نییە کە پاداشتی ئەمی تیا بدرێتەوە!!.. دەوڵەمەند ئەوماڵەی لەژێر دەستیدایە و لەناو قاصە و ماڵیدایە بە هی خوای نەزانی و تەکەبوری لێدا، فرۆشیار تەماحی چڵێسی خۆی بە فێڵ و دەستبڕینی کڕیار تێر کرد، ژن و مێرد یەکتریان بەقوربانی ئارەزووەکانی ناشەرعی دونیایی کرد! ڕۆڵە پێی عەیب بوو بڵێ ئەو پیاوە دەست قڵیشاوە پشت چەماوەی سوتاوی بەرسوری هەتاوە باوکی خۆشەویستمە و ئەو ئافرەتە بەساڵاچووە پرچ

سپیە خاوەن حەیا و حیشمەتە دەم بە زیکر و تەهلیلەیە دایکی بەسۆزمە، بەڵکو گاڵتەی بە عەقڵ و بۆچون و ڕێنماییەکان و عیبادەت و خواناسیان دەکرد و بە کۆنەپەرستیان دەزانی! خاوەن پیشە چاوەڕێی هەلێك بوو کە ئیشەکەی خۆی پێکبێنێ و پارەی خۆی وەربگرێ و بڕوات، ئایا ئەو دونیایە و ئەو وڵاتە و ئەو خێزانە، هەر بۆخۆی ژیان تێیدا دۆزەخ نییە؟! بێگومان بەڵێ.

وەلەسەر ئاستی ژیانی تاکە کەسیشدا: هەر کەسێك خۆشەویستی خوا و بڕوابوون بە قیامەت لە خراپە بیگێڕێتەوە، خوای گەورە ژیانی دونیای بۆ دەکاتە بەهەشت، بەهەشتی دڵ و دەرون،بەهەشتی ئاسودەبوون، وە ئەوەش کە لەبەر خاتری فەرمانی خوا وازی لێ هێناوە بە حەڵاڵی دەستی دەکەوێت، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إنَّك لَن تَدَعْ شَيئاً للّهِ عَزَّ وجَلَّ إلا أبْدَلَكَ اللّهُ بهِ ما هُوَ خَيرُ لَكَ مِنهُ) حديث صحيح رواهُ احمد.

لە قیامەتیشدا: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ۝ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾.

بەڵام هەرکەسێك ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ۝ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ۝ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾ لە دونیاشدا خوای گەورە ژیانی لێ دەکات بە دۆزەخ، ژیانیش پڕیەتی لە نمونەی واقعی کە ئەم حەقیقەتە قورئانیە بێگومانەمان لەسەر شانۆی ژیان نیشان دەدەن.

فەرموون با هەموومان گوێ بۆ ئەم بەسەر هاتە ڕاستەقینەیەی ئەم سەردەمە بگرین و پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرین: ئەو کەسەی کە ئەم بەسەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە ئافرەتێکە و بەم شێوەیە باسی

ڕوداوەکەمان بۆ دەکات و دەڵێت: من ئافرەتێك بووم، کوڕێك و کچێکم هەبوو، هاوسەرەکەشم بەڕێوبەرێکی دائیرەیەك بوو، هەر بۆیە باری ئابوریمان زۆر باش بوو، بەڵام من لەجیاتی شوکری خوا لەخۆم بایی بووم و خۆم بە گەورە دەزانی و خزمەتکارم گرتبوو بۆ خزمەتی ماڵ و منداڵەکانم، جا لەبەر ئەوەی هاوسەرەکەم پیاوێکی دڵ ڕەق و توڕە و توند بوو، هەر خزمەتکارێکمان بهێنایە دوو مانگ زیاتر لەژێر سوکایەتی و بەچاوی سوك سەیر کردنی ئێمەدا خۆی پێ نەدەگیرا و دەڕۆشت، تا ڕۆژێکیان کابرایەك کچێکی خۆی هێنا بۆ ماڵمان بۆ ئەوەی بیکەین بە خزمەتکاری خۆمان و مانگانە پارە بدەین بە باوکی، کاتێ باوکەکە کچە تەمەن کەمەکەی بەجێهێشت،کچەکە جلوبەرگی باوکەکەی گرتبوو لێی دەپاڕایەوە کە بەجێی نەهێڵێ،باوکیشی بە چاوی فرمێسکاویەوە جگەرگۆشەکەی خۆی بەجێ هێشت بۆ ئەوەی مانگانە هەندێك پارەیان بۆ پەیدا بکات!... بەڵێ ئەو کچە ژیانی پڕ نەهامەتی لە لای ئێمە دەستی پێ کرد، بەیانیان زوو هەڵدەسا تاوەکو یارمەتیم بدات بۆ ئامادە کردنی خواردن، پاشان جانتای کوڕ و کچەکەمی هەڵدەگرت و دەچوو لەسەر جادە چاوەڕوانی پاسی قوتابخانەی دەکرد تاوەکو دەهات، ئینجا منداڵەکانمی بەڕێ دەکرد و دەگەڕایەوە ماڵ و دەستی دەکرد بە کارکردنی ناوماڵ تاکو نیوەشەو، لەبەر ماندویی و بێ هێزی لاشەی وەکو مردوو دەردەکەوت و خەوی لێ دەکەوت، ئەگەر شتێکی لەدەست بشکایە یان بچوکترین هەڵەی بکردایە، هاوسەرەکەم بە توندترین شێوە سزای دەدا ئەویش هیچ وەڵامێکی بۆ نەدەمایەوە جگە لە گریان، لەگەڵ ئەوەشدا بەڕاستی کچێکی زۆر دڵسۆز و پاکوخاوێن و دەستپاك بوو، بە

هەموو خواردن و جلوبەرگێك مەمنون بوو، لە ئازاردانی خزمەتکارەکەمان منیش بەشدار بووم و ڕێگام نیشانی پیاوەکەم دەدا، وە ئەگەر جاروبار دڵسۆزیەکیم بە بیر دەهاتەوە بە هاوسەرەکەم دەوت: ئازاری مەدە و درێخی ناکات. کەچی هاوسەرەکەم دەیوت: نا ئافرەت تۆ نازانی ئەم هەژار و خزمەتکارانە هەر بۆ لێدان باشن، ئەوەهەژار و دەستکورتن بۆیە ئاوان خۆ ئەگەر بیانبیٚ لە هەموو کەس خراپترن!...

بەڵێ ئەو کچە خزمەتکارە بەردەوام ئارامی دەگرت لەسەر ئەو هەموو سوکایەتیەی کە پێمان دەکرد، چونکە هیچ ڕێگای ڕونی شك نەدەبرد، کە جەژنیش دەهات منداڵەکانم دەچونە دەرەوە و یارییان دەکرد کەچی ئەو داماوە هەر خەریکی کارکردن و خاوێنکردنەوەی ناوماڵ و جلشۆرین بوو، باوکیشی تەنها ئەو کاتانە چاوی پێ دەکەوت کە سەری مانگ دەهات و پارەکەی وەردەگرت، لەو کاتەوەش کە هاتە ماڵی ئێمە تەنها سێ جار چاوی بە دایك و براکانی کەوت:

جاری یەکەم: کاتێ کە برایەکی وەفاتی کرد. جاری دووەم: کاتێ نەخۆشیەکی توندی گرت ئێمەش لە ترسی ئەوەی لێی نەگرینەوە ناردمانەوە بۆ ماڵی باوکی تاکو چاك بۆوە. جاری سێیەم: کاتێك باوکی وەفاتی کرد!..

بەڵێ، هاوسەرەکەم کە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، ئەو دەوڵەمەندییە چونکە خواناسی لەگەڵ نەبوو، ئەوەندەی تر دڵرەقی کردبوو، خۆی بە فیل دەبینی و خەڵکی بە مێروله، بە تایبەتی زۆر ڕقی لە فەقیر و هەژار و بێکەس بوو، زۆرجار ڕقی دەرەوەی ماڵی دەهێنایەوە بۆماڵەوە و بەو کچە بەسەزمانەی دەڕشت و لێ دەدا و سزای دەدا، تا جۆری سزادانەکەی بۆ سەختتر کرد ئەویش بەوەی کە بە کارەبا سزای دەدا و پاشان پێی پێدەکەنی!!...

وە زۆرجار ئێواران هیچمان نەدەدایە بیخوات و بە برسیەتی دەخەوت!...بەڵام چونکە پاش وەفاتی باوکی دایك و براکانی ئەوەندەی تر دەستکورت و هەژار کەوتن و هیچ خزم و کەس و کارێکیشیان خۆی تێنەدەگەیاندن و سەردانی نەدەکردن، ئەم کچە بەم هەموو سزایە ڕازیی بوو، وە ئاسۆی ڕزگاربونی شك نەدەبرد لەم دۆزەخە!!.بەڵێ وردە وردە منداڵەکانم گەورە بوون، کوڕەکەشم هاوکاری باوکی دەکرد لە سزادانیدا و بەتوندی کچەکەی دەبەستەوە تا باوکی کارەبای لێ بدات و پاشان کە ئەو هاواری دەکرد ئەمان پێی پێدەکەنین.

پاش ماوەیەك دەمانبینی شتی لەدەست بەردەبێتەوە و لە ڕۆشتندا ساتمە دەکات و دەکەوێ جا بۆیە بردمانە لای پزیشك و پزیشکی چاو پێی وتین: چاوی زۆر زۆر بێهێز بووە، بە جۆرێك بەردەم پێی خۆی نابینێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هیچ بەزەییمان پێیدا نەدەهاتەوە وەکو جاران دەبوایە بەو چاوە کزانەوە هەموو ئیشی ماڵەکەی بکردایە، ئەم خزمەتکارە بەسەزمانە دوای ئەوەی بە تەواوەتی چاوەکانی لە کزی داو بەحاڵ بەرپێی خۆی دەبینی، ڕۆژێکیان لە ماڵ چوبووە دەرەوە ئیتر نەگەڕایەوە، ئێمەش چونکە ئیشمان پێی نەمابوو گوێمان پێ نەدا و بەشوێنیدا نەگەڕاین.

بەڵێ بەڕێزان: ساڵ هات و ڕۆیی و پێشینان فەرمویانە: ڕۆژان ڕۆژی لەدوایە، پیاوەکەم دەسەڵاتی نەماو خانە نشین بوو، کوڕەکەشم زانکۆی تەواو کرد و ژنمان بۆ هێناو زۆر دڵخۆش بووین، وە کاتێك بوکەکەمان سکی بەرز بۆوە و حامیلە بوو زیاتر دڵخۆش بووین، ئەوە بوو چاوەڕێمان دەکرد کە منداڵەکەی ببێت، جا کاتێك منداڵەکەی بوو بۆمان دەرکەوت چاوی کوێرە و نابینێت!! بەڕاستی ناخۆش بوو، بەجۆرێك هەموو خۆشیەکانمان لێ بوو بە ناخۆشی، بە پەلە منداڵەکەمان گەیاندە لای پزیشکی پسپۆڕی چاو، بەڵام دوای هەوڵێکی زۆر و لیژنەی پزیشکی هەواڵیان پێداین کە بە هیچ جۆرێك

چاوی چاك نابێتەوە و منداڵێکی نابینایە!!.. ئیتر هیچمان بۆ نەمایەوە تەنها یاری بوون نەبێت.. بۆیە خێزانی کوڕەکەم لەترسی ئەوەی ئەو حاڵەتە دوبارە نەبێتەوە بڕیاری دا، نەهێڵێ سکی تر بکات، بەڵام پزیشکەکان هانیاندا کە مەنعی منداڵبوون نەکات و منداڵی دووەمی نابینا نابێت، چونکە لە بنەماڵەکەماندا هەم هی کوڕەکەمان هەم بنەماڵەی بوکەکەمان کەسی نابینای تیا نەبوو!

بەڵی، بۆ جاری دووەم بوکەکەمان حامیلە بوو، منداڵی دووەمیشی بوو، زۆر جوان بوو، دوکتۆرەکان موژدەیان پێداین کە چاوی ساغە و دەبینێت، زۆر دڵخۆش و شادمان بوین، بەڵام دوای حەوت مانگ تێبینیمان کرد بۆ یەك لا دەڕوانێت، ئێمەش بەپەلە گەیاندمانە چاکترین دکتۆری پسپۆڕ لە چاودا، دوای پشکنینی وردی چاوی دکتۆرەکە وتی: چاوی تەواو نیە، تەنها کەمێك ڕوناکی بەرەو لایەك دەبینێت، لەوانەشە دوای چەند مانگێکی تر بەتەواوی کوێر بێت، پیاوەکەم (باوەگەورەی منداڵەکان) کە ئەوەی بیست لە ناخەوە ڕوخا و توشی نەخۆشی دەرونی بوو (چونکە ئەوانەی لە کاتی خۆشیدا شوکر و سوپاسی خوا ناکەن ئەو ماڵ و سامان و دەسەڵاتە بە هی خوا نازانن، ئەوا لە کاتی بەڵا و موصیبەت و هەواڵی ناخۆشیشدا ئارام ناگرن و تێك دەشکێن و ورەیان دەروخێ، چونکە دیسان بڕوایان بە پاداشتی خوای گەورە نییە)...

بەڵی هاوسەرەکەم لە هەموو شتێك بێزار بوو، پزیشك پێی وتین بیبەنە نەخۆشخانەی دەرونی تاکو چارەسەری بکەن، منیش زۆر دڵتەنگ بووم و نەمدەزانی چی بکەم دەتگوت خەو دەبینم!! چۆن ژیانمان لەو

هەموو خۆشییەوە ئاوا گۆڕا بۆ خەم و مەراق و خەفەت خواردن و تێکچوونی شیرازەی ژیانمان و ژیانمان بوو بە ژان!!

لە دڵی خۆمدا بیرم دەکردەوە و دەمگوت: خوایەگیان دەبێت هۆیەکەی چی بێت کە ئاوامان لێ هات، دوو منداڵی ساوای نابینای بێچارەسەر، ئەو پیاوەی کە زەوی لە ژێر قاچیدا دەلەرزی و بۆ گاڵتە پێکردن کارەبای بە خزمەتکاری ماڵەکەمانەوە دەنا، ئێستا خۆی کارەبای لێ دەدرێ و لە نەخۆشخانەی دەرونی وەکو شێتی لێ هاتووە!

لەم کاتدا یەکسەر ئەو کچە خزمەتکارەم بیر هاتەوە کە بۆ ماوەی (١٠) ساڵ لای ئێمە بوو، وە بە هەموو جۆرێك سوکایەتیمان پێ دەکرد. پاشانیش کە چاوەکانی لەدەستدا ئینجا هەڵهات لەو دۆزەخەی تێیدا بوو، کە ئەوم بیرکەوتەوە زۆر شڵەژام و لە دڵی خۆمدا وتم: دەبێت ئەوەی بەسەرمان هات تۆڵەی ئەو ئافرەتە نەبێت کە خوای گەورە و تۆڵە ئەستێن لێمان دەکاتەوە؟!!

بەڵێ وێنەی ئەو کچە هەتیوەی کە ئێمە ببوینە هۆی ئەوەی کە چاوی لەدەستدا بەردەوام لە خەیاڵمدا بوو، دەموت: پێش ئەوەی بمرم دەبی بیدۆزمەوە و گەردنی خۆمی پی ئازاد بکەم، ئەوەبوو دەستم کرد بە گەڕان بەشوێنیدا، دوای گەڕان و پرسیارێکی زۆر بۆمان دەرکەوت کە لە یەکێك لە مزگەوتەکان بووە بە خزمەت گوزار،وە لە ژورێکی بچکۆلانەدا بۆ خۆی لەگەڵ هەندێ ئافرەتی نابینای تردا دەژیا، منیش چووم تاوەکو بیهێنمەوە بۆ ماڵی خۆمان و گەردنی خۆمی پێ ئازاد بکەم و ئەوەندەی تەمەنم ماوە لەگەڵ خۆمدا بژیەت، جا کاتێك زانیبوی من پرسیارم لە بارەیەوە کردووە و بە شوێنیدا گەڕاوم زۆر دڵخۆش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو هەموو ئازارەشماندابوو، ئەو بەتەواوی بە پێچەوانەی ئێمە بوو، هەر کە گریام و

داوای لێبوردن و گەردن ئازاییم لێ کرد، ئەو زۆر میهرەبان و دڵنەرم بوو، وە داواکەی ڕەت نەکردمەوە و لەگەڵمدا هاتەوە بۆ ماڵەوە و پاشان ئەو ئافرەتە بێکەسە خزمەتکارە لەگەڵ ئێمەدا دەژیا و من خزمەتی ئەو ئافرەتە و هەردوو منداڵە نابیناکەی کوڕەکەمم دەکرد، بە ئومێدی ئەوەی خوای گەورە لێم خۆش ببێت... دوای ئەوەی بە چاوی خۆم بینیم چی بچێنی هەر ئەوە دەدوریتەوە و ئەوەی بەو داماوە کەساسەمان کرد هەر لە دنیادا خوای گەورە بەسەر خۆمانی هێنایەوە و پێش قیامەت دونیامان لێ بوو بە دۆزەخ، بەڵێ. خوای پەروەردگار (أصدق القائلين) کە دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ۝ وَءَاثَرَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ۝ فَإِنَّ ٱلْجَحِيمَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾.

خوای گەورە بمانپارێزی لە سەرکەشی و یاخیبوون و ناشوکری و لەبیر چوونەوەی قیامەت. اللهم آمین

سەرچاوەکان


١. قورئانی پیرۆز
٢. الترغيب و الترهيب – للحافظ المنذري –فەرموودەی ژمارە: ٥٣٦٩
٣. رَوْضَةُ المُتَّقِين في مجالِس الصالحِين– محمد عبدالعاطي بحيري ج٢ ص٥
٤. نامیلکەی (چی بچێنی ئەوە دەدوریەوە) – فەرمان نەجار– (بە کەمێک دەستکاریەوە)

# وتاری سێیەم بۆ مانگی جماد الثاني

## (( خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد ))

الحَمدُ للّهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَّلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمعينَ.

ئیماندارانی بەڕێز بە پشتیوانی خوای گەورە لەم وتارەدا باسی خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد دەکەین،باسی پەیوەندی تۆکمەی نێوان دوو هاوژین دەکەین، دوو کەس بە ڕەگەز جیاواز بە لاشە جیاواز بەڵام بە گرێبەستی پیرۆزی هاوسەری بوونەتە یەك هەست و سۆز و داپۆشەری یەکتری، بۆ بەرەکەتی وتارەکەمان سەردتا سەرێك لەماڵی پڕ بەرەکەتی پێغەمبەری خواﷺ دەدەین، کە دەچینە بەردەرگا و ئیزن وەردەگرین، دایکمان دایکی هەموو ئیمانداران، خێزانی پێغەمبەری خواﷺ خاتوو عائشە دەرگامان لێ دەکاتەوە و بەخێرهاتنمان دەکات. ئیمەش دەڵێین: هاتوین پرسیارت لێ بکەین لەبارەی ژیانی خێزانیتان لەگەڵ پێغەمبەری خواداﷺ، ئایا پێغەمبەری خواﷺ چۆن بوو وەکو هاوسەرێك لەگەڵتان؟ خاتوو عائشە دەفەرموێ: گوێم لێ بگرن دوو ڕوداوتان بۆ دەگێڕمەوە: یەکەم: ڕۆژێکیان لە ژوورەکەی مندا دانیشتبوین، لە ناکاو دەنگە دەنگێك پەیدا بوو، دەنگی خەڵکێکی زۆر و منداڵ و گەنجان ئەو ناوەی پڕ کردبوو، پێغەمبەری خواﷺ تەماشای کرد ئەوە (حەبەشیە)کانن ڕمبازی و شمشێر بازی دەکەن و خۆیان بۆ جەنگ و جیهاد ئامادە دەکەن و مەشقی سەربازی ئەنجام دەدەن و گەنجان و منداڵانیش لەدەوریان کۆبونەتەوە و هانیان دەدەن و دەستخۆشیان لێ دەکەن، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (یا عائشة

تعالي فَانْظري) ئەی عائیشە وەرە سەیرکە، لەو کاتە دا پێغەمبەری خواﷺ لەسەر ئەژنۆ دانیشتبوو و تەماشای دەکردن، منیش چوومە دواوەی و ڕومەتم خستە سەر شانی پێغەمبەری خواﷺ واتە دەمم بردە لای ڕومەتی و لەسەر تەنیشت دەمڕوانی. سەرنج بدەن چ دیمەنێکی ناوازە و دڵگیرە، بە دڵنیاییەوە دەڵێم نە لەوە و پێش و نە لەوەودوا سەرکردەی ئاوا هەڵناکەوێتەوە کە ئاوا ڕەفتار لەگەڵ خێزانی بکات و بەو دیمەنە جوانە بەیەکەوە ببینرێن)! عائشە خاتون دەفەرموێ: ماوەیەکی زۆر ئاواماینەوە و هەر تەماشامان دەکرد. تا پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: یا عائشة أما شبعْت؟! ئایا تێر بووی لە تەماشا کردن؟!منیش ئەموت نەخێر، (لأنظُرَ مَنْزِلَتي عنْدَهُ) بۆ ئەوەی بزانم تا چەند نرخی منی لایە و تا چەند دلّم ڕادەگریّ!. تەنانەت ئەوەندە مامەوە و دەمگوت نەخێر تێر نەبووم لە تەماشا کردن، تا (لَقَدْ رَأَيتهُ يُراوِح بَيْنَ قَدَمَيه). بینیم وا پێغەمبەری خواﷺ ئاڵوگۆڕی بە قاچەکانی دەکرد و هەرجارەی لەسەر قاچێکی دادەنیشت، چونکە ئەوەندە مابوینەوە قاچە پیرۆزەکانی سڕ ببوو!!

الله أكبر لەم خۆشەویستیە لەم حیساب بۆ یەك کردنە، لەگەڵ ئەو هەموو کاروبار و لێپرسراویەتییە گەورەیە کە لەسەر شانی پێغەمبەری خواﷺ بوو، کە غەم و هەمیی ئەم ئومەتەی لەسەر شان بوو، ڕەفیقی جوبریل بوو، جەیشی ئامادە دەکرد، پێشوازی وەفدی دەکرد، سەردانی نەخۆشی دەکرد، خەمی برسی دەخوارد، لەگەڵ مردوو دەچووە سەرقەبران، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئاوا گرنگی بە خێزانی دەدا و

تەنانەت ئەوەندەی خۆشویستووە، دڵی نەهاتووە شوێنەکەی بەجێ بهێڵێ، یان بڵێ قاچم سڕ بووە، یان ئیشم هەیە، هەمووشی لەبەر دڵی هاوسەری بەڕێزی.

ڕووداوی دووەم: هەر خاتوو عائشە بۆمان دەگێڕێتەوە لە خۆشەویستی نێوان خۆی و پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژیانی هاوسەریدا. ئەویش ئەوەیە کە: جارێکیان لە سەفەردا خاتوو عائشە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت، خۆشەویستی خوا بە هاوەڵانی دەفەرموێ: ئێوە تۆزێ خێراتر بڕۆن من و عائشە بەجێ بهێڵن، جا کاتێ هاوەڵان دوور کەوتنەوە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی عائشە وەرە با پێشبڕکێیەك بکەین بزانین کێمان یاریەکە دەبەینەوە، عائشە دەفەرموێ: لەو کاتەدا من لاشەم لاواز بوو بۆیە زۆر چوست و چالاك ڕامدەکرد و توانیم پێشی پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕاکردنەکەدا بدەمەوە، پاش ماوەیەکی زۆر (لەوانەیە چەند ساڵێکی پێ چووبێ)بە هەمان شێوە لە سەفەرێکدا عائشە لە خزمەتیدا دەبێ، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لە هاوەڵانی کرد کە کەمێك لێیان دوور بکەونەوە، پاشان فەرمووی: ئەی عائشە وەرە با یاری پێشبڕکێ بکەین عائشە دەفەرموێ: من یاریەکەی پێشترم بیر نەمابوو، وە لەم جارەیاندا قەڵەو ببوم و گۆشتم گرتبوو، بۆیە کاتێ پێشبرکێکەمان ئەنجامدا نەمتوانی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بگەمەوە و پێشی دامەوە و یاریەکەی بردەوە و ئەمجا دانیشت و زەردەخەنەیەکی پڕ خۆشەویستی بەڕومدا کرد و فەرمووی: (هَـذِه بِتِلْكَ السَّبْقَة) ئەی عائشە ئەم جارە بە جارەکەی تر کە تۆ پێشت دامەوە، وا منیش ئەم جارە پێشم دایتەوە و هیچمان بە هیچ!!..

سەرنج بدە ئیماندارانی بەڕێز: ئەوەندە ئەو ڕاکردنەی ئەو جارەی یەکەمی لەگەڵ خێزانی بەڕێزیدا پێ خۆش بووە، دوای ئەو هەموو ساڵە ئەنجامەکەی هەر لە بیر ماوە و لە یادی نەکردووە! کە ئەمەش ئەوپەڕی خۆشەویستی نێوان هاوسەر بۆ هاوسەرەکەی دەردەخات.

بەڕێزان: ژیانی هاوژینی بنەمایەکی زۆر گەورە و گرنگی هەیە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ ۞ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الروم: ٢٠-٢١

واتە: لە نیشانەکانی بوون و دەسەڵاتی (خوای گەورە) ئەوەیە کە ئێوەی (باوکە گەورەمان ئادەم) لە گڵ دروست کرد، پاشان ئێوە پلە بە پلە دەبن بە مرۆڤ و لەسەر زەویدا بڵاو دەبنەوە، وە لە نیشانەکانی بوون و دەسەڵاتی ئەوەیە کە: لە جینسی خۆتان، واتە لە ڕەگەزی ئادەمیزاد هاوسەری بۆ دروست کردوون، تا لە پاڵیاندا بحەسێنەوە، وە خۆشەویستی و میهرەبانیشی خستۆتە نێوانتان بۆ ئەوەی بتوانن پێکەوە باری گرانی ژیان درێژە بە ژیان بدەن، بێگومان ئالەوەدا گەلێ بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ کەسانێ بەوردی تێفکرێن و بەجوانی بیری لێ بکەنەوە، چونکە خوا لە لەش و جەستەی هەردوکیاندا ئەوەندەی دروست کردووە کە هەردوو بە یەکتری ڕازی بن و وەڵامی داخوازیەکانی یەکتری بدەنەوە بەوپەڕی سۆز و میهرەبانیەوە. (تەفسیری ڕامان).

با سەرنجێك لە (لِتَسكُنوا إِلَيها) بدەین، دەبینین وشەی (سَكَن) واتە (وَقَف) بە مانای لەجوڵە کەوت یان ژیانی نەما و مرد، بەڵام لێرەدا لە مانای ئایەتەکەدا: (لِتَسكُنوا إِلَيها) واتە: (إِسْتَراحَ، إِستَئنَسَ) واتە: ئۆقرەگرتن و هێوری و ئارامی.

جا سەرنج بدەن: هەندێ کەس کە ژنو مێردایەتی دروست دەکات. ناحەسێتەوە، بەڵکو دەوەستێ و ژیانی بە ناخۆشی و موشکیلەی خێزانی دەبێتە مردن، مردنی هەموو ڕۆژێ چونکە ئەوەی پێغەمبەری خواﷺ دیاری کردووە کە لە هەردوولادا (ژن و پیاو) هەبێ کە (دينَهُ و خُلُقَهُ) ئاین و بیروباوەڕی ڕاست و دروستە، لەگەڵ ڕەوشت و ئەخلاقی بەرز و پەسەند کە بەرهەمیی ئیمان و خواناسییە، لەبەرچاو نەگیراوە و لە هەردوو لادا یا لە لایەکیاندا نییە، ئیتر ژیانیان لەجیاتی گەشانەوە و بەرەو پێش چوون، لە جوڵە دەکەوێ و ژیانیان دەبێ بە ژان... هەندێ کەسیش کە لەسەر بنەمای دینداری و خواناسی و ڕەوشت جوانی ژیانی هاوسەرییان پێك هێناوە، بە ژن هێنان و شووکردن ژیانیان دەبێ بە ئارامی و پەیام و واتا و مانای ژیانی ڕاستەقینە، ئەو کرچ و کاڵی و هەڵەشە و هەڵچوونەی زەمانی سەڵتی نامێنێ، جاران ئەگەر بە بچوکترین شت فووی تێبکرایە، ئێستا دەبێتە کەسێکی هێمن و لەسەرخۆ و ئەو سەرشێتییەی نامێنێ..

ئیمانداران:کوڕ کە ژنی هێنا دەبێ بە (زَوج)، کچیش کە شووی کرد دەبێ بە (زَوجَة)..

(زَوج) واتە: جووت، کە پێچەوانەکەی (فَرد- تاك)ە، لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ باشە خۆ مرۆڤ دوای هاوسەرگیری نالکێ بە هاوسەرەکەیەوە ئیتر بۆچی جووتە؟! خۆ هەروەکو جاران بەتەنها ڕێدەکا و نان دەخوات، ئیتر مانای جووت بوون چییە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ ڕاستە بە جەستە نالکێ بە هاوسەرەکەیەوە، بەڵام خۆ مرۆڤ بە ڕۆح ئاوێتەی یەك دەبن، هەریەکەیان ڕۆحی ئەوی تر لە خۆیدا هەڵدەگرێ و

بەبێ ئەو ناجوڵێ، ناخوا،ناخەوێ، بیرناکاتەوە، ئەمە مانای ژیانی ڕاستەقینەی هاوسەرێتییە کە ئاوا تێکەڵ بە ڕۆحی یەکتر بن، نابینی زۆرجار کەسێك پێش ئەوەی توشی کارەساتێك ببێ خۆشەویستەکەی خەونی ناخۆش و ترسناك دەبینێ.

بەڵێ هەر مرۆڤێك کە هاتۆتە دونیا، هەر مرۆڤێك کە خوا خولقاندویەتی و لە خولگەی ژیاندا جێگیری کردووە تەنیایە، وەکو دکتۆر عەلی شەریعەتی دەڵێ: هەر مرۆڤێك ونبوویەکی هەیە مرۆڤ نیوەیە و نیوەکەی تری ونە، ئەبێ بۆی بگەڕێ و لە پەیدا کردنیدا ماندووبێ تا پڕ بێت، کامڵ بێت، تەواو بێت.

تەماشا کەن، خوای گەورە حەزرەتی ئادەمی دروست کرد لەو بەهەشتە پڕ لە ئاو و تاڤگە و دار و میوەهات و باڵندەدا داینا، بەڵام ئادەم ئارامی نەگرت، هەستی بە تەنهایی دەکرد بەتەنها ڕوانین، خواردن، خەوتن، گەڕان، سوڕان، ئازارێکی بێ کۆتایە، مرۆڤ بە تەنهایی چێژ لە هیچ شتێك نابات، ئادەم چونکە تەنها بوو لەو بەهەشتە خۆشەدا ئۆقرەی نەگرت و هەستی بە تەنهایی و بێ قەراری دەکرد، هەستی دەکرد لە شتێکی کەمە، تا ئەو کاتە کە خوای گەورە بە سۆز و بەزەیی خۆی حەوای بۆ خولقاند.

مەحوی دەفەرموێ:

لە کن من ئەصلی نیە و نەبووە عەیشی تەنها خۆش

نیە بەهەشتی خودا، هەم بە بێ ئەحیبا خۆش

بەڵێ بەڕێزان: دوای ئەوەش کە ئادەم و حەوا خرانە سەر زەوی هەر یەکەیان لە وڵاتێك دانران، (حەوا) لە جەددەی عەرەبستانی سعودی و ئادەمیش لە هیندستان، ئادەم (علیه السلام) ئاگری عیشقی نیوەی ونبووی گەرمی بۆ هێنا و هێنایە جوڵە، بۆیە گەڕا گەڕا تا لە عەرەفاتدا ونبووەکەی خۆی دۆزییەوە... هەندێ لە زانایان دەڵێن: بۆیە ئەو جێگایە پێی دەوترێ (شاخی عەرەفات) چوونکە ئادەم و حەوا لەوێدا یەکترییان ناسیەوە و بەیەك گەیشتن... لەوانەیە ناوی (جەددەش) هەر لەوەوە هاتۆتە سەر زەوی، جدَّة- واتە: داپیرە -نەنك- واتە: داپیرە گەورەی نەوەی ئادەم.

بەڕێزان: لێرەدا تێبینییەك هەیە ئەویش ئەوەیە: عەرەفات لە (جەددەوە) نزیکترە و زۆر زۆر دوورترە لە هیندەوە، کەواتە ئادەم زۆر زۆرتر گەڕاوە بەدوای حەوادا.

پێشەوا: قُرطُبي -رحمه الله- دەفەرموێ: فریشتەکان لە ئادەمیان پرسی: (حەوا)ت خۆش دەوێ؟! وتی: بەڵێ، هەر زۆر زۆرم خۆش دەوێ! ئەمجا بە (حەوا)یان وت: ئەی تۆ ئادەمت خۆش دەوێ؟! وتی: نەخێر!! بەڵام لە قوڵایی دڵ و ناخیدا سەد ئەوەندە ئادەمی خۆش دەویست بەڵام دەری نەدەبڕی!!..

کەواتە: ئافرەت بە سروشتی خۆی زۆرجار خۆشەویستی خۆی بۆ مێردەکەی دەرنابڕێ بەتایبەت دوای گواستنەوەی بۆ ماوەیەك بەیەکەوە ژیان، جا دەبێ پیاوان لەمە ئاگادار بن و نەیکەن بە مایەی کێشەی خێزانی!..

ئیمانداران: لە مێژووی کاروانی خواناسان و ئیمانداراندا، چەندین پەیوەندی زۆر جوان و بەرز و مەزنی نێوان پیاو ژنمان لە پێش دەستدا

هەیە، فەرموون با بۆ چەند ساتێك لەگەڵ دوو هاوسەری تا لوتکە خۆشەویستی یەکتر و خێزانێکیجوان و دڵگیر، ژیان بەسەر بەرین، ئەوانیش (حەزرەتی إبراهیم پێغەمبەر و سارا خاتونی هاوسەرێتی) زۆربەمان ژیاننامەی پڕ لە بەرەکەت و هەوڵ و تێکۆشانی حەزرەتی إبراهیممان خوێندۆتەوە، کە تەمەنی گەیشتە نزیکەی ۸۰ساڵ و خێزانەکەی هێشتا منالی نەدەبوو، وە بۆشیان دەرکەتبوو کە هۆی منالْ نەبوونەکە لە سارا خاتوونەوەیە، بەلام حەزرەتی إبراهیم ئەوەندە سارای هاوژینی خۆشدەویست، ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو هەموو تەمەنە درێژە لە نیەت و خەیالیدا نەبوو وە بە بیریدا نەهات کە ژنێکی تر بێنێت، ژنێکی تری نەدەکردە هاوسەری لە کاتێکدا کە ڕێگاشی پێ درابوو، لە شەرعدا بۆی حەرام نەبوو وە بە پێی هەموو یاسایەك مافی ڕەوای خۆی بوو کە ژنی دووەم بێنێت و بۆ ئەوەی منالی ببێت و هاوکاری باوکی بکات لە کاروباری دونیایدا و لە گەیاندنی پەیامی خوادا، جگە لەو هەموو حەز و ئارەزووە دەرونییەی کە هەموو باوکێك و دایکێك هەیەتی کەڕۆژێك لە ڕۆژان گروگالی منالْ لە مالەکەیدا دەنگ بداتەوە و گوێیان بە بیستنی وشەی ناسکی بابە و دایە ئاودێر بکرێ، حەزرەتی إبراهیم هەموو ئەو ئاوات و ئارەزووانی خۆی پشتگوێ خست بۆ ئەوەی ئازاری هەست و سۆزی هاوسەرەکەی نەدات، ئەوە بوو لەسەر داوای زۆری و پێداگرتنی تەواوی ساراخاتونی خێزانی هاجەرە خاتونی کردە هاوسەری خۆی و خوای گەورە (إسماعیل)ی پێ بەخشی، سارا خاتوون وەکو خویەکی ژنانە غیرەی لە هاجەرە کرد و بۆ ڕازیکردنی دلی ژنەکەی کە سارا خاتونی هاوسەری یەکەمیەتی و تەمەنی لاوێتی و پیری لەگەلدا بەسەر

بردووە، لەسەر داوای ئەو و بۆ ڕاگرتنی دڵی ئەو هاوسەرە ئازیزەی،خێزانە گەنج و لاوەکەی کە هاجەرە خاتوونە، لەگەڵ إسماعیلی کوڕیەی جوان و چاوگەشی تاقانەیدا لەبەر چاوی سارا خاتون لابرد و هەر لەو وڵاتەشی نەهێشتن!! جا بیهێنە بەرچاوی خۆت ئایا چ قوربانی دانێکە کە تۆ هەموو ئاواتت منداڵێك بێت لە کۆتایی تەمەندا خوای گەورە پێت ببەخشێ، وە خێزانی دووەمت زۆر جوانتر و گەنجتر بێت، لە خێزانی یەکەمت، کەچی دوریان بخەیتەوە لە خۆت و کاتی خۆشیان لەگەڵ بەسەر نەبەیت تەنها و تەنها لەبەر خاتری دڵی خێزانی یەکەمی، ئەمڕۆ کام پیاو کە ژنی دووەمی کوڕی ببێ و ژنی یەکەمی نەزۆك بێ، ئەگەر ژنەکەی یەکەمی مەرایی نەکات و خۆی نەگونجێنێ مێردەکەی دەری دەکات!..

کەواتە: ڕێز و حورمەتی ئافرەت لای هەڵگرانی پەیامی ئیسلامە چی بکەین کە بەداخەوە خەڵکانێك بەهۆی ناحاڵیبوون لە ئیسلامەوە، بەڵام لەبەرکردنی جل و بەرگی بەناو ئاینی، یان هەڵگرتنی ناوێکی بەناو ئاینی، وەکو (لەگەڵ ئەو پەڕی ڕێز و حورمەتدا) حاجی وا هەیە بەناو زیارەتی ئەو کەعبەیەی کردوە کە ئەو حەزرەتی إبراهیمە دروستی کردووە، کەچی بەداخەوە لەبەر کوڕ ژنی یەکەمی بە بێ هیچ هۆیەك تەڵاقداوە!! یان دوای هێنانی ژنی دووەمی کردوویەتی بە کۆیلە!! ئیتر خەتای ئیسلام و پەیامە پڕ لە دادگەرییەکەی و ڕێزی بۆ نێوان ژن و مێرد دابین کردووە چییە؟!

بەڕێزان: جوانترین ژیانی هاوسەرێتی خۆشەویستی و وەفای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خاتوو خەدیجەی خێزانی، ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو پیاو (پێش پێغەمبەرایەتی) جگە لە خاتوو خەدیجە هیچ ژنێکی تری نەهێناوە، لە کاتێکدا هەمووومان ئەو ڕاستییە دەزانین کە

خاتوو خەدیجە ١٥ ساڵ تەمەنی لە پێغەمبەری خوا زیاتر بووە، بەڵام ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم ماوە زۆرەی تەمەنی نێوانیان نەبووە مایەی درز تێکەوتنێك لە خۆشەویستی پتەوی نێوانیان، وە ئەم خۆشەوستییە تەنها هەر لە ماوەی ژیانیدا نەبوو، بەڵکو ئەوەتا دوای (١٤)ساڵ لە وەفاتی خەدیجە ، لە ڕۆژی گەورەی سەرکەوتنی سەرکەوتنەکان، کە ڕۆژی فەتحی مەککەیە، لەو کاتە چارەنوسس سازەدا کە ئەو هەموو هەزاران خەڵکە لە دەوری پێغەمبەری خوا ﷺ کۆببونەوە و قوڕەیش داوای لێبوردنیان لێ دەکرد و وەفدی هۆزەکانی دەورو بەری مەککە دەهاتنە خزمەتی و ڕۆژی سەرکەوتنی ئیسلام و موسڵمانان بوو، لەم کاتەدا پیرەژنێکی بەساڵاچوو هات بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پێغەمبەریش ﷺ هەر کە چاوی پێ کەوت لەبەری هەستا و عەباکەی بۆ ڕاخست و بەدەمیەوە زەردەخەنەی دەکرد و بە وردی و بە هەموو هەستیەوە گوێی بۆ قسەکانی شل کردبوو، قسەوباسێکی زۆریان کرد، دوای ڕۆشتنی پیرەژنەکە و بەحورمەتەوە خواحافیزی لێکردنی، عائشە بەسەرسوڕمانەوە پرسی: ئەرێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە کێ بوو، وا ئەو هەموو ڕێز و حورمەتەت لێ گرت و ئەو هەموو کاتەی خۆتت بۆ تەرخان کرد؟! فەرمووی: ئای عائشە، ئەوە هاوەڵی خەدیجەی خێزانم بوو!! عائشە فەرمووی: باشە باسی چیتان دەکرد؟! فەرمووی: لەبارەی ئەو ڕۆژە خۆشانەوە دەدواین کە لەگەڵ خەدیجە بەسەرم دەبرد و ئەم ئافرەتەش سەردانی دەکردین!!. عائشە غیرەی کرد و فەرمووی: ئەوە چییە تا ئێستاش دوای (١٤) ساڵ بەسەر مردنیدا هێشتا ئەو خەدیجە پیرەژنەت بیر نەچۆتەوە کە خۆڵ ڕزاندویەتی و خواش لەو باشتری پێ

بەخشیوی؟! پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (وَاللهُ ما أَبْدَلَني اللهُ خَيراً منها).. نەخێر سوێند بە خوا، هەرگیز خوای گەورە باشتر لە خەدیجەی پێ نەبەخشیوم!! واتە: دڵنیابە ئەی عائشە لەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستیەمدا بۆ تۆ کەچی تۆ جێگای خەدیجەت لە دڵی مندا پڕ نەکردۆتەوە و هەرگیزاو هەرگیز جێگای خەدیجەی خۆشەویست و هاوسەرم لە دڵمدا دەرناچێ!!

عائشە دەفەرموێ: هەستم کرد پێغەمبەری خواﷺ لێم تورەیە، بۆیە وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ لێم خۆشبە، فەرمووی: ئەی عائشە داوای لێخۆشبوون لە خەدیجە بکە با منیش لێت خۆش بم!!..

بەڵێ ئیمانداران لەگەڵمدا بن، هەر لە ڕۆژی فەتحی مەککەداین، لەو ڕۆژەدا هاوەڵە بەرز و بەرێزەکانی چوونە خزمەتی پێشنیاری دروست کردنی خانویەکیان خستە بەردەمی بۆ ئەوەی تێیدا نیشتەجێ ببێ، بەڵام پێغەمبەری خواﷺ ئەم پێشنیارەی ڕەت کردەوە و فەرمووی: نەخێر لەجیاتی خانوو، خێوەتێکم لە تەنیشت گۆڕەکەی خەدیجەوە بۆ هەڵبدەن!!..

بۆچی تەنیشت گۆڕەکەی خەدیجە؟! چونکە بە مردوویش لە هەموو کەس پێی ئاسودەترە و ئەو نیوەی ئەمە لە ژێر خاکدا، بۆیە بە نزیکی لە گۆڕەکەی ئارام دەگرێ، ئەیەوێ لە کەناری بەشەکەی تریدا پاڵ بداتەوە، چونکە کاتی خۆی ڕۆحیان ئاوێتەی یەکتر بووە، بەڵێ ئەمەیە هاوسەری و هاوژینی ڕاستەقینە و خۆشەویستی لە لوتکەدا..

چۆن کاتێ شتێك ئەکەیت بە دوو کەرتەوە ، دوو نیوەوە، ئەو دوو نیوەیە تەواو هاوشێوەی یەکتر دەردەچن، هەر بە یەکتریش دەخۆن و تەنها بۆ یەکتر دەگونجێن، هیچ پارچەیەکی تر ئەو لەتە تەواو ناکاتەوە،

بەهەمان شێوە ژن و مێردیش بۆ یەکتر دەبێ ئاوابن و بە هەردووکیان یەك ڕۆح و هەست و نەست دروست بکەن و بە بێ یەکتری نەژین و هیچ کەسێك نەتوانێ شوێنی هاوسەرەکەی لە دڵیدا بگرێتەوە.

بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ دەبینین و دەبیستین کە ئەو خۆشەویستی و پەیوەندیە تۆکمەیەی نێوان خێزانەکان بەرە و کاڵ بوونەوە و کورتبوونەوە و کەم بوونەوە ڕۆشتووە و زۆرجار کێشە دەکەوێتە نێوان ژن و مێردەکانەوە و ئەوەندە گەورە دەبێت کە لەناو ماڵ و چوارچێوەی خێزاندا جێگای نابێتەوە و دەڕواتە دەرەوە و هەر لە دۆست و دڵسۆزەوە تا دژ و ناحەزیان پێی دەزانێ و هەندێ جاریش بە چارەسەر نەکراوی دەمێنێتەوە و سەرەنجام بە تەڵاق و لەیەکتر جیابوونەوە و هەڵوەشانەوەی خێزان و کەسایەتی شکان و سەرگەردان بوونی منداڵی بێتاوانی لی دەکەوێتەوە، وە ئەم شکستەی خێزانیش و شلبونەوەی گرێ توند و تۆڵەکانی نێوان دوو هاوسەر چەند هۆکاری هەیە، کە ئاماژە بە هەندێکیان دەدەین:

**یەکەم:** پابەند نەبوونی ژن و مێرد بە شەرعەوە، لە کاتێکدا هەر خێزانێك بە گوێرەی (هُدی) خوای گەورە ژیانیان نەبردە سەر و شوێن هەوا و ئارەزووی نەفسی سەرکەشی (الأمارة بالسوء) کەوتن، ئەوە بێگومان ئەو خێزانە ناتوانێ درێژە بە ژیان بدات و هەر زوو گوڵی خۆشەویستی نێوانیان سیس دەبێت.

**دووەم:** هاوڕێی خراپ بۆ ژن یان پیاو، کە ژنێك ئەچێتە بن کلێشەی ئافرەتێکی خاوەن هاوسەرەوە و هانی دەدات بۆ ئەوەی ئەوەندە پابەند نەبێ بە فەرمانی مێردەکەیەوە و پێی دەڵێ: ئەمە پیاوسالاریە نابێ

چیتر ئافرەت قبوڵی بکات، وە زۆرجار هەندێ بەناو ڕێکخراو کە بەحیساب داکۆکی لە مافی ئافرەت دەکەن لەڕاستیدا ماڵی ئافرەت کاول دەکەن، ئەویش بەوەی کە ئەوەندە بە بن گوێیدا دەخوێنێ، کە ئافرەت ماف پێشێلکراوە و دەبێ هەوڵ بدات خۆی ڕزگار بکات و ئەم پیاو سالاریە هەتا کەی قبوڵ بکرێ، ئیتر بە تەواوی وا لە ئافرەت دەکەن کە وابزانێ پیاو دوژمنیەتی و پێویستە تۆڵەی خۆی بکاتەوە، لەجیاتی ئەوەی ژن هانبدرێ کە ئاگاداری خۆشەویستی نێوان خۆی و هاوسەرەکەی بێت و بەزەردەخەنەی سەرنج ڕاکێش و ڕەفتار و هەڵسوکەوتی بەرز و بەڕێز، بە ڕێز گرتن لە کەس و کاری هاوسەرەکەی، وا لە مێردەکەی بکات کە ئەوەندەی تر لەبەرچاوی گەورەتر و بەحورمەتتر بێت و بزانێ کە خۆشی ژیانی و ڕێز و ئیحترامی بەو ژنە بەڕێزەوەیەتی، وە بە هەمان شێوە چەندین پیاو بەهۆی ڕەفیقی خراپەوە کە خۆیان خۆشەویستی ناو خێزانیان لەدەست داوە و لەجیاتی سۆز و بەزەیی (مودَّة و رحمَة) لێدان و کوتەك و خۆزاڵ کردن بۆتە هۆی بەیەکەوە ژیانیان، هانی ئەم پیاوە بەڕێزەش دەدەن کە لەگەڵ خێزانی خۆیدا باشە و ڕێز و حورمەت لە ژنەکەی دەگرێ و هاوکاری دەکات، دەیدەنە بەر تانە و تەشەر و وشەی ناشرین و تۆمەتباری دەکەن بەوەی کە ژن بەسەریدا زاڵە و نابێ ژن ئاوا ڕێزی لێ بگیرێ و هاوکاری بکرێ، ئەگینا دوایی بەسەر مێردیدا زاڵ دەبێ و گوێڕایەڵی ناکات! زۆر جار ئەم پیاوە لە لایەن کەس و کاری خۆیەوە ئەم وشە ماڵوێرانکەرانەی بە مێشکدا دەدرێ و ئەویش ئەگەر کەسێکی زۆر بە ئاگا و ڕۆشنبیر نەبێ دەکەوێتە ژێر کاریگەری ئەم قسە و قسەلۆکانە و ڕەفتارە جوان و

هەڵسوکەوتە شیرینەکانی لەگەڵ خێزانی بێتاوانیدا دەگۆڕێ و ژیانیان دەبێ بە ژان و دۆزەخ!

ئای چەند ژن و پیاو بە هۆی بە گوێکردنی هاوڕێ و دەزگای خراپەوە، بەهۆی ڕاگەیاندنی خراپەوە (کە ئەمڕۆ ئەگەر لە ماڵی خۆشتا دابنیشی و نەچیتە دەرەوە، هاوڕێی خراپ خۆی دێتە ژوورەوە، کە تەلە فیزۆن و کەناڵی خراپە و قسەت بۆ دەکات و بە کردەوە هانت دەدات) ژیانیان تێکچووە، بە هۆی ئەو فلیمە ڕوخێنەرانەوە کە زۆر جار ژن لاسایی ئەکتەرێك دەکاتەوەکە چۆن لە تەمسیلەکەدا بە بێحورمەتی وەڵامی مێردەکەی دەداتەوە و وشەی ناشرینی پی دەڵێ، ئەمیش چاوی لێ دەکات و بەبێ ئاگایی لاسایی ئەو هەڵسوکەوتە ناشرینە دەکاتەوە و دڵی مێردەکەی ئازار دەدات و درز و کەلێن دەکەوێتە نێوان خۆشەویستیەکەیانەوە و سەرەنجام خێزانەکەیان هەڵدەوەشێ، کە بەڕاستی دەستێکی خراپ لە پشت ئەم کەناڵە ڕاگەیاندنانەوە هەیە و هەموو ئاواتیان هەڵوەشاندنی خێزانە، نەك تۆکمەکردنی!

بەڵێ هاوڕێی خراپ دڵی ئارام ناگرێ تا هاوڕێکەشی نەباتە سەر ڕەوشتی خۆی، تاوەکو خوی ئەویشماڵوێران دەکات، ﴿وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗ﴾ النسا: ٨٩

ئیمامی عثمان دەفەرموێ: زیناکار خۆزگە دەخوازێت هەموو کەس وەکو خۆی زیناکار بێت..

کەواتە : ژن و پیاوی بەڕێز و ئیماندار، ئاگاداربە هەرکەسێ هانیدایت کە ڕێز و حورمەت لە خێزان و هاوسەرت نەگری بزانە

ماڵوێرانکەرە و تا زووە لێی بەدوور بە، ﴿وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا﴾ الكهف:٢٨

**سێیەم: کۆمەڵگا و ژینگەی دەوروبەر:** زۆر جار پیاوەکە لەدەرەوەی ماڵ خەریکی کار و کەسابەتی ڕۆژانەیەتی لە معامەلە و کڕین و فرۆشتنەکەیدا زەرەری کردووە، هاوڕێ و برادەر نارەحەتیان کردووە، لە فەرمانگایەکدا فەرمانبەرێك بەجوانی وەڵامی نەداوەتەوە، دێتەوە بۆ ماڵەوە و داخ و خەفەتی ناو دڵی بە ژنەکەی دەردەبڕێ، وا ئەزانێ خەتای هاوسەرەکەیەتی!!، کە بەڕاستی ئەمە ڕەفتارێکی هەڵەیە و دەبێ ئەو حەقیقەتە بزانی تۆ چەند لە دەرەوە ماندووی، خێزانیشت ئەگەر لە تۆ ماندووتر نەبێ ئەوا کەمتر ماندوو نەبووە لە ماڵەوە، هەر لە پاك و خاوێنی ناوماڵەوە تا ئامادە کردنی خۆراك و ئاگادار کردنی منداڵ و بەڕێکردنی میوانت، کەواتە هەرگیز خەم و خەفەت و توڕەیی دەرەوەی ماڵت مەهێنەرەوە ناو ماڵەوە، بەڵکو هەوڵ بدە ئەگەر خۆشیەك و بژەیەکت لە دەرەوەی ماڵ دەست کەوتووە لەوە بەشی خێزانەکەت بدە و ئەویشی پێ دڵخۆش بکە،

دکتۆر عبداللە پەشێوی شاعیر دەڵێ:

گەر سێوێکم هەبوو لەتی دەکەم
لەتێك بۆ من لەتێك بۆ تۆ
گەر بژەیەکم هەبوو بەشی دەکەم
بەشێك بۆ من بەشێك بۆ تۆ
گەر خەمێکم هەبوو
بەشت نادەم هەمووی دەخۆم

بەڵام بەداخەوە پیاوی وا هەیە تەنها خەم لەگەڵ ژنەکەی بەش دەکات.!

وە جاری وا هەیە ژینگە و کۆمەڵگای دەورو بەر کاریگەری لەسەر ژن هەیە و دەبێتە هۆی تێکچوونی شیرازەی خێزان، وەکو چاولێکەری ژن بۆ مۆد و مۆدبازی کە مەگەر کەسێك پارەی حەرام و دەست بڕینی ئەم و ئەو پیشەی بێ، ئەگینا بە پارەی حەڵاڵ و ڕەنجی شان فریای گۆڕینی مۆد و ڕۆشتنی ژیان لەسەر مۆد ناکەوێ و سەرەنجام تیا دەچێ و موفلیس دەبێ، یاخود لە ئەنجامی تێکەڵاوی و سەردان لەگەڵ ئەو کەسانەی باری ئابوورییان لە خۆیان بەهێزترە، ئەگەر ئەو ژنە پلەی ئیمان و عەقیدەی زۆر بەرز نەبێ و خۆشەویستی و ئەوینی بۆ مێردەکەی لەسەروو هەموو شتە مادییەکانی دونیا نەبێ، ئەوا دەکەوێتە داواکاری پرتە و بۆڵە و ناشوکری کردن بەوەی کە خۆیان هەیانە و وتنی: من چیم لە ژنی خەڵك کەمترە و مێردەکەشی بەو موچە و باری لاری ئابوریەی ناتوانێ ئەمانەی بۆ ئەنجام بدات و سەرەنجام کێشەی خێزانی دروست دەبێ...

چوارەم: کاریگەری نوشتەی ناشەرعی و فاڵچی و ساحیرەکان.. کە هەندێ جار ناحەزانی ژن و پیاوێکی بەختەوەر پەنا دەبەنە لای ئەو ساحیر و نوشتە نوسانە بۆ ئەوەی نێوانی ئەو دوو هاوسەرە خۆشەویستە تێك بدەن، وە ئەمەش لە ڕوانگەی شەرعەوە کاریگەری خۆی هەیە، هەر وەکو لە زانای بەناو بانگ (شێخ محمد متولی الشَعراوي)پرسیار کرا کە: ئافرەت مێردەکەی خۆی لەبەرچاو کەوتووە و مێردەکەشی هیچ درێغیەکی بەرامبەر نەکردووە، ئایا دەگونجێ ئەمە دەستی فاڵچی و ساحیری تێدابێت؟!

لە وەڵامدا فەرمووی: بەڵێ تەئسیر و کاریگەری زۆری هەیە، چونکە هەندێ جنۆکەی خراپەکار یارمەتی هەندێ مرۆڤی خراپەکار دەدەن، بۆ

زیان گەیاندن بە مرۆڤ، وە زۆر جار ئەم ساحیر و فاڵچیانە سیحرەکە و فاڵەکەیان لە ڕێگەی جنۆکەوە وا کاردەکات ژنەکە یان پیاوەکە. هاوسەرەکەی خۆی کە پێشتر زۆر خۆشی ویستووە لە بەرچاوی دەبێ بە مەیمون و حەز بە بینینی ناکات، بەڵام کەسێك کە زانی نوشتەی ناشەرعی و سیحری لێ کراوە و شوێنەوارێکی ئەوانەی لەماڵەکەیدا هەیە، نابێ ئەویش خۆی توشی هەمان گوناه و تاوان بکات و بچێتە لای نوشتە نوسێکی نا شەرعی و نوشتەی ڕەش و سپی و ترش و شیرین بکات تا کاریگەری نوشتەکە لەسەری بەتاڵ دەبێتەوە، یان بچێتە لای فاڵچی و ساحیر و فاڵچییەك و داوای کرانەوەی بەخت و گێڕانەوەی بەختەوەری لێ بکات، چونکە ئەمەش هەر وەکو پێشوو نا شەرعی و نا ڕەوایە و درۆیەکی ئاشکرایە.

بەڵکو چارەسەرێکی ئاسان و شەرعییانە هەیە کە بریتییە لە خوێندنی سورەتی –الإخلاص و المُعَوَّذَتَين، واتە سورەتی ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ وە ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ﴾ وە ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ هەر یەکەیان سێ جار بخوێنە و فوو بکە بەسەر ئەو کەسەدا کە ئەو نوشتە و سیحرەی لێ کراوە بەتایبەت بەیانیان و ئێواران، إنشاء الله هیچ کاریگەرییەکی نامێنێ و بەتاڵی دەکاتەوە!...

جێگەی داخە لەم وڵاتە و لەم شار و شارۆچکانەی ئێمەدا دەیان شوێن و کەس هەیە بۆ نوسینی ئەم جۆرە نوشتەی ڕەش و سپیە ناشەرعیانە و ماڵی خەڵکی وێران دەکەن، کە حەق وایە دەزگا بەرپرسەکان ئەو شوێنە خراپانە دابخەن و ئەو جۆرە کەسانە بدرێن بە دادگا و سزای یاسایی بدرێن..

بەڕێزان: بۆ چارەسەری کێشە خێزانیەکانیش چەند خاڵێك دەخەینە بەرچاو:

یەکەم: ئەگەر پیاو ژنی خراپی بوو، یان ژن پیاوەکەی خراپ بوو، ئەوە با بزانن تاقیکردنەوەی خواییە و با ئارام بگرن، چونکە پێشتر دوو لە پێغەمبەرانی خوا کە حەزرەتی نوح و لوط بوون، ژنەکانیان کافر و بێ بڕوا بوون و زۆر ئازاری هاوسەرەکانیان داو پاشان بە کافری مردن!.

وە ئەگەر خراپی ژنەکەش لە عەقیدە و بیر و باوەڕەوە نەبوو، بەڵکوو لە هەندێ ڕەوشت و کرداریدا بەدڵی هاوسەرەکەی نەدەجوڵایەوە، ئەوە با دیسان ئارام بگرێ و لەبەر خاتری کردەوە و هەڵسوکەوتە جوانەکانی چاو پۆشی لە خراپەکانی بکات، قورئانیش دەفەرموێ: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـًٔا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرًا كَثِيرًا﴾ نسء ١٩

واتە: بە جوانی هاوژینی لەگەڵ خێزانەکانتان ببەنە سەر، خۆ ئەگەر خۆشتان نەویستن و لێیان بێزار بوون، ئەوە دوور نییە و دەشێت حەزتان لە شتێك نەبێت و خوا بیکات بە مایەی خێر و بێری زۆر و بێ سنور..

ئای چەند گەورە و پیرۆز و واتادارە وتە گەوهەر بارەکەی (حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب) کاتێك کە پیاوێك هاتە لای وتی: دەمەوێ خێزانەکەم تەڵاق بدەم و لێی جیا ببمەوە، حەزرەتی عومەر فەرمووی: بۆچی؟! وتی: چونکە خۆشم ناوێت، حەزرەتی عومەر فەرمووی: (وَ يْحَكَ أَلَمْ تُبْنَ البُيُوتُ إلا عَلَى الحُبِّ؟! فَأَينَ الرِّعايَةُ وَ التَذَمُّمُ؟) فەرمووی: ئەی هاوار بۆ تۆ، ئایا ماڵ و خێزان تەنها لەسەر

خۆشەویستی بنیات دەنرێ؟ ئەی چاودێری و چاوپۆشی و سۆز و بەزەیی نێوان ژن و مێرد لەکوێیە؟

واتە: شەرت نییە ئەو خۆشەویستیەی دەزگیرانی و سەرەتای مانگی هەنگوینی لە نێوان هەموو ژن و مێردێکدا تا سەر هەر بمێنێ. بەڵکو ئەمجا لە درێژایی ژیانی خێزانیدا وردە وردە هەوڵ و تێکۆشانی پیاو لە دەرەوەی ماڵ و سەرقاڵی بازاڕ و بژێوی ژیان، وە ژنیش دوای پەیدا بوونی منداڵ و زیاد بوونی خێزان و ئەرك و ئیشی ناوماڵ، ئەو خۆشەویستیە گەرم و گوڕییەی سەرەتای یەکتر ناسین و گواستنەوە نامێنێ، بەڵام لەجیاتی ئەو بەشە ڕۆشتووە و لە خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی و چاودێری حاڵی یەکتر و هاوکاری کردنی یەکتری بۆ بەرەنگار بوونەوەی تەنگژەی ژیان دێتە نێوانیانەوە و دەبێتە هۆکاری درێژە پێدەری ژیان لە نێوان ئەو ژن و مێردەدا.

بۆیە تۆی موسڵمان هەرکاتێ دەمە بۆڵەیەك و گاز و گلندەیەك کەوتە نێوان تۆ و خێزانەکەتەوە، وە بە توڕەیی و دڵڕەنجاوی لە ماڵ چوویتە دەرەوە، هەر کە هاتیتەوە بۆ ماڵ بە ڕوویەکی خۆش و زەردەخەنەوە سەلام لە خێزانت بکە، ئیتر بە پشتیوانی خوا کێشە لە نێوانتاندا نامێنێ.

پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئەنەسی فەرموو: (يا بُنَيَّ إذا دَخَلتَ على أهْلِكَ فَسَلِّم يَكُنْ بَرَكَةً عَلَيكَ و علَى أهلِ بَيْتِكَ) رواهُ الترمذي و قال حديث حسن غريب...

واتە: ڕۆڵەگیان هەر کاتێ چویتەوە بۆ ماڵ بۆ لای خێزانەکەت، سەلامێکی جوان و گەرم و گوڕی بە ڕویەکی خۆش و دەم بە زەردەخەنەوە لێ بکە، ئەو سەلام کردنە دەبێتە خێر و بەرەکەت و خۆشی بۆ سەر تۆ و بۆ ماڵ و خێزانەکەت...

بەڵێ ئیمانداران: چەند پێویستە پیاوی موسڵمان وەکو پێشەوا عومەری کوڕی خطاب، بیر بکاتەوە و ڕەنج و ماندووبوونی خێزانەکەی بەرز بنرخێنێ، کە لە ژیان نامەی حەزرەتی عومەردا هاتووە کە: پیاوێك چوو بۆ ماڵی حەزرەتی عومەر بۆ ئەوەی شکوای حاڵی خۆی بکات لە دەست دەنگ بەرز کردنەوەی ژنەکەی و گلەیی و گازندەی لە جۆری ژیانیان کە هەژارانەیە و ناتوانێ هەموو پێداویستییەکانیان دابین بکات، بەڵام کاتێ گەیشتە بەر دەرگای ماڵی خەلیفە عومەر، گوێی لێ بوو کە خێزانەکەی حەزرەتی عومەر وا دەنگی بەرز کردۆتەوە و داواکاری هەیە لە ژیانی هەژارانەیان و تەنانەت وا دەنگی بەرز کردۆتەوە کە نیشانەی توڕە بوونە، دەنگی دەگاتە کۆڵانەکە، کابرا لە دڵی خۆیدا وتی: خۆ من هاتم شکوای حاڵی خۆم لای خەلیفە عومەر بکەم بەڵام خۆ ئەویش هەمان حاڵی منی هەیە، ئیتر با بگەڕێمەوە و قسە نەکەم، لە گەڕانەوەیدا حەزرەتی عومەر هەستی پێ کرد و بانگی کرد و هۆکاری هاتنەکەی و بە بێدەنگی گەڕانەوەکەی لێ پرسی. ئەویش باسەکەی بۆ گێڕایەوە، حەزرەتی عومەر فەرمووی: براکەم، ئەم ژنەی من زۆر ئەرك و ماندووبوون بۆ من دەکێشێ، جل و بەرگم بۆ دەشوات، جێگەی خەوم بۆ ئامادە دەکات، منالم بۆ پەروەردە دەکات، منالم بۆ پاك دەکاتەوە و خزمەتی میوانم دەکات، ئەمانە هەمووی دەکات بە بێ ئەوەی کە ئەرکی سەرشانی بێت، ئایا کە ئەو بەرگەی ئەو هەموو ئەرك و زەحمەتەی من دەگرێت، ئەی من بەرگەی دەنگ بەرز کردنەوەیەکی ئەو و داواکاریەکی نەگرم؟! کابرا وتی: خۆ خێزانەکەی منیش هەموو ئەمانەم بۆ دەکات بەڵام من ئاوا بیرم لێ نەکردبۆوە، بۆیە وا منیش بڕیارم دا کە بەرگەی هەموو دەنگ بەرز کردنەوەیەکی بگرم!...

دووەم: ئەگەر ژنێکی چاك و پاك و خواناس و ڕەوشت بەرز کەوتە لای پیاوێکی خراپەکاری بێ دینی بێ ڕێز بۆ ژن، ئەوە ئەو ئافرەتە بەڕێزە

پێویستە ئارام بگرێ لەبەر خاتری ڕیز و حورمەتی خۆی، وە لەبەر خاتری منداڵەکانی ئەگەر منالی هەبوو، بۆ ئەوەی سەرگەردان نەبن و وەکو باوکیان خراپە و گوێیان پێ نادات و پەروەردەیان ناکات و بە پەروەردەیەکی دیندارانەی خوا ویستانە، با لە پەروەردەی ئەم دایکە خواناس و بەڕێزەش بێ بەش نەبن و بەو ئومێدەوە منالەکانی پەروەردە بکات کە هیوای دوا ڕۆژی بن و بۆ دونیا و دوارۆژ، وە بە پێی توانین و لێزانین ئامۆژگاری چاکەی هاوسەرەکەی بکات و بڕوای وابێ کە مرۆڤ قابیلی گۆڕانە.

زانایەك وتویەتی: خۆ ڕاگری و خۆ گونجاندن لەگەڵ دۆخەکاندا دەبێتە هۆی سەرکەوتن، لە کاتێکدا توڕەیی لەم دۆخەدا ڕوخانی بەدوادا دێت.

وە ئەو ئافرەتە وانەزانێ کە ئەوە خراپی ئەوە کە توشی بووە بە هاوسەرێکی ئاوا خراپەوە بەڵکو یەکێ لە گەورە ئافرەتانی بەهەشت کە (ئاسیای کچی مەزاحیمە) هاوسەرەکەی خراپترین و کافرترین پیاوی سەر زەوی بوو کە(فیرعەون) بوو، وە بە دەستی ئەو مێردە خراپ و خوانەناسەی شەهید کرا...

لە کۆتایی ئەم وتارەدا ڕوو دەکەمە پیاوانی موسڵمان و دەڵێم، پێغەمبەری خواﷺ لە کۆتا وەصیەت و ڕاسپاردەیدا پێش وەفاتی ڕووی کردە پیاوانی ئومەتەکەی و فەرمووی: (اللّٰه اللّٰه فِي النِّساء، فَإنَّهُنَّ عَوان فِي أيديكُمْ، أَخَذْتُموهُنَّ بِأمانَةِ اللّٰهِ وَ استَحْلَلْتُمْ فُروُجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللّٰهِ) رواهُ النسائي و إبن ماجة.

مەلای گەورەی کۆیە –ڕەحمەتی خوای لێبێت– فەرموویەتی:

ژن زینەتی دونیایە ئەمانەتی خودایە
حەبیبی موصطەفایە قەلاتن لە بۆ مێردان

وە بە ئافرەتی بەڕێزیش دەڵێم: پێغەمبەری خواﷺ بە ئێوەشی فەرمووە: (أَيُّما إمْرَأَةٍ ماتَتْ و زَوجُها عَنها راضٍ دَخَلَتِ الجَنَّةَ) رواهُ إبنُ ماجة و الحاكم
واتە:هەر ئافرەتێك بمرێت و مێردەکەی لە ژیاندا لێی ڕازی بوبێ، خوای گەورە دەیخاتە بەهەشتەوە...

خوای گەورە بەرەکەت و خۆشی و خۆشەویستی بخاتە نێوان هەموو ژن و مێردێکی ئیماندارەوە....اللّهم آمین

سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز
٢. تەفسیری ڕامان – م. احمد کاکە محمود
٣. تەفسیری ئاسان – بورهان محمد أمین
٤. شَخْصيةُ المُسْلِم – د. محمد علی الهاشمی ص٧٩، ص٧٥
٥. عیشق وەك چەمكێك بۆ ژیان – قانع خورشید ل٨٠ ،ل٦٣ ،ل١٨ ،ل٦١
٦. خۆشەویستی – عمرو خالد ل١٠ ،ل١٣ ،ل٥٠ ،ل١٦
٧. صفات الزّوج الصّالح و الزّوجة الصّالحة – محمد متولي الشّعراوي ص١٤٣
٨. کچان، ئازار و هیوا – د. إبراهیم درویش ل١٠٤

# وتاری چوارەم بۆ مانگی جماد الثاني
## ( ناپاکی هاوسەری – الخِيانة الزَّوجِيَّة )

الحَمدُ للهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعِينَ

ئیمانداران: ژیانی دونیا ئەگەر بە پێی ئەو یاسا و دەستورە کە خوای خالقی مرۆڤ و گەردوون و هەموو شتێك داینـاوە بۆ ئەوەی ژیان لەسەر گۆی زەوی بە پێی ئەو دەستور و یاسایە بەڕێوە بچێت، ئەوا دونیـا و ژیـانی سـەر زەوی دەبێتـە بەهەشتێکی بچکۆلانە و ژیـانێکی بەختەوەرانە، وە ئەگەر کەسێك بپرسێت: ئایا گەورەترین خۆشی دونیا کامەیە؟! ئەوا پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی دەداتەوە و دەفەرموێ: (الدُّنيا مَتاع وَ خيرُ مَتاعِ الدُّنيا المَرأةُ الصّالحة) رواهُ مُسلِم(١٤٦٧).

دونیا و ژیانی سەر زەوی (ئەگەر خوا نەناسان و بێدینان ناخۆشی نەکەن) ئەوە هەمووی خۆشی و ئاسودەییە و بەختەوەرییە و ژیان شیرینە، وە چاکترین و شیرینترین و خۆشترین خۆشییەکانی سەر ژیانی دونیا بریتی‌یە لە ئافرەتی گوێڕایەڵ و چاك و بۆ خوا صوڵحاو، صَدَقَ رسول الله ﷺ بەڕاستی هەموو خۆشییەکان بەسراون بە ژنی باش و ڕێکوپێکەوە، چونکە پیاو هەرچەندە گەورە بێت، هەر چەند دەوڵەمەند بێ، هەرچەندە ناودار بێت، هەرچەندە خاوەنی چەندان کوڕ و کچی باش بێ، خاوەنی قەوم و هۆزی زۆر بێ، لە هیچی کەم نەبێ، ئەگەر ژنی نەبوو، یان ژنێکی هەبوو کە گوێڕایەڵ نەبوو، کە دەمەوەر بوو، کە ناپاك بوو، کە ئەوەی شەرع دەیفەرموو بەو شێوەیە مافی مێردەکەی نەدەدا

ئەوە بەڕاستی ئەو پیاوە هەر ناتەواوە و هەر هەژارە، هەر نەدارە، هەر بێ پشتیوانە، هەموو ژیانی ژانە، وە لەزەت و خۆشی لە هیچ شتێ لەوانە نابینێ کە ئەم هەیەتی و خەڵکی بەخیلی پێ دەبەن و خۆزگەی پێ دەخوازن، بەڵام بێئاگا لەوەی کە ئەم پیاوەش خۆزگە دەخوازێ بە کەسێك کە ئەگەر نانی بەیانی هەبێ هی ئێوارەی مسۆگەر نییە، ئەگەر جل و بەرگەکەی بدڕێ پارەی نییە بەرگێکی تازە بکڕێ، ئەگەر بمرێ کەس نییە میراتی لێ بگرێ، چونکە منالی نەبووە، ئەگەر ستەمی لێ بکرێ کەس نییە پشتیوانی لێ بکات و بە هانایەوە بێت، چونکە بێ کەسە و قەوم و عەشیرەتی نییە، بەڵام زۆر بەختەوەر و دڵشاد و دەم بە خەندەیە و هەموو کاتێکی ژیانی بەهارە و بەڕاستی ژیانی ژیانە، چونکە گەورەترین خۆشی دونیای هەیە کە لە دوای ئیمان و خواناسی و دینداری لە هەموو خەڵاتێکی خوا گەورەترە کە ژنی چاك و گوێڕایەڵە، چونکە هەرچەندە نەدار بێ، ئەم ژنە بۆڵە و پرتەی بەسەردا ناکات، ناشوکری ناکات، هەرچەند لە دەرەوەی ماڵ کار و پیشەی قورس و تاقەت و توانا پروکێن بێ کە هاتە ماڵەوە بە یەك زەردەخەنە ژنەکەی ماندوو بوونی لە لاشە دەردەکات و ڕۆحی ئاسودە دەکات، ئەگەر هەموو خەڵکی سەر زەوی ناحەزی بن، کە هاتە ماڵەوە ئەمین و دڵنیایە چونکە خێزانەکەی لە خۆی زیاتر دڵسۆزە بۆی، بە کورتی ئەم پیاوە (خَيـرُ مَتَـاعِ الدُّنيا)ی هەیە کە بریتییە لە (المَرأَةُ الـصَّالحة) وە ئەوەی باسمان کرد بۆ پیاو بۆ ژنیش بە هەمان شێوەیە، گەورەترین خۆشی ژیان بۆ ژن بریتییە لە پیاوێکی صالح و دیندار و ڕەوشت بەرز و بەوەفا و دڵسۆز، بەڵام بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی ژنی کرد و باسی پیاوی نەکرد، چونکە

ژن ئەوەندە گەورەیە و ئەوەندە دەوری کاریگەری هەیە لەسەر ئاسودەیی و بەختەوەری ماڵ و منداڵ و مێرد، کە پیاو ناگاتە ئەو پلەیە لە خۆش بەختی و بەختەوەری دروست کردن لە ناو خێزاندا، هەموومان دەیان نمونەمان لەبەرچاوە، کە چۆن ژنێکی سالار و سەرنگین هەر چەندە مێردەکەی خراپ بوبێ، دەست کورت بوبێ، بەڵام ئەم ژنە بە لێزانی و بەڕێزی خۆی نەیهێشتووە کەس بە حاڵیان بزانێ و سەرەنجام کاریگەری کردۆتە سەر هاوسەرەکەی و کردوویەتی بە پیاوێکی بەڕێز و باش، لە کاتێکدا پیاو ناتوانێ ئاوا خراپەی ژنەکەی بشارێتەوە و دان بە خۆیدا بگرێ و خەڵکی بە ژیانی خێزانییان نەزانن!..

کەواتە: ئەگەر هاتوو ژن و مێرد بەیەکەوە ڕێکوپێك و گونجاو و تەبابن، ئەوا ژیانی دونیایان بەهەشتۆکەیەکی جوان و دڵگیر دەبێ و لە قیامەتیش سەرەنجامیان بەهەشتی بەرین دەبێ إنشاء الله قورئانی پیرۆز چەند جوان ئەو دیمەنەمان بۆ دێنێتە بەر چاو و دیدە کە خوای گەورە لە قیامەتدا بانگی پیاوێك دەکات و دەفەرموێ: بڕۆ بۆ بەهەشت، بەڵام هەر بە تەنها نا، بەڵکو بڕۆ دەستی خێزانەکەشت بگرە و ئێوە لە دنیادا بۆ ساتێك نەتاندەتوانی بێ یەکتری بژین، دەی ئەمڕۆش نابێ لە یەکتری جیاببنەوە و بەیەکەوە بڕۆنە بەهەشتەوە.

ئیمانداران: فەرموون با بە گوێی دڵ گوێ لەم چەند ئایەتە موژدە بەخشە خۆشانە بگرین و کە لێبوینەوە لە خوێندنەوەی هەموومان دوعا بکەین و لە خوا بپاڕێینەوە و بڵێین: خوای پەروەدگار بە ڕەحم و بەزەیی خۆی ئێمەش و خێزانەکانیشمان یەکێك بین لەو کەسانەی کە ئەم چەند ئایەتە قورئانییە باسیان دەکات، اللّهم آمین... خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ۝ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٖ مِّن ذَهَبٖ وَأَكۡوَابٖۖ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ۝ وَتِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ۝ لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ كَثِيرَةٞ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ﴾

الزخرف: ٧٠-٧٣

واتــە: پێیــان دەوتــرێ: فــەرموون بــچنە بەهەشــتەوە، خۆتــان و هاوسەرانتان، خۆتان و ئەوانەی وەك ئێوە خواناس بوون و لـەوێ ژیـانی کامەرانی و شادی و بەختەوەریتان پێ دەدرێت.. لەسەر سینی و کوپی ئاڵتون جۆرەها خـواردن و خواردنـەوەی جـوان و ڕازاوە و تـام خـۆش و بۆن خۆشیان بەسـەردا دەگێڕن و لـەو بەهەشتەدا هەرچی نـەفس حـەزی لێ بکات و دڵ بیخوازێت و چاو حـەز بە دیتنی بکات ئامادەیە و ئێوە ئـەی خوانـاس و پاکـان، ژیـانی هەمیشـەیی و نەبڕاوەشـی تیـادا دەبەنـە سـەر، خـوای میهرەبـان ئەوەنـدەی تـر دڵخۆشـیان دەکـات، کاتێـك پێیـان دەفـەرموێت: ئـا ئەوبەهەشـتەی کـە ئێـستا ئێـوە بوونەتـە خـاوەنی، وەك میراتی شایستەی خۆتانـە، بەهۆی ئەو کـار و کردەوانـەی کـە دەتـانکرد، میوەهـاتی زۆر و هەمـە جـۆر تیایـدا بۆتـان ئامادەیـە و لێـی دەخـۆن و هەرگیز تەواو نابێت و کەم ناکات..

ئیمانـداران: خـوای گـەورە کـە باسـی ژن ومێـرد دەکـات بـۆ یـەکتر دەفــەرموێ:﴿هُنَّ لِبَاسٞ لَّكُمۡ وَأَنتُمۡ لِبَاسٞ لَّهُنَّ﴾ واتــە: خێزانــەکانتان پۆشـاکن بـۆ ئێـوە و ئێـوەش پۆشـاکن بـۆ ئـەوان) لـە تەفـسیری صَـفْوَةُ التَفاسـیردا هـاتووە: إبـن عبـاس فەرموویـەتی:﴿هُنَّ لِبَاسٞ لَّكُمۡ وَأَنتُمۡ لِبَاسٞ لَّهُنَّ﴾. واتە: چۆن خانوو ماڵ جێگای حەسانەوە و پشودان و دڵنیاییە و

مـرۆڤ لـە هـەموو مەترسـییەك دەپـارێزێ، ئـاوا ژن و پیـاو دەبنـە هـۆی حەوانـەوە بـۆ یـەکتر و پاراسـتنی یـەکتری لـە داو و پیلانـی شـەیطـان و ئارەزوی خراپ.

وە هەروەها لە (تلخيص البيـان)دا دەفەرموێ: مانـای ئایـەتی: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ﴾ ئەوەیـە: (المُـراد قـرب بعـضهم مِـنْ بَعـض و إشْتمالُ بَعضَهم عَلى بَعض كَما تَشْتَمِلُ المَلابسُ عَلى الأجسام). چۆن جل و بەرگ هەموو لاشە دادەپۆشێ و لە سەرما و گەرما و دەرکەوتنی ناشرین مرۆڤ دەپارێزێ و لە هەموو شتێك جل و بەرگەکەی بەرت لێت نزیکە، بە هەمان شێوە ژن و پیاویش بۆ یەکتری ئاوان..

بەڵام بەداخەوە هەندێ جار ئەم بەهەشتە بچکۆلەیە دەبێ بە دۆزەخ، ئەو جل و بەرگە داپۆشە دادەماڵرێ و عـەیب و عار دەردەکـەوێ ئـەویش بە هۆی ناپاکی هاوسەرێتیەوە (الخِيانة الزَوجيَّة)

بەڕێزان: خیانەت و ناپاکی نێوان ژن و مێرد چەند جۆرێکی هەیە کە ئاماژەیان پێ دەکەین:

١ـإفـشاء أسـرار الزَوجيَّـة: ئاشـکراکردنی نهێنیـەکانی نێـوان ژیـانی هاوسەری، کە کۆمەڵێك نهێنی تایبەتی هەیە لە نێوان ژن و مێرددا کە بە هـیچ شـێوەیەك نـابێ لـە ژووری نوسـتن بێنـە دەرەوە، وە لای نـزیکترین کەسـی ژن و مێـردیش بـاس بکـرێن، کـە ئـەویش باسـکردنی چـۆنێتی جوتبـوون و ئـەو هەڵسوکەوتانەی کـە لـەو کاتـەدا ژن و مێـرد بـە یەکـەوە ئەنجامی دەدەن، ئەمە ئەمانەتێکی نێوان ژن و مێردە و هەر کامێکیان لـە هـەر شـوێن و لای هـەر کەسـێك باسـی بکـات ئـەوا خیانـەتی کـردووە بـە

درکاندنی ئەو نهێنییە.. پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: (إنَّ مِن شَرِّ النّاس الرَّجُلُ يَفْضي إلى المَرْأة و تَفْضي إليه، ثُمَّ يَنْشرُ سِرَّها).

واتە: لە خراپترینی هەموو خەڵکی ئەو ژن و پیاوەن کە باسی نهێنی کاتی جووتبوون و سەر جێگایان بۆ خەڵکی باس دەکەن و ئەو نهێنییەی نێوانیان بڵاو دەکەنەوە..

کەواتە: دەبێ ژنی موسڵمان وە پیاوی موسڵمان ئەوەندە ڕێزی ئەو پەیوەندییە تایبەتی و نهێنییەی لا بێ لە لای هیچ کەسێك باسی ئەوە نەکات چی لەگەڵ هاوسەرەکەی کردووە، یان هاوسەرەکەی چی لێ کردووە، ئەگینا ئەوە خیانەتی هاوسەریەتی لەم لایەنەوە ئەنجام داوە.

٢- الخيانــة الماليّــة: ناپاکی لە بواری سامان و داراییدا، ژن و پیاو دەبێ گەیشتبنە ئەو قەناعەتەی کە ئەو ماڵ و سامانەی کە هەیانە هی هەردوکیانە و نابێ بە بێ پرس و بە نهێنی یەکترەوە لێی خەرج بکەن، بە داخەوە هەندێ ئافرەت زۆر زیادەڕۆیی دەکات لە خەرج کردنی پارەدا و مێردەکەشی ئاگای لەمە نییە، بەڵام ئەو کارە ناپاکییە و تەنانەت ژن نابێ خێر و صەدەقە بکات لە پارە و ماڵی ناو خێزانەکەی کە لە سنوری عورف و عادەت دەربچێ ئەگەر بزانێ مێردەکەی پێی خۆش نییە و ڕازی نییە، ئەو کاتە خوای گەورە لێی قبوڵ ناکات، وە نابێ بۆ خەرجی ژیانی ڕۆژانەی خۆی و منداڵی و میوانی ماڵیان بە بێ پرسی هاوسەرەکەی پارە هەڵبگرێ و خەرج بکات، مەگەر لە کاتێکدا ئەو پیاوە زۆر چروك و بەخیل بێت و ئامادە نەبێ پارەیەك دابین بکات بۆ خەرجی ڕۆژانەی ژن و منداڵ و میوانی، ئەو کاتە ئەوژنە بۆی هەیە بە پێی پێویست پارە خەرج

بکات با مێردەکەشی پێی نەزانێت، بەڵام نابێ لە سنور دەربچێ و ئیسراف و زیادە مەصرەف بکات، وە چەند جاریش هەوڵی لەگەڵ مێردەکەی دابێ بەڵام بێ سوود بێ و هەر ئامادە نەبێ کە پارەیان بۆ دابین بکات، هەروەکو لەم بارەیەوە ئەو فەرمودەیەمان بەدەستەوەیە کە جارێکیان: هیندی خێزانی ئەبو سوفیان هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ و عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خواﷺ: ئەبو سوفیانی هاوسەرم پیاوێکی زۆر پارە خۆشەویستە و ئامادە نییە کە پارەیەك بخاتە بەردەستم کە ڕۆژانە بۆ خۆم و منداڵەکانم بەکاری بهێنم، ئایا بۆم هەیە بە دزی ئەوەوە پارە لە گیرفانی دەربکەم و ژیانی خۆمانی پێ دابین بکەم؟! پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: مادام وابێ بۆت هەیە پارە لە گیرفانی هەڵبگری با پێشی نەزانێ، بەڵام نابێ تۆش ئیسراف و زیادە ڕۆیی بکەی و لە پێویستی ئاسایی خۆت و منداڵەکانت زیاتر هەڵبگری.

لەبەر ئەوە خوشکی بەڕێزم: زۆر زۆر خۆت بپارێزە لەوەی کە بە بێ ئاگاداری هاوسەرت کەمترین پارە خەرج بکەیت و هەڵ بگریت، چونکە هەر ئەوەندە یەك جار هاوسەرەکەت بەم کارەی زانی، ئیتر هەتا هەتایە سیقە و متمانەت پێ ناکات و بە ناپاکت دەزانێ.

وە ئەی پیاوی بەڕێز تۆش هەرگیز لەوەی کە لە توانای دارایت دایە درێغی لە ژن و منداڵ و میوانت مەکە و ئەو ژنە پاکەت وا لێ مەکە کە ناچاری بکەیت بۆ ژیانی خۆی و منداڵی بە بێ پرسی تۆ پارە لە گیرفانت دەربهێنێ، چونکە ئەو کاتە تۆ ناپاکیت کردووە، کە ئەو دەستپاکەت ناچاری ئەو کارە ناشرینە کردووە.

وە ئەوەی باسمان کرد هەر تایبەت نییە بە ژنەوە، بەڵکو پیاویش دەگرێتەوە، چونکە پیاویش دەبێ ئەو ڕاستییە بزانێ کە ئەو پارەی گیرفانی تەنها هی خۆی نییە، بەڵکو بەشی ژن و منداڵەکەشی پێوەیە و ئەویش نابێ بە بێ پرسی خێزانەکەی و ڕەزامەندی ئەو لێی خەرج بکات، وە گەورەترین خیانەتی بواری داراییە کە پیاو لە ژنەکەی خۆی دەکات کاتێ کە ئەو پارەی ماڵ و گیرفانی دەدات بە جگەرە و عەرەق و لە جیاتی بۆنی عەتر بە بۆگەنی عەرەقەوە ئەچێتە ماڵەوە، پیاوی وا هەیە منداڵەکەی موحتاجە بۆ قتویەك شیر، بۆ کراسێك، بۆ جوتێ پێڵاو کەچی ئەم پارە دەدات بە شتێك کە عەقڵی خۆی پێ لەدەست دەدات و وەکو شێتێکیش خۆی دەکاتەوە بە ماڵدا و بەسەر خێزانیدا دەڕشێتەوە و هێشتا دەیەوێ خێزانی پێشوازی لێ بکات.

٣-الخِیانە الجَسَدِیَّة: ناپاکی لاشەیی، کە لە هەموو خیانەتەکان گەورەترە و ئەمەش چەند جۆرێکی هەیە:

**یەکەم:** پیاوی وا هەیە کاتێ لەگەڵ خێزانەکەیەتی وا ئەزانێ کە ژنەکەی کە لە لایەتی ئافرەتێکی ترە!.

**دووەم:** ژن یان پیاو قسەی نەرم و دەنگ ناسك کردنەوە و ڕوانینی بە مانا ئەدات بە کەسێکی نامەحرەم، کە لە شەرعدا حەرامە بەو شێوەیە ڕەفتاری لەگەڵ بکات.

**سێیەم:** حاڵەتی هەرە گەورەی خیانەت و لوتکەی ناپاکی هاوسەریە کە بریتییە لە جووت بوون لەگەڵ کەسێکی تردا غەیری خێزان یان هاوسەری خۆی، کە لەم حاڵەتەدا تاوانەکە ئەوەندە گەورەیە، هەر کام لە ژن و مێرد ئەم ناپاکییە گەورەیە ئەنجام بدات دەبێ ڕەجم بکرێ و بەرد

باران بکرێ تا لە ژێر بەردا دەمرێ بەو شێوەیەی کە لە باسی ڕەجمی زیناکاردا باس کراوە.

بەڕێزان خیانەتی هاوسەر لە هاوسەری ژیانی، کۆمەڵێك هۆکاری تایبەتی خۆی هەیە، لەو هۆکارانە:

١. لە ناو ژن و پیاودا کەسانێك.هەن دەروون نەخۆشن و لە سەرەتای تەمەنی هەرزەکاری و لاویەتیانەوە، فێری تەماشاکردنی نامەحرەمانە و ناشەرعیانە بوون بۆ ڕەگەزی بەرامبەریان و خوو و خەیاڵ و بیریان لای ڕەگەزی بەرامبەرە و ئەم جۆرە کەسانە کاتێ کە دەشبنە خاوەنی هاوسەری ژیانیان ئەم ڕەوشتە ناپەسندەیان بۆ تەرك ناکرێ و کورد وتەنی: (خوی شیری هەتا پیری)، هەر بۆیە ئاینی ئیسلام کە سەرچاوەی هەموو بەختەوەرییەکی مرۆڤە و قەڵغانی پتەوی پاراستنیەتی لە هەموو نەهامەتییەك و دوا ڕۆژ ڕەشییەك، هەر لەو کاتەوەی کە کوڕ و کچ خۆیان دەناسن فەرمانیان پێ دەکات کە چاویان لە ئاستی تەماشاکردنی ڕەگەزی بەرامبەریان بپارێزن و قەدەغەی کردووە کە بە تەنها لە شوێنێکدا بە یەکەوە کۆببنەوە و دابنیشن و گفتوگۆ بکەن، بۆ ئەوەی لێیان نەبێتە خوڕەوشتێکی نەگۆڕاو و چەسپاو کە لە دوای ژیانی هاوسەریش نەتوانن وازی لێ بهێنن و سەرەنجام توشی ناپاکی هاوسەری بن، لەبەر ئەوەی ئەو کەسانە کە ئافرەتی حەڵاڵی خۆیان هەیە و کەچی پەلاماری حەرام دەدەن و زینا دەکەن ئەوە سەرەنجامی نەزر و تەماشا کردنی حەرام و قسە کردن لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەر و دەنگ ناسك کردنەوەی کاتی پێش هاوسەری و هەرزەکاریە.

٢. گوێ نەدانی پیاو و ژن بە یەکتری: پیاوی وا هەیە ڕوو لە ژنەکەی ناکات، یان ژنی وا هەیە بە ساڵ ناهێڵی پیاوەکەی لێی نزیك بێتەوە، لەم کاتەدا ئەگەر ئەو ژنە یان ئەو پیاوە ئیمانێکی تۆکمە و پتەوی بە چاودێری خوا و سەرەنجامی ناپاکی هاوسەری نەبێ ئەوە بۆ تێر کردنی ئارەزووی جنسی خۆی پەلاماری حەرام دەدات و توشی زینا دەبێت.

ئیمانداران: زەمانی حەزرەتی (عومەری کوڕی خطاب) خەلیفەی دادگەر، کە بە هۆی دادگەرییەکەیەوە چاوی هاولاتی بە شێوەیەك کرابۆوە،کە داوای هەموو مافێکی خۆی لە ڕێگای یاسا و دادگای شەرعەوە دەکرد، ئافرەتێکی موسڵمانی ژیر (کە ئەم ئافرەتە نمونەی ئافرەتی موسڵمانی هۆشیارە کە ئەگەر ئێستا بوایە دەیانگوت ئافرەتێکی بێ شەرمە، یان خۆ عومەر و دادگای پڕ دادگەری ئیسلام نییە ئافرەت شکاتی خۆی بکات)، ئەم ئافرەتە ژیرە دڵ پڕ لە ئیمانە هاتە خزمەت خەلیفە عومەر و عەرزی کرد: مێردەکەم بە ڕۆژ هەر بەڕۆژووە و شەویش هەتا بەیانی لەسەر بەرماڵ لاناچێت و هەر خەریکی شەونوێژ و زیکر و دوعا و قورئان خوێندنە حەزرەتی عومەر فەرمووی: دەی یاخوا لەشی ساغ بێت جا ئیش لەمە باشتر دەبێ؟! بەلام ئەم ئافرەتە دەزانێ کە ئەم خواناسی و عیبادەتە کارێکی زۆر باشە بەلام ئیسلام فێری کردبوو کە دەبێ داوای ماف خۆشی بکات، وە مێردەکەشی فێر بکات کە چۆن لەسەری پێویستە ماف خوا بدات ئاواش لەسەری پێویستە ماف لاشەی و ماف ژنی بدات، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (إنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقاً وَ إنَّ لِبَدَنِكَ عَلَيْكَ حَقّاً، وَ إنَّ لِزَوْجِكَ عَلَيْكَ حَقاً) بەڵێ ئیسلام ئافرەتی فێر کرد کە داوای ماف خۆی بکات، نەك ئسلام

ماڤ ئافرەتی پێشێل کردبێ!. وە ئیسلامە کە ئەوەندە ئافرەتی فێری ئەدەب و حورمەت کردووە کە ئاوا بە ئەدەبە، ئاوا بە جوانی داوای ماڤ خۆی دەکات، ئەوەندە داواکاریەکەی بە ئەدەبەوە باس دەکات سەرەتا حەزرەتی عومەر لە مەبەستی ناگات، بۆیە دواتر لە مەبەستی تێدەگات و کابرا ئاگادار دەکاتەوە کە دەبێ ئاگای لە ماڤ هاوسەرەکەشی بێت لە بواری جنسیەوە و ئەو مافەی بۆ دابین بکات.. هەر لەبەر ئەوەشە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: هەر کاتێ پیاو داوای کاری سەرجێگای لە خێزانی حەلاڵی خۆی کرد و ئافرەتەکەش هیچ ڕێگەیەکی ناشەرعی لە بەردەمدا نەبوو، بەلاّم وەلاّمی مێردەکەی نەدایەوە و پشتی تێ کرد و لەگەڵی نەخەوت ئەوە هەتا بەیانی فریشتەکان نەفرەتی لێ دەکەن!.

وە بێگومان ئەگەر پیاویش گوێ بە خێزانی نەدات و لەگەڵیا نەخەوێ و خۆی لێ تورە بکات توشی گوناهی گەورە دەبێت.

٣. تێکەلاّوی لەگەڵ نامەحرەم، پیاو لە ماڵ دەچێتە دەرەوە و دەچێتە هۆڵێکی شاییەوە کە ئەوەی تێدا ئەنجام دەدرێ تەنها لە شایی و خۆشی و ئاهەنگی بوك گواستنەوە ناچێ ئەگینا لە هەموو شێت و شێتخانە و سەما خانەیەك دەچێ، ئەو پیاوە کە بە چاو ڕاو دەکات ژنێك یان کچێك لەو ئاهەنگەدا دەبینێ یان دەستی دەگرێ و لەگەڵیا هەڵدەپەڕێ کە ئەو ئافرەتە چەند سەعات خەریکی خۆرازاندنەوەی خۆی بووە و هەموو لاشەی بۆیە کراوە و ڕووی ڕاستەقینەی خۆی شاراوەتەوە، ئەم پیاوە کە سەرنجی ئەم ئافرەتە ڕازاوە دەدات، دەیخاتە بیر و خەیاڵیەوە و شەیطانیش ئەوەندەی تر لە بەرچاوی جوان دەکات، کاتێك دێتەوە بۆ ماڵەوە و خێزانی خۆی دەبینێ کە خەریکی کار و باری ماڵ و بەخێو کردنی منالّ بووە و نەیتوانیوە وەکو پێویست خۆی ئامادە

بکات و برازێنێتەوە وا دەزانێ ئەم ژنەی خۆی هیچ جوانییەکی نییە و ئەو ئافرەتە نا مەحرەمانەی دێنەوە بەرچاو ودیدە کەچاو و مێشکی پڕە لە وێنەکانیان و ئەمجا خێزانەکەی خۆی بەرچاو دەکەوێ و بە بێ هیچ هۆیەك لە خێزانی ماندوو نەناسی خۆی لالوت دەبێ و سەرەنجام بەرەو خیانەتی لاشەیی دەڕوات چونکە خیانەتی لە هاوسەرکەی کردووە و بە تەماشا کردنی ئافرەتی بێگانە و دەست خستنە ناو دەستی و شایی لەگەڵ کردنی.

وە بە نیسبەت ئافرەتیشەوە هەر بە هەمان شێوەیە.

٤. هاوڕێی خراپ بۆ ژن و پیاو، کە ئەو کەسانەی کە ناپاکی هاوسەرییان کردووە بەو چاوەشەوە سەیری هەموو کەس دەکەن و حەز دەکەن هەموو کەسێك وەکو خۆیان بێ و باس و قسەی دانیشتنیان هەر ئەو باسە بۆگەن و نەشیاوەیە، زانایان فەرموویانە: (الزَّانـي يَحلِـفُ أنَّ جَميع النِّساءِ خائنـاتُ، و الزَّانيَـةُ لا تَتَـصَوَّر أنَّ هُنـاكَ إمْـرَأةُ شَـرِيفَة) واتە: پیاوی داوێن پیس سوێند دەخوات کە هەرچی ئافرەتە ناپاکی هاوسەری کردووە، وە ژنی داوێن پیسیش گومان نابات کە ئافرەتێك هەبێ داوێن پاك بێت و خیانەتی هاوسەری نەکات، بۆیە حەز دەکات هەموو کەس وەك خۆی وابێت، وە هەر کەسێ هاوڕێیەتی و تێکەڵی ئەو جۆرە ژن و پیاوانە بکات ئەوا دەچێتە سەر ڕەفتار و ڕەوشتی قێزەونی ئەوان، یان لانی هەرە کەم لە لایەن خەڵکیەوە بە چاوی گومانەوە تەماشای دەکرێت.

٥. دەزگاکانی ڕاگەیاندن، بە بینرا و خوێنراوەوە، کە ئەو هەموو فیلمە نیشان دەدەن هەمووی سەرەنجام و کرۆکی باسەکەی بریتییە لەوەی کە چۆن ژن حەز لە پیاوێکی تر دەکات غەیری مێردەکەی خۆی و

چۆن پیاو موعجەبە بە ژنێکی تر غەیری خێزانەکەی خۆی و چۆن پەیوەندی خۆشەویستی دروست دەکەن، وە گۆڤارەکانیش زۆریان پڕن لە چیرۆك و بەسەرهاتی داوێن پیسان کە ئەو باسانە دەبێ بمرێنرێن، نەك بنوسرێن و وا لە خوێنەر بکرێ کە ئەمە شتێکی ئاساییە کە ئافرەتێك جگە لەوەی کە خیانەتی هاوسەری کردووە مێردەکەشی کوشتووە!!..

کار نەکردن بە شەرعی خوا و جێبەجێ نەکردنی فەرمانی خوا بەسەر ژن و پیاوی زیناکاردا کە دەفەرموێ: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ النور:٢، واتە: ئافرەتی زیناکار و پیاوی زیناکار هەریەکەیان سەد قەمچییان لێ بدەن (ئەمە ئەگەر کوڕ و کچ بوون و ژیانی هاوسەریان پێك نەهێنابوو)، بەزەیی نەتانگرێت لە بەجێهێنانی فەرمانی خوادا بۆیان، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خوا و ڕۆژی دوایی هێناوە، با دەستەیەکیش لە ئیمانداران ئامادەی سزاکەیان بن.

سُبحان الله، تاوانی داوێن پیسی ئەوەندە گەورەیە کە نابێ ئەم یاسای سزادانە لە هیچ زەمان و زەمینێکدا بوەستێنرێ لە کارکردن بە هەر ناو و بەهانەیەکەوە بێ، وەکو دروشمی ماف مرۆڤ و ئازادی شەخصی و چی و چی کە ئەمڕۆ بێ دینەکان دەڵێن: ئەگەر هەردوو ڕەگەز ڕازی بوون لەسەر ئەو زینایە ئەوا سزا نادرێن، بۆیە قورئان فەرمووی: ﴿وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ لە تەفسیری کەبیردا هاتووە: (قالَ مُجاهِد: لا تعطلوا حُدُودَ اللهِ وَ لا تترکُوا إقامتها شفقة وَ رحمة)..

وە ئەگەر هاتوو ئەو کەسەی کە داوێن پیسی کردبوو، خاوەنی هاوسەر بوو، ئەوە تاوانەکەی زۆر گەورەترە و جگە لەوەی کە زوڵمی لە خۆی و لە شەخصیەت و کەسایەتی خۆی و دین و ئیمانی خۆی کردووە و ستەمی لە کۆمەڵگا کردووە چونکە زینا دەبێتە هۆی چەندین نەخۆشی ترسناکی بێ چارەسەری کۆمەڵگا هەڵوەشێن وەکو ئایدز، وە ستەمی کردووە لەو هاوسەرەی خۆی، لەو هاوجووت و هاوژینەی کە پەیمانی پێ دابوو کە هاوسەرێکی بەوەفا بێت لەگەڵی و خیانەتی لێ نەکات، ئێستا وا ماڵی ئەویش و کەسایەتی ئەویشی ڕوخاند، بۆیە دەبێ بەردباران بکرێ و لەژێر بەردا بمرێ و ئەو میکرۆبە ژێر زەوی بخرێ و بکرێت بە پەند و عیبرەت بۆ هەموو ئەو کەسانەی ڕۆژێك لە ڕۆژان بیر لە خیانەتی هاوسەری بکەنەوە!

وە هەر بەمەش ناپاکی هاوسەری و زینا نامێنی یان لانی کەم زۆر دەگمەن دەبێ،بەڵام یاسای مرۆڤ دەڵێ: سزاکەی زیندانی کردنە و پاش تەواو بوونی حوکمەکەی موعەزەز و موکەرەم وەکو نە بای دیبێ و نە باران، نە لانە و خانەی کەسێکی تێك دابێ نە کەسایەتی خۆی و کەسێکی ڕوخاندبێ، جارێکی تر دەست دەکاتەوە بەو کارە قێزەونەی و دەیان کەسی تریش چاوی لێ دەکەن و بە کارێکی سادە و ساکار دێتە بەرچاویان!.

ئیمانداران: ئەگەر ژن یان پیاو هەستی بەوە کرد یان گوێبیستی ئەوە بوو کە هاوسەرەکەی ناپاکی لەگەڵ کردووە و دەستی لەگەڵ کەسێکی تر تێکەڵاو کردووە، ئایا چی بکات لەم کاتەدا؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: نابێ ژن و پیاو گوێ بۆ قسە و قسەڵۆکی هەموو کەس بگرن و ئەبێ لەوە وشیارتر بن کە بیستنی هەر قسەیەك لە هەر

کەسێکەوە ڕاستەوخۆ بڕوابکەن چونکە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بەداخەوە کەسانێکی زۆر تەنها و تەنها ئیشیان بۆتە ئەوەی کە دڕك بخەنە نێوان ژن و مێردەکانەوە و خانە و لانەیان لێ بشێوێنن و پاشان پێیان پێبکەنن، قورئان دەفەرموێ:﴿إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾ هەتا بۆ خۆت بە چاوی خۆت شتێك نەبینی بڕوا بە کەس مەکە کە قسەت بۆ دەگێڕێتەوە، چونکە ئەوە فاسقە، وە مێژوو پڕیەتی لە بوختان هەڵبەستن بۆ داوێن پاکان، مەگەر بوختان بۆ دایکی ئیمانداران نەکرا و عائشەی داوێن پاك تۆمەتبار نەکرا بە زینا کردن –پەنا بە خوا– کەچی پێغەمبەری خوا ﷺ کە ژیانی بەم هەواڵە دڵ تەزێنە و ناخ هەڵتەکێنە بوو بە ژان، هەر ئارامی گرت و بڕیاری بەپەلەی دەرنەکرد هەتا قورئان هاتە خوارەوە و باسی پاکیەتی عائیشەی سەلماند و بوختان چییان و دووڕوانی خەجاڵەتی دونیا و دوا ڕۆژ کرد.

جارێکیان: پیاوێك بە شپرزەیی، بە ڕوخسار و ڕەنگێکی ئاڵۆزەوە کە تەعبیری لە ناخ و دڵی بە ئازاری دەکرد، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و عەرزی کرد، هاتووم ڕاوێژ بە جەنابت بکەم لە بارەی ئەوەوە کە دەمەوێ ژنەکەم تەڵاق بدەم و لێی جیا ببمەوە، (لێرەدا ژیری ئەم پیاوە دەردەکەوێ کە هاتووە ڕاوێژ بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەکات و کوتوپڕ بڕیار دەرناکات و بە گومانێك ماڵی خۆی و کەسایەتی خۆی و خێزانی لەناو نابات).. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئاخر لەسەر چی و چ هۆکارێك وای لێ کردوویت کە ئەم بڕیارە سەختە بدەی و لەو ژنەی کە خۆت باسی دەکەی چەند منداڵتان هەیە و چەندین ساڵە بەیەکەوەن و ئاوی تاڵ و شیرینتان بە یەکەوە خواردۆتەوە جیا ببیتەوە؟!! وتی: ئەی

پێغەمبەری خواﷺ من گومانم لە ژنەکەم پەیدا کردووە کە ناپاکی هاوسەری لەگەڵ کردبم و دەستی لەگەڵ پیاوێکی تر تێکەڵاو کردبیٚ!.
پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئاخر هیچت لیٚ بینیوە؟! وتی: نەخێر، بەڵام گومانەکەم لەوەوە بۆ دروست بووە کە من خۆم پیاوێکی سورەم و ژنەکەشم سپی پێستە، هەر منالێکمان بوە، سپی پێست یان سورە بووە، کەچی ئەمجارەیان کە منالمان بووە منالییێکی ڕەش پێستە، بۆیە وا گومان دەبەم کە ئەم منالە لە من نەبیٚ و لە پیاوێکی ڕەش پێست بیٚ!!..

پێغەمبەری خواﷺ زانی ئەم پیاوە چۆن تێبگەیەنیٚ، (هەزاران هەزار صلاوات لە دیداری نورینت بیٚ ئەی پێغەمبەری خواﷺ کە ئاوا فریادرەسی هەموو کەس بووی و هەموو کەس ڕزگار دەکەیت لە خلیسکان و لادان ئەگەر وەکو ئەو کابرایە بێتە خزمەتت و لە دوای وەفاتت بێتە خزمەت فەرموودەکانت و ڕاوێژت پیٚ بکات)، فەرمووی: باش گوێم لیٚ بگرە و بیربکەوە پرسیارێکت لیٚ دەکەم، کابرا وتی: بەلیٚ ئەی پێغەمبەری خواﷺ گوێم لێتە..

فەرمووی: تۆ حوشترت هەیە؟! وتی: بەلیٚ حوشتری زۆرم هەیە و هەموو ژیانم بە بەخێوکرنی حوشترەوە بەسەر بردووە، فەرمووی: ڕەنگیان چۆنە؟! وتی: زۆربەیان حوشتری سورن، فەرمووی:قەت بینیوتە حوشترێکی سور بەچکە حوشترێکی ڕەشی بووبیٚ؟! وتی: بەلیٚ بینومە، فەرمووی: باشە هۆی ئەوە چییە؟! کابرا وتی: قوربان لەوانەیە چەند پشت لەوەو پێش لەو حوشترە نێرەکە یان مێیەکە حوشترێکی ڕەش هەبووبیٚ و ئەم بەچکە حوشترە دەچێتە سەر ئەو باوانە کۆنەی!.
پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ڕاست دەکەی و ئەم منالەی تۆش هەر بە

هەمان شێوە چۆتەوە سەر باوانێکی لە پشتی تۆوە یان دایکیەوە کە ڕەش پێست بووە! ئیتر خێزانی بەڕێزت هیچ ناپاکی و تاوانێکی نەکردووە و ئەم باسەی لە لا نەدرکێنی و دڵی نەرەنجێنی و هێلانەی لێ نەشێوێنی.

ئیتر کابرا ڕەنگی گەشایەوە، دڵی کرایەوە، مێشکی بوژایەوە، دەستی پێغەمبەری خوای ﷺ ماچ کرد و بە ڕووگەشی بەرەو ماڵ گەڕایەوە و ئەو گومانە بەدەی ڕەوایەوەو خۆشەویستی خێزانەکەی بۆ ناودڵی گەڕایەوە..

بەڵام ئەمڕۆ بەداخەوە زۆرێك لەوانەی کە پرس و ڕاوێژیان لەم باسە سامناکەدا پێ دەکرێ، لەجیاتی وەکو پێغەمبەری دڵسۆز و لێزان ﷺ کارەکە بەجوانی کۆتایی پێ بێنن، گومانەکە لە دڵی پرسیار کارەکە دەکەن بە ڕاستی و یەکسەر بڕیاری کوشتن بۆ ژن و فلان و فلان دەردەکەن و بێ دینانیش، بێ ئاگایانیش لە ئیسلامی حەق، ئیسلام و موسڵمانان بە کوشتنی ژنان تۆمەتبار دەکەن..

بەڕێزان: ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی بەربەستێکی پۆلاین لەبەردەم خلیسکان و توشبوون بە بەڵای گەورەیی ناپاکی هاوسەری دوای پشت بەستن و پاڕانەوە لە خوا کە بمانپارێزێ لەم خیانەتە هەرە گەورەیە ئەمانەن:

١. بیرکردنەوە لە چاودێری خوا و یەقین بوون بەوەی کە لە هەر جێگایەك بی خوای گەورە دەت بینێ، دەی مرۆۃ خۆی لە چاوی خەڵکی دەشارێتەوە، ئیتر چۆن دەبێ شەرم لە خوا نەکات کە لە هەموو شوێن و جێگایەك دەیبینێ! وە بیر کردنەوە لەو پاداشتە گەورەیەی کە خوای گەورە لە دونیا و قیامەتدا بۆ داوێن پاکانی داناوە، لە دنیادا بەوەی کە کەسایەتییەکی زۆر بەرز و بەڕێزیان هەیە و جێگای متمانەی خەڵکن و ببنە میوانی هەر کەسێك هەرگیز گومانی خراپیان پێ نابرێ، وە لە قیامەتیشدا یەکێ دەبێ لەو کەسانەی کە لە ژێر سێبەری عەرشی خوای گەورەدا دەبن،

٢. دورکەوتنەوە و خۆپاراستن لە تێکەڵاوی ئەو کەسانەی کە بە ناپاك ناسراون و گوێ نەگرتن بۆ قسە و باسی بۆگەنیان (کە هەیانە بە شانازییەوە باسی داوێن پیسی خۆی دەگێڕێتەوە!!) وە هاتوچۆ نەکردنی ماڵیان وە ڕێگە پێنەدانیان کە بێنە ناو ماڵ و منداڵت.

٣.هەر کاتێ پیاو لە دەرەوەی ماڵ ژنێکی بینی سەرنجی ڕاکێشا، با خێرا بگەڕێتەوە بۆ لای خێزانی حەلاڵی و ئارەزووی خۆی لە حەلاڵی خۆیدا دابنێ، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (إذا رَأى أحَـدكم إمـرَأةً فَأعْجَبَتْهُ فَلْيَأْت أهلَهُ فَإنَّ ذالكَ يُرَدُّ مافِي نَفْسه) رواهُ مُسْلِمْ.

٤. نەچوون بۆ ئەوشوێنە نا شەرعییانە کە ژن و پیاوی نامەحرەمی لێ تێکەڵاو دەبێ، وەکو هۆڵەکانی شایی و ئاهەنگی بووك گواستنەوە، کە غیرەت و جوامێری و پاکی لە ناو دەرونی ژن و پیاودا ناهێڵێ و سەرەتای بانگەشەکردنە بۆ داوێن پیسی، کە لە نەزەر و ڕوانین بۆ یەکتریو تەوقە لەگەڵ کردن و شایی و خۆ لەیەك هەڵسوون و بەرامبەر یەکتر پێکەنین، کە ئەمانە فرسەتن بۆ داوێن پیسان و دەروون نەخۆشان و خیانەت کاران کە حەزە گڵاوەکانیان تێر بکەن و سەرەنجامی زیناش هەر لەمانەوە دەست پێ دەکات، شاعیر فەرموویەتی:

(نَظْرَةٌ فَابْتِسامة ، فَسَلامْ فَكَلام فَمَوْعدُ فَلقاءُ)

ئای چەند کارێکی نا شایستەیە بە ڕێزی مرۆڤ و پیرۆزی ژیانی هاوسەری بوك و زاوایە لە یەکەم ساتی ژیانی هاوسەریدا دەبێ لە بەر چاوی یەکتر ئەو ژنەی دەست بخاتە ناو دەستی یەك بەیەکی ئەو هەموو پیاوە نا مەحرەمە گورگ دڵانە، ئەو پیاوەش کە زاوایە دەستی بخاتە ناو

دەستی یەك بەیەکی ئەو هەموو ژنە نا مەحرەمە نەشیاوانە،بە ناوی تەوقەی پیرۆزبایی لێ کردنەوە! کە لە ڕاستیدا پیرۆزبایی لێکردن نییە. ئاگر لە دین و ئیمان و ڕێز و حورمەت و پاکی خێزان بەردانە!. هەر خێزانێکیش سەرەتاکەی بەم هەموو بێ شەرعییە دەست پێ بکات بێ گومان عاقیبەتی هەر ئەوەیە دوای مانگێك دوو مانگ بووك و زاوای تازە لەیەك دەکەونە تەقە و تەڵاق.

حەیف بۆ موسڵمان کە یەکێ لە سیفاتە بەرز و باڵاکانی بوونی غیرەتە لەسەر ناموس و شەرەف کەچی بێدینان بەم ناوی هۆڵی شایی و ئاهەنگی بووك گواستنەوە و مۆدە و مۆدبازییەوە چۆن غیرەی موسڵمانانیان نەهێشت و ئەو بەرگی بووکە کە ڕەمزی پاکی و خۆشەویستیە کرا بە بەرگێك کە تەنها بەناو بەرگە، ئەگینا هەموو لاشەی ئەو بووکە بەدەرەوەیە و لە زاوا باشتر هەموو ئامادە بووان تەواوی لاشەی بوکەخان دەبینن و زاواش مووی لاشەی ناجوڵێ!!

٥.نوێکردنەوەی خۆشەویستی لە نێوان ژن و مێردا، چونکە بە تێپەڕبوونی کات و چەند ساڵێك و پەیدابونی منداڵ و گرانبوونی ژیان خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد ئاساییە ئەگەر کاڵبوونەوەیەك ڕووی تێ بکات، جا بۆ نوێکردنەوە و تازەکردنەوەی ئەو خۆشەویستییە پێویستە ژن و پیاو کۆمەڵێك هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتریدا ئەنجام بدەن کە هی سەرەتای بەیەك گەیشتنیانە لە کەژاوەی پیرۆزی هاوسەریاندا، با بچینە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ و بزانین ئەو سەروەر و پێشەوایەمان چی کردووە لەگەڵ خێزانی بەڕێزی خۆیدا، خاتوو عائشەی دایکی ئیمانداران بۆ ئەوەی هەموو ژن و مێردێکی موسڵمان

لەم خۆشی و خۆشەویستی نوێکردنەوەیە بێبەش نەبن، وەکو دایکێکی ماملۆستا و دڵسۆز کە لەگەڵ ئەو هەموو ئەدەب و شەرم و گەورەییەی خۆی لەبەر خاتری ئێمە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: (كُنْتُ أغْتَسِلُ أنا وَ رَسولَ اللهِ ﷺ من إناء واحد بَيني و بَينَهُ، فَيُبادرُني حَتَّى أقولُ لَهُ: دَعْ لي ، وَ هُما جُنُبان) رواه البخاري (٢٥٠)و مُسلم (٣٢١)

واتە:من و پێغەمبەری خوا ﷺ بەیەکەوە خۆمان دەشت و مەنجەڵێ ئاو لە نێوانماندا بوو، هەردووکمان ئاومان لەو مەنجەڵە دەردەهێنا و بە لاشەی خۆماندا دەکرد، پێغەمبەر ﷺ وەکو یاری و سوبعەتێك بۆ ئەوەی من بێنێتە قسە خێرا خێرا ئاوی بە خۆیدا دەکرد. تا منیش وتم: بەسە بەسە با ئەو تۆزە ئاوەی ماوە بۆ من بێت،وە لەم خۆشتنەدا هەردوکیان – پێغەمبەری خوا ﷺ و عائشە لەشیان گران بوو، وە خۆشتنی واجب بوو–.

کەواتە: هەرچەندە ژن و مێرد هەژار بن، لە خانویەکی سادە و ساکار و حەمامێکی بە قوڕ دروستکراودا بژین، وە تەنها مەنجەڵێ ئاویان هەبێ، دەتوانن لەسەر ئەو مەنجەڵە ئاوە و لەو ناو حەمامە سادە و ساکارەدا خۆشەویستی نێوانیان تازە بکەنەوە، وە چێژ و لەزەت لە کاتی خۆشتنەکەشدا بە دوو وشەی خۆش و زەردەخەنەیەکی پڕمانا بۆ یەکتر دەربڕن.

وە لەم کاتەدا کە ژن و مێرد بەیەکەوە خۆیان دەشۆن دروستە تەماشای هەموو لاشەی یەکتری بکەن، هەروەکو پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( إحْفَظ عَوْرَتَك إلا من زَوْجَتَك) دامێن و عەورەتی خۆت بپارێزە لەوەی کەس بیبینێ تەنها هاوسەری خۆت نەبێت!

زانای ناودار پێشەوا (إبن قُدامة) لە کتێبی (المُغني ج٧ ص٤٥٨)دا دەفەرموێ: (وَ مُباحٌ لكُل واحد منَ الزَّوجَيْنِ النَّظَرُ إلى جَميع بَدَن صاحبه و لَمسه حَتَّى الفَرْجُ) واتە: ڕەوایە و حەڵاڵە بۆ هەر یەکێ لە ژن و پیاو کە تەماشای هەموو لاشەی هاوسەرەکەی خۆی بکات وە دەستی لێ بدات تەنانەت تەماشا کردن و دەست لێدانی عەورەتیشی –ئەندامی زاوزێشی...

هەموو ئەمانەش کە شەرع باسی دەکات بۆ ئەوەیە کە خۆشەویستی نوێبێتەوە و لە کاڵ بوونەوە و ساردبوونەوە بپارێزرێ.

وە پێغەمبەری خواﷺ هانی پیاوانی داوە کە پێش جووت بوون یاری و گاڵتە و گەپ و قسەی خۆش و ماچ کردن و دەم و لێو مژین ئەنجام بدەن لەگەڵ خێزانەکانیاندا، هەروەکو پێغەمبەری خواﷺ بە جابری فەموو کاتێ کە وتی بێوە ژنێکم مارە کردووە: (مالَكَ وَ العذارى و لعابها)

زانای گەورە –إبن حجر لە (فتْحُ الباري ج٩ ص٢٥ فەرموودەی ژمارە (٥٠٨٠))دا دەفەرموێ: (فيه إشارَةُ إلى مَصٍ لسانها و رشف شَفَتَيها، وَ ذالكَ يَقَعُ عنْدَ الملاعَبَة وَ التَّقبيل) واتە: لەم فەرمودەیەدا ئاماژە بەوە کراوە کە پیاو زمانی ژنەکەی خۆی بمژێ، وە لێوەکانی بمژێ لە کاتی دەستبازی و ماچ کردنی پێش کاتی جووتبوندا.

کەواتە: ئەوەی ئەورووپی و ئەمریکی و لادینەکان بە حەرامی دەیکەن و لە ڕێگای سەدان کەناڵی ئاسمانییەوە نیشانی خەڵکی جیهانی دەدەن و مەبەست و مەرامیان ئەوەیە خەڵکی فێری خیانەتی هاوسەری بکەن و بەو شێوەیە دەم بخەنە ناو دەمی یەکترەوە، ئیسلامە ئازیز و جوانەکەی خۆمان کە کاڵایەکە پڕ بە باڵای مرۆڤ و حەز و ئارەزووە ڕەواکانی، بە هەزار ساڵ زیاتر پێش ئەوان بە سوننەتی داناوە، بەڵام هاوسەر لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆیدا ئەمە ئەنجام بدات، نەك لە پشتەوە لەگەڵ کەسێکی تر ئەمە ئەنجام

بـدات و خیانـەتی هاوسـەری بکـات! بـە داخـەوە هێشتا کەسـانێك لـە نـاو موسڵمانانـدا بەهۆی دورکەوتنەوە لە دین و بەرنامەی ئیسلام نازانن ئیسلام و پێغەمبـەرە پایـە بەرزەکـەی هـەزاران صـەلاوات وسـەلامی خـوای لەسـەر بـێ، ئەمەی باس کردووە کە ژن و مێرد بە یەکەوە ئەنجامی بدەن.

وە هـەرکاتێ ژن و مێـرد لـە تـەواوی تەمـەنی هاوسـەرێتیاندا ئـەم جـۆرە هەڵسوکەوتە هەست بزوێنە ئارەزووی حەڵاڵ جوڵێنە بە یەکەوە ئەنجام بدەن، بە دڵنیاییـەوە هیچ کامیـان شـەیتان و نەفسی بەد زاڵ نابێت بە سـەریدا کـە توشی خیانەتی هاوسەری بکات.

٦.هەر یەکە لە پیاو ژن بەردەوام ئـەو پـەیمان بەستنەوەیان لەبەرچاو و لە ناو بیر و مێشکدا بێت کە لە کاتی عەقدی زەواجەکەیاندا بە یەکیان داوە و بە ئامادەبوونی وەلی ئەمری ئافرەتەکە و زانایەکی بەڕێزی ئایینی ئیسلامی و دادوەردا و دوو شاهیدی خواناسی بەڕێزدا ئـەم کـوڕە دەستی خستۆتە نـاو دەسـتی خەزوریـەوە و پـەیمانی داوە کـە هاوسـەرێکی بـەوەفا بێـت لەگـەڵ هاوسـەر و هـاوژینی داهـاتووی ژیانیـدا و هـەرگیز خیانـەتی لـێ نـەکات و مافەکانی جێبەجێ بکـات، وە هـەروەها کچیش کـاتێ ئیـزن و ڕەزامەنـدی لـێ وەردەگیرێ و هەموو لاشەی تەزوی خۆشـی پێـدا دێ کـاتێ دەڵـێ ڕازیـم شـوو بـەو کـوڕە بکـەم، ئـەو ڕەزامەنـدی نواندنـەش وەعـد و بەڵێنێکـە کـە پێویـستە پێوەی پابەند بێ و هەرگیز ئەو کوڕەی کە بە تـەواوی ئـارەزووی خـۆی هـەڵی بـژاردووە بـۆ هاوسـەری خـۆی نەیگۆڕیوەتـەوە بـە هـیچ پیـاوێکی سـەر ئـەم زەوییـە، چـونکە پـەیمانی داوەتـێ کـە ژنێکـی بـەوەفا و دڵـسۆز بێـت بـۆ مێردەکەی!.

خۆ مـارەکردن و وتنـی وتـەی پڕمانـا و پیـرۆزی -إنکـاح و تَـزویج- هـەر دوو وشەی سادە و ساکار و بێ ناوەڕۆك نییە، وەکو بێدینەکان دەڵێن جا ئەو مارەبڕینـەی بۆچـییە؟ نـەخێر، ئـەو گرێبەسـتی هاوسـەرییە هـەڵگرتنی

ئەمانەتێکی زۆر زۆر گەورەیە و خیانەت لەو ئەمانەتە گەورەترین تاوانە، بۆیە سزای کوشتنی بە نارەحەتترین وئازاردارترین شێوەی کوشتن بۆی دیاری کراوە کە ڕەجم کردنە بە بەرد، پێغەمبەری خواﷺ لە وەصیەت و ڕاپرسیەکانی کۆتایی ژیان و سەرەمەرگیدا و لە وتاری ماڵ ئاواییدا ڕووی لە پیاوان کرد و فەرمووی: (إِتَّقُوا اللهَ فِي النِّسَاءِ، فَأَنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانَةِ اللهِ وَ اسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللهِ)رواهُ مُسلم(١٢١٨)

ئەو مارەبڕینە گرێبەستێکە بۆ هەتا هەتایە ئیمزا دەکرێ، نابێ بۆ کاتی بێ و ناوی کاتی تێدا بوترێ، چونکە ئەو کاتە دەبێتە نیکاحی موتعە کە حەرامە و پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (أَلا إِنِّي قَدْ كُنْتُ أَبَحْتُ لَكُمْ زَوَاجَ الْمُتْعَةِ وَ إِنِّي أَنْهَاكُمْ عَنْهُ)رواهُ مُسلِم

واتە: ئاگادار بن من پێشتر –زەواجی موتعە–م بۆ حەڵاڵ کردبوون و ڕێگام دابوو کە هاوسەرگیری کاتی بکرێ، بەڵام ئەوا بەڕاستی و دڵنیایی تەواوەوە لێتان قەدەغە دەکەم و ئەو جۆرە هاوسەرگیریە ئەنجام مەدەن)

٧.دەبێ ژن و پیاوی خیانەت کار لە هاوسەرەکانیان بزانن و سەیری ڕابڕدووی ناپاکان بکەن، کە لە زووترین کاتدا ئەو تاوانە گەورەیان ئاشکرا دەبێ و ئابرویەك کە لە ناخدا نەیانماوە و پەردەیەکیان بەسەردا داوە لەبەرچاوی خەڵکدا، ئەو پەردەیەش لادەچێ و سوك و ڕیسوا دەبن و ئەو کارە ناپاکەیان بە شاراوەیی نامێنێتەوە.

٨. ئەبێ ژن و پیاوی ناپاك لە هاوسەریان بزانن ئەگەر لەم دنیایەشدا ئاشکرا نەبن و کارە دزێوو بۆگەنەکەیان بۆ بچێتە سەر ئەوا لە قیامەتدا توندترین سزای ناو قەبر و دۆزەخیان بۆ هەیە و پێغەمبەری خواﷺ لە کاتی شەوڕەویدا نیشانی درا کە خەڵکانێك گۆشتی پاك

لەبەردەمیاندا بوو کەچی دەچوون گۆشتی کەلاکی بۆگەنیان دەخوارد. جوبریل فەرمووی: ئەوە ناپاکانن کە هاوسەری حەلاڵی خۆیان هەبووە و چون خۆیان بە حەرام تێر کردووە، وە فەرمووی هەر لە کاتی شەوڕەویدا –معراج–دا، بیرێکی قوڵم بینی کە وەکو تەنور وابوو سەرەوەی تەسك و ژێرەوەی پان پڕ بوو لە ژن و پیاوی ڕووت و ناڵە و هاواریان لێ بەرز دەبووەوە و وەکو دانولەی ناو مەنجەڵ بە تەوژمی ئاگرەکە بەرز دەبونەوە و دووبارە دەچونەوە ناو قوڵایی ئاگرەکەوە، پرسیم: ئەوانە کێن؟ جوبریل فەرمووی: ئەوانە زیناکارانن.

داواکارم لە خوای گەورە هەموو هاوسەران وەفادار بکات و خۆشەویستی و ڕێز و پاکی لە ناو هەموو خێزانێکدا بێ و خیانەت و ناپاکی و ناپاکان لە ناو خێزاندا و لە کۆمەڵگای موسڵماندا نەمێنێ و لە ناوچێ. اللّهُمَّ آمين.

**سەرچاوەکان:**

قورئانی پیرۆز

فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ

تُحْفة العروسين – محمد متولي الشعراوي ص٢٠٩ ، ص١٩٢

الخيانة الزَّوجيَّة –محمد حبيب الفندي ص٨ ، ص٤٢ ، ص٧٩

الموسوعة الذَّهَبيَّة منَ القصص الواقعيَّة – محمد أحمد الهلالي ص٥٠٩

تەفسیری ئاسان – بورهان محمد أمين

صَفْوة التَّفاسير – محمد علي الصّابوني – ج١ ص١٢٢

# وتاری یەکەم بۆ مانگی ڕەجەب

## ((بانگ))

الحَمدُ للّٰهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعينَ.

**ئیمانداران: لە وتاری ئەمڕۆدا باسی (بانگ) دەکەین إنشاء الله.**
**بانگ کە شیعاری ئیسلامە و مارشی ئومەتی ئیسلامە و تاکە شتێکە کە هەرگیز کۆنبونی بەسەر نایەت و مرۆڤ هەرچەندە گوێبیستی بێت، زیاتر تامەزرۆی دەبێت و ڕۆژی پێنج جار لە هەموو مزگەوتێکەوە لە گوند بێت یان شارۆچکە یان شار ئەو شیعاری ئیسلامە بە گوێی موسڵماناندا دەدرێت، بەڵام ڕۆژێك لە ڕۆژان مرۆڤی موسڵمان نەك هەر هەست بە بێزاری ناکات لێی، بەڵکو ئەگەر لە کاتی هەر نوێژێکدا گوێی لە دەنگی بانگ نەبێت، هەست بە بێتاقەتی دەکات و خێرا پرسیاری ناو مێشکی دێتە سەر زوبانی و بەسەرسوڕمانەوە دەپرسێت ئەوە بانگی نەفەرموو؟! وە باوك و باپیرانمان ئەو قسە جوان و بەجێیەیان فێر کردووین کە هەر ئاوەدانییەك ئەگەر سێ ماڵیشی تێدا نیشتەجێ بن، ئەگەر پێنج فەرزە بانگی تێدا نەدرێت، فەرموویانە ئەوە ئاوەدانی نیە و ئەو شوێنە کاولە وبەرەو چۆڵبوون و وێران بوون دەڕوات، بەڵێ بانگ نیشانەی ئاوەدانییە، نیشانەی زیندوویەتی دڵ و ناخ و مێشك و دەرونی دانیشتوانی ئەو شوێنەیە، بانگ نیشانەی دینداری و خواناسییە، نیشانەی بە گەورە زانینی خوای تاك و تەنهایە بە ((الله أكبر)) بەڵێ هەر خوا گەورەی هەموو گەورەو و دەسەڵاتدارانە و مرۆڤ تەنها دەبێ بۆ ئەو خوایە مل کەچ بکات و سەر بخاتە سەر زەوی، بانگ بانگی ئازادی**

مرۆڤەکانە لە هەموو چەوسانەوە و کۆیلایەتی کردن و خۆ بە کۆیلە کردن، بانگ واتە کۆبونەوەی مرۆڤەکان لەژێر دروشمی سەرفرازی و و ڕزگاریدا، ڕزگاری لە مەینەتی و ماندوو بوونی دونیا، ڕزگار بوون لە نەهامەتی قەبر و قیامەت. ڕۆشتن بەرەو ماڵی خوا و سەر بەرماڵ لە کاتی گوێبیست بوونی (حَيَّ عَلى الصلاة) و (حَيَّ عَلى الفَلاح)دا..

بەڕێزان: لە ناو هەندێ لە موسڵماناندا قسەیەك بڵاوە کە گوایە سەرەتا بانگ لە کولەکەدا دراوە و موسڵمانان نەیانتوانیوە بە ئازادی و بە ئاشکرا بانگ بڵێن، بەلام ئەم قسەیە بێ بنەمایە و هەر ئەوەندە بەسە بۆ وەڵامدانەوەی ئەم قسە ناڕاستە کە بڵێین: بانگ لە قۆناغی بانگەوازی مەککەدا نەبووە تاوەکو موسڵمانان لەژێر هەڕەشە و ئازاردانی موشریکەکاندا نەتوانن بە ئازادی بانگ بڵێن، بەڵکو بانگ لە قۆناغی مەدینەدا بوو بە دروشمی موسڵمانان، لە کاتێکدا موسڵمانان خاوەنی هێز و دەسەڵات و سەربەخۆیی تەواوی خۆیان بوون لە ناو شاری مەدینەدا، وە پێم خۆشە گەشتێکی ڕۆحی بکەین و بڕۆین بۆ شاری مەدینەی پرشنگدار و خزمەتی پێغەمبەری نازدارﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانی، لەناو هاوەڵە بەڕێزەکاندا دەچینە خزمەت عبدالله ی کوڕی زەید و لێی دەپرسین: ئایا چۆن بانگ هاتە ناو موسڵمانانەوە؟ عبدالله ی کوڕی زەید دەفەرموێ: موسڵمانان چوونە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ داوایان لێ کرد کە دروشمێك، دەنگێك، نیشانەیەك دیاری بکرێ بۆ ئەوەی موسڵمانانی پێ ئاگادار بکرێتەوە کە کاتی نوێژ هاتووە و ڕووبکەنە مزگەوت و نوێژی جەماعەت ئەنجام بدەن، کۆمەڵێ شت پێشنیار کرا، لەناویاندا باسی ئەوە کرا کە (ناقوس) لێ بدرێ و هەر کە

گوێیان لە دەنگی ناقوسەکە بوو بزانن کە ئەوە کاتی نوێژ هاتووە.
پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: هەرچەندە ناقوس هی گاورانە، بەڵام بەنابەدڵیەوە فەرمووی: با لەمەودوا ناقوس لێبدرێ، عبدالله ی کوڕی زەید دەفەرموێ: ئەو شەوە کە لە ڕۆژەکەیدا ئەو بڕیارە درا، لە خەونمدا کەسێکم بینی زەنگێکی گەورەی پێ بوو، وتم: ئەوە بەچەند دەیفرۆشی؟ وتی: پێم بڵێ بۆچیتە؟! وتم: زەنگی پێ لێدەدەین و موسڵمانانی پێ ئاگادار دەکەینەوە کە کاتی نوێژ هاتووە، وتی: نا، ئەم زەنگە بەکەڵکی ئەوە نایەت، بەلام وەرە من شتێکی لەمە باشترت فێر بکەم، ئیتر دەستی کرد بە الله أكبر، الله أكبر. تا کۆتایی بانگ.

کەبەخەبەر هاتم نزیك نوێژی بەیانی بوو، زۆر بە خەوەکە دڵخۆش بووم، دەستنوێژم گرت و بەرەو مزگەوت ڕۆشتم بۆ خزمەت پێغەمبەرﷺ و لە خزمەتیدا دانیشتم و خەونەکەم بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺ ڕووی ئەوەندەی تر گەشایەوە و سوپاسی خوای کرد و فەرمووی: بەڕاستی ئەم خەونە حەق و ڕاستە و بەلام بیلال لەتۆ دەنگی خۆشتر و بەهێزترە. هەر ئێستا بڕۆنە سەربانی مزگەوت و تۆ بانگەکە کە لە خەوندا پێیان وتی بە هێواشی بیڵێ و با بیلالیش بە دەنگی بەرز بیلێت، دەفەرموێ: لەسەر فەرمانی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ بیلال چوینە سەربانی مزگەوت و من بە هێواشی بانگەکەم دەگوت و بیلالیش بە دەنگە زوڵاڵەکەی بانگەکەی دەوت و تاریکی ئەو شەوەی شەق کرد، هاتینەوە ناو مزگەوت و حەزرەتی عومەری کوڕی خَطاب بە پەلە کە عەباکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ و فەرمووی: (وَالَّذي بَعَثَكَ بالحَقِّ لَقَدْ رَأَيْتُ مِثْلَ الَّذي أرى)، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ

سوێند بەو خوایەی کە تۆی بە حەق ڕەوانە کردووە بە پێغەمبەر. منیش هەمان ئەو وشانەی بانگیان لە خەودا پێ وتم و ئەو خەونەی عبدالله ی کوڕی زەید بینویەتی و ئێستا گوێم لە بانگەکە بوو منیش هەمان خەونم بینی و ئەو وشە ئاسکانەی بانگیان بە منیش وت، پێغەمبەری خواﷺ زیاتر دڵخۆش بوو و فەرمووی: (فَلله الحمد) دەی سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە. ئەم فەرموودەیە: رواه احمد وابو داود و الترمذي وقال حسن صحيح

بەڵێ ئیمانداران: ئەمە چیرۆك و بەسەرهاتی پەیدابونی ئەم بانگە بەرز و بەڕێزەیە کە پێنج جار لە شەو و ڕۆژێکدا گوێبیستی دەبین و دڵ و دەرونمان پێی ئاسودە دەبێ و ئێمەش لێرەدا وەکو پێغەمبەری دڵسۆز و پێشەوامان دەڵێین: هەزاران سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە.

خۆشەویستان: ئەم صەحابە بەڕێزە کە عبدالله ی کوڕی زەیدە، خۆشەویستییەکی بێوێنەی هەبوو بۆ پێغەمبەری خواﷺ، خەطیبی شەربینی لە (مُغني مُحتاج)دا ج١ ص١٣٣ دەفەرموێ: (قِيلَ أنَّ عبدالله بن زيد، لَمَّا ماتَ النَبيُّﷺ قالَ: اللّهم اعمي حَتَّى لا أرى شَيْئاً بَعدَهُ، فَعُميَ مِنْ ساعَتِه) واتە: کاتێ پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد و شاری مەدینەی منەوەرە بو بە شاری خامۆشی و خەم و خەفەت، کاتێ هەواڵی وەفاتی خۆشەویستی هەموانﷺ بە عبدالله ی کوڕی زەید گەیشت. لە شوێنی خۆی جوڵەی بۆ نەکرا و دانیشت و دەستەکانی بەرز کردەوە بۆ ئاسمان و بەکوڵ و دڵ لە خوا پاڕایەوە و فەرمووی: خوای گەورە و میهرەبان خۆت ئاگاداری ئاشکرا و نهێنی هەموو مرۆڤەکانی. ئاگاداری ناو ناخ ودڵ و دەرونی منیشی، خوایە خۆت ئاگاداری کە من چەندە

پێغەمبەری خوامﷺ خۆشدەوێ. خوایەگیان ئەم دونیایەم بۆیە پێ خۆشە کە چاوم بەو ڕوخسارە موبارەك و نورینەی پێغەمبەری خوا ڕوون دەبۆوە، خوایە ئێستا کە دەبیستم وا پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی کرد و دونیای فانی بەجێهێشت، خوایەگیان داوات لێ دەکەم هەر ئێستا ڕووناکی هەردوو چاوم وەربگریتەوە و نابینا بم. بۆ ئەوەی لە دوای ڕسول الله هیچ شتێکی سەر ئەم دونیایەی پێ نەبینم!!! ئەوانەی لەدەوری بوون دەفەرموون: هەر لەوێدا کوێر بوو!

بەڕاستی ئەی عبدالله ی کوڕی زەید ڕاستت کرد لە خۆشەویستی پێغەمبەردا، بەڕاستی دڵسۆز بووی، سەلماندت کە پێغەمبەری خواتﷺ لە نەفسی خۆت، لە ڕوناکی چاوەکانت خۆشتر دەوێت، هەر بۆیە خوای گەورە یەکەم ڕاگەیاندنی ئەو ئیسلامە (کە بانگە) بە تۆی خەڵات کرد و بۆ یەکەم جار لە دەمی تۆوە چووە گوێی بیلالی حەبەشییەوە، هەزاران ڕەزا و ڕەحمەتی خوا لە تۆ و لە هەموو یارانی پێغەمبەری دڵسۆز و خۆشەویست بێ.

ئیمانداران: لە بارەی گەورەیی بانگەوە کۆمەڵێ فەرموودەی پێغەمبەری خواﷺ باس دەکەین:

قالَ رسولُ الله ﷺ: (لَو يَعْلَمُ النّاسُ مافِي الأذانِ و الصَّفِ الأوَّل ثُمَّ لَم يَجِدوا إلا أَنْ يَسْتَهِموا عَلَيهِ لاسْتَهَمُوا، وَلَو يَعْلَمونَ مافِي التَّهْجيرِ لاستَبَقوا إلَيه، وَلَو يَعْلَمونَ مافِي العَتَمَة و الصُّبْحِ، لأتَوْهُما وَلَو حَبواً) رواه البخاري

واتە: ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە کە خێری بانگ دان و پاداشت و خێری ڕیزی یەکەمی نوێژی جەماعەت چەندە گەورەیە، هەموویان هەوڵیان بۆ دەدا تا ناچار دەبوون کە تیر و پشك (قُرعە)ی بۆ بکەن بزانن

بەر کامیان دەکەوێت بانگ بدەن یان بچنە ڕیزی یەکەمەوە بۆ نوێژی جەماعەت، وە ئەگەر بیانزانیایە کە خێری نوێژی نیوەڕۆ بە جەماعەت چەندە ئەوا پێشبڕکێیان دەکرد و هەر یەکەی هەوڵی ئەوەی دەدا زووتر بگاتە ئەو نوێژە، وە ئەگەر خەڵکی بیانزانیایە کە نوێژی خەوتنان –عشاء– و نوێژی بەیانی چ پاداشتێکی گەورەی هەیە لای خوا، ئەگەر لەسەر ئەژنۆش بوایە دەهاتن بۆ مزگەوت بۆ ئەنجام دانی ئەو نوێژە بە جەماعەت لە گەڵ ئیمامی مزگەوتدا.

واتە: هێشتا خەڵکی نازانن کە ئەم بانگ دان و ڕیزی یەکەم و جەماعەتی نیوەڕۆ و عیشا و بەیانییە چەندە خێر و پاداشتەکەی گەورەیە لای خوا، هەرچەندە بیری لێ بکەنەوە هێشتا پاداشتەکەی لای خوا گەورەترە...

لە فەرموودەیەکی تردا کە پێشەوا موسلیم و ئەحمەد ڕیوایەتیان کردووە، پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: (إِنَّ الْمُؤَذِنِينَ أَطْوَلُ النَّاسِ أَعْنَاقاً يَوْمَ الْقِيامَةِ)

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا بانگ بێژان لە هەموو کەس زیاتر گەردنیان بەرزە، لە هەموو کەس زیاتر سەر بڵندن لە ڕۆژی قیامەتدا، لە ناو هەموو خەڵکیدا دیارن کە ئەوانە بانگ بێژ بوون لە دنیادا بۆیە ئەوەندە گەردنیان بەرزە.

بەڵێ هەر کەسێ بانگەواز بکات بۆ ئیسلام، خەڵکی بانگ بکات بۆ (لا إله إلا الله محمد رسول الله) هەر کەسێك خەڵکی بانگ بکات بۆ ڕێگای نوێژ و سوژدە بردن بۆ خوا، خەڵکی فێری ئەوە بکات سەریان بۆ غەیری خوا دانەنەوێنن، خەڵکی بانگ بکات بۆ ڕێگای فەلاح و ڕزگاری ئەوە بە

بێ گومان خوای گەورە هەم لە دنیادا سەرفراز و سەربڵندی دەكات و هەم لە قیامەتیشدا گەردنی لە هەموو كەس بەرز ترە.

ئیمانداران: بانگ مەرج نییە هەر لە ناو مزگەوت و ناو گوند و شاردا بدرێ بەڵكو بانگ بە تەنها و لە ناو شاخ و دۆڵ و دەشتیشدا كە تەنها خۆت بیت و كەسی لێ نەبێت دەوترێ.

لەو بارەیەوە عوقبەی كوڕی عامر ﷺ دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (يَعْجَبُ رَبُّكَ مِنْ راعي غَنَمٍ في رَأسِ شَظِيَّةٍ للجَبَلِ يُـؤَذِّنُ بالصَّلاةِ و يُصَلِّي ، فَيَقولُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ: أُنْظُروا إلى عَبدي هـذا يُـؤَذِّنُ و يُقيمُ الصَّلاةَ يَخافُ مِنِّي ، قَد غَفَرْتُ لِعَبْدي و أدْخَلْتُهُ الجَنَّة) رواهُ أبو داود و النسائي

واتە: خوای گەورە زۆر خۆشحاڵە بەوەی كاتێك كە شوانێك لە لای مەڕەكەیەتی لەسەر لوتكەی دۆڵێكدا لە پاڵ چیایەكدا خەریكی لەوەڕاندنی ڕانە مەڕەكەیەتی، كاتێ كە وەختی نوێژ دێت بانگ دەدات و بە دەنگی خۆی لە كاتی بانگدا، بە الله اكبر، ئەو ناوە دەنگ دەداتەوە. پاشان نوێژەكەی دەكات، خوای گەورە بە -فریشتەكانی- دەفەرموێت: تەماشای بەندەكەم بكەن كە ئەم شوانە دڵپاكەیە، چۆن تەنها لە بەر خاتری من و دور لە هەموو ڕیاو بەرچاویەكی خەڵكی، لە كاتی نوێژدا بانگی دا و قامەتی كردو نوێژەكەی كرد، تەنها لە ترسی منیش ئەو كارەی كرد، دەی بزانن وامنیش لە هەموو گوناهەكانی ئەو بەندەیەم خۆش بووم و دەیخەمە بەهەشتەوە.

كەواتە: هەر كاتێ مرۆڤی موسڵمان لە دەشت و دەر و دۆڵ و سەر چیا بوو، وە كاتی نوێژ هات خێر و پاداشتێكی زۆر زۆر گەورەی دەست

دەکەوێ و خوای گەورە بە چاوی ڕەحمەت تەماشای دەکات ئەگەر بێتوو لە کاتی نوێـژدا بانگ بدات و قامەت بکات و نوێژەکەی بکات چونکە ئەوە لوتکەی ئیخلاص و دڵسۆزی و خواناسییە و دوورە لە بچوکترین ڕیا و بەرچاوی.

جارێك كابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خواﷺ كردەوەیەكم پێ بڵێ ئەگەر ئەنجامی بدەم و لەسەری بەردەوام بم، بە هۆی ئەو كردەوە جوانانەوە بچمە بەهەشت، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ببە بە بانگبێژی مزگەوت. كابرا وتی: ئەگەر نەمتوانی بانگ بدەم و دەنگی بانگم نەبوو چ كردەوەیەكی تر بكەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بكە، كابرا وتی: ئەگەر نەمتوانی ئیمامەتی بكەم و پێشنوێژی بۆ موسڵمانان بكەم، چ كردەوەیەكی تر ئەنجام بدەم؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (فَعَلَيْكَ بالصَّفِّ الأَوَّل) ئامۆژگاریت دەكەم بەردەوام هەوڵ بدە كە لە ڕیزی یەكەمی نوێژدا بیت.

زانای گەورەو ناودار (ئیمامی نەوەوی ﷺ) لە (منهاجُ الطالبين)دا دەفەرموێ: (الأَصَح أنَّ الأذانَ أَفْضلُ منَ الأمامَة) واتە: فەرمودەی ڕاستتر ئەوەیە: كە بانگدان گەورەترە لە ئیمامەت و پێشنوێژی و خێر و پاداشتی زیاترە.

ئیمانداران: بانگ بێژی كۆمەڵێ مەرجی تایبەتی خۆی هەیە كە پێویستە لەو كەسەدا هەبێ كە ئەو ڕێز و شەرەفەی بە نسیب دەبێ كە بانگ بدات، لەوانەش:

١. كرێ وەرنەگرێ لەسەر بانگدانەكەی و تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا بانگ بدات و چاودێری كاتی بانگ بكات، نەك وەكو مۆزەفێك

تەماشای بانگدان بکات و ئەگەر کاتی دەوامی خۆی نەبوو گوێی پی نەدات و بانگەکەی تەنها بۆ موچە وەرگرتن بێت!

٢.واباشە و سونەتە کە بانگ بێژ لە کاتی بانگداندا بە پێوە بێت و ڕوو لە قیبلە بێت.

٣. ئەگەر لە دەشت و ناودۆڵ و سەرشاخیشدا بیٚ هەر دەنگ هەڵبڕیٚ بۆ بانگدان با هیچ مرۆڤێکیش لەو ناوەو لەو نزیکە نەبیٚ کە گوێی لیٚ بێت، صەحابی گەورە و بەڕێز ئەبی سەعیدی خودری بە پیاوێکی فەرموو: تۆ کەسێکی ئاژەڵداری و زۆربەی کات خەریکی لەوەڕاندنی مەڕوماڵاتەکەی و لە دەشت و بیاباندای، جا ئامۆژگاریت دەکەم هەر کاتێك وەختی نوێژ هات، (فارفَعْ صَوْتَكَ بالنِّداء فَأَنَّه لا يَسمَعُ مَدى صَوتِ المؤَذِّن جن ولا إنْسٌ وَلا شَيءٌ إلا شَهِدَ لَهُ يَومَ القيامة) واتە: دەنگت بەرز بکەرەوە لە کاتی بانگدانەکەدا و دەنگی لیٚ هەڵبڕە، چونکە چەندی دەنگی بانگبێژ بڕوات و جنۆکە و مرۆڤ و هەر شتێك ئەو دەنگی بانگە ببیستیٚ ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا شاهیدی بۆ دەدات،ئەبو سەعیدی خودری بە کابرای فەرموو وا نەزانی کە ئەمە قسەی خۆمە بەڵکو (سَمِعتُه مِن النَبيِّ ﷺ) بۆ خۆم ئاوا لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە..ئەم فەرمودەیە پێشەوا بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

٤. چاك وایە و سوننەتە کە بانگبێژ لە کاتی بانگداندا دەستنوێژی هەبیٚ، کەواتە ئەگەر بانگبێژ هاتبوو وە کاتی بانگ دەستنوێژی نەبوو. بۆ ئەوەی بانگەکەلە کاتی خۆیدا دوا نەکەوێت دروستە بە بیٚ دەستنوێژ بانگ بدات.

٥. سوننەتە کە بانگدان بە هێواشی بێت، واتە: پەلەی تێدا نەکرێ و لە نێوان وشەکاندا ماوەی پێ ویست بوەستێ، بەڵام قامەت بە خێرایی دەکرێ.

٦. هەر کەسێ بانگی دا، قامەتیش هەر ماڤی بانگبێژەکەیە و بە بێ ڕەزامەندی ئەو نابێ کەسێکی تر قامەت بکات.

٧. بانگبێژ پێویستە دەنگی خۆش بێت، ئەوەتا لە ناو ئەو هەموو هەزاران صەحابەدا پێغەمبەری خواﷺ تەنها دوو بانگبێژی هەبووە، ئەوانیش بیلالی حەبەشی و عبداللە ی کوڕی ئوم مەکتوم، کە ئەو دوانە زۆر دەنگیان خۆش بووە، کە بەداخەوە ئێستا هەرچی ڕاست دەبێتەوە بانگ دەدات بە بێ ئەوەی بزانێ چۆن وشەکانی بانگ وەکو خۆی دەردەبڕێ وە بەبێ ئەوەی هیچ دەنگخۆشییەکی تێدا بێت، بەڵکو گەلێك لە بانگبێژەکان نەوەك هەر دەنگیان خۆش نییە، بەڵکو لە دەنگ ناخۆشەکانی ناو خەڵکن و بەم شێوەیە بەهۆی هەڵە لە وشەکان و ناخۆشی و ڕەقی دەنگەکە، ئەو بانگە عەظیمە سەرنج ڕاکێشە هەست بزوێنەرە ئەو تەئسیر و کاریگەرییەی نەماوە..

بەڕێزان: هەر سەبارەت بە بانگ چەند شتێکی پێویست هەیە کە ئیمانداران دەبێ لێی ئاگادار بن:

١. هەر کاتێ بانگ درا، ئەوەی گوێی لە بانگەکەیە وەڵامی بانگبێژ بداتەوە، واتە: بانگبێژ چی وت، ئەویش هەمان شت بڵێتەوە، تەنها لە (حي علی الصلاة) و (حي علی الفلاح) دا نەبێ کە کاتێ بانگ بێژ ئەم دوانەی فەرموو، ئەو کەسەی کە گوێی لە بانگەکەیە لە وەڵامی ئەم دوانەدا دەڵێ: (لا حول ولا قوة إلا بالله) ئەمەش والله أعلم لەبەر ئەوەیە کە تۆ گوێت لە بانگبێژە دەفەرموێ (حي علی الصلاة) ئەی خەڵکینە

خێراکەن وەرن بەرەو نوێژ، تۆ کە گوێت لێیە و خۆت ئامادە دەکەی بەرەو ڕۆشتن بۆ دەستنوێژ و سەر بەرماڵ و ناو مزگەوت دەڵێی (لا حول ولا قوة إلا بالله) خوایە گیان هەرچەندە وا من هەستاوم و بە قاچەکانم دەڕۆم بەلام گەر تۆ هێز و قووەتم پێ نەبەخشیت و یارمەتیم نەدەیت ناتوانم یەك هەنگاو هەڵبنێمەوە و ئەوە تۆ یارمەتیت داوم و ڕەحمت پێ کردووم و هیدایەتت داوم کە ڕوو لە مزگەوت و سەر بەڕماڵ دەکەم، لە کاتێکدا دەیان کەسی وەك من هەر نوێژ و مزگەوتیان لە بیریش نییە. خوایە ئەوە ئازایەتی خۆم نییە بەڵکو کەرەم و ڕەحمەتی تۆیە پێت بەخشیوم، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا سَمعتُم النِّداء فَقُولوا مثلَ ما يَقُولُ المُؤَذِّنُ) رواهُ البخاري و مُسلم.

٢. هەر کاتێك بانگبێژ لە بانگ بۆوە، بانگبێژەکەش و ئەو کەسەش کە گوێی لێیەتی سوننەتە صلاوات لە پێغەمبەر ﷺ بدات و پاشان بڵێ: اللّهُمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوة التامة . . . الخ) هەروەکو جابر رضي الله عنه دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (من قالَ حينَ يَسْمع النداء : (اللّهُمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوة التامة . . . الخ) حلَت لَهُ شَفاعَتي يَومَ القيامَة) رواهُ البخاري

واتە: هەر کەسێك کە گوێی لە بانگ بوو، لە دوای تەواو بوونی بانگەکە وتی: (اللّهُمَّ رَبَّ هذه الدَّعْوة التامة . . . هتد) ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەتی منی بۆ مسۆگەر دەبێت.

٣.سوننەتە لە نێوان کاتی بانگ و قامەتدا دوعا و پاڕانەوەی زۆر بکرێ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (الدعاء لايُرد بين الأذان و الاقامة) رواهُ الترمذي وقال حديث حسن صحيح

واتە: لە نێوان بانگ و قامەتدا دوعا و پاڕانەوە ڕەت ناکرێتەوە و خوای گەورە قبوڵی دەکات.

٤.بانگ و قامەت لە نوێژی فەوتاویش لە کاتی گێڕانەوەیدا دەکرێ.

واتە: ئەگەر کەسێ لە کاتی نوێژدا خەوی لێکەوت، یان لەبیری چوو کە کاتی نوێژە، وە نوێژەکەی فەوتا، ئەوا وا چاکە کە ویستی نوێژەکەی بگێڕێتەوە بانگ بدات و قامەت بڵێ ئەمجا نوێژە فەوتاوەکەی بگێڕێتەوە، لە ڕیوایەتی (أبو داود)دا هاتوە لە بەسەرهاتی ئەوەدا کە پێغەمبەرﷺ و صەحابەکان لە غەزایەکدا بوون، لەبەر دووری ڕێگا و گەرمای کاتەکە و ماندووبونی سەفەرەکە کاتێ شەو خەوتن خەبەریان نەبۆوە هەتا ڕۆژ هەڵهات وکاتی نوێژی بەیانی بەسەر چوو، جا کە هەستان و دەستنوێژیان شت، پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد بە بیلالی حەبەشی بانگ بدات و قامەت بکات ئەمجا نوێژەکەیان بە گێڕانەوە کرد.. جا ئەگەر هاتوو نوێژە فەوتاوەکان چەند نوێژێك بوون، سوننەتە بۆ نوێژی یەکەمیان بانگ بدرێ و بۆ نوێژەکانی تر تەنها قامەت بکرێ، هەر وەکو ئەو باسەی کە کاتێ کافرەکان پێغەمبەری خوایانﷺ مەشغول کرد لە ڕۆژی خەندەقدا تاوەکو چوار نوێژیان فەوتا، هەتا وەکو ئەوەندەی خوا مەیلی لێ بێت شەو ڕۆیشت، ئەمجا پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی کرد بە (بیلال) کە بانگ بفەرموێ و قامەت بکات، ئینجا نوێژی نیوەڕۆیان گێڕایەوە، ئینجا فەرمانی پێ کرد قامەتی کرد و نوێژی عەسریان بە قەزا گێڕایەوە، پاشان بیلال قامەتی کردەوە و نوێژی مەغریبیان گێڕایەوە، ئینجا بیلال قامەتی کردەوە و نوێژی عیشایان کرد،واتە تەنها یەك بانگیان دا بۆ نوێژی یەکەم و بۆ نوێژەکانی تر تەنها قامەت کرا.

لە بارەی گەورەیی بانگەوە لە (فقْهُ السُنة)ی سید سابق ج١ ص١١٠دا، دەفەرموێ: ئیمامی قورطبی و غەیری ئەویش فەرموویانە:

بـانگ هـەر چـەندە لـە ڕووی ژمـارەی وشـەکانیەوەکەمە، بـەلام لەگـەڵ ئەوەشدا لە ڕووی ناوەڕۆك و ماناوە عەقیدە و بیر و باوەڕی ئیسلامی بە تەواوەتی لە خۆ گرتووە، چونکە سەرەتا بە (الله أکبر) دەست پـێ دەکات کە باسی بوون و گـەورەیی دەسەڵاتی خوا دەکات کە لـە سەرو هـەموو دەسەڵاتێکەوەیە، ئەمەش بەشی یەکەم و بنچینەی بیر و بڕوایە، ئینجا دەوترێ (أشهدُ أن لا إلـهَ إلا الله) واتـە: باسی یەکتاپەرستی و تەوحیدی خوایی دەکرێ و نـەفی شـەریك بـۆ خـوا قـەرار دان دەکرێ ئینجا باسـی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی (محمد) دەکرێ کە ئەم شایەتمانە بـە (لا إلـهَ إلا الله، محمـد رسـول الله) ڕوکنـی یەکـەمی ئیـسلامەتییە، ئینجـا باسـی کۆڵەکەی ئیسلام و ڕوکنـی دووەمـی ئیسلام دەکات کـە نوێـژە، ئینجا باسـی ڕزگـاربوون لـە عـەزابی خـوا دەکـرێ لـە قیامەتـدا، واتـە باسـی ڕوکنێکی گەورەی ئیمان دەکرێ کە بڕوابوونە بە ڕۆژی دوایـی، ئینجا لە کۆتاییدا جارێکی تـر باسـی گـەورەیی و دەسـەڵاتی بـێ سنوری خوای گەورە دەکرێ و تەئکید لە بێ شەریکی خوا دەکرێتەوە، بە واتای ئەوەی کە کۆتایی هەموو شتێك تەنها بۆ لای خـوا دەگەڕێتـەوە و بـەقا و مانـەوە تەنها هەر بۆ خوایە.

ئیمانداران: بەڕاستی تەنها هەر ئەم بانگـەی ئیسلامە کـە قـەت کـۆن نابێ، شەو و ڕۆژ لە تەواوی ئەم سەرزەوییە بە بەردەوامی بانگ دەدرێ، بەهۆی جیاوازی کاتەکانەوە، کاتێ لێرە بانگ تەواو دەبـێ لـە شوێنێکی تـر ئـەمجا دەسـت دەکـرێ بـە بـانگێکی تـر، بەڕاسـتی جێگـای خۆیـەتی و واجیبە کە شانازی بە ئیسلامەکەمانەوە بکەین کە خاوەنی بانگێکی ئاوا جوان و هەمیشە بەردەوامین، کە لە تەواوی مێژوی مرۆڤایەتیدا هیچ دین

و ئایدۆلۆژیایەك مارشی وا جوانی هەرگیز نەبووە، كە بۆ هەموو سەردەم و زەمان و زەمینێك بشێت و هەرگیز مرۆڤ لێی بێزار نەبێ و هەمیشە لای تازە بێت، كە غەیری بانگ هەر شتێكی تر بە درێژایی تەمەنت ڕۆژی پێنج جار گوێت لێی بێت و لێی بێزار دەبی و لانی كەم گوێی بۆ ناگری، نەك وەك بانگ پێنج فەرزە بەدڵ گوێی بۆ دەگیرێ و وەڵامیش دەدرێتەوە و دڵ و دەرونیش پێی نوێ دەبێتەوە...

ئەم بانگی ئیسلامە هەمووی ئامۆژگاریە، بە دەنگی بەرز بە كاربەدەست دەڵێ: بە دەسەڵاتەكەتەوە مەنازە و تەكەبور لێمەدە چونكە لەسەر و دەسەڵاتی تۆوە دەسەڵاتداری گەورە كە الله یە هەیە و (الله أكبر) ئەگەر یاخی ببی و لە سنور دەرچی، دەسەلاتەكەت لەناو دەبات، وە بە میللەتیش دەڵێ زەلیل مەبە، كەس بە ڕازیق و ژێنەر و مرێنەری خۆت مەزانە تەنها ڕووت لە خوا بكە، چونكە (لا إلهَ إلا الله)

خۆشەویستان: بەڕاستی بانگ ئەوەندە گەورەیە كە حەقی خۆیەتی لە كاتی بانگدا تا تەواو بونی وەكو شێوازی وەستانی سەربازی هەموو كەسێك لە شوێنی خۆی بوەستێ و هەموو كڕین و فرۆشتن و قسە و باسێك و دەنگ و باسێك بوەستێنرێ و بە دڵ گوێی بۆ بگیرێ و بە زمان وەڵام بدرێتەوە، خەطیبی شەربینی لە (مُغني مُحتاج)دا لە باسی بانگدا دەفەرموێ:نَعَمْ قَدْ یَسنُ الآذان لغَیرِ الصَّلاة: بەڵێ سوننەتە بانگدان بۆ غەیری نوێژیش وەكو: كما:

١. في آذان المولـود: بـە گـوێی منـاڵی تـازە لـەدایك بـوودا لـە ڕۆژی حەوتمەدا

٢. والمهوم: كەسێك خەمبار و دڵتەنگ بێ و نەخۆشی دەرونی هەبێ

٣. وَالمَصْروع: ئەو كەسەی كە بورانەوەی لەگەڵدایە و فێی لێ دێ.

٤. و الغـضبان: كەسـی تـوڕە كـە مەترسـی ئـەوەی لـێ دەكـرێ لـە كـاتی توڕەیەكەیدا زەرەرێك لە كەسێك بدات و ئەوەندە توڕە بێ گوێ بۆ كەس نەگرێ.

٥. ومَن ساءَ خُلقهُ من إنسان أو بَهيمة: مرۆۋ و ئاژەڵی لاسار

٦. و عند مزدحم الجيش: لە كاتی تێك ڕژانی سوپای ئیسلام لەگەڵ كافراندا

٧. وعند الحريق: لە كاتی ئاگر كەوتنەوەدا.

٨. و عنـد توغـل الغـيلان. أی تمـرد الجـن: لـەو كاتـەدا كـە جنۆكـە لـە شوێنێكدا بڵاو دەبنەوە و مەترسییان لێ دەكرێ.

٩. وهـوَ والأقامـة خَلْـفَ المُـسافر: وە سـوننەتە بـانگ و قامەت بدرێ لـە كاتێكدا كەسێكی خۆشەویستت دەڕوات بۆ سـەفەرێكی حـەڵاڵ و خێـر و لێـت دوور دەكەوێتـەوە، چـونكە مانـای وایـە تـۆ ئـەو كەسـەت بـە خـوای گەورە سپاردووە إنشاء الله بە سەلامەتی دەیبینیتەوە.

بـەڵێ زانايـانی شـەرع زان كـە فەرموويانـە لـەم نـۆ جێگايـەدا بـانگ بدرێ، زانیويانـە بـانگ چـەندە گـەورە و پـڕ بەرەكەتـە و هـەموو شـتێك لـە ئاستيدا دەوەستێ و ئارام دەگرێ.

ئیمانداران:بانگ ئەوەندە گەورەیە لەو کاتەدا کە لەسەر زەوی بانگ دەدرێ، لە ئاسمانیش ئەو دەنگە دەبیسترێ، ئەمەش ڕاستییەکی زانستییە و بوو بەهۆی موسڵمان بوونی کەشتییەوانێکی ئاسمانی ئەمریکی، ئەوە بوو کاتێ کەشتییەوانێکی ئاسمانی ئەمریکی (ئارمسترۆنگ) لە ساڵی ١٩٩٩دا بۆ گەشتیاری سەردانی وڵاتی میصر دەکات و، بەیانییەکیان لە دەنگی بانگی بەیانی لە خەو خەبەری دەبێتەوە، وشەکانی بانگەکە زۆر سەیر دەبێت بە لایەوە، باشە خۆ سی ساڵ لەمەو بەر لە ١٩٦٩دا هەمان شتی گوێ لێ بووە، کاتێ لەسەر مانگ بوو (دیارە خوا ئیرادەی خێری پێ بووە بۆیە ئەو بانگە هاتۆتە گوێی لەسەر مانگ، بۆیە لەبەر خۆیەوە وتی: تۆ گەورە و بەدەسەڵاتی ئەی پەروەردگار، تۆ پاك و بێگەردی ئەی پەروەردگار، ئینجا هەندێ دوعای کرد تا خەوی لێ بکەوێتەوە، خەوی لێ نەکەوت ناچار پەراوێکی لە جانتاکەی دەرهێنا تا بیخوێنێتەوە، چی خوێندەوە هیچی لێ حاڵی نەبوو حەزی دەکرد گوێی لەو بانگە بێتەوە، ڕۆژ بووەوە و هاتە خوارەوە و نانی بەیانی خوارد ئینجا لەگەڵ هاوەڵانیدا چوون بۆ گەڕان، لە ناو مەتحەفێکی فیرعەونیدا بوون، گوێی لە بانگێکی خۆش بوو لە ڕادیۆی یەکێ لە فەرمانبەرانی مەتحەفەوە، خێرا چووە لایەوە و برادەرەکانی بانگ کرد و وتی: وەرن وەرن گوێ بگرن، ئەوانیش هاتن و خەریك بوو قسە بکەن، بێدەنگی کردن تا تەواو بوو، ئینجا بە هاوەڵانی گوت: گوێتان لێ بوو؟! وتیان: بەڵێ، وتی: دەزانن کەی گوێم لەمە بوو بۆ

یەکەم جار؟!! من لە ساڵی ١٩٦٩ لەسەر مانگ ئەم بانگەم بیستووە!!..
یەکێ لە هاوەڵانی بردیە لاوە و هەندێ پرت و بۆڵەیان بوو، پاش چەند خولەکێك ئارمسترونگ برادەرەکانی بە تورەیی بەجێ هێشت و بە تاکسییەك گەڕایەوە بۆ ئوتێل، لە ژورەکەی خۆیدا لەسەر جێگاکەی خۆی ڕاکشا و بیری دەکردەوە، چۆن (سیمث)ی هاوەڵم پێم دەڵێ شێت بووی، چەند سەعاتێك تێپەڕی و بۆ جارێکی تر گوێی لە بانگ بوو، لە جێگاکەی هەستا و پەنجەرەی ژورەکەی کردەوە و گوێی گرت، ئینجا کە تەواو بوو هاواری کرد: نا من شێت نیم، نا من شێت نیم، بە خوا ئەمەم لەسەر مانگ گوێ لێ بووە!! درەنگانێك هاتە خوارەوە و نانی نیوەڕۆی خوارد ئەو چەند ڕۆژەی لە قاهیرە بوون خۆی بەدوور دەگرت لە هاوەڵانی، تا گەڕانەوە ئەمریکا، ئینجا کەوتە دیراسەی ئیسلام و پاش ماوەیەکی کەم موسڵمان بوو، لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا: موسڵمان بوونەکەی وگوێلێبوونی بانگی لەسەر مانگ ڕاگەیاند، لە ئەنجامی ئەمە و پاش چەند ڕۆژێك وەکالەی فەزای ئەمریکی (ناسا) ئارمسترۆنگی لەکار خست، جا کە ڕۆژنامەنوسێك لە بارەی دەست لە کار کێشانەوەی پرسیاری لێ کرد، لە وەڵامیا وتی: ڕاستە ئیشەکەم لەدەست چوو، بەلام لە بەرامبەر ئەوەدا خوام دۆزییەوە.

ئیمانداران: بانگ ئەوەندە تەئسیر و کاریگەری هەیە کە بوو بە کلیلی هیدایەتی ئەکتەرێکی ئەلبانی بەناوبانگ، دوای ئەوەی ئەم ئەکتەرە ڕازی بوو بەوەی کە ڕۆڵی پاڵەوان ببینێ لە فیلمی (خۆشەوستی

پەرستش)دا و هەوڵدانی بۆ دیراسە کردنی کەسایەتی و لایەنی دەروونی پاڵەوانی موسڵمانی فیلمەکە هۆکاری سەرەکی بوو لە گۆڕانی ڕێڕەوی ژیانی ئەکتەری بەناوبانگی ئەلبانی (میروشی قاباشی) و پەسەند کردنی فەرزەکانی ئیسلام لە لای و ڕەمەزانی ١٤٢٥ی کۆچی یەکەم ئەزمونی ڕۆژوو گرتن بوو لە ژیانیدا، بابەتی ئەم فلیمەش کە بوە هۆی موسڵمان بوونی(میروشی قاباشی) گەورە ئەکتەری ئەلبانی باس لە چیرۆکێکی ڕاستەقینە دەکات لە بارەی گەنجێکی ئەلبانی کە خوێندنی لە یەکێك لە ئامادەییە ئاینیەکان تەواو کردوە و پاشان لە یەکێك لە مزگەوتەکانی شاری (بیرات) لە باشوری ئەلبانیا وەك بانگدەر دادەمەزرێت، بەلام قەدەر وا دەبێت کە نیزامی شیوعی لەو ولاتەدا دێتە سەر حوکم لە ساڵی ١٩٦٧دا و فەرمانی ئەوە دەر دەکەن کە نابێت هیچ دیاردەیەکی ئاینی هەبێت و زۆرێك لە مزگەوتەکان دەروخێنن و تێکی دەدەن، ئەم گەنجە وەك پێشەواکانی تر سوور دەبێت لەسەر ئەوەی کە نوێژەکانی خۆی بکات و هەروەها خەڵکی بانگبکات بۆ لای ئیسلام و درێژەبدات بە پەرستشەکانی لە زینداندا، بۆیە پاش ئەوەی ٨ ساڵ لە زینداندا تەواو دەکات لەبەر سوربوونی لەسەر بەندایەتی، دەسەلاتی شیوعی (ئەلبانی) هەشت ساڵی تریشی بۆ دوبارە دەکاتەوە!.

ئەم ئەکتەرە دەوری ئەو کوڕە گەنجە موسڵمانەی دەبینی، سەری سوڕما لەو هەموو عەشق و شەوق و عیبادەتە، بۆیە بە دەرهێنەرەکەی وت: بە تەسجیل بانگ لێمەدەن خۆم فێر دەبم تا ڕۆڵەکە جوانتر ببینم،

دواتر ئەم بانگدانە ئەوەندە تەئسیر و و کاریگەری لێ کرد کە الحمد لله موسڵمان بوو، دوای موسڵمان بوونی وتی: من مەدحی ئیسلام ناکەم بەلام ئەوەندە دەڵێم: هەر چۆن بیابان پێویستی بە ئاو هەیە، ئاواش لەم سەردەمی ئێستاماندا پێویستمان بە ئیسلام هەیە، ئەم ئەکتەرە ناودارەی ئەلبانیا (قاباشی) لە ساڵی (١٩٩٧)دا خەڵاتی باشترین ئەکتەری لە میهرەجانی قاهرەی دەولی بۆ فلیم و شانۆگەری وەرگرت.

بەڕێزان لێرەدا کە باسی وڵاتی (ئەلبانیا)مان کرد دەمەوێ ئاماژە بدەم بەوەی کە ئەم بانگی ئیسلامە زۆر دژایەتی کراوە و هەوڵی بێدەنگ کردنی دراوە، بەڵام سەرەنجام گەرمتر و دەنگ زوڵاڵتر لە جاران دەستی پێ کردۆتەوە، بۆ نمونە:

١. لە ئەلبانیا لە ساڵی ١٩٤٣ی زایینیدا کاتێك شوعیەکان حوکمیان لە ئەلبانیا گرتە دەست بە سەرکردایەتی (ئەنوەر خۆجە) کە بە تەواوەتی هەوڵی دەدا ئیسلام بسڕێتەوە بە پاڵپشتی سیستەمی ستالینی ئەو کات، ئەنوەر خۆجە وای کرد کە ئەلبانیا لە هەموو دنیا دابڕێ وە لە تاکە دەوڵەتی ئیسلامی ئەوروپیەوە کردی بە تاکە دەوڵەتی بێدینی نەك هەر لە ئەوروپا بەڵکە لە هەموو جیهانیشدا، وە دژی هەموو ئاینەکان دەجەنگا، وە لە ماوەی ئەو ساڵانەی حوکمی دا زۆر بڕیاری دا بەوەی کە نابێت فەرمانەکانی ئاین بە هیچ جۆرێك جێبەجێ بکرێن وە هەروەها فەرمانی دا بە گۆڕینی مزگەوتەکان بۆ مۆزەخانە و مەخزەن و شوێنی بازرگانی و شوێنی سەما کردن!! بەڵام هەر کە دەسەڵاتی

شـيوعی نـەما (٪٧٠)ی خەڵکەکـەی موسـڵمان بـوونی خۆيـان ئـيعلان كردەوە و بانگی ئيسلام دەنگی زوڵاڵ بۆوە، الحمد لله..

٢.شيخ الأسلام (إبن التمية) لـه ج١١ ص١٥٦ی (مجمـوع الفتـاوی)دا دەفەرموێ: لـه ڕۆژانـی شـومی كارەسـات -الحـره-دا، كـه ئـەو كارەسـاتە شوم و پڕ شەرمەزاريەيە كه له سـەردەمی حوكمڕانيـەتی (يەزيـدی كـوڕی موعاويـەی كـوڕی ئـەبو سـوفيان)دا ڕووی دا كـه ناخۆشـترين كارەسـات بووە بەسەر خەڵكی مەدينـەی پێغەمبـەری خواداﷺ هـاتووە لـەو كاتـەدا لە مزگـەوتی پێغەمبـەرداﷺ جگـه لـه (سـەعيدی كـوڕی موسـەيەب) هـيچ كەسـی تێـدا نـەمابوو، وه بـانگ لـه مزگـەوتی پێغەمبـەردا نـەدەوترا، سـەعيدی كـوڕی موسـەيەب دەفـەرموێ: كـاتی هـەموو نوێـژەكان لـه نـاو گۆڕی پێغەمبەری خواوەﷺ دەنگی بانگم دەبيست!!..

٣. لـه وڵاتـی توركيـا دوای ڕوخـانی خەلافـەتی عوسمـانی و هاتنـه سەر حوكمی ئەتاتوركی ڕەگەز پەرسـتی دژ به ئيسلام، بڕيـاری دەركـرد كه نابێ بانگ له هيچ مزگەوت و شـوێنێكدا بگـوترێ، چەند سـاڵ بـانگی ئيسلامی قەدەغه كرد، كەچی هەر دوای نەمانی ئەتاتورك و بونی تۆزێك ئـازادی، بـانگی ئيسلام لـه هـەموو شـوێنێكی توركيـا لـه جـاران دەنگـی زوڵاڵتر بۆوە،زياتر له (٤) مليۆن حافز قورئان بونی خۆيان ڕاگەياند!!

بەڵێ ئيمانداران: كه خـوا دەفەرموێ: (إنّا نَحن نَزَّلنـا الـذكرَ وَ إنّـا لـهُ لَحافظون) جا چۆن قورئانەكه دەپارێزێ، ئاوا بـانگ و قامـەت و مزگـەوت و نوێژ و ئەهلی مزگەوتيش دەپارێزێ هەتا ڕۆژی قيامەت إنشاء الله

بە داخەوە لەم سەردەمەشدا ڕێز و حورمەت وەکو پێویست بۆ بانگ دانانرێ، یەکێ لەو گرنگی پێ نەدانە ئەوەیە کاتێ وەزارەتی ئەوقاف بانگبێژ بۆ مزگەوتەکان تەعین دەکات و موچەی مانگانەیان پێ دەدات. هیچ گوێ ناداتە ئەوەی کە ئەو کەسەی دەبێتە بانگبێژ ئایا ڕادەی دینداری و دڵسۆزی بۆ ئیسلام چۆنە؟ هەر تەنها وەکو موچەخۆرێك دەوام دەکات ئەگەر سەرەی دەوامی نەبێت بە ناو مزگەوتدا دەڕوات و نوێژەکەی ناکات، یاخود ئەگەر موچەکەشی ببڕدرێ عەشقی بۆ ئیسلام و پێغەمبەری خواﷺ وەکو دوو بانگدەرە بەناو بانگەکەی پێغەمبەری خواﷺ (بیلالی حەبەشی و عبداللهی کوڕی ئوم مەکتوم) ڕۆحی خۆی فیدای ئیسلام دەکات.

وە بە داخەوە زۆربەی بانگبێژان لە بواری دەنگ خۆشیدا هیچ هەڵسەنگاندنێکیان بۆ ناکرێ لە کاتی دامەزراندنیاندا، بەڵکو زۆربەیان لە دەنگ ناخۆشەکانن و ئەو بانگە گەورە و کاریگەرە بە دەنگی ناخۆشیان کەم بایەخ دەکەن.

بەداخەوە چەندین بەرنامە لە تەلەفیزیۆنەکانەوە ئامادە دەکرێو ڕەنج و پارەی زۆری بۆ صەرف دەکرێ، بۆ هەڵسەنگاندنی دەنگ خۆشی بۆ گەنجە تازە پێگەیشتوەکان تاوەکو گۆرانی بێژی تازەیان لێ دروست بکەن! بەلام نەمانبینی جارێك لە جاران بەرنامەیەك ئامادە بکرێ بۆ ئەو هەموو دەنگ خۆشە لاوەی کە ئەگەر بانگ بکرێن و هانبدرێن و

دامەزرێن دەنگخۆشترین بانگدەریان لیْ دەردەچیْ و ئەو کاتە بانگ مانا و واتای خۆی بۆ دەگەرێتەوە.

لە کۆتایدا دەڵێم: با لە خزمەتی بانگدا بین، بە ئەدەبەوە وەڵامی بدەینەوە، لە خزمەتی ئیسلامدا بین تا سەرفرازی دونیا و قیامەت بین.

سەچاوەکان:


١. فِقهُ السُنَة – سید سابق ج١ ص١١١
٢. فیقهی ئاسان – م. نوری فارس حەمە خان ب١ ل١٤٣
٣. مُغني المحتاج – خطیب الشربیني ج١ ص١٣٢
٤. الترغیب و الترغیب – للحافظ المُنذري – فەرموودەی ژمارە: ٢٥٦،٣٦٨،٣٨٠
٥. بەرەو ئیسلام – ئازادی – ئەندازیار عثمان محمد ل٣٥
٦. بەرەو ئیسلام – دڵنیایی – ئەندازیار عثمان محمد ل٦٩
٧. رێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون – م.علی باپیر ل٢٨٧

# وتاری دووەم بۆ مانگی رەجەب

# دیاری کردنی مەبەست لە ژیاندا

## بەشی یەکەم

# وتاری دووەم بۆ مانگی رەجەب

## (( دیاری کردنی ئامانج لە ژیاندا ))

## بەشی یەکەم

الحَمدُ للّهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعينَ.

ئیمانداران: زۆرێك لە خەڵكی وادەزانن ژیان تەنها یەكسانە بەوەی كە مرۆڤ چەند ساڵێك بژی و لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا تەنها خەریكی كاركردن و پارە پەیداكردن و بەدەستهێنانی شەهادە و ناو و ناوبانگ و پلە و پایە بن و لە بەرهەمی هەوڵ و ماندووبونیان خۆشترین خواردن و خواردنەوە بخۆن و بنۆشن و جوانترین پۆشاك بپۆشن، وە هاوسەرگیری بكەن و ئارەزووی جنسیان تێر بكەن و منالیان ببێ و ئیتر ژیان هەر ئەمەیە و ئاوا دەگوزەرێت و خۆشترین ژیان هەر ئەمەیە، ئەمە زۆربەی خەڵكی سەر زەوی وا بیر دەكەنەوە.

لەبەرامبەریشدا كەسانێك هەن دەڵێن: نەخێر دەبێ لە ژیان بەڕێكردنی تەمەندا مەبەست و ئامانجێك هەبێت و لەو شتانە هەمووی گەورەتر و ئەمانەی كە خەڵكانی تر وادەزانن ژیان هەر ئەوەیە، دەبێ هەموو ئەوانە لە خزمەتی گەیشتن بەو مەبەستەدا بن.

بەڕێزان: ئەم بابەتە بەزۆری بۆ لاوانە چونكە بەساڵاچوان ئامانجی خۆیان دیاری كردووە لە ژیاندا، وە لە ڕاستیدا گەنجێتی جوانترین قۆناغی ژیانە، لەبەر ئەوەی منالی قۆناغێكە ژیری تێدا نییە، وە پیری تەمەنی دانایيە بەڵام لاوێتی تێدا نییە، بەڵام گەنج و لاوەكان لە یەك كاتدا خاوەنی تەندروستی باش و لاشەی تۆكمە و بەهێز و ژیری و

تێگەیشتنی گونجاو و باشن، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: لە ڕۆژی قیامەتدا مرۆڤ پێش هەموو شتێك لەبەردەم خوای گەورەدا دەوەستێنرێت و پرسیاری لێ دەکرێت لە بارەی چوار شتەوە: تەمەن، گەنجیەتی، ماڵ و سامان چۆنت پەیدا کرد و لە چیدا صەرفت کرد،وە لە زانست و زانیاریەکەت، ئەمەش ئەو فەرموودەیەیپێغەمبەری خوایەﷺ کە دەفەرموێ: (لا تَزولُ قَدَماً عَبْدٍ يَوْمَ القيامَةِ حَتَّى يُسألَ عَن أرْبَعٍ : عَنْ عمره فيما أفناهُ، وَعَن شَبابه فيما أبلاهُ، وَعَن ماله من أيْنَ اكْتَسَبَهُ، وفيماأنفقَهُ، وعَن علْمه ماذا عَملَ به) رواهُ الترمذي

سەرنج بدەن هەموو تەمەن بە گشتی یەك پرسیاری لە بارەیەوە لەسەرە، بەڵام تەمەنی گەنجێتی بەتەنها پرسیارێکی تایبەتی لەبارەیەوە هەیە!. جا بەڕاستی پرسیار کردن لە تەمەن و وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە گەورەیە قورس و گرانە، گرانتریش لەوە وەڵامدانەوەی ئەوەی کە تەمەنی لاوێتیت لە چیدا بەسەر برد کە گرنگترین و هەستیارترین قۆناغی ژیانە!.. هەر بۆیە زۆر جێگای خۆیەتی هەریەك لە ئێمە هەر ئێستا کە لە ژیاندا ماوین، پێش ئەوەی بگەینە قیامەت و ئەو پرسیارانەمان لێ بکرێ، هەر ئێستا پرسیار لە خۆی بکات بۆچی دەژی و لە ژیاندا چی کردووە.

ئیمانداران: دیاری کردنی ئامانج لە ژیاندا زۆر گرنگە، چونکە ئەوەی مرۆڤ بەڕێز دەکات بوونی ئامانجە لە ژیاندا، لەبەر ئەوەی ژیان ئەگەر هەر خواردن و خواردنەوە و جوتبوون و زۆربوون و مردن بێت و تەواو، کەواتە جیاوازی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ چییە؟!

ئەمڕۆ کۆمەڵگاکەمان ئازاری لاوانێکی زۆری بێ ئامانج دەچێژێ. ڕۆژانە عەرەق خانە و قومارخانە و بلیارد و شوێنی خراپە کاری زیاد دەکات و بۆتە باشترین پڕۆژەی ئابووری بۆ کەسانی بێ هەست و بێ دین و ڕەواجێکی زۆری هەیە، سەرجادەکان بە شەو وبە ڕۆژ پڕە لە گەنجی بێ ئیش و بێ کار کە خەریکی خۆ بەنج کردن و خۆ سەرخۆش کردنە و بێزارە لە ژیان چونکە نازانێ ئامانجی چییە لە ژیاندا.

زۆر لە کچان و خوشکان هەموو ئاوات و خەون و خەمیان هەر ئەوەیە چۆن نوێترین مۆدی جل و بەرگ و میکیاژ و ئاڵتوون بەدەست بهێنن، هەموو دەنگ و باسیان تەنها ئەوەیە فلان ئەوەی کڕی و چووین بۆ ئەو ئاهەنگە و ئەمەمان خوارد... هتد

بەڕاستی ئەمە نیشانەی ڕوخانی کۆمەڵگایە کە هەموو خەم و کێشەی کچێك ئەوە بێت ئایا جوانە و دەتوانێ سەنجی کوڕێك بەلای خۆیدا ڕابکێشێت یان نا، وە هەموو ئاواتی کوڕێك ئەوە بێت ئایا کچێك موعجەبە پێی یان نا؟!

زانایانی کۆمەڵناسی ئەگەر بیانەوێت بزانن وڵاتێك و میللەتێك گەشە دەکات یان دەفەوتێت فۆرم دابەش دەکەن و بزانن: ئایا ئارەزوو مەبەستی لاوان چییە لە ژیاندا؟! ئایا خەون و ئاواتی گەورەیان هەیە،یان حەز و ئارەزووی منداڵانە و بچکۆلانە؟!

بۆ زیاتر ڕرونکردنەوە ئەم نمونەیەتان پێشکەش دەکەم:

موسڵمانان ماوەی (٨٠٠) ساڵ لە ئەندەلوس مانەوە و ئەو وڵاتەیان ئاوەدان کردەوە، بە شارستانی و زانست و زانیاری و دینداری، پورتوگالیەکانیش ناڕازی بوون بە بوونی موسڵمانان لە ئەندەلوسدا،

بیریان کردەوە چی بکەن، بۆ ئەم مەبەستەش کۆمەڵێك سیخوریان ناردە ئەندەلوس، چ شتێ جێی بایەخی لاوانی موسڵمانانە، ئەوە بوو سیخورەکان دەستیان کرد بە چاودێری لاوان و یەکێکیان چاودێری دوو لاوی کرد کە دیار بوو لە گفتوگۆیەکی گەرمدا بوون، کە لێیان نزیك بویەوە گوێی بۆ شل کردن تێگەیشت کە گفتوگۆکەیان لەسەر فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوایەﷺ لەسەر سەنەد و مەتنی فەرموودەکە گفتوگۆ دەکەن، ڕاپۆرتی نوسیەوە و وتی بە پرتوگالیەکان: دڵنیا بن جارێ موسڵمانان لە ئەندەلوس ناکرێنە دەرەوە!. دوای چەند ساڵێکی تر سیخوورێکی تر چاودێری دوو لاوی موسڵمانی کرد کە خەریکی گفتوگۆ بوون، لێیان نزیك کەوتەوە و سەرنجی دان تەماشای کرد ئەم جارەیان گفتوگۆ دەکەن لەسەر باسێکی زانستی لە فیزیا و کیمیادا ڕاپۆرتی نوسیوەوە و وتی: هێشتا نائومێدین!دوای چەند ساڵێکی تر دەزگای سیخوری پورتوگالی هەواڵی دا بەوەی کە ئێستا کاتی هێرش بردنە سەر ئەندەلوسە و بە ئاسانی موسڵمانان دەکرێنە دەرەوە، بەڵگەشمان ئەوەیە ئەمجارە گوێمان لە لاوێك گرت کە دەردە دڵی خۆی بۆ هاوڕێکەی هەڵدەڕشت و دەگریا و دەیوت هاوڕێ کچەکەم بەجێی هێشتم و پەیوەندی لەگەڵ کوڕێکی تر بەستووە!!..

ئەوە بوو پورتوگالیەکان تێگەیشتن مادام لاوانی موسڵمان ئاوات و مەبەستەکانیان ئاوا بچووك بوونەوە ئیتر ناتوانن بەرگری لە وڵات و ئاینەکەیان بکەن و هێرشیان بردە سەر ئەندەلوس و موسڵمانانیان دەرکرد و دوای (٢٥) ساڵ ناوی ئەندەلوس نەما و سڕایەوە بەڵێ ئیمانداران: دیاری کردنی ئامانج لە ژیاندا ئەوەندە گرنگە، بۆیە لە

ئەمریکا هەفتانە وانەیەك دەوترێ بە قوتابی لە تەمەنی -٨- ساڵەوە تاوەکو تەمەنی -١٢- ساڵ کە باس لە دیاری کردنی ئامانج دەکات، دیارە منالێکی هەشت ساڵ هیچی وا نازانێت بەڵام یارمەتی مامۆستاکەی و باسکردنی بەردەوامی بۆ چوار ساڵ ئەوەی کە پەروەردە مەبەستێتی دەیهێنێتە دی کە لاوەکانیان ئامانج بۆ خۆیان دانێن، جا هەرچەند باری کۆمەڵایەتییان شێواوە و فەوزای جنسی هەیە، بەڵام ئەم هەوڵەی باسمان کرد جێی سەرنجە لە ئیسلامدا و هەر لە سەرەتاوە گرنگی دراوە بەم لایەنە و قورئان و فەرموودە ئامانجی ژیانیان دیاری کردووە هەروەك قورئان دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات: ٥٦

خۆزگە هەر یەکەمان زوو بەرنامەی ژیانمان دیاری بکرایە و ئەوەندەی تەمەنمان ماوە بزانین چی دەکەین و بەرەو کوێ دەچین، چونکە هەر کەسێ نەزانێت بۆ کوێ دەچێت و بە کوێدا دەڕوات لە کۆتاییدا سەرگەردان دەبێ و دەبێ گلەییش هەر لە خۆی بکات.

بەڕێزان: پرسیارێکی گرنگ کە پێویستە بکرێت و وەڵامیشی بدرێتەوە ئەوەیە کە: ئایا ئەو هۆکارانە چین کە دەبنە هۆی نەبوونی ئامانج لە ژیاندا.

١. تێنەگەیشتن لە بەرنامەی ڕاست و دروستی خوا کە ئیسلامە و قورئان و سوننەت سەرچاوەکەیەتی، لەبەر ئەوەی هەر کەسێك بە وردی لە ئیسلام تێبگات زۆر بە ئاسانی ئامانجی ژیانی خۆی بۆ دەردەکەوێ و دەزانێ بۆچی هاتۆتە سەر زەوی و دەبێ چی بکات بۆگەیشتن بەو ئامانجە،کە ئامانجەکەش ڕوون و ئاشکرایە کە بریتی یە لە بەندایەتی خوا و ئاوەدان کردنەوەی سەر زەوی بە پێی ئەو شەریعەتی ئیسلامەی کە کاڵایەکە پڕ بە باڵای مرۆڤایەتی و هەمووی ڕەحمەت و عەدالەت و

خۆشبەختی دونیا و دوارۆژە، جا ئەگەر ژیان ئاوا بەسەر برا ئەنجامەکەشی گەیشتنە بە ڕەزامەندی خوا و بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ و هەموو پێغەمبەران و چاکان و پاکان لە بەهەشتی بەریندا.

٢. لاوازی هیمەت: بەڵێ بێهیمەتی وا لە مرۆڤ دەکات کە دوای فەشەل هەڵنەسێتەوە و نەگات بە هیچ ئامانجێك و ئەو ئامانجەش کە هەیەتی بیری بچێتەوە،

بۆ نمونە: خوێند کارێك ئامانجێکی گەورەی لە بیر و هۆشی خۆیدا دیاری کردووە کە لە سەرەنجامی خوێندنەکەیدا پێی بگات، وای داناوە لە دواڕۆژدا ببێتە پزیشك، مامۆستا، بەڵام کاتێك لە خوێندنی ساڵێکدا سەرکەوتوو نابێ، ئەگەر خوێند کارێکی هیمەت لاواز بێت ئەوا بە تەواوەتی دەروخێ ئامانجەکەی خۆی لە بیر دەچێتەوە، بەلام کە لە سەرەتای چوونە قوتابخانەیە وە ئامانجی ئەوە بوو کە ببێ بە دکتۆر، لە شەشی زانستیدا سێ ساڵ ماوەتەوە سەرەنجام هەر لە کۆلیژی پزیشکی وەرگیراوە و ئێستا دکتۆرە!..

مێژوو ناوی چەند کەسی هیمەت بەرزی تۆمار کردووە کە سەرەڕای ئەو هەموو نەهامەتییانەی هاتۆتە ڕێگەیان کەچی هەر گەیشتوونەتە ئەو ئامانجەی کە لە ژیاندا دیاریان کردووە.

بۆ نمونە: پیاوێك لە فەلەستین به ناوی (ماجد اقبالیه) کە خەڵکی (ئوم فەحم) بوو، خاو و خێزانێکی سیانزە کەسی بەسەردا کەوتبوو، تەمەنی نۆ ساڵ بوو کە باوکی مرد، بە هەتیوی پێ گەیشت، بە ڕۆژ بە کرێکاری بژێوی پەیدا دەکرد و بە شەویش دەیخوێند تا قۆناغەکانی

خوێندنی تەواو کرد و گەیشتە خوێندنی باڵا و ماجستێری لە (ئیدارەی ئەعمال)دا بەدەست هێنا و پاشان دکتۆرای خوێند لە (نَظم المعلومات)داو بووە یەکەم لێکۆڵەری جیهان لە (نَظم المعلومات)دا لە ساڵی (١٩٩٧)تەوە تا ساڵی (٢٠٠٢) کە وەفاتی کرد بە نەخۆشی شێرپەنجە لە تەمەنی (٤٤)ساڵیدا لە ئەمریکا...

هەروەها (دیفید هارتمان) پیاوێکی کوێر بوو، کەم ئەندامیەکەی نەبووە رێگر و توانی بە هیمەتی بەرزەوە بخوێنێ و دکتۆرا بهێنێت لە -طب-دا.

یاخود (هیروتادا ئوتوتاکی) پیاوێکی یابانیە و دەست و قاچی نەبوو، پەڕاوێکی نوسی چوار ملیۆن دانەی لێ فرۆشرا!!

بەڵێ بە سەدان نمونە هەن لەم بابەتە کە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەو ڕاستیەی کە پرۆفیسۆر (زەغلول نەجار) دەڵێ: کەم ئەندام ئەوەیە کە لە ناخیدا کەم ئەندام بێت..

پێشەوا موسلیم لە صەحیحەکەیدا فەرموویەتی: یەحیای کوڕی ئەبی کەثیر فەرمووی: (لا يَنال العِلْمُ بِراحَةِ الجِسمِ) زانست بەدەست نایەت بە ئیسراحەت و پشوی لاشە.

هەروەها وتویانە: (مَنْ طَلَبَ الرَّاحة تَرَكَ الرَّاحة) هەر کەسێ بیەوێ بگات بە ئیسراحەت و حەسانەوەی تەواو ئەوا دەبێ واز لە ئیسراحەت و پاڵدانەوە بێنێت!

بەڕێزان: دیاری کردنی ئامانج لە کار و کەسابەتیشدا زۆر گرنگە، هەر کۆمپانیایەك کە پێك دێت ئەگەر بیانەوێ بەرچاو ڕوون بن و داهاتوویەکی باشیان هەبێت، دەبێت ئامانجی کۆمپانیاکە و بەرنامەی کاریان دیاری بکەن، بۆ نمونە کۆمپانیای (سۆنی یابانی) کە نزیکەی

سی ساڵ لەمەوبەر دامەزرا ئامانجێکیان بۆ خۆیان دیاری کرد کە ئەویش بریتی بوو لەوەی کە بەرهەمی یابانی ببێت بە مونافیسی ژمارەیەك لە بازاڕەکانی ئەمریکا و پاش هەوڵ و زەحمەتی زۆر توانیان زۆر بچنە پێشەوە و ئامانجیان بهێننە دی..

پیاوێك بۆچونێکی بۆ دروست بوو بۆ بەرەو پێشبردن و چاکتر کردنی ئوتومبیل، چوو بۆ کۆمپانیای ئوتومبیلی تۆیۆتا وەڵامیان نەدایەوە، بۆیە ئاڵتوونی هاوسەرەکەی فرۆشت و کارگەیەکی دانا، بەهۆی جەنگەوە ڕوخا، دروستی کردەوە و جارێکی تر ڕوخا، ئەمجارەش دروستی کردەوە بەڵام ئەمجارە بە بومەلەرزە ڕوخا، بەلام هەر وازی نەهێنا و سوور بوو لەسەر بەدەست هێنانی ئامانجەکەی ئەوە بوو سەرلەنوێ دروستی کردەوە ئەمجارە سەرکەوتنی بەدەست هێنا و ئاوات و خەیاڵەکانی هاتنە دی و بوو بە خاوەنی کۆمپانیای گەورەی (هۆندا) کە پێشبڕکێ دەکات لەگەڵ گەورەترین کۆمپانیا بەناوبانگەکانی جیهاندا.

بەڵێ هیمەت بەرزی دەتگەیەنێتە ئامانجەکانت و لاوازی هیمەتیش وات لێ دەکات دوای فەشەل هەڵنەسیتەوە و تا ماوی بێ ئامانج بیت، هەر بۆیە پێغەمبەری خواﷺ بەردەوام ئەم دوعایەی دەخوێند و ئومەتەکەشی فێرکرد کە بڵێن: (اللّهم إنّي أعُوذُ بكَ منَ العجْزِ والكَسَلِ).

٢. نەبونی پێشەنگ: یەکێ لەو هۆکارانەی کە کاریگەری تەواوی هەیە لەسەر بونی ئامانج و مەبەست بۆ مرۆڤ بریتیە لەوەی کە چاو لە کەسانی پێشەنگ بکات، کە تۆ سەیرت کرد سەرکردەکەت بێ ئامانج دەژی، تۆی هاوڵاتی چۆن ئامانجدار دەژی؟

با بچینە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ کاتێك قورەیشیەکان بۆ تۆڵەی بەدر هاتنە سەر مەدینە و پێغەمبەری خواﷺ ئەم هەواڵەی پێ گەیشت

کە قورەیش هەموو هێز و توانای خۆی کۆکردۆتەوە و گەنج و پیریان تەنانەت ئافرەتیشیان هاتونەتە دەرەوە و دەیانەوێ بە توندی لە موسڵمانان بدەن و شاری مەدینە بگرن و تۆڵەی شەڕی بەدر بکەنەوە، پێغەمبەری خواﷺ ڕاوێژی بە هاوەلان کرد، پیرەکان وتیان: با لە ماڵەکانەوە شەڕ بکەین و لە مەدینە نەچینە دەرەوە، بەلام گەنجەکان کە زۆرینە بوون، بەتایبەت ئەوانەی شەرەفی بەشداری شەڕی بەدریان بە نسیب نەبوو، زۆر بە سوربونەوە وتیان: ئەگەر نەچینە دەرێ بۆیان ئەوا بە ترسنۆکمان دەزانن، ئەوەبوو زۆرینە لەگەڵ چونە دەرەوە بوو، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ ڕۆشتەوە بۆ ماڵەوە و چەکەکەی کە شمشێر و تیروکەوان و زرێی جەنگی بوو پۆشی و هاتەوە بۆ مزگەوت، لەم ماوەیەدا تا پێغەمبەری خواﷺ چووە ماڵەوە و خۆی ئامادە کرد و هاتەوە بۆ مزگەوت، گەنجەکان کە زۆرینە بوون، لەناو خۆیاندا وتیان: بەڕاستی دیار بوو کە پێغەمبەری خواﷺ خۆی ڕەئی لەسەر مانەوە لە ناو مەدینەدا بوو، بەلام ئێمە کە زۆربەی دەنگەکانمان بۆ چونە دەرەوەی مەدینە مسۆگەر کرد، لەبەر ڕێزی ڕەئی ئێمە ئەویش ڕازی بوو، بۆیە وا چاکە بە پێغەمبەری خواﷺ بڵێین: چۆنت پێ چاکە وا بکە و ئێمە لە خزمەتداین با نەچینە دەرەوە، کاتێ ئەم قسەیان بە پێغەمبەری خواﷺ گەیاند. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (ما كانَ لنَبيٍّ أنْ يَلْبَسَ لأمَتَهُ ثُمَّ يَرْجِعَ حَتَى يَحكُمَ اللهُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ عَدُوِّه) بۆ ئەوەی فێری دامەزراویان بکات و دوور بن لە دوودڵی و ڕاڕایی و بڕیار گۆڕین لە کاتی بڕیاردانی چارەنوس سازدا..

کەواتە: مرۆڤی مەبەستدار نابێ ڕاڕا و دوودڵ بێ، وە نابێ ئەگەر بەکار بهێنێ ، ئەگەر وام نەکردایە وانەدەبوو، ئەگەر وام بۆ بکردایە وام بۆ دەبوو، ئەمە قسەی کەسی ئامانجدار نیە.

پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (إسْتَعنْ باللهِ ولا تَعْجَز، و إن أصابكَ شَيءُ فَلا تَقُلْ: لَو أنِّي فَعَلْتُ كَذا كانَ كَذا وَ كَذا، وَلكنْ قُلْ: قَدَّرَ اللهِ وَماشاء فَعَلَ، فَإنَّ (لَوْ) تُفْتَحُ عَمَلَ الشَّيْطانِ) رواهُ مُسلم

واتە: پشت بە خوا ببەستە و دەست لە ئەژنۆ دامەنیشە و بەردەوام داوای یارمەتی لە خوا بکە، لە ژیاندا کەسێکی هیمەت بەرز بەو بەرامبەر نەهامەتیەکانی ژیان چۆك دامەدە و ئەگەر کارەساتێکی ناخۆشت توش بوو هەرگیز مەڵێ: ئەگەر بهاتایە من وام بکردایە، ئەوا ئاوا و ئاوا دەبوو، بەڵکو بڵێ: خوای گەورە بڕیاری داوە و ئەوەی خوای گەورە مەبەستی بێ هەر ئەوە دەبێ، چونکە وشەی (ئەگەر) دەرگای کارکردنی شەیطان لەسەر مرۆڤ دەکاتەوە و لەو ڕێگەی ئەگەر وام نەکردایە وا نەدەبوو، شەیطان دەتوانێ کار لە مرۆڤ بکات و لە خوای دوور بخاتەوە..

٣. خاڵی سێیەم لەو هۆکارانەی کە وا لە مرۆڤ دەکەن ئامانجی نەبێ لە ژیاندا لەدەستدانی متمانە بەخۆبوونە، زۆرکەس بۆیە بێ مەبەست و ئامانجە لە ژیاندا چونکە متمانەی بە خۆی نەماوە، ئینسانیش بەرهەمی بیرکردنەوەکانیەتی.

کاتی خۆی ئیمپراتۆری ڕۆمانی (مارکۆس اورلیوس) وتویەتی: (إنَّ حياتنا منْ صُنَع أفْكارنا) بە ڕاستی ژیانمان لە بەرهەمی بیرکردنەوەکانمانەوە سەرچاوەی گرتووە.. جاری وا هەیە لە ژیاندا دوو کەس توشی یەك گرفت دەبن، یەکیان متمانە لە دەست نادا و ئەوی تر ئەژنۆی دەشکێ بەرامبەر هەمان گرفت و کارەسات، ئەگەر پێشتر مەبەستدار بوبێ، ئێستا بێ ئامانج دەبێ، بۆ نمونە:

کاتێك (عبدالله ی کوڕي عَباس) کە ئامۆزای پێغەمبەرە و پێی دەوترێ (حبرُ الأمَّة) لەبەر شارەزایی و زۆری تێگەیشتنی بۆ قورئانی پیرۆز، ئەم صەحابە گەورە و خاوەن قەدرە کاتێ هەردوو چاوی لەدەستدا و نابینا بوو، بەم شێوەیە تەعبیری ناوناخی خۆی دەربارەی نابینابیەکەی دەربڕی کە فەرمووی:

إنْ يأخُذ اللهُ من عَيني نُورَهما — فَفي لساني وسَمعي منهُما نُورُ
قَلبي ذَكيٌ وعَقلي غَيرُ ذي دَخَلٍ — وَفي فَمي صارمٌ كالسَّيف مَأثُورُ

واتە: ئەگەر خوای گەور و دادپەروەر ڕوناکی هەردوو چاومی لێ وەرگرتومەتەوە، ئەوا لە زمان و گوێچکەمدا نور و ڕۆشنایی داناوە، دڵم زیرەکە و بەئاگایە و عەقڵ و فیکرم هیچ کەم و کوڕی تێدا نییە، وە ئەوەش کە بمەوێ دەری ببڕم ئەوا لەناو دەممدا زمانێکی کارا هەیە وەکو شمشێر دەتوانێ ناحەزان دەمکوت بکات.

وە هەروەها (بَشار بن برد) کە شاعیرێکی گەورەیە، کاتێ کە نابینا بوو، وە ناحەزانی تانەیان لێ دەدا بەوەی کە کوێر بوە، وەڵامی دانەوە بەم چەند دێڕە شیعرە و وتی:

وَعَيَّرَني الأعْداءُ وَالعَيْبُ فيهمُ — فَلَيسَ بعار أنْ يُقالَ ضَريرُ
إذا أبْصَرَ المَرءُ المُروُءَةَ و التُّقَى — فإنَّ عَمَى العَيْنَيْن لَيسَ يَضيرُ
رَأَيْتُ العَمَى أجْراً وَ ذُخْراً و عصْمَةً — وَإنِّي إلى تلكَ الثَّلاث فَقيرُ

واتە: ناحەزانم تانە و تەشەرم لێدەدەن و عەیب و کەم و کوڕیش لە خۆیاندایە، هیچ عەیبە و کەمیەك لە وشەی (نابینایی)دا نیە، چونکە ئەگەر مرۆڤ چاوی دڵی پیاوەتی و مەردی و خۆپارێزی بینی، ئەوا کوێری چاو نابینایی نییە، من بینیم کە نابینایی بونم سێ خەڵاتی خوای تێدایە بۆ من، ئەوانیش: پاداشتی لای خوا (وەکو لە فەرموودەکەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتووە کە هەر کەسێك خوای گەورە ڕوناکی هەردوو چاوی لێ وەر بگرێتەوە و ئەویش ئارام بگرێ و ڕازی بێ بەو قەدەرەی کە بەسەریدا هاتووە پاداشتی لای خوا تەنها بەهەشتە). وە هەروەها بەهۆی ئەو نابینا بوونەوە چاوی دڵم کەوتۆتە کار و ئێستا زیاتر شت دەبینم و جوانتر لە شتەکان تێدەگەم، وە ئەو نابینایی‌یەش بۆتە پارێزگایم لە بینینی شتە حەرامەکان و نەزەر ناکەم و

ماڵ و حاڵی کەس نابینم و حەسودی بە کەس نابەم عەیب و کەم و نوری کەس نابینم تاوەکو تانە و تەشەری لێبدەم، کەواتە: نابینایی بونەکەم پاداشتی لای خوای تێدایە، وە خەڵاتی خوای تێدایەبۆم نەك مایەی بێڕێزی و عەیب و کەمیبیٚ بۆم.

ئەمە نمونەی دوو کەسی هیمەت بەرز، کە نابینا بوون نەك هەر نەیترساندن و ئەژنۆی نەلەرزاندن، بەڵکو هیمەت و ورەی زیاتر بە خۆیان بەرزکردنەوە، جا وەرە ئەم هیمەتە بەراورد بکە لەگەڵ کەسێکی تر کە توشی نابینایی بوە کە ئەویش (صالح بن عبد القدوس)بوو کە ئەویش شاعیر بووە، کاتیٚ چاوەکانی لەدەست دا وتی:

عَلى الدُّنيا السّلام فَما لشَيْخٍ ضَرير العَيْن في الدُّنيا نَصيبُ

يَموتُ المَرءُ وَهوَ يُعَدُّ حَيّاً وَيُخلفُ ظَنَّهُ الأَمَلُ الكَذوبُ

خوا حافیزی لە دونیا ئایا چی هەیە بۆ پیاوێکی پیری نابینا لە دنیادا، ئایا چ بەش وبەهرەیەك ماوە بۆ کەسێکی نابینا و پیر و بەساڵاچوو، مرۆڤی وەکو من مردووەو بە زیندوو ئەژمار دەکریٚ لە شوێنی بەجیٚ دەمێنیٚ کۆمەڵیٚ گومان و هیوا و ئاواتی درۆ!!..

تەماشاکەن ئەمیش هەر نابینایە بەلام چۆن ورەی بەرداوە و هیچ ئومێد و ئاواتێکی لە ژیاندا نەماوە، لە کوردستانی خۆشماندا دەیان کەسی ناودارمان هەیە کە نابینا بوون وەکو مەلا حەمدونی شاعیر کە چەندین بەسەرهاتی لیٚ دەگێڕدرێتەوە کە هەمویان نمونەی هیمەت بەرزی ئەو کەسە دەردەخەن، وە چەندین کەسی تری کەم ئەندام هەیە کە بەوپەڕی متمانە بەخۆبونەوە بژێوی ژیانیان پەیدا دەکەن و بەدەم ژیانەوە پێدەکەنن و هەرگیز مل بۆ کەس کە چ ناکەن، درێژەی ئەم باسە لە وتاری داهاتودا تەواوی دەکەین إنشاء الله.

# وتاری سێیەم بۆ مانگی ڕەجەب
## ((دیاری کردنی ئامانج لە ژیاندا))
## بەشی دووەم

الحَمدُ للّٰهِ رَبّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعِينَ.

ئیماندارانی بەڕێز: لە وتاری ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد. گەورەیی مرۆڤ ئەوەیە کە خاوەنی ئامانج بێت لە ژیاندا، بۆیە زانایان فەرموویانە: خەڵکی سێ جۆرن:

جۆری یەکەم: کەسانێکن کە بە دیمەن و ڕواڵەت زیندوون و دەجوڵێن و دێن و دەچن، بەڵام لە ڕاستیدا مردوون، وەکو وتراوە (حَيٌ كَمَيِّت، مَوْجُود كَمَفقُود) مردووە و بەشی زیندوو دەخوات، لەبەر چاوانە بەڵام بە نەبوو حیسابە، کاتێ لە ژیاندایە هیچ جێگای دیار نییە وە کاتێك دەمرێ هیچ کەلێنێك لە کۆمەڵگەدا چۆڵ ناکات، ڕۆژێك لە ڕۆژان شوێنی لە مزگەوت و جومعە و جەماعەتدا نەبووە، تا کاتێ دەمرێ جێگای نوێژەکەی دیار بێ، لەناو فەرمانگە و شوێنی کەسابەت و هەوڵ و هیمەت و زانستدا، کەسێکی ئەوەندە دڵسۆز و خزمەتگوزار نەبووە بۆ کۆمەڵ کە کاتێك لە ژیاندایە خەڵکی ئامارژەی بۆ بکەن و دوعای بۆ بکەن،وە لە دوای مردنیشی مەگەر ئۆخەی بکرێ بۆ مردنیان و چۆڵکردنی ئەو جێگە و پێگەی کە بە ناڕەوا داگیریان کردبوو، بەداخەوە کەسانێك هەن لە دنیادا کە لە کوێوە بای بێت لەوێوە شەن دەکات و وەکو قانگەلاشك بەدەم باوە دێت و دەچێ و هەرجارەی لە جێگایەکە،

ڕەکو گوڵە بەڕۆژە هەرجارەی ڕووی لە لایەکە، ئەمەش لە ئەنجامی بێبەرنامەییە بۆ ژیان و نەبوونی ئامانجە لە ژیاندا، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَا ۚ أُولَٰئِكَ كَالْأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ﴾ الأعراف: ١٧٩

واتە: سوێند بە خوا بێگومان ئێمە زۆر لە پەری و ئادەمیزادمان بۆ دۆزەخ دروست کردووە، ئەوانە دەزگای دڵیان هەیە کەچی حەقی پێ تێ ناگەن، چاویشیان هەیە کەچی حەقی پێ نابینن، گوێیان هەیە کەچی حەقی پێ نابیستن، ئائەوانە وەکو ئاژەڵ وان (لە شوێن کەوتنی ئارەزوودا) بەڵکو ئەوانە وێڵتریشن، ئائەوانە هەر غافڵ و بێئاگان لە حەق.

بەڵێ کەسێك لە ژیانیدا بەو عەقڵ و بیر وهۆش و دڵ و ناخەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوە لەجیاتی بیر کردنەوەی جوان و داهێنانی بەسود و بیری پەسەند، خەریکی ئەوەبێ کە پڕی بکات لە ڕق و قین و بوغز و پیلان دارشتن بۆ لەناو بردنی کەسانی بێتاوان، بەو چاوەی کە بۆ ئەوە پێی بەخشراوە کە لەزەت و خۆشی لە ژیان و ژینگە وەربگرێ پێی و سەیری کەونی پێ بکات و زیاتر گەورەیی و دەسەڵاتی خوای بۆ دەربکەوێ، کەچی بەو چاوە سەرنجی شەرەف و ناموسی خەڵکی پێ بدات و چاوی بە سەیر کردنی ڕەگەزی بەرامبەر کە حەرامە پێی تێر بکات و بەو چاوەی سەرنجی ماڵ و سامان و مناڵ و گوزەرانی خەڵکی بدات و بەچاویانەوە بکات و خۆزگەی لەناوچوونیان بۆ بخوازێت، بەو گوێیەی کە ئەو هەموو دەزگا گرنگەی تێدا دانراوە بۆ ئەوەی کە خێری

پێ ببیستێ. ئەو هەموو وشە خێرە بەو گوێیانەت ببیستی و ژیانی خۆت و کەسانی تری پێ ڕازاوە بکەیت، کەچی لەجیاتی ئەوە گوێ بگرێ بۆ ئامێرێکی سیخوری کردن بەسەر کەسانی دەوروبەرەوە و گوێ هەڵخستن بۆ وشەیەك بە مەبەستی گەیاندنی بە شوێنێك و توشکردنی قسەکەرەکە و دروست کردنی فیتنەیەك لە نێوان کەسەکاندا، بەڕاستی کەسی ئاوا کە دڕکی ناو کۆمەڵگان لەجیاتی ئەوەی گوڵ بن، هەر بۆ جەهەنم باشن، خوای گەورە بە لوتفی خۆت بمانپارێزی لەم جۆرە کەسانە.

جۆری دووەم کەسانێکن کە هەموو ئاوات و هیوایەکیان لە دنیادا تەنها بریتییە لە بەدەست هێنانی پارە و سامان و دەوڵەمەند بوون و خۆش خۆری و جوانپۆشی، ئیتر گرنگ نییە چۆن بەدەستی دەهێنن بە حەلاڵی یان حەرامی، ئەمانە لەجیاتی خواپەرستی،کورد زۆر جوان ناوی ناون. پارە پەرست. پارە مەعبودیانە و لە خزمەتیدان و پارێزگاری لێ دەکەن، نەك پارە بکەنە خزمەتکاری خۆیان و کۆمەڵگایان، زۆرجار ئەم کەسانە لە پێناوی پارەدا ڕۆحی خۆیان دەردەکەن و خۆیان دەکوژن، بۆ نمونە: لە کۆتایی ڕۆژەکانی ساڵی ۲۰۰۸دا ئەڵمانیەکی دەوڵەمەند زیانە مادیەکانی پێ قبوڵ نەکرا، کە بەهۆی قەیرانە داراییەکەی ساڵی ڕابردوو بەسەری هات، بۆیە لەسەر هێلێکی ئاسنینی شەمەندەفەر خۆی کردە قوربانی سەروەت و سامانە لەکیس چووەکەی، سەبارەت بە ڕوداوی خۆکوشتنی ئەو پیاوە ئەڵمانیە سەرچاوەکانی هەواڵی ئەو وڵاتە بڵاویان کردەوە کە تەرمی (ئەدۆڵف مێرکڵ)ی تەمەن (٧٤)ساڵ لە لایەن کارمەندێکی هێڵی ئاسنین دۆزراوەتەوە هەروەها بەرپرسانی ئەمنی ڕایان گەیاندووە (ئەدۆڵف مێرکڵ) ملیاردێری ئەڵمانی لە شاری (ئۆڵم) لە

باشوری ڕۆژهەڵاتی ئەڵمانیا لەسەر هێڵێکی شەمەندەفەر خۆی کردووە بەژێر شەمەندەفەرەکەوە و کۆتایی بە ژیانی خۆی هێناوە، لە لایەن خۆیەوە هاوسەری (مێرکڵ) هۆکاری خۆکوشتنی مێردەکەی گەڕاندۆتەوە بۆ ئەو قەیرانە ئابوریەی ساڵی ڕابردوو جیهانی گرتەوە، ئەویش زیانە مادییەکانی خۆی پێ قبوڵ نەکراوە و خۆی کوشتووە، جێی ئاماژەیە بەپێی سەرچاوە هەواڵیەکانی ئەڵمانیا مێرکڵ لە ڕیزبەندی لیستی —فربس—ی دەوڵەمەندەکانی جیهاندایە، بە بڕی دوانزە ملیار و هەشت سەد ملیۆن دۆلار، لە ساڵی ٢٠٠٧دا لە پلەی چلوچوارهەمین دەوڵەمەندی جیهاندا بووە، بەڵام دواتر بەهۆی شکستی داراییەوە پارەکەی بۆ نۆ ملیار و دووسەد ملیۆن دۆلار دابەزیوە و لە ڕیزبەندەکەشدا چۆتە پلەی نەوەدو چوارەمین دەوڵەمەندی جیهان!!. هەربۆیە ئەم پارە پەرستە، کە هەموو هیوا و ئاواتی لە ژیاندا تەنها پارە و پول بوو، تەحەمولی ئەو زەرەرەی نەکرد و خۆی کوشت!.

جۆری سێهەم: کەسانێکن کە بۆ ئامانجی زۆر گەورە دەژین، ئەوانیش ئیمانداران و خواناسانن کە ئامانجیان لە ژیاندا ئەوەیە بەندەیەکی گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار بن و بگەنە ڕەزامەندی خوا کە لوتکەی ئامانجی ئینسانی موسڵمانە، قورئانیش ئامانجەکەی بۆ دیاری کردون و دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات: ٥٦ .

بەندایەتی خواش ماناکەی زۆر زۆر فراوانە و بە شایەتمان دەست پێ دەکات و کۆڵەکەکەی کە نوێژە و ڕۆژووە و زەکاتە هەتا دەگاتە لابردنی دڕکێك، ئازارێك لە ڕێگەی خەڵکیدا و ڕازاندنەوەی باخچە بە گوڵ و گوڵزار بەکورتی هەموو خزمەتێکی مرۆڤ و خۆشکردنی ژیانی

مرۆڤ بە مەرجێك مەبەست پێی ڕەزامەندی خوا بێت و بەتەمای پاداشتی قیامەت بێت، بە عیبادەت و بەندایەتی خوا حیسابە.

بەڕاستی ژیان بەم جۆرە کەسە ئاماجدارە ڕاستەقینانەوە جوانە، کە کەسانێکن دروست دەکەن، ناروخێنن، خەندە دەخەنە سەر لێوان و فرمێسکی چاوی غەمباران دەسڕن، خەڵکی گوڵباران دەکەن و دڕك لە ڕێگایاندا لادەبەن، بۆنی عەتر و گوڵاو دەپرژێنن و دژی بۆنی باروت و خوێنن، حەز و هەوڵیان بۆ خۆش گوزەرانی و تێری و لەشساغی مرۆڤەکانە و دژی هەژاری و نەخۆشی و ناخۆشی و کزۆڵی و کلۆڵی دەجەنگن، هەموو ئەم کارانەش دەکەن و منەتیش بەسەر کەسدا ناکەن، خۆیان لە کەس بە گەورەتر نازانن، چاوەڕێی پاداشتیان تەنها لە خوای گەورەیە.

بەڕێزان: لە وتاری ڕابردوودا باسی ئەوەمان کرد کە هەندێ شت هەیە کە دەبێتە هۆی نەهێشتنی ئامانج لە ژیانی مرۆڤەکاندا، لەوانە هەندێکمان باس کرد وەکو: لاوازی هیمەت، نەبونی پێشەنگ، لەدەستدانی متمانە بە خۆبوون، ئەمرۆش بە پشتیوانی خوای گەورە دەچینە سەر خاڵی چوارەم کە بریتییە لە: نەمانی بەرز خوازی لای لاوان:

بەڵێ مرۆڤی بێ ئامانج و مەبەست تەنها هەر ڕۆژ بەرێ دەکاتو بۆ بەدەست هێنانی ئامانجێك ناژی، بەڵام بە پێچەوانەوە مرۆڤی مەبەستدار بەردەوام بیر لە شتی بەرز بەڵام پیرۆز دەکاتەوە، با بچینە لای لاپەڕەکانی مێژوو بزانین لەو بارەیەوە چی بۆ تۆمار کردووین:

سەدان ساڵ لەمەوبەر (محمدی کوڕی ئەبی عامر) لەگەڵ دوو برادەریدا لە شاری (قُرطبة) دەژیا لە گەڕەکێکی هەژاردا و خەریکی ئاو فرۆشتن بوو، ڕۆژێ بە هاوەڵەکانی وت: ئەگەر بووم بە فەرمانڕەوای ئەندەلوس چیتان ئەوێ بۆتان بکەم؟! یەکێکیان وتی: من دەمەوێ باخ و

بێستانێکم بدەیتێ و بژێویم بۆ پەیدا بکەی، ئەوی تریان وتی: شەرت بێت ئەگەر تۆی ئاوفرۆش ڕۆژێك بووی بە کاربەدەستی هەرەگەورەی وڵات پشتاوپشت سواری گوێدرێژێکم بکە بە شاردا بمگێڕە و بڵێ ئەمە دەجال و پیاوخراپە و هەرچی نزیکی بکەوێتەوە دەیخەینە بەندینخانەوە... بەڵێ ناوبراو خوێندی و بوو بە سەرباز و پلە پلە سەرکەوت تا پاش سی ساڵ بوو بە بەڕێوبەری فیرقەی قورطوبە و ئینجا کە خەلیفە مرد کوڕەکەی دانرا کە تەمەنی نۆ ساڵ بوو، برای خەلیفە کە وەزیری دارایی بوو لەگەڵ ئەمدا بوون بە سەرپەرشتیار و ڕاوێژکار بۆ کارەکانی خەلیفە، پاشان ئەم محمدی کوڕی ئەبی عامرە کە وتمان ئاوفرۆش بوو کچی مامی خەلیفەی هێنا و سەرەنجام بوو بە دەسەڵاتداری هەموو ئەندەلوس و فتوحاتی زۆری کرد!!

ڕۆژێکیان لەسەر کورسی دەسەڵات لە کۆشکەکەی خۆیدا بیری ڕابردووی خۆی و ژیانی کولەمەرگی و پڕنەهامەتی و نەداری خۆی دەکردەوە، لە ناکاو بیری دوو برادەرەکەی کەوتەوە کە لە کاتی ئاو فرۆشیدا ئەو گفت و گۆیەی لەگەڵ ئەنجام دابوون کە باسمان کرد، فەرمانی دەرکرد بۆ سەرۆکی پۆلیس کە بە هەر شێوەیەك بوو دەبێ ئەو دوو ناوەم بۆ بدۆزنەوە و بیانهێنن بۆ لام، بەڵی دوای گەڕانێکی زۆر دۆزیاننەوە و هێنایانن بۆ کۆشکی پاشا، بە یەکەمیانی گوت: تۆ بیرتە خۆت داوای چیت لێ کردم کە بە یەکەوە دانیشتبووین و باسی ئەوەم دەکرد کە ئەگەر ڕۆژێك بوومە پاشای وڵات چیت بۆ بکەم؟! برادەرەکەی وتی: بەڵێ من داوای باخ و بێستان و دابین کردنی بژێویم کرد، پاشا فەرمانی دا کە چی دەوێ بۆی جێبەجێ بکەن! ئەمجا ڕووی کردە

برادەرە کۆنەکەی تری کە کاتیٚ ئاوفرۆش پێی وت: لەبیرتە ئەو ڕۆژەی کە لە کەلاوەکە دانیشتبووین و وتم ئەگەر ڕۆژێك ببم بە پاشای وڵات چیت بۆ بکەم؟ بیرتە داوای چیت کرد؟! وتی: قوربان بمبورە من هەروا لە خۆمەوە قسەیەك بەدەمما هات، پاشا وتی: نەخێر هەر دەبیٚ باسی بکەی ئەو کاتە داوای چیت کرد؟ وتی: داوام کرد سواری گوێدرێژێکم بکەیت، پشتاوپشت بەشاردا بمگێڕی و بڵێی ئەمە دەجال و پیاوخراپە و هەرچی نزیکی بکەوێتەوە دەیخەینە بەندیخانەوە، پاشا وتی: زۆر باشە چیت داوا کردوە بۆت جێبەجیٚ دەکەم و فەرمانی دا ئاوای لیٚ بکەن، لەبەر ئەوەی کاتی خۆی ئەم لاوە ئاوفرۆشە خاوەنی هیمەتێکی بەرز بوو کە دەبیٚ ڕۆژێك لە ئاوفرۆشییەوە ببێت بە سەرۆکی وڵات، بەڵام ئەم هاوڕێیەی گاڵتەی بە هیمەتەکەی دەهات و تەنانەت ئەوەندە ئەم هیوا و ئاواتەی بەدور زانیبوو داوای ئەوەی کردبوو کە ئاوا سوکایەتی پیٚ بکریٚ ئەگەر ئەم ئاواتەی هاتە دی، بەڵام ئەوی تریان پشتیوانی لە ئاواتەکەی کرد و بەلایەوە ئاسایی بوو کە ڕۆژێك ئاوفرۆشێك ببێت بە سەرۆکی وڵات، بۆیە پاشا خەڵاتی کرد و داواکاریەکانی بۆ جێبەجیٚ کرد.

بەڕێزان: لە مێژووی نوێشماندا (شێخ أحمد یاسین)ی شەهید کە لە تەمەنی (١٦)ساڵیەوە ئیفلیج بوو، بەڵام ورە و هیمەتی دانەبەزی بۆ گەیشتن بە ئامەنجەکانی، بۆیە کۆڵی نەدا و توانی ببێتە -حوجە- بەسەر هەموو ئەوانەی کەلەشیان ساغە و دەستەوسانن، شێخی شەهید برادەرێکی کوێری هەبوو بە ناوی (کامل بلتاجی) ئەویش هەروەکو شیخ احمد یاسین هیمەت بەرز بوو، حەزی دەکرد هەرچۆنێك بێت خزمەتێك پێکەش بکات، بۆیە شیخ احمد یاسینی دەکردە کۆڵی و شێخیش

ڕێنمایی دەکرد بەو جۆرە ئەچوون بۆ هەر کوێیەك بیانوستایە بۆ بانگەواز کردن!.

ڕەزا و ڕەحمەتی خوا لە ئیمامی عەلی بێ کە زۆر جوان فەرمویەتی: ئەگەر هەموان ڕازی بن بەوەی کە هەیانە و بەو بار و وەزعەی کە تیایدا دەژین دنیا کاول و خاپور دەبێ.

بەڵێ ئیمانداران: ئێمەی مرۆڤ تەنها بۆ خواردن و خواردنەوە دروست نەبووین ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَٰكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ۝ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْكَرِيمِ﴾ المؤمنون ١١٥-١١٦

بەڵێ هەر کەسێك لە دیدی ئیسلامەوە سەیری مرۆڤ نەکات، وادەزانێ هەر وا بە خۆڕایی دروست کراوە، کەسانێکی زۆر هەن دێنە دنیاوە و دەژین و دەمرن و نازانن بۆ چ مەبەستێك دروست بوون، بۆ نمونە:

ئەفلاتون دەڵێ: خودا ئەم گردوونەی بەدیهێناوە و لەبیری کردووە، لەبەر ئەوە خەڵکی یەکتری دەکوژن و لەناو دەبەن!!

یەکێکی تر دەڵێ: ئەم گەردوونە گەمەیەکی گەورە نەبێت هیچی تر نییە!!

بەڵام ئێمەی موسڵمان ئامانجی بونمان لە لا ڕوون و ئاشکرایە ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاریات: ٥٦

عیبادەتی خواش تەنها کورت هەڵنەهاتوە لە پەرستشەکاندا بەڵکو ژیان هەمووی عیبادەتە ئەگەر مەبەستی ڕەزامەندی خوای لەگەڵ بەرچاو بگیرێ.

بۆ نمونە: ماڵ و سامان و پارە و پول لە ئیسلامدا نەفرەت لێکراو نییە، بەڵکو ئیسلام واجبی کردووە کە دەبێ هەوڵیشی بۆ بدەی، لە فەرموودەی خۆشەویستماندا ﷺ هاتووە کە فەرموویەتی: (إنَّ الله يُحبُّ المُؤْمنَ المُحْتَرفَ) رواه الطبراني و البيهقي

واتە: بەڕاستی خوای گەورە ئیمانداری خاوەن پیشەی خۆش دەوێت.

حەزرەتی عومەری کوڕی خطاب دەیفەرموو: (إنِّي لَأَرى الرَّجُلَ فَيَعْجبُني فإذا سَأَلْتُ عَنهُ فَقيلَ: لا حرْفَةَ لهُ سَقَطَ منْ عَيْني) واتە: زۆرجار بووە کەسێکم بینیوە سەرنجی ڕاکێشاوم، بەڵام کاتێ کە پرسیارم کردووە: ئایا کار و پیشەی چییە؟ وتویانە: بێ ئیش و کارە و هیچ پیشەیەك نازانێ، ئیتر بەرچاوم کەوتووە!.

پیاوێکی زانا و زاهید و پایەبەرزی وەکو (سوفیانی سەوری) کە لە گەورە پیاوانی تابیعە، ئەم پیاوباشە زانایە شەرعزانە گەورەیە، سەروەت و سامانێکی زۆری هەبوو، جا کاتێ هەستی کرد هەندێ لە دۆستانی و نزیکانی بەلایانەوە شتێکی نائاساییە کە ئەم پیاوە عالم و خواناسە کەم وێنە ئاوا پارە و سامانی زۆر بێ، بۆیە وەڵامی دانەوە و ئاماژەی بۆ سامانەکەی کرد و فەرمووی: (لَولا هذه لَتَمَنْدَلَ بنا هؤلاء –يَقْصد بَني أُمَيَّة- ) واتە: ئەگەر ئەم سەروەت و سامان و پارە و ماڵەی بەردەستم نەبوایە، ئەوا دەبوایە ئێستا ملکەچی و موداهەنە و ماستاوچێتیم بۆ پیاوانی بەنی ئومەیە بکردایە بۆ ئەوەی شتێکم پێ بدەن کە گوزەرانی ژیانمی پێ دابین بکەم! بەڵام چونکە خۆم دەوڵەمەندم هەرگیز چاو لەدەستیان نیم و ئەوانیش ناتوانن هیچ فەرمانێکم بەسەردا بدەن!

بەڵێ ماڵ و سامان ئەگەر بەدەست کەسێکەوە بێت کە خاوەنی ئامانج و مەبەستێکە لە ژیاندا کە عیبادەتی خوایە بە مانا گشتگیر و فراوانەکەی، ئەو ماڵ و پارەیە پەیداکردنەکەشی بە عیبادەت حیسابە، بەلام: ئەگەر پارە و سامان لای کەسێك کۆبۆوە -بەتایبەت ئەگەر کەسەکە گەنج بێ وە ئەو کەسە بێ ئامانج و مەبەست بێ لە ژیاندا، کە مەبەستی ئەوەی نەبێ کە بەو ماڵ و سامانە خزمەت بە دینی خوا و ژیان و ژینی خۆی و هاونیشتمانی بکات و خاك و خەڵکی پێ ببوژێنێتەوە، ئەوە لەو کاتەدایە کە ماڵ و سامان مەزموم و ناپەسەندە و نەفرەت لێکراوە چونکە لە دێر زەمانەوە چاکسازانی ناو کۆمەڵ دەرکیان بەو ڕاستییەوە سەلماوە کردووە کە دەست بەتاڵی و بێ ئامانجی مرۆڤی دەوڵەمەند و پارەدار وڵات و میللەت بەرەو لاڕێ بوون و سەرلێشێواوی و پشێوی دەبات، شاعیر بە حەق فەرموویەتی:

إنَّ الشَّبابَ وَالفَراغَ وَالجِدَّة . . . . . . . مُفْسِدَةٌ للمرءِ أيٍّ مَفسدَةَ

نمونەیەکی تر: کوڕێك یان کچێك دەیەوێت هاوسەرگیری بکات، تکایە با زەواجەکەی هەر بۆ ئەوە نەبێ کە دەبێ هەموو کوڕ و کچێك ژن بێنێ و شوو بکات، ماڵ وحاڵێك و مناڵێکی هەبێ وئیتر هەر ئەوە ئامانج بێ لە هاوسەرگیرییەکەیدا، نەخێر با مەبەستی هاوسەرگیریەکەیان لەو ئایەتە قورئانیە وەربگرن کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ الفرقان: ٧٤

واتە: بەندە ڕاست و ساغەکانی خوای گەورە خاوەنی کۆمەڵێك ڕەوشت و هەڵسوکەوتن، یەکێکیان ئەوەیە کە بەردەوام لە خوا

دەپاڕێنەوە و دەڵێن: پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕوناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان و بمانکە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان.

قُرَّةَ أَعْيُن: کوردەواری خۆمان دەڵێ: چاوت ڕوون بێ کە کوڕێکی ئەوەندە سالار و سەنگینت هەیە، چاوت ڕوون بێ کە کچێکی ئەوەندە بەڕەوشت و خاوەن هەڵوێستت هەیە، چاوت ڕوون بێ کە ژنێکی ئەوەندە بەڕێزت هەیە ژیانی بۆ کردووی بە ژین نەك بە ژان، بەڵێ ئەگەر بەو مەبەستەوە هاوسەرگیری بکرێ کە ئاوا خێزانێکی بەختەوەر و بەکەڵك پێشکەش بە کۆمەڵگا بکرێ، وە بەو ژیانی هاوسەرگیرییە ببی بە کەسێکی داوێن پاك، وە نەوەی صالح پەروەردە بکەی، بەو ئامانجە ئەو ژیانی خێزانیەت دەبێ بە عیبادەت.

ئیماندارانی بەڕێز: لە بواری کاری ڕۆژانەتدا دەتوانی ئامانجدار بیت، بۆ نمونە: دەتوانی وەرزشەوانێکی مەبەستدار بیت، جارێك ڕۆژنامەنوسێك چاوپێکەوتنێك لەگەڵ یاریزانێکی بەناوبانگ ساز دەکات و پرسیاری لێ دەکات: هیوا و ئاوات و ئامانجت چییە لە ژیاندا؟! یاریزانەکە وتی: ئاواتم چوونە بەهەشتە!! ڕۆژنامە نوسەکە وتی: وا ئەزانم لە پرسیارەکەم تێنەگەیشتی من باسی ئامانج و مەبەستت دەکەم لە ژیاندا، یاریزانەکە دوبارە وتیەوە: دەمەوێ بچمە بەهەشت. ڕۆژنامە نوسەکە ئەوەی بەلاوە ئامانج و مەبەست نەبوو، بۆیە وتی: کەواتە بۆچی یاری دەکەیت؟! وەرزشەوانەکە وتی: مەبەستی من لە یاری کردن دەسکەوتی پارەیە و پیشاندانی نمونەیەکی بەرز و جوانە بۆ جەماوەر، چونکە کاتێ لاوان یاریزانێکی سەنگینی ڕەوشت بەرز و هەوڵسوکەوت

**جوان دەبینن کە خواپەرستە و سەرکەوتووە لە پیشەکەیدا ئەو کاتە لاوان لاسایيم دەکەنەوە و بەم جۆرەش پاداشتی هەموو ئەو لاوانەم دەست دەکەوێ کە لاسایی من دەکەنەوە!..**

**بەڵێ ئیمانداران: ئەمە ئیسلامەکەی ئێمەیە، دینی دونیا و قیامەتە،ئامانجی ئیسلام ئەوەیە کە تۆی مرۆڤ ئامانجدار بیت و خۆشترین ژیان بەسەر بەریت، نەك وابزانی دواکەوتویی و کزۆڵەیی و ژیان ناخۆشی و بێ ئامانجی لە ژیاندا هەدەفی ئیسلامە.**

**لە ڕاستیدا لەناو هاوەڵانی پێغەمبەرداﷺ کەسی وا هەبوو کە کەوتبووە ئەو هەڵەیەوە وە وا تێگەیشتبوو کە خۆ خستنە بەر ژیانی زبر و نارەحەت و ئازاراوی دەبێتە کەفارەتی هەڵە و تاوان بەلاّم پێغەمبەری ڕەئوف و ڕەحیم ﷺ بۆی ڕاست کردنەوە کە نەخێر کارەکە زۆر لەوە ئاسانترە، دەگێڕنەوە کە ڕۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ هەواڵی کەسێکی پرسی کە لە مزگەوت و جومعە و جەماعەتدا نەدەهاتە بەرچاوی، خەڵکەکەش وتیان نەخۆشە و ماوەیەکی زۆرە لەناو جێگادا کەوتووە، پێغەمبەری خواشﷺ چوو بۆ سەردانی، کە چووە لای تەماشای کرد زۆر لاواز بووە و هێز و گوڕی تێدا نەماوە، لە فەرمودەکەدا دەفەرموێ: (فَصار مثل الفَرَخِ -هُزالاً) وەك بەچکەی باڵندەی لێ هاتبوو لە پچوك بوونەوە و وشك بونەوەدا، پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: (هَل كُنتَ تَدعوا الله بشَيءِ أو تَسألَهُ إيّاهُ؟) ئایا لە خوا پاڕاویتەوە و داوات لێکردوە، وە چۆن پاڕاویتەتەوە لە خوا و چیت وتوە؟ کابرا وتی: (نَعم، كُنتُ أقُولُ: (اللّهمَّ ماكُنْتَ مَعاقِبي بهِ في الآخِرَةِ فَعَجِّلْهُ لي في الدُّنيا) وتی: بەڵێ لە**

خوا پاڕاومەتەوە و لە دوعاکانمدا بەم شێوەیە پاڕاومەتەوە و وتومە: ئەی خوای پەروەردگار داوات لێ دەکەم هەر سزا و ئەشکەنجەیەکت بۆ داناوم کە لە قیامەتدا توشم ببێ، ئەوا بۆم مەگەیەنە قیامەت و هەر لە دنیادا با سزاکەم توش ببێ!) پێغەمبەری دڵسۆزو خەمخۆری هەمووان فەرمووی: (سُبْحانَ الله، لا تُطيقهُ، أو لا تَسْتَطيعهُ، أفَلا قُلْتَ: (اللّهم آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفِي الآخرةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النار) فەرمووی: سُبحان الله ئاخر تۆ نازانی کە ناتوانی تەحەمولی سزای خوا بگری و بەرگەی بگری؟ ئەی باشە بۆ لەجیاتی ئەوە نەتوت: ئەی خوای پەروەردگار داوات لێ دەکەم هەرچی چاکە و خێرو خۆشی و لەش ساغی و خۆشگوزەرانی و ژینی کامەرانی یە لە دونیادا پێمان ببەخشە (بە منیش و بە موسڵمانانیش ببەخشە)، وە لە قیامەتدا بەختەوەر و ڕوسور و سەر بەرز و سەرفرازی مەیدانی مەحشەر و بەردەمی خۆتم بکە و حیسابم ئاسان بکە و بەر شەفاعەتی پێغەمبەرم بخە و بەرەحمی خۆتم لەگەڵ بکە و بەکردەوەی بەدی خۆمم لەگەڵ مەکە و هەرچی خێر و چاکەی قیامەتە بەنسیب من و هەموو موسڵمانانی بکە و داوات لێ دەکەم لە ئاگری دۆوزەخ و سزای بەئێش و تەحەمول نەکراوی بمان پارێزە.

هاوەڵان دەفەرموون: کابرای نەخۆش ئەمجا تێگەیشت ئەم چۆن بە هەڵە لە دینی ئیسلام حاڵی بووە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ (دعا الله لَهُ فَشَفاهُ) داوای لە خوای گەورە کرد کە شفای ئەم نەخۆشە بدات و خوای گەورەش شیفای دا و چاك بۆوە، ئەم فەرموودەیە پێشەوا –موسلم– رەحمەتی خوای لێ بێت ڕیوایەتی کردووە.

وە لە فەرموودەیەکی تردا کە پێشەوا –ترمذي– ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت ڕیوایەتی کردووە دەفەرمویٚ: (سَمِعَ النَبيُّ ﷺ رَجُلاً يَقولُ: (اللّهم إني أسْأَلُكَ الصَّبرَ فَقال: سَأَلت الله البلاءَ، فَسَلْهُ العافيَةَ) خۆشەویستمانﷺ گوێی لە پیاوێك بوو دەیوت: خوایە داوات لیٚ دەکەم خۆڕاگریم پیٚ ببەخشە و صەبرم بدەیتیٚ بەرامبەر بە نەهامەتییەکانی ژیان، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: ئەوە تۆ داوای بەلاٚ و نارەحەتی دەکەی، ئەی بۆ لەجیاتی ئەوە ئاوا ناپاڕێیتەوە کە بلێی: خوایە/گیان داوات لیٚ دەکەم خۆشبەخت و سەرفراز و بەختەوەری دونیاو قیامەتم بکەی؟

بەلیٚ دینی پیرۆز و پاکی ئێمە کە ئیسلامە ئامانجی ئەوەیە کە مرۆڤایەتی لە خۆشترین ژیاندا بژی و هەر چوار وەرزەکەی بەهار بیٚ و هەموو ژیانی گولستان بێت و بەردەوام سفرە و خوانی ڕازاوە بێت و دەمەکان لێو بە خەندە بن و چاوەکان خۆشەویستی و موژدە ببارێنن و موسلمانان داوای ئاوا ژیانێك لە خوا بکەن و کابەدەستان ژینی ئاوا بۆ گەل فەراهەم بهێنن، نەك وابزاندریٚ ئەوەی ناوی موسلمانی لەسەر بوو، وە بە خاکی ئیسلام ناوبرا دەبیٚ هەموو ژیانی هەر دواکەوتووی و پیس و پەلۆخی و هەژاری و نەداری و کزۆلی و کلۆلی بیٚ، نەخێر ئەوە پێچەوانەی ڕۆحی ئاینی ئیسلامە.

بەڕێزان: هەر گەل و میللەتێك ئامانجدار نەبیٚ ئەبێتە ژێردەستەی دوژمن، هەروەکو لە کۆتای سەدەی هەژدەیەم و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم داگیر کەران وتیان: هیچ ڕێگایەك نییە بۆ دەست بەسەرا گرتنی جیهانی ئیسلامی جگە لە نەخشەیەکی دوو سەرە نەبێت،

١. شلگیر کردن و بەکالاٚ کردنی لاوان

٢. سڕینەوەی شارستانی باوباپیرانی و ئاسەوارەکانی لە هزر و بیری لاواندا.

کە بەڕاستی ئەم دوو ڕێگا و نەخشەیەشیان بە کردەوە جێبەجێ کرد و هەر لەو ڕێگایەوە دەستیان گرت بەسەر وڵاتانی موسڵمانانداو دەست بەسەرا گرتنی خێرو بێری هەموو وڵاتەکان و ئەوەی ماوەتەوە تەنها ناوی جیهانی ئیسلامیە و ناوێکی بێ ناوەڕۆکە و هیچ پەیوەندیەکی بە ئیسلامەوە نەماوە.

ئیمانداران: بەداخەوە ئێمە خاوەنی ئەم ئیسلامە جوانەین کە بۆ هەموو کارێکی گەورە و بچوك بەرنامە و نەخشەی تایبەت بە خۆی هەیە کەچی زۆربەی هەڵگرانی بێ ئامانج دەژین کوفریش کە خاوەنی نەخشە نیە، بەڵام بەئاگایە و ئامانجەکانی خۆی دیاری دەکات و کار بۆ بەدەست هێنانیان دەکات، بەڕاستی زۆر جوانی فەرمووە ئەو کەسەی کە دەڵێ:

(النّاسُ رَجُلان، رَجُلٌ نامَ في النُور، وَرَجُل استَيْقَظَ في الظلام).

خەڵکی دوو کەسن کە نوێنەرایەتی هەموو خەڵکی دەکەن، کەسێك لەناو ڕوناکییە بەڵام خەوتووە و سود لەو ڕوناکیەوەرناگرێ تاوەکو جموجۆڵ و هەڵس و کەوتی باشی تێدا ئەنجام بدات، دووەمیان کەسێکە لەناو تاریکیدایە، بەڵام لەو تاریکستانەدا بەئاگایە و بە هەموو لایەکدا دەجوڵێ و لە ئەنجامی ئەوەدا کە بەرچاوی ڕۆشن نییە دەیان زەرەر و زیان دەدات.

کەواتە: با ئامانج لە ژیانماندا دیاری بکەین، ئامانجی ئێمەش لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ دیاری کراوە، کە مەزنترین ئامانج لە ژیاندا ئەوەیە کە پەروەردگارت بناسیت و بۆ ڕازیکردنی ئەو زاتە بژیت، وە نەنگی و شەرمەزاریە بژیت و بمریت و نەزانیت چیت دەوێت لەم ژیانەدا، هەر لە بارەی ئەو کەسانەوەیە کە تەواوی تەمەنیان بە فیڕۆ

داوە و بێ ئامانج ئەو هەموو ساڵەی تەمەنیان بەڕێ کردووە. کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ يُقْسِمُ الْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا غَيْرَ سَاعَةٍ كَذَٰلِكَ كَانُوا يُؤْفَكُونَ﴾ الروم: ٥٥

واتە: ئەو ڕۆژەی کە قیامەت بەرپا دەبێت تاوانباران سوێند دەخۆن کە لە ژیاندا تەنها کاتژمێرێك ماونەتەوە، بەڵێ ژیانیان هەر دوبارە بوونەوەی سەعاتێك بووە و هیچی لێ زیاد نەکراوە چونکە ئامانجی گەورەیان نەبووە لە ژیاندا کە ڕەزامەندی خوا و ئاوەدان کردنەوەی سەر زەوی بووە بە بەرنامەکەی ئەو کە ئیسلامە.

خوای گەورە ڕاگیراو و دامەزراومان بکات لەسەر ئیسلام و ڕێبازە ناوازەکەی کە تەنها و تەنها بەختەوەری مرۆڤ لەودایە و ئەوەی لێی لابدات بێ ئامانجی لە ژیاندا و بەدبەختی و چارەڕەشی قیامەتی بۆ دەمێنێتەوە.

**سەرچاوەکان:**

١. قورئانی پیرۆز
٢. تەفسیری ئاسان – بورهان محمد أمین
٣. صفوة التفاسیر – محمد علي الصابوني
٤. ژیانەوە – ئەندازیار: عثمان محمد ڕشید ل٣٨٩، ل٣٩٢
٥. لا تحزن – محمود المصري ص٥٢٥
٦. (جدِّد حياتك)–الشَّيْخ محمد الغزالي ص٥٥. ص٩٩. ص١٤٧، ص٦٦، ص٢٦، ص٤٦، ص١١
٧. كَلامٌ منَ القلب – الغاية –عمرو خالد
٨. بەهاری دڵان – ئەندازیار: عثمان محمد ڕشید ل٤٢٧
٩. زادُ الخطيب – عبْدُ الخالق محمد الشامي ص٢٢٨.

# وتاری چوارەم بۆ مانگی رەجەب

## ((الإسراء والمعراج))

## -بەشی یەکەم-

الحَمدُ للّهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاة وَ السَلامُ على سَيِّدنا مُحَمَدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعينَ.

**ئیماندارانی بەڕێز: یەکێ لە موعجزە هەرە گەورەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ کە بە پێی زۆربەی ئامارژەکان لە کۆتایی مانگی رەجەبدا روویداوە، ئەوەندە موعجیزەکە گەورەیە تەنانەت یەك سورەتی گەورەی قورئانی بە ناوەوەیەکە سوڕەتی (الأسراء)، ئەو موعجیزەیەش شەوڕەوی و بەرز بوونەوەی پێغەمبەری خوایەﷺ کە ئەم ئیسرا و میعراجە سەرەتای گۆڕینی ژیانی پێغەمبەری خواﷺ بوو بە ناخۆشی و چەوسانەوەوە بۆ ئازادی و سەربەستی و بنیاتنانی دەوڵەت، واتە موعجیزەی ئیسرا و میعراج ناوەڕاستی ئیسلامە، هەر وەکو لە قورئانیشدا ئەگەر سەرنج بدەن سُبحان الله سوڕەتی (الأسراء) کەوتۆتە نزیك ناوەڕاستی قورئانەوە.**

**دەفەرموون با هەمووومان بچینە خزمەت ژیاننامەی پڕ بەرەکەتی حەزرەتی رسول الله و بزانین ئیسرا و میعراج چۆن روی داو وە چ دەرس و ئامۆژگاریەکی لێ وەردەگرین.**

**خۆشەویستان: ئیسراء واتە: شەورەوی، مەبەست لەوەیە کە پێغەمبەری خواﷺ لە شەوێکدا لە مەککەی پیرۆزەوە رۆشتووە بۆ قودسی پیرۆز لە فەلەستین. خوای گەورە لە سەرەتای سورەتی**

(الأسراء)ەوە باسی ئەو سەفەر و ئەو گەشتی شەوە و حیکمەتی گەشتەکەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێ: ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾الأسراء

واتە:پاکی و بێگەردی و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە شەورەوی کرد لە بەشێکی کەمی شەودا، بە بەندەی خۆی (محمدﷺ) لە مزگەوتی (حرام) کەعبەی پیرۆزەوە، بۆ مزگەوتی (الاقصی) لە بیت المقدس کە دەوروبەریمان پیرۆز و پڕ بەرەکەت کردووە تا هەندێك نیشانە و بەڵگە و دەسەڵاتداری و توانایی خۆمانی نیشان بدەین بەڕاستی ئەو زاتە بیسەر و بینایە..

بەشی دووەمی گەشتەکەی پێغەمبەرﷺ بریتیبوو لە: میعراج. واتە بەرز بوونەوە لە مسجد الاقصی وە بۆ سەرووی ئاسمانەکان و گەیشتن بە عەرشی خوا و گفتوگۆکردن لە خزمەت پەروەردگاردا – سُبحانە و تعالی– باسی ئەم میعراجەش خوای گەورە لە سورەتی (النجم)دا باسی دەکات و دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ۞ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ۞ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ۞ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ۞ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ۞ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ﴾ النجم: ١٣-١٨

واتە: سوێند بە خوا بێگومان جارێکی تریش لە دابەزینێکی تردا جوبرەئیلی بینیوە، کاتێ هاتووە بیبات بۆ شەوڕەوی، لە کاتێکدا لە (سِدرة المنتهی)دا بوو، کە لەوێدا بەهەشتی –مأوی– هەیە بە واتای لانە و جێگای حەوانەوە، کاتێك ئەوەی (سدرە)ی داپۆشی مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت کێن و چین و کاریان چییە. جا بینینی ئەو بەدیهێنراوانە لەو شەوەدا وە نەبێت چاوبەست لە پێغەمبەر کرا بێت و چاوی لێ لادا

بێت. بێگومان پێغەمبەرﷺ لەو شەوەدا لە بەڵگە و نیشانە و موعجیزە گەورەکانی پەروەردگاری بینیوە بە چاوی سەری. بە هەموو هەستی ئەوانیش وەکو: سِدرَةُ المنتهى و بَيت المعمور و بەهەشت و دۆزەخ و... هتد.

ئیمانداران: ئایا ئەم گەشتە کە لە شەودا بە پێغەمبەری خواﷺ کرا لە لایەن خواوە لە چ کات و زەمانێکی ژیانی پیرۆزی پێغەمبەردا بووﷺ؟! لە سیرە و ژیاننامەی پیرۆزی پێغەمبەرداﷺ هاتووە کە لە دوای وەفاتی خاتوو خەدیجەی هاوسەری کە گەورەترین پشتیوانی پێغەمبەری خواﷺ بووە لە ناو ماڵەوەیدا و هەموو ئەو ئەشکەنجە و ئازاردانە کە موشریکەکان بە پێغەمبەری خوایان دەکرد. بە هاتنە ماڵەوە و دانیشتن لەگەڵ ئەو ئافرەتە گەورە کە خاتوو خەدیجەی خێزانی بوو، وە قسە خۆش و زمانە شیرین و هیممەتە بەرزەکەی و دڵدانەوە بەردەوامەکانی بۆ پێغەمبەرﷺ ماندووبوون لە لاشەی پێغەمبەرﷺ دەردەچوو وە دڵی ئاسودە دەبوو، وە گوڕ و تینێکی تری بۆ دروست دەبوو بەڵام بە وەفاتی خەدیجە خان –هەزاران هەزار رەحمەتی خوای لێ بێت– پێغەمبەری خواﷺ ئەو خانە و لانە ئارامەی لێ شێوا، ئەو پاڵپشتە گەورەی کە لەیەکەم ساتی دابەزینی وەحیەوە گەورەترین پشتیوانی خۆی بۆ دەربڕی، تا ئەو کاتەی ئامادەبوو لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەربەدەری شیوی ئەبو طالب بکرێ و لە پێناوی ئیسلام و پێغەمبەری خواداﷺ، ئەو خەدیجەیەی کە یەکێ بوو لە گەورە بازرگانەکان، لە شیوی ئەبو طالبدا لەژێر گەمارۆی ئابوری بێ بەزەییانەی موشریکەکاندا بە برسێتی و نەخۆشی وەفاتی کرد، ئای

دەبێ پێغەمبەری خواﷺ چەندە غەمبار و مەحزون بووبێ بۆ وەفاتی ئەو هاوسەرە دڵسۆز و فیداکارەی، دووەم پاڵپشتی پێغەمبەری خواﷺ کە بە ئاشکرا پشتیوانی خۆی بۆ پێغەمبەری خواﷺ دەربڕی، تەنانەت لە تەمەنی (٨) ساڵییەوە پێغەمبەرﷺ لە ماڵ و سایەی ئەودا بەخێوکراو رێزی تەواوی پێ بەخشرا، ئەبو طالبی مامەی بوو، ئەبو طالب ئەو لەمپەرە بوو لەبەردەم موشریکەکاندا کە لەبەر رێز و کەسایەتی گەورەی ئەو نەیان دەتوانی بە ئاشکرا پەلاماری پێغەمبەری خواﷺ بدەن. ئەبو طالب کە گەورە و ریش سپی قورەیش بوو لەسەر پێغەمبەری خواﷺ ناو شاری مەککە و خانە و لانەی خۆی بەجێهێشت و لە شیوەکەدا وەکو موسڵمانەکان ژیا و گەمارۆی ئابوری لەسەر بوو. وە پێغەمبەری خوایﷺ لە تەنیشت خۆیەوە ئەخەواند و بەردەوام چاودێری دەکرد لە ترسی ئەوەی نەوەکا موشریکەکان دەستی رەشی لە تاریکی شەودا بنێرنە سەر و بیکوژن، بەلام ئەوەبوو ئەویش وەفاتی کرد و پێغەمبەری خواﷺ زۆر بۆی غەمبار بوو، بە تایبەت کە بەداخەوە ئەبو طالب بە کافری مرد و ئیمانی نەهێنا!!

ئیتر لە دوای ئەبو طالب هێرش و ئەشکەنجەدانی دەرونی و جەستەیی بۆ سەر پێغەمبەری خواﷺ زیادی کرد، ئەوە بوو دوای مەئیوس بوون لە خەڵکی مەککە کە دڵەکانیان وەکو بەردە رەقەکانی دەوری مەککە رەق بوون و ئامادەی ئیمان هێنان نین، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ بیری کردەوە کە ئەم بانگەوازە بەرێتە دەرەوەی مەککە و شوێنێکی ئەمین پەیدا بکات کە هاوەڵانی کۆچی بۆ بکەن، ئەوە بوو کە بڕیاری دا بچێ بۆ شاری طائیف و ئەم باسەیان لەگەڵ تاوتوێ بکات و

داوای پشتیوانییان لێ بکات، بەلام ئەوە بوو سەرکردە و سەرەك هۆزەکانی طائیف نەك هەر پشتیوانییان بۆ دەرنەبڕی و پێشوازییان لێ نەکرد بەڵکو بە ناشرین ترین وشە وەڵامیان دایەوە و لە کاتی بەجێهێشتنی طائیفدا منالّ و هەرزەیان خستە شوێنی و هاوەڵی سەفەرەکەی کە (زەیدی کوڕی حاریسە)بوو، دەستیان کرد بە بەرد بارانکردنیان و زەید خۆی دەخستە بەر بەردەکان، بەلام ئەوەندەیان بەرد تێگرتن کە پێغەمبەری خواﷺ خوێن بە قاچە پیرۆزەکانی هاتە خوارەوە و ناو پێڵاوەکانی پڕ کرد، ئیتر ئەوە بوو پەنایان بردە لای کابرایەکی باخەوان بۆ ئەوەی منالّەکانیان لێ دور بخاتەوە، کابرای باخەوان هەر چەندە کافر بوو، بەڵام بەزەیی پێیاندا هاتەوە و منالّەکانی لێ دوور خستنەوە!.، پێغەمبەری خواﷺ زۆر ماندوو هیلاك و دڵ مەحزون بوو. لە ناو باخەکە دانیشت و بیری ناسۆریەکانی ناو مەککە و ئازاری ناو دڵی بۆ مردنی خەدیجە و ئەبو طالب و ئەو بێ ڕێزییەی سەرۆك هۆزەکانی طائیف و ئەم بەرد باران کردنەی لە لایەن ئەم هەرزە و نەفامانەوەوە خەمی دوا ڕۆژی ئەم پەیامی ئیسلامەی دەکردەوە، ئیتر لەم کاتەدا دەستی کرد بە عیبادەتێکی تایبەتی کە بریتییە بە (زەلیل بوون و کوڕوزانەوە لەبەر خوا) ئەوە بوو هەردوو دەستی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و بە چاوی فرمێسکاویەوە فەرمووی: (اللّهُمَّ إلَيكَ أشْكوا ضَعْفَ قُوَّتي و قلةَ حيلَتي وَهَواني عَلى الناس، يا أرحَمَ الرّاحمين، انتَ رَبُّ المُستَضعَفينَ و أنتَ ربِّي.. تا کۆتایی پارانەوەکە کە لە کتێبەکانی سیرەدا هاتووە).

بەڵێ بە زەلیلی پاڕانەوە لەبەر خوا گەورەترین عیبادەتە و هەر لەوێدا خوای گەورە وەڵامی دوعا و پاڕانەوەکەی دایەوە و دڵی دایەوە بەوەی کە هەر لەو کاتەدا خاوەنی ئەو باخە کە پێغەمبەرﷺ تێیدا دانیشتبوو کە ناویان (عوتبە و شەیبە)ی کوڕانی ڕەبیعە بوون، کە خاوەنی دەسەڵات و سامان و هۆز بوون لە طائیف، لە هەموو کەس زیاتر ڕقیان لە پێغەمبەری خواﷺ دەبۆوە، خوای گەورە دڵی ئەو دوو دوژمنەی نەرم کرد و فەرمانیان کرد بە (عەداس)ی خزمەتکاریان کە هێشوە ترێیەك بۆ پێغەمبەری خواﷺ لێبکاتەوە و بیداتێ بیخوات!!

بەڵێ فەرموودەی خودایە: ﴿فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا﴾

بەڵێ لەگەڵ هەموو تەنگانە و دڵ نارەحەتییەك دوو خۆشی بەدوادا دێت... هەر لێرەدا پێغەمبەرﷺ هەردوو خۆشییەکەی بینی:

خۆشی یەکەم: ئەوە بوو کاتێ (عەداس)ی خزمەتکار هێشوە ترێیەکەی دایە دەستی پێغەمبەرﷺ پێغەمبەری خوا سوپاسی کرد و یەکەم بۆڵە ترێی لێکردەوە و پێش ئەوەی بیخاتە ناو دەمیەوە فەرمووی: ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾، ئەوجا دەستی کرد بە خواردنی، عەداس زۆر سەرسام بوو بە پێغەمبەری وت: خەڵکی ئەم ناوە ئەم وشەیە ناڵێن، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: تۆ کێیت و خەڵکی کوێی؟ سەرنج بدەن پێغەمبەری خواﷺ چۆن دڵی ئەم لاوە رادەکێشێ بەوەی کە پرسیاری ناو و شوێنی لە دایك بوونی لێ دەکات، وەکو ئەوەی بفەرموێ دیارە تۆ لاوێکی زۆر وریا و بەهەستی کە ئەم پرسیارەت لێ کردم) عەداس وتی: من مەسیحیم و خەڵکی نەینەوام،

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خەڵكی شاری خواناسەكە ( یونسی كوڕی مەتای)؟! عەداس وتی: چۆن دەزانی یونس كوڕی كێیە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەو برای منە، ئەو پێغەمبەرە و منیش پێغەمبەرم، عەداس كە ئەمەی بیست كەوتە ماچكردنی دەست و قاچی پێغەمبەری خواﷺ و روومەتی خۆی بە خوێنەكەی قاچی پێغەمبەردا هێنا و هەر لەوێدا موسڵمان بوو!.. (عوتبە و شەیبە)ی خاوەن باخ كە ئەمەیان چاولێبوو وتیان: عەداس هەڵخەڵەتا و پەكی كەوت، كە هاتەوە بۆ لایان وتیان: عەداس بۆ وات كرد؟! وتی: سوێند بە خوا لەو پیاوە كە محمدە لەم سەرزەویە باشتر و چاكتر نەبۆوە و نابێ.

بەڵێ ئیمانداران: ئەوە خۆشی یەكەم، ئای دەبێ پێغەمبەری خواﷺ چەند دڵخۆش بووبێ بەموسڵمان بوونی عەداس، ئێمە وا دوای هەزار و چوارسەد و ئەوەندە ساڵە كە دەیگێڕینەوە و گوێبیستی دەبین، ئاها چۆن دوای ئەوەی لە تاوی پێغەمبەرﷺ فرمێسكمان رشت كەچی بەم موسڵمان بوونەی عەداس رووومان كرایەوە و دڵمان گەشایەوە، ئەی ئەبێ دڵخۆشیەكەی پێغەمبەرﷺ لە چ ئاست و پلەیەكدا بووبێ، سەرنج بدەن چۆن خوای گەورە دڵخۆشی دەكات و دەفەرموێ: ئەی محمدی خۆشەویستم تۆ مەبەستت و هیوا و ئامانجت ئەوە نییە خەڵكی موسڵمان بن، دەی وا ئاواتەكەت هاتە جێ و سەفەرەكەی طائیف بەفیڕۆ نەچوو، ئاها ئەوەتا عەداس موسڵمان بوو، سەرنج بدە چۆن دلێرانە ئیمانەكەی لەبەردەم گەورەكانیدا ئاشكرا كرد و سوێندی خوارد كە تۆ بەڕێزترین و چاكترین مرۆڤی سەر زەوی! وە ئاینەكەت حەقە و پەیامی هەموو پێغەمبەرانی لە خۆ گرتووە! بەڵێ ئەمە فەرەحی و خۆشی و دەرگای خێری یەكەم لە دوای دڵتەنگی و دڵشكاوی .

موژدەی دووەم و دڵخۆشی دانەوەی دووەم: ئەوە بوو لە ڕێگای گەڕانەوەدا بۆ مەکە لە نێوان طائیف و مەککەدا، شوێنێك هەیە پێی دەڵێن –نەخله– لەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی زەید با دانیشین و پشویەك بدەین، لەو کاتەدا کۆمەڵێك –جنۆکە– هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش قورئانی بۆ خوێندن و باوەڕیان هێنا، هەروەکو خوای گەورە لە سورەتی (الجن)دا باسی دەکات کە وتیان: ﴿إِنَّا سَمِعْنَا قُرْءَانًا عَجَبًا يَهْدِيَ إِلَى ٱلرُّشْدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦ ۖ وَلَن نُّشْرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدًا﴾ الجن ١-٢ ، پێغەمبەری خوا ﷺ بەو ئیمان هێنانەی ئەو جنۆکانە زۆر دڵخۆش بوو، خوای گەورە تێی گەیاند کە ئەو پێغەمبەری ئادەمیزاد نییە، بەڵکو پێغەمبەری جنۆکەشە. ئیتر با گەمژە و مێشك وشکەکانی طائیف و مەککە هەر پڕوپاگەندەی نابەجێ دژی پێغەمبەر بکەن، بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ بە دڵخۆشیەوە گەڕایەوە بۆ شاری مەککە و ئیتر دەرگای خۆشی و فەرەحی کرایەوە و پێغەمبەری خوا ﷺ گەشتی ئیسرا و میعراجی پێ کرا، وە ئەوەندەی تر پێغەمبەری خوا و موسڵمانان دڵیان خۆش بوو.

ئیمانداران: ئێمە باسی ئیسرا و میعراج دەکەین، بەلام بۆیە ئەم پێشەکیەم باس کرد، تاوەکو تێبگەین کە مرۆڤی موسڵمان هەرگیز نابێ مەئیوس ببێ و دەست لە ئەژنۆ دابنیشێ و وابزانێ ئەگەر لە جێگایەك یان لە زەمانێکدا وەکو تاقیکردنەوە پەڵە هەورێك بەری تیشکی زێڕینی ئیسلامی گرت، ئیتر جارێکی تر خۆری ئیسلام هەڵنایەتەوە، نەخێر بەڵکو بە دڵنیاییەوە دەبێت موسڵمانان هەموو کات چاوەڕێی سەرکەوتن و بەرەو پێش چوونی زیاتری دینەکەیان بن، وە لە ژیانی ڕۆژانەشیاندا مادام موسڵمانن و پشت و پەنایان خوای تاك و تەنهایە کە (مالك

الملك)ـە وە رابەریان حەزرەتی محمدە، پەیامیان قورئانە، بەردەوام گەشبین بن وەکو پێغەمبەرەکەیان لە کاتی تەنگانە و دڵبەخەمیدا بە زەلیلیەوە لە قاپی پەروەردگار بدەن و لێی بپاڕێنەوە و دڵنیا بن کە خوای گەورە لە جێگای هەر ناخۆشیەك دوو خۆشیان بۆ دەنێرێت و کورد گوتەنی: ئەگەر خوا دەرگایەکی لێ داخستی دوو دەرگای ترت لێ دەکاتەوە...

ئیمانداران: هەموو پێغەمبەرانی خوا (سەلامی خوا لە هەموویان بێ) خاوەنی معجیزە بوون، کە ئەو موعجیزانە بەڵگەی دەستی پێغەمبەران بوون کە ئەی خەڵکینە ئەوەتا خوای گەورە پشتیوانی لە بوونمان بە پێغەمبەر و رەوانەکراوی خۆی دەکات بەوەی کە ئەم موعجیزەی پێ بەخشیوین، جا هەندێ جار موعجیزەکان بە پێغەمبەرەکە دەبەخشرێن پێش ئەوەی پەیامەکە بگەیەنێت..

بۆ نمونە حەزرەتی موسا کاتێ خوای گەورە کردی بە پێغەمبەر پێش ئەوەی بینێرێ بۆ لای فیرعەون دوو موعجیزەی گەورەی پێ بەخشی کە بریتی بوو لەوەی کە گۆچانەکەی دەستی دەبوو بە مارو پاشان دەیگرتەوە و جارێکی تر دەبۆوە بە گۆچانەکەی جاران، ئەوەی تریشیان دەستی دەخستە باخەڵیەوە کە دەیهێنایە دەرەوە پرشنگی ئەدایەوە بە بێ ئەوەی نەخۆشی پێستی توش ببێ، وەکو دەفەرموێ: ﴿قَالَ أَلْقِهَا يَـٰمُوسَىٰ ۞ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِىَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ۞ قَالَ خُذْهَا وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ۞ وَٱضْمُمْ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ۞ لِنُرِيَكَ مِنْ ءَايَـٰتِنَا ٱلْكُبْرَى﴾طه ١٩-٢٣

حەزرەتیموسا بە بینینی ئەم دوو حاڵەتە دڵی پڕ بوو لە خۆشەویستی خوا و تێگەیشت کە خوا ئاوا پشتیوانی لێ دەکات، ئەمجا دوای ئەوە خوای گەورە پێی فەرموو: ﴿ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ﴾ طه ٢٤ .ئەمجا فەرمانی پێ کرد کە بڕوات بۆ لای فیرعەون، وە

هەندێ لە پێغەمبەرانیش موعجیزەکانیان لەسەر داوای قەومەکەیان بووە وەکو موعجیزەی حەزرەتی صالح کە گەلەکەی داوایان لێ کرد لەو بەردە گەورەیە حوشترێك بێتە دەرەوە شیری هەموو هۆزەکە بدات، بەلام پێغەمبەری ئێمە –حەزرەتی محمدﷺ– لەبەر ئەوەی پەیامەکەی بۆ تا قیامەتە، موعجیزەکەشی ئەبێ هەموو کەس لە ئومەتی بیبینێ.

بۆیە قورئانی پیرۆز گەورەترین موعجیزە یە و گەورەترین بەڵگەیە بۆ قەناعەت پێهێنانی هەموو خاوەن عەقڵێك، وە باقی موعجیزاتی تەنها بۆ دڵدانەوە و رێزگرتنی تایبەتی حەزرەت بووەﷺ ئەوەتا جارێکیان موشریکەکان پێیان وت: ئەی محمد ئەگەر راست دەکەی پێغەمبەری خوایت فەرموو نیشانمان بدە و لەبەر چاومان بڕۆ بۆ ئاسمان، بەلام خوای گەورە فەرمووی ئاوا وەلامیان بدەرەوە و بڵێ: ﴿قُلۡ سُبۡحَانَ رَبِّي هَلۡ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولاً﴾الاسراء ٩٣

بەلام کاتێ کە دواتر گەشتی میعراجی پێ کرا و بەرز بۆوە بۆ ئاسمان هەرگیز رۆژێك لە رۆژان باسی ئەوەی نەکرد کە ئەم بەرز بوونەوەیەی بۆ ئاسمانەکان وەلامێکە بۆ داواکاریەکەی پێشویان و تەحەدایەکە بۆیان، بەڵکو ئەم موعجیزەی ئیسرا و میعراجە تەنها وەکو رێزلێنانێکی خوا و پشتیوانی کردنی پێغەمبەرەکەی تەماشا کرا، کەواتە موعجیزەی ئیسرا و میعراج بۆ رەدی موشریکەکان نەبوو، بەڵکو قۆناغێکی ژیانی پێغەمبەرێتیە و نەخشەی داهاتووی تێدایە، بەڵێ ئیسرا و میعراج لە ناوەڕاستی تەمەنی بانگەوازدایە کە تەمەنی پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محمدﷺ ٢٣ ساڵ بووە، لە ساڵی ١٠ی پێغەمبەرایەتیدا رووی داوە، بەم شێوەیە ئەم موعجیزەیە بوو بە چارەسەرێك بۆ سارێژی برین و ئازارەکانی رابردوو هەر لە سەرەتای

وەحیەوە تا کاتی ئەم گەشتە، وە دانانی نەخشە و بەرنامەی ڕێگای سالانی داهاتووی بانگەوازی پێغەمبەرایەتی تا کاتی وەفاتی.

ئیمانداران: لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە: باشە بۆچی پێغەمبەری خوا ڕاستەوخۆ لە کەعبەوە بەرز نەبۆوە بۆ ئاسمان. لە فەرموودەی پێغەمبەرداﷺ هاتووە کە کەعبەی پیرۆز ڕێك لە ئاستی (بیت المعمور)ی ئاسماندایە کە فریشتەکان تەواف بەدەوردا دەکەن، ئەی بۆچی تەشریفی موبارەکی لە کەعبەوە چووە (مسجد الاقصی) ئەوجا لەوێوە بەرز بۆوە بۆ ئاسمان؟! لە وەلامی ئەم پرسیارەدا ئەڵێین: والله اعلم لەبەر ئەم چەند هۆیە بووە:

١. (بیت المقدس) مەهبەطی نیگا بووە بۆ پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل کە لە نەوەی ئیسحاق بوون، بەلام کاتێ یەهود ڕێزی وەحی خوایان نەگرت و حوکمی ئاسمانیان پشتگوێ خست، خوای گەورە پیچغەمبەرایەتی لە ناو لابردن و بەخشی بە حەزرەتی محمدﷺ لە نەوەی اسماعیل، جا بۆ ئەوەی پەیوەندی دروست بکرێ لە نێوان کۆن و نوێدا، لە نێوان ئێستا و ڕابردوودا، وە ئەوە ڕوون ببێتەوە کە پەیامی خواو وەحی خوا هەمووی سەرچاوەکەی یەکێکە کە خوای تاك و تەنهایە، وە (مسجد الاقصی) ببێ بە سێیەم شوێنی پیرۆز لە ئیسلامدا، پێغەمبەری خواﷺ لە کەعبەوە چووە بۆ (مسجد الاقصی)، ئەمجا لەوێوە بەرز بۆوە، بەمەش ئەو ڕاستیە سەلما کە ئیسلام نەهاتووە بۆ سڕینەوەی هیچ کەسێك، بەڵکو پێغەمبەری ئاخیر زەمان کە حەزرەتی محمدەﷺ هاتووە کە ڕێز بگێڕێتەوە بۆ هەموو ئاینێك و شوێنێکی خاوەن ڕێز کە شوێن کەوتوانی زوڵمیان لێ کردووە و حەق و مافی خۆیان پێ نەداوە..

٢. بۆیە پێغەمبەری خواﷺ چووە (مسجد الاقصی) ئەمجا بۆ ئاسمان، تاوەکو مەجال و بوار هەبێ بۆ موشریکەکانی مەککە کە پرسیار لە پێغەمبەر بکەن دەربارەی سەفەرەکە و بیت المقدس و ئەوەی لە رێگا بینویەتی، چونکە ئەگەر یەکسەر لە کەعبەوە بۆ ئاسمان بەرز بکرایەتەوە ئەوا موشریکەکان ئەو پرسیارەیان بۆ نەدەکرا، چونکە خۆ ئەوان ئاسمان شارەزا نین و بە چاوی خۆیان هیچیان لێ نەدیوە تاوەکو پرسیاری لەبارەوە بکەن. ئەمەش بەڵگەیەکی گەورەیە لەسەر ئازادی رادەربڕین و پرسیار کردن بۆ هەموو کەسێ دەربارەی هەموو بابەتێك..

بەڕێزان: ئەم سەفەرەی پێغەمبەری خواﷺ کە هەمووی موعجیزەیە و دوورە لە تەوەقوعی مرۆڤەوە، یەکێ لە موعجیزەکانی ئەم سەفەرە، کورتی ماوەکەی بوو، کە لە بەشێکی زۆر کەمی شەوێکدا لە مەکەوە چوە فەلەستین و لەوێشەوە چووە سەر هەر حەوت ئاسمانەکان و و هەر لەو شەوەشدا هاتەوە ناو جێگای خەوتنەکەی خۆی. جا وڵاخی سواری ئەم سەفەرەی پێی دەوترێ (بوڕاق) کە ئاژەڵێکی سپیە، لە گوێدرێژ بەرز ترە و لە ئەسپ نزمترە، لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە کە پێغەمبەری خواﷺ لەبارەی بوڕاقەوە فەرمووی: (يَضَعُ حافرَهُ عندَ مُنتَهى طَرفه فَركبْتُهُ حَتَّى اتَيتُ بَيتَ المَقْدس ، فَرَبَطْتُه بالحَلقة التي يَربطُ به الانبياءُ)..

واتە: بوڕاق ئەوەندە بە خێرایی دەڕۆشت کە قاچی لەو شوێنە دادەنا کە چاوی بڕی دەکرد بۆ بینین واتە: نێوانی هەر هەنگاوێکی بەقەدەر ئەوەندە بوو کە چاوی بوڕاق دەیبینی! واتە: بە دەیان کیلۆمەتری بە یەك هەنگاو دەبڕی! پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: منیش سواری پشتی بووم هەتا گەیشتمە (بیت المقدس) ، ئەمجا دەبەزیم و بوڕاقم بەستەوە بەو ئەڵقەیەوە کە پێغەمبەرانی پێش من پێیانەوە بەستبۆوە.

ئیمانداران: کە گوێبیستی ئەم فەرمودەیە دەبین دوو سەرنجمان لا دروست دەبێ و پێویستمان بە وەلامدانەوە هەیە:

یەکەم: ئایا چۆن بۆراق ئەوەندە بە خێرایی دەڕوات، کە لە تەواوی سەرزەویدا گیانداری ئاوا تیژڕەو نییە؟! لە وەلامدا دەڵێین: ئێمە موسڵمانین هەرچی پێغەمبەری سەروەرمانﷺ فەرموویەتی هیچ گومان و دوودڵیەکمان نییە دەربارەی راست و دروستیەوە. بەلام بۆ وەلامی کەسانی نەیار و گومان دروستکەر بۆ موسڵمانان، دەڵێین: بۆراق ناوەکەی لە (برق)ەوە هاتووە واتە: هەورەبروسکە، واتە وەکو خێرایی هەورەبروسکە تیژڕەو بووە، وە زانست دەڵێ: تیشك (روناکی) لە ماوەی یەك چرکەدا (۳۰۰)هەزار کیلۆمەتر دەبڕێت. باشە ئەو خوایەی کە خالقی روناکیە و توانای ئەو تیژ تێپەڕبوونەی پێ بەخشیوە، ئایا هیچ قورسیەکی بۆ خوا تێدایە کە ئاژەڵێکی سواری ئاوا دروست بکات کە وەکو تیشك تیژڕەو بێت؟! سُبحان الخالق، إنّ الله على كل شيء قدير.

دووەم: لە فەرمودەکەدا پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: بۆراقم بەستەوە بە ئەڵقەکەوە، (فربطْتُه بالحلقة التي يربطُ بهِ الانبياءُ) باشە خۆ بۆراق رای نەدەکرد خۆ مەترسی ئەوە نەبوو کەس پەلاماری بدات و بیدزێت، ئەی کەواتە بۆچی بەستیەوە، هەزار رەحمەت لە زانای گەورە (ئیمامی نەوەوی) بێ کە لە شەرحی صەحیحی موسلیمدا ج۲ص۲۷٦دا لە شەرحی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێ: (وَفِي رَبط البُراق الاخْذُ بالأحتياط فِي الأُمور و تعاطِي الأسْباب، وَأن ذالكَ لا يَقْدَح فِي التَوكُّلِ إذَا كانَ الإعتَمادُ على الله تعالَى، واللهُ أعلم)

واتە: لە بەستنەوەی بۆراقدا پێغەمبەری خواﷺ وانەی دەستگرتن بە ئیحتیاتکردنی فێر کردین لە هەموو کار و بارێکدا، واتە: مرۆڤی موسڵمان نابێ کاروبارەکانی ئیهمال بکات و شلگیر بێ، بەڵکو بەردەوام دوور بینی

هەبێ، وە دەست بگرێ بە هۆکارەکانەوە، وە دەست گرتن بە هۆکارەوە –وەکو بەستنەوە بە ئەڵقەوە– هیچ نابەرامبەریەکی تێدا نییە لەگەڵ پشت بەستن بە خوای گەورە، لە کاتێکدا مرۆڤ تەواوی دڵنیایی خۆی و سیقە و متمانەی هەر لەسەر خوا بێ، هەروەکو پێغەمبەری خواﷺ بەو کەسەی فەرموو کە هاتە خزمەتی و لە وەڵامی پێغەمبەری خواداﷺ کە لێی پرسی: حوشترەکەت چی لێکرد؟! وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ لەو دەشتە بەرەڵام کرد توکلت علی الله، پشت بە خوا بە هیچ لایەکدا ناڕوات و کەس نایبات،پێغەمبەری خواﷺ ئەم بۆچونە هەڵەیەی لەسەر (تەوەکول وپشت بەخوا بەستن) بۆ راست کردەوە و فەرمووی: (أعقلها و تَوكَّل) بڕۆ جوان بیبەستەوە و ئەمجا دڵیشت بە خوا ببەستە و پشت بە خوا ببەستە کە حوشترەکەت بۆ دەپارێزێ نەك بەستنەوەکە، بەڵکو بەستنەوەکە تەنها سەبەبێکە و ئیحتیات کردنە، لێرەشدا ئەم وانەیەی فێری ئومەتەکەی کرد کە دەست بە هۆکارەکانەوە بگرن و دڵیشیان هەر پابەند بێ بە خوای گەورەوە..

لەو ریوایەتەدا کە پێشەوا (ترمذي) بە سەنەدێکی حەسەن گێڕاویەتیەوە و دەفەرموێ: (أنَّ رسول اللهﷺ ليلة أُسرى به، أُتي بالبُراق مسرجاً ملجماً فاستصعَبَ عَلَيْه، فَقالَ لهُ جبريل : ما حَمَلَكَ علىَ هذا؟! فَوَالله ماركبك خلق قَطُّ اكرم على اللهَ منهُ، قال: فارفضَّ عرقاً)... واتە: لە کاتی شەوڕەوی پێغەمبەرداﷺ پێغەمبەری خوا کاتێ ویستی سواری پشتی بۆراق ببێ جولا و خەریك بوو نەهێڵێ، جوبریل پێی وت: ئەی بۆراق چی وای لێکردی، بجوڵێی، سوێند بە خوا هەرگیزاو هەرگیز هیچ کەسێك نەهاتۆتە سەر پشتی تۆ کە چاکتر و بەڕێزتر بێ لای خوا لەم زاتە کە حەزرەتی محمدەﷺ ئەمجا بۆراق لە جوڵە کەوت و هەموو لاشەی عەرەقەی دەردا لە شەرمی پێغەمبەردا، زانایان دەفەرموون: بۆیە بۆراق جوڵا و خەریك بوو نەهێڵێ پێغەمبەری خوا بچێتە سەر پشتی، لەبەر ئەوەبوو کە ماوەیەکی زۆر بوو هیچ کەس نەچوبوە

سەر پشتی لە پێغەمبەران، چونکە پێغەمبەران هەموویان سواری پشتی بۆراق بوون، بەڵام لە زەمانی عیساوە ئیتر کەس نەچوبوە سەر پشتی بۆیە ئاوا جوڵا.

هەندێکی تریش لە زانایان دەفەرمون: ئەم جوڵانەی بۆراق (هَزة الطرب لا هزة الغضَب) جوڵانی خۆشی و فەرەحی بوو کە زاتێکی وەکو حەزرەتی محمد دێتە سەر پشتی، نەك جوڵانەوەیەك بێ بۆ ناڕازی بوون و تورە بوون. چونکە بێگومان هەرچی لە ئەرز و ئاسماندایە دەزانێ کە حەزرەتی محمد خاتَمُ الأنبیاء و المرسلین و چەند بەرێز و بە قەدرە لای خوا، هەر وەکو لە فەرموودەدا هاتووە کە حەزرەتﷺ فەرموویەتی: هەرچی لە گەردووندایە دەزانێ من پێغەمبەری خوام (إلا عاصي الجن و الإنس) تەنها سەرپێچکەران و دڵ رەشانی جنۆکە و مرۆڤ نەبێ کە دان نانێن بە پێغەمبەرێتیمدا. نمونەی ئەم جولانەوەیەش ئەوەبوو کاتێ کە پێغەمبەری خواﷺ لەگەڵ حەزرەتی ابوبکر و عومەردا چونە سەر شاخی ئوحود، شاخەکە دەستی کرد بە جولان و لەرزین، تاوەکو پێغەمبەری خواﷺ پێی فەرموو: (أُثبُتْ یا أُحُد فَأَنَّما عَلَیكَ نَبيٌّ وصَدِّیقٌ وشَهید) راگیراوبە و مەجوڵێ ئەی شاخی ئوحود، بزانە ئەوەی بەسەرتەوە وەستاوە پێغەمبەرێکە و راستگۆیەکە کە ابوبکرە و شەهیدێکە کە عومەرە)!! هەروەکو ئەم باسە بە جوانی و درێژی لە (فَتْحُ الباری ج٢ص٢٤٧)دا روون کراوەتەوە.

بەرێزان: کاتێ ئێمە بەسەرهاتی ئیسرا و میعراج باس دەکەین، وەکو چیرۆکێك نایگێرینەوە بەڵکو إنشاء الله ئەوەندەی خوای گەورە یارمەتیمان بدات سەرنجی وشە بە وشەی دەدەین و دەرس و ئامۆژگاری بۆ ژیانی رۆژانەی خۆمان وەردەگرین، لەم شوێنەدا کە باسی بۆراقمان کرد، لە فەرموودەکەی پێشودا کە خوێندمانەوە تیایدا هاتبوو کە: (أَنَّ رَسول اللهﷺ لیلَة أُسری بِه أُتي بالبراق مسرجاً مُلْجَماً..) واتە: (لەو شەوەدا کە خوای

گەورە شەوڕەوی بە پێغەمبەرﷺ کرد. بۆراقیان بۆ هێنا زین و لغاو کرا بوو. وە ئامادە کرابوو بۆ سواربوون تاوەکو پێغەمبەرﷺ بچێتە سەر پشتی و بڕوات بەرەو (بيت المقدس)..) ئەم فەرموودەیە صححه الألباني في (صحيح الترمذي ٢٥٠٣)

لێرەدا دوو وشە جێگای لەسەر وەستانن ئەوانیش دەفەرموێ: (مسرجا ملجَماً) زین و لغاو کرابوو، خۆ بۆراق کە خۆی هەموو لاشەی موعجیزەیە ئەگەر زین و لغاویش نەکرایە بە دڵنیایەوە پێغەمبەری خوایﷺ هەر بە سەلامەتی دەگەیاند و توشی هیچ ئازارێك نەدەبوو، بەلام لێرەدا خۆشەویستمانﷺ ئەو وانەیە فێری ئومەتەکەی دەکات کە: تەوەکول و پشت بە خوا بەستن مانای وازهێنان نییە لە ئەسباب و هۆکارەکان، لێرەدا زین کە لەسەر پشتی ولاخ دادەنرێ و جێگای دانیشتنە وە لغاو کە لە مل و دەمی ولاخ دەکرێ و بۆ سوڕاندنەوە و وەستاندن بەکاردێ، لە ئەمڕۆدا کە ئۆتۆمبیل جێگای ولاخی سواری گرتۆتەوە، زین و لغاو واتە: کوشنی دانیشتن و قاپی سەیارە و ئیستۆپ و سوکانی سەیارەکە، واتە: مرۆڤی موسڵمان ئەگەر راست دەکات شوێنکەوتەی پێغەمبەرە و گوێ بۆ گەشتی شەوڕەوی ئیسراو میعراجی ئەو خۆشەویستەی رادەگرێت، دەبێ لە کاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبیلدا هیچ نوقسانی و کەم و کوڕیەك لە ئۆتۆمبیلەکەیدا نەبێت ئەمجا ناوی خوای گەورە بێنێت و دەست بە لێخوڕین بکات وە نمونەی شۆفێری توند و تۆڵ و رێکوپێك بێت، نەك وا تێ گەیشتبێ و خۆی وا تێبگەیەنێت مادام موسڵمانە و دەڵێ تەوەکولم لەسەر خوا هەیە ئیتر ئۆتۆمبیلەکەی قاپی دانەخرێ و لایتی نەبێت و سوکانی ناتەواو بێت و بێ ئیستۆپ بێت، هەر بڕواو بڵێت پشت بەخوا هیچ نابێت، ئەمە ناشرین کردنی ئیسلام و دینداری و ئەهلی مزگەوتە و پشت کردنە لە رێبازی پێغەمبەری خوا

ﷺ، کە بەداخەوە ئێمە بۆیە دواکەوتوین چونکە لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا لاینداوە، ئەوەتا لەم سەفەرەی ئیسراو میعراجدا کە هەمووی سەرتاپا لە ئەلفەوە تا یای موعجیزەیە و دوورە لەدەسەڵاتی بەشەرییەوە، لێرەشدا ئومەتەکەی بە ئاگا دێنێتەوە کەنەکەن پشت لە هۆکار و ئەسبابەکان بکەن و وابزانن ئەوە تەوەکولەو پاشان خۆتان بە هیلاك بدەن و دینەکەش ناشرین بکەن و ببنە کۆمەڵگایەکی دواکەوتوو!!

ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ بەردەوامە لەسەر گێڕانەوەی باسی سەفەرەکەی و دەفەرمووێ: (ثم دَخَلْتُ المَسْجدَ فَصَلَّيْت فيه ركَعتَين) رواه مسلم، واتە: دوای ئەوەی گەیشتینە بيتَ المقدس، بۆ راقم بەستەوە بەو ئەڵقەیەی کە بەدەرگای مزگەوتەکەوە بوو، کە پێشتر پێغەمبەران پێیانەوە بەستبۆوە، پاشان چومە ناو مزگەوتەکەوە و دوو رکات نوێژم کرد.

دەفەرموێ: دوای ئەوە: (فَلَم ألبث إلا يَسيراً حَتّى إجتَمَع ناسُ كَثير، ثُمَ اذن مؤذنُ فأقيمت الصلاَة فَقُمنا صُفُوفاً نَنتَظرُ مَن يؤمنا، فَأخَذَ بيَدي جبريل فَقَدَّمني فَصَلَّيْتُ بهم) واتە: دوای کەمێك کە من و جوبریل لە مزگەوتەکەدا بووین، خەڵکانێکی زۆر کۆبونەوە پاشان بانگبێژ بانگی داو قامەتی نوێژ کرا و ئێمەش هەستاین بە چەند ریزێکی رێك و جوان ریز بووین و چاوەڕوانی کەسێکمان دەکرد کە پێشنوێژیمان بۆ بکات، ئەمجا جوبریل هات و دەستی منی گرت و بردمیە پێشەوە و منیش پێشنوێژیم بۆ کردن، لە صەحیحی موسلیمدا ئاوا فەرموودەکە هاتووە: (وَحانَت الصلاةُ فأمَمتُهُم) کاتی نوێژ هات و ئیمامەتم بۆ کردن، بێگومان ئەو خەڵکە زۆرە سەرجەم هەموو پێغەمبەران بوون لە ئادەمەوە تا خاتەم لێرەشدا چەند وانەیەك فێردەبین:

١. ڕێکوپێکی ڕیزەکانی نوێژی جەماعەت کە فەرمووی: (فَقُمنا صفوفاً) بە چەند ڕیزێکی زۆر جوان ڕیز بوین، کە بە داخەوە ئومەتی ئەو پێغەمبەرە تا ئێستاش لە زۆربەی مزگەوتەکاندا ڕیزی نوێژەکانیان ناڕێکە.

٢. پێغەمبەری خواﷺ کە بێگومانە لەوەی کە خۆی سەرداری هەموو پێغەمبەرانە و بینا و کۆشکی پێغەمبەران بەو تەواو بووە، بەلام بۆخۆی ڕاستەوخۆ نەچووە پێشەوە و خۆی نەکرد بە ئیمامی پێغەمبەران، کە ئەمەش دەرس و وانەی ڕێزلێنانمان فێر دەکات بۆ خەڵکانی تر، وە ئەو وانە رامیاریەمان فێر دەکات کە نابێ سەرکردە خۆی بەزۆر خۆی بخاتە پێشەوەی خەڵکی، بەڵکو دەبێ داوای لێ بکرێ بۆ پێشەوایەتی، ئەمەش ڕەت کردنەوەی دیکتاتۆریەتە لە پێشەوایەتیدا.

٣. بەم ئیمامەتیە پێغەمبەری ئێمەﷺ بوو بە پێشەوای هەموو پێغەمبەران و بە کردەوە ئالای دەستی هەموو پێغەمبەران تەسلیمی دەستی ئەمینی محمد المصطفیﷺ کرا، وە ئەمەش تەبایی و ڕێز و بەیەکەوە ژیانی ئاینی ئیسلام دەردەخات لەگەڵ هەموو ئەهلی کیتاب و شوێنکەوتەی هەموو پێغەمبەران، وە تەنها ئاینی ئیسلامە کە دان دەنێ بە هەموو ئاینە حەقە ئاسمانیەکان و هەموو کتێبە ئاسمانیەکان و ئیمان بە پێغەمبەران سەرجەم دوو پایەن ئیمان و بیر و باوەڕی مرۆڤی موسڵمان، ﴿كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ﴾ کەواتە تەنها و تەنها ئاینی پیرۆزی ئیسلامە کە دەتوانێ بە یەکەوە ژیان لە نێوان هەموو بیروباوەڕەکاندا دروست بکات، چونکە ڕێزی هەموویان دەگرێت.

ئیمانداران: پێغەمبەری خواﷺ بەردەوامە لەسەر گێڕانەوەی شەوڕەویەکەی و دەفەرموێ: (ثُمَّ خَرَجتُ فَجَاءَني جبريل بإناء مِنْ خَمْرٍ

وَإناء من لَبَنٍ، فاخترتُ اللّبَن، فَقالَ جبريل: اختَرْتَ الفطرَةَ).. رواه مُسلمٌ

**واتە: پاشان لە مزگەوتەکە چوومە دەرەوە و جبریل دوو قاپی بۆ هێنام یەکێکیان مەی و عەرەقی تێدا بوون ئەوی تریان شیری تێدابوو، منیش شیرەکەم هەڵبژارد، جوبریل فەرمووی: فیترەتت هەڵبژارد... هەر لە صەحیحی موسلمیدا (٤٢٣) هاتوە کە فەرمووی: جوبریل پێی وتم:** (أما لَو أنّكَ اخَذْتَ الخَمْر غَوَتْ أُمَتَّك). **واتە: جوبریل فەرمووی: ئەگەر تۆ ئارەقەکەت هەڵبژاردایە، ئەوا ئومەتەکەت دوای تۆ گومڕا دەبوون.**

**ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صەحیحی موسلمیدا ج٢ص٢٧٧ لە شەرحی ئەو فەرموودەیەدا و لە مانای (اخترتَ الفطرة) دەفەرموێ:** (فَسَّروا الفطرةَ هنا بالأسلام و الأستقامة، وَمَعْناهُ والله أعلَمُ اخترتَ عَلامَةَ الأسْلام وَالاستقامة، وجعَلَ اللَبن عَلامة لكَونه سَهلاً طَيِّباً طاهراً سائغاً للشاربينَ سليمَ العاقبَة، وأمّا الخَمر فَإنّها أُم الخَبائَث وجالبَة لأنواعَ من الشَر في الحَال و المَآل واللهُ اعلَم).. **واتە: شیر نیشانەی ئیسلام و دامەزراویە، چونکە شیر پاك و خاوێنە ئاسان هەرس دەکرێ و تام و بۆن و رەنگی جوان و خۆشە، بە ئاسانی دەخورێتەوە، هیچ نەخۆشیەکی بەدواوە نییە، بەلام شەراب و عەرەق دایکی هەموو تاوانەکانە و هەموو شەڕ و خراپەیەك بەشوێن خۆیدا دێنێ لە ئێستا و لە داهاتودا- خودا زاناترە.**

**بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز لێرەشدا ئەو دەرس و وانەیە فێر دەبین کە بیر و باوەڕ و شەریعەتی ئیسلامی وەکو شیر وایە، تێگەیشتنی، پەیرەوکردنی، سەرەنجامی شوێنکەوتنی، وەکو خواردنەوەی شیر وایە و رەوانە و ئاسانە و مایەی گەشە کردنە، جا کێ هەیە قەرزاری شیر نەبێ و بەشیر گەورە نەبووبێ، ئەوەی لە کاتی گەورە بوونیشدا ماست و پەنیر و شیر و بەرهەمەکانی شیر ناخوات، ئایا هەر بە شیر بەخێو**

نەکراوە، هەر بە شیر گەورە نەبووە؟. کەواتە: چۆن شیر گەورەکەرە و بۆ هەموانە، ئیسلامیش گەورەکەرە و هی هەمووانە. عەرەقیش بەرنامەی مرۆڤکردە، چۆن عەرەق سەرخۆشکەرە، هەموو خراپە و تاوانێك بەشوێن خۆیدا دێنێ و دونیا و قیامەت لەناو دەبات. ژیان دەکات بە ژان. هەندێ کەس بە بازرگانی پێکردنی و خەڵەتاندنی گەنجان و رۆڵەی خەڵك کە سەرخۆشیان دەکەن، خۆیانی پێ دەوڵەمەند دەکەن و هەزارانیشی پێ ئیفلاس دەکەن، بێ ژیانیان دەکەن، چۆن عەرەق لەناوبەرە، بەرنامەی دەستکردی مرۆڤیش هەروایە، بەرنامەی کوفریش رێك ئاوایە، تەنها بەنج کردنی پێیە، ئەو تۆزە خزمەتە تەزویرەش کە کوفر دەیکات بە مرۆڤایەتی هەروەکو سودی عەرەق و شەراب، بەلاّم ﴿وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ من نَّفْعِهِمَا﴾ زەرەر و زیانەکەی، ماڵوێرانیەکەی، دین و ئیمان سوتاندنەکەی لاوان و گەنجان، زۆر زۆر گەورەترە لەو تۆزە خزمەتەی کە وەکو دێوجامە بۆ چاوبەستی گەلان دەیکات، الله أکبر ئەم پێغەمبەرە چۆن بە چەند وشەیەك هەموو رێگایەکی ژیانمان بۆ رۆشن دەکاتەوە... دەی قوڕ بەسەر ئەو کەس و خێزان و میللەتەی کە شیری پاك و خاوێن و رەنگ جوان و تام خۆشی ناوێ و حەزی لە بۆگەنی عەرەق و کەلاکی مردارەوەبوە.

ئیمانداران: پێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێ مەشهەدمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لە شەوڕەویەکەیدا بینیویەتی و وەك رەحمەتێك ئومەتەکەی ئاگادار دەکاتەوە کە ئاگاداری خۆن بن و نەکەونە ئەو هەڵە و تاوانەوە چونکە ئەوە سزاکەیەتی، وە ئەوانیشی کە چاکەیان کردبێ ئەوە پاداشتیەتی، فەرموون بەڕێزان با بزانین پێغەمبەری خوا ﷺ چیمان بۆ دەگێڕێتەوە.

خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموێ: لە کاتی شەوڕەویەکەمدا رۆشتم بەلای کۆمەڵێکدا کە کشتوکاڵیان دەکرد و خەریکی چاندن بوون، بەلاّم سُبحان الله هەر کە تۆوەکەیان دەچاند یەکسەر سەوز دەبوو و

پێدەگەیشت و دەستیان دەکرد بە دروێنە کردنی، بەردەوام ئەوە ئیشیان بوو هەتا لایەکیان دەدوریەوە، لایەکەی تریشی سەوز دەبۆوە و ئەوانیش دەستیان دەکرد بە دروێنەی، جوبریل فەرمووی: هؤلاء المُجاهِدون، ئەمانە ئەو کەسانەن کە لە پێناوی خوادا تێکۆشاون و هەموو ژیانیان بەخشی بە ئیسلام و بە ئیخلاص و دڵسۆزی و دوور لە ریا و مەبەست و مەرامی دونیایی خەباتیان دەکرد لە پێناوی گەیاندنی پەیامی ئیسلام و هەموو هەوڵ و تێکۆشانیان بۆ چەسپاندنی پەیامی پڕ دادگەری ئیسلام بوو، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بە خۆشترین و ئازادترین و شادترین ژیان بژین و دوور بن لە هەموو زوڵم و ستەم و چەوساندنەوەیەك، ئەمانە خێر و پاداشتیان بەردەوامە و لە دوای مردنیشیان خێرەکەیان نەبڕاوەیە...

وە فەرمووی ﷺ: کۆمەڵێ دیمەنی ترسناکم بینی کە ئەنجامی تاوان و گوناه بوو، وەکو:

١. کۆمەڵە کەسێکم بینی کە سەریان بە بەردی گەورە پان دەکرایەوە، بەلام هەر کاتێ سەریان پان دەبۆوە، جارێکی تر وەکو خۆی لێ دەهاتەوە و دوبارە بەردەکەیان دەکێشایەوە بە سەریدا و سەریان پان دەکردنەوە، جوبریل فەرمووی: ئەمانە ئەو کەسانەن کە (تثاقَلَت رؤوسُهُم عَنِ الصَّلاة) سەریان قورسە لە ئاستی نوێژدا و نوێژ ناکەن.

٢. کۆمەڵێ کەسم بینی کە پاش و پێشیان پینەی پێوەبوو، وەکو ئاژەڵ وابوون، جوبریل فەرمووی: (هؤلاء الذينَ لا يُؤدُونَ الزَّكاة) ئەمە ئەو کەسانەن کە زەکاتی ماڵەکانیان نادەن!

٣.کۆمەڵێکم بینی کە گۆشتی پاکوخاوێن و جوانیان لەبەردەمدا بوو، بەلام ئەوان دەچوون لەولاترەوە گۆشتی بۆگەن و تێکچوویان دەخوارد و پاکەکەیان نەدەخوارد، جوبریل فەرمووی: (هؤلاءْ الزناة)

ئەمانە ئەو کەسانەن کە حەلاڵی خۆیان هەیە کەچی لەگەڵ کەسانی تری حەرام بە خۆیان رادەبوێرن و زینا دەکەن.

٤. وە پیاوێکم بینی کە کۆڵێ پوش و دار و چیلکەی گەورەی کۆکردبۆوە، بەڵام کە دەیویست بیدات بە کۆڵیدا بۆی هەڵنەدەگیرا، کەچی لەجیاتی ئەوەی بچێ هەندێکی لێ لابدات بۆ ئەوەی تۆزێك سوك ببێ، دەچوو هی تریشی کۆدەکردەوە و دەیخستە سەر کۆڵە قورسەکەی و ئەوەندەی تر قورسی دەکرد و سەرەنجام هەر بۆی هەڵنەدەگیرا!! جوبریل فەرمووەی (هذا الذي عندهُ الأمانة لا يؤديها وَهوَ يطلب أُخرى) ئەمە ئەو کەسەیە کە ئەمانەتێکی لایە، بەرپرسیاریەتیەکی لەسەر شانە، بەڵام ناتوانێ جێبەجێی بکات، کەچی لەجیاتی هەندێکی وازلێبێنێ داوای پلەی بەرزتر و مەسئولیەتی زیاتر دەکات!..

٥، رۆشتم بە لای پیاوانێکدا بینیم لێویان بە مقەستی ئاگرین پارچە گۆشتی لێ دەکرایەوە، بەلام ئەوە نەبوو کە هەر جارێك بێ و تەواو بەڵکو هەموو جارێ کە لێویان بەو مقەستە ئاگرینە دەبڕین، جارێکی تر لێوەکانیان دروست دەبۆوە، دوبارە لێویان پارچە پارچە گۆشتی لێ دەکرایەوە، جوبریل فەرمووی: (هؤلاء خُطباء الفتنة) ئەوانە ئەو وتاربێژانەن کە دەبنە مایەی فیتنە بۆ خەڵکی کە گوێیان لێ دەگرتن واتە ئەو وتاربێژانەن کە بە خەڵکی دەڵێن چاکە بکەن بەلام خۆیان نایکەن، بە خەڵکی دەڵێن فلانە شت بێشەرعیە مەیکەن، بەڵام خۆیان ئەنجامی دەدەن، وە ئەو وتار بێژانەن کە حەق و راستیەکان بە خەڵکی ناگەیەنن و لە ترسان و لەبرسان راستیەکانی ئەم ئیسلامە دەشارنەوە و دەیانەوێ دڵی کاربەدەستانیان لێ نەڕەنجێ و شوێنیان پێ لەق نەبێ!..

٦. بینیم کە گایەکی زۆر گەورە لە کونێکی زۆر بچوکەوە هاتە دەرەوە، بەردەوام ئەو (گا) گەورەیە دەیویست بچێتە ناو کونە

بچکۆلەکەوە، بەلام تازە نەیدەتوانی بچێتە ناویەوە، جوبریل فەرمووی: (هذا الرَجل يتكلم بالكَلمَة فَيَندم فَيُريد أن يردها فَلا يستَطيع) ئەمە پیاوێکە. کە قسەیەکی کردووە، بەلام لە دەمی هاتە دەرەوە و پەشیمانە و دەیەوێ قسەکەی بێتەوەلای خۆی، بەلام تازە ناتوانێ و لە دەستی دەرچووە!.. ئەو دیمەنانەی کە باسمان کرد، هەردوو پێشەوای فەرموودە –طبرانی و بزار– لە ئەبی هورەیرەوە ریوایەتیان کردووە.

٧. پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: کاتێك کە بەرز کرامەوە تێپەڕیم بەلای کەسانێکدا کە نینۆکی مسیان هەبوو، بەو نینۆکانەی خۆیان دەم وچاو و سنگی خۆیانیان پێ دەڕنیەوە و دەم و چاوی خۆیان خەڵتانی خوێن دەکرد، وتم: ئەوانە کێن ئەی جوبریل؟ فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن کە (يأكُلونَ لُحومَ الناس و يَقَعُونَ في اعراضِهم) گۆشتی خەڵکان دەخۆن، غەیبەتیان دەکەن و ناموسیان لەکەدار دەکەن. (ئەم فەرموودەیەی رواهُ أحمد (٢٢٤/٣) وصَححَهُ الالباني في سلسلة الصحيحة (٥٣٢))

بەڕێزان: لە ئەسەرێکدا هاتووە ئەگەر چی پلەی فەرموودەکە لاوازە بەلام بۆ بواری (الترغيب و الترهيب) نابەجێ نیە کە باسی بکەین، کە باسی چەند دیمەنێکی ترمان بۆ دەکات.

دەفەرموێ: رۆژێکیان حەزرەتی علی و فاطمەی خێزانی چوونە خزمەت پێغەمبەری خواﷺ بینیان پێغەمبەری دڵسۆز و بە بەزەیی بۆ ئومەتەکەی زۆر بە کوڵ دەگریا، عەرزیان کرد: هۆی گریانەکەت چییە؟ فەرمووی: لە شەوی میعراجدا چاوم بە کۆمەڵێ لە ژنانی ئومەتم کەوت کە بە سزای سەخت سزا دەدران، بەم شێوەیە:

١. ژنی وا هەبوو کە بە قژی هەڵواسرا بوو، مێشکی سەری لە تاوی ئازار دەکولا، کە پرسیم چ تاوانێکی کردوە، پێیان وتم: کە لە دنیادا سەری رووت

کردوە و قژی رازاندۆتەوە و نیشانی کەسانی نامەحرەمی داوەو سەری دانەپۆشیوە.

٢. هەندێ ژنم بینی کە بەزمانیان هەڵواسراون و ئاوی گەرمیان بە قورگا دەکردن، کە پرسیم تاوانیان چییە، وتیان: ئەوە ئەو ئافرەتانەن کە بەزمانیان ئازاری دراوسێکانی خۆیانیان دەداو هەموو دراوسێکانیان لە زمانیان دەترسان.

٣. ژنێك هەردوو پێی بە مەمکیەوە بەسترابۆوە و دەستی بەناوچاوانیەوە بوو، مار و دوپشکی زۆری پێوەبوو، وتیان: ئەوە سزای ئەو ئافرەتانەیە کە حەیز و لەشگرانی خۆی نەدەشت و خۆی پاك نەدەکردەوە و گاڵتەی بەو شتانە دەهات.

٤.ژنی وا هەبوو بە مەمکی هەڵواسرابوو، وتیان: ئەوە ئەو ژنانەن کە بە بێ هیچ هۆیەك تەنها بۆ ئارەزووی خۆیان و ئیسراحەتی خۆیان شیری مەمکی خۆیان نادەن بە جگەرگۆشەکانیان.

٥. ژنی وام بینی کە سەری وەکو سەری بەراز و لاشەی وەکو لاشەی گوێدرێژ وابوو، وتیان: ئەوە سزای ئەو ئافرەتانەن کە مێردێکی رێکوپێکو داوێنپاکی هەیە، بەڵام ئەم ژنە لەگەڵیا ناخەوێ و کاری سەرجێگایی کە مافێکی شەرعییە لەگەڵ مێردەکەی جێبەجێ نەکردووە،

٦. ئافرەتی وام بینی کە وەکو شێوەی سەگی لێهاتبوو، ئاگر لە دەمی دەردەچوو، فەرمووی: پێیان وتم: ئەوە ئەو ئافرەتانەن کە لە ژیانی دونیادا حەسود بوون بە ماڵی خەڵك و ژیانی خەڵکی و بە بینینی خۆشی و خۆشگوزەرانی ژنانی خزم و ناسیاو و دراوسێیان دڵیان تەنگ بووە ئاواتیان ئەوە بوە کە خەڵکی ژیانیان ناخۆش بێ و دەست کورت و هەژاربن و هاوسەرەکان بەیەکەوە لەشەڕ و ئاژاوەی خێزانیدابن..

کەواتە خوشکانی بەڕێز، ئێوە زۆر بەڕێزن و دەبێ خۆتان بپارێزن لەو خوورەوشتە ناشرینانەی کە دەبنە مایەی ناشرین کردنتان لەبەر چاوی هاوسەرەکانتان و کۆمەڵگا و دەوروبەرتان بە گشتی، کە بەداخەوە ئەو جۆرە ئافرەتانە، (لەگەڵ ڕێزی زۆرمدا بۆ تەواوی خوشکان و دایکان) بونەتەمایەی نارەحەتی و نائارامی و نیگەرانی و ژیان تاڵ کردنی هاوسەر و منداڵ و دراوسێ و دەوروبەر و کۆمەڵگاکەیان و دەبێ بەو شێوەیە سزا بدرێن و (الجزاءُ مَنْ جنْس العَمَل). جا ئومێدەوارم خۆتانی لێ بپارێزن و ئەوەشی کە تَا ئێستاَ ئەو رەوشتە ناشرینانەی هەبوە بە بیستنی ئەم وتانە تەوبە بکا و وازی لێ بێنێ.

بەڵێ خۆشەویستان: دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خواﷺ لە سەفەرە شکۆدارەکەی لای خوای گەورە و میهرەبان، ئەوەبوو نیشانە گەورەکانی دەسەڵاتی خوای گەورە بینی، لەگەڵ بینینی ئاسمانەکان و فریشتەکانی خوای گەورە و جوبریل، وە پێغەمبەری خواﷺ باش دەیزانی کە بگەڕێتەوە لای کافرەکانی قوڕەیش و ئەوان دەمەقاڵە دەکەن و باوەڕی پێ ناهێنن و بەدرۆشی دەخەنەوە، بۆیە پێغەمبەری خواﷺ لەو بەرە بەیانیەدا کە گەڕایەوە بە کزۆڵەیی و دوور لە خەڵکی دانیشتبوو، ئیبن عەباس دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ فەرمووی: کاتێ خوای گەورە شەوڕەوی پێ کردم و گەڕامەوە و بەیانیم بەسەردا هات لە مەککە، زۆر دەترسام لەم کارەم و دەمزانی کە خەڵکی بەدرۆم دەخەنەوە.

تەنانەت کاتێ پێغەمبەری خواﷺ باسی ئەو شەوڕەویەی بۆ (ئومو هانيء) گێڕایەوە و پاشان هەستا بڕوات، (ئومو هانيء) داوێنی پۆشاکەکەی پێغەمبەری گرت و ویستی نەهێڵێ بڕوات، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەوە چیتە؟ بۆ داوێنی پۆشاکەکەم دەگری؟ وتی: دەترسم ئەگەر تۆ ئەم هەواڵە رابگەیەنی و بڵاوی بکەیتەوە، قەومەکەت بەدرۆت

بخەنەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر بە درۆشم بخەنەوە من ئەوەیان هەر بۆ دەگێڕمەوە، ئیتر رۆیشتە دەرەوە و چووە دەوری ماڵی کەعبەی پیرۆز و بە تەنهاله شوێنێکدا دانیشت، لەو کاتەدا دوژمنی خوا (ئەبو جەهل) بەلایدا تێپەڕی و هاتە لای پێغەمبەر و وەکوگاڵتە پێکردنێك بە پێغەمبەری خوایﷺ وت: چیە چی بووە وا بە تەنها دانیشتووی و دەڵێی بیر لە شتێك دەکەیتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ ئەمشەو شەوڕەویم پێ کراوە، وتی: بۆ کوێ؟! فەرمووی: بۆ (بیت المقدس) وتی: هەر ئەمشەو چویتە ئەوێ و گەڕایتەوە؟! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، (لێرەدا ئیبن عەباس دەفەرموێت: ئەبو جەهل پێی باش نەبوو کە پێغەمبەرﷺ بەدرۆ بخاتەوە نەوەك گوایە پێغەمبەر قسەکەی بگۆڕێت، کاتێ کە خزمانی لێی کۆبونەوە بەوانی رانەگەیەنێت، لەبەر ئەوە بە پێغەمبەری خوایﷺ وت: ئایا ئەوەی بۆ منت گێڕایەوە بۆ خزمانتی دەگێڕیتەوە، ئەگەر کۆیان بکەمەوە؟! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ بۆیان دەگێڕمەوە، ئەمجا ئەبو جەهل هاواری کرد هۆ کوڕانی کەعبی کوڕی لوئەی وەرن بۆ ئێرە، هەموو کوڕ و کۆمەڵێ چواردەوری کەعبە و شوێنە گرنگەکان هەموو چۆڵ بوون و هەمویان هاتن بۆ لای ئەبو جەهل و کۆبونەوە و دوای ئەوەی ئەبو جەهل بە پێغەمبەریﷺ وت: ئەوەی بۆ منت گێڕایەوە بۆ ئەوانیشی بگێڕەوە، پێغەمبەرﷺ بەوانیشی فەرموو: من ئەمشەو شەوڕەویم پێ کراوە، وتیان: بۆ کوێ؟! فەرمووی: بۆ بیت المقدس! وتیان: یەعنی تۆ ئەی محمد هەر ئەمشەو لەناومان رۆشتیت و گەیشتیە (بیت المقدس) و بەیانیەکەی گەڕایتەوە ناومان؟!! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئەمجا کافرەکان هەندێکیان دەستیان کرد بە پێکەنین و چەپڵە لێدان و هەندێکیان چمبۆڵەیان لەسەری خۆیان دەدا ( وەکو ئەوەی بڵێن: ئای ئەم درۆیە چەند گەورەیە) تەنانەت هەندێك لەو

موسڵمانانەی کە پێشتر ئیمانیان هێنابوو، پاشگەز بوونەوە لە ئیمانەکانیان! هەندێ کەس بە هەڵەداوان رایان کرد بۆ لای حەزرەتی ابوبکر، بۆ ئەوەی ئەم هەواڵەی بۆ بگێڕنەوە، بەڵکو ئەویش لە ئیسلام پاشگەز ببێتەوە، کە هەواڵەکەیان بۆ گێڕایەوە، حەزرەتی أبو بکر فەرمووی: ئایا پێغەمبەرﷺ بۆ خۆی وا دەفەرموێ؟! وتیان: بەڵێ بە دەمی خۆی بۆ خەڵکەکەی گێڕایەوە، ئەبوبەکر فەرمووی: ئەگەر پێغەمبەر بۆ خۆی ئەوە بڵێ، ئەوە من شایەتی دەدەم کە راست دەفەرموێ، وتیان: ئاخر چۆن بەراستگۆی دەزانی و بڕوا بە قسەیەکی وا دەکەی کە بڵێ لە تاقە شەوێکدا چومە ولاتی شام و پێش ئەوەی رۆژ بێتەوە هاتومەوە مەککە؟! حەزرەتی ابو بکر فەرمووی: بەڵێ ئەگەر لەوەش دورتر بفەرموێ، من بڕوای پێ دەکەم، پێی بڕوا دەکەم ئەگەر بڵێ چومە ئاسمانەکانیش، لە ریوایەتێکدا دەفەرموێ: من بۆ کاری لەوە گرنگتر بڕوام پێ کردووە کە دەفەرموێ لە ئاسمانەوە هەواڵم بۆ دێت لە بەرەبەیانێکدا یان لە ئێوارەیەکدا، ئیتر بۆ ئەوە بڕوام پێ کردووە، ئیتر بۆ ئەمەیان بۆ دەبێ دوودڵبم لە راستگۆیی فەرموودەکەی؟! ئیتر هەر ئەو رۆژە (أبوبكر) نازناوی –الصديق–ی لێنرا (صَحَحهُ الالبانی فی الصحیحة(٣٠٦)) پاشان هەندێ لە پیاوە ناودارەکانیان کە لەوێ بوون و پێشتر سەفەریان کردبوو بۆ فەلەستین وبیت المقدسیان بە چاوی خۆیان بینیبوو، وە دڵنیا بوون کە هەرگیز پێغەمبەری خواﷺ لە ژیانیدا نەچۆتە ئەو وڵاتە و بیت المقدسی نەبینیوە، داوایان لە پێغەمبەر کرد و وتیان: ئەی محمد ئەگەر دەتەوێ راستی ئەم هەواڵە عەجایەب و بڕوا پێنەکراوەت بسەلمێنی فەرموو وەصفی چۆنیەتی مزگەوتەکەمان بۆ بکە!.. پێغەمبەرﷺ بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: کە داوایان لێکردم وەصفی مزگەوتی –بیت المقدس–یان بۆ بکەم، دەستم کرد بە وەصف

کردنی مزگەوتەکە بۆیان، بەردەوام بووم. ئەوەندەم وەصف کرد هەتا هەندێ وەصفم لێ تێکچوو خوای گەورە مزگەوتەکەی وەکو شێوەی خۆی هێنایە بەردەمم تا لەبەری خانوەکەی عەقلیەوە لە پێش چاوم بوو و سەیرم دەکرد و وەصفم دەکرد بۆیان. ئیتر زۆر بە جوانی و بە وردی بۆم وەصف کردن، هەموو ئەوانەی بە چاوی خۆیان (بیت المقدس)یان بینیبوو، وتیان: بەڕاستی وەصف کردنەکەی محمد تەواو و بێکەم و کوڕی بوو پێکای.

پاشان کافرەکانی مەککە وتیان: ئەی محمد بۆ وەصف کردنەکەی (بیت المقدس) راستت کرد و چۆنی دەڵێی ئاوایە، بەلام پرسیارێکی ترت لێ بکەین! ئێمە کاروانێکمان بەرێودیە لە شامەوە دەگەڕێتەوە، هەواڵمان بدەرێ ئێستا لەکوێیە و چۆنە و چۆن نیە؟! پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نیشانەی راستی وتەکانم ئەوەیە من تێپەڕیم بەلای کاروانێکی ئێوەدا لە فلان جێگا و وشترێکیان لێ بزر ببو. وە فلان کەس گرتبویەوە بۆیان، وە ئەوان لەڕێی رۆشتنەکەیدا گەیشتونەتە فلان جێگە و لە فلان جێگە لایانداوە و لە رۆژی ئەوەندە و ئەوەندەدا دەگەڕێنەوە و وشترێکی سپی کە کۆپانێکی رەشی بەسەر پشتەوەیە لەگەڵ دوو مەشکەی رەشدا لەپێش کاروانەکەوە دەگەڕێتەوە لاتان بۆ شاری مەککە لە فلان رۆژ و لە فلان رۆژدا!..

بەڵێ بەو شێوەیەی کە پێغەمبەری خواﷺ باسی کردبوو، لە کاتی دیاری کراودا کاروانەکەی قورەیش لە شامەوە گەیشتنەوە مەککە و هەر ئەو حوشترەی کە پێغەمبەری خواﷺ باسی کردبوو لە پێشیانەوە بوو، چۆنی فەرمووبوو ئاوا دەرچوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بڕوایان پێ نەکرد و بەدرۆیان خستەوە و وتیان: ئەمە سیحر و جادووە کە محمد لێمان دەکات!!..

کۆتایی وتارەکەمان بە فەرموودەی موفەسیری قورئان (مامۆستای شەهید سید قطب) دێنین کە لەم باسەدا دەفەرموێ: ئەوەی تێبینی دەکرێ بەبۆنەی ئەم روداوەوە و دەرکەوتنی راستی هەواڵەکە بە بەڵگەی مادی و بەرچاو کە باسکردنی کاروانەکە بوو، کە پێغەمبەر بە وردی چۆنیەتی کاروانەکەی روون کردۆتەوە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە پێغەمبەرﷺ گوێی بە ترساندنەکەی (ئومو هانيء) نەدا، کە ئامۆژگاری کرد روداوەکە نەگێڕێتەوە نەبا گەلەکەی بەدرۆی خەنەوە، ئەم روداوە غەریب و ناوازەیە هەزم ناکەن، بەڵکو زۆر بە راشکاوی روداوەکەی بڵاو کردەوە، چونکە متمانەی پێغەمبەرﷺ بە پەیامەکەی، دڵسۆزی بۆ راگەیاندنی ئەو حەقەی نیگای بۆ کراوە و ئەو حەقەی لەگەڵیەتی گەیشتبوە ئاستێك لە هیچ شتێك نە پرینگێتەوە، روبەڕوویان بوەستێ و بە ئاشکرا رووداوەکەیان بۆ بگێڕێتەوە، چی دەبێ با ببێ، هەڵوێستیان چۆن دەبێ بەرامبەر خۆی و پەیامەکەی بابێ، بێگومان بە بلاو کردنەوەی ئەم باسە لە لایەن پێغەمبەرەوە هەندێ لەوانەی ئیمانیان هێنابوو پاشگەز بونەوەن، هەندێکیان مەوزوعەکەیان کردە مایەی پێکەنین و گاڵتە و گومان خستنە سەر پێغەمبەرایەتیەکەی، بەلام ئەمانە هیچیان نەیانتوانی ببنە کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم بانگەواز کردنەکەی پێغەمبەرداﷺ، هیچیان نەیانتوانی پێغەمبەر لە هەوڵ و تێکۆشان دابنیشێنێ و حەق بشارێتەوە!

بەڕاستی ئەمە نمونەی رەچەشکێنییە بۆ بانگخوازانی ئیسلام کە پێویستە ئەوان لە بانگەوازیدا چاو لە پێغەمبەر بکەن، حەق رابگەیەنن، لە پێناو راگەیاندنی حەق و راستیدا لە هیچ شتێك نەترسن و خەمی ئەوەیان نەبێ کە بانگەوازەکەیان لە دڵی بانگکراواندا کاریگەری نەبووە، نابێ ماستاو بۆ کەس بکەن، دەبێ حەققانی و راستانی بن، حەق

رابگەیەنن جا خەڵك پێی خۆشە. یا پێی قەڵسن چش، ئەوە گرنگ نییە، گرنگ ئەوەیە ئەوان پەیامی خۆیان رابگەیەنن، ئەرکی سەرشانی خۆیان ئەنجام بدەن..

داواکارم لە خوای کاربەجیٚ و بەتوانا کە زیاتر لە سیرە و رێبازی پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ شارەزامان بکات و ژیانمان لەژێر رۆشنایی فەرموودە و کردارەکانی ئەو چاوساغەماندا ببێت بە ژین و دوور بێت لە ژان و ناخۆشی و نەهامەتی. اللّهُمَّ آمین.

# وتاری پێنجەم بۆ مانگی ڕەجەب

## ئیسراو میعراج - بەشی دووەم

الحَمدُ للّٰهِ رَبِّ العالَمين، والصَّلاةُ وَ السَلامُ على سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ و على آلِهِ و صَحْبِهِ أجمَعينَ.

**ئیماندارانی بەڕێز: لە وتاری ڕابردودا لە خزمەت موعجیزەی گەورەی پێغەمبەری خۆشەویستماندا بوین کە بریتی بوو لە گەشتی شەوڕەوی، بەرزبونەوەی بۆ سەروی ئاسمانەکان کە بە عەرەبی پێی دەوترێت (الاسراء و المعراج)، وە یەکێك لە سورەتە گەورەکانی قورئان بە ناوی (الإسراء) شەوڕەویەوە ناونراوە، بەڵام ئێمەی موسڵمان پێویستە زۆر بە وردی سەرنجی قورئان بدەین، بە ورد بونەوەی چڕ و ورد ئەمجا زیاتر بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم قورئانە چەند گەورە و پیرۆزە، چۆن لە سورەتی (الإسراء)دا تەنها ئایەتی یەکەمی باس لە شەوڕەویەکەی دەکات، بەڵام هەر لەو سورەتەدا ئەو داخوازی و داواکاریانەی قوڕەیشە کافرەکان باس دەکات کە پێش ئیسرا و میعراج لە پێغەمبەری خوایان ﷺ داواکرد.**

**لە ئایەتەکانی (٩٠ – ٩٣) لەم سورەتەدا باسیئەو داواکاریانەمان بۆ دەکات، و هۆکاری وەڵامنەدانەوەشیان و جێبەجێ نەکردنیشیان لە ئایەتی (٥٩) ی ئەم سورەتەدا باس دەکات.**

**دە فەرمون با بچینە خزمەتی سورەتی (الإسراء) ئایەتی (٩٠ – ٩٣) بزانین کافرەکانی قوڕەیش داوای چیان لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد:**

**ئیبنوجەریر لە ئیبن و عەبباسەوە ڕیوایەت دەکات و دەفەرموێت: پیاوماقوڵانی قوڕەیش لە لای کەعبەی پیرۆزەوە کۆبوونەوە و وتیان: بنێرن بە شوێن (محمد)دا و هەندێك مشتومڕی لەگەڵدا بکەن، تا بیانوتان دەربارەی**

نـەمێنێت. ناردیـان بـە دوایـدا و وتیـان: ئـەوە ریـش سـپیانی قـورەیش کۆبونەتـەوە بـۆ ئەوەی هەنـدێك قسەت لەگەڵدا بکـەن. ئەویش تەشـریفی بـە خێرایی هاتو وایزانـی گۆڕانکاریـەك بەسـەر هەڵوێستیاندا هـاتووە!... کاتێك دانیشتن و دەستیان کرد بە گفتوگۆ، کافرەکانی قورەیش وتیان: ئەی محمد، وەڵلاهـی ئێمـە نەمانبینیوە و نەمانبیستوە کـەس لـە عـەرەب وەکـو تـۆ ئـاوای لەگـەڵ هـۆزی خـۆی کردبێـت، ڕەخنـە لـە ئایینەکـەیان دەگریـت، گاڵتـە بـە بیروهۆش و بیرکردنەوەیان دەکەیت، دوو بەرەکیت تێدا ناوینەتـەوە، یـەکێتی و تـەبایی نێوانمـان لێـك پـچڕاوە، ئێمـە نـازانین تـۆ چـیت دەوێـت، ئەگـەر مەبەستت لە ماڵ و سامانە و بۆ ئـەوە وا دەکـەیت کـە دەوڵەمەنـد ببیـت، ئـەوە وەرە واز لەو هەڵوێستەی خۆت بێنە ئەوەندە ماڵ و سـامانت دەدەینـێ کـە لـە هەمووومان دەوڵەمەندتر ببیت، ئەگەر داوای ڕێز و گـەورەی دەکـەیت دەتکـەین بـە گـەورە و سـەرۆکی خۆمـان، ئەگـەر ئـەم حاڵەتـەت لـە ئاکـامی دەسـت لێوەشاندنی جنۆکـەوە تـوش هـاتووە، ئـەوە ئامـادەین چـی مـاڵ و سـامانمان هەیە لە پێناو چارەسەر و چاکبونەوەت لەم دەردە خەرج بکەین.

پێغەمبەر ﷺ لە وەڵامدا فەرموی: نەخێر، ئەوەی ئێـوە دەیڵێن هیـچی وا نیـە، مـن نـەهاتووم داوای مـاڵ و سـامانتان لێ بکـەم، نامـەوێت بمکەنـە پیاوماقوڵی خۆتـان، شێتیش نـیم، بـەڵکو خـوای میهرەبان منـی کـردووە بـە پێغەمبەر و بۆ سەر ئێوەی ناردووم، جا ئەگەر ئەو پەیامەی بۆم هێناون لاتـان پەسـەند بێـت و شـوێنم بکـەون، ئـەوە نیـشانەی بەختـەوەری دونیـا و قیامەتتانـە، خـۆ ئەگـەر پەیەماکـەم ڕەت بکەنـەوە، ئـەوە مـن ئـارام دەگـرم و چاوەڕوانی بڕیاری پـەروەردگارم لـە نێـوان مـن و ئێـوەدا... ئـەمجا کافرەکـانی قورەیش وتیان: ئەی محمد ئەگەر تۆ ئەم پێشنیارەمان ڕەت بکەیتەوە و سـور بیت لەسەر ئەوەی کـە تـۆ ڕەوانـەکراوی خـوای، ئـەوە داوایـەکی ترمـان هەیـە، ئـەویش ئەوەیـە: بـۆ خـۆت ئـەزانیت وڵاتـی ئێمـە وڵاتێکـی کـوڕ و تەنگەبەرە،

ولاتێكی شاخ و داخ و ڕەقەن و چەقەنە، گوزەرانمان گوزەرانێكی كەم و كورتە، كشتوكاڵ و باخ و بێستانمان نیە، دە داوا لە خوای خۆت بكە ئەم كێوانەی دەوروبەرمان بۆ بگوێزێتەوە، ولاتمان بۆ ببێتە سەرایەكی بەرفراوان، ئەمجار كانیاو و چۆم و جۆگەی ئاوی تێدا بتەقن و جۆگە و جۆباری تێدا بكشێن و كشتوكاڵمانی پێ ئاو بدەین، هەروەها داوا بكە ئەو باوك و باپیرانەی ئێمە كە لە دونیا دەرچوون زیندویان بكاتەوە، بۆ ئەوەی پرسیاریان لێ بكەین ئایا ئەوەی تۆ دەیڵێیت راستە و حەقە یان نا؟! هەروەها داوا لە خواكەت بكە باغ و باخاتت بۆ بەدی بهێنێت، قەصر و كۆشكت لە زێڕ و زیو بۆ درووست بكات، بۆ ئەوەی پێویستیت بە ئێمە نەبێت و تەماع نەكەیتە ماڵ و سامانی ئێمە.!.

بەڵێ خۆشەویستان: ئەم كافرانەی قورەیش كە هەمویان سەركردە بوون، وەكو (عوتبە و شەیبە و كوڕانی رەبیعە ، و ئەبو سوفیانی كوڕی حەرب و ئەبوجەهل و وەلیدی كوڕی موغەیرە و نەضری كوڕی حاریث و ئوممەیەی كوڕی خەلەف) كاتێك كەوتنە چاو و ڕاو و پەڵپ گرتنی نابەجێ و داواكردنی خاریقەی ماددی و پێشنیاری سەیر و سەمەرە، خوای گەورە قسە و داواكاریەكانیانی لە قورئانی پیرۆز باس كردووە و هەتا قیامەت موسڵمانان و هەموو مرۆڤایەتی دەیخوێننەوە.

قورئانی پیرۆز لە سورەتی (الإسراء)دا لە ئایەتی (٩٠-٩٣) باسی شەش داواكاریەكەیان دەكات كە وتیان:

١.﴿وَقَالُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفۡجُرَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَرۡضِ يَنۢبُوعًا﴾ واتە: ئێمە ئیمانت پێ ناهێنین هەتا لە زەوی مەككەدا كانیاومان بۆ هەڵنەقوڵێنیت، دەبێت داوا لە خواكەت بكەیت ئاومان بۆ هەڵقوڵێنێت و بەسەر زەویدا جاری ببێت.

٢. ﴿أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا﴾ یان دەبێت تۆ ئەی محمد باخێکت ببێت لە دار خورما و داری مێو و درەختی بەری تر، جۆگە و چەم و ئاوبارەیان بە خوڕەم تێدا هەڵڕێژێتە خوارێ، بەو ئاوە کشتوکاڵ و باغ و بێستانمان ئاودێر بکەین، بۆ ئەوەی بەروبومیان زۆر ببێت.

٣. ﴿أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا﴾ یان ئاسمان پارچە پارچە ببێت و بەسەرماندا بکەوێتە خوارێ، وەکو بۆخۆت دەڵێی خودای من ئەگەر مەیلی لێ بێت ئەوە دەکات، ئەی محمد تۆ هەڕەشەت لێ کردین بەوەی کە رۆژی قیامەت دێت و ئاسمان شەق دەبێت، پارچە پارچە دەکەوێتە خوارێ، دەی تا زووە ئەوەمان بۆ بێنە دی، با ئاسمان پارچە پارچە ببێت و بەسەرماندا بکەوێتە خوارەوە!!.

٤. ﴿أَوْ تَأْتِيَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا﴾ یان بە ئاشکرا ببینین خوا و فریشتەکان بێن و کۆمەڵ بە کۆمەڵ پێمان بڵێن محمد پێغەمبەرە، بە ئاشکرا قسەمان لەگەڵدا بکەن، شایەتی بدەن بەوەی کە تۆ پێغەمبەری خوایت و لە خواوە نێردراوی.

٥. ﴿أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ﴾. یان دەبێت تۆ خانوو باڵەخانەیەکت لە ئاڵتون و زێڕ هەبێت، چونکە تۆ هەتیوێکی هەژار و نەداریت، بەو حاڵەی ئێستات بە کەڵکی پێغەمبەرایەتی نایەیت.

٦. ﴿أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ﴾ یان دەبێت بە چاوی خۆمان ببینین پەیژەیەك بەرە و ئاسمان

هەڵبنێیت و بە پلیکانەکانیدا بەرەو ئاسمان سەر بکەویت، و ئەمجاش بزانە ئێمە باوەڕ بە بەرزبونەوەکەت ناکەین هەتا کتێبێک، نامەیەک لەگەڵ خۆت نەهێنیتە خوارەوە و بۆمان بخوێنیتەوە، چوار فریشتەش لەگەڵ خۆت بێنە خوارەوە شایەتیت بۆ بدەن، کە هەرچی دەیڵێیت راست دەکەیت.

ئیمانداران: ئایا وەڵامی ئەم هەموو داواکاریە سەیر و سەمەرە و بێ بنەمایانە چی بوو، خوای گەورە بە پێغەمبەری ئازیزی ﷺ فەرموو: ﴿قُلْ سُبْحَانَ رَبِّي هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولاً﴾. ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ خوای من زۆر لەوە بەرزترە یەکێك بەخۆی راوە ببینێت و ڕێگا بە خۆی بدات، پەڵپی ئاوای لێ بگرێت و پێشنیاری ئاوای بداتێ، ئەو خوایە بۆخۆی دانا و زانا و لێزان و خاوەن دەسەڵات و موڵك و مەلەکوتە، چی بوێت و چۆنی بوێت ئەوە دەکات و ئاوا دەکات...

ئایا من جگە لەوە: کە ئادەمیزادێکی رەوانەکراوم هیچی ترم؟! بێگومان من تەنها پێغەمبەرێکی ئادەمی سروشتم، وەکو باقی پێغەمبەرانی پێشوو، هیچ پێغەمبەرێك بۆی نیە و ناتوانێت جگە لەوەی خوا لەسەر دەستیان دەری بخات، شتی تر بێنێت یان داوای بکات.

ئیمانداران: لەوانەیە پرسیارێك لە بیر و مێشکی کەسانێك درووست ببێت و بڵێت: باشە ئەگەر ئەو هەموو سەرکردانەی کوفری مەککە داواکاریەکەیان بۆ جێبەجێ بکرایە و هەر زۆر زۆر ئاسانیشە بۆ خوای گەورە ﷻ کە ئەوەی ئەوان داوایان کردووە، لە لای مرۆڤ و توانای مرۆڤ لە سنوری خەیاڵە و مەحاڵە، بەڵام لای خوای گەورە بە (كُنْ فَيَكُون)ێك، هەر ئەوەندەی بفەرموێت ببە، یەکسەر درووست دەبێت و دێتە دی، ئەی باشە بۆ خوای گەورە بۆی نەهێنانە دی و ئەوانیش هەموویان ئیمان بێنن و بەهۆی ئەو

سه‌رۆكانه‌شه‌وه هه‌موو خه‌ڵكی مه‌ككه و ده‌وروبه‌ری موسڵمان ببن و ئیتر نه پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئازار ده‌درێت و نه كۆچ ده‌كات بۆ مه‌دینه و نه (به‌در و ئوحود و خه‌نده‌ق) ڕووده‌ده‌ن و نه ئه‌و هه‌موو هاوه‌ڵه شه‌هید ده‌كرێن... ئیتر بۆچی خوای گه‌وره وه‌ڵامی داواكه‌ی نه‌دانه‌وه؟!.

له وه‌ڵامی ئه‌م پرسیاره‌دا ده‌ڵێین:

١.خوای گه‌وره له سوره‌تی (الإسراء)دا له ئایه‌تی (٥٩)دا ده‌فه‌رموێت:

﴿وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَ﴾ واته: هیچ شتێك نه‌بووه ببێته به‌رهه‌ڵستی ئێمه له‌وه‌ی ئه‌و موعجیزانه‌ی موشریكه‌كانی مه‌ككه په‌ڵپیان لێ گرتبوو بیانهێنێته دی، جگه له‌وه‌ی كه ئوممه‌تانی پێشوو ئه‌و جۆره په‌ڵپانه‌یان گرتن و پاشان كه موعجیزه‌كانمان به‌دی هێنان باوه‌ڕیان پێ نه‌كرد و ئیمانیان نه‌هێنا، ئێمه‌ش له‌ناومان بردن، جا كه ئێمه بۆ موشریكه‌كانی قوڕه‌یش هه‌مان هه‌ڵوێست بنوێنین و په‌ڵپه‌كانیان بهێنینه دی و یه‌كسه‌ر ئیمان نه‌هێنن، ئه‌وه به گوێره‌ی داب و نه‌ریتی خۆمان ده‌بێت له‌ناویان به‌رین، ئه‌وه‌ش ویستی ئێمه نیه. چونكه ئه‌م په‌یامی ئیسلامه په‌یامێكی گشتی و هه‌میشه‌ییه، ئه‌مان خۆشیان ئیمان نه‌هێنن، منداڵ و نه‌وه‌كانیان ئیمان ده‌هێنن، بۆیه ئه‌و موعجیزانه‌ی داوایان كردووه پشتگوێمان خستن و نه‌مانهێنایه دی.. الله أكبر له ڕه‌حمی خوا به‌رامبه‌ر ئوممه‌تی محمد ﷺ.

٢.پایه‌ی هه‌ره گه‌وره‌ی ئیمان بریتیه له ئیمان و بڕوا به غه‌یب، وه‌كو بونی خوای گه‌وره ، فریشته‌كان، ڕۆژی دوایی، كه ئه‌مانه له دونیادا به چاو نابینرێن و گه‌وره‌یی ئیمانی مرۆڤی باوه‌ڕداریش له‌وه‌دایه‌كه خوای به چاو نه‌بینیوه و له ڕێگه‌ی په‌یامه‌كه‌ی و دروستكراوه‌كانیه‌وه ده‌یناسێت و ئیمانی پێیه‌تی... نه‌چۆته جیهانی دوای مردن و به‌هه‌شت و جه‌هه‌ننه‌م به‌ڵام

لە ڕێگەی نەقڵی کە قورئان و فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ کە باسی هاتن و پێشهات و ڕووداوەکانیان کردووە و بە بەڵگەی عەقڵی کە نابێت چاکەکار و خراپەکار وەکو یەك بن و ڕۆژێك نەبێت، جیهانێکی تر و ژیانێکی تر نەبێت کە پاداشت و سزای مرۆڤی تێدا بێتە دی... جا ئەگەر لە دونیادا خوات بە چاوی سەر بینی و قسەت لەگەڵ کرد بەهەشت و دۆزەخت بینی ئیتر گرنگی ئیمان و بڕوا لەکوێدا دەردەکەوێت.

هەروەها ئیمان و عەقیدە مەبدەئو بیروباوەڕە و نابێت بەرامبەر بە شتی دونیایی ببێت، بڵێ من ئیمان دێنم ئەگەر خوا ئەوەم بۆ بکات و ئەوەم بۆ جێبەجێ بکات. بەڵکو عەقیدە و بیروباوەڕ کە مەبدەئە، دەبێت مرۆڤ سامان و پارە و ماڵ و باخ و باخات و خۆشیەکانی ژیانی خۆی لە پێناودا بەخت بکات، بەداخەوە لەم سەردەمەدا کەسانێکی سادە و ئیمان کاڵ ، ئەو کاتە دڵیان بە خوا پەرستی و دینداریەکەیان خۆشە کە ڕزق و ڕۆزی باش و پارە و پوڵی چاك و لەشی ساغ و منداڵی زۆریان ببێت و درکێك نەچێت بە پەنجەیاندا، بەڵام ئەگەر توشی ئازارێك بوون، توشی زەرەر و زیانێك بوون، توشی لەدەس چوونی جگەرگۆشەیەك بوون، پەنا بە خوا ڕەخنە لە کاری خوا دەگرن و دەڵێن: باشە خۆ ئێمە موسڵمانین، خۆ ئێمە نوێژ دەکەین و ڕۆژوو دەگرین و جومعە دەکەین و حەرام ناخۆین، ئیتر بۆچی خوا ئەوەمان بەسەردا دێنێت!! کە ئەمە نیشانەی حاڵی نەبونە لە ئیسلام و ئیمان و نزیکە لە داواکاریە نابەجێکانی کافرە موشریکەکانی مەککە.

٣.خوای گەورە بۆیە داواکاریەکانی بۆ جێبەجێ نەکردن، و لە قورئانیشدا هەر شەش داواکاریەکەی تۆمار کردن، بۆ ئەوەیە تا ئوممەتی ئیسلامی فێری ئەوە بکات، ئێوە ئوممەتێکن نابێت لەسەر خەیاڵ پلاوی بژین و چاوەڕێ بن هەموو شتێکی ژیان و ئاوەدانی سەر زەویتان لە ڕێگەی موعجیزە و کەرامەتەوە بۆ بێتە دی، لە شوێنی خۆت دانیشیت و بەردێك

نەخەیتە سەر بەردێك و بیرێك هەڵ نەكەنیت و نەمامێك نەنێژیت و ناخی زەوی هەڵنەدڕیت و كانزا دەرنەهێنیت و كارگە درووست نەكەیت و هەر بەوەندەی لەسەر بەرماڵ بپاڕێیتەوە كە خوا وڵاتت ئاوەدان بكات و كشتوكاڵت بە پیت بكات و خاكت سەوز و پڕ دار و درەخت و باخ و باخات بكات و كۆشك و تەلارت بچێت بە ئاسماندا و ئاڵتون و پارەی دونیات لە بەردەستدا بێت. ئەمە لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامدا ناكۆكە و ئەم ئوممەتی ئیسلامە ئوممەتی (إقْرأ)ـە، ئوممەتی خوێندن و فێربوون وزانستە. ئوممەتی ﴿نٓ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ﴾ ئوممەتی مەرەكەب و قەڵەم و دێڕ و نوسینە، ئوممەتی ﴿وَقُلِ إعْمَلُوا﴾ ئوممەتی كاركردن و دەستی زبر و ماندوو خەباتكەرە، ئومەتێكە قورئانەكەی سەدان ئایەتی باسی كوشتوكاڵ و ئاودێری و ئاوەدان كردنەوەی سەر زەوی و باسی بازرگانی و ڕۆشتن بۆ ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای زەوی و باسی دروست كردنی كارگە و سەد و بەنداو و بەرهەمهێنانی وزە و زانستی زەڕە و ئەتۆم دەكات، ئەم ئوممەتە لە قورئاندا ئومەتی هیمەتە، ئومەتی هەڵمەتە، ئومەتی هەڵسانەوە و بوژانەوەی نەك هەر خۆی بەڵكو گەلانی سەر زەویە بە گشتی، ئومەتێكە ئەبێ بەسەر زەوی نەوەستێ و قورئانەكە دەفەرموێ دەبێ بڕوا بۆ ئاسمان و بەناو دەریا و زەریادا بچێتە خوار و بەرهەمی دەریا و ژێر زەریا دەربهێنێ، ئەم ئومەتە كە دوا پەیامی پێ سپێردراوە زۆر لەوە گەورەترە پاڵ بداتەوە و پیشەی خەو و خواردن بێ و نەجوڵێ و نەبزوێ بەڵام هەر پەڵپ بگرێ لە خوا، چونكە بەڕێزان دوعا هەیە و پەڵپ گرتن هەیە، دوعا و پاڕانەوەی شەرعی كە لە قورئاندا ئەمری پێ كراوە، ئەوەیە تۆ هەموو هێز و تینی خۆت بخەیتە كار هەموو هۆكارەكانی سەركەوتن لەو كارە بگریتە بەر ئەمجا لە خوا بپاڕێنەوە كە سەركوتوت بكات

و یارمەتیت بدات و پشت و پەنات تەنها هەر خوای گەور بێت و سەرکەوتنەکەت لە خواوە بزانی نەك هەوڵ و هیمەت و جوهد و تێکۆشانی خۆت، بەلام پەڵپ گرتن ئەوەیە کە بێکار و دەستەوسان لێی دابنیشی و هیچ هەوڵێك نەدەی و تەنها داوا لە خوا بکەیت کە ئەوەت بۆ بکات و ئەوەت بۆ ئەنجام بدات لە کاتێکدا کەخوای گەورە هەموو هۆکارەکانی خستۆتە بەردەستت و دەفەرموێ تۆ بجوڵێ و کار بکە منیش یارمەتیت دەدەم و سەرکەوتوت دەکەم.

بەڵێ ئیمانداران: خوای گەور لەو کاتەدا وەڵامی ئەو پەڵپە نابەجێ و منالبازارِیەی کافرە موشریکەکانی مەککەی نەدایەوە کە لە سورەتی -الاسراء-دا باسی کردووە بۆمان و رونمان کردەوە، بەڵام دوای چەند ساڵێك خوای گەورە شەورەوی و بەرزبونەوەی بە پێغەمبەری خۆشەویست کرد بۆ ئەوەی دڵدانەوەیەك بێ بۆ خۆشەویستەکەی خۆی کە حەزرەتی محمدە لە کاتی ئەو هەموو ئەشکەنجە دەروونی و جەستەیەی کە باسمان کرد کە بەسەر خۆی و هاوەڵانی هاتوە وەکو لە وتاری رابردوودا باسمان کرد، وە بۆ ئەوەش کە خوای گەورە نیشانی موشریکەکانی مەککە و هەو مرۆڤایەتی بدات کە هیچ شتێ لە دەسەڵات و توانای خوای گەورە بەدەر نیە و لە ماوەیەکی زۆر کورتی شەوێکدا وەکو موفەسیری قورئان دەفەرموون شەورەوی پێ کراو چووە ئاسمان و دەیان مەشهەدی بینی و کە گەڕایەوە ناو جێگەکەی هێشتا جێگاکەی سارد نەبوبۆوە. ئێستاش با بچینە سەرەتای سورەتی -الاسراء- کە دەفەرموێ ﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ﴿سُبْحَٰنَ ٱلَّذِىٓ أَسْرَىٰ بِعَبْدِهِۦ لَيْلًا مِّنَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ إِلَى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْأَقْصَا ٱلَّذِى بَٰرَكْنَا حَوْلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنْ ءَايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ﴾ الاسراء ١

واتــە: پــاکو مونــەزەهو بــێ عــەیب و بــێ هــاوەڵ و هاوشــانە ئــەو خــودا بەدەسەڵاتەی کە لە بەشێکی شەودا شەوڕەوی بە بەندەی خۆی محمدﷺ کرد، لە مزگەوتی کەعبەوە بۆ مزگەوتی قودس، کە بە گوێرەی وەسائیلی هاتوچۆی ئەو کاتە و ئەو رۆژگارە چل قۆناغە رێ لە یەکتر دوور بون، ئەم ئیسرا و میعراجە ساڵێك پێش کۆچکردن بۆ مەدینە بووە مەبەست لە (المسجد الاقصی) مزگەوتی قودسە، بۆیەش پێی گوتراوە –الاقصی– چونکە زۆر لە مەککە دوور بووە. لە نێوان مَسجِدُ الحرام و مَسْجِد الاقْصی چل قۆناغە رێگابووە.

پاشان قورئان دەفەرموێ (اسری بعَبْدە) صیفەتی عەبدایەتی بۆ پێغەمبەری خوا چەسپاند لەم مەقام و پلە و پایەیەدا کە مەقامی شەوڕەوی پێکردن و بەرز کردنەوەیە بۆ پلە و پایەیەك، کە هیچ ئادەمیزادێك نەیگەیشتۆتێ نالەم مەقامەدا هێنانی وشەی (بِعَبْدە) مەغزایەکی تایبەتی هەیە و ئەوە هێندراوە. کە ئەم صیفەتە بەرچاو بگیرێ و لەبیر نەچێتەوە، نەوەکوو مەقامی عبودیەت و مەقامی ئولوهیەت تێکەڵ بەیەکتر بن، دوایی خەڵکی لێیان بشێوێ، وەکو لە بیر و باوەڕی مەسیحیدا رویدا بەهۆی ئەو دیاردانەی کە پەیوەندی بە لەدایك بوونی عیسا و لە دونیا دەرچوونیەوە هەیە و ئەو موعجیزانەی پێی درا، نەوەبوو بە بۆنەی ئەم شتانەوە دوای لە دنیا دەرچوونی، هەندێ کەس هاتن پلە و پایەی پێغەمبەرایەتی و مەقامی ئولوهیەتیان تێکەڵاو بە یەك کردن بیر و باوەڕی سێ خودایی و عیسا خودایی هات!... بەم شێوەیە بیر و باوەڕی ئیسلامی بە پاك و خاوێنی و ئاسایی و دوور لە هەموو شیرك و شوبهە و تێکەڵ و پێکەڵێك دەمێنێتەوە.

لە لایەکی ترەوە وشەی –أسری– بە مانای شەوڕەوییە، کەواتە مانای شەو لە وشەکەدا هەیە، ئەدی بۆچی وشەی (لَیلاً)ی هێنا؟! لە وەڵامدا دەگوترێ: وشەی (لَیلاً) بە نەکیرە هاتووە، کەبەر ئەوەی (لَیلاً) نەکیرەیە

**کەواتە: تەقلیل دەگەیەنێ واتە: شەوڕەویەکە لە ماوەیەکی کەم و کورتی شەودا بووە و زۆری نەخایاندووە، بەڵێ قورئان دەفەرموێ: (أسری بعبده) لەسەر ئەم دوو وشەیە زۆربەی زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئیسرا و میعراج بە جەستە و گیان بووە. چونکە کە خودا فەرمووی: (أسری بعبده) وشەی (عەبدیش) ناوە بۆ جەستە و بۆ گیان، کەواتە: شەوڕەوی و بەرزبوونەوەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئاسمانەکان بە جەستە و گیان بووە.**

**کە باسی مزگەوتی** قودسیش دەکات دەفەرموێ: **(الذي باركنا حَولَهُ) ئەوە مزگەوتی قودسەی کە دەورو بەرەکەیمان کردۆتە خێر و بەرەکەت بۆ دانیشتوانی. ژیان و رزق** و روزی **و کێڵگە و دار و درەختی ئاو و هەوا و بەرو بومی** هەمووی هەر حیر و بەرەکەتە، **بۆ دین و دونیا شوێنێکی پیرۆزە لە بارەی ئاینەوە، چونکە مەڵبە**ندی پێغەمبەرانە، **لەبارەی دونیایشەوە چونکە وڵاتێکی** بە پیت و بەرەکەتە. پرە **لە دار و درەختی بەردار و بەروبومی جۆراوجۆر.**

**خوای گەورە دەفەرموێ:** شەورەویمان پێ **کرد: (لنُريهُ منْ آياتنا) بۆ ئەوەی بەڵگەی** تاك و تەنهایی **و خودایەتی خۆمان نیشانی بەندەی بەڕێزمان** بدەین، **بەڵگەی بەهێز و** پێز لەسەر **بەتوانایی و دەسەلاتی بێ سنوری خۆمانی** نیشان بدەین (إنَهُ هُوَ السَميعُ البَصير) **بێگومان ئەو خودایەی شەوڕەوی بە بەندەی خۆی کرد بیسەر و بینایە..**

**بەڕێزان:** دوای **گەیشتنی پێغەمبەری خوا ﷺ لە کەعبەوە بۆ قودس و ئیمامەتی بۆ هەموو پێغەمبەران، ئەنجا کاتی بەرز بوونەوەی بوو لە مسجد الاقصی وە بۆ ئاسمان.**

**لە صەحیحی موسلمیدا دەفەرموێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی:**
(ثُمَ عَرج بنا إلى السماء فاسْتَفتَحَ جبريل ، فَقيلَ: مَنْ أنتَ؟ قال: جبريل . قيل

وَمَن مَعَكَ؟ قال: محمد، قيلَ: وقَد بُعِثَ إليه؟ قال: قَدْ بُعث إلَيهِ، فَفُتِح لنا))

**واتە: پاشان بەرز کراینەوە بۆ ئاسمان، جوبریل داوای کردنەوەی دەرگای ئاسمانی کرد، وترا: کێیە؟ وتی: جوبریل وترا: کێیە لەگەڵتا؟ وتی: محمد. وتی: ئایا بانگ کراوە؟! وتی: بەڵێ دەعوەت کراوە!! دەرگا بکەرەوە، ئەنجا دەرگاکەی بۆ کردینەوە.**

**لێرەدا چەند دەرس و وانەی گەورە هەیە کە زانای گەورە ئیمامی نەوەوی لە شەرحی صحیح مُسلم دا ج٢ ص٢٧٧ دا ئاماژەی پێ کردوون وەکو:**

**١. جوانی دەستوری لەدەرگادان، کە هەرچەندە ئەو کەسە گەورەش بێ و سەرکردەی هەموو ئەوانەش بێ کە دەرگاوانن و پاسەوانن، بەڵام بە بێ لەدەرگادان و داوای روخسەت و مۆڵەت وەرگرتن نەچێتە ژورەوە، هەروەکو جوبریل علیە السلام لەگەڵ ئەوەی کە گەورەی هەموو فریشتەکانە، بەلام بەبێ لەدەرگادان و مۆڵەت وەرگرتن نەڕۆشتە ئەودیو دەرگاوە.**

**٢. کاتێ لەدەرگاتدا وتیان: کێیە؟ بڵێ فلان کەسم، ناوی خۆت بڵێ، مەڵێ خۆمانین، ئەوەتا جوبریل کەوتیان: کێیە؟ فەرمووی: جوبریلم.**

**٣. فریشتەکانی دەرگاوانی ئاسمانی دونیا فەرمووی: وَقَد بُعِثَ إليهِ؟ ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ:** (فَمُرادهُ وَقد بُعِثَ إلَيه للأسراء وصعُود السَّماوات ولَيسَ مُرادهُ الأستفهام عَنْ أصلِ البعثة والرِّسالة فَإنَّ ذالكَ لا يَخفى عَلَيهِ هذه المُدَّة. **(مُسلم بشرح النووي ج٢ ص٢٧٧) هەروەها –الحافظ إبن حجر) لە (فتح الباري ج٢ ص٢٤٩)دا دەفەرموێ: لە بوخاریدا هاتووە کە فریشتەی دەرگاوانی ئاسمان لە جوبریلی پرسی:** (وَقَد أُرسِلَ إلَيه؟) أي: للعُرُوجِ ولَيسَ المُراد اَصْلُ البعث لأنَّ ذلكَ كانَ قَدْ غشتَهَرَ في الملكوت الاعلى) **واتای مەبەست**

ئەوەیە کە: فریشتەی دەرگاوان کاتێ پرسی: ئایا پەیامی بۆ نێردراوە، مەبەستی لە پەیامی پێغەمبەرایەتی نەبوو. بەڵکو مەبەستی لەوەبوو ئایا پەیامی بۆ نێردراوە کە گەشتی ئاسمانی پێ بکرێت؟ چونکە بوون بە پێغەمبەر و بەخشینی پەیامی پێغەمبەرایەتی شتێکی ئاشکرا بوو لە لای فریشتەکان و پێویستی بە پرسیار نەدەکرد.

هەروەها –إبن حجر– هەر لە فتح الباري دا دەفەرموێ: ئەم پرسیارەی بۆیە کرد وەکو سەر سوڕمانێك لە گەورەیی پلە و پایەی پێغەمبەر و ئەو هەموو ڕێز و قەدرەی کە خوا پێی بەخشیوە، وە ئەم پرسیارەی فریشتەی دەرگاوان، وەکو خۆشی دەربڕینێك بوو بۆ ئەو هەموو پلە و پایەیەی کە لە پێغەمبەری خودا گیراوە و هەتا ئەو کاتە هیچ کەس پەیامی بۆ نەنێردراوە کە بەرز بێتەوە بۆ ئەو شوێنە، وە ئەم پرسیارەشی وەکو گومان نەکرد چونکە فریشتەکان زانان بەوەی کە هیچ مرۆڤێك ناگاتە ئەو شوێنە لە ئاسمان بەبێ ئیزن و ڕەزامەندی خوای پەروەردگار، وە جوبریل کەسێك لەگەڵ خۆی نابات بۆ ئاسمان ئەگەر ئەو کەسە پەیامی لەلایەن خواوە بۆ نەنێردرابێ.

٤. لە (فتح الباري ج٧ص٢٤٩) فریشتەی دەرگاوانی ئاسمان فەرمووی: (ومن معك؟!) ئەوە کێیە لەگەڵتا. نەیفەرموو: (أمَعَكَ أحَد؟) ئایا کێت لەگەڵە؟ چونکە فریشتەکە هەستی کرد جوبریل کەسێکی لەگەڵە، ئەم هەست کردنەشی یان بەهۆی بینینی پێغەمبەری خواوەﷺ بوو چونکە ئاسمان شەفافە و ئەمدیوی تێدا دیارە، یاخود بەهۆی ڕوداوێکی مەعنەویەوە زانی وەکو زیادبونی نور و ڕوناکی و درەوشانەوە کە نور و ڕوناکی پاکی حەزرەتی محمدەﷺ

٥. لە کاتی وەڵامدانەوەی فریشتەی دەرگاواندا حەزرەتی جوبریل فەرمووی: ئەوە محمدە، إبن حَجر دەفەرموێ: (دَليلُ عَلى أنَّ الإسْمَ أولى في

التعريف مِنَ الكُنية) ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ناو –الآسم– لە پێشترە بۆ ناساندن لە –نازناو– کونیە، وە فریشتەکە نەیفەرموو: مَن مُحمد؟! چونکە ناوی پیرۆزی محمد ئەوەندە ئاشکراو وناسراو بوو پێویستی بە پرسیار لێکردن لە بارەیەوە نەبوو. کەواتە: خوای گەورە نیشانی پێغەمبەری خۆشەویستی دا کە ئەی محمد تۆ ئاوا ناوت ئاشکرا و بەرز و نورانیە نەك هەر لەسەر زەوی بەڵکو لە ئاسمانیش ئیتر هێزی کوفری مەککە و طائف و سەرانیان و وەڵام نەدانەوەت چ بایەخێکی هەیە، کە تۆ دڵی خۆتی پێوە گران بکەی؟!...

٦. لەم فەرموودەیەوە تێدەگەین کە ئاسمان بۆیە رێك و پێکە و پێکدادان روونادات و پشێوی و ئاژاوە هەرگیز لە ئاسماندا دروست نابێت چونکە نیظام و یاسا هەیە و کەس سنور نابەزێنێ، ئەوەتا جوبریل گەورەی هەموو فریشتەکانە، حەزرەتی محمدﷺ خاتم الانبیاء و المرسلین، هەموو فریشتەکان دەیناسن، بەڵام سەربەخۆ و بەبێ ئیزن و لەدەرگادان ناڕۆنە ئەودیو دەرگاوە، ئەبێ لێیان بپرسرێ کە کێن و ئایا رێگایان پێدراوە یان نا؟ تەماشاکەن ئەوانیش چەند بە تەوازوعەوە وەڵام دەدەنەوە، حەزرەتی جوبریل دەفەرموێ: جوبریلم و محمدم لەگەڵە، جا ئێمەش گەر بمانەوێ لەسەر زەوی بەرێك و پێکی بژین و کەس ئازاری کەس نەدات و پێکدادان رونەدات و ژیان ببێتە گوڵستان و نەبێتە گورگستان، دەبێ نیظام و یاسا هەبێت و گەورەترین و پلەدارترین کەس نابێ بەبێ پرس دەرگا بڕێ و لە خاڵی پشکنینەوە تێپەڕ بێت.

بەڵێ بەڕێزان: پێغەمبەری خواﷺ باسی بەرز بوونەوەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: لە ئاسمانەکان چاوم بە پێغەمبەران کەوت بەم شێوەیە: لە ئاسمانی یەکەم حەزرەتی ئادەم، لە ئاسمانی دووەم: یحیی و

عیسی، لە ئاسمانی سێیەم: یوسف، لە ئاسمانی چوارەم:ئیدریس و لە ئاسمانی پێنجەم هارون و لە ئاسمانی شەشەم موسی و لە ئاسمانی حەوتەم إبراهیم.

ئیمانداران: پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: سەلامم لە پێغەمبەران دەكرد و ئەوانیش وەڵامی سەلامەكەیان دەدامەوە و هەموویان بەم شێوەیە بەخێرهاتنیان دەكردم: (مَرْحَباً بالأخِ الصالحِ و النَّبيِّ الصالح) مەرحەبا و پێشوازی لە برای چاك و پێغەمبەری چاك.. بەلام ئادەم پێی وتم: (مَرْحَبا بالإبنِ الصالِح و النَّبي الصَّالح) مەرحەبا و پێشوازی لە كوڕی چاك و پێغەمبەری چاك. وە هەموو پێغەمبەران دوعای خێریان بۆ دەكردم.

ئیمانداران: لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ ئەویش ئەوەیە: باشە بۆچی تەنها هەر چاوی بەو پێغەمبەرانە كەوت، ئەی بۆچی چاوی بە نوح و هود و صالح و شوعەیب و لوط نەكەوت؟! شێخی إبن حجر لە (فَتح الباري ج٧ص٢٥١) دەفەرموێ: حیكمەت لەوەدا كە چاوی بەو پێغەمبەرانە كەوت ئەوەیە كە ئاماژەیە بەوەی كە ئەی محمد تۆش ژیانی لەمەودوات وەكو ئەو پێغەمبەرانە دەبێت كە لە ژیانیاندا لەگەڵ هۆزەكانیان بۆیان هاتە پێش وەكو حەزرەتی ئادەم چۆن لە بەهەشتا دەركرا چەند خەفەتبار و دڵتەنگ بوو، بەڵام پاشان گەڕایەوە بۆ بەهەشت، كەواتە: ئەی محمدﷺ تۆش لە مەككە دەردەچی و وڵات و زێدی خۆت بەجێ دێڵی و خەفەتبار دەبی و بەڵام پاشان تۆش بە دڵخۆشیەوە دەگەڕێیتەوە بۆ نیشتمان و شوێنی لەدایك بوونت كە مەككەیە.

بە چاوپێكەوتنی یحیی و عیسی پێغەمبەر ئەوە دەردەكەوێت بۆ پێغەمبەری خواﷺ كە لەمەودوا دەچێتە شوێنێك كە جولەكەی لێیە و ئەو جولەكانە چۆن دژایەتی ئەو دوو پێغەمبەرەیان كرد و دەستی خیانەت و

خراپەکاریان بۆ درێژ کردن و سەرەنجام حەزرەتی یەحیایان شەهید کرد و هەوڵی تیرۆر و کوشتنی حەزرەتی عیساشیان دا بەڵام خوای گەورە پاراستی و بەرزی کردەوە بۆ ئاسمان.

کەواتە ئەی محمد تۆش لە لایەن ئەو جولەکانەوە هەوڵی لەناوبردنت دەدرێ و پیلانی ژەهراویت بۆ دادەڕێژن.

وە بە چاوپێکەوتنی یوسف پێغەمبەر، ئەوە بە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاگەیەنرا، چۆن کاتی خۆی یوسف لەلایەن براکانیەوە هەوڵی لەناوبردنی دراو پیلانی بۆ داڕێژرا بۆ کوشتنی یان دوورخستنەوەی لە باوەشی باوکی و دەرکردنی لە وڵات، بەڵام پاشە ڕۆژ هەر بۆ یوسف بوو، ئەی پێغەمبەری خۆشەویست تۆش بە هەمان شێوە لە لایەن خزمە حەسود و نادانەکانتەوە، لە لایەن قەوم و هۆزەکەتەوە پیلانت بۆ دادەنرێ هەروەکو لە کاتی هیجرەتدا وتیان: بیکوژین، یان زیندانی بکەین، یاخود لە وڵات دوری بخەینەوە، بەڵام چۆن یوسف سەرکەوت بەسەر برا نەزانەکانیدا و بەمل کەچیەوە لەبەردەمیدا وەستان و داوای لێبوردنیان کرد، ئەویش عەفووی کردن، تۆش ئەی پێغەمبەری خۆشەویست ئاوا ڕۆژێك دادێ کە ئەو کەسانەی کە دژایەتیان کردی و دەربەدەریان کردی و هەوڵی لەناوبردنیان دای ئاوا بە ملکەچیەوە لەبەردەمتا ئەوەستن و تۆش بەو دڵە گەورەتەوە لێیان دەبوری، هەروەکو ئاماژەیە بۆ فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا فەرمووی: ئەی خەڵکی مەککە، هەر ئەوەتان پێ دەڵێم کە یوسف فەرمووی: (لا تَثريب علَيكُم) بڕۆن ئازادن و هیچ تۆڵە سەندنەوەیەك نیە.

وە بە چاوپێکەوتنی حەزرەتی ئیدریس، ئەوە ئاماژە بوو کە چۆن ئیدریس پلە و پایەی بەرز بوو لای خوا (وَرَفَعْناهُ مَكاناً عَلياً) ئەوە تۆش ئەی

محمد ئاوا پلـه و پایـەت بـەرز بـۆوە و ئـەوەتا لـەم شـەوڕەویەدا گەیـشتویتە شوێنێك كە هیچ مرۆڤێك نەیگەیشتۆتیٚ و ناشیگاتیٚ.

وە بە چاوپێكەوتنی هارون پێغەمبەر، ئەوە ئامارژە بوو كە چۆن هارون سـەرەتا قەومەكـەی زۆر ئازاریـان بـە دڵـی گەیاند و سەرپێچی فەرمانەكانیان كرد، كەچی دوایی زۆر شیرین بوو لـە دڵیاندا و بـوو بە خۆشەویستێكی زۆر گـەورە لـەناو هۆزەكەیـدا، ئـەی محمـد ﷺ تـۆش ئـاوا سـەرەنجام دەبـی بـە شیرینتر و خەۆشەویست ترین كەسی ناو هۆزەكەت دوای ئەوەی  كە سـەرەتا ئازاریان دای.

وە چاوپێكەوتنی حەزرەتی موسی ئاماژەی ئەوەی تێدا بوو كە موسی لـە پێنـاوی رزگـاركردن و چاكسازی قەومەكەیـدا چـەند ئەشكەنجە و ئـازاری چەشـت، بـەڵام موسـی زۆر خـۆڕاگر بوو،هـەروەكو پێغەمبـەری خـواﷺ لـە كاتێكدا ئازاردرا فەرمووی: (لَقَدْ أوذِيَ مُوسى بأكثَر من هذا فَصَبَرْ).

لە چاوپێكەوتنی حەزرەتی ابراهیمدا ئەوە ئاماژە پێدەكریٚ، كە چۆن ئیبراهیمت لە ئاسمانی حەوتەمدا و لە كۆتای پێغەمبەراندا بینی ئاواش ئـەی محمـد لـە كۆتـایی تەمەنتـدا، یـان لـە ساڵی حەوتـەمی دوای كۆچكردنتدا بـۆ مەدینە زیارەتی كەعبەی  پیرۆز دەكەیتەوە و حەج دەكەی.

بـەڕێزان: شـێخی ئیبن كـثیر لـە تەفسیرەكەیدا ج٤ص٤٠٤ دەفـەرمویٚ: ثَبَت فِي الصَّحيحَين اَنَّ رَسولَ اللهﷺ قـالَ فِي حَـديثِ الأسـراء، بَعْـدَ مجاوزتـه الى السماء السابعة: (ثُمَ رَفَع بي إلى البَيْت المعمور، وإذا هُوَ يَدخله فِي كُلٍّ يَوْمٍ سَبعونَ ألفاً لا يعدون إليه آخر ما علـيهم) واتـە: لـە هـەردوو صـەحیحەیندا (بوخـاری و موسلم)دا هاتووە كە پێغەمبەری خواﷺ لەو فەرموودەیـەدا باسـی شـەوڕەوی دەكـات و دەفـەرمویٚ: دوای گەیـشتنمان بـە ئاسمـانی حەوتـەم: پاشـان بـەرز

کراینەوە بۆ (بیت المعمور)، کە ئەو شوێنە موبارەکەیە کە هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناوی و طەوافی دەکەن و ئیتر جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ ناوی، لەبەر زۆری فریشتە، ئەوەی یەك جار چووە ناوی ئیتر جارێکی تر بەری ناکەوێتەوە!! واتە ئەم (بیت المعمور)ـە وەکو کەعبەی سەر زەوی وایە بۆ خەڵکی ئاسمان و چۆن مرۆڤەکان طەوافی کەعبە دەکەن لەسەر زەویدا، فریشتەکانیش ئاوا لە ئاسماندا طەوافی (بیت المعمور) دەکەن، جا موفەسیری گەورەی قورئان –شێخی إبن کثیر– لەسەر ئەم فەرموودەیە لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێ: کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: لە ئاسمانی حەوتەمدا ئیبراهیمم بینی پشتی بە (بیت المعمور)ەوە دابوو، ئەوە ئەو ڕێز و گەورەی یەی لەسەر ئەوە پێ بەخشرا چونکە ئیبراهیم دروستکەری خانووی کەعبەیە لەسەر زەویدا، (الجـزاءُ مَـنْ جِـنْسِ العَمَـلِ) پاداشتیش لە جۆری کردارە، کەواتە: هەرکەسێ خزمەتکار و دروستکاریماڵی خوابێ، ئاوا خوا دوای مردنیشی ڕێزی لێدەگرێ، ئیبراهیم چونکە لە دونیادا بینای ماڵی خوای کرد کە (کەعبە)یە، خوای گەورە دوای وەفاتی بردیە (بیت المعمور) لە ئاسمانی حەوتەم چونکە (بیت المعمور) ڕێك بە بێ زیاد و کەم لە ئاستی کەعبەی پیرۆزدایە، ئەم لەسەر زەویە، ئەو لە ئاسمانی حەوتەمە، (إبن کثیر) دەفەرموێ: لە هەموو ئاسمانێکدا خانویەك (بەیتێك) هەیە کە ئەهلی ئەو ئاسمانە عیبادەتی خوای تێدا دەکەن، وە نوێژی تێدا دەکەن، ئەوەی لە ئاسمانی دونیادایە پێی دەوترێ: بَیتُ العِزة... والله اعلم.

جا خۆشبەختی بۆ ئەو کەسانەی کە بە دڵسۆزی و تەنها لە پێناوی خوادا لەسەر زەوی مزگەوت دروست دەکەن و دڵیان وابەستەیە بە مزگەوتەوە و بە هەموو جۆرێك خزمەتی مزگەوت دەکەن، ئەوە إنشاءَ الله لە دوای مردنیان رۆحەکانیان لە خزمەتی حەزرەتی ئیبراهیمدا لە ئاسمانی حەوتەمدا لەلای (بیت المعمور)ەوە ئارام دەگرێ تا قیامەت.

ئیمانداران: بەڕاستی باسی ئیسرا و میعراج لەگەڵ هەموو وشە و دێڕێکی ئەو بابەتە خۆش و سەرنجراکێشەدا، پێویستی بەلەسەر وەستان و لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە و پرسیار و وەڵامێك هەیە.

بۆ نمونە: لە صحیحی مُسلم دا هاتووە کە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: لە ئاسمانی سێیەمدا چاوی بە یوسف کەوت (إذا هُوَ قَدْ أُعطی شَطَرَ الحُسْنِ . . .)، واتە: یوسف نیوەی هەموو جوانی پێبەخشرابوو، وە هەروەها لەو ریوایەتەدا کە لەلای –طەبرانی و بەیهەقی– هاتووە دەفەرموێ: (فَإذا انا بِرَجُلٍ أحسن ما خَلَقَ الله، قَد فَضل الناس بالحُسن کالقَمَرِ لَیْلَة البَدرِ عَلی سائرِ الکواکب) واتە: چاوم کەوت بە پیاوێك کە جوانترین شتێك بوو کە خوا دروستی کردووە، بەڕاستی ئەوەندە جوانیەکەی لەسەر و جوانی خەڵکی ترەوە بوو هەروەکو جوانی مانگی شەوی چواردە لەسەر هەموو ئەستێرەکان..

لێرەدا ئەو پرسیارە دروست دەبێ کە: خۆ پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی محمدﷺ لە هەموو مرۆڤەکانی سەر زەوی جوانتربووە، هەر وەکو

لەو فەرموودەیەدا هاتووە کە (ترمذي لە ئەنەسەوە) فەرموویەتی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ما بَعَثَ اللهُ نَبياً إلاحَسَنُ الوَجه حُسْنُ الصَّوْت، وكانَ نَبيُّكُم احْسَنهُم وَجهاً و أحْسَنُهُم صَوتاً) واتە: خوای گەورە هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە. ئەو پێغەمبەرە جوانترین روخسار و خۆشترین دەنگی هەبووە، (ئەم دوو مەرجەش پشکی گەورەیان هەیە لە سەرکەوتنی بانگخواز لە بانگەواز کردنی خەڵکیدا) فەرمووی: وە بزانن پێغەمبەرەکەتان جوانترین روخسار و خۆشترین دەنگی هەیە لە ناو هەمو پێغەمبەراندا و لە پێشی هەموویانەوەیە.

پرسیارەکە ئەوەیە: ئەی بۆچی یوسف بە رەمزی جوانی دادەنرێ و ئەوەندەی کە باسی جوانی جەماڵی یوسف دەکرێ باسی جوانی پێغەمبەری خوا ﷺ ناکرێ؟! لە وەڵامدا دەڵێین: (لأنَّ الله كَسا جَمال النَبي ﷺ بالهَيْبَة وَ الجَلال فَلا يَسْتَطيع أحَدُ أنْ يُحدَّ النَّظَرَ إلَيْه).. لەبەر ئەوەی کە خوای گەورە جوانی روخسار و شێوەی پێغەمبەری خوای ﷺ داپۆشیوە بە هەیبەت و سەنگینیەکی زۆر گەورە، ئەوەندە کەسایەتی قورس و سەنگین بوە، هیچ کەسێك نەیتوانیوە چاو لە چاوی بڕێ لە کاتی تەماشاکردنیدا، ئەمەش رێزێکی تایبەت بوە کە خوای گەورە بە پێغەمبەری خۆشەویستی بەخشیوە ﷺ کە ئاوا خاوەنی هەیبەت و کەسایەتی بەهێز بووە، بەبێ ئەوەی زەرەیەك، تۆزقاڵێك کیبر و خۆ بەزل زانینیشی هەبێ.

لـە صـەحیحی مُـسلم دا هـاتوە دەفـەرموێ: عـەمری کـوڕی عـاص فەرموویەتی: (ما كانَ اَحَدٌ أحَبُّ إليَّ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ ولا أجَلَّ في عَيْنَيَّ مِنهُ، وَما كنت أطيق اَنْ أمْلأَ عَيْنَي منهُ إجْلالاً لَه، وَلَو سئلت أنْ أصفَه، ما أطقْتُ لأنِّي لَمْ أكُنْ أملأ عَيْني منهُ)

واتە: هیچ کەسێك نەبووە کە خۆشەویستر و بەڕێزتر بێ لە ناو دڵ و بەرچاوی منـدا لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ زیـاتر، وە هـەرگیز ڕۆژێـك لـە ڕۆژان نەمتوانیوە کە پڕ بە چاوم سەیری بکەم، وە ئەگەر کەسێك داوام لێبکات کە وەصـفی پێغەمبـەری خـوای بـۆ بکـەم، بێگومـان نـاتوانم، نـەك لەبـەر ئـەوەی خۆبەزل زان و توڕە و خاوەن ڕق بوبێ بەرامبەر بە هـیچ کەسێك، بـەڵکو لەبەر ئـەوەی کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەوەنـدە خـاوەنی هەیبـەت و ڕێـز و حورمـەت بوو، ئەوەندە شەخصیەتێکی بەهێز لە دەموچاویدا دەبینرا هەرگیز چاوم پڕ نەبوو لە بینینی ئەو خۆشەویستەم!...

وە لێـرەدا گـەورەیی ئـەدەب و ڕێـزی صـەحابەش دەردەکـەوێ بـۆ پێغەمبەری خوا ﷺ.

خۆشەویـستان: دیمـەنێکی تـر لـەو شـوێنانەی کـە جێگـای لەسـەر وەستانە ئەوەیە کە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرموێ: لـە ئاسمـانی شەشـەمدا چاوم کـەوت بـە حـەزرەتی موسـی و پێشوازی لـێ کـردم و دوعـای خێـری بـۆ کردم، بـەلام (فلّما جاوزته بكى، فَنُودِيَ: ما يَبْكيك؟ قال: يا رَب هذا غلام بعثته بَعدي يَدْخل من أُمَّته الجَنَّة اكثر ممّا يـدخل مـن أُمّـتي) واتـە: کاتێك کە ویستم

موسی بەجێبهێڵم و کەمێك لێی دوور کەوتمەوە دەستی کرد بە گریان، بانگی لـێ کـرا: ئـەی موسـی چـی خـستیتیە گریـان؟! موسـی فـەرمووی: ئـەی پـەروەردگار کوڕێکـت نـاردووە دوای مـن، ئومەتەکـەی ئـەو زیـاتر دەچـنە بەهەشتەوە لە چاو ئومەتەکەی مندا..

بەڕێزان: لێرەدا پێویستە روونکردنەوەیەك بخەینە بەر چاو، نەوەکو کەسێك بە نەزانی واتێبگات کە حەزرەتی موسی حەسودی بە پێغەمبەری خوا ﷺ بردووە، پەنا بە خوا، بەڵکو بۆ رەواندنەوەی ئەو گومانە دەچینە خزمەت کتێبی گەورە و ناودار و بۆن خۆش کە (فَتح الباري ج٧ص٢٥١) لەوێدا بەم شێوەیە شەرحی ئەم فەرموودەیە دەکات و دەفەرموێ: زانایان دەفەرموون: گریانی حەزرەتی موسی بە هیچ شێوەیەك لەرووی حەسودیی پێبردنەوە نەبوو، -معاذ الله- چونکە لە راستیدا حەسودی لەو جیهانی بەرز و بالایـەدا دارنـراوە و نەهێـشتراوەتەوە لـە دڵ و دەرونـی تاکـە تاکـەی ئیماندارانیـشدا، چ جـای کەسـێکی وەکـو موسـی کـە خـوای گـەورە هـەڵی بژاردووە و لە پێغەمبەرە هەرە گەورەکانە، بەڵکو ئەو گریانەی موسی ئەوە بوو کە ئەسەفی دەخوارد و خەم و خەفەتی دەخوارد لەسەر ئەوەی کە ئەو هەموو پاداشتە گەورەی لەدەست چوو کە خوای گەورە دەیبەخشێ لە موقابیلی هیدایەت دانی خەڵکی دا و وەرادەی پابەندبونی ئەو ئیماندارانەوە بە خواپەرستی و یەکتا پەرستیەوە، چونکە قەومی حەزرەتی موسی زۆر لار و لـەوێری و سەرپێـچییان دەکـرد و لـە ریگـای راسـتی خواناسـی لایانـدەدا، ئەمەش بێگومان دەبێتە هۆی کەمبونەوەی ئەجر و پاداشتیان، کە دەبێتە

هۆی کەم بوونەوەی ئەجر و پاداشتی حەزرەتی موساش (لأنَّ لكُلِّ نَبيٍّ مثل أجر كُل مَنْ تَبِعَهُ) لەبەر ئەوەی هەموو پێغەمبەرێك ئەوەندەی پاداشت دەستگیر دەبێ بە وێنەی پاداشتی هەموو ئەوانەی کە شوێنی کەوتوون... لەبەر ئەوە ژمارەی ئەوانەی کە شوێن حەزرەتی موسی کەوتن لە ئومەتەکەی لە ژمارەدا زۆر کەمتر بوو لە ژمارەی ئەوانەی کە شوێن حەزرەتی محمد دەکەون، چونکە ماوەی ئەم ئومەتی ئیسلامە هەتا قیامەتەو بەردەوام خەڵکی ئیمان بە پێغەمبەری خوا حەزرەتی محمدﷺ دەهێنن!. بەلام حەزرەتی موسی بە وەفاتی خۆی و بە نەسخ بونەوەی دینەکەی شوێنکەوتوانیشی کۆتاییان پێدیَ، بۆیە بۆ ئەو هەموو پاداشتە زۆرە گریا، کە ئەمەش لە ئیسلامدا رەوایە و پێی ناگوترێ حەسودی.

وە کاتێك حەزرەتی موسی وشەی (غُلام) ئەو کوڕە گەنجە مناڵکارەی بەکار هێنا بۆ پێغەمبەری خواﷺ هەرگیز مەبەستی بە کەم تەماشاکردن و لەقەدر و پلە و پایە کەمکردنەوە نەبوو بەڵکو مەبەستی لە دەربڕینی قەدر و ڕێزی خوای گەورە بوو بۆ پێغەمبەری خوا حەزرەتی محمدﷺ کە لەگەڵ ئەوەدا تەمەنی لەسەروو پەنجا ساڵیەوە و لە تەمەنی بەرەو پیریدایە و چۆتە قۆناغی پیریەوە و قۆناغ و تەمەنی لاویەتی تێپەڕاندووە، بەڵام سُبحان الله هیچ نیشانەیەکی پیر بوون بەسەر روخساریەوە نەدەبینرا و دەم و چاوی وەکو کەسێکی تازەلاو دەهاتە بەرچاو. وە ئەو چوست و چالاکی و گورج و

گۆڵیەی لەو تەمەنەدا لە هی کەسێکی پەنجا ساڵی نەدەچوو بەڵکو دەتگوت هێز و گوڕ و چوستی تازە لاوێکی تازە پێگەیشتووە.

وە ئەمەش تەنها حەزرەتی موسی هەستی پێ نەکرد بەڵکو لە کاتێکدا تەشریفی هیجرەتی کرد بۆ مەدینە لەگەڵ حەزرەتی ابو بکردا، چ ئەوانەی لە رێگا توشیان دەبوون کە دەیانگوت ئەی ئەبوبکر ئەو لاوە کێیە لەگەڵت؟ ناوی گەنج و لاویان بۆ پێغەمبەر دادەنا و ناوی پیر و بەساڵاچویان بۆ ئەبو بکر دادەنا، وە لە کاتی گەیشتنیاندا بۆ مەدینە، خەڵکی مەدینە ئەوانەی کە پێشتر بە خزمەت پێغەمبەرﷺ نەگەیشتبوون وایان دەزانی ابو بکر پێغەمبەرە، چونکە بەسالاچوو بەتەمەن دیاربوو، تەوەقوعی ئەوەیان نەدەکرد کە ئەو گەنج و لاوە کە پێغەمبەرە ئەو پێغەمبەر بێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە تەمەندا پێغەمبەری خواﷺ لە ئەبو بکر بەتەمەنتر بوو.

کەواتە کە موسی فەرمووی: (غُلام) مەبەستی لەو قەدر و رێزگرتنەی خوای گەورە بوو بۆ پێغەمبەری ئاخیر زەمان کە ئاوا بە گەنجی و لاوی هێشتویەتیەوە و ئەو رێزەی بە کەسی تر نەبەخشیوە. وە لە راستیدا حەزرەتی موسی لە هەموو پێغەمبەران زیاتر دڵسۆزی نواندووە بۆ پێغەمبەری خۆشەویستمان و تەواوی ئومەتەکەی، ئەمەش لەو فەرموودە پیرۆزەدا دەردەکەوێ کە (طەبەری و بەزار) لە ئەبی هورەیرەوە دەیگێڕنەوە کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: (كانَ موسى أشدهُم عَلَيَّ حينَ مَرَرْتُ بِهِ وَخيرهُمْ لي حينَ رَجَعتُ إليْه).

واتە: (بەڕاستی موسا پێغەمبەر لە هەموو پێغەمبەران زیاتر بە گەرم و گوڕی و دڵسۆزی و خۆشەویستیەوە بەخێرهاتنی کردم و دڵسۆزی بۆ نواندم لە کاتێکدا بە لایدا تێپەڕیم و بەرزبوومەوە لە هەمووشیان بۆم باشتر بوو کاتێ کە بەلایدا گەڕامەوە) وەکو ئەوەی کەلەسەر داوای حەزرەتی موسی پێغەمبەری خواﷺ چەند جار گەڕایەوە بۆ خزمەت خوا و داوای کەمکردنەوەی ژمارەی نوێژەکانی کرد تاوەکو ئەوە بوو لە پەنجا نوێژەوە خوای گەورە کردی بە پێنج نوێژ و فەرمووی: ئەی محمد هەر کەسێك بە ڕێك و پێکی و ئیخلاص و دڵسۆزی و دەستنوێژی جوان و خشوعەوە ئەو پێنج نوێژە ئەنجام بدات، ئەوە پاداشتی پەنجا نوێژی پێ دەبەخشم!! بەڵێ ئەمە دڵسۆزی حەزرەتی موسی دەردەخات بۆ ئومەتی محمدﷺ کە نوێژەکانیان بۆ کەم بکرێتەوە نەوەکو بۆیان نەکرێت و توشی بێفەرمانی خوا ببن..

بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لە میعراجدا گەیشتە ئەو شوێنەی کە ئیتر قەدەغەیە کەسی تری تێ بچێ، تەنانەت حەزرەتی جوبریل لێی جیا بۆوە و فەرمووی: ئەی محمد من لێرە بەرەو ژورتر ناتوانم بەرز ببمەوە.

لە صەحیحی مُسلم دا هاتووە کە فەرموویەتی: (ثُمَّ عَرَجَ بِي حَتَّى ظهـرت لمستوى اسمعُ فيهِ صَريف الأقلامِ) واتە: پاشان بەرز کرامەوە تا گەیشتمە شوێنێك کە گوێم لە دەنگی نوسینی قەڵەم بوو کە هەرچی ڕوودەدات خوای گەورە بە فریشتەکانی دەفەرموو بینوسن..

بەڵێ ئیمانداران: کاتێ پێغەمبەری خواﷺ گەیشتە حزوری خوای پەروەردگار -سُبحانَهُ و تعالى- فەرمووی: التَّحِيــاتُ لله، سەلامی کرد بە شیعاری ئومەتەکەی، کەواتە: ئیسلام دینی ئاشتیە، لەو شەوەوە سەلام بوو بە سوونەت، خوای گەورەش وەڵامی سەلام و تەحیەکەی پێغەمبەری دایەوە و فەرمووی: السَّلامُ عَلَيْكَ ايّها النَبيُّ وَ رَحْمَةُ الله وَبَرَكاتُهُ.

لێرەوە وەڵامی سەلامکردن بوو بە فەرز.

بەڵام پێغەمبەری رەحمەت و بەرەکەت دوورە لە خۆپەرستی و ئەنانیەت، بۆیە لەوێشدا فەرمووی: خوایەگیان با ئەو سەلام و ئاشتییە هەر تەنها بۆ من نەبێ بەڵکو: السَّلام عَلَيْنا وعلى عبادِ الله الصالحين. نەیفەرموو، فاطمة و عەلی و حەمزە و ئال و بەیتم، بەڵکو فەرمووی: هەرچی بەندەی چاکەکارە لە ئومەتم تاقیامەت، کە بێگومان ئەگەر إنشاء الله بەندەی چاکەکاری خوای پەروەردگاربین، من و تۆی ئیمانداریش دەگرێتەوە.

لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە کە رۆژێکیان پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: دەزانن پلەی زۆر بەرز هی کێیە؟ صەحابەکان عەرزیان کرد هی فریشتەکانە، فەرمووی: نەء، چونکە نەفس و شەیتانیان لەگەڵ نیە، وتیان: دەی کەواتە پلەی زۆر بەرز هی پێغەمبەرانە، فەرمووی: ئەوان وەحیان بۆ دێ لە لایەن خواوە، فەرموویان: هی ئێمەی یارانی تۆیە، فەرمووی: ئێوە بە چاوی خۆتان منتان بینیوە رۆژانە من قسەتان لەگەڵ دەکەم و لەگەڵتانا دەژیم... فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەی پلەی بەرز هی کێیە؟!

فەرمووی: پلەی زۆر بەرز بۆ ئەو برایانەمانە کە دوای ئێمە دێن و ئێمەیان نەبینیوە و ئیمان بە من دێنن و وەکو بیلبیلەی چاویان منیان خۆش دەوێت... دەی موسڵمانی بەڕێز ئەو ڕێز و حورمەتە لەدەست خۆت مەدە.

بەڵێ فریشتە بەڕێزەکان بە یەك دەنگ فەرموویان: أشْـهدُ أن لا إلـه إلا الله، و اشـهَدُ انَّ محمَّـداً رَسُـولُ الله. ئەم گفتوگۆ و وەڵامدانەوە و شایەتمانی فریشتەکان بونە تەحیاتی نوێژەکەمان، بۆیە (الصلاة معراج المؤمن) نوێژ بڵند بوون و بەرز بوونەوەی ئیمانداره..

جارێکی تر لە کۆتایی وتارەکەماندا وەکو سەرەتا دەڵێین: هەزاران هەزار سوپاس بۆ تۆ ئەی خوای پەروەردگارمان کە ڕێزت لێناین بەوەی کە کردتین بە ئومەتی ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە و ئێمەت بەم پێغەمبەرە و بەو قورئانە و بەشوێن کەوتنی ئەم ئیسلامە ئازیزە، بەم نوێژە بەرز کردەوە.

یارەبی خوایە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر بژین و بمرین و لەو قیامەتیشدا بەر شەفاعەتی ئەو سەروەر و سالارەمان بکەوین. اللهُمَّ آمین

## سەرچاوەکان:


١ قورئانی پیرۆز

٢ تەفسیری ئاسان – بورهان محمد أمین

٣ ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ – عبد العزیز علاء الدین ل١٢٣

٤. السلسلة الذهبیة – محمد المصری – ابو عمار–ج٢ ص٣١٠، ص٣١٤، ص٣١٨ ص٣٢٠، ص٣٣١

٥ فقة السیرة – الشیخ محمد الغزالي ص١٥٤

٦ ژیاننامەی پێغەمبەری خواﷺ – محمد ملا فائق شارەزوری ب١ ل١٨١

٧ تەفسیری رەوان – مەلا محمودی گەلاڵەیی – بەرگی هەشتەم جزئی١٥ ل١١٠،١٠، ل١٥٧

٨. سی وتاری ئاینی – مامۆستا مەلا هادی ئەفخەم زادە ل٢٥٠

# پێڕست